## تەفسیری سوورەتەكانی

# طه و الأنبياء

نووسینی: عەلی باپیر

دیزاینی ناوەوە : زەردەشت كاوانی

چاپی یەكەم ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز

٦٧٤ لاپەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتیەكان - هەرێمی كوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

## پێشەكی ئەم تەفسیره بەگشتیی

إنَّ الحَمْـدَ للَّـهِ نَحْمَـدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُـوذُ بِاللَّهِ مِـنْ شرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَـا، مَـنْ يَهْده اللَّـهُ فَلاَ مُضِـلَّ لَـهُ، وَمَـنْ يُضلِـلْ فَـلاَ هَـادِيَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَن لاَ إلَـهَ إلاّ اللَّـهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيـكَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً عَبْـدُهُ وَرَسـولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب .

أَمَّـا بَعْـدُ: فـإنَّ أَصْـدَقَ الحَديـث كَلامُ اللَّـه، وَخَيْرَ الْهَـدِي هَـدْيُ مُحَمَّـد ﷺ وَشرَّ الأُمُـورِ مُحْدَثاتُهـا، وَكُلَّ مُحْدَثَـةٍ بِدْعَة، وَكُـلَّ بِدْعَةٍ ضَـلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَـلاَلَةٍ فِي النَّـار[1].

**خوێنـەرە بەڕێـزو خۆشـەویستەكان!**

هیـچ گومـانی تێدانیــە - بـۆ مرۆڤـی بـڕوادار - كـە ئـەو تەمەنـەی لـە خزمـەت دواییـن كتێبـی خـوا (قورئـان)دا بەسـەردەبرێ، جـا بـە هــەر شـێوەیەك لـە شـێوەكانی لە خزمەتدابووندا بـێ؛ خوێندنـەوە، تێفكریـن و ڕامـان، فێركـردن، كارپێكـردن ... هتـد، بـە باشتــرین جێگرتـن جێـگا دەگـرێ و، خاوەنەكـەی لـە دنیـاو دوارۆژدا لێـی بەهرەمەنـدە.

---

(١) ئـەوە پێـی دەگـوترێ: (خطبـة الحاجـة) كـە پێغـەمبــەر ﷺ هــاوەڵانی بەڕێـزی فێــردەكرد، پێــش هـــەر قسـەیەكی گرنگ، بیڵـێن، وەك وتـاری جومعــەو داخــوازییكردن (خِطْبة)و... هتـدو، ئـەم وتــارە، هـەركام لە: التــرمذي: (١١٠٥)، النســائي: (١١٠٤)، ابن ماجـه: (١٨٩٢) أحمـد: (٣٧٢٠)، الطّبــراني: (٢٤١٤) هێنــاویانەو (مسلم)یش بەشـێكی هێنـاوە.

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خوا (**التحدّث بنعمة اللّه**) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردوومو، بەر لە تەمەنی بیست ساڵیی یەوە هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەڕێزو پێز لەبەر بکەم و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان و تێوەڕامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان و چۆنیەتی جێبەجێکردن و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو، کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم و خۆمی بۆ یەکلایی (**متفرّغ**) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون و، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەڕامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (**القرآن يُفَسِّر بَعْضُهُ بَعْضَاً**)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (**مُبَيِّن**)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: وە زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوە، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزن و تەفسیرەکانی و کتێبەکانی سوننەتدا خەریکم و، دەیان کتێب و بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیست و دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا (تبارك و تعالى)، وە بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەکانی یەوە، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلّى في كتاب اللّه تعالى**)دا زۆر چاك درەوشاوەتەوە[1]. بەڵام هەڵبەتە ناڵێم و هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنوورداربوونی تواناو بڕستم، لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕوویێکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشمویستوە کە زۆر بەملاولادا بچم و بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو

---

(١) ئەو مەوسووعەیە کە ئێستا چاپ کراوەو، کەوتۆتە بەردەستی خوێنەران و، سەرجەم هەشت بەرگ و دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەم و، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوونەت، کە لە هۆش (ذاکرة)دا بووون.

شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبی سەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

شـــارەزا نیـم، یـان خوێنـــەر پێویســـتی پێـی نیـە، لـە کاتێکـدا دەیـــەوێ لـە قورئان تێبگات و، بزانێ خـوا (تبـارك وتعــالـی) ڕاستەوخۆ چـی پـێ فــەرمووە؟!

ئنجـا هــەر لێرەشـەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو بـرا گەنجە ڕووح ســووك و گـورج و گـۆڵ و دڵســۆزە بکـەم (حـەزی نەکـرد نـاوی بهێنـم)، کـە هـەڵسـا بـە نووسـینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشـان تایپکـردن و دوایـی پێداچوونـەوەو هەڵەگیـریی، سـەرجـەم ئـەم زنجیـرە دەرسـە، کـە لـە ئەسـڵدا لـە شێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشـکەش کراون، هــەروەها هـەڵسـا بـە (تخریج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێـکی زۆری بـە سـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیـرە کێشـــاوە، خـــوا بـە باشـتـرین شـــێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هــەر صـاڵح و سـاغ و سـەلامەت و ســەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنـج و لاوانـە لـە کـوڕان و کچـان، لەنێـو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشـە کـە ئێمـە لـەم تەفسـیـرەماندا بـاسی بـەش (جـزء)ەکانی قورئـان و دابەشـکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حــزب) - ناکەیـن، چونکـە هــەر ســووڕەتێك بۆخـــۆی شـــتێکی ســەربەخۆیـــەو، ســەرجەم ئایەتـەکانی وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەسـتن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەســـت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئـــان، دیـارە ئێمـە لـە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیـرەشـدا، دیسـان حیســـاب بـۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بـە گوێـرەی ســووڕەتەکان، بەرگـەکانی دیـاریی دەکەیـن.

---

(١) ئـەو بـــرا دڵســۆزە ئێســـتاش پـاش تەواوکردنـی نیـوەی زیاتـری قورئـان، لێبڕاوانـە بەردەوامـە و عەزمیشـی جـەزم کـردوە، کـە ئەگـەر تەمەنمـان بـەردەوام بـێ، هەتـا کۆتـایی ئـەم تەفسـیـرە سـەرگەرمی کارەکـەی بـێ .

دوا قسـەشـم ئەوەیـە کە:

ئـەم تەفسـیرە - وەك پێشـتـر گوتمـان - لـە ئەسـڵدا بەشـێوەی دەرس و وتـار پێشـکەش کـراوە، بـەڵام دواتـر خـۆم دووجـار بـە وردیـی پێیـدا چوومـەوەو، بەپێـی پێویسـت دەسـتکاریيم کـردوە، دیـارە هـەموو دەرسـێکیش بەنـاوی خـواو سـتایشی خـوا ﷻ دەسـتی پێکـردوە، بـەڵام ئێمـە لـە سـەرەتای دەرسـەکانەوە، ئەوانەمـان لابـردوە، بـۆ زۆر دووبارە نەبوونـەوەو، ئـەو (خطبـة الحاجـة)یەی لـە سـەرەتای ئـەم پێشـەکەییەوە هاتـوە، لەجیاتی سـەرەتای سـەرجەم دەرسـەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هـەولـێر

# بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

خوێنەری بەڕێز !

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەکانیانمان بە ڕیز نووسیون، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنن، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبێ و بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیکتیفا دەکەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمية) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتیی خۆمم، دەربارەی کۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ،

وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، کەچی ڕەنگە لە تەفسیرەکانی دیکەش - یەکێکیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە من ئەو تەفسیرەم نەکەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

## پێشەکی ئەم بەرگە

الحمدلله وحده، والصلاة والسلام على من لا نبيَّ بعده، وآله المُلْتزمين دَرْبَه:

بەڕێـــــزان !

ستایش شایستە بۆ خوای میهرەبان، کە گەیاندنی بە بەرگی شازدەیەمی: (تەفسیری قورئانی بەرز و بە پێز)، کە هەردووك سووڕەتی: (طـه) و (الأنبیاء) دەگرێتە خۆی.

شایانی باسیشە ئێمە ئێستا لە تەفسیری کۆی سووڕەتەکانی قورئان بووینەوە، وەك گوتنەوەو تۆمارکردنی دەنگیی و ڤیدیۆیی و، ماوەتەوە چاپکردنی کە بەدەستگەرمیی کاری لەسەر دەکەین.

ئەم بەرگەش وێڕای لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای ئایەتە بە پێزەکانی هەردووك سووڕەتی: (طـه) و (الأنبیاء) بە حەوت هەنگاو، وەك عادەتی خۆمان لە کۆی ئەم تەفسیرەدا، کۆمەڵێك بابەت و باسی دیکەشی گرتوونە خۆی، کە ئەمانە گرنگترینیانن:

### أ- لە سوورەتی (طه) دا:

١- کورتەباسێك: چوار سەرنجی گرنگ لەسەر ئەم دوازدە ئایەتە (٢٥-٣٦).

٢- وەڵامەکەی مووسا و دوو بەڵگەی نکوولیلێنەکراو لەسەر بوونی خوا.

٣- پێناسەی جادوو و چوار جۆرەکەی.

٤- پێنج وردە سەرنج.

٥- ئایا سامیریی کێ بووە؟.

٦- سێ وردە سەرنج.

٧- ئایا مووسا هەقی بووە، یان هارِوون، لە مشت و مرِەکەیان دا؟

٨- قسە دابرِین لە ئەهلی بیدعەت و هەڵوەستەیەك.

٩- سێ جۆرە لێکدانەوە بۆ بیانووکە سامیریی لە دروستکردنی گۆلکەکەدا.

١٠- حاڵی چیایەکان لە دوارِۆژدا لە پێنج قۆناغ دا، کورت هەڵدێ.

١١- لە نێوان پەلە کردن و خێرایی کردن دا.

١٢- دوو پرسیار لە بارەی ئادەمەوە و وەڵامەکەیان.

١٣- بەهەشتی هەمیشەیی، یان باخێکی سەر زەویی؟

١٤- وەڵامی سێ پرسیار.

١٥- نوکتەیەکی رِەوانبێژیی.

١٦- وەرگرتنی دوو حوکمی گرنگ لەم ئایەتە بەپێزە (طه - ١٣٤).

## ب- لە سوورِەتی (الأنبیاء)دا:

١- وەڵامی پرسیارێك.

٢- چەند قسەیەك لەبارەی بەرگە هەوای دەوری زەوییەوە.

٣- کورتە باسێك دەربارەی وەڵامی ئیبراهیم : گەورەکەیان شکاندوونی.

٤- کورتە باسێك: نۆ هەڵوەستەی کورت لە بەردەم ئەم ئایەتانەدا (٧٩-٨٠).

٥- بەسەرهاتی شەش لە پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا.

٦- یەکەم: بەسەرهاتی داوود.

٧- دووەم: بەسەرهاتی سولەیمان.

٨- سێیەم: بەسەرهاتی ئەییووب.

٩- چوارەم: بەسەرهاتی ذوالكیفل.

١٠- پێنجەم: بەسەرهاتی ئیلیاس.

١١- شەشەم: بەسەرهاتی ئەلیەسەع.

١٢- تیشكێك لەسەر ڕستەی: (كما بدأنا أول خلق نعيده).

هیواداریشم ئەم بەرگەش وەك بەرگە پێشووەكان بە قووڵیی و شێنەیی بخوێندرێتەوەو سەرنج بدرێ و بەهرەی شایستەی لێوەربگیرێ .

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك

١٢ ربيع الثاني ١٤٤٢ك - ٢٩-١٠-٢٠٢٠ز

## دەستپێک

بەڕێـــــــــزان!

ئەمـڕۆ کـە (٧)ی موحەڕڕەمـی سـاڵی (١٤٣٩)ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٧/ ٩/ ٢٠١٧)ی زایینـی، بـە پشـتیوانیی خـوا، دەسـت دەکەیـن بـە ڕوونکردنـەوەی ماناو مەبەسـتەکانی ئایەتـە بـە پێـزەکانی سـوورەتی (طـه)، کـە نیـوەی دووەمـی، جوزئـی شـازدەیەم لـە قورئانـی بـە پێـز پێـک دێنـێ.

## پێناسەی سووڕەتی (طه) و بابەتەکانی

سـەرەتا دێینـە سـەر پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەو سـووڕەتەو، لـە شـەش (٦) بڕگـەدا پێناسـەی ئـەم سـووڕەتە موبارەکـەو نێوەڕۆکەکـەی دەکەیـن:

### ا)- ناوی ئەم سووڕەتە:

ئـەم سـووڕەتە تەنیـا بـە نـاوی دوو پیتـی سـەرەتای کـە (ط، هــ)ن، ناونـراوە، کـە دیـارە ئەوانیـش بـە (**طا**) و (**ها**) گـۆ دەکرێـن، وەک هەمـوو ئـەو پیتـە پچـڕ پچڕانـەی دیکـە کـە لـە سـەرەتای (٢٩) سـووڕەت لـە سـووڕەتەکانی قورئانـدا هاتـوون، ئـەوە لـە لای زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان و لێکۆڵەرەوانـی مانـاو مەبەسـتەکانی قورئـان، وایـە.

بـەڵام (**السّـیوطي**) لـە (**السَّـخاوي**)یەوە هێناویەتـی، لـە کتێبـی (**الإتقـان فـي علُـوم القـرآن**)دا، کـە ئـەم سـووڕەتە بـە (**سـورة الكليـم**)، هەرروەهـا بـە (**سـورة مـوسى**)ش

ناوی هاتوە، لەبەر ئەوەی کە زۆربەی هەرە زۆری ئەم سوورەتە موبارەکە، بۆ بەسەرهاتی مووسا (علیه سلام) و، فیرعەون تەرخانکراوە.

### ٢)- ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنە خواردا:

لە ڕیزبەندیی (**مُصحف**)دا، واتە: ئەو (**مُصحف**)ەی کە لەبەر دەستمانە: ژمارە (٢٠)ی بۆ دانراوە، واتە: (١٩) سوورەت لە پێشیەوە هەن، بەڵام لە ڕیزبەندیی هاتنە خواردا، زانایان ژمارە (٤٥) یان بۆ داناوە، دوای سوورەتی (**مريم**) کە ژمارە (٤٤)ەو، پێش سوورەتی (**الواقعة**)یە.

### ٣)- شوێنی دابەزینی:

زانایان مشت ومریان لەو بارەوە زۆرە، بەڵام بە پێی ئەوە کە لە مسوڵمان بوونی (عومەری کوڕی خەتتاب)دا، (خوای لێ ڕازی بێ)، باسی سوورەتی (**طه**) کراوە، کە ئێمە دواتر بەسەرهاتەکەی باس دەکەین، لە (**السيرة النبوية لابن هشام**)دا هاتوە، کە ئەویش دوای کۆچ کردنی بەشێک لە مسوڵمانان بووە، کە ژمارەیان (٨٣) هەشتا و سێ کەس بووە، بۆ حەبەشە، لەو سەرو حەدەدا عومەری کوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازی بێ)، مسوڵمان بووە، دەبێ ئەم سوورەتەش پێش مسوڵمان بوونی عومەر هاتبێتە خوار، ئنجا هەندێک دەڵێن: لە ساڵی پێنجەمی کۆچییدا، بەڵام من وا بۆی دەچم کە مسوڵمان بوونی عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، لە نێوان ساڵەکانی (٦ - ٧)دا بوو بێ، واتە: (٦ - ٧)ی پێغەمبەرایەتیی، وەک پێشتریش لە تەفسیری سوورەتی (**مريم**) دا باسمان کرد.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم کە بەسەرهاتی مسوڵمان بوونی عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) باس بکەم، وەک لە سیرەی (**إبن هشام**)دا هاتوە، ئەم کتێبەش:

(**السيرة النبوية**)، (**إبن هشام**) بە زۆری لە (**إبن إسحاق**)ەوە، دەیهێنێ بەڵام جار جار خۆیشی لێی زیاد دەکات و، هەندێک زانیاریی دەخاتە سەرێ، ئەمەش دەقی ئەوەیە کە (**ابن إسحاق**) هێناویەتی لە (**السيرة النبوية لابن هشام**)[1]:

(**إبن إسحاق**) دەڵێ: مسوڵمان بوونی عومەر وەک پێم گەیشتوە خوشکەکەی (**فاطمة بن الخطاب**)، هاوسەری (سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نەوفەیل) بووە، کە پێشتر مسوڵمان بووەو، هاوسەرەکەشی (سەعیدی کوڕی زەید) مسوڵمان بووە، بەڵام مسوڵمان بوونی خۆیان لە عومەر پەنهان کردوە، ئنجا (**نُعَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللهِ النَّحّام**) لە مەککە، پیاوێک بووە لە گەلەکەی خۆی، واتە: لە خزمانی عومەر لە (**بني عدي بن كعب**)، ئەویش هەر مسوڵمان بووە، بەڵام ئەویش دیسان مسوڵمان بوونی خۆی پەنهان کردوە، لە ترسی خەڵکەکەی خۆی {هی (**فاطمة** و سعيد)، لە ترسی عومەر، بەڵام هی (**نُعيم**) لە ترسی خزمەکانی}.

ئنجا (خەبابی کوڕی ئەرەت)یش، (خوا لە هەموویان ڕازی بێ)، دەچوو بۆ لای (**فاطمة بنت الخطاب**)، قورئانی فێر دەکرد، ڕۆژێک عومەر شمشێرەکەی لە کالان دەردێنێ، دەڕوا بە مەبەستی چوون بۆ لای پێغەمبەر خوا ﷺ و، کۆمەڵێک لە هاوەڵانی کە باسکراون، کە لە ماڵێکدا لە لای (**صفاء**)، لەوێ کۆبوونەوەو، نیزیکەی چل (٤٠) کەس بوون لە پیاوان و ئافرەتان، (دیارە لە شوێنێک بە پەنهانیی کۆبوونەوەیان کردوە)، کە ئەویش ماڵی (**أرقمِ بن الأرقم**)ە، لەو کاتەدا ئەوانەی لە خزمەت پێغەمبەردا بوون ﷺ: حەمزەی مامی بووە، کە پێش عومەر مسوڵمان بووە (**حمزة بن عبدالمطلب**)، (**أبو بكر بن قُحافة**) بووە (**أبو بكر الصديق**) و (**علي بن أبي طالِب**) بووە، کە ئەو کاتەی مسوڵمان بووە، تەمەنی دە (١٠) ساڵ بووە، بەڵام کە (٥ - ٦) ساڵی بەسەردا تێپەریون، ئەو کاتە باڵغ بووە، هەروەها پیاوانێکی دیکەش لە مسوڵمانان لەوانەی لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ مابوونەوەو، لەگەڵ ئەوانەی کە کۆچیان کرد بوو بۆ حەبەشە، نەچوو بوون.

---

(١) ج١، ص١٧٤ - ١٧٦.

ئیدی (**نُعَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللّهِ النَّحّام**)، دەبینی کە عومەر شمشێری لە کالان دەرهێناوە، لێی دەپرسێ: بۆ کوێ دەچی ئەی عومەر؟ دەڵێ: دەمەوێ بچم بۆ لای موحەممەد ئەو هەڵگەڕاوەیەی کە دینی قورەیشییەکان و، کاروباری قورەیشییەکانی پەرتەوازە کردووە، عەقڵی باب و باپیرانی قورەیشیش بە نەفام باس دەکات و، ئایینەکەیان ڕەخنە لێ دەگرێ و، قسە بە پەرستراوەکان دەڵێ، دەمەوێ بیکوژم، (**نعیم**) پێی دەڵێ: ئەی عومەر! نەفست هەڵیخەڵەتاندووی، ئایا پێت وایە (**بنو عبدالمناف**)، خزمانی پێغەمبەر لێت دەگەڕێن لەسەر زەوی بڕۆی، لە کاتێکدا کە موحەممەدت کوشتوە! ئەدی بۆچی ناگەڕێیەوە بۆ لای ماڵی خۆت، کاروباری ماڵی خۆت چاک بکەی و ڕاست بکەیەوە، ئەویش دەڵێ: کام لە بنەماڵەی خۆم؟ دەڵێ: زاوایەکەت کە ئامۆزاشتە کە (سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمر)ە و، خوشکەکەت (**فاطمة**)، چونکە سوێند بە خوا هەردووکیان مسوڵمان بوون و، شوێن موحەممەد کەوتوون و، شوێن ئایینی موحەممەد کەوتوون، ئەگەر ڕاست دەکەی بچۆ ئەوان ڕاست بکەوە، ئیدی عومەر دەگەڕێتەوە بۆ لای ماڵێ و، دەچێ بۆ لای خوشکەکەی و زاوایەکەی کە لەو کاتەدا (**خَبّابُ بْنُ الأَرَتّ**) پەڕاوێکی پێ دەبێ، یان چەند پەڕێکی پێ دەبن، کە سووڕەتی (**طه**)یان تێدایەو، ئەو چەند ئایەتەیان کە لە سەرەتای سووڕەتی (**طه**)دا دابەزیون، {یان سووڕەتی (**طه**)یان تێدا هەیە}، ئەوەیان پێ دەڵێ، کاتێک هەست بە هاتنی عومەر دەکەن، (**خَبّابُ بْنُ الأَرَتّ**) لە شوێنێک (پاش کەندوو، یاخود شوێنێک کە عومەر نایزانێ)، لەوێ خۆی پەنهان دەکات (**فاطمة بنت الخطاب**) یش، ئەو پەڕەیە کە خەبباب سووڕەتی (**طه**)ی تێدا پێی دەگوتن، دەیخاتە بن ڕانی، دیارە عومەر کاتێک دێتە نیزیک ماڵ، گوێی لە (**خَبّاب**) دەبێ کە قورئانیان پێ دەڵێ، ئنجا کاتێک دێتە ژوور دەڵێ: ئەو دەنگە دەنگە چی بوو دەمبیست؟ ئەوانیش پێی دەڵێن: هیچت نەبیستوە، هیچ شتێکی زیادە نەبوو، ئەویش دەڵێ: با، سوێند بە خوا هەواڵیشم پێدراوە کە دەبێ ئێوە مسوڵمان بوون و، شوێن موحەممەدو ئایینەکەی کەوتوون، ئیدی پەلاماری زاواکەی (سەعیدی کوڕی زەید

دەدات)، خوشکەکەشی هەڵدەستێ، بەرگریی لە مێردەکەی دەکاو ناهێڵێ لێی بدا، ئنجا لەویش دەداو، سەری یاخود دەم و چاوی دەشکێنێ، کاتێک ئەوە دەکات، خوشکەکەی و زاواکەشی، هەردووکیان پێی دەڵێن: بەڵێ مسوڵمان بووین و، بڕوامان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی هێناوەو، تۆش هەر چیت لە دەست دێ بیکە، کاتێک عومەر خوشکەکەی دەبینێ ئاوا خوێنی پێدا دێ، دیارە بەزەیی پێدا هاتۆتەوە، پەشێمان دەبێتەوە لەوەی کە کردوویەتی و، دەست هەڵدەگرێ لە لێدانیان و بە خوشکەکەی دەڵێ: ئەو پەڕەیەی کە گوێم لێ بوو دەتانخوێند، تۆزێک پێش ئێستا وێم بدە، با تەماشای بکەم، داخۆ موحەممەد چی هێناوە، عومەریش (خوا لێی ڕازی بێ) نووسەر بوو، واتە: دەیتوانی بیخوێنێتەوە (بنووسێ و بخوێنێ) کاتێک وا دەڵێ: خوشکەکەی پێی دەڵێ: ئێمە دەترسین تۆ زیانێک بەو پەڕە بگەیەنی، ئەویش دەڵێ: مەترسێ و سوێندی بە پەرستراوەکانی بۆ دەخوات، ئنجا (**فاطمة**)ش ئومێدەوار دەبێ بە مسوڵمان بوونی، بۆیە پێی دەڵێ: برایەکەم تۆ مادام هاوبەش بۆ خوا دانەری، پیسی و ئەو قورئانەش دروست نیەو پاک نەبێ دەستی لێ بدەن، (واتە: هەڵسە خۆت بشۆ)، ئیدی عومەر هەڵدەستێ خۆی دەشوات، ئەویش پەڕەکانی پێدەدات، کە سوورەتی (**طه**)یان تێدایە، دەیخوێنێتەوە[1]، چونکە هاتوە: (**فَلَمّا قَرَأَ مِنْهَا صَدْرًا**)، کاتێک کە سەرەتایەکەی (سوورەتی (**طه**)ی) خوێندەوە، گوتی: (**مَا أَحْسَنَ هَذَا الْكَلَامَ وَأَكْرَمَهُ**) واتە: ئەم قسەیە چەند بەڕێزەو چەند چاکە!

ئنجا کاتێک خەبباب گوێی لەو قسەیە دەبێ، دێتە دەر لەو شوێنەی کە خۆی تێدا پەنهان کردوەو، دەڵێ: ئەی عومەر! ئومێدم وایە کە خوا ﷻ تۆی تایبەت کردوە بە پاڕانەوەکەی پێغەمبەر ﷺ، چونکە دوێنێ گوێم لێ بوو، دەیفەرموو: (**أَللَّهُمَّ! أَيِّدْ الإِسْلَامَ بِأَبِي الْحَكَمِ بْنِ هِشَامٍ أَوْ بِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ**) ئەی

---

(١) وا پێدەچێ ئایەتەکانی سەرەتای سوورەتی (طه) بووبن، ئەو (٨) هەشت ئایەتەی کە ئێمە دەیانکەین بە دەرسی یەکەم، وا پێدەچێ هەر ئەو (٨) هەشت ئایەتە بووبن، یاخود زیاتریشی تێدا بووبێ، بەڵام بێگومان باس نەکراوە کە هەموو سوورەتی (طه)ی خوێند بێ، کە (١٣٥) ئایەتە.

خوایە! ئیسلام بەهێز بکە، بە (**أبي الحكم بن هشام**)، (واتە: (**أبو جهل**))، یاخود بە عومەری کوڕی خەتتاب، ئەی عومەر! خوات بە گژ دادەکەم، هەوڵبدە کە تۆ ئەو دوعایەی پێغەمبەرت بۆ گیرا بووبێ.

ئنجا عومەر لەو کاتەدا پێی دەڵێ: ئەی خەبباب! پێم بڵێ موحەممەد لە کوێیە؟ تاکو بچم مسوڵمان ببم! خەبباب پێی دەڵێ: لەماڵێکە لە لای صەفا، کۆمەڵێک لە هاوەڵانی لە خزمەت دان، ئنجا عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) شمشێرەکەی هەڵدەگرێ و دەیخاتە کالانەکەیەوەو بە شانی دا دەکات و، دوای دەچێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی و لە دەرگا دەدات، کاتێک دەنگەکەی دەبیستن، پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەستێ لە کەلێنی دەرگاکەوە تەماشا دەکات، عومەرە خوای لێ ڕازی بێ شمشێرەکەی بە شاندا کردوە، دەگەڕێتەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە حاڵێکدا کە ترساوە، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە عومەری کوڕی خەتتابە شمشێرەکەی لە ملدایەو هاتوە، (**حمزة بن عبدالمطلب**) دەڵێ: مۆڵەتی بدە، ئەگەر بۆ خێرو چاکە هاتبێ، ئەوا خێرو چاکەی پێ دەدەین و، ئەگەر بۆ خراپەش هاتبێ، بە شمشێرەکەی خۆی دەیکوژین، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: مۆڵەتی بدەن، پیاوەکە مۆڵەتی دەداو دەڵێ: وەرە ژوور پێغەمبەری خواش ﷺ هەڵدەستێ تاکو لە لای دەرگاکە دەیگرێ و (پشتێنەکەی دەگرێ، یاخود یەخەی دەگرێ)، بە توندیی ڕایدەتەکێنێ و دەفەرموێ: ئەی کوڕی خەتتاب! چ شتێک تۆی هێناوە، سوێند بە خوا پێم وایە تۆ واز ناهێنی تاکو خوا سزایەکت بۆ دەنێرێتە خوار، یاخود چەند ئایەتێک بۆ سزادانی تۆ؟.

عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! هاتووم کە بڕوا بە خواو بە پێغەمبەرەکەی بێنم و بەوەی کە لە خواوە هاتوە، ئیدی پێغەمبەر ﷺ (**الله أكبر**)ێک دەکات، خەڵکەکەی کە لە ماڵەکەدان، (واتە: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەموویان ئەوانەی کە لەوێدان)، دەزانن کە عومەر مسوڵمان بووە.

ئنجا ئیدی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شوێنی خۆیان هەڵدەستن و دڵیان بەوە خۆشدەبێ، بە مسوڵمان بوونی عومەر، هەروەها بە مسوڵمان بوونی حەمزەش پێش ئەو و، دەشزانن کە لەمەودوا حەمزەو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، بەرگریی لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن و، تۆڵەش لە دوژمنەکانیان دەکەنەوە.

هەڵبەتە ئەمە ئەوەیە کە **(إبن إسحاق)**، هێناویەتی و یەک دوو ڕیوایەتی دیکەشی هێناون، بەڵام ئەوەی جێی مەبەست بوو، ئەمە بوو.

## ٤)- ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە:

بە چوار جۆر ئایەتەکانی ئەم سوورەتە سەرژمێر کراون:

١- خەڵکی مەککەو مەدینە ئایەتەکانیان بە (١٣٤) داناون.

٢- بەڵام خەڵکی شام بە (١٤٠)یان داناون.

٣- خەڵکی بەصرە بە (١٣٢)یان داناون.

٤- خەڵکی کووفەش بە (١٣٥)یان داناون، کە دیارە ئەو (مصحف)ی ئێمە لەبەر دەستماندا هەیە، ئەم ژمارەیەی تەبەنیی کردوە.

پێشتریش گوتوومانە: کە ژمارەی ئایەتەکان، جیاوازیی هەیە، بەهۆی کورتیی و درێژیی ڕستەکانەوە، ئەگەرنا هیچ زانایەک، نەیگوتوە: فڵان پیتە، یان فڵان وشەیە لە قورئاندا هەیە، یەکی دیکەشیان بڵێ: نیە، بەڵام لە کوێ دەوەستی، یان ناوەستی؟ جاری وایە ڕستەیەک زانایەک کردوویەتی بە دوو ئایەت، زانایەکی دیکە کردوویەتی بە یەک ئایەت، بەوە ئایەتەکان ژمارەیان کەم و زیاد دەکات.

## ٥)- نێوەرۆکی:

ئەم سووڕەتەش بە هەر (١٣٥) ئایەتەکەیەوە، وەک سەرجەم قورئانی مەککەیی لە سوڕگەی: بووناسیی و، ئیمان و عەقیدە واتە: ئیمان و خوا بە یەکگرتن بە هەموو پایەکانیەوە، پاشان خواپەرستیی و ڕەوشت و ئاکارو، پاشان باسی ڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ و...هتد، لەو سوڕگەیەدا دەخولێتەوەو، دەتوانین بڵێین: ئەم سووڕەته بۆ پێنج بابەتی سەرەکیی دابەشکراوە:

١- هەشت ئایەتی سەرەتای سووڕەتەکە، وەک پێشەکی وان.

٢- نەوەد (٩٠) ئایەت، ئایەتەکانی: (٩ - ٩٨)، تەرخانکراون بۆ بەسەرهاتی مووساو هاڕوونی برای ﷵ، هەروەها فیرعەون و دارو دەستەکەی، کە زۆرترین ئایەتن لە سووڕەتێکدا بۆ ئەو بەسەرهاتە تەرخان کرابن، وەک ژمارەی زۆر، ئەگەرنا لە سووڕەتی (الأعراف)دا کە لە بەرگی شەشەمی ئەم تەفسیرەدا، شیمانکردەوەو مانای ئایەتەکانیمان لێکدایەوە، لەوێ بۆ ئەو مەبەستە شەست و نۆ (٦٩) ئایەت تەرخانکراون، کە ئایەتەکانی: (١٠٣ - ١٧١)ن، کە بە تەئکید لە ڕووی قەبارەو، لە ڕووی پانتاییەوە، لەو نەوەد (٩٠) ئایەتەی ئێرە زیاترن.

٣- ئایەتەکانی: (٩٩ - ١١٤)ن، واتە: شازدە (١٦) ئایەت، بۆ باسی ڕۆژی دوایی و باسی قورئان، تەرخان کراون.

٤- ئایەتەکانی: (١١٥ - ١٢٧)، واتە: سێزدە (١٣) ئایەت، بۆ بەسەرهاتی ئادەم و حەووا (علیهما السلام) و ئیبلیس و، سەرەنجامی شوێنکەوتووانی ئیبلیس و، شوێنکەوتووانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ)، تەرخان کراون.

٥- ئایەتەکانی: (١٢٨ - ١٣٥) کە هەشت (٨) ئایەتی کۆتایین، بۆ خستنە ڕووی چەند ڕێنماییەکی گرنگ بۆ پێغەمبەر ﷺ و شوێنکەوتووانی تەرخانکراون.

## ٦- دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە ئەو (١٣٥) ئایەتەمان دابەش کردوون، بۆ حەوت (٧) دەرس:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ٨)، کە بە پێشەکی ئەم سوورەتە دادەنرێ، باسی ئامانجی دابەزێنرانی قورئان و، سەرچاوەکەی و، وەسفی خوا ﷻ و بە دیهێنەرایەتیی خوا و خاوەندارێتیی و حوکمڕانێتیی و زانایەتیی و، تەنیا پەرستراوێتیی و، خاوەندار بوونی بۆ هەرچی ناوی هەرە چاك و پەسندە، ئەو بابەتانە باسکراون.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەکانی: (٩ - ٥٥)، واتە: چل و حەوت (٤٧) ئایەت دەگرێتەوە، کە سەرەتای بوونە پێغەمبەری مووسا ﵇و، ڕەوانەکرانی بۆ لای فیرعەون و، خستنە ڕووی داواکارییەکانی و، وەڵامدرانەوەیان و، ڕووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ فیرعەونداو.... هتد، خراوەتە ڕوو.

**دەرسی سێیەم:** ئایەتەکانی: (٥٦ - ٧٦)، واتە: بیست و یەک (٢١) ئایەت، کە بەرەنگاربوونەوەی مووساو هاروون (علیهما السلام)و، جادووگەرەکانی فیرعەون و، شکستهێنانی جادووگەرەکان و، سەرەنجام بڕوا هێنانیان و، هەڕەشەکردنی فیرعەون لە جادووگەرەکان، کە دەستی ڕاست و پێی چەپیان دەبڕێ و، بە گڵۆفکی دارخورمایان هەڵدەواسێ، ئەوانیش بێ باکیی و بێ منەتیی خۆیان دەردەبڕن، باسی ئەوە کراوە.

**دەرسی چوارەم:** ئایەتەکانی: (٧٧ - ٩٨)، واتە: بیست و دوو (٢٢) ئایەت، باسی فیرعەون دەربازکرانی بەنی ئیسرائیل و، چوونی مووساو بۆ ژوانگەو، فریودانی سامیریی بۆ بەنی ئیسرائیل و، گەڕانەوەی مووسا و لێپرسینەوەی لەگەڵ هەر کام لە خەڵکەکە، (واتە: بەنی ئیسرائیل) و، هاروونی برای ﵇و، سامیریی فریودەر، کراوە.

**دەرسی پێنجەم:** ئایەتەکانی: (٩٩ - ١١٤)، واتە: شازدە (١٦) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە تێیان دا باسی قیامەت و ڕووداوەکانی و، باسی قورئان و، باسی چۆنیەتی مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ قورئاندا، کراوە.

**دەرسی شەشەم:** ئایەتەکانی: (١١٥ - ١٢٧)، واتە: سێزدە (١٣) ئایەت، کە تێیان دا باسی ئادەم و هاوسەرەکەی (علیهما السلام)، هەروەها باسی ئیبلیس و چۆنیەتی فریودانی ئیبلیس بۆ ئادەم و حەوواو، خواردنیان لە درەختە قەدەغەکراوەکە، کراوە.

**دەرسی حەوتەم و کۆتایی:** ئایەتەکانی: (١٢٨ - ١٣٥)، واتە: هەشت (٨) ئایەت، کە تێیان دا باسی گەڕانەوە بۆ لای مێژوو و، چەند ڕێنماییەک بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لە بواری مامەڵە کردنی لەگەڵ کۆمەڵگادا، کراوە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان هەشت (٨) ئایەتی سەرەتای سوورەتی (**طه**) دەگرێتە خۆی، کە تەرخانکراون بۆ ڕوونکردنەوەی ئامانجی نێردرانی قورئان و، وەسفی دابەزێنەرەکەی کە خوایە ﷻ بەوە: کە بەدیهێنەری زەوی و ئاسمانە بەرزەکانەو، حوکمڕانی ڕەهای بوونەو، خاوەنی هەموو شتێکەو، هیچ شتێکی لێ پەنهان نیەو، تەنیا ئەو پەرستراوەو، خاوەنی هەرچی ناوی پەسندو چاکە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿طه ﴿١﴾ مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لِتَشْقَىٰٓ ﴿٢﴾ إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ﴿٣﴾ تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ ٱلْأَرْضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلْعُلَى ﴿٤﴾ ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ﴿٥﴾ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ ٱلثَّرَىٰ ﴿٦﴾ وَإِن تَجْهَرْ بِٱلْقَوْلِ فَإِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخْفَى ﴿٧﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴿٨﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، (**طا، ها**)، ﴿١﴾ قورئانمان بۆ ئەوە دانەبەزاندۆتە سەرت کە ناڕەحەت و گرفتاربی ﴿٢﴾ (قورئانمان) بۆ جگە لە بیرخستنەوە (ی ڕاستییە خواڕسکەکان) بۆ کەسێک کە (لە سزای خوا) بترسێ، دانەبەزاندوە ﴿٣﴾ (ئەم کتێبە) لە لایەن کەسێکەوە دابەزێنراوە کە زەمین و

ئاسمانە بڵندەکانی هێناونە دی ﴿٤﴾ (خوای) بەبەزەیی کە لەسەر تەختەکەیەتی (بەو جۆرەی کە شایستەیەتی) ﴿٥﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدایەو، ئەوەی کە لە نێوانیانداو، لە بن خاکی شێدار دایە، هی ویە ﴿٦﴾ ئەگەر قسەش بە دەنگی بەرز بکەی (یان پەنهانیی بیکەی هەر دەیزانێ)، چونکە نهێنیی و پەنهانتریش (لە نهێنیی) دەزانێ ﴿٧﴾ خوا، جگە لەوی هیچ پەرستراوێک نیە، ناوە هەرە چاکەکانی هەن ﴿٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لِتَشۡقَىٰٓ): (شَقِيَ يَشْقَى شَقاً وَشَقَاءً: تَعِسَ وَسَاءتْ حَالُهُ، وَشَقِيَ فِي كَذَا: تَعِبَ وَاشتَدَّ عَنَاؤُهُ وَالشَّقَاءُ: العُسْرُ وَالتَّعَبُ وَالشِّدَّةُ والمِحْنَةُ والضَّلاَل)، کە دەفەرمووێ: ﴿مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ﴾، قورئانمان بۆ ئەوە دانەبەزاندۆتە سەرت کە (شَقِيَ)بێ، دەگوترێ: (شَقِيَ يَشْقَى شَقاً وَشَقَاءً)، واتە: حاڵی خراپ بوو، بەدبەخت بوو، نابەختەوەر بوو، دەگوترێ: (شَقِيَ فِي كَذَا: تَعِبَ)، واتە: تێیدا ماندوو بوو، هەروەها دەگوترێ: (شَقِيَ فِي كَذَا: اشْتَدَّ عَنَاؤُهُ)، نارەحەتییەکەی زۆر بوو، هەروەها (شَقَاء) بە سەغڵەتیی و نارەحەتیی دێ و، بە مانای ماندوو بوون دێ و، بە مانای سەختیی دێ و، بە مانای بەڵا دێ و، بە مانای گومڕاییش دێ، لە هەندێ ناوچان لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: خۆت (شەقیی) مەکە، واتە: خۆت ماندوو مەکە، یاخود دەڵێن: پێوەی شەقیی بووە، مەبەستیان ئەوەیە پێوەی ماندوو بووە.

(ٱسۡتَوَىٰ): دەگوترێ: (اسْتَوَى عَلَى كَذَا أي: اسْتَقَرَّ، وَثَبَتَ، وَمَلَكَ وَتَوَلَّ عَلَى مُلْكٍ)، (اسْتَوَى عَلَى كَذَا) واتە: لەسەری چەسپا، لە سەری نیشتەجێ بوو و، خستیە ژێر ڕکێفی خۆی و، دەستەڵاتی تێدا ڕانا، چونکە (استوى) ئەگەر بە (على) تەعەددا

بکات، ئەو مانایانەی هەن، بەڵام جاری واش هەیە (استوى) بە مانای (قَصَدَ) ویستی، هەروەها بە مانای (پێگەیشت) دێ: ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ﴾، کاتێک گەیشتە توغیانی تاقەتی خۆی و کامڵ بوو، پێگەیشت.

(ٱلثَّرَىٰ): (الأَرْضُ النَّدِيُّ، والتُّرَابُ النَّدِيُّ)، (ثَرَى) بە زەوی دەگوترێ، زەوی شێدار، هەروەها بە خۆڵی شێداریش دەگوترێ.

(ٱلسِّرَّ): دەڵێ: (السِّرُّ: مَا تَكْتُمُهُ وتخفيه، مَا يُسِرُّهُ المَرْءُ فِي نَفْسِهِ مِنَ الأُمُورِ الَّتِي تلزمُ عَلَيْهَا)، (سر) ئەوەیە کە پەنهانی دەکەی و دەیشاریەوە، ئەوەیە کە مرۆڤ لە دڵی خۆیدا پەنهانی دەکات، لەو کارانەی کە پێویستە بیانکات، بەڵام پەنهانیان دەکات و بۆ خەڵکیان دەرنابڕێ.

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

سەرەتا دەڵێین: ئەم هەشت (٨) ئایەتە، بێگومان چەند مانایەکی زۆر گەورەو گرنگ دەگرنە خۆیان، هەر بۆیەش وەک لە بەسەرهاتی مسوڵمان بوونی عومەردا خوای لێ ڕازی بێ، باسمان کرد، کە ئەم ئایەتانە دەخوێنێتەوە، (وا پێدەچێ ئەم هەشت ئایەتە بووبن)، زۆر توند عومەر ڕادەچڵەکێنن و لە خەوی بێ ئاگایی نێو شیرک و کوفر بە خەبەری دێنن و، دەزانێ کە ئەو فەرمایشتە لە توانای مرۆڤدا نیە، شتی وا بڵێ، وەک لە بەسەرهاتەکەیدا پێشتر باسمان کرد، ئنجا با تەماشا بکەین مانای گشتیی ئەم هەشت ئایەتە چۆنە؟

سەرەتا خوا ﷻ وەک سەرەتای هەموو سووڕەتەکان بێجگە لە سووڕەتی **(التوبة)** دەفەرموێ: (**بِسمِ الله الرحمن الرحيم**)، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: ئەم کارە دەست پێدەکەم، یان دەست پێکردنی ئەم کارەم، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندەیە، کە ئەویش دەبێ مرۆڤ چەند مەبەستێک لە دڵ بگرێ:

**١)**- ئەو کارە بە ناوی خواوە دەکەم.

**٢)**- ئەم کارە بۆ خوا دەکەم.

**٣)**- ئەم کارە بە پێی بەرنامەی خوا دەکەم.

**٤)**- ئەم کارە بە پێی تواناو بڕستێک کە خوا پێی داوم دەیکەم، نەک بە شان و شەوکەتی خۆم.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ طه ﴾، کە دیارە ئەمانە دوو پیتن: کە پیتی **(طا)**و پیتی **(ها)**ن، ئەمە ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانە، هەروەک سووڕەتی: ﴿ يسٓ ﴾،

هەروەها سووڕەتەکانی: ﴿ حمٓ ﴾ەکان، کە ئێمە لە سەرەتای سووڕەتی (یونس)دا، زۆر بە تەفصیلْ باسی ئەو پیتە پچڕپچڕانەمان کرد، کە لە سەرەتای بیست و نۆ (٢٩) سووڕەت، لە سووڕەتەکانی قورئان هاتوون، ئەوەی لەوێ گوتوومانە: پێویست بە دووبارە کردنەوە ناکات، گرنگ ئەوەیە لێرەدا خوا ﷻ ئەم سووڕەتە بەو دوو پیتە دەست پێدەکات: ﴿ طه ﴾.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لِتَشْقَىٰٓ ﴾، قورئانمان بۆیە دانەبەزاندۆتە سەرت کە نارەحەت ببی، ماندوو ببی، بەد بەخت ببی، ژین تاڵ ببی، ئنجا لە هەندێک لە بەسەرهاتاندا هاتوە، کە کافرەکان گوتوویانە: پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی کە خوا کردوویەتی بە پێغەمبەر ﷺ، بەردەوام شە و نوێژ دەکات و، زۆر عیبادەت دەکات و، لە دەوری کەعبە ماندوو دەبێ، بە شەو و بە ڕۆژ، گوتوویانە: موحەممەد ئەو ئایینەی کە بۆی هاتوە، بۆتە مایەی گرفتاریی و نارەحەتیی و سەغڵەت بوونی، خوا ﷻ بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوەو دەفەرموێ: قورئانمان بۆ ئەوە دانەبەزاندۆتە سەر تۆ، کە نارەحەت بی و گرفتارو بەدبەخت بی، ئەوە واتایەکی.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە، کە پەیوەندیی بەوەوە نەبێ کە خەڵک چی گوتوە؟ بەڵکو خوا ﷻ وەک ڕاستییەکی مەزن دەفەرموێ: قورئانمان بۆ نارەحەت بوونی تۆ، هەروەها نارەحەت بوون و گرفتار بوونی ئەوانەی کە شوێن تۆ دەکەون، دانەبەزاندوە، ﴿ إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ﴾، واتە: قورئانمان دانەبەزاندوە، مەگەر بیر خەرەوە بێ بۆ کەسێک کە بترسێ، لە چی بترسێ؟ بێگومان لە سزای خوا بترسێ و، سام و هەیبەتی هەبێ بەرانبەر بە خوا، شەرم و شکۆی هەبێ بەرانبەر بە خوا ﷻ، واتە: تەنیا بۆ ئەوە دامانبەزاندوە: ئەو ڕاستییانەی کە لە خواڕسک و زگماکی مرۆڤەکاندا هەن، بیریان بخاتەوە، بەڵام کەسێکیش ئەوانەی دەکەوێتەوە بیر کە خوا ﷻ بناسێ و، بزانێ خۆی و ئەو بوونەوەرو دەورووبەرە، ئەو گەردوونە بێ خاوەن نیە.

﴿ تَنزِيلًا مِّمَّنۡ خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلۡعُلَى ﴾، ئەم کتێبە دابەزاندنەکەی لە لایەن کەسێکەوەیە، کە زەوی و ئاسمانە بڵندەکانی هێناوەنە دی، لێرەدا دوای ئەوەی کە ئامانجی دابەزێنرانی قورئان دەخاتە ڕوو، ئنجا سەرچاوەی لێوە هاتنە خوارەوەی قورئان و، ئەو زاتەی کە دایبەزاندوە، دەست دەکات بە پێناسەی، دەفەرموێ: ئەو زاتە بەدیهێنەری زەوی و ئاسمانە بڵندەکانە.

﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴾، میهرەبانە و خاوەن بەزەیی بێ سنوورەو، چۆتە سەر عەرش بەو شێوەیەی کە بۆ خوا شایستەیە، کە بێگومان لێرەدا مەبەستی پێ ئەوەیە کە خوا گەردوونی خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆی، هەڵبەتە من ناڵێم: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ ٣﴾یونس، یان: ﴿عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴾، تەنیا مەبەستەکەی ئەوەیە، بەڵام بێگومان ئەوەش دەگرێتەوە، کە خوا ﷻ لەسەر عەرش و بارەگای خۆیەوە سەرپەرشتی بوونەوەر دەکات و، لە ژێر ڕکێفی وی دایەو، بەو شێوەیەی کە حیکمەتی دەیخوازێ، ئیدارەی گەردوون دەکات و سەرپەرشتیی دەکات.

﴿ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَمَا تَحۡتَ ٱلثَّرَىٰ ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و، هەرچی لە زەوی و، هەرچی لە نێوانیاندا هەیەو، هەرچی لە بن گڵی شێداریشدا هەیە، هەمووی هی ئەوە، واتە: خاوەندارێتیی ڕەهای هەیە، بۆ خوارەوەی دروستکراوەکان و بۆ سەرەوەی دروستکراوەکان، بۆ ئەوەش کە دەکەوێتە نێوانیانەوە، بۆ ئەوەش کە پەنهانە.

لێرەدا خوا دوای ئەوەی باسی بە دیهێنەرایەتیی خۆی کرد، ئنجا باسی بەزەیی و بەخشندەیی خۆی دەکات و، باسی ئەوە کە سەرپەرشتیی گەردوون دەکات و، دوایی باسی خاوەندارێتیی خۆی دەکات.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تَجۡهَرۡ بِٱلۡقَوۡلِ فَإِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخۡفَى ﴾، هەروەها ئەگەر تۆ قسە بە دەنگی بەرز بکەی، دەنگتی پێ هەڵبڕی، ﴿ فَإِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ

﴿وَأَخۡفَى﴾، بە دڵنیایی خوا ئەوە کە پەنهانەو، ئەوەش کە لە پەنهان پەنهانترە، ئەویش دەزانێ، (ٱلسِّرَّ)، قسەیەکە لەبەر خۆتەوە بیکەی بە چپە، بەڵام (وَأَخۡفَى) واتە: ئەوەش کە لەو پەنهانترە، کە بریتیە لەو خولیاو هەستانەی لە عەقڵ و دڵ و دەروونی مرۆڤدا هەن، کەواتە: ئەوەش باسی زانیاریی بێ سنووری خواو، ئاگاداری بێ سنووری خوایە، سەبارەت بە دروستکراوەکانی.

ئنجا دێتە سەر باسی سیفەتێکی دیکەی خواو دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، خوا، جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، ئەمیش باسی یەکتایی خواو تەنیا پەرستراوێتیی خوایە.

ئنجا دێتە سەر باسی ناوە هەرە بەرزو پەسندەکانی خوا: ﴿لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾، هەرچی ناوی هەرە چاکن، هی ئەون، واتە: ناوە هەرە چاکەکان هی ئەون، بێگومان ناو، ناونیشانە بۆ سیفەت، لەبەر ئەوەی خوا خاوەنی سیفەتە هەرە بەرزەکانە، هەروەک دەفەرموێ: ﴿وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٢٧﴾ الروم، واتە: سیفەتی هەرە بەرز لە ئاسمانەکان و زەوی دا هی خوایە، کەسێک سیفەتی هەرە بەرزی هەبن، دیارە ناوی هەرە چاکیشی هەن، کەسێکی واش، زاتێکی واش، کە تەنیا خوایە ﷻ، بێگومان جگە لە کرداری هەرە چاک و ڕێک و پڕ حیکمەت، لێی چاوەڕێ ناکرێ.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**خوا دەفەرموێ:** ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ، طه ﴾:

### شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، زۆر جاری دیكەش بەمجۆرە مانامان كردوە: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، یان: بە ناوی خوای میهرەبانی بەخشندە.

٢)- ﴿طه﴾، ئەمانە دیارە دوو پیتن، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەمە لەبەر ئەوە بووە، كە پێغەمبەر ﷺ لەسەر یەک پێ، خوا پەرستیی كردوە، بۆ ئەوەی زیاتر ملكەچیی بۆ خوا بنوێنێ، خوا فەرموویەتی: (طَأْ ها)، یانی: پێت بخەرە سەر زەوی، واتە: هەردووک پێت! بەڵام بەڕاستیی ئەوانە هیچ بەڵگەیەكی وایان بە دەستەوە نیەو، بە عەقڵ و سەلیقەی خۆیان، ئەم مانایەیان داتاشیوە، مانای ڕاست هەر ئەوەیە كە ﴿طه﴾، هەروەک: ﴿يسٓ﴾ و ﴿حمٓ﴾، وەک باقی ئەو پیتە پچڕپچڕانەی كە لە سەرەتای ئەو بیست و نۆ (٢٩) سووڕەتەی لە قورئاندا هاتوون، كە بە زۆریش وایە، بە دوای ئەو پیتە پچڕپچڕانەدا، باسی قورئان كراوە، چونكە ئەوە ئاماژەیە بۆ ئەو قورئانەی كە ئێوەی مرۆڤ و جند لە بەرانبەریدا دەستە پاچەن و، ناتوانن نەک قورئانێكی وا، بەڵكو دە (١٠) سووڕەت و، بگرە سووڕەتێكی واش بێنن، ئەو قورئانە هەر لەو پیت و لەو دەنگانە پێک هاتوە، كە ئێوە بەكاریان دێنن، بەڵام خوا ﷻ ئەو فەرمایشتەیەی، ئەو موعجیزەیەی لێ پێكهێناون، كەواتە: بزانن ئەو كەرەستەیە لە بەر دەستی ئێوەش دا هەیە، بەڵام خوا ﷻ بەو كەرەستەیە كتێبێكی پەیدا كردوە، كە فەرمایشتەكەی خۆیەتی، كە ئێوە ناتوانن وەک ئەوە بێنن، كەواتە: بزانن سەرچاوەی هاتنی ئەو قورئانە، ئەو فەرمایشتە بەرزو ناوازەیە، خوای بێ وێنەیە ﷻ.

**مەسەلەی دووەم:**

**حیکمەت و ئامانجی دابەزێنرانی قورئان، ناڕەحەت کردن و سەغڵەت کردن نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە: بە ختەوەرکردن و بیرخستنەوە و هۆشیارکردن و بێدارکردنەوەیە بۆ مرۆڤەکان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ ٢ إِلَّا تَذۡكِرَةٗ لِّمَن يَخۡشَىٰ ٣﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:**

١)- ﴿مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ﴾، قورئانمان بۆیە دانەبەزاندۆتە سەر تۆ، تاکو ناڕەحەت و ماندوو و سەغڵەت ببی و، تووشی ژین تاڵیی ببی.

وشەی (الشَّقَاءُ) وەک پێشتر باسمان کرد، هەم بە مانای بەدبەختیی دێ، هەم بە مانای ناڕەحەتیی و گرفتاریی دێ، هەم بە مانای ماندوو بوون دێ، هەم بە مانای بێ مرادیی دێ، چونکە (شقاء)، پێچەوانەی (سعادة)ە، (سعادة)یش، واتە: بەختەوەریی و بە ئامانج گەیشتن، بە مراد گەیشتن، (شقاء)یش واتە: ناڕەحەتیی و بێ مرادیی و ماندوو بوون، واتە: قورئانمان بۆیە دانەبەزاندۆتە سەر تۆ، ببێتە مایەی ناڕەحەتیی و گرفتاریی و ماندوو بوون و بێ مرادییت.

٢)- ﴿إِلَّا تَذۡكِرَةٗ لِّمَن يَخۡشَىٰ﴾، قورئانمان نەناردۆتە خوار، مەگەر بۆ ئەوە کە بیر خەرەوە بێ بۆ کەسێک بترسێ، ئەم ڕستەیە، شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: (**إستثناء مُفرّغٌ من أحوالٍ للقرآنِ مَحْذُوفَةٍ، أي: ما أنزلنا عليك القرآنَ في حالٍ منَ الأحوال، إلَّاحال تذكرة لِمَنْ يشاء**)، ئەمە لە ڕێزمانی عەرەبیی دا پێی دەگوترێ: (**إستثناءُ مُفَرَّغ**)، هەڵاواردنێکی بۆشکراو، بەتاڵ کراوە، کە مانایەکەی بەو شێوەیە: قورئانمان دانەبەزاندۆتە سەر تۆ لە هیچ حاڵێک لە حاڵەکاندا، مەگەر لە حاڵی بیر خەرەوەییدا بۆ کەسێک کە بترسێ، واتە:

تەنیا قورئانمان بە ئامانجی ئەوە دابەزاندوە، کە کەسێک بیەوێ بەرەو خوا بگەڕێتەوە، لە سزا و جەزرەبەی دادگەرانەی خوا بترسێ و، بەرەو خوا بگەڕێتەوە، ئنجا هەر کەس سام و هەیبەت و ڕێزو حورمەتی بەرانبەر خوا عزوجل هەبێ، دەبێتە هۆی بیرخستنەوەی، چی بیر دەخاتەوە؟ ئەو ڕاستییانەی کە خوا ﷻ لە خواڕسک و ناخ و ڕووحی مرۆڤدا داناون و، پێویستییان بەوە هەیە کە بیری بخرێنەوە.

هەڵبەتە: بنەما و بنچینەکانی ئەو ڕاستییانەی داناون، نەک وردەکارییەکانیان، کە پەکیان لەسەر هاتنی وەحیی کەوتوە، کەواتە: ماناکەی ئاوا لێدێتەوە:

ئێمە قورئانمان دانەبەزاندۆتە سەرت، تاکو تۆ نارەحەت ببی، گرفتار ببی، بەڵکو لە هیچ حاڵاندا دامان نەبەزاندوە، مەگەر لە حاڵی ئەوەدا کە ببێتە بیرخەرەوە بۆ کەسێک کە لە سزای خوا بترسێ.

کورتەی مانای ئەو ئایەتە دەبێتەوە بە دوو شت:

**أ)**- قورئانمان بۆیە دانەبەزاندۆتە سەر تۆ، کە تۆ لە ڕووی جەستەییەوەو لە ڕووی دەروونییەوە، ماندوو ببی و، نارەحەت ببی و گرفتار ببی، بەڵکو بە پێچەوانەوە: بۆیە دامان بەزاندوە کە بەختەوەر بی و، خۆشحاڵ بی و شادمان بی.

**ب)**- قورئانمان دانەبەزاندۆتە سەر تۆ، کە تۆ بێ مراد بی، بەڵکو بۆ ئەوە دامانبەزاندۆتە سەرت، کە تۆ بەختەوەر بی و، سەرەنجامی خێر بۆ خۆت دەستەبەر بکەی.

دیارە پێشتریش باسمان کرد کە (**تذكِرَة**)، بریتیە لە بیر خستنەوە، (**التذكِرةُ: خطُورُ المنسِيِّ بالذِّهنِ، فالحَقَائِقُ الدِّينيةُ أصولها مَرْكُوزَةٌ في الفِطَرِ**)، (**تَذْكِرَة**)، بریتیە لە شتێک لە بیر کراوە بە زەین دابێتەوەو، بیر بهێنرێتەوە، چونکە ڕاستییە ئاینییەکان، واتە: ئەو ڕاستییانەی کە بەرنامەکانی خوا دەیان هێنن، ڕیشەکانیان و بنەماکانیان لە سروشتی مرۆڤەکاندا هەن، بەڵام پێویستییان بەوە دەکات کە بیریان بخرێنەوە.

مەسەلەی سێیەم:

**پێناسەو وەسفی خوای بەرزو مەزنی دابەزێنەری قورئان، بە حەوت سیفەتی سەرەکیی: بەدیهێنەرایەتیی، میهرەبانیی، سەرپەرشتیارێتیی گەردوون، خاوەندارێتیی، زانایی و شارەزایی، یەکتایی لە پەرستراوێتییدا، خاوەنی ناوی هەرە چاک و پەسەند بوون:**

خوا دەفەرمویّ: ﴿ تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ ٱلْأَرْضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلْعُلَى ﴿٤﴾ ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ﴿٥﴾ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ ٱلثَّرَىٰ ﴿٦﴾ وَإِن تَجْهَرْ بِٱلْقَوْلِ فَإِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخْفَى ﴿٧﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴿٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ ٱلْأَرْضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلْعُلَى ﴾، وشەی (تَنزِيلًا: حَالٌ ثَانِيَةٌ مِنَ الْقُرْآن)، حاڵی یەکەمی قورئان: ئەوەیە کە قورئانمان بۆیە دانەبەزاندۆتە سەرت، کە تۆ بەدبەخت و ناڕەحەت و گرفتار ببی، بەڵکو بۆ ئەوەیە بیر خەرەوە بێ.

ئنجا حاڵی دووەمی ئەوەیە: کە ئەم قورئانە دابەزێنراوە لە لایەن کەسێکەوە کە زەوی و ئاسمانە بڵندەکانی هێناونە دی، بێگومان تایبەتمەندترین و سەرەتاییترین سیفەتی خوا ﷻ بریتیە لە بەدیهێنەرایەتیی خوا (**خالقیة الله**)، بۆیە پێش هەموو شت باسی ئەوە دەکات و خوا بەوە پێناسە دەکات، کە ئەو زاتەیە، زەمین و ئاسمانە بڵندەکانی خوڵقاندوون، بۆیەش زەمین پێش دەخات، چونکە بە نسبەت ئێمەی مرۆڤەوە، زەمین لە ئاسمانەکانیش گرنگترە، چونکە لێرە (لە زەوی دا) دەژین و، لێرەش (لە زەوی دا) دەمرین و، لێرە (لە زەوی دا) پەیدا دەکرێینەوە، وەک خوا فەرموویەتی:

﴿ مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ ۝٥٥ ﴾، طه.

ئەگەرنا بێگومان زەمین لە چاو گەردوون، شتێکی زۆر بچووکە، وەک لە تەفسیری سوورەتی (**یونس**)دا باسێکمان دەربارەی گەردوون کردوەو، لە سوورەتی (**الأعراف**)یشداو، لە سوورەتی (**الأنعام**)یشدا[1]، کەم و زۆر باسی ئەوەمانکردوە کە زەوی یەکێکە لە نۆ (٩) خڕۆکە، کە بە هەموویان لەگەڵ خۆریشدا کۆمەڵەی خۆر پێکدێنن، خۆریش یەکێکە لە ئەستێرەکان، کە ملیۆنان ئەستێرەی دیکەی وەک ئەو هەن، لە کەهکەشانی کاکێشان داو دەوری یەک تریلیۆن (١)[12]، کەهکەشانیش لە گەردوون دا هەن! واتە: زەوی لە ڕووی قەبارەوە، زۆر شتێکی بچووکە لە چاو ئاسمانەکاندا.

**٢)**- دووەم سیفەت کە خوا دەیکاتە پێناسە بۆ خۆی، وەک دابەزێنەری قورئان، دەفەرموێ: ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴾، ئنجا وشەی: ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴾یش، لێرەدا، یان (خبر)ەو، (**مبتدأ**)کەی قرتێنراوە، (**خبر مبتدأهُ مَحْذوفٌ، أي: هو الرحمن**)، یاخود (مبتدأ)ەو (خبر)ەکەی لە دوایی دێ، کە بریتیە لە چی؟ ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴾، ئەوە (**مبتدأ**)یە و ﴿ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴾، ئەوە (خبر) ەکەیەتی، واتە: خوا خاوەن بەزەیی بێ سنوورەو چووەتە سەر عەرشەکەی.

**٣)**- ﴿ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴾ چۆتە سەر عەرش، دیارە عەرش جیهانێکی زۆر مەزنە، یەکێکە لە دروستکراوە مەزنەکانی خواو، ئەو زانایانەی گوتوویانە: عەرش بریتیە لە ڕەمزو هێمای خاوەندارێتیی و دەسەڵاتی خوا، نەیانپێکاوە، چونکە خوا ﷻ زۆر بە ڕوونیی لە قورئاندا باس دەکات، کە عەرشی خوا، دروستکراوێکە هەڵدەگیرێ، بۆ وێنە:

لە سوورەتی (**غافِر**) لە ئایەتی (٧)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ ﴾، واتە: ئەوانەی کە عەرش هەڵدەگرن و، ئەوانەش کە بە دەوریەوەن، کەواتە: عەرش هەڵدەگیرێ، لە لایەن فریشتەکانەوە.

---

(١) دواتر لە هەر کام لە سوورەتەکانی: (حم، فصلت)و (الرحمن)یش کورتە باسمان لەو بارەوە کردوون.

بەڵكو لە سوورەتی (الحاقة)دا، لە ئایەتی (١٧)دا، خوا ﷻ ڕوونی دەكاتەوە، كە لە ڕۆژی دوایی دا هەشت لە فریشتەكان، یان لە كۆمەڵە فریشتەكان، عەرشی خوا هەڵدەگرن، وەك دەفەرموێ: ﴿وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ﴾، واتە: لەو ڕۆژەدا هەشت، عەرشی پەروەردگارت بەسەر سەریانەوە هەڵدەگرن، ئیدی ئەو هەشتە، هەشت كۆمەڵە فریشتەن، یان هەشت فریشتەن، یاخود هەشت دروستكراوی دیكەن، كە ئێمە نایزانین، چین! گرنگ ئەوەیە كە عەرشی خوا دروستكراوێكەو، هەڵدەگیرێ و فریشتەكان بە دەوریەوەن، ئەمیش وەسف و سیفەتی سێیەم.

٤)- سیفەتی چوارەم كە خوا ﷻ دەیكاتە پێناسە بۆ خۆی، دەفەرموێ: ﴿لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا﴾، هەرچی لە ئاسمانەكاندا هەیەو، هەرچی لە زەویدا هەیەو، هەرچی لە نێوانیاندا هەیە، هەمووی هی خوایە.

٥)- ﴿وَمَا تَحۡتَ ٱلثَّرَىٰ﴾، هەروەها هەرچی لە ژێر گڵی شێداریشدا هەیە، (الثَّرَى) یان بە مانای خۆڵ و گڵ دێ، یان بە مانای گڵی شێدار دێ، هەمووی هی خوایە، ئەمەش باسی خاوەندارێتیی ڕەهای خوایە بۆ هەموو شتێك كە لە گەردوون دایە، بە سەرووی و، خوارووییەوە.

٦)- ئنجا دێتە سەر باسی سیفەتی پێنجەم، وەك خۆ ناساندنی بە ئێمە، وەك دابەزێنەری قورئان: ﴿وَإِن تَجۡهَرۡ بِٱلۡقَوۡلِ﴾، تۆ ئەگەر دەنگ هەڵێنیی بە قسە، دەڵێ: (**الجَهْرُ: العَيَانُ، جَهَرَ بالقَولِ: رَفَعَ بِهِ صَوته، وَإِجْهَارُ الكَلَامِ: إِعْلَانُهُ**)، ﴿وَإِن تَجۡهَرۡ بِٱلۡقَوۡلِ﴾، ئەگەر تۆ دەنگ هەڵێنی بە قسە، قسە بە دەنگی بەرز بكەی، چونكە (**جَهَرَ بالقَولِ**)، دەنگی پێ بەرز كردەوە، (**وَإِجْهَارُ الكَلَامِ**)، واتە: ئاشكرا كردنی قسەكە، ئەگەر تۆ قسە دەنگی پێ بەرز بكەیتەوە، (یاخود بە دەنگی پەنهان بیكەی).

٧)- ﴿فَإِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخۡفَى﴾، بە دڵنیایی ئەو (خوا) پەنهان و لە پەنهانیش پەنهانتر دەزانێ، (**السِّرُّ وَأَخْفَى مِنَ السِّرِّ، فِي الأَحْوَالِ الَّتِي يَجْهَرُ فِيهَا القَائِلُ بالقَوْلِ لِإِسْمَاعِ مُخَاطَبِهِ**)، بە دڵنیایی خوا پەنهان دەزانێ و، لە پەنهان پەنهانتریش دەزانێ، یاخود دەنگی چپە

دەزانێ، یاخود دەنگی سرکە سرک و چپەش دەزانێ، وێڕای ئەوەی کە دەنگی بەرز دەبیستێ و، لەوەش پەنهانتر دەزانێ، کەواتە: خوا زانیاریی و شارەزایی و ئاگاداریی ڕەهای هەیە بە دروستکراوەکانی خۆی.

٨)- ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، خوا جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، (ٱللَّهُ) دیسان یان گوزارە (خبر)ە، (هُوَ) نیهاد (مُبْتَدأ)ەکەیەتی، یاخود (ٱللَّهُ) نیهاد (مُبْتَدأ)یە، (لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ) دەبێتە گوزارە (خبر)ی، خوا، جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، ئەمیش سیفەت و وەسفی شەشەم.

٩)- ﴿لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾، هەرچی ناوی هەرە چاکن، هی ئەون، ئەمیش سیفەت و وەسفی حەوتەم، وشەی (**ألله**)، کە بە کوردیی دەڵێین: (خوا)، ناوی (عَلَم)ە، بەڵام ئەوانی دی هەموویان سیفەتن، بەڵام کاتێک بۆ خوا بەکاردەهێنرێن، پێیان دەگوترێ: ناوەکانی خوا (**أسماء الله**)، دەشگونجێ بڵێین: ئەمانە هەموویان وەسفی خوای پەروەردگارن، سیفەتی خوان، تەنیا ناوی خوا کە پێی دەناسرێ، بریتیە لە (**ألله**)، بەڵام (**الرّحمان**)یش، هەر ناوی خوایە، وەک خوا دەفەرمووێ:

﴿قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾الإسراء.

واتە: بڵێن: (ٱللَّهَ) یان (ٱلرَّحْمَٰنَ) هەر کامێکیان بڵێن، خوا خاوەنی ناوە هەرە چاکەکانە، کە ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٨٠﴾﴾، بە درێژیی باسی ناوەکانی خوای پەروەردگارمان کردووە، لە چەند شوێنێکی قورئانیش دا باسی سیفەتەکانیمان کردوە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێزان!

ئەم دەرسەمان چل و حەوت (٤٧) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٩ - ٥٥) کە لەو چل و حەوت ئایەتەدا، باسی دوو قۆناغی گرنگ لە ژیان و بەسەرهاتی مووسا و هاڕوونی برای (علیهما السلام) کراوە، کە بریتین لە:

١)- هەڵبژێردرانی مووسا بە پێغەمبەر لە کاتی گەڕانەوەیدا، لە مەدیەن، بەرەو میسڕو، داواکردنی لە خوا کە هاڕوونی برایشی بکاتە پێغەمبەرێکی پاڵپشتی و، ئامادەو تەیارکردنیان بەرەو لای فیرعەون و دارو دەستەکەی، کە ئەمە ئایەتەکانی: (٩ - ٤٦)ی گرتوونەوە، یانی: سی و هەشت (٣٨) ئایەت.

٢)- چوونیان بۆ لای فیرعەون و، گەیاندنی پەیامی خوا پێی و، مشت و مڕیان لەو بارەوە، کە ئەمیش ئایەتەکانی: (٤٧ - ٥٥) دەگرێتەوە، یانی: نۆ (٩) ئایەت.

دیارە لەمیانی ئەوەشدا خوا ﷻ ژمارەیەک لە چاکەو نیعمەتەکانی خۆی دەخاتەوە یادی مووسا، کە حەوت یان هەشتن و، لە کاتی خۆیدا باسیان دەکەین لە تەفسیری ئەم ئایەتانەدا، بەڵام شوێنی باسکردنی تێرو تەواو لەو بارەوە، وەک پێشتریش گوتمان: سەرەتای سوورەتی (**القصص**)ە.

﴿ وَهَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿٩﴾ إِذۡ رَءَا نَارٗا فَقَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِقَبَسٍ أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى ﴿١٠﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ ﴿١١﴾ إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ﴿١٢﴾ وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴿١٣﴾ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴿١٤﴾ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخۡفِيهَا

لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا تَسْعَىٰ ﴿١٥﴾ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَن لَّا يُؤْمِنُ بِهَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَتَرْدَىٰ ﴿١٦﴾ وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَا مُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّأُ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَآرِبُ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ قَالَ أَلْقِهَا يَا مُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلْقَاهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ﴿٢٠﴾ قَالَ خُذْهَا وَلَا تَخَفْ ۖ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا الْأُولَىٰ ﴿٢١﴾ وَاضْمُمْ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ آيَةً أُخْرَىٰ ﴿٢٢﴾ لِنُرِيَكَ مِنْ آيَاتِنَا الْكُبْرَى ﴿٢٣﴾ اذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي ﴿٢٦﴾ وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا قَوْلِي ﴿٢٨﴾ وَاجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي ﴿٢٩﴾ هَارُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي ﴿٣٢﴾ كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا ﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا ﴿٣٥﴾ قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَا مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰ ﴿٣٧﴾ إِذْ أَوْحَيْنَا إِلَىٰ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰ ﴿٣٨﴾ أَنِ اقْذِفِيهِ فِي التَّابُوتِ فَاقْذِفِيهِ فِي الْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ الْيَمُّ بِالسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّي وَعَدُوٌّ لَّهُ ۚ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِي ﴿٣٩﴾ إِذْ تَمْشِي أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُ ۖ فَرَجَعْنَاكَ إِلَىٰ أُمِّكَ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ۚ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا ۚ فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِي أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَا مُوسَىٰ ﴿٤٠﴾ وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي ﴿٤١﴾ اذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِآيَاتِي وَلَا تَنِيَا فِي ذِكْرِي ﴿٤٢﴾ اذْهَبَا إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ قَالَا رَبَّنَا إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَا أَوْ أَن يَطْغَىٰ ﴿٤٥﴾ قَالَ لَا تَخَافَا ۖ إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾ فَأْتِيَاهُ فَقُولَا إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ۖ قَدْ جِئْنَاكَ بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكَ ۖ وَالسَّلَامُ عَلَىٰ مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَىٰ ﴿٤٧﴾ إِنَّا قَدْ أُوحِيَ إِلَيْنَا أَنَّ الْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَا مُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَىٰ كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ قَالَ فَمَا بَالُ الْقُرُونِ الْأُولَىٰ ﴿٥١﴾ قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَابٍ ۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ ﴿٥٣﴾ كُلُوا وَارْعَوْا أَنْعَامَكُمْ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّأُولِي النُّهَىٰ ﴿٥٤﴾ مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴿٥٥﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئایا هەواڵی بەسەرهاتی مووسات بۆ هاتوە؟ ﴿٩﴾ کاتێک (لە دوورەوە) ئاگرێکی دی، ئنجا بە خێزانی گوت: لێرە بوەستن! من ئاگرێکم بەدی کردوە (دەچم) بەڵکو بزووتێکتان لێی بۆ بێنم (بۆ ئاگر کردنەوەو گەرم بوونەوە) یان لەسەر ئاگرەکە (خاوەن) ڕێنماییەک ببینم (ڕێمان پێشان بدات) ﴿١٠﴾ ئنجا کاتێک هاتە لای (ئاگرەکە) بانگ کرا: هۆ مووسا! ﴿١١﴾ بە دڵنیایی من پەروەردگارتم، ئنجا چونکە تۆ لە شیوی پاکی طووا دای، پێڵاوەکانت دابنێ ﴿١٢﴾ هەروەها من (بۆ پێغەمبەرایەتیی) هەڵم بژاردووی، دەجا گوێ بۆ ئەوە ڕادێرە کە بۆت سروش دەکرێ ﴿١٣﴾ مسۆگەر من خوام، جگە لە من هیچ پەرستراوێک(ی ڕاستەقینە) نیە، هەر من بپەرستەو، نوێژ بۆ یادکردنم بەرپا بکە ﴿١٤﴾ بێگومان کاتی دیاریکراو (ی ئاخیر زەمان) دێ، نیزیکە (لە خۆشم) پەنهانی بکەم، تاکو هەر کەسە بە پێی ئەو کۆششەی کردوویەتی، سزاو پاداشت بدرێتەوە ﴿١٥﴾ ئنجا با هەرگیز بابایەک کە بڕوای پێی نیەو شوێن ئارەزووی کەوتوە، تۆ لێی (لە بڕوا پێهێنانی) لانەدات، (ئەگەرنا) دەفەوتێی، هەڵدەدێرێی ﴿١٦﴾ هۆ مووسا! ئەوەش کە بە دەستی ڕاستتەوەیە چییە؟ ﴿١٧﴾ (مووسا) گوتی: ئەوە گۆچانەکەمە، خۆمی دەدەمە سەرو، گەڵای درەختی بەسەر مەڕەکانم دا پێ دەوەرێنم و، چەندان پێویستی دیکەشم پێینی ﴿١٨﴾ (خوا) فەرمووی: ئەی مووسا بیهاوێ ﴿١٩﴾ ئنجا کە هاویشتی، یەکسەر بوو بە مارێک(ی زەبەلاح) کە بە خێرایی دەڕۆیی ﴿٢٠﴾ (خوا) فەرمووی: بیگرەو مەترسە، دەیگێڕینەوە بۆ شێوە و حاڵەتی یەکەمی ﴿٢١﴾ (هەروەها خوا بە مووسای فەرموو:) دەستیشت بخە بن باڵت (دوایی دەری بێنە) بەبێ هیچ نەخۆشیی و خراپیەک بە سپیەتیی

(وبە درەوشاوەیی) دێتە دەرێ، ئەمیش نیشانەیەکی دیکەیە ﴿٢٢﴾ (بۆیە ئەوەمان کرد) تاکو لە نیشانەو بەڵگە گەورەکانمانت پێشان بدەین ﴿٢٣﴾ بچۆ لای فیرعەون بێگومان ئەو (لە خوا) یاخیی بووە ﴿٢٤﴾ (مووسا) گوتی: پەروەردگارم! سینەم گوشاد (و دڵم فراوان) بکە ﴿٢٥﴾ کاریشم بۆ ئاسان بکە ﴿٢٦﴾ گرێیەکیشم کە لە زماندا هەیە، بیکەوە ﴿٢٧﴾ تاکو (زمان پاراو بم و) لە قسەم تێبگەن ﴿٢٨﴾ لە کەس و کاریشم پاڵپشتێکم بۆ بڕەخسێنە ﴿٢٩﴾ با هاروونی برام بێ ﴿٣٠﴾ پشتمی پێ قایم بکە ﴿٣١﴾ هەروەها لە کارەکەمدا بەشداری بکە ﴿٣٢﴾ تاکو زۆرت بە پاک بگرین ﴿٣٣﴾ زۆریشت یاد بکەین ﴿٣٤﴾ بە دڵنیایی تۆ بینەری ئێمەی ﴿٣٥﴾ (خوا) فەرمووی: ئەی مووسا! داواکارییەکەتت پێدرا ﴿٣٦﴾ بە دڵنیایی جارێکی دیکەش چاکەمان لەگەڵتدا کرد ﴿٣٧﴾ کاتێک ئەوەمان بۆ دایکت سروش کرد کە بۆمان سروش کرد ﴿٣٨﴾ (پێمان ڕاگەیاند:) کە کۆرپەکەت بخەرە تابووتێکەوە و فڕێبدە دەریاوە، با دەریاش بیخاتە کەنار، (کە سەرەنجام) کەسێک کە دوژمنی من و دوژمنی ویشە، دەیگرێتەوە (کە فیرعەونە)، هەروەها خۆشەویستیی تایبەتی خۆم خستۆتە سەرت (خۆشویستراوم کردووی) هەروەها وامانکرد کە لە ژێر چاودێریی مندا بە خێوو پەروەردە بکرێی ﴿٣٩﴾ (یاد بکەوە!) کاتێک خوشکت دەڕۆیشت و دەیگوت: ئایا کەسێکتان پێشان بدەم کە بە خێوی بکات! ئیدی سەرەنجام گێڕامانیەوە بۆ لای دایکت، تاکو دڵخۆش بێ و خەمبار نەبێ،هەروەها کەسێکیشت کوشت (لە (قبطي)ەکانی میسر)، بەڵام ئێمە لە خەم و پەژارە دەربازمان کردی و، بە تاقیکردنەوەی جۆراو جۆر تاقیمان کردیەوەو، ساڵانێک لە نێو خەڵکی مەدیەندا مایەوە (بە شوانیی)، ﴿٤٠﴾ پاشان ئەی مووسا! لە کاتێکی ئەندازەگیریی کراودا هاتی و، بۆ خۆمم ڕەخساندی (کە بتکەمە ڕەوانەکراو بۆ لای فیرعەون) ﴿٤١﴾ خۆت و برایەکەت بە نیشانەکانمانەوە بچن (بۆ لای فیرعەون) و، لە یاد کردنمدا سستیی مەکەن ﴿٤٢﴾ بچنە لای فیرعەون، بێگومان ئەو (لە بەرانبەر خوادا) یاخیی بووە ﴿٤٣﴾ ئنجا قسەیەکی نەرم و نیانی لەگەڵدا بکەن،

بەڵکو بیری بکەوێتەوە (کە بەندەی خوایە)، یان بترسێ ﴿٤٤﴾ (مووساو هارِوون) گوتیان: پەروەردگارمان! ئێمە مەترسیی زۆرمان هەیە کە دەست پێشخەریی لە دژماندا بکات (بە سزادان) یاخود یاخیی بێ ﴿٤٥﴾ (خوا) فەرمووی: مەترسن، بە دڵنیایی من لەگەڵتانم دەبیستم و دەبینم ﴿٤٦﴾ بچن بۆ لای پێی بڵێن: ئێمە هەردووکمان نوێنەری پەروەردگارتین، دەجا گەلی بەنی ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێرەو (چیدی) ئازاریان مەدە، بێگومان نیشانەیەکمان لە پەروەردگارتەوە هێناوە (کە ئێمە راستگۆیین)و، سەلامەتییش بۆ کەسێکە کە شوێن رێنمایی (خوا) دەکەوێ ﴿٤٧﴾ مسۆگەر ئێمە سروشمان بۆ کراوە، کە ئازارو سزا(ی خوا) دەکەوێتە سەر کەسێک کە (پەیامی خوا) بە درۆ دادەنێ و پشتی تێدەکات ﴿٤٨﴾ (فیرعەون) گوتی: ئەی مووسا! پەروەردگاتان کێیە؟ ﴿٤٩﴾ (مووسا) گوتی: پەروەردگارمان! ئەو کەسەیە کە بوونی بە هەموو شتێک بەخشیوە، پاشان رێنماییشی کردوە (چۆن بەرێوە بچێ) ﴿٥٠﴾ (فیرعەون) گوتی: ئەدی حاڵی (خەڵکی) سەدە پێشووەکان چۆنە؟ ﴿٥١﴾ (مووسا) گوتی: زانیارییان لە لای پەروەردگارمە، لە نووسینێکدا (تۆمار کراوە) پەروەردگارم نە هەڵە دەکات و، نە لە بیریشی دەچێ ﴿٥٢﴾ ئەو کەسەی زەمینی بۆ کردوونە رایەخ و رێیەکانی بۆتان تێدا داناون و، لەسەرێوە ئاوی بۆ دابەزاندوون، چەندان رووەکی جۆراوجۆرمان پێ (لە زەوی) دەرهێناون ﴿٥٣﴾ (لە بەرهەمی ئەو رووەکە) بخۆن و ئاژەڵەکانیشتان (تێیدا) بلەوەرێنن، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانە هەن بۆ خاوەن عەقڵان ﴿٥٤﴾ (ئێمە) لە وێدا (لە زەمیندا) دەرمان هێناون (ئێوەمان دەرهێناوە)و بۆ نێویشی دەتانگێرِینەوەو، جارێکی دیکەش هەر لەوێدا دەرتان دێنینەوە ﴿٥٥﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(فَقَالَ لِأَهۡلِهِ): (أَهْلُ الرَّجُلِ: مَنْ يَجْمعُهُ وَإِيَّاهُم نَسَبٌ أو دِينٌ، وَأَهْلُ الرَّجُلِ: مَنْ يَجْمَعُهُ وَإِيَّاهُم مَسْكَنٌ وَاحِدٌ... وَعُبِّرَ بِأَهْلِ الرَّجُلِ عَنِ امْرَأَتِه)، (أَهْلُ الرَّجُل) ئەهلی پیاو: ئەوەیە كە لەگەڵ وی ڕەچەڵەك یان ئاینێك كۆیان بكاتەوە، (أَهْلُ الرَّجُل)، ئەهلی پیاو: ئەوانەن كە لە ژێر سێبەری خانوویەك دا كۆببنەوە، هەروەها وشەی (أهل) بۆ هاوسەری پیاو بەكارهاتوە.

(ٱمۡكُثُوٓاْ): واتە: ڕاوەستن، چاوەڕێ بكەن، (المَكْثُ: ثَبَاتٌ مَعَ انْتِظَارٍ)، (مَكْث) ڕاوەستانە، مانەوەیە لەگەڵ چاوەڕوانییدا.

(ءَانَسۡتُ نَارٗا): واتە: ئاگرێكم بەدی كردوە، (آنَسَهُ: أي أَبْصَرَهُ، وَآنَسَ مِنْهُ رُشْدَاً عَلِمَهُ، وآنَسَ الصَّوْتَ: سَمِعَهُ، وَالإِيْنَاسُ: خِلافُ الإيحَاش)، دەگوترێ: (آنَسَ مِنْهُ رُشْدَاً)، واتە: زانی كە گەیشتۆتە حاڵەتی كامڵ بوون و سەر ڕاستیی، (آنَسَ الصَّوْتَ) دەنگەكەی بیست، (إينَاس) پێچەوانەی (إيحاش)، (الإيناس) هۆگریی و ئولفەت، (الإيحاش) واتە: گلەیی لێكردن و نامۆیی لێ كردن.

(بِقَبَسٍ): (القَبَسُ: النَّارُ أو شُعْلَةً مِنْهَا)، (قبس) بریتیە لە ئاگر، یاخود بڵێسەیەك لە ئاگر، لە ڕاستییدا (قَبَس) بە كوردیی (بزوت)ە، چونكە دەڵێ: (عُودٌ فِي رَأْسِهِ نَارٌ)، دارێكە كە سەرێكی ئاگر بێ، كە بە كوردیی پێی دەگوترێ: بزووتە ئاگر، واتە: دارێكە سەرێكی ئاگرەو، سەرەكەی دیكەشی دەگیرێ، بۆ ئەوەی ئینسان ئاگری پێ بكاتەوە.

(نَعۡلَيۡكَ): (النَّعْلُ: الحِذَاء)، واتە: دوو پێڵاوەكانت دانێ.

(ٱلۡمُقَدَّسِ): (المُقَدَّس: المُبَارَك، القُدسُ: البَرَكَة، قَدُسَ يَقْدُسُ قُدْسَاً: طَهُرَ)، (مُقَدَّس)، واتە: بە پیرۆز، (قُدس)، واتە: پیرۆز، (قَدُسَ يَقْدُسُ قُدْسَاً)، واتە: پاك بوو، پاك دەبێ،

پاکیی، کەواتە: وشەی (**مُقَدَّس**) هەم بە مانای پاککراوە دێ، هەم بە مانای بەرەکەت و بەرهەمدار دێ.

(طُوًى): (**الطَّوى: الشَّيءُ المُثَنيُّ أو المَطْوِيُّ**)، شتێکە کە دوو لا کرابێتەوە، یاخود شتێکە کە نووشتێنرابێتەوە، بەڵام (**طُوَى**) لێرەدا یانی: دوو جاران پاککراوەتەوە، یاخود ناوی چیایەکە لە (شام) یاخود دۆڵێکە لە دامێن چیای (**طور**)ەوە، کە ئەویش چیایەکە لە شام.

(فَتَرْدَىٰ): (**رَدِيَ يَرْدى رَدًى: هَلَكَ وَسقَطَ في الهُوَّة**)، (**رَدِيَ يَرْدى رَدًى**) واتە: لە بەین چوو، فەوتا، یاخود بە مانای کەوتە نێو چاڵەوە، دێ.

(أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيْهَا): واتە: خۆمی دەدەمە سەر، (**تَوَكَّأَ عَلَى العَصَى: إعْتَمَدَ وَتشَدَّدَ بِهَا**)، شوان بە زۆری وایە: بۆ ئیسراحەتی پشتی، خۆی دەداتە سەر گۆچانەکەی، یان جاری وایە کەسێک کە بە ڕێگەدا دەڕوات، گۆچانەکەی خۆی بەکاردێنێ، سەنگی دەداتە سەرێ، یان ئەوانەی کە نوقسانیی لەلاقیاندا هەیە، بۆ ئەوەی قورسایی نەگاتە سەرلاقیان، خۆیان دەدەنە سەرگۆچان.

(وَأَهُشُّ): دەڵێ: (**الهَشُّ: يُقَارِبُ الهَزَّ في التَّحْرِيكِ**)، (**هَشّ**) و (**هَزّ**) ڕاوەشاندن، لێک نیزیکن، دەگوترێ: (**هَشَّ الوَرَقَ: خَبَطَهُ بالعَصا**)، بە گۆچان گەڵای درەختانی وەراند، ئەوە پێی دەگوترێ: (**هَشّ**)، (**وَرَجُلٌ هَشُّ الوَجْه: طَلِقُ المُحَيَّا**)، پیاوێکی ڕووخۆش، پێی دەگوترێ: (**هَشُّ الوجه**)، دەشگوترێ: (**هَشّ وَبَشّ**) واتە: لە ڕووی دا کرایەوە، چۆن گەڵایەکە لێدەکرێتەوە، کەسێکیش کە ڕووی کراوەو خۆش بێ، ئەوەی بۆ بەکاردێ.

(مَـَٔارِبُ): دەگوترێ: (**أَرِبَهُ إلى كَذا أَرَباً وَأُربَةً وَإِرْبَةً وَمَأْرُبَةً: إحْتَاجَ إِلَيْهِ حَاجَةً شَدِيْدَة**)، (**أَرِبَهُ إلى كذا**) یانی: (**إحتاجَ**) چاوگەکەی (**أَرباً**)ی بۆ بەکاردێ، هەم (**أُربَةً وَإِرْبَةً وَمَأْرُبَةً**) هەموویان بە مانای پێداویستیی و ئاتاجیی دێن.

(سِيرَتَهَا ): (السِّيْرَةُ: الحَالَـةُ الَّتِي يَكُـونُ عَلَيْهَـا الإِنْسَانُ وغيره)، (سيرة) بريتيه لەو حاڵەتەی کە مرۆڤ و غەیری مرۆڤ، لەسەری دەبن، لە ئەصڵدا (سَيْر) یانی: ڕۆیشتن، ئنجا (سِيرة) واتە: چۆنیەتی ڕۆیشتن، بەڵام دوایی خوازراوەتەوە بۆ حاڵەتی چۆنیەتی مرۆڤ، جاری واشە ژیان و گوزەران بە گشتی.

(أَزْرِى): (الأَزْرُ: القُوَّةُ الشَّدِيْدَةُ، وَآزرَهُ: أَعَانَهُ وَقَوَّاهُ، وَأَصْلُهُ مِنْ شَدِّ الإِزَارِ)، (أَزرْ): بريتيه لە هێزێکی پتەو، (وآزَرَهُ): بە هێزی کرد، هاوکاریی کرد، لە ئەصڵدا وشەی (أَزْر) لە پشتێن بەستنەوە هاتوە، (إزارْ) ئینسان کە خۆی دەبەستێ، یاخود بەرگ و پۆشاکی لە خۆی دەپێچێ، لەوەوە هاتوە.

(سُؤْلَكَ ): (السُّؤلُ: مَا يُسْأَلُ والمسئولُ: وَالْمَطْلُوب)، (سُؤل) بريتيه لەوەی داوا دەکرێ، هەروەها (سُؤل) بە مانای (مَسْئول) دێ، داواکراو، واتە: داواکارییەکەت جێبەجێ بوو.

(اَلْيَمِّ): (البَحْرُ)، (يَمّ) بە مانای دەریا دێ، هەڵبەتە دەریا لە بەکارهێنانی قورئانداو لە بەکارهێنانی زمانی عەرەبییشدا، بە ڕووباری گەورەش دەگوترێ، هەروەها بە دەریای ئاساییش دەگوترێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ڕووباری نیلە، ڕووبارێکیش فراوان بێ، هەر وشەی (يَمّ) یاخود (البَحْرِ)ی بۆ بەکارهاتوە.

(بِٱلسَّاحِلِ ): (السَّاحِلُ: شَاطِئُ البَحْرِ وَالجَمْعُ: سَوَاحِل)، (ساحِل) واتە: کەنار دەریا، کە بە (سَوَاحِلْ) کۆدەکرێتەوە، واتە: کەنارەکان، یان قەراغەکان.

(يَكْفُلُهُۥ): واتە: دەیگرێتە خۆی، بە خێوی دەکات و مشووری دەخوات، دەگوترێ: (كَفَلْتُهُ كَفَالَةً: عُلْتُهُ)، واتە: سەرپەرشتییم کردو ژیاندم و بە خێوم کرد، (الكَافِلُ: الَّذِي يَعُولُ إِنْسَاناً وَيُنْفِقُ عَلَيْهِ)، (كَافِل): کەسێکە سەرپەرشتیی مرۆڤێک دەکات و، وەخۆی دەگرێ و بە خێوی دەکات.

(نَقَرَّ عَيْنُهَا): (قَرَّت العَيْنُ: قُرَّةً وَقُرُوراً: بَرَدَتْ سُرُوراً)، واتە: بە هۆی دڵخۆشییەوە چاوی سارد بوو، زانایان گوتوویانە: فرمێسکی شادیی ساردە، هەروەک فرمێسکی

خەمباریی، گەرمە، لەوەوە گوتوویانە: (**قَرَّت العين أو قرَّت عينُهُ**)، چاوی فێنک بوو، واتە: فرمێسکی شادیی پێدا هات، مەبەستیان پێی دڵخۆش بوونە.

(ٱلْغَمِّ): بە کوردییش هەر بەکاری دێنین: خەم و خەفەت، بەڵام ئێمە دەڵێین: خەم، واتە: خەفەت و دڵتەنگیی، دەگوترێ: (**غَمَّهُ الشَّيءُ غَمّاً: غَطَّاهُ، وَقِيلَ لِلْحُزْنِ: غَمٌّ، لأَنَّهُ يُغَطِّي السُّرورَ وَالحِلْم**)، (**غَمَّهُ الشَّيءُ غَمّاً**)، واتە: دایپۆشی، بۆیەش بە خەمباریی گوتراوە: خەم، چونکە دڵخۆشیی و، عەقڵ و هۆش دادەپۆشێ.

(فُتُونًا ): (**فَتَنَ المَالُ النَّاسَ فُتُونَاً: اسْتَمَالَهُم وَفُتِنَ عَنْ دِينِهِ: مَالَ**)، (**فُتُون**) دەگونجێ چاوگ بێ، دەشگونجێ کۆ بێ، ﴿ وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا ﴾، واتە: بە تاقیکردنەوە، تاقیمان کردیەوە، یان بە چەند جۆرێک تاقیمان کردیەوە، دەگوترێ: (**فَتَنَ المَالُ النَّاسَ فُتُونَاً**) واتە: ماڵ و سامان خەڵکی بە تاقیکردنەوە، تاقی کردەوە، واتە: لایدان، (**وَفُتِنَ عَنْ دِينِهِ**) واتە: لە ئاینەکەی خۆی لایدا.

(فَلَبِثْتَ ): واتە: مایەوە، (**لَبِثَ بِالْمَكَانِ: أَقَامَ بِهِ مُلازِمَاً لَهُ**)، مایەوە لەو شوێنە، ﴿ فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِيٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ﴾، واتە: چەند ساڵێک لە نێو خەڵکی مەدیەن دا مایەوە.

(وَٱصْطَنَعْتُكَ ): واتە: بۆ خۆمم بەرهەم هێنای، بۆ خۆمم دروست کردی و، پەروەردەم کردی و، مشوورم خواردی، دەڵێ: (**الصُّنْعُ: إِجَادَةُ الفِعْل...**) (**صنع**) ئەوەیە شتێک بە کارامەیی دروست بکرێ، (**والإِصْطِنَاعُ: المُبَالَغَةُ فِي إِصْلاَحِ الشَّيءِ**)، (**إِصْطِنَاع**) بریتیە لە زێدەڕۆییکردن لە چاککردنی شتێک دا.

(وَلَا تَنِيَا ): واتە: لە یادی مندا سستیی و تەنبەڵیی مەکەن، خاوو خلیسکیی مەکەن، دەڵێ: (**الوَنَى: الضَّعْفُ وَالفُتُورُ وَالكَلاَلُ والإِعْيَاء**)، بریتیە لە بێ هێزیی و سستیی و خاویی و ماندوێتیی و بڕست لێ بڕان، (**الونى: الضعف**)، (**وَنَى فِي الأَمْرِ وَنِيَاً**)، لە کارەکەدا سستیی نواند، واتە: بێ هێزیی نواند، (**فهو وانٍ**) ئەو بێ هێزو خاوو خلیچکە.

(يَفۡرُطَ عَلَيۡنَآ): (فَرَطَ عَلَيْهِ: عَجِلَ وعَدَا)، واتە: پەلەی لێکردو ستەمی لێ کرد.

(بَالُ): (القَلْبُ: مَا خَطَرَ فُلاَنٌ بِبَالِي)، واتە: فلانکەس بەسەر یادمدا نەهاتووە، (والبَالُ: رَخَاءُ النَّفْسِ) بریتیە لە حاڵ خۆشیی، (والبَالُ: الحَالُ يُقَالُ مَا بالُكَ؟) واتە: حاڵت چۆنە.

کە دەڵێ: ﴿ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلۡقُرُونِ ٱلۡأُولَىٰ ﴾، یانی: حاڵی سەدە پێشووەکان، ئەو کۆمەڵگایانەی کە لە سەدەی پێشووەکاندا ژیاون، حاڵی وان چۆن بووە؟

(وَسَلَكَ): (سَلَكَ الطَّرِيْقَ: ذَهَبَ فيهِ)، واتە: بە ڕێگایەکەدا ڕۆیی، (وَسَلَكَ الشَّيَ فِي الشَّيءِ: أَدْخَلَهُ فِيه)، خستیە نێوی و، شتەکەی خستە نێو شتەکەوە، ﴿ وَسَلَكَ لَكُمۡ فِيهَا ﴾.

(سُبُلًا): واتە: ڕێی بۆ تێدا داناون لە زەویدا، کە مەبەست پێی ڕێیە سروشتییەکانە، ئەو دابڕاوایانەی نێوان چیاکان و گردەکان، کە بەزۆریی بە هۆی جۆگەلەو ڕووبارەکانەوە، ئەو دابڕاوایانە دروست بوون، ئەگەر وا نەبووایەو ئەو دەربەندو کەلێن و شیوانە، نەبوونایە، دەبوو هەموو جارێ بەو شاخە بەرزانەدا بەسەر بکەوین.

یاخود ڕێیە ئاساییەکان کە مرۆڤەکان بۆ خۆیان دروستیان دەکەن، هەردووکیان دەگرێتەوە.

(شَتَّىٰ): (الشَتُّ: تَفْرِيقُ الشَّعْب أَشْتَاتاً: مُتَفَرِّقِينَ، شَتَّى: مُخْتَلِفَةُ الأَنْوَاعِ)، (شَتّ) بە مانای بەش بەشکردنی شتێکی کۆیە، (أَشْتَاتاً) واتە: بەش بەش، (شَتَّى) واتە: جۆرە جیاوازەکان.

(أَزۡوَٰجًا): (أَقْرَان، أَشْبَاه)، (أزواج) جاری وایە بە مانای کۆی (زوج)ە، جووتەکان، جاری واشە بە مانای ئەوانەی کە شێوەی یەکدی دەکەن، واتە: (أَصْنَافاً وَأَشْكَالاً)، ئەوانەی کە شێوەی یەکدی دەکەن، مەرج نیە جووت بن، وەک نێرو مێ، یان دوو شتی پێکەوە، بەڵکو یانی: شتە لێکچووەکان.

(﴿لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ﴾): واتە: بۆ خاوەن عەقڵان، (**النُّهَى جَمْعُ النُّهِيَة: العَقْلُ النَّاهِي عَنِ القَبَائِح، وَجَمْعُهَا: نُهَىً**)، (**نُهية**) بریتیە لە عەقڵێک کە ڕێگریی دەکات لە شتی ناقوڵا، کە بە (**نُهَی**) کۆ دەکرێتەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

پێشتر گوتمان: کە ئەم چل و حەوت (٤٧) ئایەتە، لەگەڵ چل و سێ (٤٣) ئایەتی دیکە، کە لە دەرسەکانی داهاتوودا دەیگەینێ، واتە: (٢١) لەوێ (٢٢) لەوێ، کە لە دەرسەکانی سێ و چواردا دێن، هەموویان ئەو نەوەد (٩٠) ئایەتەن، کە بۆ بەسەرهاتی مووساو فیرعەون تەرخان کراون، خوا زۆر بە وردیی قۆناغەکانی بەسەرهاتی مووسا و هارِوونی برای (سەلامی خوایان لێ بێ) لەگەڵ فیرعەون و دارو دەستەکەیدا، لە دوو توێی ئەو نەوەد (٩٠) ئایەتەدا دەخاتە ڕوو، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە بەسەرهاتی مووسامان ﷺ بۆ سێزدە (١٣) قۆناغ دابەش کردوە، کە هەشت (٨) قۆناغیان لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا ڕابردوون، لەو شەست و نۆ ئایەتەی کە باسمان کردوون، ئایەتەکانی: (١٠٣ - ١٧١) وەک پێشتر باسمان کرد، کە لە میانی تەفسیرکردنی ئەو ئایەتانەدا، هەرچی لەو بارەوە لە سوورەتەکانی دیکەش دا هاتوە، بە زۆریی هێناومانە، پێنج (٥) قۆناغەکەی دیکەش کە دەکەنە پێنج قۆناغی سەرەتای ژیان و بەسەرهاتی مووسا ﷺ لەگەڵ فیرعەون و دارو دەستەکەیدا، هەڵمان گرتوون بۆ کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (**القصص**)، چونکە لە سوورەتی (**القصص**)دا، هەندێک شت باسکراوە، کە لە هیچ کام لە سوورەتەکانی دیکەدا نەهاتوون، لە سوورەتی (**طه**)دا هەندێک شت هاتوە، هەر بیرخستنەوەی ئەوەیە کە لە سوورەتی (**القصص**)دا هاتوە، کە دیارە سوورەتی (**القصص**) پێش سوورەتی (**طه**) دابەزیوە، بۆیە ئێمە ئەو پێنج

(٥) قۆناغـەی دیکـەی ژیانـی مووسـا ﷺ هەڵدەگریـن بـۆ کاتـی تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**القصص**)و، لێـرەدا توێژینەوەیەکـی ئاسـایی لـە بـارەی ئـەو نـەوەد (٩٠) ئایەتـەوە دەکەیـن، کـە (٤٧)یـان لـەم دەرسـەدا، کـە دەرسـی دووەمـە، هاتـوون.

خـوا ﷻ ڕوو لـە پێغەمبـەری خاتـەم دەکات ﷺ پێـی دەفەرمـوێ: ﴿ وَهَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴾، ئایا بەسـەرهاتی مووسـات بـۆ هاتـوە؟ وشـەی: ﴿ وَهَلۡ ﴾، وەک دوایـی باسـی دەکەیـن لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا، لێـرەدا بـە مانـای پرسـیارکردنی ئاسـایی نیـە، بەڵکـو واتـە: بـە دڵنیایـی تـۆ بەسـەرهاتی مووسـات بـۆ هاتـوە، واتـە: بـاس و خواسـی بەسـەرهاتی مووسـات پێگەیشـتوە، چونکـە ئـەم سـوورەتە کـە چـل و پێنجـەم سـوورەتە لـە ڕیزبەندیـی دابەزینیـدا، کەواتـە: زۆر سـوورەتی دیکـەی لـە پێشـدا هاتـوون، کـە بەسـەرهاتی مووسـایان ﷺ تێـدا باسـکراوە، وەک: سـوورەتی (**القصـص**)و، سـوورەتی (**الشـعراء**)و، سـوورەتی (**النمل**)، لە هەمـوو ئەوانەدا باس و خواسـی مووسـاو هاروونـی بـرای (سـەلامی خوایـان لـێ بـێ)و، بـەنی ئیسـرائیل لـە لایـەک، هەروەهـا فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی لـە بەرانبەریانـدا، لـە لایەکـی دیکـەوە، لـە هەمـوو ئـەو سـوورەتانەی پێشـتردا بـاس و خواسـی مووسـا هاتـوە.

بۆیـە خـوا ﷻ بـە شـێوەی پرسـیار دەیفەرمـوێ، بـەڵام یـانی: بـە دڵنیایـی تـۆ بـاس و خواسـی بەسـەرهاتی مووسـات بـۆ هاتـوە.

ئنجـا لێـرەوە لـەم قۆناغـە وە دەسـت پێدەکات، کـە مووسـا ﷺ لەگـەڵ خێزانـی، لەگـەڵ هاوسـەرو منداڵەکانـی لـە مەدیەنـەوە دەگەڕێتـەوە، دەیەوێ سـەردانی میسـڕ بکاتـەوە، ئایـا دوای دە (١٠) سـاڵی شـوانییەکە بـووە، یاخـود زیاتریشـی پێچـووە، لـەو دە (١٠) سـاڵە، کـە مەرجـی لەگـەڵ خـەزووری داگرتـوە کـە دە (١٠) سـاڵ شـوانیی بـۆ بـکات، یاخـود هەشـت (٨) سـاڵ، کـە بـە تەئکیـد وا پێدەچـێ مووسـا دە (١٠) سـاڵەکەی تـەواو کردبـن، ئنجـا ئایـا دوای دە (١٠) سـاڵ بـووە ئـەو گەڕانەوەیـەی لـە مەدیەنـەوە بـۆ میسـڕ، یاخـود زیاتـری پێچـووە؟! لـە پەیمانـی کۆنـدا دەڵـێ: زیاتریـش

بووه، ئنجا لەوێوە خوا ﷻ بەسەرهاتەکەی دێنێ، وەک پێشتر گوتم: تەنیا لە سووڕەتی (**القصص**)دا ئەو قۆناغانەی پێشتر: چەوسێنرانەوەی بەنو ئیسرائیل بە دەستی فیرعەون و، سۆغرە بێگارکردنیان، پاشان مووسا ﷺ چۆن دایکی بە مەلۆتکەیی بە ئاوێی دادەداو، دوایی چۆن مووسا ﷺ کابرای (**قبطي**) بە دەست دەکوژێ و، دوایی دەچێ بۆ مەدیەن و، شوانیی دەکات؟ ئەو قۆناغانە زیاتر لە سووڕەتی (**القصص**)دا هاتوون، بۆیەش ئێمە ئەو پێنج قۆناغەی سەرەتای تەمەنی مووسا ﷺ هەڵدەگرین بۆ ئەوێ.

ئنجا دێتە سەر باسی بەسەرهاتی مووسا، لەو قۆناغەوە کە لە مەدیەنەوە گەڕاوەتەوە، ﴿ إِذۡ رَءَا نَارٗا فَقَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ ﴾، کاتێک کە ئاگرێکی بینی، لە دوورەوە بینی، بۆیە بە خێزانی گوت، یاخود بە منداڵەکانی و بە خێزانی گوت: ڕاوەستن، (واتە: تۆزێ چاوەڕێ بکەن)، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە شەو بووە، چونکە ئاگر کەم وایە بە ڕۆژ بەدی بکرێ، کەواتە: دیارە بە شەو گەڕاوەتەوە، لە تەفسیرەکاندا دەڵێ: لە شەوێکی ساردی زستانی پڕ سەرماو ڕەهێڵ و باران و تووش دا بووە، ڕێگاشیان لێ هەڵە بووە، ئەمەش هەر لە خودی ئەو ئایەتە وەردەگیرێ کە ڕێگاشیان لێ هەڵە بووە، چونکە کە دەفەرموێ: ﴿إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا ﴾، من ئاگرێکم بەدی کردوە، بۆیە وشەی (**إيناس**) بەکاردێنێ، چونکە (**أُنسٌ**) واتە: ئولفەت پێوە گرتن و دڵ پێخۆش بوون، بێگومان کەسێک لە شەوێکی ساردی زستاندا، ماڵ و منداڵی پێ بێ، ڕێی لێ تێک بچێ و باران و سەرماو ڕەهێڵە بێ، ئاگرێک بەدی بکات، بۆی دەبێتە مایەی دڵخۆشیی و ئولفەت گرتن، کە دیارە ئاوەدانییەکی لێیەو، دەچێ یان ئاگریان لێ وەردەگرێ، یاخود وێڕای ئاگر لێ وەرگرتن و بزووت لێ وەرگرتنێک، ڕێگاکەشیان لێ دەپرسێ: ڕێیەکە بە کوێ دایەو، چۆن بچنەوە سەر ڕێگا؟ ﴿لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِقَبَسٍ أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى ﴾، بەڵکو لەو ئاگرە بزووتێکتان بۆ بێنم، ئاگرێکتان بۆ لێ وەربگرم، کە مەبەست لە (**قبس**) بزووتێک، دارێکە سەرێکی ئاگرە، ﴿أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ

﴿ هُدَى ﴾، یاخود لەسەر ئاگرەکە ڕێنماییەک پەیدا بکەم، واتە: کەسانێک یان کەسێکی لێ بێ، کە خاوەن ڕێنمایی بێ، بە ڕێیە بزانێ.

﴿ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ ﴾، ئنجا کاتێک هاتە لای ئاگرەکە، بانگکرا، ئەی مووسا! هۆ مووسا! ﴿ إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ ﴾، بە دڵنیایی من پەروەردگارتم، ﴿ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ ﴾، پێڵاوەکانت دانێ، ﴿ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ﴾، تۆ لە شیوی پاک، لە شیوێکی پاککراوە دای، ﴿ طُوٗى ﴾، کە ئەو شیوە ناوی (طُوٗى)یە، ﴿ وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴾، من تۆم هەڵبژاردوە بۆ پێغەمبەرایەتیی، گوێ ڕادێرە، بۆ ئەوەی بۆت سروش دەکرێ، ﴿ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ ﴾، بە دڵنیاییەوە منم خوا، ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ ﴾، جگە لە من هیچ پەرستراوێکی دیکە نیە، ﴿ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴾، بەندایەتیی تەنیا بۆ من بکەو نوێژ بۆ یاد کردنی من بەرپا بکە.

خوا ﷻ خۆی پێ دەناسێنێ، چونکە وەک دوایی باسی دەکەین: مووسا ﷺ چووە سەلکە بزووتێک بێنێ، ئەو پەڕیش کە کەسێکی لێ بێ، لێی بپرسێ: ئەرێ ڕێیەکە بە کوێ دایە؟ بەڵێ مووسا لە ڕێی ئاسایی دەگەڕێ، کەچی خوای پەروەردگار، ڕێیەکی زۆر مەزنی پێشان دەدات، مووسا لە ڕێیەک دەگەڕێ پێیدا بچێتەوە بۆ میسر، بەڵام خوا ڕێیەکی پێشان دەدات خۆی و خەڵک و جەماوەرێک کە بە قسەی دەکەن، بەرەو خوایان بەرێو، بەرەو سەرفرازیی دنیاو دواڕۆژیان بەرێ، ﴿ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخۡفِيهَا ﴾، بە دڵنیاییەوە (ساعة) ئەو کاتە دیاریکراوەی کە گەردوونی تێدا کۆتایی دێ، ئاخیر زەمان، بە دڵنیایی دێت، ﴿ أَكَادُ أُخۡفِيهَا ﴾، نیزیکە پەنهانی بکەم، واتە: نزیکە پەنهانی بکەم لە خۆم، ئەگەرنا خوا لە غەیری خۆی پەنهانی کردوە، ﴿ لِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۢ بِمَا تَسۡعَىٰ ﴾، بۆ ئەوەی هەر کەسە بە پێی هەوڵ و کۆششەکەی خۆی سزاو پاداشت بدرێتەوە، ﴿ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنۡهَا مَن لَّا يُؤۡمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرۡدَىٰ ﴾، وریا بە! کەسێک کە بڕوای پێی نیەو، شوێن ئارەزووی خۆی کەوتوە، تۆ لانەدا لەو ڕۆژی دواییە، واتە: لە بڕواهێنان بە ڕۆژی دوایی، یاخود: بە کاتی تێکچوونی

گەردوون و ئاخیر زەمان، کە دواییش قیامەتی بە دوا دێ، ﴿ فَتَرْدَىٰ ﴾، ئەگەرنا لە بەین دەچی و دەفەوتیی، هەڵدەدێرێی.

ئنجا دوای ئەوەی خوا ﷻ ئەو ڕاستییە مەزنانەی پێ ڕادەگەیەنێ و، خۆی پێ دەناسێنێ و، باسی یەکتایی خۆی دەکات، کە دەبێ هەر ئەو پەرستراو بێ و، دوای ئەوەی فەرمانی پێدەکات بە پەرستنی و، فەرمانی پێ دەکات بە تایبەتمەندترین جۆرەکانی خواپەرستیی کە نوێژە، ئامانجی نوێژیشی بۆ دەخاتە ڕوو، کە بریتیە لە یادکردنی خوا ﷻ، ئنجا باسی ڕۆژی دوایی بە تایبەت ئاخیر زەمانی بۆ دەکات و، ڕێگرییشی لێدەکات کە کەسێک کە بڕوای پێی نیە و، شوێن ئارەزووی خۆی کەوتوە، لای بدات لە بڕواهێنان بە ڕۆژی دوایی.

ئنجا خوا ﷻ دوو بەڵگەو موعجیزەی پێشان دەدات، چونکە پێغەمبەرێک کە بە گژ فیرعەوندا بچێ، دەبێ بەڵگەی پێ بێ، پێغەمبەران ﷺ بە گشتیی موعیجزەو بەڵگەیەکیان بە دەستەوە بووە، پێی بیسەلمێنن کە پێغەمبەری خوان و ڕاستگۆن لەوەدا کە دەیڵێن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴾، ئەوەی بە دەستی ڕاستتەوەیە چیە، ئەی مووسا؟ ﴿ قَالَ هِىَ عَصَاىَ ﴾، گوتی: ئەوە گۆچانەکەمە، پێشێ وەک خودی (گۆچانەکەم) دەیناسێنێ.

ئنجا دێتە سەر باسی ئەو کارانەی کە بە گۆچانەکەی ئەنجامیان دەدات: ﴿ أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيْهَا ﴾، خۆمی دەدەمە سەرێ، یانی: خۆمی پێ بەهێز دەکەم، ﴿ وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِى ﴾، هەروەها گەڵای درەختانی پێ دەوەرێنم، بەسەر مەڕەکانم دا، ﴿ وَلِىَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ ﴾، دیسان چەندان کاری دیکەشم پێی هەن، بەو گۆچانە، هەندێک لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: دە (١٠) ئیش، هەیە دەڵێ: پازدە (١٥) ئیش، بگرە هەیە گوتوویەتی: گۆچان سەد (١٠٠) کاری پێدەکرێ، بە هەر حاڵ زۆر ئیش بە گۆچان دەکرێن، بەڵام مووسا ﷺ بە کورتیی بڕیویەتەوە، دوو کاری سەرەکیی باس دەکات، کە خۆی دەداتە سەری و، گەڵای درەختانی بۆ مەڕەکانی پێ دەوەرێنێ، بەڵام کارەکانی دی بە کۆ باس دەکات: چەندان کاری دیکەشم پێی هەن.

﴿ قَالَ أَلْقِهَا يَٰمُوسَىٰ ﴾، خوا فەرمووی: فڕێیدە ئەی مووسا، ﴿ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِىَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ﴾، فڕێیدا یەکسەر بوو بە مارێک (واتە: مارێکی زەبەلاح) حەزیاو هەژدیهایەک کە دەڕۆیی، ﴿ قَالَ خُذْهَا وَلَا تَخَفْ ﴾، فەرمووی: بیگرەو مەترسە، لە شوێنی دیکەدا هاتوە کە دەفەرموێ: مووسا ترسا و پشتی هەڵکرد، بۆیە کە لێرەدا خوا دەفەرموێ: بیگرەو مەترسە، چونکە لە شوێنی دیکەدا باسیکردوە کە ترساوە، گۆچانێک یەکسەر ببێتە حەزیایەک، ئەژدیهایەک، مارێکی گەورە، بە تەئکید لە حاڵەتێکی زۆر کت و پڕدا بووە، مووسا ؏ چاوەڕێی ئەوەی نەکردوە، بۆیە ترساوە، وەک شتێکی سروشتیی، ﴿ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ ﴾، دەیگێڕنەوە بۆ حاڵەتی یەکەمی، واتە: وەک پێشتر ببێتەوە بە گۆچانێکی ئاسایی، ئنجا ئایا لە کلکیەوە گرتوویەتی، یان لە زارییەوە گرتوویەتی، لێرەدا بەس ئەوەندە دەفەرموێ: چونکە لە (پەیمانی کۆن)دا دەڵێ: لە کلکییەوە بیگرە، کلکەکەی بگرە، بەڵام لە قورئان دا دیار نیە لە سەرییەوە گرتوویەتی، یاخود لە کلکییەوە!

﴿ وَٱضْمُمْ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ ﴾، دەستیشت کۆ بکەوە بۆ لای باڵت، (واتە: دەستی ڕاستت بخەرە بن باڵت)، ﴿ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخْرَىٰ ﴾، بەبێ ئەوەی کە حاڵەتی نەخۆشیی هەبێ، (واتە: بەبێ بەڵەکیی و کە تووشی نەخۆشییەک بووبێ)، بە حاڵەتی سپێتیی دێتە دەرێ، ئەویش نیشانەیەکی دیکەیە، دیارە حاڵەتی سپێتییەکەی وەک سوورەتی **(الأعراف)**دا باسمان کردوە، سپێتییەکی نائاسایی بووە، واتە: درەوشاوە بووە، وەک گڵۆپێکی زۆر درەوشاوەو بە شۆق، ئەگەرنا هەر سپێتیی ئاسایی، سەرنج ڕاکێش نیە، ﴿ لِنُرِيَكَ مِنْ ءَايَٰتِنَا ٱلْكُبْرَى ﴾، (بۆیە ئەو دوو نیشانەیەم پێ نیشان دای) تاکو لە نیشانە مەزنەکانی خۆمانت پێشان بدەین، بۆچی؟.

﴿ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴾، بچۆ بۆ لای فیرعەون، چونکە ئەو یاخیی بووەو، لە سنوور دەرچووە، سەرکێشیی کردوە لە بەرانبەر خوادا ﷻ.

لـە شـوێنەكانی دیكـەدا هاتـوە، كـە مووسـا ﷺ دەفەرمـوێ: نەفەرێكـم لـێ كوشـتوون، دەترسـم بمكوژنەوەو...هتـد، بـەڵام لێـرەدا تەنیـا باسـی داواكارییەكانـی مووسـا دەكات، ﴿ قَالَ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ﴾، (مووسـا) گـوتی: پـەروەردگارم! سـینەم فـراوان بكـە، سینەم گوشـاد بكـە، دڵـم بـا فـراوان و گـەورە بـێ، ﴿ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ﴾، كاریشـم بـۆ ئاسـان بكـە، ﴿ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ٢٧ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ٢٨ ﴾، گرێیەكیـش كـە لـە زمانـم دا هەیـە، بـۆم بكـەوە، تاكـو لـە قسـەم تـێ بگـەن، واتـە: زمـان پـاراوم بكـە، ﴿ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ﴾، پاڵپشتێكیشـم لـە نیزیكانـی خـۆم بـۆ برەخسـێنە، كێ بـێ ئـەو پاڵپشـتە؟ ﴿ هَٰرُونَ أَخِي ﴾، هاروونـی بـرام بـێ، ﴿ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ﴾، پشـتمی پـێ بەهێـز بكـە، بیكـە بـە هـاوكارم، ﴿ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ﴾، لـە كارم دا بەشـداری بكـە، ﴿ كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا ٣٣ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ﴾، تاكـو زۆرت بـە پـاك بگریـن و، زۆریشـت یـاد بكەیـن، ﴿ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرٗا ﴾، بـە دڵنیایـی تـۆ بینـەری ئێمـەی، واتـە: حـاڵ و باڵـمان دەبینـی، ئـاگات لێمانـە.

﴿ قَالَ قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴾، خـوا فەرمـووی: داواكارییەكـەت جێبەجـێ بـوو ئـەی مووسـا! داواكارییەكـەی مووسـا ﷺ چـوار شـت بـوون، بـەڵام خـوا دەفەرمـوێ: داواكارییەكـەت جـێ بەجـێ بـوو، پێتـدرا، ﴿ وَلَقَدۡ مَنَنَّا عَلَيۡكَ مَرَّةً أُخۡرَىٰٓ ﴾، جـاری دیكـەش ئێمـە چاكەمـان لەگـەڵ تـۆدا كـردوە، واتـە: دڵنیابـە كـە ئـەو داواكاریيانەشـت بـۆ جێبەجـێ دەبـن و پێـت دەدرێـن، چونكـە یـاد بكـەوە جـاری دیكـەش ئێمـە چاكەمـان لەگـەڵ تـۆدا كـردوە، ﴿ إِذۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴾، كاتێـك كـە سروشـمان بـۆ لای دایكـت كـرد، ئـەوەی كـە بۆمـان سروش كـرد، كـە بـە تەئكید لێـرەدا مەبەسـت لـە (**وحـي**) قسـەی پەنهانـە، كـە مەبەسـت پێـی (**إلهـام**)ە، یـانی: خسـتمانە دڵـی دایكتـەوە، یـان بـە خـەون بینیویەتـی، یاخـود بـە ئیلهـام و خورپـە خـوا خسـتوویەتە نێـو دڵـی، چـی خسـتۆتە نێـو دڵـی؟ ﴿ أَنِ ٱقۡذِفِيهِ فِي ٱلتَّابُوتِ ﴾، (كـە مووسـا كـە ئـەو كاتـە، مەلۆتكەیـەك و كۆرپەیـەك بـووە، تـازە لـە دایـك بـووە) بیخـە تابووتێكـەوە، تابـووت، واتـە: سـندووق، بیخـە سـندووقێكەوە، ﴿ فَٱقۡذِفِيهِ فِي ٱلۡيَمِّ ﴾،

ئنجا سندووقەکەش بخە نێو دەریاوە، مەبەست پێی ڕووباری (نیل)ە، ﴿ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ ﴾، با دەریایەکەش، واتە: ڕووباری (نیل)یش فڕێیداتە کەنارەوە، ﴿ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّي وَعَدُوٌّ لَّهُۥ ﴾، سەرەنجام دوژمنێکی من و دوژمنێکی خۆی (کە فیرعەونە) دەیگرێتەوە، ﴿ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي ﴾، ئنجا بۆ ئەوەش کە فیرعەون و دارو دەستەکەی نەتکوژن، لە لایەن خۆمەوە خۆشەویستییم خستبووە سەرت، واتە: وام دروست کردبووی و، وام لێ کردبووی، هەر کەسێک بتبینێ بە مەلۆتکەیی، خۆشی بوێی، ﴿ وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِيٓ ﴾، هەروەها تاکو لە ژێر چاودێریی مندا تۆ دروست بی و بە خێو بکریی و پەروەردە بکرێی.

ئنجا خوا ﷻ باسی ئەوەی بۆ دەکات کە چۆن خوشکەکەی چووەو، لە ماڵی فیرعەون دەربازی کردوە و گێڕاویەتەوە بۆ لای دایکی، دەفەرموێ: ﴿ إِذْ تَمْشِيٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ﴾، یاد بکەوە! کاتێک کە خوشکەکەت دەڕۆیشت دەیگوت: ئایا کەسێکتان پێشان بدەم لە خۆی بگرێ و بە خێوی بکات و سەرپەرشتیی بکات؟ ﴿ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ﴾، سەرەنجام تۆمان گێڕایەوە بۆ لای دایکت، تاکو دڵی خۆش بێ و خەمبار نەبێ، ﴿ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ﴾، کەسێکیشت کوشت، بەڵام تۆمان لە خەم و خەمباریی دەرباز کردو، بە چەندان جۆرە تاقیکردنەوە تاقیمان کردیەوە، ﴿ فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِيٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ﴾، چەندان ساڵ لە نێو خەڵکی مەدیەندا مایەوە، ﴿ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴾، دوایی تۆ لە کاتێکی ئەندازەگیریی کراودا هاتی، ئەی مووسا ﷺ! ﴿ وَٱصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي ﴾، هەروەها من بۆ خۆمم دروست کردی، واتە: بۆ ئەرکێک هی منە، پێت دەسپێرم، بەو شێوەیە بە مەلۆتکەیی دەربازم کردی و لە ماڵی فیرعەوندا بەخێوکرای، دوایی هەرچەند نەفەرێکت لە دەست کوژراو، بەڵام دەربازم کردی، دوایی چووی ماوەیەک لە نێو خەڵکی مەدیەندا مایەوەو شوانییت کرد، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئێش و ژان و ناڕەحەتییەکانی ژیاندا، ڕووبەڕوو ببیەوە و بزانی ژیان چۆنەو، بزانی ناڕەحەتیی چۆنەو، بزانی ژیانی

خەڵكی هەژارو نەدار چۆنە؟ بەو جۆرە بۆ خۆمم پەروەردەم كردووی، چونكە كارێكی گرنگم پێتە، ئەویش ئەوەیە كە پەیامی خوا بگەیەنی بە فیرعەون و دارو دەستەكەی.

﴿ ٱذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِى وَلَا تَنِيَا فِى ذِكْرِى ﴾، ئنجا خۆت و برایەكەت بە بەڵگەو نیشانەكانی منەوە بچن و، لە یادی مندا سستیی مەنوێنن و خاوو خلیچكیی مەكەن، چونكە ئینسان ئەگەر یادی خوای هەمیشە لە دڵ دابێ، بێگومان ئەو كۆسپ و تەگەرانەی دێنە بەردەمی، لە بەرانبەریاندا بە چۆك دانایەت، ﴿ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴾، هەردووكتان بڕۆن بۆ لای فیرعەون، چونكە ئەو یاخیی بووە، لە سنوور دەرچووە، لافی پەروەردگارێتیی و پەرستراوێتیی بەسەر بەندەكانمدا لێ دەدا، ﴿ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا ﴾، قسەیەكی نەرمی پێ بڵێن، ﴿ لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴾، بەڵكو وە بیری بێتەوە، یاخود بترسێ، یان عەقڵ و هۆشی بێتەوە بیری، یاخود دڵ و دەروونی ترس و سام و هەیبەتی خوای بچێتە تێ.

﴿ قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَآ ﴾، گوتیان: ئەی پەروەردگارمان! ئێمە ترسی ئەوەمان هەیە، كە دەسپێشخەریی بكات (واتە: زوو سزامان بدات و پێشمان بكەوێ، بەرلەوەی پەیامی تۆی پێ بگەیەنین)، ﴿ أَوْ أَن يَطْغَىٰ ﴾، یاخود دوای ئەوەی كە پەیامەكەی تۆی پێ دەگەیەنین، یاخیی بێ و، لە سنوور دەربچێ، واتە: پێش گەیاندنی پەیامەكەت دەسپێشخەریی بكات بە سزادانانمان، یاخود دوای گەیاندنی پەیامەكەت، یاخیی بێ!

﴿ قَالَ لَا تَخَافَآ ﴾، خوا فەرمووی: مەترسن، ﴿ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴾، بە دڵنیاییەوە من لە گەڵتانم و دەبیستم و دەبینم، قسەی ئێوەو فیرعەونیش دەبیستم و، حاڵی ئێوەو ئەویش دەبینم، ﴿ فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ ﴾، بچن بۆ لای بڵێن: ئێمە هەردووكمان نوێنەرو ڕەوانەكراوی پەروەردگاری تۆین، ﴿ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ﴾، دەجا وەچەی ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێرە و

ئازاریان مەدە، چی دیکە، سۆغرەو بێگاریان پێ مەکە، ﴿قَدْ جِئْنَاكَ بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكَ﴾، لە پەروەردگارتەوە نیشانەیەکی مەزنمان بۆ هێناوی، ﴿وَالسَّلَامُ عَلَىٰ مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَىٰ﴾، ئەو کەسەش کە شوێن ڕێنمایی خوا دەکەوێ، هەر ئەو سەلامەتیی بۆ هەیە، ﴿إِنَّا قَدْ أُوحِيَ إِلَيْنَا أَنَّ الْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾، بە دڵنیایی ئێمە سروشمان بۆ کراوە، کە سزا لەسەر کەسێکە، پەیامی خوا بە درۆ دادەنێ و پشتی تێدەکات.

﴿قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَا مُوسَىٰ﴾، (فیرعەون) گوتی: پەروەردگاری ئێوە کێیە ئەی مووسا؟! چونکە فیرعەون خۆی گوتوویەتی: ﴿أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَىٰ﴾، من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم، بۆیە دەڵێ: ئەی مووسا! پەروەردگاری ئێوە کێیە؟ پەروەردگار، واتە: مشوورخۆرو کارسازو کارهەڵسووڕێنەر، واتە: پەروەردگار هەر منم، کێ پەروەردگاری ئێوەیە؟ ﴿قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَىٰ كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَىٰ﴾، گوتی: پەروەردگارمان ئەو کەسەیە کە بوونی بە هەموو شتێک داوەو، ڕێنماییشی کردوە، واتە: هەم لە نە بوونەوە هێناویەتە دی و، هەم دوای ئەوەی هێناویەتە دی، بەرنامەشی بۆ داناوە، چ بەرنامەیەک کە لە یاسا گەردوونییەکاندا بەرجەستەیە، چ بەرنامەیەک کە لە یاسا شەرعییەکاندا بەرجەستە دەبێ، بە نسبەت مرۆڤەکانەوە، ﴿قَالَ فَمَا بَالُ الْقُرُونِ الْأُولَىٰ﴾، (فیرعەون) گوتی: ئەدی حاڵی سەدە پێشووەکان چۆنە؟ واتە: نەمانبیستوە ئەوان: بەرنامەو پەیامیان بۆ هاتبێ، پێغەمبەریان بۆ هاتبێ، یاخود دەگونجێ فیرعەون مەبەستی ئەوە بوو بێ، لەبەر ئەوەی لێرەدا شکستی خواردوە، سەرقاڵیان بکات بە باس و خواسی لاوەکییەوە.

بەڵام مووسا ﷺ هەر زوو وەڵامی دەداتەوە، ﴿قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَابٍ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى﴾، گوتی: زانیاریی دەربارەی سەدە پێشووەکان لە لای پەروەردگارمە، لە نووسراوێکدا تۆمار کراوە، واتە: لە زانیاریی بێ سنووری خوادا تۆمار کراوە، یان: لە نووسراوێک دا تۆمار کراوە، ﴿لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى﴾،

پەروەردگارم نە لێی تێک دەچێ و، نە لە بیریشی دەچێ، نە هەڵە دەکات و نە لە بیری دەچێ.

ئنجا دێتەوە سەر باسی پێناسە کردنی خوا ﷻ، دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا﴾، (خوا) ئەو کەسەیە کە زەوی بۆ ڕاخستوون، وەک فەرشێک، وەک ڕایەخێک، بۆی ڕاخستوون، ﴿وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا﴾، چەندان ڕێی بۆ لەو زەوییەدا داناون، ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾، لە سەرێوەش ئاوی بۆ دابەزاندوون (لە شێوەی باران و بەفرو تەرزەدا)، ﴿فَأَخْرَجْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ﴾، ئنجا لە چەندان جۆرە ڕووەکی جۆرا و جۆر، لە زەوی پێمان دەرهێناوە، ﴿كُلُوا۟ وَٱرْعَوْا۟ أَنْعَـٰمَكُمْ﴾، خۆشتان بخۆن و ئاژەڵەکانیشتان بلەوەڕێنن، ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ﴾، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن، بۆ خاوەن عەقڵان، ﴿مِنْهَا خَلَقْنَـٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ﴾، لە زەوییەوە هێناومانن دی، هەر دەشتانگێڕینەوە بۆ نێو (زەوی)و، جارێکی دیکەش هەر لە زەوی دەرتان دێنینەوە، واتە: لە ڕۆژی دواییدا.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**باسی چوونی مووسا ﷺ بۆ لای ئاگرێک کە لە دوورەوە بە دی کردووە، بانگ کرانی لەلایەن خوای بێ وێنەوە، دوێنرانی و ئاگادارکردنەوەی لەوە کە کراوەتە پێغەمبەری خوای تاک، بۆیە پێویستە تەنیا ئەو بپەرستێ و، نوێژی بۆ بەرپا بکات و، ئاخیر زەمانیش هاتنی مسۆگەرە، بۆ پاداشت و سزا درانەوەی هەموو کەس و، نابێ کەسێک کە پێی بێبڕوایە و، شوێنکەوتەی ئارەزووی خۆیەتی، وای لێ بکات (واتە: وا لە مووسا بکات) کە لە بڕواهێنان بە ڕۆژی دوایی لابدا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَهَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ۝٩ إِذۡ رَءَا نَارٗا فَقَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِقَبَسٍ أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى ۝١٠ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ ۝١١ إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ۝١٢ وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ ۝١٣ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ۝١٤ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخۡفِيهَا لِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا تَسۡعَىٰ ۝١٥ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنۡهَا مَن لَّا يُؤۡمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرۡدَىٰ ۝١٦ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست و دوو بڕگەدا:

١)- ﴿ وَهَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴾، خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەدوێنێ، بە پلەی یەکەم و، لە پشت ئەویشەوە، هەموو ئەوانەی کە لە ڕێی ئەوەوە

قورئانیان پێگەیشتوە، دەفەرموێ: ئایا باس و خواسی مووسات بۆ هاتوە؟ بێگومان لێرەدا، وەک پێشتریش گوتمان: (هَلْ) هەرچەندە بۆ پرسیارکردنە، بەڵام شوێنی (قَدْ) دەگرێتەوە لە هەواڵداندا، وەک لە سەرەتای سوورەتی (الإنسان) لە ئایەتی ژمارە (١) دا کە دەفەرموێ: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا﴾، واتە: بە دڵنیایی کاتێک بەسەر مرۆڤدا هاتوە کە شایانی باس نەبووە، واتە: نەبووە و بوونی نەبووە، تاکو باس بکرێ.

بەڵێ: (هَلْ) (ئایا) بۆ پرسیارکردنە، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ نەیویستوە پرسیار لە پێغەمبەری خاتەم بکات ﷺ، ئایا هەواڵی باس و خواسی بەسەرهاتی مووسات بۆ هاتوە، یان نا؟ بۆچی؟ چونکە دەزانێ کە لە سوورەتەکانی پێش ئەم سوورەتی (طه)دا، کە چل و چوار (٤٤) سوورەتی لە پێش دا هاتوون، ئەو باس و خواسەی بۆ پێغەمبەری خاتەم ناردوە، کە سوورەتەکانی: (**الشعراء و القصص و النمل**)و، چەند سوورەتێکی دیکەش، بەسەرهاتی مووسایان تێیدا هاتوە، لە پێش ئەم سوورەتەوە هاتوون.

کەواتە: لێرەدا ﴿وَهَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ﴾، با بە ڕواڵەت ماناکەشی ئاوا بێ: ئایا بەسەرهاتی مووسات بۆ هاتوە؟ باس و خواسی سەرگوزەشتەی مووسات بۆ هاتوە؟ بەڵام لە ڕاستییدا مەبەست پێی ساغکردنەوە (**تحقیق**)ە، یانی: بە دڵنیایی بۆت هاتوە، ئنجا دێتە سەر گێڕانەوەی بەسەرهاتی مووسا عليه السلام.

**٢)**- ﴿إِذْ رَءَا نَارًا﴾، کاتێک کە ئاگرێکی بینی، وشەی (**إِذْ**) بێگومان (**ظرف**)ە، واتە: کاتێک کە کارێکی تێدا ئەنجام دەدرێ، بۆ وشەی (**حديث**) بەسەرهات، واتە: بەسەرهاتەکە ئەو کاتە بوو کە ئاگرێکی بینی بە تایبەت، مەسەلەکە لەوێوە دەست پێدەکات، کە دەفەرموێ: ﴿إِذْ رَءَا نَارًا﴾، کاتێک ئاگرێکی بینی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەو کاتەی ئاگرەکەی بینیوە، شەو بووە، چونکە لە شەودا ئاگر بەدی دەکرێ، بەڵام لە ڕۆژدا بە تایبەت لە دوورەوە، ئاگر بە زەحمەت دەبینرێ.

هەڵبەتە لە كتێبە مێژووییەكان و لە سەرچاوەكاندا هاتوە، كە مووسا ﷺ وەک دوایی لە تەفسیری سوورەتی (القصص)دا، بە درێژیی باس دەكەین، كاتێک لە مەدیەنەوە گەڕاوەتەوە، خۆی و ماڵ و خێزانی شەویان لێ بەسەردا هاتوە، ڕێیەكەشیان لێ هەڵە بووە، باران و سەرماو ڕەهێڵە بووە، سەرماشیان بووەو ڕێشیان لێ ون بووە، بۆیە كە ئاگرەكەی بەدی كردوە، هەم ئومێدی ئەوەی هەبووە بچێت بزووتێک ئاگر بێنێ و ئاگری پێ بكەنەوەو، لەو سەرمایە دەربازیان بێ و خۆیانی پێ گەرم بكەنەوە، هەم كەسێكیش لەوێ ببینێ، كە ڕێیەكەیان پێشانبداو، بێنەوە سەر ئەو ڕێیەی كە دەیانگەیەنێ، بە ئامانج، كە ئامانجەكەیان، بریتی بووە لە گەیشتن بە میسڕ.

٣)- ﴿ فَقَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ ﴾، بە خێزانەكەی گوت: لێرە بمێننەوە و ڕاوەستن.

وشەی **(أَهْلْ)** لە زمانی عەرەبییدا تەعبیری پێ دەكرێ لە ژن (هاوسەر)، بەڵام وێڕای ئەوە، بە مانای ژن و منداڵیش دێ، واتە: هاوسەرو منداڵەكان لە كوڕان و كچان.

**(الْمَكْثُ: ثَبَاتٌ مَعَ انتظار)**، **(مَكْث)** بریتیە لە مانەوە لە شوێنێک لەگەڵ چاوەڕێ كردندا، یانی: كەمێک ڕاوەستن.

٤)- ﴿ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا ﴾، من ئاگرێكم بەدی كردوە، وشەی **(ءَانَسْتُ)** بە مانای **(أَبْصَرْتُ)** بینیم دێ، بەڵام: **(الإِينَاسُ: الإِبْصَارُ البَيِّنُ الَّذِي لاَ شُبْهَةَ فِيهِ)**، (إیناس) واتە: ئەو بینینە ڕوونەی كە هیچ گومانی تێدانیە.

بەڵام وێڕای ئەوەش من وای تێدەگەم: بۆیە خوا ﷻ وشەی **(إِينـاسِ)**ی بەكارهێناوەو نەیفەرمووە: **(إِنِّي أَبْصَرتُ ناراً)**، یان **(رَأَيْتُ ناراً)**، چونكە (مووسا) بەهۆی دیتنی ئەو ئاگرەوە، ئولفەت و هۆگرییەكی بۆ پەیدابووە و، دڵخۆشیی و شادمانیی و ئومێدێكی بۆ پەیدابووە، وەک لە سوورەتی **(النور)**دا دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴾.

**(إستأناس)** کە لە **(أُنس)**ەوە هاتوە، یانی: پێش ئەوەی تۆ لە دەرگا بدەی، دەبێ حاڵیی ببی، کە ئەو ماڵەی سەردانیان دەکەی، پێی دڵخۆشن و کاتیان گونجاوە و بۆیان دەلوێ پێشوازیی بکەن، ئنجا دەڵێ: من ئاگرێکم بەدی کردوە، کە بۆتە هۆی ئولفەت و دڵخۆشییم.

٥)- ﴿لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِقَبَسٍ﴾، بەڵکو لەو ئاگرە بزووتێکتان بۆ بێنم، **(القَبَسُ: مَا يُؤْخَذُ اشْتِعَالُهُ مِنْ اشْتِعَالِ شيءٍ آخر)**، **(قَبَس)** ئەوەیە کە ئاگرێک دابگیرسێنرێ لە شتێکی دیکەدا کە داگیرساوە، کە بە کوردیی پێی دەڵێن: سەلکە بزووت، یاخود بزووت: کە بریتیە لە دارێک کە سەرێکی ئاگر بێ و سەرەکەی دیکەشی بە دەستەوە دەگیرێ بۆ ئەوەی بە کاربهێنرێ، ئەو کاتە شقارتەو چەرخ و ئەو شتانە نەبوون، کە دەستیشت نەسووتێنێ و ئاگریشی پێ بکەیەوە، بۆیە بە ناچاریی ئەگەر ویستبایان ئاگرێک بکەنەوە، دەبووایە لەو ئاگرەی کە داگیرساوە، دارێکی درێژ بێنن و، سەرێکی داگیرسێنن و سەرەکەی دیکەی بگرن، تاکو دەیگەیەننە شوێنی مەبەست.

٦)- ﴿أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى﴾، (بەڵکو لەو ئاگرە بزووتێکتان بۆ بێنم، کە لێرە ئاگرێک بکەینەوە) یاخود لەسەر ئاگرەکە ڕێنماییەک ببینم، ڕێنمایی لێرەدا، کە دەفەرموێ: ﴿أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى﴾، یانی: **(ذا هُدَىً)** کەسێک کە خاوەنی ڕێنمایی بێ، ئەگەرنا **(هُدَى)**چاوگە، نەیگوتوە: **(أَوْ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هَادِياً)** واتە: ڕێ پێشاندەر، بەڵکو دەفەرموێ: **(هُدَىً)** واتە: کەسێک کە خاوەنی ڕێنمایی بێ، خاوەنی ڕێ پێشاندان بێ، واتە: بگەمە کەسێک کە شارەزای ڕێ بێ، واتە: وێڕای ئەوەی کە ئاگر دێنم و سەلکە بزووتێک دێنم، بەڵکو کەسێکیشم لێ هەڵکەوێ، لەسەر ئاگرەکە، زۆر شارەزای ڕێ بێ.

٧)- ﴿فَلَمَّآ أَتَىٰهَا﴾، واتە: کاتێک کە هاتە لای، ڕاناوەکە بۆ ئاگرەکە دەچێ، **(فَلَمَّا أَتى النَّارَ)**، چوو بۆ لای ئاگرەکە، ئەو پێی وابوو ئاگرە، بەڵام لە ڕاستییدا ئاگر نەبوو، کە دوایی باسی دەکەین و، لە پەیمانی کۆنەوە ئەو دەقە دێنین، بەڵکو ئەوە دروویەک بووە، یاخود تووتڕکێک بووە داگیرساوە، کە لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: **(عُلَّيْقَة)**، ئنجا کاتێک مووسا چوو بۆ لای ئەو ڕۆشناییەی کە پێی وابوو ئاگرە.

٨)- ﴿نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ﴾، بانگکرا ئەی مووسا، لێرەدا بە (**مجهول الفاعل**) هێناویەتی، بانگکرا، لە لایەن کێوە بانگ کرا؟ بە تەئکید لە لایەن خواوە، بەڵام دەڵێ: (**بُنِيَ فِعْلُ النِّدَاءِ لِلْمَجْهُولِ زِيَادَة فـي التَّشْوِيْقِ إلى اسْتِطلاَعِ القِصَّة**)، بۆیە بانگکردنە بە بکەر نادیار دانراوە، تاکو زیاتر ببێتە هاندانی بابای خوێنەر، بۆ ئەوەی بزانێ ئەو بەسەرهاتە سەری بە چی دەگات و، کێ بوو بانگی مووسای کردوە؟.

٩)- ﴿إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ﴾، (ئەو بانگکەرەی کە بانگی مووسای کرد)، فەرمووی: بە دڵنیایی منم پەروەردگارت، لێرەدا مووسا ﷺ حاڵیی دەبێ کە ئەو قسەیەی لەگەڵیدا دەکرێ لە خواوەیە، چونکە قسەکردنێکی نائاسایی بووە.

زانایـان زۆریـان باسـکردوە: مووسـا ﷺ چـۆن فەرمایشـتی خـوای بیسـت، ئایـا هـەر بـە گوێیەکانـی بیسـتی، یاخـود بـە هەمـوو جەسـتەی بیسـتی، ئنجـا چـۆن دڵنیابـوو کـە ئـەوە فەرمایشـتی خوایـە، بـۆ وێنـە: قسـەی (**شـیطان**)ێک، (جند)ێـک، قسـەی کەسـێکی دیکـە نیـە؟ وەڵامەکـەی هـەر ئەوەیـە کە کاتێـک لـە لایـەن خـواوە ﷻ مرۆڤێـک حاڵیـی دەکرێ لـە شـتێک، جا ئەگـەر لـە حاڵەتـی بێداریـی دابـێ، کـە بـۆ پێغەمبـەران وەحیـی بـووەو، بـۆ دۆسـتانی خـوا ئیلهـام و خورپـەو خسـتنە دڵـە، یـان لـە حاڵەتـی خـەون دابـێ، ئـەو مرۆڤـە، ئـەو کەسـە وا حاڵیـی دەبـێ و وا دڵنیـا دەبـێ، کـە هیـچ تـەم و مـژ لـە دڵ و دەروون و عەقڵـی دانامێنـێ، کـە ئـەوە خـوا ﷻ، ئـەو شـتەی لـێ حاڵیـی کـردوە، واتـە: مووسـا ﷺ گرنـگ ئەوەیـە کـە دڵنیایـی تـەواوی بـۆ پەیـدا بـووە، کـە ئـەوە خوایـە ﷻ، ئـەو دەنگـە لـە لایـەن خواوەیـە، ئنجـا ئایـا خـوا ﷻ دەنگـی هەیـە ئـەو دەنگـەی کـە ئێمـە دەیبیسـتین؟! ئـەوەش دیسـان پێویسـت نـاکات ئێمـە زۆر بچینـە نێـو ئـەو وردەکارییـەوە، بێگومـان خـوا ﷻ هیـچ حاڵەتێکـی ماددیـی نیـە، وەک ئـەوەی کـە بـۆ ئێمـە بەرهەسـتە بـە پێنـج هەسـتەکانمان هەسـتیان پـێ دەکەیـن.

بۆیـە زانایـان گوتوویانـە: خـوا ﷻ ئـەو ڕۆشـناییەی لـەو تووترکـەدا (لـەو دڕووەدا) دروسـتکردوە، هەڵبەتـە بـە پێـی قسـەی پەیمانـی کـۆن، ئەگەرنا دەگونجـێ دەوەنێـک

بوو بێ و، دەگونجێ جۆرە درەختێکی دیکە بوو بێ، بەڵام پەیمانی کۆن دەڵێ: تووترک (عُلَّيْقَة)ێک دا، ئەو ڕۆشناییەی لەوێدا خولّقاندووە، ئاگریش نەبووە، بەڵکو تەماشای کردوە دەئایسێ و کەچی ناشسووتێ، هەروەها خوا ئەو دەنگەشی هەر لەوێ هێناوە! گرنگ ئەوەیە کە مووسا حاڵیی بووە کە ئەو دەنگە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە دێ، ئنجا ئایا هەر دەنگی خوا بووە، یاخود دەنگێک بووە، خوا دروستی کردوە؟ هەروەها ئایا مووسا هەر بە گوێی بیستوویەتی، یان بە هەموو ئەندامەکانی بیستوویەتی؟ ئەوە بەڕاستی ئەوانە هەندێ وردەکاریین کە لە دەرەوەی توانای مرۆڤن.

گرنگ ئەوەیە بزانین خوا ﷻ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾، هیچ شتێک وەک خوا نیە، هەرچی ڕواڵەتی ماددییە، ئنجا لە ڕووی دەنگەوە، لە ڕووی ڕەنگەوە، لە ڕووی بۆنەوە، لە ڕووی تامەوە، لە هەموو ئەو ڕووانەی کە پێنج هەستەکان دەرکیان پێ دەکەن، خوای پەروەردگار بەو شێوەیە نیە، چونکە خوا: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾، هەموو شتەکان دروست کراوی خوان و، شتە ماددییەکان بە پێنج هەستەکان هەستیان پێ دەکرێ، بەڵام خوا ﷻ نە وەک شتە ماددییەکانە، نە وەک شتە مەعنەوییەکانیشە، وەک دروستکراوەکانی نیە، بە هەموو جۆرو شێوەکانیانەوە[1].

١٠)- ﴿فَٱخْلَعْ نَعْلَيْكَ﴾، (خوا پێی فەرموو: منم پەروەردگاری تۆ)، پێڵاوەکانت دانێ، (الخَلْعُ: فَصْلُ شَيءٍ عَنْ شَيءٍ كَانَ مُتَّصِلاً بِهِ)، (خَلْع) دارنینی شتێکە لە شتێک، کە پێوەی پەیوەست بووە، پێڵاوەکانت دابکەنە، دایان بنێ، وشەی (نَعْل) ئێستا لە کوردییدا دەگوترێ: نەعل، واتە: دەمپایە، یان سەرپایە، ئەوەی کە بەسەر پێوە دەکرێ، بەڵام (نَعْل) لە زمانی عەرەبییدا، یانی: (حذاء) پێڵاو، نەعلیش دەگرێتەوە، یانی: سەرپایەو، پێڵاوی دیکەش بە هەموو جۆرەکانیەوە دەگرێتەوە، بۆچی خوا فەرموویەتی: پێڵاوەکانت دابنێ؟ هەندێک لە ڕوونکەرەوانی ماناو مەبەستەکانی قورئان، نازانم لە کوێیان هێناوە

---

(١) لە تەفسیری سوورەتی (القصص)دا لەو بارەوە وردەکاریی زیاترمان هێناوە.

دەڵێن: لەبەر ئەوەی کە پێڵاوەکانی مووسا لە پێستی کەرێک کە دەباغ نەکراوە، دروست کرابوون، بەڵام بە ڕاستیی ئەمە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، چونکە دوایی خوا ﷻ هۆکاری داکەندنی پێڵاوەکانی ڕوون دەکاتەوە.

١١)- ﴿إِنَّكَ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى﴾، بە دڵنیایی تۆ لە شیوی پاک و پاککراوە (**مُقَدَّس**)، دای، کە ناوی (طُوًى)یە، لەبەر ئەوەی تۆ لە شوێنێکی پاکی، پێڵاوەکانت دانێ.

(**الوَادِيُّ: المُفْرَجُ بَيْنَ الجِبَالِ وَالتِّلَالِ، المُقَدَّسُ: المُطهّر، طُوَى: اسْم الوَادِي أو اسْمٍ لِصنْفٍ مِنَ الأودية**)، (**وادي**) کە بە (**ي**) دێ، جاری واشە بەبێ (**ي**) دێ، (واد) بریتیە لە بۆشایی و کەلێنی نێوان چیاکان، یاخود گردەکان، (**مُقَدَّس**)یش واتە: پاککراوە (**مُطَهَّرْ**)، (طُوًى)ش ناوی شیوەکەیە، یاخود ناوی جۆرێک لە شیوەکانە، وەک ئەوەی پێچرابێتەوە، چونکە (**طَوَاه**)، یانی: پێچایەوە، نوشتاندیەوە.

پێم وایە[1] کە فەرمانکردنی خوا بە مووسا ﷺ کە پێڵاوەکانی دابنێ، ئەوە هیچ لەبەر ئەوە نەبووە کە هیچ بەڵگەیەک نیە کە لە چەرمی کەرێکی دەباغ نەکراو، دروست بووبن، پێم وایە لەبەر ئەوەش نەبووە کە ئەو شوێنە شوێنێکی پاک بووەو نە دەبووایە بە پێڵاوەوە پێیدا بڕوا، بەڵکو پاکیەتیی ئەو شوێنە لەو کاتەدا لەوەوە هاتوە، کە لەو کاتەدا خوا ﷻ فەرمایشتی خۆی لەو ڕۆشناییەدا بۆ مووسا دەرخستوەو، دواندوویەتی لەو شوێنەدا، واتە: پاکیی ئەو شیوە لەو حاڵەتە تایبەتەوە سەرچاوەی گرتوە، کە بریتیە لە فەرمایشتکردنی خوا لەگەڵ مووسا ﷺدا، ئەگەرنا، نە پەیوەندیی بە شوێنکەوە هەبووە، لەبەر خودی خۆی و، نە پەیوەندیی بە پێڵاوەکانی مووساشەوە هەبووە، بەو ماددەیەی کە لێی دروست کراون، بەڵکو پەیوەندیی بەو حاڵەتەوە هەبووە.

ئەوە شتێکی لۆژیکیی و مەنتیقییە، چونکە ئەگەر لەبەر شوێنەکە بووایە، ئاخر ئەو شوێنە چی لێ بووە، جگە لەوەی کە خوا لەو کاتەدا فەرمایشتی

---

(١) کە هەڵبەتە لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە، بۆیە دەڵێم: پێم وایە.

فەرمووە لەگەڵ مووسادا ؏؟ نەمان بیستوە هیچ شتێکی دیکەی لێ بوو بێ، بەڵام ئەو حاڵەتەی لێ بووە کە لەو کاتەدا خوا فەرمایشتی لەگەڵ مووسادا ؏ کردوە، کەواتە: پاکیی ئەو شوێنە لەو حاڵەتەوە هاتوە، واتە: لەبەر ئەو حاڵەتە تایبەتەی کە قسە لەگەڵ پەروەردگارت دا دەکەی، پێڵاوەکانت دابنێ، چونکە بە هۆی فەرمایشتکردنی پەروەردگارت لەگەڵتدا لەو شوێنەدا، ئەو شوێنەش بە پاک لە قەڵەم دەدرێ و، دەبێ بە پێخواسیی لە خزمەت خوای پەروەردگاردا بوەستی.

١٢)- ﴿ وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ ﴾، هەروەها من تۆم هەڵبژاردوە، دەڵێ: (**الإِخْتِيَارُ: تَكَلُّفُ طَلَبِ مَا هُوَ خَيْرٌ**)، (**إِخْتِيَار**) بریتیە لە هەوڵدان بۆ داواکردنی شتێک کە چاکە، واتە: من هەڵمبژاردووی، بۆچی هەڵیبژاردوە؟ بە تەئکید لێرە باسی نەکردوە، بەڵام ڕوونە کە: (**أَنَا آخْتَرْتُكَ لِلنُّبوَّةِ أو لِلرِّسالَةِ**) من تۆم هەڵبژاردوە بۆ پێغەمبەرایەتیی و بۆ ڕەوانەکراویەتیی.

١٣)- ﴿ فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴾، دەجا گوێ هەڵخە بۆ ئەوەی کە سروش دەکرێ، پێشتر گوتوومانە: (**الوَحِي: الكَلَامُ الخَفِيُّ**)، (**وَحِي**) واتە: ئەو قسەیەی کە بە پەنامەکیی و بە پەنهانیی بۆت دەنێردرێ، تۆ ئەوەی بۆت سروش دەکرێ، گوێی بۆ هەڵخەو ڕادێرە، ئنجا ئەم فەرمایشتە باس دەکات:

١٤)- ﴿ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ ﴾، بە دڵنیایی من خوام ﷻ، وشەی (**أَلله**) ناوی عەلەمی خوایە، واتە: ئەو ناوەی کە خوای پەروەردگاری پێ دەناسرێ، ئەگەرنا ئەوانی دیکە هەموویان سیفەتی خوان: (**الرحمان، الرحيم، العزيز، القادر، المقتدر، العليم، الحكيم، ... هتد**)، هەموویان ناسێنەری خوان، بەڵام وشەی (**ألله**) ناوی عەلەمی خوایە.

دیارە لە پەیمانی کۆندا ناوی خوا بە (**أهية**) هاتوە[1]، هەڵبەتە لە هەندێک شوێنانیش بە (**يَهْوَه**) ناوی خوا ﷻ هاتوە، هەروەک چۆن ئێستا بە ئینگلیزیی

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: ٣، ص١٣٥.

ناوی خوا (God)ی بۆ بەکاردێنن، لە فارسییدا (خُـدا)ی بۆ بەکاردێنێن، لە کوردییدا (خوا) بەکاردێ و، لە عەرەبییشدا (ألله)، لە هەر کام لە زمانەکانی دیکەشدا خوا ﷻ ناوێکی تایبەتی هەیە.

١٥)- ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠﴾، جگە لە من هیچ پەرستراوێک نیە، ئەمەش گوزارە (خبر)ی دووەمە بۆ وشەی (إِنَّ)، (إِنَّني: أنا الله)، (لاإله إلاَّ أنا) ئەمە هەواڵی دووەمە بۆ وشەی (إِنَّ)، واتە: بێجگە لە من هیچ پەرستراوێک نیە.

١٦)- ﴿فَٱعۡبُدۡنِي﴾، بمپەرستە، بەندایەتییم بۆ بکە، پێشتر گوتوومانە: (عبادة) یانی: ئەو پەڕی خۆشویستن، وێڕای ئەوپەڕی بە گەورەگرتن، وێڕای ئەو پەڕی مل بۆ کەچ کردن، وێڕای ئەوپەڕی پشت پێ بەستن، وێڕای ئەو پەری لێترسان و شەرم و سام لێکردن، بۆ خوا، کەواتە: ﴿فَٱعۡبُدۡنِي﴾ بە دڵ و بە قسەو بە کردەوە بۆ من بەندایەتیی بکە، کە وەک گوتم: بەندایەتیی وێڕای ئەوپەڕی ملکەچیی و بچووکیی نواندن لە خزمەت خوادا، ئەوپەڕی خۆشویستن و لێترسان و، بە گەورە گرتن و، پشت پێ بەستنیش دەگرێتەوە.

١٧)- ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ﴾ بۆ یاد کردنیشم نوێژ بەرپا بکە، دوای ئەوەی کە بە گشتی فەرمانی پێ دەکات خوا بپەرستێ و بەندایەتیی بۆ بکات، ئنجا فەرمانی پێدەکات بە تایبەتترین جۆری خواپەرستیی کە بریتیە لە نوێژو، ئامانجی نوێژ کردنیشی بۆ ڕوون دەکاتەوە کە بریتیە لە یادکردنی خوا، کەواتە: نوێژ، تایبەتترین جۆری خواپەرستییەو، لە ڕاستییدا لە نوێژدا خوا پەرستیی بە هەموو جۆرەکانی بەرجەستە دەبێ، هەم خواپەرستیی دڵ و دەروون و پەنامەکیی، هەم خواپەرستیی قسەو جووڵاندنی زمان و دەربڕین، هەم ملکەچی ئەندامەکان بە کردەوە، هەموویان لە نوێژدا بەرجەستە دەبن.

کە دەفەرموێ: ﴿لِذِكۡرِيٓ﴾، بۆ ئەوەی یادم بکەی، واتە: حیکمەت و ئامانجی نوێژ، بریتیە لە یادکردنی خواو باسکردنی خواو، ئاگابوون لە خوا ﷻ.

١٨)- ﴿إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ﴾، ئنجا دوای ئەوەی کە خۆی پێ دەناسێنێ و، فەرمانی پێدەکات بە بەندایەتیی، باسی ڕۆژی دوایی دەکات، دەفەرموێ: بە دڵنیایی ئەو کاتەی

کە دنیای تێدا کۆتا دێ، ئاخیر زەمان، دێ، هیچ دوو دڵیی و گومانی تێدا نیە، (**السَّاعَةُ: اسمٌ بالغَلَبَةِ عَلَى سَاعَةِ خَرَابِ الدُّنيَا أو القِيَامَة**)، وشەی (**ساعة**) واتە: کاتێکی دیارییکراو، بەڵام بووە بە ناو بۆ ئەو کاتەی کە دنیای تێدا کۆتایی دێ، واتە: ئەم گەردوونەی تێدا دەپێچرێتەوە، هەروەها جاری واش هەیە بۆ قیامەت بەکاردێ، بەڵام بە زۆریی (**ساعة**) بۆ ئاخیر زەمان و کۆتایی هاتنی ئەم ژیانی دنیایە، بەکاردێ، بەڵام قیامەت بۆ هەڵسانەوە بۆ قۆناغی دووەمی ڕۆژی دوایی، بەکاردێ.

**١٩**)- ﴿أَكَادُ أُخْفِيهَا﴾، خەریکم پەنهانی بکەم، (**أَكَادُ**) بە مانای: (**أَقترِبُ**) لێی نیزیک کەوتمەوە، دێ، (**أَكَادُ**): (**أَقْتَرِبُ**)، (**أُخفيها**): پەنهانی دەکەم، (**كَادَ**) بۆ نزیک کەوتنەوەیە لە کارێک، بەڵام ئەنجام نەدرێ، ئەگەر گوتمان: (**كَادَ المَطَرُ أنْ يَسْقُطَ**)، کەواتە: بارانەکە نەباریوە، ئەدی لێرەدا کە خوا هاتنی ئاخیر زەمان و کاتی تێدا هاتنی کۆتایی دنیای پەنهان کردوە، بۆچی دەفەرموێ: نیزیکم پەنهانی بکەم؟ لێرەدا زانایان مشتومڕی زۆریان بووە، کە ڕای ڕاستترو باشتر ئەوەیە، ڕستەی: ﴿أَكَادُ أُخْفِيهَا﴾، خەریکم پەنهانی بکەم، واتە: لە خۆشم پەنهانی بکەم، ئەوەش تەعبیرێکە لە زمانی عەرەبییدا بەکاردێ، هەڵبەتە لە خۆی پەنهان نیە، بەڵام لە غەیری خۆی پەنهانە، هەروەک لە فەرموودەکەدا کە بە فەرموودەی جیبریل (**حدیث جبریل**) ناسراوە، کاتێ جیبریل پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ دەکات (**مَتَى السَّاعَةُ**)؟ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**مَا الْمَسْئُولُ بِأَعْلَمَ بِهَا مِنَ السَّائِلِ**}[1]، پرسیار لێکراو (کە پێغەمبەرە ﷺ) پێی زاناتر نیە لە پرسیارکەر (کە جبریلە)، واتە: نە پێغەمبەری خاتەم ﷺو نە جیبریلیش کە سەرۆکی فریشتەکانە، هیچ کامیان هاتنی کاتی ئاخیر زەمان نازانن.

هەندێکیش لە شارەزایانی زمانی عەرەبیی گوتوویانە: ﴿أَكَادُ﴾ لێرەدا بە مانای (**أُرِيدُ**) دێ، یانی: ﴿أَكَادُ أُخْفِيهَا﴾، یانی: (**أُرِيدُ إخفائَها**) دەمەوێ پەنهانی بکەم، کە ئەویش ویستوویەتی و پەنهانیشی کردوە لە غەیری خۆی، بەڵام لە ڕاستییدا هەر وا ڕێکترە وشەی: (أَكَادُ)، پێویست ناکات ماناکەی بگۆڕدرێ،

---

(١) أخرجه البخاري في كتاب الإيمان، باب سؤال جبريل النبي صلى الله عليه وسلم عن الإيمان والإسلام، برقم: ٥٠، ومسلم برقم: ١٠٦.

﴿أَكَادُ أُخْفِيهَا﴾، یانی: نیزیکە کە لە خۆشمی پەنهان بکەم، هێندە مەبەستم بووە کە کەس پێی نەزانێ.

٢٠- ﴿لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا تَسْعَىٰ﴾، ئاخیر زەمان بۆچی دێ؟ کە بێگومان دوای هاتنی ئاخیر زەمان، قیامەت و هەڵسانەوەش دێ، ئەگەر (**ساعة**) لێرەدا مەبەست پێی هاتنی کۆتایی ئەم گەردوونە بێ، ئەگەرنا ئەگەر (**ساعة**) مەبەست پێی هاتنی ڕۆژی دوای بێ بە گشتی، واتە: بە قیامەت و بە هەڵسانەوەشەوە، واتە: بۆیە ڕۆژی دوایی دێ، تاکو هەر کەس بە پێی ئەوەی ئەو کۆششەی کە کردوویەتی، سزاو پاداشت بدرێتەوە، وشەی (**لِتُجْزَى**) تاکو ئێستا لە زمانی کوردییدا، وشەیەکم پێ شک نایەت کە مانای پڕ بە پێستی بگەیەنێ، چونکە لە زمانی عەرەبییدا (**جزاء**) هەم بە مانای سزا (**عقاب**) دێ، هەم بە مانای پاداشت (**ثواب**) دێ، واتە: هەم بە مانای پاداشت دانەوەی کەسێک کە چاکەی کردوە، هەم بە مانای سزادانی کەسێک کە خراپەی کردوە، بەڵام ئێمە لە زمانی کوردییدا دەبێ بڵێین: سزاو پاداشت، سزا بۆ خراپەکار، پاداشت بۆ چاکە کار، بەڵام وشەی (**جَزاء**) لە زمانی عەرەبییدا هەردووکیان پێکەوە دەگەیەنێ، دیارە بەو پێیەی کە هەردووکیان پێکەوە دەگەیەنێ وەک ئێرە، چونکە لێرەدا: ﴿لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ﴾، هەر نەفسێک، هەر کەسێک، کە هەندێ لە کەسەکان خراپەکارن و، هەندێکیش لە کەسەکان چاکەکارن، کەواتە: هەندێکیان شایستەی پاداشتن و هەندێکیان شایستەی سزان، بەڵام جاری وایە لە سیاقێکدا کە دێ، دەزانرێ کە (**جزاء**) مەبەست پێی پاداشت دانەوەی چاکەکارە، جاری واش هەیە دەزانرێ: مەبەست سزادانی خراپەکارە، بەڵام وەک گوتم: لە زمانی کوردییدا مەگەر وشەیەکی بۆ دروست بکرێ، یاخود ڕەنگە هەبێ و من نەیزانم، ئەگەرنا وشەیەکمان نیە پڕ بە پێستی (**جزاء**) بێ، بەڵکو دەبێ بگوترێ: سزاو پاداشت.

واتە: حیکمەتی هاتنی ڕۆژی دوایی بە گشتی، یاخود کاتی تێدا کۆتایی هاتنی گەردوون (ئاخیر زەمان) ئەوەیە کە هەرکەسە، بە پێی هەوڵ و کۆششی کە داویەتی، سزایان پاداشت بدرێتەوە.

٢١)- ﴿ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَن لَّا يُؤْمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ﴾، ئنجا با تۆی لێ نەدات، واتە: لە بڕوا پێهێنان بە (ساعة) تۆ لانەدا، کێ؟ ﴿مَن لَّا يُؤْمِنُ بِهَا ﴾، کەسێک کە بڕوای پێی نیە، ﴿وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ﴾، کەوتۆتە شوێن ئارەزووی خۆشی، بە تەئکید هەمیشە ئینسان کە ئیمانی نەبوو بە ڕۆژی دوایی، هەڵبەتە هەر کەس ئیمانی بە خوا نەبوو، بە ڕۆژی دواییشی نابێ، ئنجا لەو کاتەدا ڕێیی لە بەردەمدا ئاچووخ دەبێ، بۆ شوێنکەوتنی ئارەزووی خۆی، یاخود ئارەزووی جگە لە خۆی، بەڵام ئینسان بڕوای بە خوا بێ و، بڕوای بە ڕۆژی دوایی بێ، بڕوای بە سەرچاوەو سەرەتایەک بێ کە لێوەی هاتوە، کە خوایە، ﴿إِنَّا لِلَّهِ ﴾البقرة، واتە: ئێمە هی خواین، هەروەها بڕواشی بە سەرەنجام (مصير)ەکەشی بێ، ﴿وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦﴾البقرة، واتە: ئێمە بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە، بێگومان هەر کەسێک بڕوای بە خوا بێ و، بڕوای بە دیداری خوا بێ، جڵەوی نەفسی خۆی توند دەکات و، خۆی بەرهەڵدا ناکات، کە لە ڕاستییدا ئارەزووی خۆ بەرهەڵداکردن، لە ئەنجامی بێ ئیمانییەوەیە.

بۆیە یەکێک لە خوا ناسان (عاريفان) دەڵێ:

وَمَنْ أَبَاحَ النَّفْسَ مَا تَهْوَاهُ ... فَإِنَّمَا إِلَهَهُ هَوَاهُ

واتە: هەر کەسێک نەفسی چی ئارەزووی کرد، ڕێی پێبدا، ئەوە ئارەزووی خۆی کردوە بە پەرستراوی خۆی.

وەک خوا دەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ٢٣﴾الجاثية، واتە: تەماشای ئەو کەسە ناکەی، کە ئارەزووی خۆی کردوەتە پەرستراوی خۆی! نافەرموێ: کردوویەتە خوای خۆی، بەڵکو پەرستراوی خۆی، چونکە خوا ﷻ یەک زاتە، بێ وێنەیە، پەروەردگارە، بەدیهێنەرەو، هەر ئەویش شایستەی پەرستنە.

٢٢)- ﴿ فَتَرْدَىٰ ﴾، ئەگەر نا دەکەوی، یاخود بە هیلاک دەچێ و دەفەوتێی، (رَدَى، يَرْدَى، أَي: هَلَكَ)، هەروەک (رَدَى)، یانی: (سَقَطَ) واتە: لە سەرەوە کەوتە خوار، لێرەدا با ئەم دوو دەقە بێنین لە پەیمانی کۆنەوە، کە تیشکی زیاترمان بۆ دەخەنە سەر ئەوەی خوا ﷻ باسی کردوە.

هەڵبەتە ئێمە دوایی لە تەفسیری سوورەتی (القصص)دا، خوا پشتیوان بێ، وەک پێشتر باسمان کرد، ئەو پێنج قۆناغەی سەرەتایی ژیان و بەسەرهاتی مووسا عليه السلام لەوێدا بە تەفصیل باس دەکەین، هەروەک هەشت قۆناغەکەی دیکەمان لە سوورەتی (الأعراف)دا، لە کاتی تەفسیرکردنی ئەو (٦٩) ئایەتەدا کە باسکران، خستنە ڕوو:

**دەقی یەکەم:** (**فَرَجَعَ مُوسَى إِلَى يَثْرُونَ حَمِيهِ، وَقَالَ لَهُ: «دَعْنِي أَعُودُ إِلَى قَوْمِي فِي مصر لأَرَى أَمَا زَالُوا بَعْدُ أَحْيَاءً». فَأَجَابَ يَثْرُونُ مُوسَى: «اذْهَبْ بِسَلامٍ»**)[1]، ئنجا دوای چەند قسەیەک دەڵێ: (**فَأَخَذَ مُوسى إِمْرَأَتَهُ وَبَنِيهِ وَأَرْكَبَهُم عَلَى الحَمِيرِ وَمَضَى عَائِدَاً إلى أرض مِصْر، وأخذ معه عصا الله أيضاً**)، واتە: مووسا گەڕایەوە بۆ لای خەزووری (**یثرون**)و پێی گوت: لێمگەڕێ با بگەڕێمەوە بۆ لای خەڵکەکەم لە میسر، تاکو بزانم ئایا هەر زیندوون؟ (**یثرون**) وەڵامی مووسای دایەوە: برۆ بە سەلامەتیی، ئنجا دوایی دەڵێ: مووسا عليه السلام ژنەکەی و کوڕەکانی لەگەڵ خۆی بردن و سواری کەرانی کردن و ڕۆیی کە بگەڕێتەوە بۆ سەر زەمینی میسر، گۆچانەکەی خواشی لەگەڵ خۆیدا برد، (گۆچانی خوا: واتە: ئەو گۆچانەی کە خوا ﷻ دوایی بۆی دەکات بەو موعجیزەیە).

ئەمە بۆ سەرەتای ئەوە کە مووسا عليه السلام لە مەدیەنەوە بەڕێ دەکەوێ.

**دەقی دووەم:** ئنجا بۆ چۆنیەتی بینینی ئەوەی کە مووسا بە بڵێسە ئاگری تێگەشتووە، گفتوگۆ لەگەڵ کرانی لە لایەن خوای پەروەردگارەوە، هەر لە هەمان سەرچاوەدا دەڵێ:

(**وأَمَّا مُوسَى فَكَانَ يَرْعَى غَنَمَ حَمِيهِ يَثْرُونَ كَاهِنِ مِدْيَانَ، فَقَادَ الْغَنَمَ إِلَى مَا وَرَاءِ الطَّرَفِ الأَقْصَى مِنَ الصَّحْرَاءِ، حَتَّى جَاءَ إلى حُورِيبَ جَبَلِ اللهِ، وَهُنَاكَ تَجَلَّى لَهُ مَلاَكُ الرَّبِّ بِلَهِيبِ نَارٍ وَسَطَ عُلَّيْقَةٍ، فَنَظَرَ مُوسَى وَإِذَا بِالْعُلَّيْقَةِ تَتَّقِدُ دُونَ أَنْ تَحْتَرِقَ، فَقَالَ مُوسَى: «أَمِيلُ الآنَ لأَسْتَطْلِعَ هَذَا الأَمْرَ الْعَظِيمَ، لِمَاذَا لاَ تَحْتَرِقُ الْعُلَّيْقَةُ؟» وَعِنْدَمَا رَأَى الرَّبُّ أَنَّ مُوسَى قَدْ دَنَا لِيَسْتَطْلِعَ الأَمْرَ، نَادَاهُ مِنْ وَسَطِ الْعُلَّيْقَةِ قَائِلاً: «مُوسَى»،**

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح:٤٠، ص١٣٨، رِحلةُ العودة.

فَقَالَ: «هَا أَنَا»، فَقَالَ: «لاَ تَقْتَرِبْ إِلَى هُنَا: اخْلَعْ حِذَاءَكَ مِنْ رِجْلَيْكَ، لأَنَّ الْمَكَانَ الَّذِي أَنْتَ وَاقِفٌ عَلَيْهِ أَرْضٌ مُقَدَّسَةٌ)[١].

بۆیەش ئەم دەقانە دێنم لە پەیمانی کۆنەوە، چونکە لە هێڵە گشتییەکانیاندا لەگەڵ قورئاندا تێک دەکەنەوە، هەڵبەتە ئەوەی کە لەگەڵ قورئاندا تێکدەکاتەوە، دیارە ئەوە فەرمایشتی خوایە، ماوە لە پەیمانی کۆندا، ئەوەش کە تێکدەگیرێ، ئەوەیە کە گۆڕدراوەو دەستکاریی کراوە.

واتە: بەڵام مووسا کە مەڕی خەزوورەکەی (**یثرون**)ی دەلەوەڕاند، کە کاهینی مەدیان بوو، (ئەوان وشەی کاهین بە مانای (زانا)یان بەکارهێناوە، بەڵکو جاری وایە بە مانای پێغەمبەریشیان بەکارهێناوە)، مەڕەکەی لێخوڕی هەتا گەیاندیە پشت ئەو پەڕی بیابان، تاکو هاتە لای حوریب (**جبل الله**) چیای خوا، (دەبێ مەبەستی پێی کێوی (**طور**) بێ، ئەو چیایەی کە مووسا گفتوگۆی لەسەر کردوە، لە خزمەت خوادا)، لەوێ فریشتەی پەروەردگار بە بڵێسەیەکی ئاگرەوە لە نێوە ڕاستی دڕووێک دا[٢]، بۆی دەرکەوت.

مووسا تەماشای کرد سەرنجی دا ئەو دڕووە بڵێسەی لێ بەرز دەبێتەوە بێ ئەوەی بسووتێ، مووسا گوتی: ئێستا با بچم نزیک ببمەوە، لەم کارە مەزنە، ئەو دڕووە بۆچی بڵێسەی لێ بەرز دەبێتەوەو ناشسووتێ؟ ئنجا کاتێک پەروەردگاری بینی، کە مووسا نیزیک کەوتۆتەوە تاکو بەو شتە ئاشنا بێ و ئاگادار بێتەوە (ئەو دووڕە چۆنە، بڵێسەی هەیەو ناشسووتێ؟) بانگی کرد لە نێوە ڕاستی دڕووەکەوە فەرمووی: مووسا، مووساش گوتی: من لێرەم (بەڵێ

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح:٣، ١٣٤، ظهور الله.

(٢) (عُلَيقة) لە فەرهەنگەکانی زماندا دڕوو (تووترك)ە، چونکە دەڵێ: بەرێک دەگرێ وەک هی توو، هەرچەندە لە (المعجم الوسيط)دا بە لاولاوی لێکداوەتەوە، دەڵێ: ئەوەی کە لە درەخت و شت دەئاڵێ، بەڵام بە تەئکیدا ئەو ڕایە ڕاستە کە دەڵێ: دڕوو (توودڕکە)ە، چونکە هەر ئەو بەرەکەی وەک توویە، مەگەر مەبەستی لە لێئالان، تێئاڵقانی دڕکەکانی بێ.

منم)، خوا فەرمووی: لێرە نیزیک مەبەوە، پێڵاوەکانت لە دوو پێیەکانت دابنێ، چونکە تۆ لە شوێنێکی، ئەو شوێنەی کە تۆ لێی وەستاوی سەرزەمێنکی پاکە.

کە ئەمە ڕێک لەگەڵ ئەوەی کە لە قورئاندا فەرموویەتی، تێک دەکاتەوە، دیارە فەرمایشتی خوا، چ لە تەوراتدا فەرمووی بێ، چ لە ئینجیل دا فەرموو بێ، چ لە قورئاندا فەرموو بێ، فەرمایشتی خوا هەریەکە، هەر هەمووی نابێ جیاواز بێ، مەگەر ئەوەی کە دەستکاریی بکرێ و بگۆڕدرێ.

## مەسەلەی دووەم:

**ڕەوانەکرانی مووسا لە لایەن خواوە، بە گۆچانێکەوە کە دەبوو بە مارێکی گەورەو، بە دەستی ڕاستیشیەوە کە سپی و درەوشاوە بوو، دوای ئەوەی کە دەیخستە بن بن هەنگڵی چەپی خۆی، بۆ لای فیرعەونی لە خوا یاخیی:**

وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّؤُا عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ قَالَ أَلْقِهَا يَٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ﴿٢٠﴾ قَالَ خُذْهَا وَلَا تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ ﴿٢١﴾ وَٱضْمُمْ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخْرَىٰ ﴿٢٢﴾ لِنُرِيَكَ مِنْ ءَايَٰتِنَا ٱلْكُبْرَى ﴿٢٣﴾ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە (١٦) بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴾، ئەوەی کە بە دەستی ڕاستتەوەیە چیە، ئەی مووسا؟ لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە ئاوای لێ دێتەوە: (**أي: مَا تِلْكَ التي حَالَ كَونها بِيَمِنِيك؟**) ئەوەی کە لە حاڵێکدا بە دەستی ڕاستتەوەیە چییە؟ هەڵبەتە خوا ﷻ دەزانێ ئەوە گۆچانە بە دەستی ڕاستییەوە، بەڵام دەیەوێ مووسا بۆی باس بکات.

٢)- ﴿ قَالَ هِيَ عَصَايَ ﴾، گوتی: ئەوە گۆچانەکەمە، لێرەدا مووسا عليه السلام باسی چییەتی ئەو شتە دەکات، کە بە دەستی ڕاستیەوەیە، کە بریتیە لە گۆچانەکەی، پێناسەی دەکات وەک خودی خۆی، بەڵام دوایی باسی سیفەتەکانیشی دەکات، بۆ ئەوەی ئەگەر خوا ﷻ مەبەستی بووبێ، پێناسەی چییەتی شتەکە بکات، بۆی پێناسە بکات و، ئەگەر مەبەستیشی بووبێ، باسی کارەکانی بکات، ئەوەش ڕوون بکاتەوە.

٣)- ﴿أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيْهَا﴾، خۆمی دەدەمە سەر، باسی هەندێک لە سوودەکانی دەکات، یاخود هەندێک لە وەسفەکانی (**أتَوكَّأُ أي: أَعتَمِدُ وَأَسْتَنِدُ**)، دیارە عادەتی شوانان وایە کە گۆچانیان پێیە، خۆیانی دەدەنە سەر، لە کاتێک دا پشتیان ماندوو دەبێ، یاخود خۆیان دەدەنە سەری، لە کاتی ڕۆیشتنداو خۆیانی پێ دەگرنەوە، کاتێک دەچنە خوار لە شوێنێک، یان وەک هاوکارێک بۆ دوو پێیەکانیان.

٤)- ﴿وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي﴾، هەروەها گەڵای درەختانیشی پێ دەوەرێنم، بەسەر مەڕەکانمدا، (**الْهَشُّ: الْخَبْطُ، وَهُوَ ضَرْبُ الشَّجَرَةِ بِعَصًا لِيَتَسَاقَطَ وَرَقُهَا، وَعُدِّيَ بِـ «عَلَى» لِتَضمينِهِ مَعْنَى: أُسقِطُ**)، (**هش**) وەک پێشتر باسمان کرد: (**الْهَشُّ: الهَزُّ**)، (**هَزّ**) ڕاوەشاندن، (**هَشْ**)یش لێی نیزیکە، دەڵێ: (**هَشّ: خَبْط**)، بریتیە لە لێدانی درەختێک بە گۆچانێک تاکو گەڵاکانی هەڵوەرێن، لێرەدا وشەی (**هُش**) بە (**على**) بەرکاری خواستوە، تاکو مانای (**أُسْقِطُ**)، (بخەمە خوار)ی بچێتە نێو، تاکو گەڵای درەختانی پێ هەڵوەرێنم، پێ بەردەمەوە بەسەر مەڕەکانم دا، ئەوانیش بیخۆن.

٥)- ﴿وَلِيَ فِيهَا مَآرِبُ أُخْرَىٰ﴾، هەروەها چەندان کاری پێویستی دیکەش بەم گۆچانە دەکەم، (**مَآرِب: جمع مَأْرِبَ أو مَأْرُبَ أو مأْرَبَ، أي: الحَاجَة**)، (**مَآرِب**) کۆی (**مَأْرِب**)، (**مَأْرُب**)، (**مأْرَب**) هەر سێکیان بە مانای (**حاجة**) پێداویستیی دێن، واتە: چەندان کاری پێویستیشم بەو گۆچانە هەن و، بەهۆی ئەوەوە ئەنجامیان دەدەم.

زانایان لە تەفسیرەکانیان دا زۆر بە تەفسیڵ باسیان کردوە، کە گۆچان چەند سوودی هەن، هەندێکیان دەڵێن: دە (١٠) سوود، هەندێکیان دەڵێن: بیست (٢٠) سوود، هەندێکیشیان دەڵێن: سەد (١٠٠) سوود.

کە لە ڕاستییدا هیچ بەڵگەیەک لەو بارەوە نیە کە خوا ﷻ مەبەستی بووبێ، ئێمە بە سوودەکانی گۆچاندا بچینە خوار، گرنگ ئەوەیە مووسا ؑ هەم گۆچانەکەی وەک خودی خۆی بۆ خوا ﷻ پێناسە کردوەو، گوتی: ئەوە گۆچانە، هەم ئەو پێداویستییانەی کە بە هۆی ئەو گۆچانەوە دەیانهێنێتە دی، سوودەکانی گۆچانیشی باسکردوون.

٦)- ﴿ قَالَ أَلْقِهَا يَٰمُوسَىٰ ﴾، خوا فەرمووی: ئەی مووسا! فڕێیدە، بیهاوێ، کە دەفەرموێ: ئەی مووسا! فڕێیدە، بیهاوێ، ئەوە بە تەئکید هۆکارە بۆ مەبەستێکی دیکە کە دوایی باسی دەکەین، بەڵام ئەمە ڕاهێنان و ئاگادارکردنەوەی مووساش بووە ﷺ لە بارەی گۆچانەکەیەوە، کە خوا وەک موعجیزەیەک بۆی دەکاتە حەزیاو ئەژدیهایەکی گەورە، هەر خودی ئەو گۆچانەی کە هی خۆیەتی و بە دەست خۆیەوەیەتی، بۆ ئەوەی زیاتر ئولفەتی پێوە بگرێ، لێی نەترسێ، پێوەی ڕابێ.

٧)- ﴿ فَأَلْقَىٰهَا ﴾: (قَذَفَهَا، طَرَحَهَا): هاویشتی و فڕێیدا.

٨)- ﴿ فَإِذَا هِىَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ﴾، یەکسەر دوای هاویشتنی بوو بە مارێک کە دەڕۆیشت، دەهات و دەچوو، ئنجا لە سوورەتی (**الأعراف**)دا دەفەرموێ: ﴿ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٠٧﴾ ﴾، گۆچانەکەی فڕێدا، یەکسەر بوو بە مارێکی زۆر ئاشکرا و ڕوون، (**ثُعبَان**) واتە: مارێکی زۆر گەورە، بە کوردیی دەڵێن: حەزیا یان ئەژدیها.

لە سوورەتی (**القصص**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: گۆچانەکەت فڕێ بدە، کاتێک کە بینی خۆی ڕادەوەشاند وەک تیرە مار (﴿ جَآنٌّ ﴾، ماری گچکەش هەڵچوون و داچوونی خێراترە) یەکسەر مووسا پشتی تێ کردو ڕایکردو ئاوڕی نەدایەوە.

ئنجا هەر بەهەمان تەعبیر لە سوورەتی (**النمل**)یشدا هاتووە: دەفەرموێ: ﴿ أَلْقِ عَصَاكَ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ﴿١٠﴾ ﴾.

لە کۆی ئەم ئایەتانە وەردەگیرێ، ئەو گۆچانەی مووسا فڕێی داوە، بۆتە مارێکی زۆر گەورە و، جوولە جوڵەکەشی زۆر خێرا بووە، وەک تیرە مارێک، وەک مارێکی گچکە، بەڵام لە قەبارەیەکی گەورەدا.

٩)- ﴿ قَالَ خُذْهَا وَلَا تَخَفْ ﴾، خوا پێی فەرموو: بیگرەو لێی مەترسێ، دیارە دوایی لە پەیمانی کۆنەوە دەیهێنین، گرتنەکەی چۆن بووە، لێرە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

بیگرەو لێی مەترسێ، ئنجا ئایا لە لای سەرییەوە گرتوویەتی، لە لای کلکییەوە گرتوویەتی، چۆنی گرتوە؟.

١٠)- ﴿سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ﴾، دەیگێڕینەوە بۆ حاڵەتی یەکەمی، دەڵێ: **(السيرةُ: هيئة السَّير، وأطلقت على العادة الطبيعية، وانتصب سيرتها بنزع الخافض: إلى سيرتها الأولى التي كانت عليها).**

(**سيرة**) واتە: شێوەی ڕۆیشتن، هەم لێرەو هەم بە گشتی بە مانای عادەت و سروشتیش دێ، بەڵام لێرە ﴿سِيرَتَهَا﴾ کە (منصوب) بووە، دەڵێ: (**بنَزْعِ الخافض**)، یانی: ئەوەی کە ژێرداری دەکات، لێی داڕنراوە، یانی: (سَنُعِيدُهَا **إلى** سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ)، لە ئەسڵدا ئاوا بووە: دەیگێڕینەوە بۆ حاڵەتی پێشێ کە حاڵەتی گۆچانی ئاساییە.

١١)- ﴿وَٱضْمُمْ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ﴾، دەستیشت بەرە ژێر باڵت، دەستت بخە بن هەنگڵت، یانی: دەستی ڕاستت بخە بن هەنگڵی چەپت.

١٢)- ﴿تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ﴾، بە سپێتیی دێتە دەرێ بە بێ نەخۆشیی و، بەبێ ئەوەی حاڵەتێکی خراپی لێ پەیدابوو بێ، وەک لە سوورەتی (**الشعراء**)دا دەفەرموێ: ﴿وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّـٰظِرِينَ ﴿٣٣﴾﴾، دەستیشی هێنایە دەرێ، دوای ئەوەی خستبوویە بن باڵی، هێنایە دەرێ، یەکسەر سپی بوو بۆ بینەران.

لە سوورەتی (**النمل**)دا لە ئایەتی (١٢)دا، هەمان شت دەفەرموێ و لە سوورەتی (**الأعراف**)یش لە ئایەتی (١٠٨)دا بە هەمان شێوە، وەک لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا باسمان کردوە: ئەو سپییەتییەی دەستی مووسا ﷺ هەر ئەوە نەبووە کە سپی بوو بێ، وەک پەڕێک یان کاغەزێک سپی بێ و، بەڵکو سپێتییەکی نا ئاسایی بووە، درەوشاوەتەوە، وەک بلاجکتۆرێک و گلۆپێکی زۆر بە شۆق، چونکە دەفەرموێ: ﴿بَيْضَآءُ لِلنَّـٰظِرِينَ﴾.

١٣)- ﴿ءَايَةً أُخْرَىٰ﴾، ئەم دەستە سپییەشت نیشانەیەکی دیکەیە.

ئنجا ئایا بۆچی ئەمانەت پێشان دەدەین؟

١٤)- ﴿ لِنُرِيَكَ مِنْ ءَايَٰتِنَا ٱلْكُبْرَى ﴾، تاکو لە نیشانە گەورەکانی خۆمانت پێشان بدەین، واتە: تاکو بزانی کە ئێمە خاوەنی نیشانەو بەڵگەی زۆر گەورەین.

١٥)- ﴿ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ ﴾، بڕۆ بۆ لای فیرعەون.

١٦)- ﴿ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴾، بێگومان ئەوە سەرکێشیی کردوە، یاخیی بووە، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴾، بێگومان ئەوە هۆکارو هۆی فەرمان پێکردنەکەیەتی، بۆچی بچێ بۆ لای فیرعەون؟ بە هۆی ئەوەی کە یاخیی بووە، تاکو لەو یاخیی بوونەی بیگێڕیتەوە، بۆ پێگەیاندنی پەیامی خوا ﷻ.

ئنجا دەربارەی گۆچانەکەی مووسا ، کە چۆن بووە بە مارێکی گەورە؟ هەروەها دەستی چۆن دوای ئەوەی خستوویەتە بن باڵ و بن قۆڵی و دەریهێناوە، سپی و درەوشاوە بووە؟ لەو بارەوە لە پەیمانی کۆنەوە ئەم دەقە دێنین، دەڵێ:

(فَقَالَ مُوسَى: «مَاذَا إِذَا لَمْ يُصَدِّقُونِي وَلَمْ يَصْغُوا إِلَيَّ، وَقَالُوا: إِنَّ الرَّبَّ لَمْ يَظْهَرْ لَكَ؟» فَسَأَلَهُ الرَّبُّ: «مَا تِلْكَ الَّتِي بِيَدِكَ؟» فَأَجَابَ: «عَصاً»، فَقَالَ: «أَلْقِهَا عَلَى الأَرْضِ». فَأَلْقَاهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ، فَهَرَبَ مِنْهَا مُوسَى، فَقَالَ الرَّبُّ لِمُوسَى: «مُدَّ يَدَكَ وَاقْبِضْ عَلَيْهَا مِنْ ذَيْلِهَا». فَمَدَّ مُوسَى يَدَهُ وَقَبَضَ عَلَيْهَا، فَارْتَدَّتْ عَصاً فِي يَدِهِ ... ثُمَّ قَالَ الرَّبُّ أَيْضاً: «أَدْخِلْ يَدَكَ فِي عُبِّكَ». فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِي عُبِّهِ، وَعِنْدَمَا أَخْرَجَهَا إِذَا بِهَا بَرْصَاءُ كَالثَّلْجِ)[1].

واتە: مووسا  گوتی: ئەدی ئەگەر قسەی منیان بە ڕاست نەزانی و، گوێیان بۆ نەگرتم و، گوتیان: پەروەردگار بۆ تۆ دەرنەکەوتوە (واتە: تۆی نەکردۆتە پێغەمبەر)، چی بکەم؟ پەروەردگار لێی پرسی: ئەوەی کە بە دەستی ڕاستتەوەیە

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: ٤، ص ١٣٦، المُعجزات البرهانية.

چیە؟ وەڵامی دایەوە: گۆچانە، فەرمووی: فڕێیدە سەر زەوی، فڕێیدا یەکسەر بوو بە مار، مووسا هەڵات (لێی ترساو هەڵات)، پەروەردگار بە مووسای فەرموو: دەستت درێژ بکەو لە لای کلکییەوە بیگرە (واتە: لەو حاڵەتەدا کە مارە کلکی بگرە)، مووسا دەستی درێژ کردو گرتی، (واتە: لە لای کلکییەوە، یەکسەر بوو بە گۆچان)، دوای چەند قسەیەک دەڵێ: پەروەردگار دیسان فەرمووی: دەستت بخەبن قۆڵتەوە (بە تەئکید مەبەستی پێی بن هەنگڵی بووە، یانی: دەستی ڕاست بخەرە ژێر هەنگڵتەوە)، ئەویش دەستی خستە ژێر قۆڵی، کاتێک دەریهێنا، تەماشای کرد بەڵەک بوو بوو، وەک بەفر.

هەڵبەتە لێرە ئەمە یەکێکە لەم شتانەی گۆڕدراون، چونکە خوا لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٍ﴾، مووسا ئەگەر دەستی خستبایە بن قۆڵی و ژێر باڵی و بەڵەک بووبایە، دەیانگوت: ئەو دەستەت نەخۆش بووە، هەرچەندە دەڵێ: (كَالثَّلْجِ) بەڵام (برصاء)، یانی: بەڵەک، بەڵام خوا دەفەرموێ: ﴿تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٍ﴾، دەستت سپی و درەوشاوە دەبێ، بێ ئەوەی نەخۆشیی ببێ، چونکە ئەگەر نەخۆشیی بێ، نوقصانییە، بەڵکو دەستی وا سپی بووە، سپیەکی درەوشاوە کە شۆقی داوە، ئەگەرنا هەر سپێتیی ئاسایی، ئەو کاتە جیاواز نابێ لە ڕەنگی دەستی و دیسان ئەوەش نابێتە بەڵگە.

## مەسەلەی سێیەم:

**چوار داواکاریی مووسا لە خوا ﷻ کە سینگ فراوانیی و، کار ئاسانیی و، زمان پاراویی و، ڕەوانیی و، هاڕوونی برای بە پشتیوان دانرانیەتی و، وەڵامدانەوەی خوای بەخشەر بۆ داواکارییەکانی مووسا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي ﴿٢٦﴾ وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا قَوْلِي ﴿٢٨﴾ وَاجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي ﴿٢٩﴾ هَارُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي ﴿٣٢﴾ كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا ﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا ﴿٣٥﴾ قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَا مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

دوای ئەوەی خوا ﷻ مووسا عليه السلام دەکاتە پێغەمبەری خۆی و، فەرمانیشی پێدەکات بچێ بۆ لای فیرعەون کە یاخیی بووە، بۆ ئەوەی پەیامی خوای پێ بگەیەنێ و، بۆ ئەوەی بەنوو ئیسرائیل گەلی ستەم دیدەو چەوساوە) لە ژێر دەستی دەربێنێ و، دەربازیان بکات، تەماشا بکەن، پێغەمبەرانی خوا هەموویان چەندە داناو لێزان و کارامەو دووربین بوون! مووسا عليه السلام هەرچەندە خوا دەیکاتە پێغەمبەرو، ئەو دوو بەڵگەیەشی دەداتێ و، ئاماژەشی بۆ دەکات کە خوا بەڵگەی دیکەی گەورەشی لەلان، کە لە کات و شوێنی خۆیدا ئەو بەڵگانەشی بخاتە بەردەست و بۆی بڕەخسێنێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مووسا عليه السلام هەر یەکسەر مل لێ نانێ، بۆچی؟ چونکە دەزانێ ئەو کارە کارێکی گەورەیەو، ئەرکەکە ئەرکێکی قورسە و نوێنەرایەتیی خوا دەکات، کەواتە: تاکو دوور بینیی بکات و هەتا لای دووربینیی (**إحتیاط**)و وردەکاریی بگرێ، کەمە، کەسێک بیەوێ کارێک بکات و بە جددیی مشووریی لێ بخوا، دیارە هۆکارەکانی و ئامرازەکانی بۆ ساز دەکات، بۆیە مووسا عليه السلام چوار داواکاری سەرەکیی لە خوای پەروەردگار دەکات:

١)- ﴿ قَالَ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ﴾، گوتی: پەروەردگارم! سینەمم بۆ فراوان بکە، دڵم بۆ گوشاد بکە، لە زمانی عەرەبییدا دەڵێ: (آلة الرِّئاسة سعة الصدرِ)، ئامرازی سەرۆکایەتیی سینگ فراوانییە، ئەگەر ئینسان سینگی فروان نەبێ و دڵی گەورە نەبێ و بار قووڵ نەبێ، وەک کوردەواریی دەڵێن: فڵانکەس دڵی وەک کونە مێروو وایە، وەک شارە مێروو وایە، بە دڵۆپە ئاوێک وێران دەبێ، ئینسان ئەگەر دڵی گچکە بێ، دوو خەمی هاتنە پێش، دڵی پڕ دەبێ و بێ حەوسەڵە دەبێ و، بە چۆک دادێ، یاخود لەو ئەرکەی خۆی ڕا دەکات، بەڵام ئەگەر بار قووڵ بێ، وەک کوردەواریی دەڵێن: فڵانکەس دڵی وەک بەحرێ وایە، شلوێ نابێ، ئینسان دەبێ بار قووڵ و دڵ فراوان بێ، بۆیە مووسا ﷺ پێش هەموو شتێ لە پەروەردگاری دەپاڕێتەوە: خوایە! سینەم بۆ فراوان بکە.

وشەی (شَرْحْ) لە ئەصڵدا بریتییە لە بڕینی شتێک، (شَرَحَ لَحْماً)، یانی: گۆشتی بڕی، بەڵام لێرەدا (اشْرَحْ لِي صَدْرِي) واتە: سینەم فراوان بکە، لێکی بکێشەوە کە مەبەستیشی لە سینە واتە: دڵی، مەبەستیشی لە دڵی واتە: با لە ڕووی مەعنەوییەوە بار قووڵ و سینگ فراوان بم، شتی زۆر تەحەممول بکەم.

٢)- ﴿ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ﴾، کاریشم بۆ ئاسان بکە، (**الأَمْرُ: الشأْن والحالُ، والتيسيرُ: جعل الشيءِ يسيراً**)، (**أمر**) یانی: کار، (**تیسیر**)یش ئاسانکردنە، کارم بۆ ئاسان بکە، واتە: ئەو کارەی کە پێت سپاردووم، بۆم ئاسان بکە، بە دەستمەوە بێ.

٣)- ﴿ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ﴾، گرێیەک کە لە زمانمدا هەیە، بیکەوە، (**العُقْدةُ: موضع ربط بعض الخيط أو الحبل ببعض آخر منه وهي بِزِنةِ (فُعْلَة) بمعنى: مَفعول كالقصة والغُرفة**)، (**عُقدة**) ئەو شوێنەیە کە هەندێک لە پەتێک یان هەندێک لە داوێک بە هەندێکیەوە دەبەسترێ، بە کوردیی گرێی پێ دەڵێین، کە لەسەر کێشی (**فُعْلَة**)یە، بەڵام بە مانای (**مَفْعول**)، گرێ دراو، وەک (**قصة**) کە بە مانای (**مقصوص**)ە، بە مانای گێڕدراوەو، (**غُرفة**) واتە: لوێچێک بە مانای (**مغروفة**)، هەڵێنجراو، لوێچێک ئاو.

٤)- ﴿ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ﴾، بۆ ئەوەی لە قسەم تێبگەن، ﴿ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ﴾، واتە: گرێیەک لە زمانم بکەوە با زمان ڕەوان بێ و لە قسەم تێبگەن، دوایی باس دەکەین کە مووسا ﷺ

ئەوەی چۆن داوا کردوە، توێژەرانی قورئان لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوە، کە ئەو گرێیەی زمانی چی بووەو چۆن بووە؟.

٥)- ﴿وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي﴾، هەروەها پاڵپشتێک لە نیزیکانی خۆمم بۆم بڕەخسێنە، دەڵێ: (**الوزيرُ فَعيلٌ بمعنى فاعل، من وازر مثل: حكيم من أحكم، وهو مشتق من الأزر وهو المعونة والأزر: الظهر**)، ﴿وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي﴾، دەڵێ: (**وزير**)، (**فَعيلَ**)ە، بەڵام بە مانای (**فاعِلَ**)ە، ئنجا ئەویش لە (**وازَرَ**)ەوە هاتوە، وەک (**حَكيم**) لە (**أحْكَمَ**)ەوە هاتوە، کە (**وازَرَ**)ش لە (**أَزْر**)ەوە هاتوە، (**أَزْر**) بریتیە لە هاوکاریی، (**أَزْر**) بریتیە لە پشت، کەواتە: (**وزير**) بریتیە لە پشتیوان و، هاوکارو پاڵپشت و، یارمەتییدەر، ئنجا دوایی دیاریی دەکات ئەو وەزیرە و ئەو پاڵپشتە کێ بێ.

٦)- ﴿هَٰرُونَ أَخِي﴾، با هاڕوونی برام بێ.

٧)- ﴿ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي﴾، پشتمی پێ قاییم بکە، (**الشَّدُّ: الإمْسَاكُ بِقُوَّة**)، (**شَدْ**) بریتیە لەوەی شتێک بەهێز بگری، یانی: پشتمی پێ بگرە و پشتمی پێ بە قوەت بکە، کە لێرەدا یانی: هاوکارییمی بێ بکە، چونکە (**الأزْرُ: الظَّهْرُ وَسُمِّيَ الإزارُ إزاراً، لأنه يُشَدَّ به الظَّهْرُ**)، (**إزار**) بۆیە وای پێ گوتراوە، چونکە پشتی پێ بە هێز دەکرێ، (**إزارْ**) واتە: شەڕواڵ کە پشتی پێ دەبەسترێ لە داپۆشینی جەستەدا، هەروەها (**إزار**) بە مانای پشتێنیش هاتوە، لەبەر ئەوەی پشتی پێ بە هێز دەکرێ.

٨)- ﴿وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي﴾، لە کارەکەمدا بەشداریی پێ بکە، کارەکەی بریتیە لە چی؟ بریتیە لە پێغەمبەرایەتیی و گەیاندنی پەیامی خوا بە فیرعەون و گەلی فیرعەون و، پاشان دەربازکردنی بەنوو ئیسرائیل و مشوورلێخواردنیان، لەو کارەدا هاوبەش و بەشداری بکە.

(**ماشاءَالله**)! مووسا ﷵ چەند سەخیی و، بە سەماحەت و، بێ جیاوازیی و، دڵ گەورەو، سیفەت بەرز بووە، هی وایە پێی خۆشە کە کارێک دەکات، ئەگەر بۆشی نەکرێ، کەس تێیدا بەشدار نەبێ، بەڵام مووسا ﷵ داوا لە پەروەردگاری دەکات: کە هاڕوونی براشی بکات بە پاڵپشتی و لە کارەکەشیدا بەشداریی پێبکات.

٩)- ﴿كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا﴾، تاکو زۆر تۆ بە پاک بگرین، ﴿وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا﴾، زۆریشت یاد بکەین، ئەمە هۆکار هێنانەوە (تعلیل)یە بۆ داوا کردنەکانی، واتە: بۆیە ئەو داوایانەت لێدەکەم، تاکو بتوانین زۆرت بە پاک بگرین و زۆریشت یاد بکەین، ئنجا زۆر بە پاکگرتنی خوا ﷻ هەر ئەوە نیە، کە ئینسان لە زاتی خۆیدا، مێشک و دڵی خۆی لەو شتانە بژار بکات و پاک بکاتەوە، کە لەگەڵ پایەو مەقامی بەرزی خوادا ناکۆکن و نەگونجاون، وەک هاوبەش بۆ خوا دانان، ڕیابازیی، گومانی خراپ بە خوا بردن و، هەموو ئەو بیرو بۆچوونانەی کە شایستەی مەقامی بەرزی خوا نین، بەڵکو وێڕای ئەوە بە پاکگرتنی خوا ئەوەش دەگرێتەوە: تۆ یارمەتییمان بدە کە عەقڵ و دڵی خەڵک پاک بکەینەوە، لەو شتانەی کە لەگەڵ پایەو مەقامی بەرزی تۆدا ناگونجێن، واتە: یارمەتییمان بدە کە جۆماڵی عەقڵی و دڵی خەڵک بکەین، عەقڵ و دڵی خەڵک بژار بکەین لەو شتانەی کە لەگەڵ پایەو مەقامی بەرزی تۆدا ناگونجێن، بە تایبەت هاوبەش بۆ خوا دانان و پەرستنی غەیری خوا.

١٠)- ﴿وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا﴾، زۆریش یادت بکەین، زۆر یادی خوا کردن یانی: زۆر لە خوا ئاگا بوون و، عەقڵ و دڵ ئاوەدان بوونەوە بە یادی خوا، هەم لە زاتی خۆمانداو، هەم وابکەین کە خەڵکیش زۆر یادی تۆ بکات.

١١)- ﴿إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرٗا﴾، بە دڵنیایی تۆ بینەری ئێمەی، ئەمەش دیسان هۆکار دۆزینەوە(**تعليل**)ە، بۆ داواکردنەکەی، واتە: بۆیە ئەو داوایەت لێدەکەم، چونکە تۆ بۆ خۆت ئاگاداری ئێمەی، بینەری ئێمەی، دەزانی کە ئەگەر تۆ ئەو کارانەم بۆ نەکەی و، ئەو داواکارییانەم بۆ جێبەجێ نەکەی، من لەو ئەرکەدا کە پێت سپاردووم، سەرکەوتوو نابم و، دوایی عەیبدارو ڕوو زەردی لای تۆ دەبم.

کەواتە: وشەی (**تسبيح**) مەبەست پێی حاڵەتی بژاردکردن (**تخلية**)و، (**ذكر**)یش مەبەست پێی حاڵەتی ڕازاندنەوە (**تحلية**)یە، ڕازاندنەوەی عەقڵ و دڵی خەڵک بە ئیمان و بە خوا بەیەکگرتن و یادکردنی خوا.

**١٢)**- له كۆتاییدا: ﴿ قَالَ قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴾، (خوا) فەرمووی: ئەی مووسا ﷺ! داواكارییەكەت پێدرا، (السؤْلُ: المسئولُ، كالخُبزِ، بمعنى: المخبوزِ، والأَكْلُ، بمعنى: المأكولَ)

(سُؤْل) چاوگە بەڵام لێرەدا بە مانای (مَسْئول) داواكرا، وەک (خُبز) یانی: (مَخْبوز) واتە: كراو بەنان، یاخود (أكل) واتە: خواردن، بەڵام یانی: شتێک كە دەخورێ (مَأْكُول).

كەواتە: وشەی (سُؤْل) هەر چوار داواكارییەكەی مووسا ﷺ دەگرێتەوە، ئەوەی كە داوات كرد، ئەوە پێت دراو لەلایەن خواوە بڕیار درا.

## کورتە باسێک:
## چوار سەرنجی گرنگ لەسەر ئەم دوازدە (١٢) ئایەتە

**یەکەم:** چوار داواکارییەکەی مووسا ﵇ هەموویان پێداویستیی گەورەو گرنگن و، پێکەوەش پەیوەستن:

١- پێشێ داوا دەکات: ﴿قَالَ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي﴾، گوتی: خوایە! سینەم فراوان بکە، باسمان کرد، واتە: دڵم گەورە بکە، بار قووڵم بکە و بە تەحەممولم بکە.

٢- دوایی دەڵێ: ﴿وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي﴾، کارم ئاسان بکە.

٣- دەڵێ: گرێی زمانم بکەوە، ﴿وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي﴾، ئنجا هۆکاری زمان کرانەوەکەشی و لابردنی ئەو گرێیەش لە زمانیدا، حیکمەتەکەی دەخاتە ڕوو، دەڵێ: ﴿يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي﴾، بۆ ئەوەی لە قسەم تێبگەن.

٤- ﴿وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي﴾، واتە: پشتیوانێکم لە نیزیکانی خۆم بۆ بڕخسێنە، دواییش دیاریی دەکاو دەڵێ: ﴿هَٰرُونَ أَخِي ٣٠ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ٣١ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ٣٢﴾، هارووني برام، پشتمی پێ قاییم بکەو، لە کارەکەمدا بەشداریی پێ بکە.

هەڵبەتە هەر کاتێک مرۆڤ سینەی فراوان بوو، بار قووڵ بوو، دڵی گەورەو بە تەحەممول بوو، کارەکەی ئاسان دەبێ، کە کاری ئاسان بوو، زمانیشی کراوەتر دەبێ و، دەربڕینەکانی باشتر بۆ دێن و، بێگومان ئەگەر دڵ فراوان بوو و کارەکەشی لەبەر ڕۆیشت، گفت و لوتفیشی خۆش بوو، زمانیشی کراوە بوو تەعبیرەکانی باش بوون، خەڵکیش باشتر بۆی دەبێتە هاوکارو دەستبارگرو پشتیوان، ئەگەرنا بابایەکی تەنگە پرێسکەی تووڕەو تۆسنی و مۆن و مرچی، ئنجا کار لێ ئاڵقاوی، زمان زبری ڕوو ترش، خەڵک لە ڕاستییدا لێی کۆنابێتەوەو،

خەڵک ئامادە نابێ هاوکاری بێ و پاڵپشتی بێ، خوا خوایانە چرو چاوی نەبینن، خوا خوایانە کە لێی دوور بن و لێی نیزیک نەبنەوە.

ئەم چوارانە هەر چواریان پێکەوە پەیوەستن و، مووسا ﷺ زۆر حەکیمانەو کارزانانە، داواکارییەکانی خۆی ئاراستەی خوای کاربەجێ کردوون، پێشێ داوای سینە گوشاد بوون و دڵ فراوانیی دەکات، ئنجا داوای کار بۆ ئاسان کران دەکات، دوایی داوایی زمان کرانەوەو زمان پاراو بوون دەکات، ئنجا دوایی داوای خاوەن پشتیوان بوون دەکات.

زانایان لە بارەی ئەو گرێیەی کە مووسا ﷺ داوا دەکات لە خوا کە لە زمانییدا بیکاتەوە، زۆر قسەیان کردوە، بەسەرهاتیان زۆر هێناون، کە ئێمە خوا پشتیوان بێ، لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (**القصص**)دا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر ئەوە، کە کورتەکەی ئەوەیە:

گوایە کاتی خۆی مووسا ﷺ پرِی داوەتە ریشی فیرعەون، فیرعەونیش تووڕە بووەو گوتوویەتی: سەری ببڕن، ئەوە ئەو کەسەیە کە کۆتایی موڵک و سەڵتەنەتی من لەسەر دەستی وی دێ، خێزانەکەشی دەڵێ: نەخێر ئەوە منداڵەو نافامێ و نازانێ، بە بەڵگەی ئەوەی کە هەندێک گەوهەری بۆ دێنین لەسەر سینی و هەندێک پشکۆ ئاگریش، ئەگەر دەستیدا گەوهەرەکان، دیارە دەزانێ و ئەگەر دەستی دایە پشکۆیەکان، دیارە نازانێ، مووسا دەست دەداتە پشکۆیەک ئاگرو دەیخاتە نێو زاری، لەوەوە زمانی ئەو لەنگییە، یاخود ئەو گرێیەی تێدا پەیدادەبێ، ئەوە بە هەر حاڵ لە کتێبەکاندا هاتوە، مەرجیش نیە وابێ، گرنگ ئەوەیە کە مووسا ﷺ زمانی قورس بووە، وەک دوایی لە پەیمانی کۆندا باسی دەکەین، زمانی قورس بووە و زمانی باش گۆی نەکردوەو، باش هەڵنەسووڕاوە و زمان پاراو نەبووە، بۆیە داوای کردوە لە خوای پەروەردگار زمان پاراوی بکات، هەرچەندە دوایی هەر بە ئەوەندەش وازی نەهێناوە، بەڵکو داوای کردوە کە هاڕوونی برای کە پیاوێکی زۆر زمان پاراو و قسە زان و بەکارو زار بووە، گوتوویەتی: ئەویش بکە بە پاڵپشت، وەک لە شوێنەکانی دیکەدا باس کراوە.

**دووەم:** ئامانج لە کاری بانگەواز بریتیە لە خواپەرستیی:

بۆیەش مووسا ﷺ دوای ئەوەی ئەو داواکارییانە ئاڕاستەی خوای پەروەردگار دەکات، دوایی دەفەرمووێ: ﴿كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا ۝٣٣ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ۝٣٤﴾، بۆ ئەوەی زۆرت بە پاک بگرین و، زۆرت یاد بکەین، کە باسمکرد یانی: زۆر بە پاک گرتنەکە، هەم لە خودی خۆماندا، هەم هەموو ئەو خەڵکەش کە لەسەر دەستی ئێمە خوا هیدایەتی دەدا، بە پاکت بگرین، واتە: تۆ دوور بخەینەوە لە هەر شتێک کە شایستەی تۆ نیە، عەقڵ و دڵی خۆمان بژار بکەین، لە هەموو ئەو شتانەی کە شایستەی تۆ نین، کە ئەمە حاڵەتی بژارکردن (تخلية)ە، ئنجا ﴿وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا﴾، زۆریش یادی تۆ بکەین، دیارە کەسێک کە زۆر یادی خوا دەکات، دەبێ ئیمانی بە خوا هەبێ و، ئەهلی تەقوا بێ، واتە: ئەمەش حاڵەتی خۆ ڕازاندنەوە (تحلية)یە، وەک ئەهلی تەصەووف و عیرفان دەڵێن.

کەواتە: ئامانج و حیکمەت لە کاری بانگەواز، ئەوەیە کە ئینسان خۆی و خەڵک وا لێ بکات، شتێک لە عەقڵ و دڵیان دا نەبێ، کە شایستەی خوا نەبێ، عەقڵ و دڵی خۆیان بڕازێننەوە بە هەموو ئەو سیفەتانەی کە شایستەی خوان، وەک ئەو پەڕی بە پاکگرتنی خوا، ئەوپەڕی بە مەزنگرتن و بە گەورە گرتنی خوا، خۆشویستنی خوا، لێ ترسانی خوا، سام و هەیبەت بەرانبەر بە خوا، ملکەچیی بۆ خواو، پشت بەستن بە خواو.... هتد.

**سێیەم:** دوو فەرمووده لە بارەی پشتیوانیی بۆ بابای حوکمڕان و کاربەدەست:

**١)- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ وَلِيَ مِنْكُمْ عَمَلاً فَأَرَادَ اللهُ بِهِ خَيراً جَعَلَ لَهُ وَزِيْرَاً صَالِحَاً، إِنْ نَسِيَ ذَكَّرَهُ، وَإِنْ ذَكَرَ أَعَانَهُ»}، (أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ برقم: ٨٧٥٢، وَالبَيْهَقِيُّ برقم: ٢٠١٠٦، قال الشيخ الألباني: صحيح).**

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کامێک لە ئێوە کارێکی بە ئەستۆوە گرت و، خوا چاکەی بۆی ویست،

هاوكاریكی باشی بۆ دەڕەخسێنێ، ئەگەر شتێكیشی فەرامۆش كرد، بیری دێنێتەوەو، ئەگەر شتێكیشی لە بیر بوو، هاوكاری دەبێ، پشتگیری دەبێ بۆ ئەنجامدانی.

**٢)**- هەروەها هەر لەو بارەوە ئەم فەرموودەیەش هاتوە: {**مَا بَعَثَ اللهُ مِنْ نَبِيٍّ، وَلاَ اسْتَخْلَفَ مِنْ خَلِيفَةٍ إلاَّ كَانَتْ لَهُ بِطَانَتَانِ: بِطَانَةٌ تَأمُرُهُ بالمَعْرُوفِ وتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، وَبِطَانَةٌ تَأمُرُهُ بالشَّرِّ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، وَالمَعْصُومُ مَنْ عَصَمَ اللهُ**} **(أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: ١١٣٦٠، والبخاري برقم: ٦٧٧٣، والنسائي برقم: ٤٢٠٢، وابن حبان برقم: ٦١٩٢، عن أَبي سعيدٍ وأَبي هريرة رضي الله عنهما)**.

واتە: خوا هیچ پێغەمبەرێكی ڕەوانە نەكردوەو هیچ جێنشینێكیی دانەناوە، مەگەر دوو جۆرە خەڵكیی تایبەتی بووە {(بطانة) دەڵێ: ئەو خەڵكەن كە خەڵكی تایبەتن، ئەوانەی كە ئینسان ڕاوێژیان پێ دەكات و ڕازو نیازیان لەگەڵ دەكات}، كەسانێكی نیزیك كە فەرمانی پێدەكەن بە شتی پەسندو هانی دەدەن بۆی و، كەسانێكی دیكەی تایبەت، فەرمانی پێ دەكەن بە خراپەو هانی دەدەن لەسەر خراپەو، پارێزراو ئەو كەسەیە خوا بیپارێزێ، (بیپارێزێ لە دەوروبەری خراپ و لە نیزیكانی خراپ، كە هانی دەدەن بۆ خراپەو هاوكاریی دەكەن لەسەر خراپە، نەك بۆ چاكە).

**چوارەم:** چەند قسەیەك لە تەوڕاتەوە لە بارەی ئەو چوار داواكارییانەی كە مووسا عليه السلام لە خوای پەروەردگاری كردوون، كە لە (پەیمانی كۆن)[1]دا، لە ژێر ناوونیشانی: (**تَهَرُّبُ موسى**) واتە: خۆ دزینەوەی مووسا، كە تەعبیرەكەیان جوان نیە، بەڵام لە وێدا وا هاتوە، دەڵێ:

**(فَقَالَ مُوسَى لِلرَّبِّ: «اصْغَ يَا رَبُّ، أَنَا لَمْ أَكُنْ فِي يَوْمٍ مِنَ الأَيَّامِ فَصِيحاً، لاَ فِي الأَمْسِ، وَلاَ مُنْذُ أَنْ خَاطَبْتَ عَبْدَكَ. إِنَّمَا أَنَا بَطِيءُ النُّطْقِ عَيِيُّ اللِّسَانِ» فَقَالَ الرَّبُّ لَهُ: «مَنْ هُوَ بَارِيءُ فَمِ الإِنْسَانِ؟ أَوْ مَنْ يَجْعَلُهُ أَخْرَسَ أَوْ أَصَمَّ أَوْ بَصِيراً أَوْ كَفِيفاً؟**

---

(١) (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: ٤، ص١٣٨)

أَلَسْتُ أَنَا الرَّبُّ؟ فَالآنَ انْطَلِقْ فَأُلَقِّنَ فَمَكَ النُّطْقَ، وَأُعَلِّمَكَ مَاذَا تَقُولُ»لَكِنَّ مُوسَى أَجَابَ: «يَا سَيِّدُ، أَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ أَنْ تُرْسِلَ مَنْ تَشَاءُ غَيْرِي»، فَاحْتَدَمَ غَضَبُ الرَّبِّ عَلَى مُوسَى وَقَالَ: «أَلَيْسَ هَرُونُ اللاَّوِيُّ أَخَاكَ؟ أَنَا أَعْلَمُ أَنَّهُ يُحْسِنُ الْكَلامَ، وَهَا هُوَ أَيْضاً قَادِمٌ لِلِقَائِكَ ... فَيُخَاطِبُ هُوَ الشَّعْبَ عَنْكَ ويَكُونُ لَكَ بِمَثَابَةِ فَمٍ، وَأَنْتَ تَكُونُ لَهُ بِمَثَابَةِ إِلَهٍ . وَخُذْ بِيَدِكَ هَذِهِ الْعَصَا لِتَصْنَعَ بِهَا الْمُعْجِزَاتِ).

واتە: مووسا بە پەروەردگاری گوت: پەروەردگار! گوێ بگرە، من ڕۆژێک لە ڕۆژان زمان پاراو نەبووم، (واتە: قسە ڕەوان نەبووم)، نە کاتی خۆی و نە دوێنێ و، نە لەو کاتەش دا کە تۆ بەندەی خۆتت دواندوە، بەڵکو من بە سستیی قسەم بۆ دەکرێ و، زمانم باش گۆ ناکات، پەروەردگار پێی فەرموو: کێ زاری مرۆڤی دروست کردوە، یان کێ مرۆڤ لاڵ دەکات، یان کەڕ دەکات، بینەر دەکات، یاخود کوێر دەکات، ئایا منی پەروەردگار نیم؟! دەجا ئێستا بڕۆ من زارت فێری قسەکردن دەکەم و، فێرت دەکەم کە چیی بڵێی، بەڵام مووسا وەڵامی دایەوە: ئەی گەورەم! لێت دەپاڕێمەوە کە یەکێکی دیکە جگە لە من بنێری، تووڕەیی پەروەردگار لەسەر مووسا توند بوو، پێی گوت: هاڕوونی لاویی برات، من دەزانم کە ئەو چاک قسە دەزانێ و، ئەوە ئەویش دێ بۆ دیداری تۆ .... دوایی دەڵێ: هاڕوون لە جیاتی تۆ با (خەڵک) گەلەکە بدوێنێ و، ئەو بۆ تۆ لە جێی زار دەبێ و، تۆش بۆ وی لە شوێنی پەرستراو دەبی، ئێستا ئەم گۆچانەش بە دەستەوە بگرە، تاکو شتی دەستەوسانکەری پێ ئەنجام بدەی.

هەڵبەتە ئەمە قسەی پەیمانی کۆنە، کە تاڕادەیەک لەگەڵ قورئاندا تێکدەکاتەوە، چونکە وەک دوایی باس دەکەین، مووسا بە تایبەت لە سوورەتی (القصص)دا لەوێ دەڵێ: خوایە هاڕوونی برام ﴿هُوَ أَفۡصَحُ مِنِّي لِسَانٗا فَأَرۡسِلۡهُ مَعِيَ رِدۡءٗا يُصَدِّقُنِيٓ ٣٤﴾، واتە: ئەو زمانی لە من پاراوترە و لەگەڵمدا بینێرە پاڵپشتم بێ و با من بەڕاست بگێڕێ.

بەڵام بەو شێوەیەی کە مووسا ﷺ ڕای کرد بێ لەبەر بەرپرسیارێتیی، وا نیە، لە قورئاندا شتی وا نەهاتوە، هەروەها ئەوە کە لێرەدا دەڵێ: کە تۆ بۆ هاڕوون لە شوێنی پەرستراو دەبی، ئەوەش دیارە زێدەڕۆییەکی گەورەیە، دیارە مووسا ﷺ برای هاڕوون بووە، بەڵێ، هاڕوون لەبەر دەستی مووسادا بووە، بە قسەی کردوە، بەڵام وەک برایەتی و، وەک کەسێک کە کارێک بە کەسێک دەسپێررێ، نەک وەک پەرستراوێتیی.

هەروەها ئەوەش ڕاست نییە کە مووسا گوتبێتی: [لێت دەپاڕێمەوە کە یەکێکی دیکە جگە لە من بنێرێ]!

## مەسەلەی چوارەم:

**بیرخستنەوەی خوای بەخشەر بۆ مووسا ﷺ کە لە ڕابردووشدا، ژمارەیەک چاکەو نیعمەتی گەورەو بەرچاوی پێ بەخشیون و، بە چەندان جۆر تاقیکردۆتەوە و، بە تایبەت پەروەردەی کردوە کە ئەو ئەرکە گەورە و گرنگەی پێ بسپێرێ:**

وەک خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰٓ ﴿٣٧﴾ إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ فِى ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ ۚ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾ إِذْ تَمْشِىٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ۖ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ۚ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ۚ فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾ وَٱصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِى ﴿٤١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەژدە (١٨) بڕگەدا:

دوای ئەوەی مووسا ﷺ چوار داواکارییەکانی دەخاتە ڕوو بۆ خوا ﷻ، خواش بەڵێنی پێدەدا دەفەرمووێ: ﴿ قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴾، داواکارییەکەت جێبەجێ بوو، دوایی چەند شتێکی دەخاتەوە بیر تاکو مووسا ﷺ دڵخۆش و شادمان بێ، کە خوا ﷻ هەر ئێستا مشووری لێ ناخوات و، هەر ئێستا کاری بۆ ئاسان ناکات و پشتیوانیی لێ ناکات، بەڵکو لە ڕابردووشدا هەر وابووە، ئێستا کە خۆی داوا دەکات و خوا داواکارییەکانی بۆ جێبەجێ دەکات، بەڵام کاتی خۆی مووسا هیچ داواکاریی لە خوا نەکردوە، کەچی خوا ﷻ خەمی لێ خواردوە و مشووری لێ خواردوە و پاراستوویەتیی، بۆیە دەفەرمووێ:

١)- ﴿ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰٓ ﴾، جارێکی دیکەش ئێمە چاکەمان لەگەڵ تۆ کردوە، نیعمەتی خۆمان بەسەر تۆدا ڕشتوە.

دیاره لێرەدا کە ئەو هەواڵە، هەم بە (ل)ی قەسەم، هەم بە (قَدْ)ی ساغکردنەوە (تحقيق)، (ولَقَدْ) ئەم هەواڵە جەخت دەکاتەوە، واتە: سەرپەرشتیی کردنی خواو، هاوکاریی کردنی خواو مشوورخۆریی خوا، بۆ تۆ، هەر بەردەوام بووە.

٢)- ﴿إِذۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ﴾، کاتێک کە سروشمان کرد بۆ دایکت، ئەوەی کە بۆمان سروش کرد، وەحیی قسەیەکی پەنهانە، کە لێرەدا ئەگەر بۆ غەیری پێغەمبەران بێ، واتە: خستنە نێو دڵ، خورپەمان بۆ دایکت کرد، کە دەفەرموێ: ﴿مَا يُوحَىٰٓ﴾، واتە: ئەوەی کە بۆمان سروش کردو بۆمان ئیلهام کرد، واتە: شتێکی گەورە بوو، شتێکی گرنگ بوو، کە هەر وەسف ناکرێ، مەگەر هەر بە خۆی وەسف بکرێ، ئەگەرنا هێندە گەورەو مەزنە، وەسف و پێناسە ناکرێ بە غەیری خۆی، چیمان بۆ ئیلهام کرد؟

٣)- ﴿أَنِ ٱقۡذِفِيهِ فِي ٱلتَّابُوتِ﴾، پێمان گوت: بیخە نێو صندووقەوە، بیخە نێو ئەو تابووتە تایبەتەوە، ئەویش دیارە هەر بە ئیلهامی خوا بۆیان دروستکردوە، وشەی (**قذف**) بە مانای فڕێدانە، بەڵام لێرەدا بە مانای دانانە، لە نێو ئەو صندووقەدا کە لە تەختە دروستکراوە، یان لە قامیش.

٤)- ﴿فَٱقۡذِفِيهِ فِي ٱلۡيَمِّ﴾، واتە: تۆ صندووقەکە، تابووتەکە فڕێ بدە نێو دەریاوە، واتە: ڕووباری نیل، کە وشەی (**يَمّ**) بە ئاوی زۆر دەگوترێ: جا چ ڕووبار بێ، چ دەریا بێ.

٥)- ﴿فَلۡيُلۡقِهِ ٱلۡيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ﴾، با دەریاکەش بیخاتە کەنارەوە، (**السَّاحِل: الشَّاطِيء**)، کە دەفەرموێ: (**يُلْقِهِ**) (ل)ەکە، لە (**فَلْيُلْقِهِ**) دا: (**دَالَّةٌ عَلَى أَمْرِ التكْوينِ، أي: سَخَّرْنَا اليَمَّ لِيُلْقِيهُ بالساحل**) دەریاکەمان ڕام و دەستەمۆو ملکەچ کرد، بۆ ئەوەی ئەو صندووقەی کە مووسای تێدایە، بە کۆرپەیی بیخاتە کەنارەوە، ئنجا سەرەنجام چۆن دەبێ؟

٦)- ﴿يَأۡخُذۡهُ عَدُوّٞ لِّي وَعَدُوّٞ لَّهُۥ﴾، دوژمنێکی من و دوژمنێکی خۆی دەیگرێتەوە، واتە: ئەو صندووقە دەگرێتەوە کە مووسای بە مەلۆتکەیی تێدایە.

٧)- ﴿وَأَلۡقَيۡتُ عَلَيۡكَ مَحَبَّةٗ مِّنِّي﴾، هەروەها لە لایەن خۆمەوە خۆشەویستییەکم خستە سەر تۆ، دەڵێ: (**إِلْقَاءُ الْمَحَبَّةِ مَجَازٌ فِي تَعَلُّقِ الْمُحِبَّةِ بِهِ، أَيْ: خَلْقُ الْمَحَبَّةِ**

فِي قَلْبِ الْمُحِبِّ بِدُونِ سَبَبٍ عَادِيٍّ)، واتە: فڕێدانی خۆشەویستیی بۆ سەری، مەجازە، بۆ پەیوەست بوونی خۆشەویستیی پێیەوە، واتە: خوا لە دڵی ئەوانەدا کە خۆشیاندەوێ خۆشەویستی مووسای ڕەخساند بوو، بۆیە هەر کەسێک بینیبایە خۆشیدەویست بە بێ هەبوونی هۆکارێکی ئاسایی.

٨)- ﴿ وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِيٓ ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی لە ژێر چاودێریی مندا تۆ دروست بکرێی و، پەروەردە بکرێی و، بە خێو بکرێی، (والصُّنْعُ: مُسْتَعَارٌ لِلتَّرْبِيَةِ وَالتَّنْمِيَةِ، تَشْبِيهًا لِذَلِكَ بِصُنْعِ شَيْءٍ مَصْنُوعٍ، يُقَالُ: صَنِيعَةُ فُلَانٍ)، وشەی (صُنْع) خوازراوەتەوە بۆ پەروەردەکردن و پێگەیاندن، کە لێرەدا چوێنراوە بە دروستکردنی شتێک کە بە شێوەیەکی تایبەت دروست دەکرێ و بە کارامەیی، هەر لە زمانی عەرەبییشدا دەڵێ: (هذه صَنِيعَةُ فُلَانٌ) ئەمە چاکەو کردەوەی فلانکەسە، یان دەڵێ: (صنائع المعروف تقي مصارع السوء)، واتە: کردەوە باشەکان و چاکەکاریی لەگەڵ خەڵک دا، مرۆڤ لە مردنی خراپ دەپارێزێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِيٓ ﴾ با لەسەر چاوی من دروست بکرێی، (العَيْنُ: مَجَازٌ فِي الْمُرَاعَاةِ وَالْمُرَاقَبَةِ) واتە: لە ژێر چاودێریی مندا، ئەمە تەعبیرێکی عەرەبییە، ئەگەرنا مووسا نەچۆتە سەر چاوی خوا ﷻ، لێرەدا مەبەستی ئەوە نیە کە چاو بۆ خوا بڕیار دەدرێ و، مووساش لەسەر چاوی بێ، وەک لە شوێنکی دیکە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ﴿٤٨﴾ ﴾ الطور، واتە: تۆ بە چاوەکانی ئێمەوەی، واتە: لە ژێر چاودێریی ئێمە دای.

٩)- ﴿ إِذْ تَمْشِيٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ﴾، واتە: کاتێک کە خوشکەکەت دەڕۆیی دەیگوت: ئایا کەسێکتان پێشان بدەم کە وەخۆی بگرێ و بەخێوی بکات، سەرپەرشتیی بکات، کەواتە: لێرەدا ئەم تەعبیرە ئاوای لێدێ: ( إِذْ تَمْشِيٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ، وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِيٓ)، واتە: کاتێک خوشکەکەت دەڕۆی و دەیگوت: ئایا کەسێکتان پێشاندەم بۆتان بەخێو بکات، ئەوەمان بۆیە کرد، تاکو لە ژێر چاودێریی مندا بە خێو بکرێی و، سەرپەرشتیی بکرێی.

ئایا خوشکەکەی مووسا ﷺ ناوی چی بووە؟ لە قورئان و سوننەت نەهاتوە، بەڵام لە پەیمانی کۆندا هاتوە کە ناوی (مَرْيَمْ) بووە.

وەک لە (**التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهدم القديم، سفر الخروج الإصحاح: ١٥، ص١٦٣**)، لە ژێر ناوونیشانی: (**مَرْيَم النَّبِيِّ أُخْتُ هارون**) مەریەمی پێغەمبەر خوشکی هاڕوون، لەوێدا ناوی وا هاتوە، هەر لە پەیمانی کۆن لە (**سفر العدد، الإصحاح**: ٢٠، ص (٣١٥)دا هاتوە، کە مەریەم خوشکی هاڕوون و خوشکی مووساش، کە لە (**صحراء سينا في قادَش**) لە قادەش لە ساڵی (١٤١٧)ی پێش زایین دا، کۆچی دوایی کردوە، واتە: ئەو خوشکەی مووسا ﷺ بە پێی پەیمانی کۆن، ناوی (مەریەم) بووە، هەڵبەتە لەوێدا دەڵێ: پێغەمبەریش بووە.

بەڵام بە تەئکید ئەمە ڕاست نیە، بەڵێ خوا ﷻ ئیلهامی بۆ کردوە، وا پێدەچێ ئەوان هەر کەسێک ئیلهامی بۆ کرابێ، بە پێغەمبەریان دانابێ، یان بە هەر حاڵ، ئیلهامیشیان بە وەحیی داناوە، وەک وەحیی ئاسایی کە بۆ پێغەمبەران دێ، گرنگ ئەوەیە کە پێغەمبەران تەنها لە پیاواندا بوون.

١٠)- ﴿ فَرَجَعْنَاكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ ﴾، دوایی کە خوشکەکەت چوو بۆ ماڵی فیرعەون و، گوتی: ماڵێکتان پێشان بدەم سەرپەرشتیی بکەن؟ ئەوانیش گوتیان: بەڵێ، ئەوە هەمووی دەپێچرێتەوە و یەکسەر دەفەرموێ: تۆمان گێڕایەوە بۆ لای دایکت، بێگومان خوشکی مووسا دەچێ بۆ لای دایکی، کە دایکی خۆشیەتی و، دایکی مووساشە دەیهێنێ و دەڵێ: ئەو ئافرەتە سروشتی وایە (وەک لە سەرچاوە مێژووییەکاندا باس دەکەن)، هەر منداڵێک بە باوەشەوە بیگرێ و بە سینەی خۆیەوە بنێ، ئەو منداڵە مەمکی دەگرێ، چونکە لە کتێبەکاندا (لەسەرچاوەکاندا)، دەڵێ: مووسا ﷺ یەک چریکە دەیزیڕاندو مەمکی هیچ ئافرەتێکی نەدەگرت، ئیدی لەو کاتەشدا خوشکەکەی مووسا ﷺ بە دەمیانەوە دەچێ و دەڵێ: ئەو منداڵە چیەتی ئاوا دەگری؟ دەڵێن: ئەو منداڵە حاڵ و حیسابی وایەو، مەمکی هیچ ئافرەتێک ناگرێ، دەڵێ: من ئافرەتێکم پێ شک دێ، حاڵ و

حسیابی وایە، هیچ منداڵێک نیە کە مەمکی نەگرێ، دەڵێن: پێمان بڵێ: ئافرەتەکە دێنێ (دایکی مووسا دێنێ) و منداڵەکەی وێ دەدەن و، مووسا دەباتەوە ماڵی خۆیان و، لەوێ شیری پێدەدات و بە خێوی دەکات، بەڵام بە مەسرەفی ماڵی فیرعەون، واتە: هەر دایکی حەقیقیی خۆیەتی، بەڵام ماڵی فیرعەون مەسرەفەکەی دەکێشن، کە گوایە ئەوە دایەنێکە بۆیان، ئنجا خوا دەفەرموێ: تۆمان گێڕایەوە بۆ لای دایکت.

١١)- ﴿كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا﴾، تاکو چاوی فێنک بێ و چاوی سارد بێ، لێرەدا، دەڵێ: (**قَرَّتْ العَيْنُ: قَرَّة، وقُروراً: بَرَدتْ سرُورا**) چاوی فێنک بوو، واتە: دڵخۆش بوو، چونکە دەڵێ: فرمێسکی شادیی ساردە، هەروەک فرمێسکی دڵتەنگیی و غەمباریی گەرمە، ئنجا لەوەوەیە (**قُرَّة العَين**) واتە: جێی دڵخۆشیی و شادمانیی، ﴿كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا﴾، تاکو دڵخۆش بێ.

١٢)- ﴿وَلَا تَحْزَنَ﴾، خەمباریش نەبێ، دڵخۆش بێ بەوەی کە کۆرپەکەی گەڕاوەتەوە بۆ لای، دڵتەنگیش نەبێ بەوەی کە (**الحمد الله**) سەلامەتەو، بۆ خۆی لە ژێر چاودێریی خۆیدا بە خێوی دەکات.

١٣)- ﴿وَقَتَلْتَ نَفْسًا﴾، خوای پەروەردگار ئەمجارە چاکەیەکی دیکە بۆ مووسا ﷺ باس دەکات و بیری دێنێتەوە، دەفەرموێ: کەسێکت کوشت، کە ئەوە لە سووڕەتی (**القصص**)دا هاتوە، لە ئایەتەکانی: (١٥ - ١٧)دا، باسی ئەوە کراوە، کە چۆن ئەو پیاوەی کوشتوەو لە شوێنی خۆی دا باسی دەکەین.

١٤)- ﴿فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ﴾، ئێمە تۆمان لە خەمباریی دەرباز کرد، بەوەی کە خوا ﷻ خستیە دڵی کە خوا لێی خۆش بووە، لە بەرانبەر کوشتنی ئەو نەفسەدا، لەبەر ئەوەی بەرگریی لە ستەم لێکراوێک کردوەو، ویستوویەتی ستەمکارێک دەفع بکات و، دوور بخاتەوە لە ستەملێکراوێک و، مەبەستیشی پێی کوشتن نەبووە.

١٥)- ﴿وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا﴾، هەروەها تۆمان بە چەندان جۆر تاقی کردەوە، واتە: تۆمان بە تاقیکردنەوە تاقی کردەوە، دەڵێ: (**الفُتونُ: مَصْدَرُ فَتَنَ، كَالخُرُوجِ وَالثُّبُورِ وَالشُّكُورِ، وَهُوَ مَفْعول مُطْلَقٌ، والفتن والفتنة: اضطراب حال المرء في مدة حياته**)، ﴿وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا﴾ واتە:

تۆمان بە تاقیکردنەوە تاقی کردەوە، (**فُتُون**) چاوگی (**فَتَن**)یە، وەک چۆن (**خروج**) چاوگی (**خَرَجَ**)یە، (**خَرَجَ، خروجاً**)، (**ثبَرَ، ثبوراً**)، (**شَكَرَ، شكوراً**) بە هەمان شێوە (**فتَنَ ، فتوناً**) ئەو کاتە (**فتوناً**) دەبێتە (**المفعول المطلق**) بەرکارێکی ڕەها بۆ (**فَتَنّا**)، (**والفَتْنُ والفتنَةُ: اضْطِرَاب حَالِ المَرْءِ في مُدَّةِ حَيَاتِهِ**)، (**فَتْنُ وفِتْنة**) بریتیە لە حاڵ تێکچوونی مرۆڤ لە کاتی ژیانیدا، ئەمە یەکێ لە واتاکانیەتی، ئەگەرنا لە ڕاستییدا بە مانای تۆمان تاقی کردۆتەوە و جەڕباند، دێ.

شایانی باسە (**فتون**) دەشگونجێ کۆی (**فَتْن**)بێ، واتە: چاوگ نەبێ، بەڵکو کۆ بێ، بە چەند جۆران تۆمان تاقی کردۆتەوە.

١٦)- ﴿فَلَبِثۡتَ سِنِينَ فِيٓ أَهۡلِ مَدۡيَنَ﴾، تۆش چەند ساڵان لە نێو خەڵکی مەدیەندا مایەوە، کە بە تەئکید مەبەست پێی گەلی شوعەیبە، مەدیەن ناوی یەکێک لە کوڕەکانی ئیبڕاهیمە، دەڵێن: ئەو گەلە بە ناوی ئەو مەدیەنەی کە کوڕی ئەو ئیبڕاهیمە بووە، ناونراوە، کە پێشتر باسمان کردوە، دیارە ئەو چەند ساڵەی کە لەوێ ماوەتەوە، ئایا (١٠) ساڵ بووە، ئایا (٢٠) ساڵ زیاتر بووە؟ دواتر لە کاتی خۆی دا کە لە تەفسیری سووڕەتی: (**القصص**) پێی دەگەین، لەوێ درێژەکەی باس دەکەین، ئەوەی کە لە قورئاندا بۆ ئێمە دیارە لای کەم هەشت (٨) ساڵ و، لای زۆر دە (١٠) ساڵ شوانیی کردوە، بۆ ئەو پیاوە صاڵحەی کە لە مەدیەن بووە، ئنجا ئایا دوای ئەو (٨) یان (١٠) ساڵەش ماوەتەوە یان نا؟ دیار نیە.

١٧)- ﴿ثُمَّ جِئۡتَ عَلَىٰ قَدَرٖ يَٰمُوسَىٰ﴾، دوایی تۆ لە کاتێکی ئەندازەگیراودا هاتی ئەی مووسا ، (**أي حضرت لدينا وهو حضوره بالوادي المقدس**) تۆ هاتی بۆ لامان لەو شیوە پاکەدا.

١٨)- ﴿وَٱصۡطَنَعۡتُكَ لِنَفۡسِي﴾، من بۆ خۆمم دروست کردووی و مشوورم لێ خواردووی و، پەروەردەم کردووی، وەک پێشتر گوتمان: (**الإصطناعُ: صُنْعِ الشيءِ باعتناءٍ**)، دروستکردنی شتێک کە بە وردەکارییەوەو، بە ئاگا لێبوونەوەو، بە کارامەییەوە، واتە:

خۆم ڕام هێناوی و پەروەردەم کردووی و هەل و مەرجم بۆ ڕەخساندووی، کە ئەو پیاوە دەربچی، بۆ ئەوەی بتوانێ ئەو ئەرکە ئەنجام بدەی.

ئنجا ئایا ئەوەی کە خوا ﷻ بە مووسای دەفەرموێ: تایبەتە بە مووساوە، یاخود ئەوەی بۆ پێغەمبەرانی دیکەی فەرمووە، تایبەتە بە پێغەمبەرانەوە، یاخود جگە لە پێغەمبەرانیش دەگرێتەوە؟

لە ڕاستییدا هەموو مرۆڤان دەگرێتەوە، نەک تەنیا بۆ خوا صوڵحاوان، کە لە پێشەوەیان پێغەمبەرانن، ئنجا زانایان و پێشەوایان و دۆستانی خوا، هیچ شتێک نیە لە بووندا و لە گەردووندا کە هەمووی بە ئەندازەگیریی و، بە ئاگا لێبوون و زانیاریی و، حیکمەتی بێ سنووری خوا ئەنجام نەدرێ.

بەڵام بێگومان خوا ﷻ بۆ هەندێک لە بەندەکان کە شایستەترن و لە ڕیزی پێشەوەن، کە پێغەمبەرانن (صەڵات و سەلامی خوایان لێ بێ)، ئنجا هەر کەسە بە پێی خۆی، خوا ﷻ مشوورخۆریی زیاترو، ئاگا لێ بوونی زیاترە، چاودێریی زیاتر بەکاردێنێ، بۆ ئەوەی باشتر ئەو مرۆڤە پەروەردە بێ، چونکە خوا ﷻ دەیەوێ ئەرکێکی پێ بسپێرێ، کارێکی پێ بکات، دیارە ئەو کارو ئەرکەش مرۆڤێکی بەو شێوەیەی دەوێ، بۆیە خوای پەروەردگار هەل و مەرجی بۆ دەڕەخسێنێ و، یارمەتی دەدات و کاری بۆ ئاسان دەکات، تاکو لە قەدەر ئەنجامدانی ئەو ئەرک و بەرپرسیاریەتییە، بێ.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**ناردنی خوا: مووساو هاڕوونی برای بۆ لای فیرعەون، کە قسەیەکی نەرم و نیانی لەگەڵ بکەن و، مەترسیی دەربڕینیان لێی و، دڵنیا کردنەوەی خوا بۆیان کە لەگەڵیانەو، ڕوونکردنەوەی ئەو پەیامەی کە دەبێ بە فیرعەونی بگەیەنن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِى وَلَا تَنِيَا فِى ذِكْرِى ﴿٤٢﴾ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَآ أَوْ أَن يَطْغَىٰ ﴿٤٥﴾ قَالَ لَا تَخَافَآ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾ فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ إِنَّا قَدْ أُوحِىَ إِلَيْنَآ أَنَّ ٱلْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەڤدە بڕگەدا:

١)- ﴿ ٱذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِى ﴾، تۆ و برایەکەت نیشانەکانی ئێمەوە ببەن.

٢)- ﴿ وَلَا تَنِيَا فِى ذِكْرِى ﴾، لە یادی مندا سستیی مەکەن و، خاوو خلیچکیی مەکەن، (وَنَى، يَنِي، وَنَىً: ضَعُفَ فـي العَمَلِ)، واتە: بێ هێز بوو لە کاردا، لە کوردییدا دەڵێ: خاوە خاو، خاوو خلیچکیی و تەنبەڵیی و سستیی، واتە: گورج و گۆڵ بن لە یادکردنی مندا.

٣)- ﴿ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ ﴾، بڕۆن بۆ لای فیرعەون.

بۆچی بچن بۆ لای فیرعەون؟

٤)- ﴿ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴾، ئەوە هۆکاری چوونەکەیانە: بێگومان ئەو یاخیی بووە.

لە کێ یاخیی بووە؟ لە بەرانبەر خوادا یاخیی بووە، لەسەر بەندەکانی خوا یاخیی بووەو، ستەمیان لێ دەکات و، بە تایبەت گەلی ستەم دیدەی بەنوو ئیسرائیل و سۆغرەبێگاریان پێدەکات و دەیانچەوسێنێتەوە.

٥)- ﴿ فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا ﴾، هەردووکتان قسەیەکی نەرم و نیانی لەگەڵدا بکەن، (**القَوْلُ اللَّيِّن: الكَلَامُ الدَّال عَلَى مَعَانِي التَّرغِيبِ وَالعَرْضِ، فَشُبِّهَ الكَلَامُ وَالمُشْتَمِلُ عَلَى المعَانِي الحَسَنَةِ بالشيء اللَّين**)، مەبەست لە قسەی نەرم: قسەیەکە ئەو مانایانەی کە هاندانن بۆ چاکە و ڕانواندنی چاکە لە بەردەمیدا، دەگرنە خۆیان، ئنجا ئەو قسەیەی کە مەبەستە باشەکان دەگرێتە خۆی، چوێنراوە بە شتێکی نەرمەوە، شتی نەرم خۆشە ئینسان دەستی لێبدات، دیارە قسەیەکیش کە مەبەستی باشی تێدابن، هاندانی بۆ چاکە تێدا هەبێ و، بە تەعبیرو بێژەی ڕێک و پێک بگوترێ، لە دڵی خەڵک خۆش دێ.

ئنجا بۆچی قسەی نەرمی لەگەڵ بکەن؟

٦)- ﴿ لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ ﴾، بەڵکو بیری بکەوێتەوە، (**لعــلَّ**)، بەڵکو، بۆ (**تَرَجِّــي**)یە ئومێدەواربوون، کە ئومێدەوار بوونەکە بۆ مووسایە، ئەی مووسا! تۆ ئومێدی ئەوەت هەبێ کە بیری بکەوێتەوە.

٧)- ﴿ أَوۡ يَخۡشَىٰ ﴾، یان بترسێ، (**تَذَكُّر**) (هاتنەوە بیر) ئیشی عەقڵە، (**خشية**) ترسانیش ئیشی دڵە، واتە: ئێوە کار لەسەر ئەو دوو کۆئەندامەی بکەن، کار لەسەر عەقڵی بکەن، ڕاستییەکانی بکەونەوە بیرو، کار لەسەر دڵی بکەن، کە ترسی خواو سام و هەیبەتی خواو شەرمی خوا بچێتە دڵی، ئنجا ئەگەر یەکێکیان بکەوێتە کار، هەر باشە و هەردووکیان بکەونە کار، هەر زۆر زۆر باشە، ئینسان ئەگەر هەم عەقڵی هۆشیار بێ و، هەم دڵی بێدار بێ، ئەوە زۆر زۆر باشە، وەک مەحوی شاعیر دەڵێ:

سەر کە هۆشێکی نەبێ زڕکە تاڵم بۆ چییە!

دڵ کە جۆشێکی نەبێ شووشەی بەتاڵم بۆ چییە!

سـەر دەبـێ هۆشـی هەبـێ و، دڵ دەبـێ جۆشـی هەبـێ، واتـە: یـان ئەوەتـا بـە عەقـڵ ڕاسـتییە خواڕسـکەکان دەخاتـەوە یـادی خـۆی، کـە خـوا لەگـەڵ سروشـتی مرۆڤەکانـدا تێکییەهەڵشـێلاون، وەحییـش بۆیـە دێ کـە ئـەو ڕاسـتییانە بیـر مرۆڤـەکان بخاتـەوە، یاخـود لـە سـزای پـەروەردگار بترسـێ و ترسـی ڕۆژی دوایـی هەبـێ.

٨)- ﴿ قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفۡرُطَ عَلَيۡنَآ ﴾، گوتیان: پەروەردگارمان! ئێمە دەترسێین کە دەستپێشخەریی بکات لەسەرمان، واتە: دەستپێشخەریی سزادان بکات لەسەرمان و، بەر لەوەی پەیامی تۆی پێ بگەیەنین، ئەو پەلە بکات و سزامان بدا.

٩)- ﴿أَوۡ أَن يَطۡغَىٰ﴾، یاخود دوای ئەوەی پەیامەکەی تۆی پێ دەگەیەنین، یاخیی بێ و گوێ نەگرێ.

١٠)- ﴿ قَالَ لَا تَخَافَآ ﴾، فەرمووی: مەترسێن، واتە: لە هیچ کام لەم دووانە مەترسێن، نە دەسپێشخەریی دەکات بۆ سزادانتان، خوا ڕێگا نادات، ئەگەرنا فیرعەون دەستەڵاتی هەبووە، هەروەها دوای ئەوەی پەیامی منیشی پێدەگەیەنن، بەرانبەر بە ئێوە ناتوانێ یاخیی بێ، بەو واتایە کە سزاتان بدات، واتە: نە پێش گەیاندنی پەیامەکە، سزاتان دەدات، نە دوای گەیاندنی پەیامەکە توانای بەسەرتاندا دەشکێ، بەڵێ: یاخیی بوون و، توغیانی هەیە بەرانبەر بە خوا، بەڵام بەرانبەر بە ئێوە لە هیچ کام لەم دووانە مەترسێن.

١١)- ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ﴾، بە دڵنیایی من لەگەڵتانم دەبیستم و دەبینم، واتە: هەموو شتێک دەبیستم، قسەی ئێوەش و قسەی ئەویش و، هەموو شتێکیش دەبینم، حاڵی ئێوەش و حاڵی ئەویش.

١٢)- ﴿ فَأۡتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ ﴾، بچنە لای پێی بڵێن: ئێمە هەردووکمان نێردراوی پەروەردگارتین، ﴿ فَأۡتِيَاهُ ﴾ **(أي: حَلاَّ عِنْدَهُ)** بچنە لای.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ﴾، (رسول) لەسەر کێشی **(فعول)**ە، بە مانای **(مفعول)** دێ، هەم پێکەڵپێک **(مطابقة)**ی تێدا ڕەوایەو، هەم ناپێکەڵپێکیی **(غير مطابقة)**شی تێدا ڕەوایە، بۆیە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ﴾.

بەڵام لە سوورەتی (الشعراء)دا دەفەرموێ: ﴿فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٦﴾، ئێمە نێردراوی پەروەردگارتین، چونکە هەردووکیان نێردراون، دەگونجێ

(**رسـول**) پێکەڵپێکـە (**مطابـق**) بێتـەوە لەگـەڵ (**إنّـا**)دا، کـە بـۆ دووانـن، دەشـگونجێ پێکەڵپێـک نەیەتـەوە، ئـەو دوو حاڵەتـە لـە صیغـەی (**فعـول**)، دروسـت دەبـن و هەردووکیـان یـەک واتایـان هەیـە.

١٣)- ﴿ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ﴾، وەچەی ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێرە و چی دیکە ئازاریان مەدە، سۆغرەبێگاریان پێ مەکەو مەیانچەوسێنەوە.

١٤)- ﴿ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ ﴾، لە پەروەردگارتەوە نیشانەیەکی مەزنمان بۆت هێناوە، کە نیشانە مەزنەکە گۆچانەکەی مووسا ﷺ بوو، یاخود هەم گۆچانەکەی بووە، هەم دەستی بووەو، هەم کۆی ئەو قسە مەنتیقیی و بەڵگە بەهێزانە بوون، کە لەسەر پەروەردگارێتیی خوا پێیان ڕاگەیاندوون.

١٥)- ﴿ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴾، سەلامەتیی و ڕێزگرتنی خوا، لەسەر کەسێک بێ کە بە دوای ڕێنمایی خوا دەکەوێ، کەواتە: لێرەدا وشەی (**سلام**) مەبەست پێی (سڵاو) کردن نیە، بەڵکو سەلامەتییە، وەک پێغەمبەری خوا ﷺ لەو نامانەدا کە بۆ (**هرقل و كِسرا**)ی نووسیونی، فەرموویەتی: (**أَسلِمْ، تَسْلَمْ**) مسوڵمان بە، سەلامەت دەبی، لێرەشدا ئەو سەلامە مەبەست پێی سەلامەتییە، سەلامەتییش، یانی: بێ بەڵایی بۆ کەسێکە، شوێن ڕینمایی خوا بکەوێ.

١٦)- ﴿ إِنَّا قَدْ أُوحِىَ إِلَيْنَآ ﴾، ئێمە بە دڵنیایی سروشمان بۆ لا کراوە و، پێمان ڕاگەیەنراوە لەلایەن خواوە، واتە: لە خۆمانەوە قسە ناکەین، لە گیرفانمان قسە دەرناهێنین، بە دڵنیاییەوە چییان بۆ سروش کراوە، ئەوە بە خەڵک ڕادەگەیەنن.

١٧)- ﴿ أَنَّ ٱلْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴾، سزای خوا بۆ کەسێکە، کە پەیامی خوا بە درۆ دادەنێ و، پشت لە پەیامی خوا دەکات و گوێی پێ نادات، وشەی (**عَذاب**) کە بە (**ال**)ی ناساندن ناسێندراوە، ئەمە (جنس)ی سزاو ئازار دەگەیەنێ، واتە: بە ڕەهایی (**مطلق**)ی سزا لەسەر کەسێکە کە پەیامی خوا بە درۆ دادەنێ و، پشت لە پەیامی خوا دەکات.

## مەسەلەی شەشەم:

**وتووێــژی نێــوان مووســا و فیرعــەون، لــە بــارەی خــوای پــەروەردگارەوەو، پرسـیارکردنی فیرعــەون لــە بــارەی گەلانــی پێشــووەوەو وەڵامدانــەوەی مووســاو، پاشـان پێناسـەکردنی خـوا لـە لایـەن مووسـاوە ﷺ، لەمیانـی خسـتنەڕووی بەشـێک لــە چاکەکانیــداو، ئاماژەکــردن بــە ڕۆژی دوایــی و زیندووکرانــەوە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلۡقُرُونِ ٱلۡأُولَىٰ ﴿٥١﴾ قَالَ عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّى فِى كِتَٰبٍ لَّا يَضِلُّ رَبِّى وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مَهۡدًا وَسَلَكَ لَكُمۡ فِيهَا سُبُلًا وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ ﴿٥٣﴾ كُلُواْ وَٱرۡعَوۡاْ أَنۡعَٰمَكُمۡۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّأُوْلِى ٱلنُّهَىٰ ﴿٥٤﴾ ۞ مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ ﴿٥٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴾، فیرعەون گوتی: ئنجا پەروەردگارتان کێیە ئەی مووسا؟ پەروەردگاری هەردووکتان کێیە ئەی مووسا؟ واتە: هی تۆ و هاڕوون، بۆیە فیرعەون دەڵێ: پەروەردگاری هەردووکتان، چونکە خۆی بە پەروەردگار زانیوە، واتە: ئەگەر من بە پەروەردگاری خۆتان نەزانن، تەنیا ئێوە ئەو دووەتان، چونکە خەڵکی میسرِ هەمووی من بە پەروەردگاری خۆی دەزانێ، ئەدی ئایا ئەو پەوەردگارەی ئێوە ئەگەر من نەبم، کێیە ئەی مووسا؟ لە سوورەتی (الشعراء)دا هاتوە: ﴿ قَالَ فِرۡعَوۡنُ وَمَا رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: پەروەردگاری جیهانییان کێیە؟ لەبەر ئەوەی مووسا ﷺ لە ئەصڵدا ئەو ڕەوانەکراوی خوا بووە بۆ لای فیرعەون، بەڵام لەسەر داوای ئەو، هاڕوونیش ﷺ، بۆتە هاوەڵی لە ئەرکی پێغەمبەرایەتیی و، لە گەیاندنی ئەو پەیامەی خوای پەروەردگاردا، بۆیە کە هەردووکیان ناو دێنێ، لەبەر ئەوەیە کە پێکەوە بوون، کە یەکێکیان ناو دێنێ کە مووسایە ﷺ، لەبەر ئەوەیە کە لە ئەصڵدا هەڵگری پەیامەکەی خوا مووسا بووە.

ئنجا ئەگەر یەكێك بڵێ: ئنجا ئایا فیرعەون گوتوویەتی: پەروەردگاری هەردووكتان كێیە؟ یان گوتوویەتی: پەروەردگاری جیهانییان كێیە؟

وەڵامەكەی هەر ئەوەیە: كە ئەو وتووێژەی بەینی فیرعەن و مووسا و هارون، بێگومان تەنیا دوو قسە نەبووە، جارێكیان گوتوویەتی: پەروەردگاری تۆ كێیە؟ جارێكیان گوتوویەتی: پەروەردگاری هەردووكتان كێیە؟ جارێكیان ڕەنگە گوتبێتی: پەروەردگاری ئێوە هەردووكتان و بەنی ئیسڕائیل كە تۆ دەڵێی: من نوێنەری ئەوم بۆ ئەوەی دەربازیان كەم لە چەنگی تۆ، كێیە؟ جارێكیشیان گوتوویەتی: پەروەردگاری جیهانییان كێیە؟.

لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە كە فیرعەون ناڵێ: (فَمَنْ رَبُّنَا؟)، پەروەردگارمان كێیە؟ یان ناڵێ: (فَمَنْ رَبِي)، پەروەردگارم كێیە؟ لەبەر ئەوەی خۆی بە پەروەردگار زانیوە، پەروەردگار واتە: خاوەن، سەروەر، گەورە، كەسێك كە دەبێ ملكەچیی بۆ بكرێ.

٢)- ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴾، مووسا ﷺ زۆر بە شێوەیەكی كورت، پێناسەی خوای پەروەردگار دەكات، دەڵێ: پەروەردگارمان ئەو كەسەیە كە بوونی بە هەموو شتێك داوە، دوایی ڕێنماییشی كردوە، (**الخَلْقُ: مَصْدَرٌ بِمَعْنَى الإيْجَاد**)، (**خَلْق**)، چاوگە بە مانای پەیداكردن، دەشگونجێ وشەی (**خَلْق**)، مەبەست پێی ئەو شێوە و هەڵكەوتە تایبەتەی خۆی بێ، هی هەر شتێك، واتە: هەموو شتێكی وێنە كێشاوە، هەموو شتێكی لە دنیای واقیعدا بەرجەستە كردوە.

﴿ ثُمَّ هَدَىٰ ﴾، دوایی ڕێنماییشی كردوە، (**ثُمَّ: لِلتَّرْتِيْب الرُّتْبِي وَالزَّمَنِي**)، دیارە هەر شتێك كە پەیدا دەكرێ، دوایی ڕێنمایی دەكرێ، بەو واتایە كە دەخرێتە سەر سكەی بەردەوامبوون.

## وەڵامەکەی مووسا و دوو بەڵگەی نکووڵییلێنەکراو لەسەر بوونی خوا:

ئەم وەڵامەی مووسا ﷺ وەک من لە کتێبەکانی خۆمدا بە تایبەت لە کتێبی دووەمی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی دا) بە تەفصیل باسم کردوە، هەروەها لەو مەوسووعەیەی کە لە سجنی ئەمریکادا نووسیم: (**الإسلام كما يتجلى في كتاب الله**)، لە کتێبی یەکەم، لە چاپی دووەمی دا، باسم کردوە کە ئەم وەڵامەی مووسا دوو بەڵگە دەگرێتە نێو خۆی:

**یەک:** ئەو بەڵگەیەی دەڵێ: هەموو پەیدا بووێک، پەیداکەرێکی هەیە، کە پێی دەگوترێ: (یاسای هۆکاریی) (**قانون السَّبَبِيّة**)، کە دەفەرمووێ: ﴿رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ﴾، پەروەردگاری ئێمە ئەو کەسەیە بوونی بە هەموو شتێک داوە، واتە: هەر شتێک کە پەیدا بوویە، پەیداکەرێکی دەوێ، (**لِكُلِ حَادِثٍ مُحْدِث**)، (**وَلِكُلِ مَخْلُوقٍ خَالِق**)، هەموو پەیدابووێک، هەموو دروستکراوێک دەبێ بەدیهێنەرو پەیدا کەرێکی هەبێ.

ئنجا ئەو هەموو شتانە کە ئێمە لە گەردووندا دەیانبینین، هەموویان پەیدابوون، هەموویان دروستکراون و، پەروەردگاری من ئەو زاتەیە کە هەموو ئەو شتانەی هێناونە دی.

**دوو:** ئەو بەڵگەیەی دەڵێ: هەموو ڕێکخراوێک ڕێکخەرێکی هەیە، (**لِكُلِ مُنَظَّمٍ مُنَظِّمْ**)، هەموو ڕێکخراوێک ڕێکخەرێکی هەیە، ئەم بوونەوەرو ئەم گەردوونە، هەموو شتەکانی ڕێکخراون، هەموویان لە شوێنی خۆیاندان، هەمووی بە سیستمێکی زۆر ورد دروستکراوە، وەک خوا دەفەرمووێ: ﴿ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ ۝٧﴾السجدة، ئەو زاتەی کە هەر شتێکی دروستکردوە، زۆر چاکی دروستکردوە، یان وەک دەفەرمووێ: ﴿صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍ ۝٨٨﴾النمل، واتە: ئەوە دروستکراوی ئەو کەسەیە، کە هەموو شتێکی زۆر بە وردەکاریی دروستکردوە، ئنجا ئەو سیستم و ڕێک و پێکیی و یاساداریيە، لە شتەکاندا، ئەوە دەگەیەنێ کە دەبێ یاسادانەرێک و، ڕێکخەرێکیان لە پشتەوە هەبێ.

کەواتە: لە یەک کاتدا، ئەم ڕستەیەی کە مووسا ﷺ لە وەڵامی فیرعەوندا گوتوویەتی: هەر کام لەو دوو بەڵگەیە دەگرێتەوە، کە ئێمە ئەو دوو بەڵگەیەمان لە کتێبەکانی خۆماندا:

١- (خواناسیی، ئایین، ئیمان)، ٢- (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)، ٣- (ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طهحاویی)، ٤- هەروەها لە مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلى في كتاب الله**)، بە تایبەت لە کتێبی یەکەم و کتێبی سێیەمدا بە تەفصیل باسی ئەو دوو بەڵگەیەمان کردوە، کە بەهێزترین بەڵگەن بۆ سەلماندنی بوونی خوا ﷻ بۆ کەسانێک کە بە خوا ئاشنا نین، یان نکوولیی لێ دەکەن، ئەگەرنا بوونی خوا پێویستیی بە سەلماندن ناکات، بەڵکو وەک عاریف و خواناسەکان دەڵێن: ئەوە شتەکانن دەبێ بەڵگەمان هەبێ لەسەر ئەوە کە هەن، ئەگەرنا بوونی خوا ﷻ لە خوارسکی مرۆڤدا، لە سروشتی مرۆڤدا، شتێکی ڕیشەدارەو لە ڕاستییدا بەبێ خوا ﷻ تەصەووڕ نەدەکرا هیچ شتێک هەبێ، چونک هیچ شتێک بوونەکەی زاتیی نیە، جگە لە خوا ﷻ[1].

ئنجا ئێمە لەو کتێبانەدا، کە ئاماژەمان پێدان، وەڵامی ئەو پرسیارو ئیشکالەشمان داوەتەوە کە دەڵێ: ئەگەر هەموو شتێک خوا پەیدای کردوە، ئەدی کێ خوای پەیدا کردوە؟ جگە لەو سەرچاوانەی کە ئاماژەمان پێدان، نامیلکەیەکیشم لەو مانگانەی ڕابردوودا چاپکرا بە ناوی: (ژیان لە سایەی ئیمان و ڕەواندنەوەی گومانەکان) لەوێشدا یەکێک لەو ئیشکالانەی کە وەڵام دراونەوە، ئەوەیە کە لە ڕاستییدا هەموو پەیدا بووێک پێویستیی بە پەیدا کەرێک هەیە، نەک هەموو هەبووێک، بەڵێ خوا هەبوویە، بەڵام هەر بووەو بوونەکەی سەرەتای نیە، بەڵام شتانێک کە پەیداکراون، پێویستییان بە پەیداکەر هەیە، شتانێک کە دروستکراون، پێویستیان بە دروستکەر هەیە، بەڵام زاتێک کە دروست نەکرابێ و، نەبوون (عدم) پێش بوونی نەکەوتبێ، حەوجێی بە پەیداکەرو دروستکەر نیە.

---

(١) لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد لەبەر تیشکی زگماک و عەقڵ و زانست و وەحیی دا) بە تێروتەسەلیی لەو بارەوە دواوین.

بـا وێنەیەکـی ماتماتیکیـی، ژمێرەیـی، بێنینـەوە: ژمـارەی هـەزار (١٠٠٠) سـێ سـفرەکە، ژمـارە یـەک (١)یـان لـە پشـتەوە بـێ، دەبێتـە هـەزار و دەتوانیـن سـفرەکان زیـاد بکەیـن، نرخـە ژمێرەییەکـەی زیـاد دەکات، ئەگـەر سـفرێکی دیکـە دابنێیـن، دەبێتـە دە هـەزار، ئەگـەر دوو سـفر دابنێیـن دەبێتـە سـەد هـەزار، سـێ سـفری دیکـە دابنێیـن، دەبێتـە ملیۆنێـک، ئنجـا ئەگـەر لـە سـفری یەکـەم بپرسـی: ئـەو نرخـەت لـە کوێـوە هێنـاوە؟ کـە هـی خـۆی نیـە، دەڵـێ: لـەوەی دوای خـۆم بپرسـە، هەروەهـا تاکـو دەگاتـە سـەر یەکەکـە، لـە یەکەکە بپرسـی: ئـەو نرخـەت لـە کوێـوەو هێنـاوە؟ دەڵـێ: هـی خۆمـە، بـە بەڵگـەی ئـەوە کـە سـفرەکان لابـەری، یەک(١)ەکـە هـەر یەکـە، هەروەهـا بـە بەڵگـەی ئـەوەش سـفرەکان بوونەکەیـان زاتیـی نیـە و خـوازراوە، یەکەکـە لابـەرە، سـفرەکان ئەگـەر نـەک سـێ سـفرو شـەش سـفر، هـەزار سـفریش بێ، هـەزاران سـفر بـێ، هـەر سـفرن، هیـچ نرخێـک و بایەخێکیـان نیـە، بـەڵام یەکەکـە لـە زاتیـی خۆیـدا نرخـی هەیـەو، هـەر سـفرێک لـە پێشیشـی دابنرێ، نـرخ بەوانیـش دەدا، خـواش ﷻ بوونەکـەی زاتییـە، لـە خۆیەوەیـەو لـە هیـچ شـوێنێکەوە وەری نەگرتـوە، هـەر بۆیـەش دەتوانـێ بـوون بـە غەیـری خـۆی ببەخشـێ.

هەڵبەتـە ئـەوە بـۆ نیزیـک خسـتنەوەیە لـە عەقڵـی مـرۆڤ، ئەگەرنـا شـەئنی خـوا، پایـەی خـوا، زۆر لـەوە بەرزتـرە کـە بـەو شـێوەیە وێنـا بکـرێ.

٣)- ﴿ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴾، لە بەرامبەر ئەم وەڵامە ددان شکێنەی مووسادا ﷺ فیرعەون دەیەوێ بەملا و لادا بڕوات، باسەکە دەگۆڕێ، دەڵێ: ﴿ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴾، ئەدی حاڵی سەدە پێشووەکان چۆنە؟ مووساش ﷺ زۆر بە کورتیی وەڵام دەداتەوە وەك دوایی دێ.

وشەی (بال)، پێویستە ئەوەش بڵێین: کە وشەی (بال)، بۆ عەقڵیش بەکاردێ، دەڵێ: (مَا خَطَرَ بِبَالِي كَذَا)، ئەو شتەم بە زەیندا نەهات.

بەڵام لێرەدا بە تەئكید وشەی (بال) واتە: حاڵێكی گرنگ، یانی بەسەرهات و سەرگوزوشتەیان، یاخود سەرەنجامیان چۆن بوو؟

ڕوونكەرەوانی مەبەستەكانی قورئان لێرەدا هەندێكیان گوتوویانە: فیرعەون مەبەستی بووە كە باسەكە بگۆڕێ، لەبەر ئەوەی لەوێدا شكستی هێناوە، لە بەردەم ئەو وەڵامە ددان شكێنەی مووسادا ﷺ، كە دوو بەڵگەی هێناونەوە، هەردووكیان بەڵگە نەویستی عەقڵیین:

١- پەیدابوو پەیداكەری دەوێ.

٢- ڕێكخراو (مُنَظَّم)، ڕێكخەری دەوێ.

هەر كەسێك ڕێز لە عەقڵی خۆی بگرێ، نكووڵیی لە بەردەم ئەو دوو یاسا بەڵگە نەویستە عەقڵییەدا ناكات، هەندێكیشیان گوتوویانە: نا، بەڵكو مەبەستی فیرعەون ئەوە بووە كە باشە تۆ بۆ لای ئێمە هاتووی، ئەدی ئەو گەل و نەتەوانەی، ئەو كۆمەڵگایانەی لە پێش ئێمەدا ڕابردوون، ئەوان حاڵ و بەسەرهاتیان چۆنە؟ خۆ پێغەمبەریان بۆ نەچوون، وا دیارە فیرعەون نكووڵیی كردوە لەوە كە لە پێش مووسادا پێغەمبەرانی دیكە ڕابردبن، بۆیە مووسا ﷺ لەگەڵی ناچێتە نێو ئەو باسەوە، كە ئەو دەیەوێ بیورووژێنێ و، مووسا بە لاڕێدا بەرێ، بەڵكو هەر بە كورتیی دەڵێ: زانیاریی ئەو كۆمەڵگا پێشووانە كە لە سەدە پێشووەكاندا هاتوون، لە لای پەروەردگارمە، لە نووسینێكدا، واتە: وەک چۆن شتێک دەنووسرێ، زایە نابێ و لە بیر ناچێ و نافەوتێ، زانیاریی خواش ﷻ بەو شێوەیە، هەڵبەتە ئەوەش لەگەڵ ئەوەدا تێک ناگیرێ كە خوا ﷻ هەموو زانراوەكانی خۆی نووسیبن، بە شێوەیەک كە بۆ خوا شایستەیە، كە ئەوەش لە قورئاندا بەم ناوانە هاتوە:

١- ﴿وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ ١٢﴾ يس.

٢- ﴿كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٥٩﴾ الأنعام.

٣- ﴿فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ ٢٢﴾ البروج.

بە چەند شێوەیەک تەعبیری لێکراوە، کە دەگونجێ مەبەست پێی زانیاریی ڕەها و بێسنووری خوا بێ، دەشگونجێ خوا ﷻ ئەو زانیارییەی خۆی دەربارەی دروستکراوەکانی، لە شتێکدا کە پێی دەگوترێ: (لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ)، یان (إِمَامٖ مُّبِينٖ )، یان (كِتَٰبٖ مُّبِينٖ)، تۆمار کردبێ، یاخود ئەوە وێناکردنە بۆ عەقڵی ئێمە، کە ئێمە ئەگەر شتێک لە کتێبێکدا نووسیبمان و تۆمارمان کردبێ، لە بیرمان ناچێ.

٤)- ﴿قَالَ عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٖۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى﴾، (مووسا) گوتی: زانیاریی سەدە پێشووەکان واتە: ئەو نەتەوانەی، ئەو کۆمەڵگایانەی لە سەدە پێشووەکاندا ژیاون، لە لای پەروەردگارمە، لە نووسینێکدا کە پەروەردگارم نە لێی ون دەبێ، نە لە بیری دەچێ، یان پەروەردگارم نە بە هەڵەدا دەچێ و، نە لە یادی دەچێ.

﴿لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى﴾، وشەی (ضَلَّ) یانی: ون بوو، پەروەردگارم ون نابێ، کە لێرەدا مەبەست پێی هەڵەیە، یانی: بە هەڵەدا ناچێ، (ضَلَّ الطَّرِيْقَ)، ڕێگاکەی ون کرد، ﴿لَّا يَضِلُّ رَبِّي﴾، واتە: پەروەردگارم زانیارییەکەی لێ ون نابێ، بە هەڵەدا ناچێ، ﴿وَلَا يَنسَى﴾، لە بیریشی ناچێ، (النِسْيَانُ: عَدَمُ تَذَكُّرِ العِلْمِ)، (نسیان) ئەوەیە ئینسان شتێک بیزانێ و لە بیری بچێ.

٥)- ﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مَهۡدٗا﴾، ئەو زاتەی کە زەمینی بۆ کردوون بە ڕاخراو، خوێنراویشەتەوە: (مِهَادًا)، (الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ مِهَادًا)، هەروەک ئەو وشەیەی لە قورئاندا هاتوە، لە جێی دیکە، (مَهْدَاً ومِهَادَاً: أي مُمَهَّدَةً مُسَهَّلَةً لِلْمُسْيرِ وَالْجُلُوسِ وَسَائِرِ التَّصَرُّفَاتِ)، واتە: ئامادەکراو و تەخت و لەبار کراوو، ئاسانکراو، بۆ پێدا ڕۆیشتن و لەسەر دانیشتن و هەڵسوکەوتەکانی دیکە.

ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (یونس)دا باسێکمان دەربارەی گەردوون بە گشتیی و، باسێکمان دەربارەی خۆرو، یەکێک دەربارەی زەوی و، یەکێک دەربارەی مانگ، کردووەو، هەر کەسێک بزانێ ئەم زەوییەی ئێمە چەند جۆرە جووڵەی هەن، ئنجا قەدری ئەوە دەزانێ کە ئەم زەوییەی ئێمە لە بنمان دا ئارامەو

جووڵە جووڵی نیە، ئەو شتانەی کە لەسەرینی ئەزیەتیان نادات، چەند گرنگ و گەورەیە! چونکە ئەو زەوییەی ئێمە:

١- بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوەو، لە خولەکێکدا سی (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ.

٢- بە دەوری خۆردا دەخولێتەوەو لە چرکەیەکدا سی (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ.

٣- هەروەها لەگەڵ خۆردا بە دەوری داڵی ڕاوەستاودا دەخولێتەوە.

٤- لەگەڵ داڵی ڕاوەستاودا بە دەوری چەقی کەهکەشان دا دەخولێتەوە.

٥- لەگەڵ کەشکەشاندا خولانەوەیەکی دیکەی هەیە.

٦- لەگەڵ گەلە کەهکەشاندا کە کەهکەشانی ئێمە یەکێکیانە، دیسان سووڕانەوەیەکی دیکەی هەیە، یانی: ئەم زەوییەی ئێمە بە لای کەمەوە، پێنج شەش جۆرە سووڕانەوەی هەن، ئەوەندەی کە بۆ ئێمە دەرکەوتوە، لەگەڵ ئەوەشدا وەک ڕایەخێک، وەک شتێکی تەخت و لەبار کە ئێمە هەستی پێناکەین، ڕاخراوەو نامانکەوێنێ، دیارە زەوی زۆر گەورەیە، بۆیە تەخت دێتە بەرچاو، ئەگەرنا بۆ کەسێک لە دەریادا بڕوات، بە ئاشکرا دیارە کە زەوی خڕو هێلکەیی دەرکەوتوە، چونکە لە دەریادا، لە دوورەوە تەماشا دەکەی، کەشتییەک کە دێ، تەنیا گلۆفک و لووتکەی کەشتییەکە دیارە، دوایی وردە وردە هەمووی دەردەکەوێ، هەروەها ئەوە کە شەوو ڕۆژیش بەسەر زەویدا دابەش دەبن، ئێستا کە لێرە ڕۆژە، لە ئەمریکا شەوە، لە ئوستڕالیا شەوە، خڕێتیی زەوی، ئێستا بۆتە شتێکی ئاشکرا و بەڵگە نەویست.

٦)- ﴿وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا﴾، هەروەها (پەروەردگارمان ئەو کەسەیە) کە لە نێو زەوییدا ڕێی بۆ داناون، ڕێی بۆ خستوونە نێو زەوییەوە، ﴿وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا﴾، **(أي: جَعَلَهَا سُبُلاً سَالِكَةً فِي الأَرْضِ، أي: دَاخِلَةً فِيهَا مُتَخَلِّلَةً سَوَاءٌ كَانَتْ خَلْقِيَّةً أو صُنعِيةً)**، ڕێی بۆ لە زەویدا داناون، ڕێی بۆ خستوونە نێو زەوی، چونکە **(سَلَكَهُ)**، یانی: **(أَدْخَلَهُ)**، هەروەک **(أَسْلَكَه)**، یانی: خستیە نێوی، ئنجا ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ڕێی بۆ خستوونە نێو زەوی، واتە: وایکردوە کە ئەم سەرزەمینە ڕێی تێدا هەبن، دابڕاوایی تێدا هەبن و،

شوێنی وای تێدا هەبن، بتوانن پێیدا بڕۆن، چ خەلقیی بن و خوا ﷻ هێنابنە دی، وەک کەلێنی ئەو چیایانەی کە بەهۆی ڕووبارەکانەوە کەلێنیان تێکەوتوە، چ مرۆڤەکان بۆ خۆیان ئەو ڕێیانەیان دروست کردبن، گرنگ ئەوەیە خوا زەوی وا هەڵخستوە کە بتوانن ڕێیانی تێدا دابنێن.

٧)- ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾، لە سەرێوەش ئاوی بۆ دابەزاندوونە خوار، وەک زۆر جاری دیکە گوتوومانە: بۆیە خوا وشەی ئاو (مَآءً)، بەکاردێنێ، چونکە ئەوەی لە ئاسمان دێتە خوار، یان بارانە، یان بەفرە، یان تەرزەیە، یاخود شەونم و ئاونگە و، هەڵمە، کە وشەی (مَآءً)، هەموویان دەگرێتەوە، بەڵام ئەگەر هەر کامێکی دیکەیانی فەرمووبایە، هەر ئەوی دەگرتەوە، وشەی (ٱلسَّمَآءِ)یش یانی: سەرەوە، (مِنَ ٱلسَّمَآءِ)، یانی: (**مِنَ الفَوْق**)، (**مِنَ الأَعْلَى**)، یەکێ لە ماناکانی (ٱلسَّمَآءِ)، بریتیە لە سەرێ، بەڵکو مانا ئەصڵییەکەی ئەوەیە، ئنجا دوایی ئەو وشەیە دەخوازرێتەوە بۆ شتی دیکەش، وەک سەربان، وەک هەورێک لە سەرووەوەیەو، هەروەها وەک ئەو ئاسمانانەی کە خوا ﷻ حەوت ئاسمانی لە سەر یەک دروستکردوون.

٨)- ﴿فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّن نَّبَاتٖ شَتَّىٰ﴾، بەو ئاوەی کە لە سەرەوە دایدەبەزێنین، چەندان جووتی لە ڕووەکی جۆراوجۆریان دەرهێناون، ئنجا خوا ﷻ شێوازی قسەکان دەگۆڕێ و، قسەکانی پاڵ داوەتە لای خۆی، واتە: پێشێ مووسا ؈ قسە دەکات، یان خوا ﷻ بە شێوەی نادیار (**غائب**)، بەڵام دوایی بە شێوەی دواندن (**خطاب**)و شێوەکەی دەگۆڕێ، ئەوەش یەکێکە لە ڕووەکانی ڕەوانبێژیی، بۆ ئەوەی کەسێک قورئان دەخوێنێتەوەو، ئەو کەسەی کە گوێی لێیە، ڕابچڵەکێ، جارێ بە شێوەی نادیار، جارێک بە شێوەی دواندن، جارێک بە شێوەی قسە بێژ (**متكلِّم**)، جارێک بە شێوەی کۆ، جارێک بە شێوەی تاک.

بۆیــە دەفەرمــوێ: ﴿فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا﴾، بــەو ئــاوە کــە دامانبەزانــدوە لــە ســەرێوە، چەنــد جووتێکــمان پــێ دەرهێنــاون، ﴿مِّن نَّبَاتٖ شَتَّىٰ﴾، لــە ڕووەکــە جــۆراو

جۆرەکان، (نَبَات: مَصْدَرٌ سُمِّيَ بِهِ النَّابِتُ، وشَتَّى: جَمْعُ شَتِيْت، وَهُوَ المُشَتَّتُ أي: المُبْعَد)، وشەی (نَبَات)، چاوگە، ئەوەی کە دەڕوێ، کراوە بە ناو بۆ ڕواو، (نَابِت)، یانی: ڕووەک، ئەگەرنا وشەی: (نَبَاتِ)، یانی: ڕواو، ﴿وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا ١٧﴾نوح، (نَبَاتاً)، یانی: ڕواو، وشەی (شَتَّى)ش، کۆی (شَتِيْت)ە، (شَتِيْت)، یانی: (مشَتَّت)، واتە: دوورخراوە، یاخود لێکپچڕاو، لێکدابڕاو، ﴿مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ﴾، واتە: لە ڕووەکی جۆراو جۆر، بۆیەش وشەی (زَوْج)، بە کاردێنێ، چونکە ئێستا لە ڕووی زانستی ڕووەکناسییەوە، سەلمێندراوە، کە هەرچی دەڕوێ، هەڵبەتە ماددەی بێ ژیانیش، بەڵام ڕووەک هەرچی کە دەڕوێ، هەمووی جووتە، ئنجا هەیە جووتەکەی لە دەرەوەی خۆیەتی، نێر بە جیا و مێ بە جیا، وەک دارخورماو ژمارەیەک لە درەختەکان و گوڵەکان، هەشە لە نێو خۆیدایە، نێرە و مێیەکە، وەک لە تەفسیری سوورەتی (الرعد)دا، لەو بارەوە ڕوونکردنەوەی زیاترمان داوە.

٩)- ﴿كُلُوا۟ وَٱرْعَوْا۟ أَنْعَـٰمَكُمْ﴾، خۆشتان بخۆن، واتە: لە بەرو بووم و بەرهەمی ئەو ڕووەکە جۆراو جۆرە، ﴿وَٱرْعَوْا۟ أَنْعَـٰمَكُمْ﴾، ئاژەڵەکانیشتان بلەوەڕێنن، یانی: خۆتان لێی بخۆن و، ئاژەڵەکانیشتانی تێدا بلەوەڕێنن، هەڵبەتە وشەی (أنْعَام)، کە کۆی (نَعَم)ە، ئەمیش چوار جۆر ئاژەڵ دەگرێتەوە، وەک لە تەفسیری سوورەتی (الأنعام)دا بە تەفصیل باسمان کردوە: حوشترو ڕەشە وڵاخ و مەرو بزن، گامێشیش هەر دەچێتەوە نێو ڕەشە وڵاخ.

١٠)- ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ﴾، بە ڕاستیی لەوەدا کە باسکرا، نیشانە هەن بۆ خاوەن عەقڵان، (أولي)، یانی: (أصحاب)، ئەوە کۆیە، تاکەکەی لە بێژەی خۆی نیە، بەڵکو تاکەکەی (ذُو)، یان (ذَاتْ)، یانی: خاوەن، بەڵام کە دەکرێتە کۆ دەبێتە: (أولي)، (ٱلنُّهَىٰ) کۆی (نُهْيَة)یە، (نُهْيَة)، واتە: عەقڵ، لەبەر ئەوەی خاوەنەکەی قەدەغە دەکات، لە شتی خراپ.

خوا دەفەرموێ: لەوێدا نیشانە هەن بۆ خاوەن عەقڵان، لەوەدا کە باسکرا، واتە: خاوەن عەقڵان، ئەگەر عەقڵی خۆیان بەکار بێنن، لەو شتانەدا نیشانە و

بەڵگەیان هەن، لەسەر ئەوەی ئەم گەردوونە بێ خاوەن نیە، ئەم مرۆڤە لەسەر ئەم زەوییە لە خۆوە پەیدا نەبووەو، خاوەنێکی هەیە، مشوورخۆرێکی هەیەو لێی دەپرسێتەوەو سزا و پاداشتی بە پێی کردەوەکانی، بۆ داناوە.

١١)- ﴿ مِنْهَا خَلَقْنَٰكُمْ ﴾، لەوێدا واتە: لەم زەوییەدا ئێوەمان هێناوەتە دی، لەبەر ئەوەی جەستەی ئێمە، هەموو پێکهاتەکانی دەگەڕێنەوە بۆ توخمەکانی زەوی، ئەو ماددانەی کە لە زەوییدا هەن، هەر ئەوانەشن کە جەستەی مرۆڤ پێک دێنن، ئەوە لە ڕووە جەستەکەیەوە، ئەمما ڕووحەکە، دروستکراوێکی تایبەتی خوایە، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي ﴿٢٩﴾ ﴾الحجر، ڕووح پەیوەندیی بە زەوییەوە نیە، پەیوەندیی بە خاکەوە نیە، بەڵکو شتێکی سەروو ماددییەو دروستکراوێکی تایبەتە، واتە: خوای پەروەردگار بە تایبەت دروستی کردووەو بە بەر جەستەی مرۆڤیدا کردوە، هەر بۆیەش کاتێک جەستە دەخرێتە نێو خاک و دەبێتەوە بە خاک، ڕووح دەچێتە شوێنێکی دیکە، لە جیهانی بەرزەخدا، لە ناز و نیعمەتدا دەبێ، یاخود لە ئازارو مەینەتییدا دەبێت، تاکو ڕۆژی قیامەت.

١٢)- ﴿ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ ﴾، دەشتانگێڕینەوە بۆ نێو زەوی، واتە: کاتێک کە دەمرن جەستەکەتان دەخرێتەوە نێو خاک، یان دەبێتەوە بە خاک.

١٣)- ﴿ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴾، جارێکی دیکەش هەر لەوێ دەرتان دێنینەوە، لەوێ دەرتان دێنینەوە، واتە: ئەو جەستەیەتان کە بە زەوییدا بڵاودەبێتەوەو تێکەڵ بە زەوی دەبێتەوە، خوا ﷻ لە ڕۆژی زیندوو بوونەوەو ڕۆژی هەڵسانەوەدا، ئەو جەستەیە دروست دەکاتەوە و ئەو ڕووحەی بە بەردا دەکاتەوە.

هەڵبەتە ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە شاردنەوەی مردووان، ناشتنی مردووان لە زەوییدا، هەر ئەوە ڕێی ڕاستەو شێوەی ڕاستی شاردنەوەی مردووانە، چونکە ئەوەی کە مسوڵمان بێت، بەو شێوەیە مردووەکان بە خاک دەسپێرن و دەیاننێژن، لە ژێر زەوییدا دەیانشارنەوە، بە ڕێزو حورمەتەوە، بەڵام

هەندێک لە گەلانی دیکە هەن، بۆ وێنە: خەڵکێک لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، لە هیندۆسییەکان و لە بووداییەکان، مردووەکانی خۆیان دەسووتێنن، بەڵام حاڵەتی سروشتیی و حاڵەتێک کە لەگەڵ ڕێز و حورمەتی مرۆڤدا بگونجێ، هەر ئەوەیە کە خوا ئاماژەی پێکردووەو شەریعەتی ئیسلامیش تەبەنّنیی کردوە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان بیست و یەک ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٥٦ - ٧٦) لەو بیست و یەک ئایەتەدا، باسی ڕووبەڕوو بوونەوەی فیرعەون و جادووگەرەکانی لە لایەک، لەگەڵ مووسا و هاڕوونی برایدا، لە لایەکی دیکەوە، کراوە، کە سەرەنجام فیرعەون و جادووگەرەکانی تێدەشکێن و، گۆچانەکەی مووسا ﷵ دەبێتە مارێکی گەورە، کە لە کوردەوارییدا بە ماری گەورە دەڵێن: حەزیا، یان ئەژدیهاو سەرجەم ئەو گۆچان و پەت و گوریسانەی جادووگەرەکان، لەبەرچاوی خەڵک کردوویانن بە مار، هەڵدەلووشێ و، فیرعەونیش بۆ چەواشە کردنی خەڵکەکە جادووگەرەکانی خۆی بەوە تۆمەتبار دەکات، کە ئێوە هەمووتان شاگردی مووسان، مووسا مامۆستاتانە، ئەو فێری جادووی کردوون، بۆیە بەشێک لە جادووەکەی لەلای خۆی هێشتۆتەوە، فێری ئێوەی نەکردوە، بۆیە لە کاتی بەرەنگاربوونەوەی یەکدیدا، جادووی وی بەسەرتاندا زاڵ بووە، چونکە دیارە مامۆستا دەتوانێ هێندێک لە زانستەکەی فێری شاگردو قوتابییەکەی نەکات.

پاشان هەڕەشەی دەستی ڕاست و چەپ برین و، هەڵواسینیش لە جادووگەرەکان دەکات، ئەوانیش بێباکیی و، بێ منەتیی خۆیان بەرانبەری دەردەبڕن و بێ منەتی دەکەن.

پاشان لە سێ ئایەتی کۆتاییدا، باسی سەرەنجامی شوومی تاوانباران و، ئاکام خێریی بڕوادارانی کردار باش کراوە.

﴿ وَلَقَدْ أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ ﴿٥٦﴾ قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٥٧﴾ فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ

أَنتَ مَكَانًا سُوًى ﴿٥٨﴾ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى ﴿٥٩﴾ فَتَوَلَّىٰ
فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ﴿٦٠﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا
فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنِ ٱفْتَرَىٰ ﴿٦١﴾ فَتَنَٰزَعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَىٰ ﴿٦٢﴾
قَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ
ٱلْمُثْلَىٰ ﴿٦٣﴾ فَأَجْمِعُوا۟ كَيْدَكُمْ ثُمَّ ٱئْتُوا۟ صَفًّا ۚ وَقَدْ أَفْلَحَ ٱلْيَوْمَ مَنِ ٱسْتَعْلَىٰ ﴿٦٤﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ
إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ ﴿٦٥﴾ قَالَ بَلْ أَلْقُوا۟ ۖ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن
سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ فَأَوْجَسَ فِى نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾
وَأَلْقِ مَا فِى يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓا۟ ۖ إِنَّمَا صَنَعُوا۟ كَيْدُ سَٰحِرٍ ۖ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾ فَأُلْقِىَ
ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴿٧٠﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ
ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِى جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ
وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ ﴿٧١﴾ قَالُوا۟ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا ۖ
فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ۖ إِنَّمَا تَقْضِى هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ ﴿٧٢﴾ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ
أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ ۗ وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿٧٣﴾ إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ
فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿٧٤﴾ وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ ﴿٧٥﴾
جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴿٧٦﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیاییش تێکڕای بەڵگە و نیشانەکانی خۆمانمان پێشان (فیرعەون) دان، کەچی (پەیامی خوا) بە درۆی دانا و ملی نەدا (بۆ بەندایەتیی بۆ خوا) ﴿٥٦﴾ (فیرعەون) گوتی: ئەی مووسا! چما بۆمان هاتووی، تاکو بە جادووەکەت لەسەر زەمینمان وەدەرمان بنێی؟ ﴿٥٧﴾ مسۆگەر ئێمەش جادوویەکی هاووێنەیت بۆ دێنین، دە جا بەڵێنگەیەک لە نێوان ئێمە و خۆتدا دابنێ، کە نە ئێمە و نە تۆ لێی دوانەکەوین، با شوێنێکی تەخت و گۆڕ بێت ﴿٥٨﴾ (مووسا) گوتی: با جێژوانتان ڕۆژی ڕازانەوە (جەژن) بێ و، با خەڵکیش دەمە و چێشتەنگا و خڕبکرێنەوە ﴿٥٩﴾ ئیدی فیرعەون ڕۆیشت، یەکسەر پیلانەکەی (گێڕاو جادووگەرەکانی) خۆی کۆکردەوە (ئنجا هات) ﴿٦٠﴾ مووسا پێی گوتن: هاوار بۆ ئێوە! درۆ بە خواوە هەڵمەبەستن، کە بە هۆیەوە بە سزایەک بنبڕتان بکات و، مسۆگەر هەر کەس (درۆ) هەڵبەستێ بێ ئاکامە ﴿٦١﴾ ئیدی لە نێو خۆیان لە کارەکەیاندا کەوتنە ناکۆکییەوەو، بە پەنهانیی کەوتنە چپەکردن ﴿٦٢﴾ گوتیان: بێگومان ئەم دووانە جادووگەرن، دەیانەوێ بە جادووەکەیان لەسەر زەمینی خۆتان وەدەرتان بنێن و، ئایین و ڕێبازە هەرە باشەکەتان نەهێڵین ﴿٦٣﴾ بۆیە پیلان (و جادووگەرەکان)ی خۆتان کۆبکەنەوە، ئنجا بە ڕیز و تۆکمەیی وەرن، هەڵبەتە هەر کەس ئەمڕۆش سەر بکەوێ، براوەی ڕاستەقینەیە ﴿٦٤﴾ (جادووگەرەکان) گوتیان: ئەی مووسا! (سەرپشک بە) یان تۆ (گۆچانەکەت) فڕێ دەدەی، یان ئێمە یەکەمجار (گۆچان و پەتەکانمان) دەهاوێژین! ﴿٦٥﴾ (مووسا) گوتی: بەڵکو ئێوە (گۆچان و پەتەکانتان) فڕێبدەن، ئیدی (دوای فڕێدانیان) (مووسا) وای زانی پەت و گۆچانەکانیان دێن و دەچن ﴿٦٦﴾ بۆیە مووسا لە دەروونیدا ترسی ڕێ نیشت

﴿٦٧﴾ گوتمان: مەترسە! مسۆگەر هەر تۆ سەرکەوتوو و براوەی ﴿٦٨﴾ ئەوەش کە لە دەستی ڕاستت دایە، بیهاوێ، یەکسەر هەرچی (جادووی) کارامانە کردوویانە، قوتی دەدات، چونکە ئەوەی کارامانە کردوویانە، بەس فێڵی جادووگەرەو، جادووگەریش لە هەر کوێیەکەوە بێ سەرکەوتوو (سەرفراز) نابێ ﴿٦٩﴾ ئیدی یەکسەر جادووگەرەکان بە کڕنووشدا کەوتن، (دوای ئەوەی گۆچانەکەی مووسا جادووەکانی ئەوانی هەڵلووشیی)، گوتیان: بڕوامان بە پەروەردگاری هارۆون و مووسا هێنا ﴿٧٠﴾ (فیرعەون) گوتی: ئایا بەر لەوەی مۆڵەتتان بدەمێ، بڕواتان بۆ هێنا؟ بێگومان ئەو گەورەکەتانە کە فێری جادووی کردوون، بە دڵنیایی ڕاست و چەپ (دەست و لاق)تان دەبڕم و، بە قەدی دارخورمایانتانەوە دەبەستم، (هەڵدەواسم)و، زۆر باشیش دەزانن کامەمان (من یان پەروەردگاری مووسا و هارۆون) سزامان سەختترو بەردەوامترە! ﴿٧١﴾ (جادووگەرەکان) گوتیان: هەرگیز تۆ بەسەر ئەو بەڵگە ڕۆشنانەدا کە بۆمان هاتوون و، بەسەر ئەو کەسەدا کە هێناوینەدی، هەڵنابژێرین، هەرچی دەگونجێ تۆ بڕیاردەری بی، بڕیاری بدە، تەنیا لە (بازنەی) ئەم ژیانی دنیایەدا بڕیار دەدەی ﴿٧٢﴾ بێگومان ئێمە بڕوامان بە پەروەردگارمان هێنا، تاکو لە هەڵەکانمان و لەو جادووەی تۆ لەسەری ناچارت کردووین، ببانبوورێ و (پاداشتی) خواش چاکترو بەردەوامترە ﴿٧٣﴾ مسۆگەر هەر کەسێک تاوانبارانە بێتە خزمەت پەروەردگاری (سزای) دۆزەخی بۆ هەیە، کە نە تێیدا دەژی و نە دەمری ﴿٧٤﴾ هەر کەسێکیش بڕوادارانە بێتە خزمەتی، لە حاڵێکدا کە کردەوە چاکەکانی کردوون، ئا ئەوانە پلە بەرزەکانیان هەن ﴿٧٥﴾ کە باغ و بێستانە هەمیشەییەکانن، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، تێیاندا هەمیشەیین و، ئەوەش پاداشتی هەر کەسێکە خۆی پاک و چاک بکات ﴿٧٦﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(سُوًى): (مَكَانٌ سُوَى وَسَوَاءٌ، أَي: وَسَطٌ، وَسَوَّى الشَّيءَ: قَوَّمَهُ وَعَدَّلَهُ وَجَعَلَهُ سَوِيّاً)، (وَسَط)، واتە: نێوەڕاست، دەگوترێ، (سَوَّى الشَّيءَ)، واتە: ئەو شتەی ڕێک و ڕاست کردو، تەخت و یەکسانی کرد.

(فَيُسْحِتَكُم): واتە: بنبڕتان بکات، لە بەینتان ببات بە یەکجاریی، (أَسْحَتَهُ: اسْتَحْصَلَهُ)، واتە: ڕیشە کێشی کرد، هەروەها وشەی (سَحَتَهُ يَسْحَتُهُ سَحْتاً)، وەک (أَسْحَتَهُ، يُسْحِتُهُ، إسْحَاتاً)، هەروەها وشەی (سَحَّتَهُ، يُسَحِّتُهُ، تَسْحيتاً)، هەرسێکیان: (سَحَتَهُ، أَسْحَتَهُ، سَحَّتَهُ)، بە مانای بنبڕی کرد، ڕیشە کێشی کرد، نەیهێشت.

(خَابَ): (خَابَ يَخِيبُ خَيْبَةً، أَي: حُرِمَ وَمُنِعَ، وَلَمْ يَنَلْ مَا طَلَبَ، خَابَ سَعْيُهُ: ذَهَبَ أَمَلُهُ وَخَسِرَ)، کەواتە: وشەی (خَابَ يَخِيبُ خَيْبَةً)، واتە: بێبەش کراو ڕێی لێگیراو، ئەوەی کە داوای دەکرد، وەدەستی نەهێنا، بە کوردیی دەڵێین: مایە پووچ بوو، ڕەنج بە خەسار بوو، ڕەنجەڕۆ بوو، بێ هیوا بوو، تەما بڕاو بوو، بێمراد بوو، هەموو ئەو وشانە بەکاردەهێنرێن.

(ٱلْمُثْلَىٰ): (مُؤَنَّث)ی (أَمْثَل)ە، (الأَمْثَلُ: تَفْضِيلٌ مِنْ مَثُلَ)، بەسەردا هەڵبژاردنە لە وشەی (مَثُلَ)، دەگوترێ: (فُلَانٌ أَمْثَلُ بَنِي فُلَانٍ)، فڵانکەس باشترینی بەنی فڵانە، فڵان هۆزەیە، (أَي: أَدْنَاهُم لِلْخَيْرِ)، لە هەموویانەوە لە چاکە نیزیکترە، کەواتە (ٱلْمُثْلَىٰ)، واتە: باشترین ڕێباز، ﴿بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ﴾، واتە: ڕێبازە هەرە باشەکەتان.

(يُخَيَّلُ إِلَيْهِ): واتە: وای دەهاتە بەر چاو، وای دەهاتە بەر خەیاڵ، (خُيِّلَ إِلَيْهِ: أَنَّهُ كَذَا: لُبِّسَ وَشُبِّهَ وَوُجِّهَ إِلَيْهِ الوَهْمُ)، واتە: شتەکەی وا بۆ وێناکرا، وای لێحاڵییکرا، وای هاتە بەرچاو، وا چەواشە کرا لەبەر چاوی.

(فَأَوۡجَسَ): (أَوْجَسَ فُلاَنٌ: وَقَعَ فِي نَفْسِهِ الخَوْفُ)، ﴿ فَأَوۡجَسَ فِي نَفۡسِهِۦ خِيفَةٗ مُّوسَىٰ ﴾، واتە: مووسا بە پەنهانیی ترس چووە نێو دڵی، ترسی ڕێ نیشت، دەگوترێ: (أَوْجَستِ الأُذُنُ: سَمِعَتْ حِسَّاً)، واتە: شتێکی بیست، هەستێکی بیست، (وَأَوْجَسَ فُلاَنٌ، وَأَوْجَسَ القَلْبُ شَيْئاً، أَحَسَّ بِهِ، وَخَافَهُ)، واتە: ئەو شتەی هەست پێ کردو لەو شتە ترسا، (وَأَوْجَسَ فُلاَنٌ الأَمْرَ: أَضْمَرَهُ)، واتە: ئەو شتەی پەنهان کرد، پێچەوانەی دەریخست.

(مِّنۡ خِلَٰفٖ): واتە: بە پێچەوانەوە، (أَي: إِحْدَاهُمَا مِنْ جَانِبٍ، وَالأُخْرَى مِنْ جَانِبٍ آخَر)، کە دەڵێ: دەست و پێتان، یان: دەست و لاقتان ڕاست و چەپ دەبڕم، واتە: دەستی ڕاست و لاقی چەپ، بە پێچەوانەوە، دەست و لاقتان پێچەوانە دەبڕم، واتە: یەکیان لە لای ڕاست، یەکیان لە لای چەپ.

(وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ): بە تەئکید هەڵتاندەواسم، (الصَّلْبُ: تَعْلِيقُ الإِنْسَانِ للقَتْلِ وَشَدُّ صُلْبِهِ عَلَى الخَشَبِ)، (الصَلْب) ئەوەیە کەسێک ڕابوەستێنرێ بۆ ئەوەی بکوژرێ، ببەسترێتەوە بە دارێکەوە، یان: هەڵبواسرێ و پشتی بە تەختەیەکەوە ببەسترێ، (وَالصَّلِيبُ: أَصْلُهُ الخَشَبُ الَّذِي يُصْلَبُ عَلَيْهِ، وَالصَّلِيبُ عَلَى شَكْلِهِ)، (صَلِيب) بە خاچ دەگوترێ، لەسەر شێوەی ئەو تەختەیە کە مرۆڤی پێوە دەبەسترێ، چوارمێخە دەکێشرێ بۆ ئەوەی بکوژرێ.

(جُذُوعِ ٱلنَّخۡلِ): (جُذُوع: جَمْعُ جِذْعَ)، (جِذْع)یش واتە: (سَاقُ النَّخْلَةِ وَنَحْوِهَا)، قەدی دارخورما، بە قەدی دارخورماوە، دەبێ بە قەدەکەیەوە شەتەکی دابن و بەستبنی، ئنجا دەستی ڕاست و پێی چەپیشی بڕیون، تاکو بە ئازارو ئەشکەنجەوە تاکو خوێنیان تێدا دەبڕێ، بەو شێوەیە گیانیان دەربچێ.

## چەند زانیارییەك لە پەیمانی كۆنەوە:

وەک زێـدە زانیارییـەک ئەمـە بـاس دەکەیـن، کـە (**التفسـير التطبيقـي للكتـاب المقـدس، العهـد القديـم، السـفر الخـروج، الإصحـاح: ٧، ص١٤٣**)، لـە ژێـر ناوونیشـانی: (**الـرَّبُّ يُخَاطِـبُ مُـوسَى وَهَـارُون**)، (پـەروەردگار مووسـا و هـاڕوون دەدوێنـێ)دا، دەڵـێ:

ئـەو کاتـە مووسـا تەمەنـی هەشـتا سـاڵ بـوو، هاڕوونیـش تەمەنـی هەشـتا و سـێ سـاڵ بـووە، کەواتـە: هـاڕوون، لـە سـەرچاوەکانی دیکەشـدا هاتـوە، کـە لـە مووسـا گەورەتـر بـووە، بـە پێـی ئـەوەی ئێـرە، دەبـێ سـێ سـاڵ لـە مووسا گەورەتـر بووبـێ.

لە ژێر ناوونیشانی: (**مُعْجِزَةُ الحَيَّة**)، (موعجیزەی مار)دا، لە لاپەڕە (١٤٣) دەڵێ:

(**فَطَـرَحَ كُلُّ وَاحِـدٍ عَصَـاهُ فَتَحَوَّلَـتْ إِلَى حَيَّـةٍ، غَـيْرَ أَنَّ عَصَا هَـارُونَ ابْتَلَعَـتْ عِصِيَّهُـمْ**)، هـەر کامێـک لـە جادووگـەرەکان گۆچانەکـەی خـۆی فڕێـدا و بـوو بـە مـار، بـەڵام گۆچانەکـەی هـاڕوون هەمـوو گۆچانەکانـی ئەوانـی هەڵلووشـی.

بۆیـەش ئامـاژەم بـەوە دا، کـە لـە (پەیمانـی کـۆن)دا گۆچانەکـەی لـە مووسـاوە گواسـتۆتەوە بـۆ هـاڕوون، کـە بـە تەئکیـد ئـەوە هەڵەیـە، چونکـە گۆچـان بـە دەسـت مووسـاوە ﷺ بـووە، هـاڕوون تەنیـا هـاوکارو یارمەتییدەرێکـی بـووە، بـەڵام ئێمـە ئـەوەی کـە لـە (پەیمانـی کـۆن)دا لـەو بـارەوە هاتـوە، لـە کاتێکـدا دەگەینە تەفسـیری سـوورەتی (**القصـص**)، خـوا پشـتیوان بـێ باسـی دەکەیـن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی ئەو وتو وێژ و مشت و مڕەی نێوان مووسا ﷺو، هاڕوونی برای لە لایەک و، فیرعەون و دارو دەستەکەی لە لایەکی دیکەوە، کرد، ئنجا دەفەرمووێ: ﴿وَلَقَدْ أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ﴾، بە دڵنیایی ئێمە هەموو نیشانەکانی خۆمان پێشاندان (پێشانی فیرعەون)، بەڵام بە درۆی دانا، واتە: پەیامی خوای بە درۆ دانا، یاخود نیشانەکانی خوای بە درۆ دانان، ﴿وَأَبَىٰ﴾، یانی: (إمتنعَ) واتە: ملی نەداو ڕێی دانەگرت و، ملی نەدا بۆ پابەندیی بەشەریعەتەوە، بۆچی؟ چونکە بەرژەوەندیی لە لادان لە شەریعەتدا بوو، ئەگەر پابەندبایە بەو پەیام و بەو شەریعەتەی خوای پەروەردگارەوە، ڕێی ئەوەی لێدەگیرا کە سۆغرەو بێگار بە گەلی چەوساوەی بەنی ئیسرائیل بکات و، بیانچەوسێنێتەوە و نێرینەکانیان سەر ببڕێ و، مێینەکانیان بهێڵێتەوە، وەک کۆیلە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، وەک لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا دەفەرمووێ: ﴿فَقَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ۝٤٧﴾، واتە: ئایا بڕوا بێنین بۆ دوو بەشەران، بۆ دوو کەسان، کە دووی وەک خۆمانن و گەلەکەشیان ملکەچی ئێمەن و، ژێر دەستی ئێمەن، یاخود کۆیلەی ئێمەن!

ئنجا دەفەرمووێ: ﴿قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ﴾، فیرعەون گوتی: ئەی مووسا! بۆیە هاتووی بە جادووی خۆت ئێمە لەسەر زەمینی خۆمان وە دەربنێی، ئەوە تەنیا تۆمەتێک بووە فیرعەون دەیداتە پاڵ مووسا ﷺ، بوختانێکە پێی دەکات، چونکە مووسا نەیگوتوە: لەسەر زەمینی خۆتان وەدەرتاندەنێم، گوتوویەتی: بەنوو ئیسرائیلم وێبدەو چیدی مەیانچەوسێنەوە، ﴿فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ﴾، بەنوو ئیسرائیلمان

لەگەڵدا بنێرەو، چیدی دیکە مەیانچەوسێنەوە، لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبۡهُمۡ ﴾، بەنوو ئیسرائیلمان لەگەڵ دابنێرە، لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ فَأَرۡسِلۡ مَعِيَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿١٠٥﴾ ﴾**الأعراف**، هۆزی بەنی ئیسرائیل، گەلی ئیسرائیلم وێدەوەو، چی دیکە مەیانچەوسێنەوە، سۆغرە و بێگاریان پێ مەکە، کەچی فیرعەون بۆ وروژاندنی خەڵکی میسر (**قبطي**) یەکان، ئەو تۆمەتە ئاڕاستەی مووسا دەکات، وەک عادەتی هەموو ئەو فیرعەونانەی کاتێک لەگەڵ ئەوانەدا ڕووبەڕوو دەبنەوە، کە بە ڕێبازی پێغەمبەراندا (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) دەڕۆن و دەیانەوێ چی دیکە خەڵکی ڕەش و ڕووت نەچەوسێنرێتەوە و نەکرێتە کۆیلە، وەک خزمەتکارو ژێر دەست و بەر دەست مامەڵەی لەگەڵدا نەکرێ، هەمیشە ئەو تۆمەتە لەلایەن فیرعەون و خۆ بە زلگرو خۆ بە پەرستراوزان و، خۆ بە پەروەردگار زانانەوە ئامادەیە، ﴿ فَلَنَأۡتِيَنَّكَ بِسِحۡرٖ مِّثۡلِهِۦ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە جادوویەکی وەک جادووەکەی خۆتت بۆ دەهێنین، ﴿ فَٱجۡعَلۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكَ مَوۡعِدٗا ﴾، ئنجا لە نێوان خۆمان و خۆتدا بەڵێنگەیەک دابنێ، جێژوانێک دابنێ، (**موعِد**) دەگونجێ چاوگ بێ بە مانای (**وعد**) واتە: گفت و بەڵێن، دەشگونجێ ناوی شوێن بێ، واتە: جێژوان، دەشگونجێ ناوی (**کات**) بێ، واتە: بەڵێنگە، کە بەڵێنگە هەموویان دەگرێتەوە، فیرعەون، مووسا سەر پشک دەکات و خۆی وا پیشان دەدات زۆر بێ منەتە، دەڵێ: تۆ بەڵێنگەو جێژوانەکە دابنێ، تۆ شوێنی پێکگەیشتنەکە دابنێ، ﴿ لَّا نُخۡلِفُهُۥ نَحۡنُ وَلَآ أَنتَ ﴾، با نە ئێمە و نە تۆ لەو شوێنە دوا نەکەوین و، لەو بەڵێنە پاشگەز نەبینەوە، لەو جێژوانە پاش و پێش نەکەین و، لە کاتی خۆیدا ئامادە بین، ﴿ مَكَانٗا سُوٗى ﴾، با ئەو جێژوان و بەڵێنگەیە، شوێنکی تەخت بێ، بۆ ئەوەی هەر شتێک دەکرێ، هەموو خەڵک ببینێ و بەرزو نزمیی تێدا نەبێ، نەوەک هەندێک لە شتەکان پەنهان بن و، بە هۆی ئەوەوە کە لە شیوێکدا و لە پەنایەکدا دەکرێ، با تەخت و گۆڕ بێ.

واتەیەکی دیکەی ﴿ مَكَانًا سُوًى ﴾، شوێنێكی مام نێوەند، شوێنێكی میانجیی بێ، بەنسبەت خەڵكەكەوە بۆ ئەوەی هەموویان بتوانن بە ئاسانیی بیگەنێ و واتە: لە نێوەڕاستی شاردا بێ، یاخود شوێنێك بێ كە لە هەموو لایانەوە مەرج نیە تەنیا شار، بەڵكو لە هەموو دەڤەرەكانەوە، خەڵك بە ئاسانیی بیگاتێ، نەك خەڵكێك ڕێیەكی دوور ببڕێ تاكو دەیگاتێ، با بۆ هەموویان یەكسان بێ، هەردوو واتاكەی گونجاون.

﴿ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ ﴾، مووسا عليه السلام كە زۆر پشت ئەستووره بە بەڵێنی خواو، زۆر لە خۆی ڕادەبینێ، لە خوای خۆی ڕادەبینێ، ئەویش كاتێكی بۆ هەڵبژاردن، كاتێكی زۆر باش، هەم لە ساڵدا كاتێكیان هەبووە وەك دوایی باسی دەكەین، كە پێیان گوتوە: (**يوم الزِّينة**) ڕۆژی ڕازانەوە، كە لەو ڕۆژەدا جلی ئاڵ و واڵایان لەبەر كردوون، بۆنەیەكی باشیان بووە، یاخود هەر جەژنێكیان بووە، یاخود بۆنەیەكی ساڵانەیان بووە، ڕایەك دەڵێ: بە هۆی هەڵسانی ڕووباری نیلەوە، كە ڕووباری نیلیان بەرداوەتەوە بەو شا جۆگەیانەدا كە لێی هەڵبەستراون بۆ ئاودێریی، ئەو ڕۆژە پێیان گوتوە: (**يوم الزينة**) لە نێو قیبتییەكاندا باو و بووە، هەر چۆن بێ، دیارە ڕۆژێك بووە، تێیدا جوانیی هەبووە، ڕازاوەیی هەبووە، كەیف و شادمانیی دەربڕین هەبووە، ئەوە بە نیسبەت بۆنەكەوە، با لە بۆنەیەكی وا دابێ، كە خەڵك هەمووی ئامادە دەبێ، ﴿ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى ﴾، بۆ كاتی تێدا ئەنجامدانیشی دا، با خەڵكیش دەمەو چێشتەنگاو كۆبكرێنەوە، چونكە دەمەو چێشتەنگاو كە خۆر وەدەر دەكەوێ و، وردە وردە خۆر قایم دەبێ، خۆر بەرەو نێوەڕاستی ئاسمان دەچێ، ئەو كاتە سێبەر نامێنن، هیچ پەناو پەسیو نامێنن، هیچ حەشارگەو نەدیو نامێنن، هەموو شتێك دەكەوێتە گۆڕێ، وەك دەڵێ: لە ڕۆژی ڕووندا، كەسێك حەقی پێ بێ، پێی خۆشە قەرەباڵغیی زۆر بێ، پێشی خۆشە لەبەر ڕۆشناییدا بێ، ڕووبەڕوو بوونەوەكە لەبەر ڕۆشناییدا بێ، نەك لە شوێنێكی تاریك و پەڕگەو چۆڵگە، بۆیە مووسا عليه السلام هەم كاتێك قەڵەباڵغەو، هەم كاتێك كە دنیا زۆر ڕوونە، بۆیان دیاریی دەكات.

﴿ فَتَوَلَّىٰ فِرۡعَوۡنُ ﴾، فیرعەون ڕۆیشت، لێرەدا (تَوَلَّی) بە مانای پشت تێکردن نیە بۆ مووسا، بەڵکو یانی: ڕۆیشت، ﴿ فَجَمَعَ كَيۡدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ﴾، پیلانەکەی و فێڵەکەی کۆکردەوە، دوایی هات، پیلانەکەی بریتی بوو لە جادووگەرەکان، بە تەئکیدیش ڕاوێژی کردوە، تەگبیری کردوە، لەگەڵ ئەوانەدا کە بە دەوریەوە بوون، ئەوانەی وابەستەو دابەستەی بوون، دوایی هات، ﴿ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ وَيۡلَكُمۡ لَا تَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ﴾، لێرە پێشەکییەکانی ڕووبەڕوو بوونەوەکە خوای پەروەردگار هەموویان دەپێچێتەوە، وەک لە سوورەتی (الأعراف)دا کە ڕابردو، لە سوورەتی (القصص)دا کە دەیگەینێ، دەفەرموێ: جاڕدەری ناردن، جاڕیان دا لە شاران، کام جادووگەر زۆر زانا و شارەزایە بیهێنن، هەموویان کۆکردنەوە، ئنجا خەڵکیان کۆکردەوە، خوای زاناو توانا ئەوە هەمووی دەپێچێتەوە، تەنیا بەوەندە کورتی دەکاتەوە: ﴿ فَجَمَعَ كَيۡدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ﴾، فیرعەون ڕۆیشت پیلان و فێڵی خۆی کۆکردەوە، دوایی هات.

﴿ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ وَيۡلَكُمۡ ﴾، مووسا پێی گوتن: سزای سەخت بۆ ئێوەو هاوار بۆ ئێوە، یاخود سەرسوڕمان بۆ ئێوە، ﴿ لَا تَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ﴾، درۆ بە ناوی خواوە هەڵمەبەستن، درۆ بە خواوە هەڵمەبەستن کە بڵێن: هاوبەشی هەن، کە بڵێن: ئەوەی مووسا دەیکات جادووە، ئەوە درۆ بە خواوە هەڵبەستنە، ﴿ فَيُسۡحِتَكُم بِعَذَابٖ ﴾، ئەگەرنا بە هۆی سزایەکەوە، بنبڕتان دەکات، دوابڕاوتان دەکات، کەستانی ناهێڵێ، ﴿ وَقَدۡ خَابَ مَنِ ٱفۡتَرَىٰ ﴾، بە دڵنیایی بێمرادو پەشێمان و بێ بەشە، کەسێک کە شت بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ، ئنجا هاوبەشی بۆ هەڵبەستێ، یاخود درۆی بۆ هەڵبەستێ، بڵێ: تۆ پێغەمبەرت نەناردوەو پەیامت نەناردوە، یاخود موعجیزەیەک کە خوا دەیدات بە پێغەمبەران (عَلَيۡهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، تۆمەتی جادووی بداتە پاڵ و بڵێ: ئەمە جادووە، هەموو ئەمانە هەڵبەستنن لەسەر خواو بە ناوی خواوەو، هەر کەسێک وابێ، پەشێمانەو بێ بەشە، ﴿ فَتَنَٰزَعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَىٰ ﴾، دوای ئەوەی مووسا ئەو

قسەیەی بۆ گوتن و ئەو هەڕەشەیەی لێکردن، لە نێو خۆیاندا لە کارەکەیاندا کەوتنە ناکۆکیی، هەندێکیان گوتوویانە: با ڕووبەڕوو ببینەوەو، هەندێکیان گوتوویانە: با ڕووبەڕوو نەبینەوە، دیارە هەندێکیشیان گوتوویانە: ئەوەی مووسا پێیەتی موعجیزەیەو، جیایە لە جادوو، با ئیمانی پێ بێنین و، مووساو هاڕوون دوو پیاوی زۆر نەجیبن و زۆر ڕاستگۆن، لێیان ناوەشێتەوە بە ناوی خواوە درۆ بکەن، خەڵکێکی دیکەیان جۆرێکی دیکەیان بیر کردۆتەوەو ڕا جیایان بۆ پەیدا بووە، هەق هەمیشە قورسایی و کاریگەریی خۆی هەیە لەسەر عەقڵ و دڵ و دەروونی خەڵک، با حەقێکی ڕووتیش بێ و دەسەڵاتیشی لە پشتەوە نەبێ، ئەگەرنا مووسا لەگەڵ هاڕوونی برای، تەنیا گۆچانەکەیان پێ بووە، ﴿وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَىٰ﴾، لە نێوان خۆیاندا بە چپە قسەیان کرد، بە سرکە سرک و بە فسکە فسک قسەیان کرد، چییان گوت؟

﴿قَالُوٓا۟ إِنْ هَـٰذَٰنِ لَسَـٰحِرَٰنِ﴾، بە دڵنیایی ئەوانە دوو جادووگەرن، ﴿يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا﴾، دەیانەوێ بە جادووەکەیان ئێوە لەسەر زەمینی خۆتان دەربکەن، ﴿وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ﴾، ئەو ڕێبازە هەرە چاکەی ئێوەش لە بەین بەرن.

(**ماشاءالله**) ڕێبازێکی چەند چاک بووە! فیرعەونیان بە پەروەردگارو بە پەرستراوی خۆیانیان زانیوەو، خۆیان بە کۆیلەو خزمەتکاریی زانیوە، ڕێباز دەبێ هەر وابێ!

(**سبحان الله**) ئەوانەی کاسە لێس و بەرماو خۆری ستەمکارانن، ئەوەی کە دەیکەن ئەو شێوە ژیان و زەلیل و زەبوونانەیەی کە بەسەری دەبەن، پێیان ژیانێکی زۆر شەرافەتمەندانەیە، خۆیان زۆر پێ بەختەوەرە، چونکە مرۆڤ کاتێک کە عیززەت و کەرامەت و ڕێزو حورمەتی خۆی لە دەست دەدات، خۆی لەلا ئەوەندە بچووک دەبێتەوە، بە شانازیی دەزانێ کە ببێتە کۆیلەو خزمەتکارو کاسە لێسی ستەمکارێک، ئەگەرنا ئەوە چ ڕێبازێکی هەرە چاک بووە، کە فیرعەون

جگە لەوەی کە گەلی بەنوو ئیسرائیل وەک کۆیلە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردن و سۆغرەبێگاریان پێ کردوون، نێرەکانی سەربڕیون و مێیەکانی هێشتوونەتەوەو، قیبتییەکانیشی پێیگوتوون: (أَنَا رَبُّكُمُ اللهُ الأَعْلَى)، واتە: من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم، بەڵکو بە دارو دەستەکەی کە لە دیوەخانەکەشی دانیشتوون، وەک لە سوورەتی (القصص)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: فیرعەون گوتی: ئەی قسە بەدەستان و قسە ڕۆیشتووانی دیوەخانەکەم! جگە لە خۆم پەرستراوێکی دیکەم پێ شک نایەت، بۆ ئێوە، دەبێ هەر من بپەرستن، هەڵبەتە لێرەدا خەڵکەکە ئەو خەڵکەی کە ویستوویانە بەرەنگاری مووساو هاروونی برای ببنەوە، وەک ئەشکەوت وابوون، فیرعەون پێشێ چی گوتوە، ئەوانیش هەر هەمان شتیان دووبارە کردۆتەوە، ئەشکەوت هەر قسەیەکی تێدا بکەی، دەنگ دەداتەوە، وەک تۆی دەڵێتەوە، فیرعەون پێشێ گوتوویەتی: تۆ هاتووی بە جادووەکەی خۆت ئێمە لەسەر زەمینی خۆمان وەدەر بنێی، ئەوانیش هەمان شت دووبارە دەکەنەوە، ئەوەشی بۆ زیاد دەکەن دەڵێن: مووساو هاروون هاتوون کە ڕێبازە هەر باشەکەشتان بفەوتێنن، لە بەینی بەرن، ئەو ئایین و بەرنامە چاکەی لەسەری دەڕۆن.

﴿ فَأَجْمِعُوا۟ كَيْدَكُمْ ثُمَّ ٱئْتُوا۟ صَفًّا ﴾، پیلان و فێڵی خۆتان کۆ بکەنەوە، واتە: تۆکمەی بکەن، هەمووی پێکەوە ڕێکی بخەن، دوایی بەڕیز وەرن، مەرج نیە بە یەکڕیز بێن، مانای وایە ڕیز بە ڕیز وەرن بە ڕێک و پێکیی، ﴿ وَقَدْ أَفْلَحَ ٱلْيَوْمَ مَنِ ٱسْتَعْلَىٰ ﴾، بە دڵنیایی هەر کەسێک ئەمڕۆ سەرکەوێ، سەرفرازە و براوەیە و بردوویەتەوە.

﴿ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ ﴾، گوتیان: ئەی مووسا! یان تۆ دەبێ بیهاوێی، گۆچانەکەی خۆت بهاوێی، یاخود ئێمە یەکەم کەس دەبین کە دەهاوێین، واتە: ئەو شتانەی کە پێمانن، تەماشایان کردوە مووسا گۆچانی پێیە، دیارە ئەوەی کە مووسا دەیەوێ بیکات، کە مووسا دەڵێ: موعجیزەو بەڵگەی

پێغەمبەرایەتیی منە و خوا پێی داوم، ئەوانیش گوتوویان: جادوویەو زانیویانە کە بە هۆی گۆچانەکەیەوە دەیکات، گوتوویانە: تۆ گۆچانەکەت باوێ، یان تۆ دەیهاوێی، یاخود دەبێ ئێمە ئەوانەی پێمانن، بیانهاوێین، ئەوانەی پێیان بوون، وەک لێرە دەقی لەسەر کردوە، هەم گۆچان بوون، هەم پەت و گوریسیش بوون.

﴿ قَالَ بَلۡ أَلۡقُواْ ﴾، مووسا زۆر بێ منەتانە فەرمووی: بەڵکو ئێوە بیهاوێن و شتەکانی خۆتان فڕێ بدەن، ئنجا خوای کاربەجێ ئەوە هەمووی دەپێچێتەوە، چییان کردوەو، چۆن هاویشتوویانەو، یەکسەر دەفەرموێ:

﴿ فَإِذَا حِبَالُهُمۡ وَعِصِيُّهُمۡ يُخَيَّلُ إِلَيۡهِ مِن سِحۡرِهِمۡ أَنَّهَا تَسۡعَىٰ ﴾، یەکسەر پەتەکانیان و گۆچانەکانیان، بە هۆی جادووەکەیانەوە، وایهاتە بەر خەیاڵ کە دەڕۆن، (**حِبال**) کۆی (**حَبل**)ە، (**حبل**) واتە: پەت، گوریس، ئەوەی کە شتێکی پێ دەپێچرێ، (**حبالهم**) پەت و گوریسەکانیان، (**عِصي**) کۆی (**عصى**)یە، واتە: گۆچانەکانیان، ﴿ يُخَيَّلُ إِلَيۡهِ ﴾ وای دەهاتە بەرچاو، وای دەهاتە بەر خەیاڵ، وای دەهاتە زەینەوە، ﴿ مِن سِحۡرِهِمۡ ﴾، بە هۆی جادووەکەیانەوە، ﴿ أَنَّهَا تَسۡعَىٰ ﴾، (بە هۆی جادووەکەیانەوە وا دەهاتە بەر خەیاڵی مووسا)، کە دەڕۆن و دێن و دەچن وەک ماران، ﴿ فَأَوۡجَسَ فِي نَفۡسِهِۦ خِيفَةٗ مُّوسَىٰ ﴾، مووسا لە دەروونی خۆیدا ترسی ڕێ نیشت، ترسی چووە نێو دڵەوە، ترسەکە ئایا لە مارەکان بووە، کە گۆچان و پەت و گوریسەکان بوون بە مار، یان لەوە کە خەڵکەکە فریو بخۆن، لە هەندێک کتێباندا دەڵێن: جادووگەرەکان دە (١٠) هەزار کەس بوون، هەندێک دەڵێن: پەنجا (٥٠) هەزار کەس بوون، بەڵکو هەندێ کەس ژمارەی زۆر زیاتر دەڵێن، کە پێم وایە زێدەڕۆییە، بە تایبەت ئەو کاتە مرۆڤ لەسەر زەوی بە گشتیی کەم بوون، ئنجا جادووگەران لە وڵاتێکی وەک میسردا بە تەنیا دەبێ چەند بوو بوون! بەڵام گرنگ ئەوەیە کۆمەڵێک بوون، دەشگونجێ ترسەکەی لە مارەکان نەبوو بێ، بەڵام ترسەکەی لەوە بووە، کە ئەو خەڵکە بە دیتنی دیمەنی ئەو هەموو مارانە، ڕەنگە سواری یەکدی بووبن و، پێکدا هاتوو چوو

بن، خەڵکەکە بکەوێتە ژێر کاریگەریی و، بڕوا بە جادووی جادووگەران بێنن، یاخود لەگەڵ موعجیزەی مووسا ﷺ لێیان تێکەڵ بن، بڵێن: ئنجا مووسا تۆ کە داوای پێغەمبەرایەتیی دەکەی، شتێکت کرد، ئەوانیش هەمان شتیان کرد، ئەگەر تۆ پێغەمبەر بی، ئەوانیش هەر پێغەمبەرن، کەواتە: تۆ ڕاست ناکەی، یانی: مەرج نیە ترسەکەی لە خودی خۆی بووبێ و، ترسەکەی ڕەنگە لەوە بووبێ، کە خەڵکەکە گومان و دوو دڵییەکی بۆ دروست بێ.

﴿ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ ﴾، پێمان گوت: مەترسە، بە دڵنیایی تۆ سەرکەوتووی، تۆ لە سەرێی و براوەی، ﴿ وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓاْ ﴾، ئەوەی بە دەستی ڕاستتەوەیە، فڕێی بدە، هەرچی بە کارامەیی کردوویانە، قووتی دەدات و هەڵیدەلووشێ، نەیفەرمووە: (وَأَلْقِ عصاك) لە شوێنی دیکەدا دەفەرمویّ: ﴿ أَلْقِ عَصَاكَ ﴿١١٧﴾ ﴾ **الأعراف**، گۆچانەکەت فڕێدە، بەڵام لێرە دەفەرمویّ: ﴿ وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ ﴾، ئەوەش کە بە دەستی ڕاستییەوە بووە، هەر گۆچانەکەی بووە، ئنجا خوا ﷻ ڕەنگە جارێک فەرمووبێتی: ئەوەی بە دەستی ڕاستتەوەیە فڕێیبدە، جارێکی دی فەرموویەتی: گۆچانەکەت فڕێبدە، هەردووکیان هەریەک شتن، ﴿ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓاْ ﴾، (لَقِفَ يَلْقَفُ)، واتە: (ابتلَعَ، يبتلعُ) قووتیدا و قووتی دەدات و هەڵیدەلووشێ، ﴿ مَا صَنَعُوٓاْ ﴾، واتە: ئەوەی بە کارامەیی و بە وردەکاریی کردوویانە، هەموو هەڵدەلووشێ، واتە: ئەو پەت و گوریسانە و گۆچانانە، ﴿ إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيْدُ سَٰحِرٍ ﴾، ئەوەی کە دروستیان کردوە، فێڵ و پیلانی جادووگەرە، خوێنراویشەتەوە: (إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيْدَ سَٰحِرٍ) ئەوانە پیلانی جادووگەرییان دروستکرد، ﴿ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴾، جادووگەر لە هەر شوێنێکەوە، لە هەر ڕێیەکەوە هاتبێ، سەرفراز نابێ، لەبەر ئەوەی ئەو جادووگەرە هەریەکەو هی شوێنێک بوون، یاخود جادووگەر هەرچی بێ سەرفراز نابێ.

﴿ فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴾، جادووگەرەکان بە کڕنووش دا کەوتن، بە کڕنووش داخران، (فَأُلْقِيَ) واتە: خران، ﴿ فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا ﴾،

جادووگەرەكان بە كڕنووش داخران، (سُجَّدْ) كۆی (ساجِدَ)، (سَحَرَة)ش كۆی (ساحِرَ)، هەڵبەتە خۆیان كڕنووشیان بردوە، بەڵام لێرەدا ئەمە ئەوەمان بۆ وێنە دەكات، كە لە بەرانبەر ئەو موعجیزەیە گەورەیەی مووسادا، ویستی ئازادانەی خۆیان لە دەست داوەو، ناچار بوون لە بەرانبەریدا بە كڕنووش دا بچن، هەڵبەتە كڕنووش بردنەكەیان بۆ خوا ﷻ بووە.

﴿ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴾، گوتیان: بڕوامان بە پەروەردگاری مووساو هاڕوون هێنا، لێرەدا وشەی هاڕوون پێش مووسا خراوە، لە شوێنی دیكەش مووسا پێش هاڕوون دەخرێ، گرنگ ئەوەیە هەردووكیان برا بوون، لێرەدا بە ئیعتیباری ئەوە كە هاڕوون لە مووسا بە تەمەنتر بووە، پێشخراوە كە بێگومان خوا ﷻ پەروەردگاری هەردووكیان بووە، مووساش پێش دەخرێ بە ئیعتیباری ئەوە كە مووسا لە ئەصڵدا هەڵگری پەیامی خوای پەروەردگار بووەو، هاڕوون هاوكارو یارمەتییدەری بووە.

﴿ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ﴾، فیرعەون بە سەرسووڕمانەوەو بە نكووڵیلێكردنەوە، گوتی: ئەوە بڕواتان بۆ هێنا بەر لەوەی مۆڵەتتان بدەم؟ دەبێ بە مۆڵەتی فیرعەون خەڵک بڕوا بێنێ، یاخود بڕوا نەهێنێ، ئەو فیرعەونانە زۆر لە خۆیان ڕادەبینن! بۆیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾، یاخیی بووە، لە سنوور دەرچووە، لە كەوڵی خۆی دەرچووە، دەڵێ: دەبێ بە مۆڵەتی من بیر بكەنەوە، ئایا ئەو شتە هەقە یان ناهەقە؟ ئایا بڕوای پێ بێنین، یان بڕوای پێ نەهێنین؟ ﴿ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ﴾، فیرعەون چەند فێڵ باز بووە! چەند ساختەچی بووە! ئەو چەواشەكارییە دەكات، دەڵێ: بە دڵنیایی ئەوە، ئەو گەورەیەتانە كە جادووی فێری ئێوە كردوە! مووسا یەكەمجارە هەر بیانبینێ، مووسا نە جادووی خوێندوەو، نە جادووی كردوە، پاشان ئەمە یەكەمجارە ئەو جادووگەرانە ببینێ، ئەو جادووگەرانە وەک لە سوورەتی (القصص)دا، هەروەها لە سوورەتی (الأعراف)دا هاتوە، داوای خەڵات و بەراتیان لە فیرعەون كردوە، ئەگەر

ئەوان زاڵ بوون، بەڵام بە هەر حاڵ بۆ چەواشەكردنی خەڵک و جەماوەرەكەو، بۆ پەردە پۆش كردنی شكستی خۆی و جادووگەرەكان، ئەو تۆمەتە دەداتە پاڵ دەداتە لای مووسا، كە گەورەی جادووگەرەكانەو، ئەو تۆمەتەش دەداتە پاڵ جادووگەرەكان، كە شاگردو قوتابیی مووسان.

﴿فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٍ﴾، ئەوانە دیارە فیرعەون كۆی كردوونەوە ئەو حوكمڕانییە لەرزۆكەی بۆ بپارێزن و بۆ بەهێز بكەن، بەڵام ئێستا كە لە فریای نەهاتوون و دادی نادەن، دەیانكوژێ، بۆ ئەوەی ئەو تۆمەتەی بۆ مووسای كردوە ﷺ، لە عەقڵی خەڵكدا بچەسپێ، (ئەها دیارە ڕاست بوو كە فیرعەون گوتی: مووسا مامۆستاتانەو گەورەتانەو فێری جادووی كردوون، ئەوە نیە ئەوەتا كوشتوونی)، كەواتە: ئەوانە ناپاكییان كردوە و خیانەتیان كردوە، بۆیە فیرعەون كوشتوونی، ناڵێن لەبەر ئەوەی كە ئیمانیان هێناوە، فیرعەون ناڵێ لەبەر ئەوەی ئیمانتان هێناوە، بەڵكو دەڵێ: لەبەر ئەوەی جادوو لە مووسا فێر بوون، چ چەواشەكارییەک!! ئەو چەواشەكارییانە بەردەوام هەن لە مێژوودا، بەڵام خەڵكی سادە و سەتحیی و سەركێڵ بەو جۆرە چەواشاكارییانە فریوو دەخۆن و كڵاویان دەچێتە سەر، كە خەڵكی هۆشیارو بێدار بەو شتانە فریو ناخۆن، هەر بۆیە پێغەمبەران (عَلَيۡهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هەمیشە هەوڵیان ئەوە بووە كار لەسەر عەقڵ و دڵی خەڵک، بكەن، عەقڵیان هۆشیار بكەن و دڵیان بێدار بكەن، بۆ ئەوەی كڵاویان نەچێتە سەرو فریو نەخۆن، چونكە ئەو فیرعەون و **طاغووتانە**، زەفەر بە خەڵكی سادەو سەركێڵ و فەقیرحاڵ و نە شارەزاو نا ئاشنا دەبەن.

ئنجا هەڕەشەیان لێ دەكات: ﴿فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٍ﴾، بە دڵنیایی دەستەكانتان و لاقەكانتان بە پێچەوانەوە دەبڕم، واتە: دەستی ڕاستتان و لاقی چەپتان، ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخۡلِ﴾، هەروەها بە قەدی دار خورماكانەوە، دەتان بەستمەوە و هەڵتاندەواسم، ﴿وَلَتَعۡلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابٗا وَأَبۡقَىٰ﴾، بە دڵنیاییەوە دەزانن كامەمان، واتە: من یان پەروەردگاری مووسا،

سزای سەختترە و بەردەوامترە، ئنجا جادووگەرەکان، کە پێشێ داوای خەڵات و بەراتیان دەکردو دەیانگوت: ﴿إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾﴾، ئایا کرێمان دەدەیە، ئەگەر ئێمە زاڵ بووین؟ وەک لە سوورەتی (الأعراف)دا هاتووەو، هەروەها یان لە سوورەتی (الشعراء)دا کە دەفەرموێ: ئایا کرێمان دەبێ ئەگەر ئێمە زاڵ بووین؟ لەوێ چاوەڕێی زار چەورکردنێک و، دەم شیرین کردنێک و خەڵات و بەراتێکیان دەکرد، لەبەرئەوەی بێ ئیمان بوون، بەڵام ئێستا کە ئیمانیان پەیدا بووە، کەسایەتیی و ڕێزو پایەی خۆیان دەزانن و، حورمەتیان لە لایەن خوا بۆ پەیدا بووە، بۆیە نەک هیچ چاوەڕوانییەکیان لە فیرعەون نیە، بەڵکو لە هەڕەشەو گوڕەشەکەشی ناترسێن.

﴿قَالُواْ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ﴾، گوتیان: تۆ هەڵنابژێرین بەسەر ئەو بەڵگە ڕۆشنانەدا کە بۆمان هاتوون، ﴿وَٱلَّذِى فَطَرَنَا﴾، هەروەها تۆ هەڵنابژێرین بەسەر ئەو کەسەدا کە ئێمەی وەدیهێناوە.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە، گوتیان: ئێمە تۆ هەڵنابژێرین بەسەر ئەو بەڵگە ڕۆشنانەدا کە بۆمان هاتوون لەسەر دەستی مووسا ﷺ، ﴿وَٱلَّذِى فَطَرَنَا﴾، سوێند بەو کەسەی کە ئێمەی هێناوەتە دی، ﴿فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ﴾، ئنجا هەرچی لە دەستت دێ، بیکەو، هەرچی تۆ ئەنجام دەری، ئەنجامی بدە، هەرچی تۆ جێبەجێ کەری و بۆت دەلوێ، جێ بەجێی بکەی، جێبەجێ بکە، بێ منەت بە، چیت لە دەست دێ، بیکە، ﴿إِنَّمَا تَقْضِى هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ﴾، بێگومان تۆ تەنیا لە چوارچێوەی ئەم ژیانی دنیایەدا، ئەنجام دەدەی و شت جێبەجێ دەکەی، ﴿إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ﴾، ئێمە بڕوامان بە پەروەردگارمان هێناوە، تاکو لە هەڵەکانمان ببووری و، ئەو جادووەی کە تۆ بە ناچاریی پێت کردووین، لێمان ببووری، وا دیارە فیرعەون کەسانێکی هەر بە منداڵیی لە دایک و باییان زەوت کردوون و، خستوونیە ئەو قوتابخانەیە کە فێری جادوویان بکەن و پەروەردەیان بکەن لەسەر جادووگەرێتیی، دیارە بە زۆر

بووە و بە ناچاریی ناچارکراون کە فێری جادوو بن، کەسێک هەقی پێ نەبێ، خۆی پێ بپارێزێ، دێ پەنا بەرێتە بەر بەتاڵ، فیرعەونیش کە هەقێکی پێ نەبووە، موڵک و سەڵتەنەتەکەی خۆی پێ بەردەوام بکات، پەنای بردۆتە بەر جادووگەرو خەڵکی هەڵخەڵەتێنەرو چاو بەستکەر، ﴿وَٱللَّهُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ﴾، بێگومان خواش باشترە، (واتە: پاداشتی خوا باشترە و بەردەوامتریشە).

﴿إِنَّهُۥ مَن يَأۡتِ رَبَّهُۥ مُجۡرِمٗا﴾، بە دڵنیاییی هەر کەسێک تاوانبارانە بچێتەوە خزمەت پەروەردگاری، ﴿فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ﴾، بێگومان دۆزەخی بۆ هەیە، ﴿لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ﴾، نە تێیدا دەمرێ و نە تێیدا دەژی، تێیدا نامرێ هەرچەندە سزایەکەی زۆر سەخت و ناڕەحەتە، بەڵام رووحی لە جەستەی جیا نابێتەوە، ﴿وَلَا يَحۡيَىٰ﴾، هەروەها ناژی، ژیانێکی ئاسایی کە پێی بگوترێ: ژیان، ﴿وَمَن يَأۡتِهِۦ مُؤۡمِنٗا قَدۡ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، هەر کەسێکیش بە بڕواوە بچێتەوە خزمەت خوا، بڕوادارانە بچێتەوە خزمەت خوای پەروەردگاری، لە حاڵێکدا کردەوە باشەکانی ئەنجام داون، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلۡعُلَىٰ﴾، ئا ئەوانە پلە بەرزەکانیان هەن، واتە: لە بەهەشتدا، ﴿جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾، باغ و بێستانە هەمیشەییەکان رووباریان بە ژێردا دەڕۆن و، بە هەمیشەیی تێدا دەمێننەوە، ﴿وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ﴾، ئەوەش پاداشتی کەسێکە کە خۆی پاک راگرتووەو، خۆی پاک و چاک کردوە، بە هۆی شوێنکەوتنی شەریعەتی پاک و چاکی خوای بێ هاوتاوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بێبڕوابوونی فیرعەون بە نیشانەکانی خواو، تۆمەتبارکردنی مووسا بە جادووگەریی و، دانانی ژوانگە بۆ بەرەنگاربوونەوەی مووساو جادووگەرەکانی فیرعەون و، ئامۆژگاریی کردنی مووساو هۆشداریدانی بە جادووگەرەکان و، بە خەڵکی وابەستەو دابەستەی فیرعەون و، خۆ گیف کردنەوەی فیرعەونییەکان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ ﴿٥٦﴾ قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٥٧﴾ فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانًا سُوًى ﴿٥٨﴾ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى ﴿٥٩﴾ فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ﴿٦٠﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنِ ٱفْتَرَىٰ ﴿٦١﴾ فَتَنَٰزَعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَىٰ ﴿٦٢﴾ قَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ ﴿٦٣﴾ فَأَجْمِعُوا۟ كَيْدَكُمْ ثُمَّ ٱئْتُوا۟ صَفًّا ۚ وَقَدْ أَفْلَحَ ٱلْيَوْمَ مَنِ ٱسْتَعْلَىٰ ﴿٦٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم نۆ ئایەتانە، لە بیست و دوو بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا ﴾، بە دڵنیاییەوە ئێمە تێکڕای نیشانەکانی خۆمانمان پێشانی فیرعەوندان، ئەم (ل)ەی سەر (وَلَقَدْ)، (ل)ی ڕێخۆشکردنە بۆ سوێند، **(اللام ممهدة للقسم)**، (قد)یش لێرەدا بۆ ساغکردنەوە **(تحقيق)**یە، یانی: بە دڵنیاییەوەو مانای هەمووی دەبێتە سەرسوڕماندن کەللەڕەقیی و لە کەللەپووچیی فیرعەون، کە لە حاڵێکدا

خوا ئەو هەموو نیشانانەی خۆی لەسەر دەستی مووساو هارِوونی برای پێشان داون، چونکە مادام دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَقَدْ أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا ﴾، مەبەست تەنیا گۆچانەکە و دەستی مووسا نەبووە ﷺ، بەڵکو ئەو وتووێژە مەنتیقییەو لۆژیکییە بەهێزەش بووە کە مووسا لەگەڵیدا کردوە، هەروەها گەلێک شتی دیکە کە مووسا ﷺ پێشانی داون، وەک لە سوورەتی (**الأعراف**)دا، هاتوە، کە خوای باڵا دەست باسی ئایەتەکان دەکات، کە نۆ (٩) ئایەتن، هەروەها لە سوورەتی (**الإسراء**)دا، دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ ﴾.

هەروەها لە سوورەتی (**النمل**)یش دا باسی نۆ ئایەتەکان دەکات، ئنجا مەرج نیە تەنیا ئەو نۆیەش بووبن، بەڵام خوای پەروەردگار ئەو نۆیە سەرەکییەی کە لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا بە تەفصیل هێناومانن، بە تایبەت باسی کردوون، ئەگەرنا وا دیارە خوای پەروەردگار نیشانەی زۆری لەسەر دەستی مووسا و هارِوونی برای (سەلامی خوایان لێ بێ) خستوونە بەر چاوی فیرعەون، بۆ بەڵگەو ئیسپاتی ئەوە کە مووساو هارِوون، دوو رەوانەکراوو پێغەمبەری خوان و، راست دەکەن، بۆیە ئەگەر خۆی و گەلەکەی و قیبتییەکانیش بروایان پێناهێنن، بە لایەنی کەمەوە، واز لە گەلە چەوساوەکەی مووساو هارِوون، (وەچەی بەنی ئیسرائیل) بێنن و چی دیکە سۆغرەو بێگاریان پێ نەکەن و، نەیانچەوسێننەوە.

٢)- ﴿ فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ ﴾، بە درۆی دانا و لامل بوو، سەرپێچیی کرد، کە دەفەرمویٚ: بە درۆی دانا، یانی: ئایەتەکانی بە درۆ دانا، یاخود مووسای بە درۆ دانا، یاخود پەیام و ئایینی خوای بە درۆ دانا، ﴿ وَأَبَىٰ ﴾، واتە: ئامادە نەبوو و ملی نەدا، ملکەچ بێ بۆ ئەو بەرنامەو شەریعەتەی خوا، یاخود بۆ داواکارییەکەی مووسا ﷺ کە بەنوو ئیسرِائیلی تەسلیم بکات و لێیان بگەرِێ، لەگەڵ خۆی بیانبات و چی دیکە نەیان چەوسێننەوە.

٣)- ﴿ قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴾، وەک پێشتر باسمان کرد لێرەدا فیرعەون بە سەرسورِمانەوە دەڵێ: ئەی مووسا! ئایا تۆ هاتووی لەسەر زەمینی خۆمان

وەدەرمان بنێی بە جادووەکەت، ئەمە لێرەدا هەم نکووڵیلێکردنی فیرعەون لە مووسا دەگەیەنێ، هەم سەرسوڕمانی خۆی، کە چۆن تۆ هاتووی ئێمە بە جادووی خۆت لەسەر زەمینی خۆمان وەدەر بنێی، هەم تۆمەتبارکردنی مووسایە ﷺ، هەروەها هاڕوونی برای بەوە کە هاتوون پاشاگەردانیی لە وڵاتدا پەیدا بکەن و، فیرعەونییەکان شاربەدەر بکەن و، لە وڵات و نشتیمان و زێدی خۆیان وەدەریان بنێن.

٤)- ﴿ فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ ﴾، بە دڵنیاییەوە ئێمەش جادوویەکی وەک ئەوەی تۆ هێناوتە، دەیهێنین، دیارە مەبەستی ئەوە بووە، ئەوەی تۆ جادوویەو، ئێمەش جادووی ئاوا دێنین، مەبەستی ئەوە نەبووە کە لە هەموو شتێکدا وەک هی تۆ بێ، واتە: ئەوەی تۆ جادوویەو، ئێمەش جادووت بۆ دێنین.

٥)- ﴿ فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا ﴾، ژوانگەیەک لە نێوان خۆمان و خۆتدا دابنێ، وەک پێشتر گوتمان: فیرعەون خۆی وا پیشان دەدات کە زۆر بێ باکەو بێ منەتەو زۆر لە خۆی ڕادەبینێ، بۆیە مووسا سەرپشک دەکات و دەڵێ: تۆ ژوانگەکە دابنێ، (مَوعِد: **مصدر ميميٌّ: بمعنى الوعد، أو اسم مكانٍ، أو اسم زمانٍ**)، (مَوعِد) هەم لێرە، هەم لە زۆر جێی دیکەی قورئان دا، دەنگونجێ چاوگی میمیی بێ، بە مانای (وعد)، واتە: بەڵێن و گفت، یاخود ناوی شوێنە، واتە: ژوانگە، یاخود ناوی کاتە، واتە: کاتی پێکگەیشتن، (بەڵێنگە)، کە من ئەم وشەیەم بەکارهێناوەو، ڕەنگە پێشتریش بەکارهاتبێ.

٦)- ﴿ لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ ﴾، کە لێی دوانەکەوین نە ئێمەو نە تۆ، (**أخلَفَ الوَعْدَ**)، واتە: لە بەڵێنەکەی دا ڕاستی نەکرد، بەڵێنەکەی نە بردە سەر، واتە: وانەبین نە ئێمە نە تۆ ئەو بەڵێنە نەبەینە سەر، یاخود لەو شوێنە ئامادە نەبین، ﴿ لَّا نُخْلِفُهُۥ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**لا نُخْلِفْهُ**) بە جەزم، دوای نەخەین، یاخود لێی دوا نەکەوین، نە ئێمەو نە تۆ لەو بەڵێنە و لەو ژوانگەیە.

٧)- ﴿ مَكَانًا سُوًى ﴾، با شوێنێک بێ تەخت و گۆڕ بێ، ئەم مانایە زیاتر دێتە زەینەوە، ئەگەرنا ﴿ مَكَانًا سُوًى ﴾، کە خوێنراویشەتەوە: (**مَكَاناً سِوًى**) هەردووکیشیان یەک واتایان

هەیە، وێڕای ئەوەی کە بە مانای تەخت و گۆڕو هەموار دێ، بە مانای شوێنێکیش دێ کە نێوەند بێ و نێوەنجیی بێ لە نێوان دەڤەرەکانداو، لە نێوان خەڵکەکەدا، بۆ ئەوەی هەموو خەڵک بە ئاسانیی پێی بگەن، هەر کەسەو لە شوێنی خۆیەوە بێ و، لە شوێنێکی نێوە ڕاست کۆ ببنەوە، ﴿مَكَانًا سُوًى﴾، (مكاناً بدلُ اشتمالٍ من موعِداً)، (مكاناً) جێداری (موعد)ە، چونکە ئەو کردەوەیە وا دەخوازێ کە شوێنێک هەبێ و، کاتێک هەبێ، هەر کردەوەیەک وەک کۆبوونەوە، هەم شوێنی دەوێ، هەم کاتی دەوێ.

٨)- ﴿قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ﴾، مووسا فەرمووی: ژوانگەتان با ڕۆژی ڕازانەوە بێ، ڕۆژی جوانیی و خۆڕازاندنەوە، هەندێکیش گوتوویانە: ڕۆژی جەژن (**یوم العید**) لەبەر ئەوەی لە جەژناندا خەڵک خۆیان دەڕازێننەوە و پۆشاکی جوان دەپۆشن.

لە تەفسیرەکاندا هاتوە بە تایبەت (**محمد الطاهر بن عاشور**) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: {**یوم الزینة: يَوْمُ الزِّينَةِ كَانَ يَوْمُ عِيدٍ عَظِيمٍ عِنْدَ الْقِبْطِ، وَهُوَ يَوْمُ كَسْرِ الْخَلِيجِ أَوِ الْخُلْجَانِ، وَهِيَ الْمَنَافِذُ وَالتُّرَعُ الْمَجْعُولَةُ عَلَى النِّيلِ لِإِرْسَالِ الزَّائِدِ مِنْ مِيَاهِهِ إِلَى الْأَرَضِينَ الْبَعِيدَةِ عَنْ مَجْرَاهُ لِلسَّقْيِ**}.

واتە: (**يوم الزِّينة**) ڕۆژێک و جەژنێکی مەزن بووە لە لای قیبتییەکان کە بریتی بووە لە ڕۆژی شکاندنی کەنداوەکان، ئەو جۆگەلانەی کە هەڵیان بەستبوون، بناوانەکانیان دەشکاندن، بۆ ئەوەی ئاوەکە بچێتە نێو جۆگەلەکە و شاجۆکەکانەوە کە لەسەر ڕووباری نیل هەڵیان بەستبوون، بۆ ئەوەی ئەو ئاوەی لەو ڕووبارانە زیاد دەبێ، بە جۆگەلەکاندا بڕوات بۆ ئاودێریی.

ئەو ڕۆژە بۆنەیەکیان بووە لەبەر ئەوەی ژیانیان زیاتر لەسەر کشتوکاڵ بووە، کشتوکاڵەکەش زیاتر پەیوەست بووە بە ئاوی ڕووباری نیل، ئنجا لە ساڵێکدا ڕۆژێکیان هەبووە، دوای ئەوەی ڕووباری نیل زۆر هەڵساوەو هاتوە، ئاوەکانیان بە جۆگەکاندا بەرداوەتەوە.

دەشگونجێ یادو بۆنەیەکی دیکە بووبێ.

هەندێکیان گوتوویانە: (یوم النیروز) واتە: ڕۆژی نەوڕۆز، نەورۆزیش، یانی: ڕۆژێکی نوێ، کە سەرەتای ساڵە، هەرچەندە زۆر لە کوردان وا لێ حاڵیی بوون کە جەژنێکی تایبەتە بەوانەوە، بەڵام زۆر لە وڵاتانی دیکەو، زۆر لە گەل و نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو میسرو تورک و زۆر لە گەلانی دیکەش ئەو جەژنەیان هەیە، کە بریتیە لە سەرەتای ساڵ، کە سەرەتای کەشی بەهارە.

٩)- ﴿وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى﴾، با خەڵکیش دەمەو چێشتەنگاو کۆبکرێنەوە و خڕبکرێنەوە، چونکە لەو کاتەدا وەک گوتمان: خۆر وردە وردە بەرەو نێوەڕاستی ئاسمان دەچێ، واتە: دنیا لەوپەڕی ڕوونیی و، ئاشکراییدا دەبێ.

١٠)- ﴿فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ﴾، لێرەدا: ﴿فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ﴾، بە مانای پشت تێکردنی فیرعەون نیە لە مووساو لە پەیامی مووسا، بەڵکو لەسەر مانا زمانەوانییەکەی خۆیەتی، ئەگەرنا پشتی تێکرد، ئەوە مانا خوازراوەکەیەتی و، مانای ئەصڵیی وشەی (تَوَلَّى)، واتە: ڕۆیشت، ڕۆیشت و لەو کۆڕو مەجلیسە کرد، بۆ کوێ ڕۆیی؟ بۆ ئەوەی مشووری کۆکردنەوەی جادووگەرەکان بخوات.

١١)- ﴿فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ﴾، پیلانەکەی خۆی کۆ کردەوە و دوایی هات، پیلانەکەشی بریتی بوو لەو جادووگەرانەی کە پیلانی فیرعەونیان جێبەجێ دەکرد.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ﴾، وێڕای کۆکردنەوەی جادووگەرەکان، ئەوەش دەگەیەنێ کە لەگەڵ کاربەدەستە گوێ لە مستەکانیدا، ڕاوێژی کرد بێ و تەگبیری کرد بێ و، کۆبوونەوەی کرد بێ کە چۆن ئەوە بکەن و چۆن بەرەنگاری مووسا ببینەوە، ئەوەش هەمووی کۆکردنەوەی پیلان و فێڵ دەیگرێتەوە.

١٢)- ﴿قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾، دوای ئەوەی کە هاتن ڕووبەڕووی مووسا بوونەوەو، جادووگەرەکانیان هێنا و، فیرعەون و دارو دەستەکەشی لەوێ بوون، مووسا پێی گوتن: ﴿وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾، هاوار بۆ ئێوە، سزای سەخت بۆ ئێوە، درۆ بە خواوە هەڵمەبەستن، کە ئەو موعجیزەیەی هێناومە بە

جادووی ناوزەد بکەن، یاخود من بە جادووگەر ناوزەد بکەن، یان ئایین و بەرنامەی خوا، بە هەڵە دابنێن، یاخود پێتان وابێ فیرعەون پەرستراوە، یان پێتان وابێ خوا هاوەڵی هەبن، ئەوانە هەموویان درۆ هەڵبەستن بە ناوی خواوە، ئەوە مەکەن.

١٣)- ﴿فَيُسۡحِتَكُم بِعَذَابٍ﴾، ئەگەرنا (خوا) بە سزاو ئازارێک لەلایەن خۆیەوە بنبڕتان دەکات و، لە بەینتان دەبات، پێشتر گوتمان: (أَسْحَتَ، وَسَحَتَ، وَسَحَّتَ) هەرسێکیان بە مانای (إِسْتَأْصَلَ وَأَهْلَكَ)، بنبڕی کردو، لە بەینی بردو، هیچی نەهێشت، کە مووسا دەفەرموێ: ﴿وَيۡلَكُمۡ﴾ دەگونجێ مەبەست پێی سزا بێ، واتە: هاوار بۆ ئێوە، سزای سەخت بۆ ئێوە.

دەشگونجێ مەبەست پێی سەرسوڕمان بێ، واتە: **(أعجب منكم)** سەرم لە ئێوە سوڕدەمێنێ، هەروەک پێغەمبەر ﷺ کە لە صوڵحی حودەیبییەدا یەکێک لە هاوەڵان کە مسوڵمان بوو، کافرەکان داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد تەسلیمیان بکاتەوە، پێغەمبەر فەرمووی: **{وَيْلُ أُمِّهِ، مِسْعَرُ حَرْبٍ لَوْ كَانَ لَهُ أَحَدٌ} (أخرجه أبو داود: ٢٧٦٧، قال الألباني: صحيح).**

واتە: سەرم لێ سوڕ دەمێنێ، چ دایکێک ئەوەی هێناوەتە دنیا، شەڕ هەڵگیرسێنێکی باشە، ئەگەر هاوکاری هەبن! دوایی دەستی کرد بە شەڕی پارتیزانیی و، کافرە قوڕەیشییەکان هاتن داوا و تەکلیفیان لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە لە کۆڵیان بکاتەوە، پێشتریش دەیانگوت: نابێ پەنای بدەی!

١٤)- ﴿وَقَدۡ خَابَ مَنِ ٱفۡتَرَىٰ﴾، بە دڵنیایی بێمرادو بێ ئاکامە، کەسێک درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ، **(الخَيْبَةُ: الخُسْرَان، عَدَمُ نَيْلُ المُرَاد)**، **(خيبة)** بریتیە لە زیانباریی، لە بە ئاوات نەگەیشتن و، ڕەنجەڕۆیی.

١٥)- ﴿فَتَنَٰزَعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ﴾، لە ئەنجامی ئەو قسانەی مووسادا، لە نێوان خۆیاندا، سەبارەت بە کارەکەیان ناکۆکییان تێکەوت، ناکۆکیی تێکەوتن و ڕاجیایی تێکەوتن، ئەوەی لێ وەردەگیرێ، هەندێکیان گوتوویانە: با بڕوایان پێ بێنین و، هەندێکیان

گوتوویانە: با لەگەڵیان ڕووبەڕوو نەبینەوە، ئەوانی دیکە ڕایان لەسەر ڕووبەڕوو بوونەوەو بەرەنگاربوونەوە بووە، ڕاجیایی ئەوەیە، هەڵبەتە ئەو قسەیەی مووسا وەک قومبەلەیەک بووە لە نێویاندا تەقیوەتەوەو، ڕاجیایی لە نێواندا پەیدا کردوون، کە پێشێ هەموویان یەک ڕا بوون، مووساو ئەوەی مووسا کردوویەتی بە جادووگەریان داناوە، بەڵام دوایی لە ئەنجامی قسەکەی مووسادا ﷺ ڕاجیاییان لە نێواندا پەیدا بووە.

١٦)- ﴿ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجْوَىٰ ﴾، بە پەنهانیی قسەیان کرد، بە پەنامەکیی، (**النَّجْوَى: الحَدِيثُ السِّرِّي**)، قسەی پەنهان، چپە چپە، قسەی بە سرکە کردن، بە پەنهانیی پێکەوە قسەکردن.

١٧)- ﴿ قَالُوٓاْ إِنۡ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ ﴾، گوتیان: بە دڵنیایی ئەم دووانە دوو جادووگەرن، دیارە ئەمە جێگری گشتگیر (**بدل اشتمال**)ە، لە قسەی پێشێ کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجْوَىٰ ﴾، ئەو قسەیەی کە بە چپە چپ پێکەوە کردیان، بە پەنهانیی کردیان، بریتی بوو لەوەی کە گوتیان: ئا ئەم دووانە بە دڵنیایی دوو جادووگەرن.

ئـەم ڕسـتەیە: ﴿ إِنۡ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ ﴾، (**إنْ**) لێـرەدا (**مخفَّفة**)یـە، لـە (**مثقَّلـة**)ەو، بـۆ تەئکیـدەو (ل)کـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە ئەگەرنا (**إنْ**) جـارێ وایـە بـە مانـای (**ما النافیـة**) هاتـوە، بـەڵام ئـەم (ل)ە، دەکەوێتـە سـەر ئـەو نـاوەی کـە لـە دوایـی دێ و جیاکەرەوەیەتــی لــە (**إنْ**)ی (**نافیــة**)، هەڵبەتــە خوێنراویشــەتەوە: (**إنَّ هَــذَانِ لَسَحِرَانِ**) بـە دڵنیایـی ئـەم دووانـە دوو جادووگـەرن، ئنجـا ئەگـەر بخوێندرێتـەوە: (إِنَّ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ )، زانایـان دەڵێـن: بێگومـان (**إنَّ**): (**تنصـب الإسـم وترفـع الخَـبَرَ**)، دەبـێ بگوتـرێ: (**إنَّ هَذَيْـنِ لَسَـحرانِ**)، بـەڵام (إِنَّ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ ) دەڵێـن:

**یەکەم**: (**إنَّ: حرفٌ جوابٍ مِثل: نعم، وأجل**) وەک لە شیعریشدا هاتوە:

**ويَقلنَ شيبٌ قد علاك .... وَقَدْ كَبُرت فَقُلْتَ إنَّهُ**

(**إنّـهُ**) یـانی: (**نعـم**) پیاوێـک ئافرەتـان پێیـان گوتـوە: مـووی سـپی لـە سـەرتدا پەیـدا بـووە، کەوتوویـە تەمەنـەوە، منیـش گوتـم: بەڵـێ، (**إنّهُ**) لێـرەدا یـانی: (**نعـم**)، کەواتە: ﴿ إِنۡ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ ﴾ یـانی (**نعـم أو أجـل** هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ ) لـە زمانـی عەرەبییـدا ئەمـە هەیە.

**دووەم:** (**إنَّ حرف تأكيدٍ**)، ئیعرابی ناوەکەشی: ﴿إِنۡ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ﴾، ئەمە بە پێی زار(**لهجة**)ی (**كِنانة وبني حارث وخثعم**)ە، کە ئەوان (**مُثَنَّى**) لە حاڵەتی (**رفع**)و حاڵەتی (**نصب**)و حاڵەتی (**جَرّ**)دا، هەر بە (**ألف**) دێنن و، ئەو دێڕە شیعرەشیان بە نموونە هێناوەتەوە:

| | |
|---|---|
| **إنَّ أباهـــا وَأبـــا أباهـــا** | **قد بلغـــا فـــي الـمجـــد منتهـــاها** |
| بابی ئەو ئافرەتەو بابی بابیشی | لە شکۆ و بەرزییدا، گەیشتوونەتە ئەو پەڕی |

لێرەدا (**إنَّ أباها**)، (**منصوب**)ە، (**أبا أباها**) دەبێ بڵێی: (**وأبا أبيها**) لەبەر ئەوەی کە دەبنە (**مضاف، ومضاف إليه**) بەڵام لە زمانی عەرەبییدا ئەوەش هەر هەیە.

هەڵبەتە هەندێک لە زانایان قسەی دیکەشیان کردوە، بەڵام ئەو دووانە لە هەموویان بەهێزترن و، وەک (**محمد الطاهر بن عاشور**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا هەڵیبژاردوەو، لە تەفسیرەکانی دیکەشدا مشت و مڕی زۆر لە بارەی چۆنیەتی خوێندنەوەی ئەو ڕستەیەوە کراوە، بەڵام زمانی عەرەبیی زمانێکی فراوانەو، وەک ئێستا خەڵک پێی ڕاهاتوون مەرج نیە، تەنیا ئەو چەند زار(**لهجة**)ەی بووبن و، چەندان بنچینەی بوون، کە قورئان جار جار هەندێک لە ئایەتەکانی، هەندێک لەو بنچینانەی دیکە کە لە زمانی عەرەبیدا بوون، بەڵام زۆر باو نین، زیندووی کردوونەوە ئاماژەی پێداون.

١٨)- ﴿يُرِيدَانِ أَن يُخۡرِجَاكُم مِّنۡ أَرۡضِكُم بِسِحۡرِهِمَا﴾، ئا ئەو دووانە، ئەو دوو جادووگەرانە دەیانەوێ لەسەر زەمینی خۆتان، بە جادووەکەیان وەدەرتان بنێن.

١٩)- ﴿وَيَذۡهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلۡمُثۡلَىٰ﴾، دەشیانەوێ ڕێبازە هەرە پەسندو چاک و ناوازەکەتان لە بەین بەرن، پێشتریش ئاماژەم پێدا: ڕێبازە هەرە پەسندو چاکەکەیان چۆنەو چییە؟ ئەوە بووە کە فیرعەونیان بە پەروەردگارو بە پەرستراوی خۆیان داناوەو، فیرعەون بە چاوی کۆیلەو خزمەتکارو ژێر دەست و بەردەست، تەماشای خەڵکەکەی کردوە.

(**الطَّرِيْقَةُ: السنَّة وَالعَادَة**)، (**طَرِيقَة**) بریتیە لە ڕێباز و لە نەریت، (**مُثْلَى: مُؤَنَّثُ الأَمْثَلِ، الأمثل يعني: الأحسن والأفضل**)، کەواتە: (**مُثلى**)ش بە باری مێینەکەیدا، بە مانای باشترین و چاکترین، دێ، دیارە وشەی (**أمثل ومُثلى**) هەردووکیان (**اسم تفضیل**)ن، لە (**مِثالَة**)ەوە هاتوون، (**المِثالةُ: هي حُسنُ الحالَة**) حاڵەت باشیی.

**٢٠)-** ﴿فَأَجۡمِعُواْ كَيۡدَكُمۡ﴾، پیلان و فێڵەکەتان کۆبکەنەوە، واتە: هەمووی با پێکەوە بێ و، ڕێک بێ و ڕێکی بخەن.

**٢١)-** ﴿ثُمَّ ٱئۡتُواْ صَفّٗاۚ﴾، دوایی خۆتان وەرن ڕیز ڕیز، واتە: جادووگەرەکان، کە وەک گوتم: بە پێی هەندێک قسان دەڵێن: سەدان یان هەزاران کەس بوون، هەمووتان ڕیز بن و بە ڕیز بوەستن، هەیبەتی زیاترە سوپایەک کە هەمووی پێکەوە ڕیز دەبێ، ڕیز ڕیز لە کوێ و لە کوێش کە تێکەڵ و پێکەڵ بن، وەک ماش و برنج تێکەڵ بن، بێسەرو بەربن، هەیبەت و هێز و پێزیان نابێ.

وشەی (**صفاً**) دەڵێ: (**مصدرٌ بمعنى الفاعل، أي صافِّين**)، ڕیز بووبن، یاخود هەر چاوگە بە مانای (**مفعول**)ە، یانی: (**مصفوفين**)، ڕیزکراو بن، خۆتان ڕیز بەستووبن، یاخود ڕیز کراوبن.

**٢٢)-** ﴿وَقَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡيَوۡمَ مَنِ ٱسۡتَعۡلَىٰ﴾، بە دڵنیایی سەرفرازە هەر کەسێک ئەمڕۆ سەرکەوێ، مەبەست لە (**أَفْلَحَ**) سەرفرازیی، سەرفرازیی دنیایە، واتە: بە ئامانج گەیشتوە و بە مراد گەیشتوە، هەر کەسێک کە ئەمڕۆ بیباتەوە و براوەو سەرکەوتوو بێ.

کەواتە: ئێوەش چۆن سەرکەوتن و زاڵ بوون بەسەر مووساو هاڕووندا، مسۆگەرو دەستەبەر دەبێ، بەو شێوەیە ڕەفتار بکەن، بەڵام ئەوەی لە لای بەندە خەیاڵە، لە لای خوا بەتاڵە، کە لە سەرەنجامی کارەکەدا ڕووبەڕوو دەبنەوە، ئەوە دەبێ کە جادووگەرەکان هەرچی کە کردوویانە بە جادوو، گۆچانەکەی مووسا ﷺ هەموویان هەڵدەلووشێ و، قووتیان دەدات و، سەرەنجام جادووگەرەکان بڕوا دێنن.

## مەسەلەی دووەم:

**سەرپشک کردنی جادووگەرەکان بۆ مووسا، کە ئەو یان ئەوان پێشێ شتی خۆیان بهاوێژن و، پێش خستنی مووسا بۆیان و، هاتن و چوونی گۆچان و پەتەکانیان لەبەر چاوی مووساو، ترس ڕێ نیشتنی و، دڵنیا کرانەوەی لە لایەن خواوە، کە هەر ئەو سەرکەوتوویە و، با گۆچانەکەی بهاوێ! تاکو گۆچان و پەتەکانی ئەوان کە بە جادوو خستوویانەتە بەر چاوی خەڵک: هەموویان مارن و دەڕۆن، هەموویان هەڵلووشێ و قووتیان بدات.**

خوا دەفەرموێ: ﴿قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ ﴿٦٥﴾ قَالَ بَلْ أَلْقُوا۟ ۖ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ فَأَوْجَسَ فِى نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلْقِ مَا فِى يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓا۟ ۖ إِنَّمَا صَنَعُوا۟ كَيْدُ سَـٰحِرٍ ۖ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّـٰحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ﴾، گوتیان: ئەی مووسا! بانگیان کرد! کێ بانگی کرد؟ بێگومان جادووگەرەکان کە لەگەڵ مووسادا ﷺ ڕووبەڕوو بوونەوە و بەرەنگاری یەک بوونەوە، جادووگەرەکان بە گۆچان و گوریس و پەتەکانیان و، مووساش ﷺ بە گۆچانەکەی کە بە دەستی ڕاستییەوە گرتوە، بانگیان کرد ئەی مووسا!.

٢)- ﴿إِمَّآ أَن تُلْقِىَ﴾، یان دەبێ تۆ پێشێ فڕێ بدەی و بهاوێی، واتە: ئەوەی کە بەدەستتەوەیە، گۆچانەکەت.

٣)- ﴿وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ﴾، یان ئێمە دەبێ یەکەم کەس بین کە دەهاوێین، لە سوورەتی (**الأعراف**)دا، بەم شێوەیە هاتوە: ﴿قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن

تَّكُونَ نَحْنُ ٱلْمُلْقِينَ ﴿١١٥﴾، گوتیان: ئەی مووسا! یان تۆ دەهاوێی (گۆچانەکەت، فڕێ دەدەی و دەیهاوێی) یان ئێمە هاوێژەر دەبین، فڕێدەر دەبین، یانی: سەرەتا.

٤)- ﴿قَالَ بَلْ أَلْقُوا۟﴾، گوتی: بەڵکو ئێوە فڕێ بدەن، لە ئایەتی (١١٦)ی سووڕەتی (**الأعراف**)دا دەفەرمویٚ: ﴿قَالَ أَلْقُوا۟﴾، گوتی: ئێوە فڕێ بدەن، هەر هەمان مەبەست دەگەیەنێ، بەڵام بە تەعبیرێکی کورتتر.

٥)- ﴿فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ﴾، دوای ئەوەی جادووگەرەکان ئەو پەت و گوریسانەی کە پێیان بوون و، ئەو گۆچانانەی پێیان بوون، فڕێیاندان، دوای ئەوەی هەندێ قسەیان کردوە و جادوویان لێخوێندوە، یەکسەر ئەو پەت و گوریس و گۆچانانەیان وا هاتە بەرچاوی مووسا، کە دێن و دەچن و دەڕۆن، لە سووڕەتی (**الأعراف**) دا دەفەرمویٚ: ﴿فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ سَحَرُوٓا۟ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾﴾، دوای ئەوەی فڕێیان دان، جادوویان لە چاوی خەڵک کردو ترساندنیان و جادوویەکی مەزنیان ئەنجامدا.

٦)- ﴿فَأَوْجَسَ فِى نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ﴾، مووسا لە دەروونی خۆیدا، ترسی بۆ پەیدابوو، ترسی پەنهان کرد، (**أوجس: أي أَضْمَرَ، أَخْفَى**)، واتە: پەنهانی کردو شاردیەوە، زانایان لەو بارەوە کە ئایا مووسا بۆچی لە دەروونی خۆیدا ترسی ڕێ نیشتوەو، هۆکارەکەی چی بووە؟ ڕاجیاییان هەیە، کە دەفەرمویٚ: ﴿فَأَوْجَسَ فِى نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ﴾، مووسا لە دەروونی خۆیدا ترسی ڕێ نیشت، ترسی بۆ پەیدابووو! کەواتە: ترسەکە لەسەر ڕواڵەت و دەم و چاوی دەرنەکەوتوەو تەنها لە دەروونیدا هەستی پێکردوەو، پەنهانی کردوە.

أ- هەندێکیان دەڵێن: مووسا لەوە ترساوە کە جادووگەرەکان زۆر بوون و، پەت و گوریس و گۆچانەکانیشیان زۆر بوون، بە هۆی زۆرییەوە کە هی ئەویش یەک گۆچان بووە، ترساوە لەوەی کە جادووەکەی ئەوان زاڵ بێ.

ب- هەندێک دەڵێن: لەوە ترساوە کە خەڵک پێیان هەڵخەڵەتێ، بێگومان ئەو مانایەی دووەمیان ڕێکترە، بە بۆچوونی من، مووسا لەوە نەترساوە، جادووی ئەوان بەسەر

موعجیزەی ئەودا زاڵ بێ، بەڵکو لەوە ترساوە کە خەڵک فریو بخۆن و پێیان وابێ کە ئەو جادووەش وەک ئەو موعجیزەیە، یان لەو موعجیزەیە گرنگترەو، سەرەنجام پێغەمبەرایەتیی مووسایان لەگەڵ جادووگەریەتیی جادووگەرەکاندا، لێ تێکەڵ بێ و، بەهۆیەوە سەریان لێ بشێوێ.

وشەی (خِيفَةً) دەڵێ: (**إسم الهيئةِ مِن الخوفِ**)، یانی: ترسێکی ڕێ نیشت، ترسێکی تایبەت کە وەک گوتم: مەبەست پێی ترسی هەڵخەڵەتاندنی خەڵک بووە، ئەوە کە جادوو و موعجیزەیان لێ تێکەڵ بن.

٧)- ﴿قُلۡنَا لَا تَخَفۡ﴾، پێمان گوت: مەترسێ! دیارە خوای پەروەردگار ڕاستەوخۆ پێی فەرمووە، یاخود خستوویەتە نێو دڵی و ئیلهامی بۆ کردوە، گرنگ ئەوەیە خوای پەروەردگار لەو کاتەدا ئەو پەیامەی خۆی پێ گەیاندوە.

٨)- ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾، بە دڵنیایی تۆ بەرزی! هەر تۆ لەسەرێ دەبی و زاڵ و سەرکەوتوو دەبی!

٩)- ﴿وَأَلۡقِ مَا فِي يَمِينِكَ﴾، ئەوەش کە بە دەستی ڕاستتەوەیە، بیهاوێ، لە سوورەتی (**الأعراف**) ئایەتی (١١٧)دا، خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَ﴾، سروشمان بۆ لای مووسا کرد کە گۆچانەکەت بهاوێ، لێرەدا دەفەرموێ: ئەوەی کە بە دەستی ڕاستتەوەیە بیهاوێ! ئەوەش کە بە دەستی ڕاستیەوە بوو، گۆچان بوو، کەواتە: هەر یەک واتایان هەیە.

١٠)- ﴿تَلۡقَفۡ مَا صَنَعُوٓاْ﴾، هەرچی کە کردوویانە، هەڵیدەلووشێ و، قووتی دەدات، (**تَلْقَفُ: أي تَبْلَعُ**)، (**اللَّقْفُ: الأخذ بسُرْعة وَمهَارَة بالفم أو اليَدِ**)، (**لقف**) بریتیە: لە گرتنی شتێک بە خێرایی و بە لێزانیی، بە زار یان بە دەست.

﴿تَلۡقَفۡ﴾، کە بە جەزم هاتوە، خوێندنەوەیەکی دیکەشی هاتوە: (**تَلْقَفُ مَا صَنَعُوا**)، واتە: قووتی دەدات، ئەوەی بە کارامەیی کردوویانە، بەڵام ئەگەر:

﴿ تَلْقَفْ ﴾بێ، یانی: با یەکسەر قووتی بدات، ئەوەی کە جادووگەرەکان بە کارامەیی و، لێزانیی ئەنجامیان داوە.

لە سوورەتی (**الأعراف**)دا دەفەرمووێ: ﴿ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ ﴾، واتە: کاتێک گۆچانەکەت فڕێ دەدەی، یەکسەر هەرچی بە درۆ هەڵیانبەستوە، قووتی دەدات، لێرەدا دەفەرمووێ: ﴿ مَا صَنَعُوٓاْ ﴾، واتە: بە لێزانیی کردوویانە، کەواتە: ئەوەی بە لێزانیی کردوویانە، درۆیەک بووە هەڵیانبەستوە، چونکە گۆچان و گوریس و پەتەکانیان مار نەبوون، بەڵکو چاو بەستیان لە خەڵک کردوە و چاوی خەڵکیان فریوو داوە.

١١)- ﴿ إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيْدُ سَٰحِرٍ ﴾، بێگومان ئەوەی کە بە لێزانیی و وردەکاریی ئەنجامیان داوە، فێڵ و پیلان و چاو بەستیی جادووگەرە.

١٢)- ﴿ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴾، جادووگەریش لە هەر شوێنێکەوە هاتبێ، یان لە هەر ڕێیەکەوە بێ، یان لە هەر حاڵێکدا بێ، سەرفراز نابێ و سەرکەوتوو نابێ.

ئەم ڕستەیە وەک خوێنراوەتەوە: ﴿ إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيْدُ سَٰحِرٍ ﴾، ئەوەی کە ئەنجامیان داوە، بریتیە لە فێڵی جادووگەرانە، خوێنراویشەتەوە: (**إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدَ سَاحِرٍ**) ئەوە فێڵی جادووگەرە کە ئەنجامیان داوە، واتە: (**كَيْدَ**) دەبێتە بەرکار (**مفعول بە**)ی (**صَنَعُوا**)، کە دەفەرمووێ: (**إِنَّمَا**)، ئەوە لە ئەسڵ دا بەسەریەکەوە نیە، هەرچەندە بەسەریەکەوە نووسراوە، بەڵکو لە ئەسڵ دا (**إِنَّ مَا**)یە، یانی: بە دڵنیایی ئەوەی کردوویانە، کە (**إِنَّ**) بۆ جەختکردنەوەیەو (**ما**)یەکەش (**موصولة**)ەیە، واتە: بە دڵنیایی ئەوەی کە ئەنجامیان داوە.

کە دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيْدُ سَٰحِرٍ ﴾، یان (**كَيْدَ سَاحِرِ**)، بە نەناسراویی (**نکرة**) هێناویەتی، واتە: ئەوەی کە ئەنجامیان داوە، فێڵی جادووگەرێکە، بۆ کەم بایەخیی، بەڵام دوایی دەفەرمووێ: ﴿ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ ﴾، کە (**أل**)ی ناساندن (**تعریف**)ی لەسەرە (**السَّاحِر**)، واتە: جادووگەر هەرچەندە زۆر تەڕ دەست و

کارامە بێ، هەر سەرفراز نابێ، ئەوەش کە کراوە، فێڵی جادووگەرێکی کەم بایەخە، بەڵام جادووگەر هەرچەندە زۆر کارامە و شارەزاش بێ، هەر سەرفراز نابێ، یان (السَّاحر)، (أل)ـەکەی بۆ ناساندن (تعريف) نیە، بەو واتایەی کە جادووگەرێکی کارامە و شارەزا بێ، بەڵکو بۆ جینسە، واتە: کۆی جادووگەرەکان سەرفراز نابن.

هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيۡثُ أَتَىٰ﴾، واتە: (**أي: لَا يَنْجَحُ السَّاحِر حَيْث كَانَ، لأنَّ صُنْعَتَهُ تَنْكَشِفُ بالتَّأَمُّلِ وَثَبَاتِ النَّفْسِ**)، واتە: بابای جادووگەر هەر کەسێ بێ، هەر سەرفراز و سەرکەوتوو نابێ، چونکە کارەکەی کە ئەنجامی داوە، بە تێڕامان و چەسپاویی دەردەکەوێ، کە هیچ نیە، بەڵکو فێڵ و چاو بەستە.

کە دەفەرموێ: ﴿حَيۡثُ أَتَىٰ﴾، وشەی: ﴿أَتَىٰ﴾، بۆیە هەڵبژێردراوە، نەک خوا بفەرموێ: (**حَيْثُ كَان**)، هەر کەسێک بێ! بەڵکو فەرموویەتی: ﴿حَيۡثُ أَتَىٰ﴾، تاکو هەموو ئەو جادووگەرانەی لەملا و لاوە هێنراون، بگرێتەوە، چونکە: ﴿فَأَرۡسَلَ فِرۡعَوۡنُ فِي ٱلۡمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ٥٣﴾الشعراء، فیرعەون جاردەرانی ناردن بۆ شارەکان، واتە: ئەو جادووگەرانە لە هەر چوار لای وڵاتەکەیەوە کۆکراونەوە، ئنجا خوا دەفەرموێ: جادووگەر لە هەر شوێنێکەوە هاتبێ، هەر سەرفراز نابێ، چونکە هەر یەکەیان لە شوێنێکەوە هاتبوون.

کە دەفەرموێ: ﴿وَأَلۡقِ مَا فِي يَمِينِكَ﴾، ئەوەی کە بە دەستی ڕاستتەوەیە فڕێی بدە! واتە: ئەوەی کە بە دەستی ڕاستییەوەیە تەنیا گۆچانێکە، بەڵام خوا دەیگۆڕێ بۆ شتێکی دیکەی زۆر گەورەو مارێکی ڕاستەقینەش دەبێ، نەک وەک هی جادووگەرەکان، کە تەنیا لەبەر چاوی خەڵک ببێتە مارو بکەوێتە بەر خەیاڵیان و چاو بەستیان لێ بکرێ، هەر بۆیەش جادووگەرەکان دواتر بە کڕنووشدا دەکەون، چونکە ئەوان دەزانن ئەوەی مووسا کردی، تەنیا چاوبەست و کارکردنە

سەر خەیاڵ و ئەندێشەی خەڵکی نیە، بەڵکو بەڕاستیی حەزیایە و هەموو گۆچان و گوریسەکان هەڵدەلووشێ و قووتیان دەدات و نامێنن.

کەواتە: ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ﴾، واتە: ئەوەی کە بە دەستی ڕاستتەوەیە، تەنیا گۆچانێکی ڕووت نیە، واتایەکی دیکەشی ئەوەیە: ئەوەی بە دەستی ڕاستتەوەیە، تەنیا گۆچانێکی ڕووتە، بەڵام خوا دەیکات بە شتێکی زۆر گەورە.

## پێناسەی جادوو و چوار جۆرەکەی

هەڵبەتە جادوو (سحر)، پێشتر ئێمە لە سووڕەتی (البقرة)دا، لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەلمان لەسەر کردوە، بە گوێرەی ئەوە کە لەگەڵ قەبارەی ئەو تەفسیرەدا بگونجێ، بەڵام لێرەش پێناسەیەکی سادەی دەکەینەوە، لە (**المعجم الوسیط**)دا، لاپەڕە: (٤١٩)، دەڵێ:

(**السِّحْرُ: كُلّ أَمْرٍ يَخْفَى سَبَبُهُ وَيَتَخيّل عَلى غَيْر حَقِيْقَتِهِ، وَيَجْرِي مَجْرَى التمويه وَالخِدَاعِ، والسِّحرُ: كلُّ مَا لَطُف مأخذه وَدَقَّ**)، واتە: جادوو: بریتیە لە هەر کارێک کە هۆکارەکەی پەنهان بێ و، بە شێوە ڕاستەقینەکەی خۆی دەرنەکەوێ و بە شێوەیەکی دیکە دەربکەوێ و، بچێتە حاڵەتی فێڵ لێکردن و چاو بەست، هەروەها جادوو بە هەر شتێک دەگوترێ: کە وردو پەنهان بێ و خەڵک بە ئاسانیی لێی تێ نەگات.

### جادوو، زانایان و شارەزایان بە گشتیی کردوویانە بە چوار جۆر:

١)- بریتیە لە چاوبەست و تەردەستیی (شعوذة)، ئەمەش جۆرێکە لە فریودانی چاوی خەڵک و فێڵ لێکردنیان.

٢)- جۆرێکی دیکەی بە هۆی تایبەتمەندییە فیزیایی و کیمیاییە نەزانراوەکانەوە بۆ زۆربەی خەڵک ئەنجام دەدرێ، بۆ وێنە: میزەڵدان (دەبدەبە)، کە جۆرە گازێکی تایبەتی تێدەکرێ، دەبینین بەرز دەبێتەوە بە پێچەوانەی هێزی کێشندەوە.

٣)- هێزە پەنهانەکانی مرۆڤ لە پشتیەوەن، واتە: مەرج نیە جادوو بێ بەو واتایە کە نەزانرێ چۆنە، بەڵام هێزە پەنهانەکانی مرۆڤ، وەک ئەوەی کە هیندۆسییەکان، یان بووذاییەکان، دوای

ئەوەی کە زۆر کار لەسەر ڕووح و لایەنی پەنهانی خۆیان دەکەن، هەندێ شتی سەرسوڕهێنەر ئەنجام دەدەن.

٤)- جۆری زۆر باوی جادوو، بریتیە لەوەی بە هاوکاریی شەیتانەکان ئەنجام دەدرێ، کە ئەوە جادووی ڕاستەقینەیە، بەڵام ئەوانی دیکە دەچنە شێوەی جادووەوە، بە جادوو لە قەڵەم نادرێن و زۆر کەسیش بە جادوویان تێ دەگات.

**مەسەلەی سێیەم:**

**کڕنووش بۆ خوا بردنی جادووگەرەکان و هەڵگەڕانەوەیان لە فیرعەون و، بڕواهێنانیان بە خوای پەروەردگارو، گلەیی لێکرانیان لە لایەن فیرعەونەوە، کە بۆچی بێ مۆڵەتی وی بڕوایان هێناوەو، هەڕەشە لێکرانیان لە لایەن فیرعەونەوە بە دەست و لاقی ڕاست و چەپ بڕینیان و، هەڵواسینیان بە قەدی دارخورمایانەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴿٧٠﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِى جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ ﴿٧١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا ﴾ جادووگەرەکان بە کڕنووشدا خران، پیتی (ف) لێرەدا کە چۆتە سەر (ألقي) بۆتە ﴿ فَأُلْقِيَ ﴾، (الفاء عاطفة على محذوف يدلّ عليه قوله: ﴿ وَأَلْقِ مَا فِى يَمِينِكَ ﴾)، ئەم (ف)ایە ئەو ڕستەیە، با دەداتەوە و دەیگرێتەوە سەر شتێک کە قرتێنراوە، بەڵام فەرمایشتی خوا کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَلْقِ مَا فِى يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓاْ ۖ إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيْدُ سَٰحِرٍ ۖ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴾، دەیگەیەنێ، واتە: دوای ئەوەی خوا فەرمانی بە مووسا کرد، گۆچانەکەت بهاوێ، گۆچانەکەی هاویشت! بوو بە مارێکی گەورە و لەو مەیدانەدا هاتووچوو، هەموویان ترسیان ڕێنیشت و، دوایی دەستیکرد بە هەڵلووشین و قووتدانی هەموو ئەو پەت و گوریسانەی کە لەبەر چاوی خەڵک کرا بوون بە مار، هەموویانی قووتدا، ئنجا دوای ئەوە: ﴿ فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا ﴾، ئەم (ف)یە ئەو ڕستەیە دەباتەوە بۆ ئەوانەی پێشێ، کە ڕەوتەکە دەلالەتی لەسەر دەکات و، خوای پەروەردگار قرتاندوونی لەبەر ئەوەی مرۆڤ بە عەقڵ و سەلیقە و ڕەوت دەیانزانێ، کەواتە: ﴿ فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا ﴾، جادووگەرەکان بە کڕنووش داخران، دیارە بە بکەر

نادیار (**مجهول الفاعل**)، هێناویەتی، چونکە (**أُلقي**): یانی: خرانە سەر زەوی، ئنجا بۆیە پاڵدراوەتە لای بکەری نادیار، چونکە ئەوان کەس نەبووە بیانخاتە سەر زەوی و، خۆیان خۆیان خستۆتە سەر زەوی.

بەڵام پێم وایە باشتر وایە بگوترێ: بۆیە خوای بێ وێنە هەم لێرەو، هەم لە چەند شوێنێکی دیکەی قورئاندا، بەو جۆرە هێناویەتی: واتە: جادووگەرەکان لە بەرانبەر ئەو موعجیزە گەورەیەی مووسادا ﷺ ویستی ئازادانەی خۆیان لە دەستداو، بەبێ ئەوەی خۆیان بیانەوێ، بە کڕنووشدا کەوتن و، بە کڕنووش داخران.

٢)- ﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَـٰرُونَ وَمُوسَىٰ﴾، گوتیان: بڕوامان بە پەروەردگاری هاڕوون و مووسا هێنا، هەڵبەتە خوا تەنیا پەروەردگاری هاڕوون و مووسا نیەو، هی هەموو شتێکە و هەموو کەسێکە، بەڵام بۆیە لێرەدا جادووگەرەکان تەنیا پاڵیان داوەتە لای هاڕوون و مووسا، ئەو دوو پێغەمبەرە پایە بەرزە، چونکە لە نێو میصرییەکاندا، خوا تەنیا بەوەی کە پاڵدرابێتە لای شتێک، یان لای کەسانێک، ناسراوە، واتە: ئەو پەروەردگارە، خوایە ﷻ، کە خاوەن و مشوورخۆرو پەروەردەکەری هاڕوون و مووسایە.

ئنجا بۆچی هاڕوون پێش خراوە، بەڵام لە سوورەتی (**الأعراف**)دا دەفەرموێ: ﴿رَبِّ مُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ﴿١٢٢﴾﴾، پەروەردگاری مووسا و هاڕوون؟

وەڵامەکەی ئەوەیە کە (و) تەنیا بۆ کۆکردنەوەی دوو شتانە پێکەوە، بەبێ ڕەچاوکردنی ڕیزبەندیی کە کامیان لە پێش کامیانەوەیە، واتە: چ هاڕوون پێش مووسا بخرێ، چ مووسا پێش هاڕوون بخرێ، هەر یەکە.

دەشگونجێ جادووگەرەکان هەندێکیان گوتبیان: ﴿بِرَبِّ هَـٰرُونَ وَمُوسَىٰ﴾، هەندێکیشیان گوتبیان: ﴿رَبِّ مُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ﴾، واتە: جادووگەرەکان زۆر بوون، هەندێکیان هاڕوونیان پێش خستبێ، کە تەمەنی گەورەتر بووە لە مووسا، هەندێکیشیان مووسایان پێش خستبێ، چونکە ئەو لە ئەسڵ دا گەیەنەرو پەیامبەری خوا بووە.

٣)- ﴿ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ﴾، ﴿ قَالَ ﴾، مەبەست پێی فیرعەونە، کە دەڵێ: ﴿ ءَامَنتُمْ لَهُۥ ﴾، بە سەرسوڕمانەوە! ئەوە بڕواتان هێنا پێش ئەوەی مۆڵەتتان بدەم؟ ئنجا ئایا لێرەدا بۆچی دەڵێ: ﴿ ءَامَنتُمْ لَهُۥ ﴾، بۆچی ناڵێ: (**آمنتم به**)؟ وەڵامەکەی ئەوەیە: (**آمن به**)، واتە: بڕوای پێهێنا! بەڵام (**آمن له**) واتە: لەبەر وی بڕوای هێنا، هەر هەمان واتای هەیە، بەڵام (**آمن له**) واتە: (**حصل عنده إيمانٌ لأجله**)، واتە: ئایا ئێوە لەبەر مووسا ئیمانتان هێنا، پێش ئەوەی مۆڵەتتان بدەم؟ وەک پێشتر گوتمان: کە خوا دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴾، بێگومان فیرعەون سەر کێشیی و سنوور شکێنییەکەی لە ڕادەبەدەر بووە، لێرەدا دەڵێ: ئێوە بۆتان نیە بڕوا بێنن، بێ ئەوەی مۆڵەت لە من وەربگرن، دەبێ دەرگای عەقڵی خۆتان دابخەن هەتا من مۆڵەتتان نەدەم، نەیکەنەوە، هەروەها دەرگای دڵی خۆتان دابخەن و هەتا من مۆڵەتتان نەدەم، نەیکەنەوەو، نابێ بهێڵن هیچ شتێ بچێتە دڵتانەوەو، هیچ شتێ بچێتە عەقڵتانەوە، هەتا من مۆڵەتتان نەدەم! کە ئەوە شتێکی زۆر پێچەوانەی سروشتی مرۆڤ و مەنتیقە، بەڵام دیکتاتۆرو تاغووتەکان کە لە خوا دوور دەکەونەوە و یاخیی دەبن، لە حوکمی عەقڵ و مەنیتق و زگماک دەردەچن.

٤)- ﴿ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ﴾، فیرعەون تۆمەتباریان دەکات، هەم ئەوان تۆمەتبار دەکات، کە ئێوە قوتابی و شاگردی مووسا بوون، هەم مووسا تۆمەتبار دەکات جارێکی دیکە، کە ئەوە مامۆستای ئەو جادووگەرانە بووە، ﴿ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ﴾، بە دڵنیایی ئەو گەورەکەتانە کە فێری جادووی کردوون، مامۆستاو گەورە و شارەزاتانە، واتە: ئێوەی فێری جادوو کردوە! بەڵام هەندێ لە بەشەکانی جادوو و، هەندێ لە هونەرەکانی جادووی لە لای خۆی هێشتۆتەوە، تاکو هەر کات لەگەڵی ڕووبەڕوو بوونەوە، بەسەرتاندا زاڵ بێ، بۆیەش بەسەرتاندا زاڵ بووە، ئەگەرنا هی هەردووکتان هەر جادوویە.

٥)- ئنجا هەڕەشەیان لێ دەکات: ﴿ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ ﴾، بە دڵنیایی دەستتان و لاقتان بە پێچەوانەوە دەبڕم، (**التَقْطِيعُ: شِدَّةُ القَطْعِ**)، (**لأَقَطِّعَنَّ**) کە دەیتوانی بڵێ: (**لأَقْطَعَنَّ**)، بەڵام (**أُقطِّعَنَّ: قَطَّعَ، يُقَطِّع، تَقْطيعاً، وَقَطَعَ، يَقْطَعُ، قَطْعاً**)، (**تقطيع**): بڕیتیە لە زۆر بڕین و بڕینی سەختی شتێک.

وشـەی: ﴿مِّنۡ خِلَٰفٖ﴾، (أي مـن جانبـين مختلفـين)، لـە دوو لای پێچەوانـەوە، وە دەسـتی ڕاسـت و، لاقـی چـەپ، یاخـود دەسـتی چـەپ و لاقـی ڕاسـت! بـەڵام بـە زۆری وا بـووە کـە دەسـتی ڕاسـت و لاقـی چـەپ بـڕدراون.

٦)- ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخۡلِ﴾، بە قەدی دارخورمایانتانەوەش دەتانبەستم، دەڵێ: (التَّصلِيبُ: مُبَالَغَة فـي الصَّلب)، (صلب): واتە: هەڵواسین و شەتەک دان و، بەستنەوەی کەسێک بە شوێنێکەوە، بەڵام (تصليب) زێدەڕۆیی تێدایە.

وشـەی: ﴿جُذُوعِ﴾، کـۆی (جـذع)ە، واتـە: قـەدی دارخورمـا یـان قـەدی هـەر درەختێـک، کـە دەڵـێ: ﴿فِي جُذُوعِ ٱلنَّخۡلِ﴾، ناڵـێ: (عَـلى جُـذُوعِ النَّخْـلِ)، واتـە: بـە قـەدی دارخورمایەکانتانـەوە دەتانبەسـتم، نـەک بەسـەر گلۆفکـی دارخورمایەکانـەوە بـن و، لـە نێـو لـق و پۆپیانـدا ون بـن، چونکـە دارخورمـا قەدەکـە ڕووتەنـەو لـق و پۆپـی پێوەنیـن تاکـو سـەرێ، ئنجا کەسـێک بـە قـەدی دارخورمایـەوە ببەسـترێ، زۆر جـوان دیـارەو هەمـوو کـەس دەیبینـێ، چونکـە مەبەسـتی ئـەوە بـووە خۆیـان زۆر بـە نارەحەتییـەوە بکـوژێ و، خەڵکیشـیان پـێ تەمبـێ خـواردوو چاوترسـاو بـکات، بۆیـە تەعبیـری (فـي) بەکارهاتـوە، واتـە: ئـەو کەسـە چۆتـە نێـو قـەدی دارخورمایەکـەوە، چونکـە کەسـێ بـە شـتێکەوە شـەتەک درا، وەک ئەوەیـە بووبێتـە بەشـێک لـەو شـتە.

٧)- ﴿وَلَتَعۡلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابٗا وَأَبۡقَىٰ﴾، (ل) یان بۆ سوێند (قسم)ە، یان ڕێخۆشکەرە بۆ سوێندو (ن)یش بۆ تەئکیدە، ﴿وَلَتَعۡلَمُنَّ﴾، بە دڵنیاییەوەش دەزانن، بە مسۆگەریی دەزانن، ﴿أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابٗا وَأَبۡقَىٰ﴾، کاممان سزای سەختترە و سزایەکەشی بەردەوامترە، ﴿أَيُّنَآ﴾ (أَيُّنَآ: إستفهام عَنْ مُشْتَرَكَيْنِ فـي شِدَّةِ التعذيب)، پرسیار کردنە بۆ دوو کەسی هاوبەش لە سزادانی سەختدا، کە فیرعەون مەبەستی پێی خۆی و خوایە ﷻ، ئایا من یان پەروەردگاری مووسا سزای سەخت و بەردەوامترە؟

بۆیـە زۆرجـار دەڵێـم: بەشـەر کـە دایـە نەفامیـی و کەودەنیـی، پێـش هەمـوو شـتێک دەکەوێتـەوە! دەنـا ئـەی فیرعـەون..!! تـۆ چیـی؟ کـە خـۆت بهێنیـە ئاسـتی خـوا ﷻ؟! سـزای خـۆت بهێنیـە ئاسـتی سـزای خـوا ﷻ؟!

## پێنج وردە سەرنج

١)- ﴿ءَامَنتُمۡ لَهُۥ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡ﴾، ئایا بڕواتان هێنا بۆی، پێش ئەوەی من مۆڵەتتان بدەم؟ وەک پێشتریش ئاماژەم پێدا، حوکمڕانە خۆسەپێن و خۆ بەزلگرەکان، لە ئەنجامی ئەوەدا کە دەستیان بەسەر سەرەوەت و سامانی خەڵکدا گرتوەو، دەستیان بەسەر وڵاتدا گرتوەو، سوپاو هێزو قەڵەباڵغییان لە دەوری خۆیان کۆکردۆتەوە، بوغڕاو لە خۆبایی بوون و، لە کەوڵی خۆیان دەرچوون و، خۆیان لێ بۆتە شتێکی دیکە لە سەرەوەی ئاستی بەشەر، بۆیە فیرعەون پێی وابووە کە بەبێ مۆڵەتی وی، بۆیان نیە نە عەقڵیان کار بکات، نە دڵیان کار بکات، نابێ عەقڵیان بیر لە شتێ بکاتەوە، تاکو فیرعەون پێیان نەڵێ، دڵیشیان نابێ شتێک پەسند بکات و قبووڵ بکات، تاکو فیرعەون مۆڵەتیان نەدات.

٢)- ﴿إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِي عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحۡرَ﴾، وەک پێشتر گوتم: ئەوە لە یەک حاڵدا فیرعەون بە بەردێک چەند نیشانەیەکی شکاندوون:

١- هەم مووسای جارێکی دی تۆمەتبار کردوە، بەوەی کە تۆ جادووگەری، نەک هەر جادووگەریشی، بگرە مامۆستای جادووگەرانی!.

٢- هەم جادووگەرانی خۆیشی تۆمەتبار کردوە بەوەی کە شاگردو قوتابی مووسان.

٣- هەم ویستووشیەتی خەڵکی چەواشە بکات، کە خەڵکینە..!! ئەو جادووگەرانەی ئێمە هێنابوومانن بۆ بەربەرەکانی کردنی مووسا، لەبەرئەوەی قوتابی مووسا بوون، بۆیە شکستیان خوارد، نەک لەبەرئەوەی کە مووسا پێغەمبەری خوایەو موعجیزەکەشی شتێکی دیکەی جیا لە جادوویە!

٣)- ﴿فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ﴾، ئایا فیرعەون ئەو هەڕەشەی خۆی جێبەجێ کردوە، یان جێبەجێ نەکردوە؟ لە هیچ شوێنێکی قورئاندا ئەو بابەتە دیار نیە،

بەڵام وا پێدەچێ جێبەجێی کردبێ، چونکە فیرعەون ئەو پەڕی دەستەڵاتی هەبووەو، جادووگەرانیش زۆر بێ دەستەڵات بوون، ئنجا بۆ چاو ترساندنی خەڵکیش وا باشتر بووە، کە فیرعەون هەڕەشەکە جێبەجێ بکات، بۆ ئەوەی خەڵکیان پێ چاوترساو بکات.

٤)- ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ﴾، (وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ) هەڵتاندەواسم، لێرەدا (**الأصلِّبنَّكم**) بە پیتی (**في**) بەرکاری خواستوە، دەیتوانی بڵێ: (وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ على جُذُوعِ النَّخْلِ)، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەڵواسینەکە، لە باری سەرەوەی قەدی دارخورماکاندا دەبێ، نەک لە نێو قەدی دارخورماکان، بەڵام تاکو ئەوە بگەیەنێ کە ئەو شەتەک دان و هەڵواسینەی فیرعەون بۆ جادووگەرەکان، ئەوەندە بە قەدی دارخورماکاندا چەسپاون، وەک چووبنە نێوی، ئاوا قایم بەستوونی! ئنجا دەگونجێ چوار مێخەی کێشابن و، مێخی لە هەر چوار پەلان قایم کرد بن، دەشگونجێ بە پەت و گوریسێکی قایم بەوێیدا پێچابن، دیار نیە چۆن بەوێدا شەتەک دراون.

٥)- ﴿وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ﴾، بە دڵنیایی بۆشتان دەردەکەوێ کامەمان سزای سەختترە و بەردەوامتریشە! ﴿أَيُّنَآ﴾، کامان! یەکێکیان ئەوە خۆیەتی، بەڵام دووەمیان دیار نیە مەبەستی پێی کێیە؟ بەڵام بە ڕەوت (سیاق) دەزانین کە مەبەستی پێ خوایە، چونکە فیرعەون خۆی بە پەروەردگاری ئەوان زانیوە، بەڵام جادووگەرەکان گوتوویانە: ﴿ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ﴾، کەواتە: بەراورد لە نێوان ئەو دوو پەروەردگارەدایە، یەکێکیان فیرعەون کە خۆی بە پەروەردگار زانیوەو، پەروەردگارێکی ساختەی درۆ، ئەوەی دیکە پەروەردگاری ڕاستەقینە کە خوایە، کەواتە: من کە خۆم بە پەروەردگارتان دەزانم، یان پەروەردگاری مووسا و هاڕوون، کە ئێوە ئێستا بڕواتان بەو هێنا، بۆتان دەردەکەوێ کامان، واتە: لەو دوو پەروەردگارە، سزاو ئەشکەنجەکەی توندترو بەردەوامتریشە؟.

## مەسەلەی چوارەم:

**بێباکیی دەربڕینی جادووگەرە بڕوادارەکان لە هەڕەشە و گوڕەشەی فیرعەون، کە ئەوان خوا و بەڵگە ڕۆشنەکانی بە هیچ ناگۆڕنەوە، ئومێدیشیان وایە کە خوا لێیان ببووریٚ:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿ قَالُوا۟ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَـٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا ۖ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ۖ إِنَّمَا تَقْضِى هَـٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ ﴿٧٢﴾ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَـٰيَـٰنَا وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ ۗ وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿٧٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

**١)-** ﴿ قَالُوا۟ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَـٰتِ ﴾، گوتیان: تۆ هەڵنابژێرین بەسەر ئەو بەڵگە ڕۆشنانەدا کە بۆمان هاتوون، **(الإيثار: التفضيل)**، **(إيثار)** واتە: هەڵبژاردن، کە دەفەرمویٚ: ﴿ قَالُوا۟ لَن نُّؤْثِرَكَ ﴾، هەڵتنابژێرین، لێرەدا پاڵدراوێک قرتێنراوە، واتە: **(لن نؤثر دينك، أو لن نؤثر طاعتك)** بەرنامەکەی تۆ، یان گوێڕایەڵیی کردنی تۆ، هەڵنابژێرین بەسەر ئەو بەڵگە ڕۆشنانەدا کە بۆمان هاتوون.

**٢)-** ﴿ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا ﴾، هەروەها تۆ هەڵنابژێرین بەسەر ئەو کەسەدا کە ئێمەی لە نەبوون هێناوەتە بوون، ئێمەی هێناوەتە دی و خوڵقاندووینی، دەشگونجیٚ: ﴿ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا ﴾، ئەوە (و)ی سوێند بیٚ، یانی: ﴿ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَـٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا ﴾، ئەو کاتە ئاوا دەبیٚ: سوێند بەو کەسەی ئێمەی بەدیهێناوە، تۆ هەڵنابژێرین بەسەر ئەو بەڵگە ڕۆشنانەدا کە بۆمان هاتوون، لە سەر دەستی ئەو دوو پێغەمبەرە پایە بەرزە کە مووسا و هاروونن.

کەواتە: دەگونجیٚ (و) بۆ سوێند بیٚ، دەشگونجیٚ ئەو (و)ە بۆ **(عطف)** بادانەوە و گێڕانەوە، بیٚ، یانی: (لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَـٰتِ وعلى الذي فطرنا)،

تـۆ هەڵنابژێریـن بەسـەر ئـەو بەڵگـە ڕۆشـنانەداو، بەسـەر ئـەو کەسـەدا کـە ئێمـەی هێناوەتـە دی، ئنجـا بۆچـی خـوای پەروەردگاریـان پێـش نەخسـتوەو، یەکەمجـار بـاسی بەڵگـە ڕۆشـنەکانیان کـردوە؟ چونکـە ئـەوان لـە ڕێـگای بەڵگـە ڕۆشـنەکانەوە خـوای پەروەردگاریـان ناسـیوە، ئـەوە لـە تەفسـیرەکاندا نەمبینیـوە، یـان ڕەنگـە هەشـبێ و بەرچـاوم نەکەوتبـێ، بـەڵام پێـم وایـە حیکمەتەکـەی ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ بەدیهێنەرو پەیداکـەری جادووگـەرەکان و هەمـوو گەردوونـە، هـەر بـووە، بـەڵام ئـەوان پەییـان پێـی نەبـردوەو پێـی ئاشـنا نەبـوون، هەتـا ئـەو بەڵگـە ڕۆشـنانەیان لەسـەر دەسـتی مووسـا و هـاڕوون بـۆ هاتـوون.

بۆیـە ئـەو بەڵگـە ڕۆشـنانەی کـە بەهـۆی ئەوانەوە خوایـان ناسـیوە، ئەوانیـان پێش خسـتوون و، خـوای پەروەردگاریـان خسـتۆتە دوای بەڵگـە ڕۆشـنەکانەوە، ئەگەرنـا لـە ڕاسـتییدا خـوا ﷻ بەئامانجگیـراو (**بیـت القصـد**)ی بـڕوا پـێ هێنانـە، بەڵگـە ڕۆشـنەکان و پێغەمبـەران و مووسـا و هاڕوونیـش، ئامـڕاز و هـۆکارن بـۆ ناسـینی خـوا و گەیشـتن بـە خـوا ﷻ، بـەڵام ئـەوان لێـرەدا ئامڕازیـان پێـش ئامانـج خسـتوە، لەبـەر ئـەوەی بەهـۆی ئامڕازەکـەوە گەیشـتوون بـەو ئامانجـە.

٣)- ﴿ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ﴾، واتە: ئنجا ئەوەی تۆ بڕیاردەری، بڕیاری بدە، یان ئەوەی تۆ ئەنجامدەری ئەنجامی بدە! چونکە وشەی (**قضى**) هەم بە مانای (بڕیاریدا) دێ، هەم بە مانای (ئەنجامیدا) دێ، وەک لە تەفسیری سووڕەتی (**الإسراء**)دا باسمان کرد، وشەی (**قضاء**) بە چەند واتایەک دێ و باوترین واتایان (بڕیاردان و جێبەجێ کردن)ە، یانی: (**إفعل ما أنت فاعله**)، ئەوەی تۆ بکەری بووی و ئەنجامدەری بووی، ئەنجامی بدە! وەک کوردەواریی خۆمان دەڵێ: چیت پێ دەکرێ بیکە! یان چیت لە دەست دێ، بیکە! یان چیت نەکردوە بیکە! بە کورتیی: بێ منەتی دەکەن.

٤)- ﴿ إِنَّمَا تَقْضِى هَـٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ ﴾، بە دڵنیایی تۆ تەنیا لەم ژیانی دنیایەدا بڕیار دەدەی، ﴿ إِنَّمَا ﴾، لێرەدا (**إِنَّمَا: أَدَاةُ الحَصْرِ وَالإِثْبَاتِ**)، ئامڕازی کورت هەڵێنان و چەسپاندنە، واتە: ئەوەی تۆ بڕیاری لێ دەدەی تەنیا لەم ژیانی دنیایەدایە، (**أي: إِنَّك مَقْصُورٌ عَلَى القَضَاءِ**

**فـي هَذِهِ الحَيَاةِ الدُّنيا**)، تۆ کورتهەڵاتووی لە بڕیاردان و ئەنجامدان، تەنیا لە بازنەی ژیانی ئەم دنیایەدا، ﴿ تَقۡضِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَآ ﴾، یانی: (**فـي هَذِهِ الحَيَاةِ الدُّنيا، وَمِنْ خِلاَلِهَا لاَ غَيْرَ**)، واتە: لەم ژیانە دنیایەداو لە میانی ژیانی دنیادا تۆ دەتوانی بڕیارەکانت بدەی و جێبەجێیان بکەی، بەڵام لە چوارچێوەی ژیانی دنیا بە دەر، هیچ کارەی! ئێمەش ژیانی دنیا وەک خۆی دەبینین کە شوێنی تێدا تاقیکرانەوەیە، نەک شوێنی تێدا حەسانەوە، بۆیە چیت لە دەست دێ، بیکە! بێ منەتین.

٥)- ﴿ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا ﴾، بە دڵنیایی ئێمە بڕوامان بە پەروەردگاری خۆمان هێنا، پێشێ دەڵێن: ﴿ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴾، بەڵام لێرە دەڵێن: ئێمە بڕوامان بە پەروەردگاری خۆمان هێنا، واتە: ئەو پەروەردگارەی خۆمان کە لە ڕێی مووسا و هاڕوونەوە ناسیمان، ئێمە بڕوامان پێی هێنا.

ئنجا ئەمە عیللەت و ئامانجی ئەوەیە کە دوایی دێ، ﴿ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا ﴾، ئێمە بڕوامان بە پەروەردگارمان هێنا، بۆچی؟

٦)- ﴿ لِيَغۡفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا ﴾، تاکو لە هەڵەکانمان ببووریَ.

٧)- ﴿ وَمَآ أَكۡرَهۡتَنَا عَلَيۡهِ مِنَ ٱلسِّحۡرِ ﴾، ئەو جادووەش کە تۆ بە زۆر پێت کردین و ناچارت کردین لەسەری، لەوەش لێمان ببووریَ.

٨)- ﴿ وَٱللَّهُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ﴾، خواش باشترەو بەردەوامترە، واتە: پاداشتی خوا باشترەو بەردەوامتریشە، ئەمە لێی وەردەگیرێ کە جادووگەرەکان بە زۆر جادوویان پێکراوە، ئەو دەستەڵاتدارانەی ئەو کات، کە جادوو باو بووە، منداڵی هەندێک خەڵکیان هەڵبژاردوون و، خستوویاننە نێو قوتابخانەی جادووگەرێکەوە، تاکو فێری جادوویان بکەن، بۆ ئەوەی ئەو جیلە لە جادووگەران کە مردن، جیلێکی دیکە شوێنیان بگرنەوە.

ئنجا ئێستاش هەروایە، تەماشا بکەن! ئەو ڕژێمە خۆسەپێن و ئەو حوکمڕانە خۆ لە خەڵک کەر بە پەرستراوانە، کە بەسەر خەڵک و جەماوەردا دەسەڵاتی

ناشـەرعیی دەسـەپێنن، ئنجا ئەگـەر کاتی خـۆی حوکمڕانـانی سـتەمکار جادووگەریـان پـەروەردە کردبـن، هـی ئێسـتاش دەهـۆڵ کـوت و زوورنـا ژەنـان پـەروەردە دەکـەن، ئێسـتاش هەندێـک خەڵکـی نووسـەرو ڕاگەیانـدکار لـە ڕاسـتییدا دەهـۆڵ کـوت و زورنـا ژەنـن و، نووسـەری دەربـارو بەکـرێ گیـراون، ئـەوە دەنووسـن و دەڵێـن: کـە حوکمڕانـەکان پێیـان خۆشـە، نـەک خۆیـان قەناعەتیـان پێـی هەیـە، وەک دەڵێـن: جارێـک یەکێـک لـەو جـۆرە کەسـانە لـە لای حوکمڕانێـک مەدحـی تەماتـە دەکات، تەماتـە ئەوەنـدە بـە سـوودە! قازانجـی وایـە! ئـەو جـۆرە قسـانە ڕیـز دەکات، کـە دەزانـێ حوکمڕانەکـە کەیفـی لـە تەماتەیـە، دوایـی ئـەو حوکمڕانـە دڵـی لەسـەر تەماتـە لادەچـێ، دڵـی دەچێتـە سـەر باینجـان، ئەوجـارە ئـەو کەسـە دەکەوێتـە مەدحـی باینجـان و زەمـی تەماتـە دەکات، یەکـێ لێـی دەپرسـێ: تـۆ دوێنـێ زۆر مەدحـی تەماتـەت دەکـرد، کەچـی ئەمڕۆ مەدحـی باینجـان دەکـەی؟! ئەویـش دەڵێ: مـن کۆیلـەی تەماتـە و باینجـان نیـم، تەماشـای گەورەکـەم دەکـەم، چـی پێخـۆش بـوو، مەدحـی ئـەو دەکـەم، هەقـم چییـە: تەماتـە باشـترە یـان باینجـان؟! تەماشـای ئـەوە دەکـەم کـە ئـەو چـی پێخۆشـترە.

لە ڕاسـتییدا زۆر لـەو ڕاگەیانـدکارو دەهـۆڵ کـوت و زورنـا ژەنانـەی، کـە ئێسـتا لـە خزمـەت ئـەو ڕژێمانـە دان، لـە خزمـەتی ئـەو حیزبـە خۆسـەپێنانە دان، کـە بەسـەر مسـوڵماناندا حوکمڕانـن، کـە لـە جیهـانی ئیسـلامیی دا ئـەوە زۆرە، زۆرینـەی ئـەو ڕاگەیاندکارانـە، لـەو قەبیلـە و قوماشـەن.

پێویسـتە ئـەوەش بڵێیـن: کـە جادووگـەرەکان لـە ئەنجامـی چیـدا، بۆیـان دەرکەوت کـە ئـەوەی مووسـا موعجیزەیـە و جـادوو نیـە؟ لـە ڕاسـتییدا بـە هـۆی زانیارییـەوە، جادووگـەرەکان زانـا بـوون، شـارەزا بـوون لـە پیشـەکەی خۆیانـدا، صەنعەتەکـەی خۆیـان بـاش دەزانـێ و زۆر تێیـدا کارامـە و پسـپۆڕ بـوون، دەیانـزانی تاکـو کـوێ بـڕ دەکات، هەمـوو خـاوەن زانسـت و هونەرێـک، دەزانـێ هونەرەکـەی، زانسـتەکەی، پیشـەکەی، ئـەو پەڕەکـەی تاکـو کوێیـە، سـنوورەکەی تاکـو کوێیـە، بۆیـە زانیاریـی زۆر

هاوكاره بۆ مرۆڤ كه بیگه‌یه‌نێته ئامانج و به ئامانجی بگه‌یه‌نێ، به مه‌رجێ مرۆڤ گوێ بۆ بڕیاره‌كانی زانیاریی بگرێ، جادووگه‌ره‌كان له‌و خه‌ڵك و جه‌ماوه‌رو حه‌شاماته‌ی كه فیرعه‌ون كۆی كرد بۆوه، له هه‌موویان باشتر ده‌یانزانی: ئه‌وه‌ی مووسا كردی موعجیزه‌یه‌و، یاسا دره‌ و له جۆری جادوو نیه، ئنجا نه‌بیستراوه خه‌ڵكه‌كه بڕوایان هێنابێ، چونكه خه‌ڵكه‌كه سه‌ریان له‌وه ده‌رنه‌ده‌چوو، هه‌روا لاساكه‌ره‌وه بوون، به‌ڵام جادووگه‌ره‌كان شاره‌زابوون و ده‌یانزانی جادووه‌كه‌ی ئه‌وان تاكو كوێ ده‌ڕوا، بۆیه بڕوایان هێنا، به‌ڵێ زانست و زانیاریی ئاسانتر مرۆڤ به ئامانج ده‌گه‌یه‌نێ و، ده‌بێته هۆی ڕێنمایی كردنی، به‌و مه‌رجه‌ی له‌گه‌ڵ بڕیاره‌كانی ئه‌و زانسته‌دا ڕاست بكات.

## مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:

**ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە بابای تاوانبار لە دۆزەخدا ژیانێکی نەمر نەژی هەیە، بەڵام بڕوادارانی کردار باش، لە باغ و بێستانە هەمیشەییەکانی خوادا، پلە بەرزەکانیان هەن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿٧٤﴾ وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ ﴿٧٥﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴿٧٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ﴾، بە دڵنیایی هەر کەسێ تاوانبارانە بچێتە خزمەت پەروەردگاری، بەدڵنیاییەوە دۆزەخی هەیە، لێرەوە تاکو ڕستەی کۆتایی، دەگونجێ قسەی جادووگەرەکان بێ، کە فیرعەونیان دواندوە و بێ منەتیان کردووە، بێباکیی خۆیان دەربڕی لە سزادانی، دەشگونجێ ئەوە جادووگەرەکان نەیانگوتبێ، بەڵکو فەرمایشتی خوا بێ ﷻ، دوابەدوای هەڵوێستی مەردانە و جوامێرانەی جادووگەرەکان لە بەرانبەر هەڕەشە و گوڕەشەی فیرعەونداو، بێباکیی و بێ منەتییان لە سزادانی سەخت، ئنجا خوا ﷻ ئەوانەی فەرمووبێ، یەکسانە، چ قسەی جادووگەرەکان بێ، دوای ئیمان هێنانیان، چ فەرمایشتی خوای پەروەردگار بێ ڕاستەوخۆ فەرمووبێتی، هەر یەک ئامانج دەپێکێ، بەڵام وا پێدەچێ هەر قسەی جادووگەرەکان بێ، چونکە دوابەدوای ئەوە کە دەڵێن: ﴿وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ﴾، ڕاستەوخۆ دەڵێن: ﴿إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا﴾، وا پێدەچێ درێژە پێدەری قسەی ئەوان بێ، کە دەڵێن: ﴿إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا﴾، بە دڵنیایی هەر کەسێ تاوانبارانە بێتە خزمەتی پەروەردگاری.

(**المُجْرِمُ: فَاعِلُ الجَرِيْمَةُ وَهِيَ المَعصِيَةُ وَالفِعْلُ الخَبِيثُ**)، (**جريمة**) بریتیە لە سەرپێچیی و کاری ناڕەوا، بە کوردیی دەڵێن: تاوان، (**جُرْمُ، جَرِيْمَة**) زیاتر پەیوەندیی

بـە سـنوور شـکێنیی و سـنوور بەزێنیـی بـۆ سـەر مافـەکانی ئـەوانی دیکـەوە هەیـە، ئنجـا هـەر کەسـێ بـە تاوانباریـی بێتـەوە خزمـەتی پـەروەردگاری.

﴿فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ﴾، بە دڵنیاییەوە، دۆزەخی هەیە، ئەو (ل)ـە (**لام الإستِحْقَاقِ والملكيَّة**)، واتە: ئەگەر لە ڕۆژی دوایی دا ببێتە خاوەنی شتێک، ئەوە دەبێتە خاوەنی دۆزەخ.

٢)- ﴿لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ﴾، نە تێیدا دەمرێ و نە تێیدا دەژی، تێیدا نامرێ، بۆ ئەوەی هەست بە سزا و ئازار بکات، تێشیدا ناژیێ، ژیانێک کە پێی بگوترێ ژیان و شایستەی ناوی ژیان بێ، ئەوە سەرەنجامی کەسێکە کە تاوانبارانە بچێتەوە خزمەتی پەروەردگاری.

٣)- ﴿وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، هەر کەسێک بڕوادارانە بچێتەوە خزمەت پەروەردگاری، لە حاڵێکدا کە کردەوە باشەکانی ئەنجام داون.

٤)- ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ﴾، ئا ئەوانە پلە بەرزەکانیان هەن، بێگومان لە بەهەشتدا، وشەی (**درجات**) کۆی (**درجة**)یە، (**عُلى**)ش کۆی (**عُليا**)یە، (**الدرجات العلى**)، پلە بەرزەکانیان هەن، دەشتوانین بڵێین: کە فیرعەون هەڵیواسیون بە گلۆفکی قەدی دارخورمایەکانەوە، بەڵێ لەوێ گیانیان سپاردوە و شەهید بوون، بەڵام خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا دەیانخاتە پلە بەرزەکانەوە لە کۆشک و تەلاران دا، لە بەرانبەر ئەوەدا کە هەڵواسراون بە شوێنی بەرزەوە،

ئنجا دێتە سەر باسکردنی ئەو پلە بەرزانەی بەهەشت.

٥)- ﴿جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾، چەند باغ و بێستانێکی هەمیشەیی بەردەوامن، کە ڕووبار بە ژێریاندا دەڕۆن، واتە: ڕووبار بە ژێر بنکی درەخت و کۆشکەکاندا دەڕۆن.

٦)- ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾، بە هەمیشەیی تێیدا دمێننەوە.

٧)- ﴿وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ﴾، ئا ئەوەش پاداشتی کەسێکە کە خۆی پاک و چاک کردوە، چونکە (**تَزَكّى**) لەسەر کێشی (**تفعُّل**)ە، (**التزكّي: التطهُّر والنمو والصلاح**)، (**تَزَكّى**) هەم بە خۆ پاک کردن دەگوترێ، هەم بە گەشەکردن و، هەم بە چاک بوون دەگوترێ.

کەواتە: ئەوەی باسکرا، پاداشتی کەسێکە کە خۆی پاک و گەشەسەندوو و چاک دەکات، واتە: خۆی پاک دەکات (خۆی بژار دەکات) لە سیفەتە دزێو و خراپ و زیانبەخشەکان، لە پێش هەموویانەوە شیرک و کوفر، هەروەها خۆی گەشە پێدەدا، واتە: سیفەتە چاکەکان لە خۆیدا گەشەپێ دەدات، لە پێش هەموویانەوە ئیمان و خوا بەیەکگرتن و یەقین، دیسان خۆشی چاک دەکات، کە بە تەئکید ئەگەر ئینسان خۆی بژارکرد لە سیفەتە خراپەکان و، سیفەتە باشەکانی لە خۆیدا هێنانە دی و، گەشەی پێ دان، ئەوە بەرەو چاکیی دەچێ، چاک بوونی مرۆڤ، ئەوەیە کە خۆی بژار بکات لە سیفەتە خراپەکان و، خۆی برازێنێتەوە بە سیفەتە باشەکان.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان بیسـت و سـێ (٢٣) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتەکانـی: (٧٧ - ٩٨)، کـە کۆتـا بەشـی باسـی مووسـا و هارووونـی برایەتـی (علیهـما السـلام)، لەگـەڵ فیرعـەون و دارو دەسـتەکەیدا، کـە لـەم سـوورەتی (**طـه**)دا هاتـوون.

ئـەم ئایەتانـە باسـی دەربازبوونـی مووسـا و گەلەکـەی (**بنـو إسرائیـل**)، لـە فیرعەونییـەکان و پەڕینەوەیـان بـە دەریـای سـووردا، دەکـەن.

پاشـان باسـی بەسـەرهاتی لادان و فریودرانـی بەنـوو ئیسـرائیل لـە لایـەن سـامیرییەوە، دەکـەن، کـە تووشـی گۆلـک پەرسـتیی کـردن، شـایانی باسیشـە ئـەو بەسـەرهاتە تەنیـا لێـرەدا هاتـوە، بەڵـێ باسـی گۆلـک پەرسـتیی لـە سـوورەتەکانی: (**البقـرة**) و (**الأعراف**)یشـدا کـراوە، بـەڵام تەنیـا لێـرەدا ئـەوە خراوەتـە ڕوو، کـە کـێ ئـەو گۆلکـە زێڕینەیـەی بـۆ بەنـوو ئیسـرائیل دروسـت کـردوە؟

هەڵبەتـە باسـی لێپرسـینەوەی مووسـاش بـۆ هـەر کام لـە: گەلەکـەی و، هارووونـی بـرای و ﷺ، سـامیرییش کـراوە، لەسـەر ئـەو گۆلـک پەرسـتییەی کـە پێـوەی گیـرۆدە بوون.

﴿ وَلَقَدْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِى فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِى ٱلْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَٰفُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَىٰ ﴿٧٧﴾ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ ﴿٧٨﴾ وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ ﴿٧٩﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ قَدْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ عَدُوِّكُمْ وَوَٰعَدْنَٰكُمْ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنَ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ﴿٨٠﴾ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَلَا تَطْغَوْا۟ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبِى ۖ وَمَن يَحْلِلْ عَلَيْهِ غَضَبِى فَقَدْ هَوَىٰ ﴿٨١﴾ وَإِنِّى لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ

﴿٨٢﴾ ۞ وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٨٣﴾ قَالَ هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ
رَبِّ لِتَرۡضَىٰ ﴿٨٤﴾ قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٥﴾ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ
إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ وَعۡدًا حَسَنًاۚ أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ
ٱلۡعَهۡدُ أَمۡ أَرَدتُّمۡ أَن يَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُم مَّوۡعِدِي ﴿٨٦﴾ قَالُواْ مَآ أَخۡلَفۡنَا
مَوۡعِدَكَ بِمَلۡكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلۡنَآ أَوۡزَارٗا مِّن زِينَةِ ٱلۡقَوۡمِ فَقَذَفۡنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلۡقَى ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٧﴾
فَأَخۡرَجَ لَهُمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٞ فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمۡ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ ﴿٨٨﴾ أَفَلَا
يَرَوۡنَ أَلَّا يَرۡجِعُ إِلَيۡهِمۡ قَوۡلٗا وَلَا يَمۡلِكُ لَهُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا ﴿٨٩﴾ وَلَقَدۡ قَالَ لَهُمۡ هَٰرُونُ مِن قَبۡلُ
يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوٓاْ أَمۡرِي ﴿٩٠﴾ قَالُواْ لَن نَّبۡرَحَ عَلَيۡهِ
عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرۡجِعَ إِلَيۡنَا مُوسَىٰ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذۡ رَأَيۡتَهُمۡ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِۖ
أَفَعَصَيۡتَ أَمۡرِي ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبۡنَؤُمَّ لَا تَأۡخُذۡ بِلِحۡيَتِي وَلَا بِرَأۡسِيٓۖ إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقۡتَ
بَيۡنَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَمۡ تَرۡقُبۡ قَوۡلِي ﴿٩٤﴾ قَالَ فَمَا خَطۡبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ ﴿٩٥﴾ قَالَ بَصُرۡتُ
بِمَا لَمۡ يَبۡصُرُواْ بِهِۦ فَقَبَضۡتُ قَبۡضَةٗ مِّنۡ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ فَنَبَذۡتُهَا وَكَذَٰلِكَ
سَوَّلَتۡ لِي نَفۡسِي ﴿٩٦﴾ قَالَ فَٱذۡهَبۡ فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَۖ وَإِنَّ لَكَ
مَوۡعِدٗا لَّن تُخۡلَفَهُۥۖ وَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِي ظَلۡتَ عَلَيۡهِ عَاكِفٗاۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِي
ٱلۡيَمِّ نَسۡفًا ﴿٩٧﴾ إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ وَسِعَ كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمٗا ﴿٩٨﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

((هەروەها بە دڵنیایی سروشمان بۆ مووسا کرد، کە شەورۆ بە بەندەکانم بکەو، (گۆچانەکەت لە دەریا بدە و) ڕێیەکی وشک و برینگیان لە دەریادا بۆ ئاچووغ بکە، نە لە پێڕاگەیشتن (ی سوپای فیرعەون بۆتان) بترسەو، نە بیمت هەبێ (کە لە دەریادا بخنکێن) ﴿٧٧﴾ ئیدی فیرعەون بە سەربازەکانیەوە شوێنیان کەوت و، یەکسەر ئەو (ئاو)ەی دەریا دایپۆشین کە دایپۆشین ﴿٧٨﴾ فیرعەونیش گەلەکەی خۆی گومڕا کردو (پاش هاتنی ڕێنمایی خواش)، ڕاستە ڕێی نەکردن ﴿٧٩﴾ (خوا فەرمووی): ئەی وەچەی ئیسرائیل! مسۆگەر لە دوژمنەکەتان دەربازمان کردن و، لە لای ڕاستی کێوی **طوور** ژوانگەمان بۆ دانان و، گەزۆ و (باڵندەی) شێلاقەشمان بۆ دابەزاندن ﴿٨٠﴾ لەو بژیوە پەسندانەی پێمان داون بخۆن و سەرکێشیی تێدا مەکەن، ئەگەرنا تووڕەیی منتان دێتە سەر، هەر کەسیش تووڕەیی منی بێتە سەر، مسۆگەر تێچووە (فەوتاوە) ﴿٨١﴾ (بەڵام) من لێبوردەم بۆ کەسێک بگەڕێتەوەو، بڕوا بێنێ و کردەوەی باش بکات، پاشان لەسەر ڕاستە ڕێ بەردەوام بێ ﴿٨٢﴾ هەروەها گوتمان: ئەی مووسا! چی وای لێکردی پەلە بکەی و پێش گەلەکەت بێی؟ (بۆ دیدارمان) ﴿٨٣﴾ (مووسا) گوتی: پەروەردگارم! پەلەم کرد بۆ لای تۆ، تاکو تۆ لێم ڕازی بی و، ئەوانیش ئەوە بە شوێنمەوەن ﴿٨٤﴾ (خوا) فەرمووی: بە دڵنیایی ئێمە دوای (هاتنی) تۆ گەلەکەتمان تاقیکردەوەو، سامیریی گومڕای کردن ﴿٨٥﴾ ئیدی مووسا بە تووڕەیی و خەمبارییەوە گەڕایەوە لای خەڵکەکەی گوتی: ئەی گەلەکەم! ئایا پەروەردگارتان گفتی باشی پێ نەدابوون، ئنجا (ئایا ماوەی جێبەجێ بوونی) گفتەکەتان لێ درێژ بۆوە و زۆری پێچوو، یان ویستتان تووڕەییەکی (تایبەتی) پەروەردگارتان بکەوێتە سەر، ئاوا لە ژوانگەکەم دواکەوتن؟! (ئاوا بەڵێنەکەمتان جێ بەجێ

نەکرد؟) ﴿٨٦﴾ گوتیان: بە دەست خۆمان نەبوو (بەڵێنەکەمان جێ بەجێ نەکرد) لە ژوانگەکەت دواکەوتین، بەڵام چەند کۆڵێکمان لە خشڵی خەڵکەکە (خەڵکی میسر) لێ کرابووە بار، ئێمەش فڕێمان دان (بۆ نێو بۆتەی گۆلک کە سامیریی دروستیکردبوو) هەروەها سامیریش (ئەوەی پێبوو) فڕێیدا ﴿٨٧﴾ ئیدی پەیکەری گۆلکێکی بۆڕەداری بۆ دەرهێنان و گوتیان: ئەمە پەرستراوی ئێوەو پەرستراوی مووساشە، بەڵام ئەو لە بیری چووە! ﴿٨٨﴾ ئایا نابینن کە وەڵامی هیچ قسەیەکیان ناداتەوەو، هیچ زیان و سوودێکیانی بە دەست نیە؟! ﴿٨٩﴾ بە دڵنیاییش هاروون بەر لەوە پێیگوتبوون: ئەی گەلەکەم! ئەو (گۆلکە)ە هەر شتێکە پێی تاقیکراونەوەو، بێگومان پەروەردگارتان تەنیا (خوای) بە بەزەییە، دە جا شوێنم بکەون و گوێڕایەڵیی فەرمانم بکەن ﴿٩٠﴾ (خەڵکەکە) گوتیان: هەتا مووسا دەگەڕێتەوە بۆ لامان، هەر لەسەر (پەرستنی) وی بەردەوام دەبین ﴿٩١﴾ (مووسا) گوتی: ئەی هاروون! کاتێک دیتنت گومڕابوون، چ شتێک ڕێگرت بوو (کە قەدەغەیان بکەی)؟ ﴿٩٢﴾ (چی وای لێکردی) کە شوێنم نەکەوی! ئایا سەرپێچییت لە فەرمانم کرد؟ ﴿٩٣﴾ هاروون گوتی: کوڕی دایکم! نە ڕیشم بگرە و نە (قژی) سەریشم بگرە، من (بۆیە هیچم نەکرد) ترسام کە دوایی بڵێی: لە نێو بەنی ئیسرائیلدا پەرتەوازەییت پەیداکردوەو، چاوەڕێی (هاتنەوە و) قسەی منت نەکردوە (تاکو خۆم کێشەکە چارەسەر بکەم) ﴿٩٤﴾ (ئنجا مووسا) گوتی: ئەو (کەتنە) چییە کردووتە ئەی سامیریی؟ ﴿٩٥﴾ گوتی: شتێکم دی کە ئەوان نەیان دی، ئیدی چەنگێکم لە شوێنەواری نێرراو داگرت فڕێمداو، نەفسیشم بەو جۆرەی بۆ ڕازاندمەوە ﴿٩٦﴾ (مووسا) گوتی: دە بڕۆ لە ژیاندا حاڵت بەو جۆرە بێ کە بڵێی: توخنم مەکەون و، بەڵێنگەیەکیشت هەیە (لە ڕۆژی دواییدا) قوتار بوونت لێی نیەو، تەماشای ئەو پەرستراوەشت بکە کە لەسەر (پەرستن)ی موکوڕ بووی، بە دڵنیایی زۆرباش دەیسووتێنین، پاشان بە دەریادا پرژو بڵاوی دەکەینەوە ﴿٩٧﴾ بە ڕاستیی پەرستراوتان تەنیا ئەو خوایەیە کە جگە لەوی هیچ پەرستراوێک نیە، زانیاریی فراوانی وی هەموو شتێکی گرتۆتەوە ﴿٩٨﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَسْرِ): (السُّرَى: سَيْرُ اللَّيْلِ، أَسْرَى وَسَرَى)، (سُرَى)، بریتیە لە ڕۆیشتنی شەو، شەوڕۆ، کە هەم بە (أَسْرَى)، هاتوە، هەم بە (سَرَى)، هاتوە هەردووکیان بە مانای: (بە شەو ڕۆیشت) دێن.

(يَبَسًا): واتە: وشک و برینگ، (يَبِسَ الشَّيءُ يَيْبَسُ واليَبَسُ: يَابِسُ النَّبَاتِ، وَهُوَ مَا كَانَ فِيهِ رُطُوبَةٌ، فَذَهَبَتْ، وَاليَبَسُ: المَكَانُ يَكُوْنُ فِيهِ مَاءٌ فَيَذْهَبُ)، (يَبِسَ الشَّيءُ يَيْبَسُ)، واتە: شتەکە وشک بوو، وشک دەبێ، (واليَبَسُ: يَابِسُ النَّبَاتِ)، (يَبَسْ) بریتیە لە: گیای وشک، ئەویش ئەوەیە کە تەڕایی تێدابێ، دوایی تەڕاییەکەی نەمابێ و وشک هەڵگەڕابێ، هەروەها (وَاليَبَسُ: المَكَانُ يَكُوْنُ فِيهِ مَاءٌ فَيَذْهَبُ)، (يَبَسَ)، شوێنێکە ئاوی لێبووبێ، بەڵام ئاوەکە وشک بووبێ، ئاوەکە نەمابێت و شوێنەکە وشک بووبێ.

(دَرَكًا): (الدَّرَكَ وَالدَّرْكُ: إسْمُ مَصْدَرٍ مِنْ الإدْرَاكِ)، (درَكَ، وَدَرْك)، هەردووکیان ناوی چاوگن لە (إدْرَاك)، (إدْرَاك) واتە: فریا کەوتن، پێڕاگەیشتن، هەروەها جاری واش هەیە بە مانای پەیپێبردنیش دێ.

(الْمَنَّ): (الْمَنُّ: مَادَّةٌ رَاتِنْجِيَّةٌ صَمْغِيَّةٌ حُلْوَةٌ تُفْرِزُهَا بَعْضُ الأَشْجَارِ، وَطَلٌّ يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ عَلَى شَجَرَةٍ أو حَجَرٍ يَجُفُّ)، (مَنّ)، بە کوردیی گەزۆی پێدەڵێن، ماددەیەکی ڕاتنجیی صەمغیی شیرینە، هەندێ لە درەختەکان دەری دەکەن، جاری واش هەیە لە سەرێوە دادەبارێتە سەر هەندێک درەخت، یاخود هەندێک بەردو، وشک هەڵدەگەڕێ (خەڵک دوایی لێی دەکاتەوەو، خۆی ڕاستەخۆ، یاخود لەگەڵ شتی دیکەدا بە کاری دێنن).

(وَٱلسَّلْوَىٰ): (السُّمَانِي: طَائِرٌ صَغِيْرٌ مِنْ رُتْبَةِ الدّجَاجِيات، جِسْمُهُ مُنضَغَطٌ مُمْتَلِئٌ وَاحِدَتُهَا سَلْوَاة)، (وَٱلسَّلْوَىٰ)، كە تاكەكەی (سَلْوَاة)، (السُّمَانِي)یشی پێ دەگوترێ، باڵندەیەكی گچكەیە لە فەصیلەی (دَجَاجِيات)، واتە: مریشكەكان، كە جەستەیەكی چڕۆ پڕو تێك چڕژراوی هەیە، لە شێوەی كەو دایە، بە كوردیی شێلاقەی پێ دەڵێن، بە فارسیی (بەڵدەرچین)ی پێ دەڵێن، بەڵدەرچین لە شێوەی كەو و سوێسكە دایە.

(يَحِلُّ): (حَلَّ غَضَبُ اللهِ عَلَى النَّاسِ: نَزَلَ)، تووڕەیی خوا كە دادەبەزێتە سەر خەڵك پێی دەگوترێ: (حَلَّ)، یانی: دابەزی، (حَلَّ يَحِلُّ حُلُولاً بِالْمَكَانِ، نَزَلَ)، واتە: لەو شوێنە دابەزی.

(هَوَىٰ): (هَوَىٰ يَهْوِي هَوْيَاً وَهَوَيَانَاً: سَقَطَ مِنْ عُلْوٍ إِلَى سُفْلٍ)، (هَوَىٰ يَهْوِي هَوْيَاً وَهَوَيَانَاً)، واتە: لە سەرێوە كەوتە خوار، لە شوێنێكی بەرزەوە هاتە شوێنێكی نزم.

(أَثَرِى): (الأَثَرُ: العَلَامَةُ وَأَثَرُ الشَّيءِ: بَقِيَّتُهُ، وَمَا يُحْدِثُهُ الشَّيءُ)، وشەی (أَثَر)، بە نیشانە دەگوترێ، ئەسەری شتێك، بە شوێنەواری یاخود پاشماوەی ئەو شتە دەگوترێ، یاخود شوێنەوارێك كە شتێك پەیدای دەكات، دەگوترێ: (جَاءَ فِي أَثَرِهِ أَي: فِي عَقِبِهِ)، بە دوایدا هات، (الأَثَرُ)، بە شوێن پێش دەگوترێ.

(أَسِفًا): (أَسِفَ يأْسَفُ عَلَيْهِ أَسَفَاً: حَزِنَ، أَسِفَ لَهُ: تَأَلَّمَ وَنَدِمَ، آسِفٌ وَأَسِيْفٌ وَأَسِفٌ)، هەرسێكیان بە مانای خەمبارو پەژارەدارە، كەواتە: (أَسِفَ يأْسَفُ عَلَيْهِ أَسَفَاً)، واتە: خەمی بۆ خوارد، خەمی بۆ دەخوا، (أَسَفَاً)، واتە: خەمخواردن، پەژارەدار بوون، (أَسِفَ لَهُ)، بە مانای بۆی بە ئازار بوو، یاخود پەشیمان بۆوە، بۆی پەشیمان بۆوە، هەروەها ناوی بكە (إِسْمُ فَاعِل)ەكەشی بە (آسِفٌ وَأَسِيْفٌ وَأَسِفٌ)، دێت، بە هەرسێكیان، واتە: پەژارەدارو خەمبار.

(بِمَلْكِنَا): واتە: بە دەست خۆمان نەبوو، لە ژێر كۆنترۆڵ و توانای خۆماندا نەبوو، دەگوترێ: (مَلَكَ الشَّيءَ يَمْلِكُ مِلْكَاً وَمُلْكَاً ومَلْكَاً: حَازَهُ وَانفَرَدَ بِالتَّصَرُّفِ فِيْهِ، فَهُوَ مَالِكٌ، وَالجَمْعُ مُلَّكَ وَمُلاَّك)، دەگوترێ: (مَلَكَ الشَّيءَ يَمْلِكُ)، واتە: ئەو شتەی

کردە هی خۆی، (مِلْكَاً وَمُلْكاً ومَلْكَاً)، هەرسێکیان واتە: خاوەندار بوون، واتە: ئەو شتەی کردە هی خۆی و تەنیا خۆی تەصەڕووفی تێداکرد، (مَالِكٌ)، واتە: خاوەن، کە بە (مُلَّكَ) و (وَمُلاَّك)، واتە: خاوەنەکان، کۆ دەکرێتەوە.

(أَوْزَارًا): (جَمْعُ وِزْر: الحِمْلُ الثَّقِيْل وَالسِلاحُ وَالذَّنبُ)، (أَوْزَارًا)، کۆی (وِزر)ە، (وِزر)، هەم بە باری قورس، هەم بە چەک دەگوترێ، هەم بە گوناهیش دەگوترێ، لەبەر ئەوەی کە چەک باری شانی ئینسان قورس دەکات و، گوناهیش لە ڕووی مەعنەوییەوە، باری شانی قورس دەکات.

(زِينَةِ ٱلْقَوْمِ): یانی: (حُلِيُّ القَوْمِ)، مەبەست پێی خشڵی خەڵکی میسرە، (الزِّيَانُ كُلُّ مَا يُتَزَيَّنُ بِهِ، الزَّيْنُ: كُلُّ مَا يَزِيْنُ وَالحُسْنُ، وَالزِّيْنَةُ: الزَّيَانُ)، (زِيَانٌ)، هەر شتێکە کە خۆی پێ برازێنرێتەوە، (الزَّيْنُ)یش هەر شتێکە کە ئینسان جوان بکات، هەروەها بە جوانییش دەگوترێ، (زِيْنَة) و (زَيَانٌ)، هەر یەکن واتە: خشڵ، یان: ئەو شتەی کە ئینسان خۆی پێ دەڕازێنێتەوە.

(فَقَذَفْنَٰهَا): واتە: فڕێماندا، دەگوترێ: (قَذَفَ بِالْحَجَرِ: رَمَى بِهِ بِقُوَة)، واتە: بە توندیی بەردەکەی هاویشت.

(خُوَارٌ): (خَارَ الثَّوْرُ يَخُورُ خَوْراً وَخُوَاراً: صَاحَ، الخُوَارُ: صَوْتُ البَقَرِ وَالغَنَمِ وَالظِّبَاءِ وَالسِّهَامِ)، گا ببۆڕێنێ، دەگوترێ: (خَارَ الثَّوْرُ يَخُورُ خَوْراً وَخُوَاراً)، واتە: بۆڕاندی، هاواری کرد، (خُوَارٌ) بە دەنگی ڕەشە وڵاخ دەگوترێ، گۆلک و مانگا و گا، هەروەها بە دەنگی مەڕو بزنیش دەگوترێ و، بە دەنگی ئاسک و بزنە کێویش دەگوترێ و، بە دەنگی تیریش دەگوترێ کە دەیهاوێی.

(لَن نَّبْرَحَ): واتە: وازی لێناهێنین، دەگوترێ: (بَرِحَ يَبْرُحُ بُرُوحَاً وبَرْحاً: زَالَ)، (بَرِحَ يَبْرُحُ بُرُوحَاً وبَرْحاً)، واتە: لاچوو، (مَا بَرِحَ يَفْعَلُ كَذا أي: يَسْتَمِرُّ)، واتە: بەردەوامە لەسەری، چونکە (بَرِحَ)، یانی: (زَالَ)، کەواتە: (مَا بَرِحَ)، واتە: (لا يَزَالُ)، واتە: بەردەوام، بەردەوامە لەسەری، وازی لێناهێنی.

(وَلَمْ تَرْقُبْ): ﴿وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِي﴾، واتە: چاوەڕێی قسەی منت نەکرد، (رَقَبَهُ يَرْقُبُهُ رَقْباً وَرُقُوباً وَرَقَابَةً: إِنْتَظَرَهُ)، (رَقَبَهُ يَرْقُبُهُ)، واتە: چاوەڕێی کرد، چاوەڕێی دەکات، (رَقْباً وَرُقُوباً وَرَقَابَةً)، هەرسێکیان چاوگن، هەموویان یانی: (إِنْتَظَرَهُ)، چاوەڕێی کرد، هەروەها جگە لە چاوەڕێی کرد، بە واتایەکی دیکەش هاتوە: (لاحَظَهُ وَحَرَسَهُ وَحَفِظَهُ)، واتە: ڕەچاوی کردو، ئێشکەی لێ گرت و پاراستی، کەواتە: ﴿وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِي﴾، یانی: چاوەڕێی قسەی منت نەکرد، یاخود: قسەکەی منت پارێزگاریی لێ نەکرد، کە بریتیە لە فەرمانەکەی ئەو.

(بَصُرْتُ): واتە: بینیم، (بَصُرَ بِالشَّيْءِ: أَي: أَبْصَرَهُ، عَلِمَ بِهِ، وبصر به بَصَراً: أَبْصَرَهُ)، واتە: بینی، هەروەها (بَصُرَ بِالشَّيْءِ)، واتە: (عَلِمَ بِهِ)، واتە: زانیی، کەواتە (بَصُرْتُ)، هەم بە مانای بینین، هەم بە مانای زانین، هەردووکیان دێ.

(فَنَبَذْتُهَا ):واتە: فڕێم دا، (نَبْذُ الشَّيْءِ: طَرْحُهُ)، فڕێدانی شتە، (نَبَذَ الأَمْرَ: أَهْمَلَهُ)، فەرمانەکەی پشت گوێ خست، (وَنَبَذَ العَهْدَ: نَقَضَهُ) واتە: پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوە.

(سَوَّلَتْ لِي نَفْسِي ): نەفسم بۆی ڕازاندمەوە، (سَوَّلَ لَهُ الشَّرَ)، واتە: خراپەی بۆ جوان کرد، یانی: (حبَّبَهُ إِلَيْهِ وسَهَّلَهُ لَهُ وَأَغْرَاهُ بِهِ)، خراپەی لە لا خۆشەویست کردو بۆی ئاسان کردو، هانیدا بۆ ئەوەی ئەو خراپەیە ئەنجامبدا.

(لَا مِسَاسَ ): دەگوترێ: (مَاسَّهُ مُمَاسَّةً وَمِسَاساً: أَي لَمَسَهُ)، کەواتە: (لَا مِسَاسَ )، واتە: با دەست لێدان نەبێ، توخن کەوتن نەبێ، نیزیک کەوتنەوە نەبێ، چونکە لە (مَاسَّهُ) هاتوە، (مَاسَّهُ)، واتە: دەستی لێدا، (مُمَاسَّةً وَمِسَاساً)، هەردووکیان چاوگن، بە مانای دەستی لێدا.

(عَاكِفًا ): (عَكَفَ يَعْكُفُ فِي المَكَانِ عَكْفاً وَعُكُوفاً: أَي أَقَامَ فِيهِ وَلَزِمَهُ)، (عَكَفَ يَعْكُفُ)، واتە: مایەوە، دەمێنێتەوە لە شوێنەکەدا، (عَكْفاً وَعُكُوفاً)، هەردووکیان

چاوگـن، واتـە: مانـەوە، (أَقَـامَ فِيْـهِ وَلَزِمَـهُ)، واتـە: لـە شـوێنەکەدا مایـەوە و پێـوەی پەیوەسـت بـوو.

(لَنَنسِفَنَّهُ): واتـە: وردو خاشـی دەکەیـن، دەیهاڕیـن، پـرژ و بـڵاوی دەکەیـن، (نَسَـفَ الـشَّيءَ: اقْتَلَعَـهُ مِـنْ أَصْلِـهِ، ونَسَـفَ الـشَّيءَ: فَرَّقَـهُ وَأَذْرَاهُ)، لە ڕیشـەوە هەڵیقەند، (نَسَـفَ الـشَّيء) شـتەکەی پرژانـد و بـڵاوی کـردەوە. (وَنَسَـفَ الحَـبَّ بالـمَـنْسِفِ: غَرْبَلَهُ وَنَقَّـاهُ)، کەسـێک دەغلێـک، شـتێک لـە بێژینـک دەدا، دەگوتـرێ: (نَسَـفَ الحَـبَّ بالمنْسِـفِ)، واتـە: بە بێژینـگ، یـان: بـە هێڵـەگ، واتـە: بێژتیـەوە، لـە بێژینگیـداو پـاک و پیسـی لێـک جیاکـردەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەک پێشتر گوتمان: ئەو بیست و سێ (٢٣) ئایەتە بەشی کۆتایی بەسەرهاتی مووسا و هاڕوونی برای ﷺ، لەگەڵ فیرعەون و دارو دەستەکەیدا، دەخەنە ڕوو، کە دیارە لێرەدا زۆر شت پێچراوەتەوە کە ئێمە کاتی خۆی لە تەفسیری سووڕەتی **(الأعراف)**دا باسمان کرد، چونکە دوای ئەوەی کە جادووگەرەکانی فیرعەون تێدەشکێن لە بەرانبەر موعجیزەی مووسادا ﷺ، جادووەکەیان پووچەڵ دەبێتەوە، جادووگەرەکان لە فیرعەون هەڵدەگەڕێنەوەو، بڕوا دێنن بە پەروەردگاری مووسا و هاڕوون، فیرعەونیش هەڕەشەیان لێدەکات، دوای ئەوە، فیرعەون دەست دەکات بە تەنگ پێ هەڵچنینی گەلی بەنوو ئیسراییل و، بە زۆر شێوە سزایان دەدات، جەزرەبەیان دەدات، فشاریان لێ دەکات، بۆیە خوا ﷻ کۆمەڵێک بەڵایان بەسەر دێنێ:

﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ فَٱسْتَكْبَرُواْ وَكَانُواْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾الأعراف، لەوێ بە تەفصیل باسمان کردوە لە کاتی تەفسیرکردنی سووڕەتی **(الأعراف)**دا.

بەڵام لێرەدا خوای موتەعال ئەوە هەمووی دەپێچێتەوە، یەکسەر دێتە سەر باسی دەربازبوونی مووساو، دەربازکردنی بەنوو ئیسرائیل لە دەست فیرعەون و، کۆچ کردنیان لە میسرەوە بەرەو دەشتی سینا و دوایی بەرەو شام، پەڕینەوەیان بە دەریای سووردا، لێرەدا خوای پەروەردگار ئەو ڕووداوانە هەموویان دەپێچێتەوەو دێتە سەر ئەم مەبەستەو دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِى ﴾، بە دڵنیاییەوە سروشمان بۆ لای مووسا کرد، کە شەورِۆ بە بەندەکانم بکە، واتە: بە شەوێ دەربازیان بکە، ﴿ فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِى ٱلْبَحْرِ يَبَسًا ﴾، ڕێیەکیان لە دەریادا بۆ دابنێ، ڕێیەکی وشک، لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە، بەڵام پێم وایە وشەی (فَٱضْرِبْ لَهُمْ)، یانی: (فَاضْرِبْ بِعَصَاكَ البَحْرَ، وَخُطَّ لَهُمْ طَرِيْقَاً فـي البَحْر)، یان (إجْعَلْ لَهُمْ طَرِيْقَاً فـي البَحْـر)، بۆیە وشەی (فَاضْرِبْ)، هاتوە لێرەدا، چونکە لە سوورەتی (الشعراء)دا دەفەرموێ: ﴿ فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ ۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ ﴾، واتە: سروشمان بۆ لای مووسا کرد کە بە گۆچانەکەت لە دەریا بدە، لێیدا یەکسەر دەریاکە شەق بوو، هەر لایەکی دەریایەکە وەک کێوێکی گەورە وابوو، هەتا بنی بەستبووی و، لە بنەوەش دەریا قوڕو لیتەی زۆری تێدایە، بەڵام خوا ﷻ وای کردبوو، کە ببێتە خاکێکی وشک و برنگ، یەکسەر لیتە و قوڕو قاڵەکەش هەمووی وشک بوو بووە، بۆ ئەوەی بەنوو ئیسرائیل کە دەپەڕنەوە، تەنانەت پێڵاوەکانیشیان بە قوڕ نەبن! بۆیە لێرە دەفەرموێ: ﴿ فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِى ٱلْبَحْرِ يَبَسًا ﴾، لە دەریادا ڕێیەکی وشکانییان بۆ پەیدا بکە، ﴿ لَّا تَخَٰفُ دَرَكًا ﴾، نە لەوە بترسێ کە پێتبگەن، فیرعەون و سوپاکەی بتانگەنێ، ﴿ وَلَا تَخْشَىٰ ﴾، ناشترسێی لە خنکان و فەوتان لە ئاوی دەریادا.

﴿ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ ﴾، فیرعەون بە سەربازەکانیەوە شوێنیان کەوت، ئیدی ئەوە دایپۆشین لە دەریادا کە دایپۆشین، دەبێ چی دایپۆشیبن! دەریا هێندێ شوێنی چەند کیلۆمەترێک قووڵە، بە لای کەمەوە چەندان مەتر قووڵە، ئەو شوێنەی کە تەنکیش بێ، ئنجا تۆ تەماشا بکە! ئەو هەموو ئاوە لەسەرت کەڵەکە بێ لە بنەوەدا، دەبێ چی دایپۆشیبن؟ واتە: ئاوێکی زۆر بە بارستایی چەندان مەتر، یان: سەدان مەتر، یان چەند کیلۆمەتر، ئاو دایپۆشیون، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ ﴾، لە دەریادا ئەوە دایپۆشین کە دایپۆشین کە وەسف ناکرێ، مەگەر هەر بەخۆی وەسف بکرێ،

دیاره ئێمه له تەفسیری سووڕەتی (الأعراف)دا به تەفصیلّ باسی ئەوەمان کردوه، که چۆن فیرعەون و سوپایەکەی شوێنیان دەکەون، له (پەیمانی کۆن)یشەوه چەند شتێکمان هێناوه، که تیشکی زیاتر دەخەنه سەر چۆنیەتی دەربازبوونی مووسا ﷺ و خەڵکەکەی، هەروەها فیرعەون و سوپایەکەی چۆن شوێنیان دەکەون، به عارەبانان؟ لەوێدا به تەفصیلّ هێناومانه.

﴿ وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ ﴾، فیرعەون خەڵکەکەی خۆی گومڕا کرد، سەری لێ شێواندن، سەرگەردانی کردن، ﴿ وَمَا هَدَىٰ ﴾، دوای ئەوەی که ڕێنماییشیان لەسەر دەستی مووسا و هاڕوونەوه له خواوه بۆ هات، هەر ڕێنمایی خەڵکەکەی نەکردو ڕێی ڕاستی پێشان نەدان.

﴿ يَٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ قَدْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ عَدُوِّكُمْ ﴾، خوا گەلی بەنوو ئیسڕائیل دەدوێنێ، ئەی وەچەی ئیسڕائیل! ئەی ئەوانەی که له ئیسڕائیل (که یەعقووبه ﷺ) له دایک بوون، ئەی ئەو کوڕو کچ و نەوانەی که له یەعقووب وەپاش کەوتوون، ئەی گەلی جووله‌که، ﴿ قَدْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ عَدُوِّكُمْ ﴾، به دڵنیایی ئێوەمان دەرباز کرد له دوژمنەکەتان، ﴿ وَوَٰعَدْنَٰكُمْ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنَ ﴾، جێژوانمان بۆ دانان له لای تەنیشتی ڕاستی کێوی طوور، ﴿ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ﴾، گەزۆ و شێلاقەشمان بەسەردا دابەزاندن، بۆ ناردنه خوار، ﴿ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ﴾، له بژیوه پەسندو چاک و سوود بەخشەکانی که پێمان داون، بخۆن، ﴿ وَلَا تَطْغَوْا۟ فِيهِ ﴾، تێیدا تووشی سنوور شکێنیی و سنوور بەزێنیی مەبن، واته: زێدەڕۆیی مەکەن له خواردندا، یان له پاشەکەوت کردنیدا، یاخود له ئەنجامی ئەوەدا که خوا بژیوی باشتان پێ دەدا، دوایی به هۆی بژیوی باش و به هۆی ژیانی چاکەوه، یاخیی مەبن، لەو ژیانه خۆشەتاندا یاخیی مەبن، ﴿ فَيَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبِى ﴾، ئەگەرنا تووڕەیی منتان دێته سەرێ، تووڕەیی منتان لەسەر پێویست دەبێ، ﴿ وَمَن يَحْلِلْ عَلَيْهِ غَضَبِى فَقَدْ هَوَىٰ ﴾، هەر کەسێ تووڕەیی منی لەسەر پێویست بوو، تووڕەیی منی، دابەزێته سەر، بێگومان کەوتوه، (هَوَىٰ)، یانی: (سَقَطَ)، کەوتوه، یاخود یانی: فەوتاوه، لەبەین چووه، تێچووه.

﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴾، بە دڵنیایی من زۆر لێبوردەشم بۆ هەر کەسێک بگەڕێتەوەو، بڕوا بێنێ و، کردەوەی باش بکات، پاشانیش لەسەر ڕاستە ڕێ بەردەوام بێ.

ئنجا خوا دێتە سەر باسی ڕووداوێک، کە ڕووداوێکی زۆر دڵتەزێن بووە لە ژیانی مووسا و هاروونی برای (علیهما السلام)و گەلەکەیاندا، کە بریتیە لە ڕووداوی هەڵخەڵەتێنرانی بەنوو ئیسرائیل لە لایەن سامیرییەوە، بەوە کە گرفتاری کردن بە گۆلک پەرستییەوە.

سەرەتا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَعْجَلَكَ عَن قَوْمِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴾، ئەی مووسا! چ شتێک وای لە تۆ کرد پەلە بکەی، پێش گەلەکەت بکەوی، پێش ئەوەی ئەوان بێن تۆ بێی؟ دیارە مووسا ﷺ ژوانگەی هەبووە، لەگەڵ خوادا، بەڵێنگەی هەبووە، کە لە سوورەتی (**الأعراف**)دا بە تەفصیل باسی دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَوَٰعَدْنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيْلَةً وَأَتْمَمْنَٰهَا بِعَشْرٍ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ﴿١٤٢﴾ ﴾، کە پێشێ سی (٣٠) شەو، دوایی دە (١٠)ی دیکەشی بۆ خستۆتە سەرێ، بۆتە چل (٤٠)، چل شەو و ڕۆژ، دەبوایە ماوەی ئەو چل شەوو ڕۆژەی پێ بچێ، کە مووسا ﷺ چاوەڕێی کردوە، یاخود جۆرێک لە خواپەرستیی ئەنجام داوە، دوای ئەوە بچێتە خزمەت خوای پەروەردگارو لەو شوێنەی کە بۆی دیارییکردوە، گفتوگۆ و ڕاز و نیازی لەگەڵدا بکات و، تەوراتی لێ وەربگرێ، کە لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا بە تەفصیل باسمان کردوە، مووسا لە پێش گەلەکەیەوە بووەو، گەلەکەشی بە دوایەوە، بەڵام ئەو پەلەی کردوە، زۆر تامەزرۆی دیداری خوای پەوەردگار بووە، ﴿ قَالَ هُمْ أُولَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِى ﴾، مووسا گوتی: ئەوانیش لە پشتمەوە دێن، بە شوێن پێمدا دێن، ﴿ وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَىٰ ﴾، منیش پەلەم کرد بۆ لای تۆ، تاکو لێم ڕازی بی، بۆ ئەوەی ڕەزامەندیی تۆ زیاتر بە دەستبێنم، بۆیە پەلەم کرد.

﴿ قَالَ فَإِنَّا قَدْ فَتَنَّا قَوْمَكَ مِنْ بَعْدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ ﴾، خوا فەرمووی: بە دڵنیایی ئێمە لە دوای تۆ خەڵکەکەمان تاقیکردەوە، تووشی بەڵامان کردن و سامیریی گومڕای کردن، دیارە کە دەفەرمووێ: ﴿ قَدْ فَتَنَّا ﴾، ئەگەر بە مانای تاقیکردنەوە بێ، یانی: خوا تاقیکردنەوەو، ئەگەر بە مانای: بەڵامان بۆ ناردن بێ، واتە: بە پێی ئەو یاسایانەی کە ئێمە لە گەردوون و لە ژیانی مرۆڤدا دامانناون، بە پێی ئەو یاسایانە بەڵایان بەسەر هات، کەواتە: بۆیە خوا پاڵی داوەتە لای خۆی و وەک خۆی بەسەری هێنابن، چونکە بە پێی یاسای خوا، بەسەریان هاتوە، ئەگەرنا خوا ﷻ کەس تووشی لادان و بەد بەختیی و تاوان ناکات.

﴿ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَٰنَ أَسِفًا ﴾، مووسا گەڕایەوە بۆ لای خەڵکەکەی، بەڵام بێگومان دوای وەرگرتنی تەورات گەڕایەوە، بەڵام بە تووڕەیی و بە خەفتباریی و بە مەینەتباریی، ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَمْ يَعِدْكُمْ رَبُّكُمْ وَعْدًا حَسَنًا ﴾، گوتی: ئەی خەڵکەکەم! ئەی گەلەکەم! ئەی کۆمەڵەکەم! ئایا پەروەردگارتان بەڵێنێکی باشی پێ نەدابوون؟ کە تەورات بە من بدات، شەریعەت و بەرنامەیەک بێ، ژیانی پەرستشەکان و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی ئێوە ڕێکبخات و، ژیانی ئاکارییتان ڕێکبخات، ئایا بەڵێنێکی باشی پێنەدابوون! ﴿ أَفَطَالَ عَلَيْكُمُ ٱلْعَهْدُ ﴾، ئایا ئەو بەڵێنەی خواتان لێ درێژ بۆوە، کاتەکەیتان پێ زۆر بوو، زۆری پێچوو؟ ﴿ أَمْ أَرَدتُّمْ أَن يَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾، یاخود ویستتان لە پەروەردگارتانەوە تووڕەییتان دابەزێتە سەر؟ واتە: ئایا کاتەکە زۆری پێچوو، جێژووانەکە و بەڵێنەکە، کە خوا پێی دابووم، تەوراتم پێ بدات، زۆری پێچوو؟ یان هەر ویستتان تووڕەیی پەروەردگارتانتان بێتە سەرێ؟ ﴿ فَأَخْلَفْتُم مَّوْعِدِى ﴾، بەڵێنەکەی منتان نەبردە سەر، بەڵێنی مووسا ﷺ لەگەڵیان ئەوە بووە: کە هەر خوا پەرست بن، تاکو دەگەڕێتەوە بۆ لایان بە تەوراتەوە، یاخود: لە جێژوانەکەی من دوا کەوتن، واتە: ئەو شوێنە، ئەو بەڵێنگەیە، ئەو جێژوانە کە داندرابوو، لە کاتی

دیاریکراودا نەهاتن، دیارە سەرگەرمی دروستکردنی گۆلک و گۆلک پەرستیی بوون، خافڵاون، بۆیە لە بەڵێنگەو جێژوانگەکە، دوا کەوتوون.

﴿قَالُواْ مَآ أَخۡلَفۡنَا مَوۡعِدَكَ بِمَلۡكِنَا﴾، خەڵکەکەی مووسا گوتیان: ئێمە جێژوانەکەی تۆ بە دەست خۆمان نەبوو کە لێی دوا کەوتین، یاخود بەڵێن و پەیمانەکەی تۆمان کە هەڵوەشاندەوە، بە دەست خۆمان نەبوو، کە نەمان بردە سەر، ﴿وَلَٰكِنَّا حُمِّلۡنَآ أَوۡزَارٗا مِّن زِينَةِ ٱلۡقَوۡمِ﴾، بەڵام بە هۆی ئەوەوە ئێمە لە ژوانگەکە دواکەوتین، یاخود بە هۆی ئەوەوە ئێمە بەڵێنەکەی تۆمان نەبردە سەر، کە ئێمە لە (خشڵ و) جوانیی خەڵکەکە، خەڵکی میسڕ، هەندێک قورساییمان لێ بارکرابوو، واتە: ئەو خشڵ و زێڕو شتەی کە لێمان وەرگرتبوون، وەک کۆڵێک بووە بە کۆڵمانەوە، کە لە زێڕو زیو دروستکرا بوون، ﴿فَقَذَفۡنَٰهَا﴾، ئنجا ئێمە فڕێمان دان.

هەڵبەتە دەگونجێ مەبەست ئەوەبێ لە کۆڵ خۆمانی بکەینەوەو، چیدیکە شانی خۆمانی پێوە قورس نەکەین، ئەو زێڕو خشڵ و قاپ و قاچاغ و کەل و پەلەی کە لە میسڕییەکان وەریان گرتوە.

﴿فَكَذَٰلِكَ أَلۡقَى ٱلسَّامِرِيُّ﴾، هەروەها سامیرییش ئەوەی کە خۆی پێی بوو، فڕێی دا، دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ کە دوای ئەوەی سامیریی بۆتەیەکی بۆ دروست کردبوون، قاڵبێکی گۆلک، ئەو زێڕەیان تێدا قاڵ کردۆتەوە، سامیریی ئاگری تێدا کردۆتەوە، دوایی هەر کەسە جوانیی و زێڕەکەی خۆی، قاپ و قاچاغ بووە، خشڵ هەرچی بووە، خستوویانەتە تێی، لەوێدا قاڵ بۆتەوە، پێشتریش دەبێ ئەو سامیرییە کابرایەکی صەنعەتکار بوو بێ، بۆتە و قاڵبێکی لە شێوەی گۆلکدا داناوە، کە ئەو زێڕەیان تێکردوە، دوایی یەکسەر: ﴿فَأَخۡرَجَ لَهُمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٞ﴾، ئەو خشڵ و زێڕو زیوە کە قاڵ دەکرێتەوە، دەخرێتە نێو بۆتە و قاڵبێکەوە، دوایی بە تەئکید کە دێتە دەرێ، پەیکەری گۆلکێکە، ﴿فَأَخۡرَجَ

﴿لَهُمْ﴾، بۆی دەرهێنان، ﴿عِجْلًا جَسَدًا﴾، پەیکەری گۆڵکێک، ﴿لَّهُۥ خُوَارٌ﴾، کە بۆڕەی دەهات، دەبێ کونێکی لە لای پشتەوەی کردبێ، کونێکی لە لای زاری کردبێ، کە (با) لە پشتەوە لێی داوەو، بە زاریدا هاتۆتە دەرێ، کابرایەکی پیشەسازو صەنعەتکارو کارامە بووە، دەنگێکی لێ هاتوە، وەک دەنگی بۆڕەی گۆلک.

﴿فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ﴾، ئنجا گوتیان: ئەوە پەرستراوی ئێوەیە، کێ بوون گوتیان؟ دەگونجێ مەبەست پێی سامیریی و ئەوانە بێ کە لەگەڵی بوو، یاخود سامیرییان بە ڕێزەوە ناو بردوە، ﴿فَقَالُواْ﴾، گوتیان، یانی: سامیریی بە تەنیا، بەڵام بە ڕێز و حورمەتەوە ناویان بردوە، لە لایان زۆریان گەورە بووە، ﴿هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ﴾، ئا ئەوە پەرستراوی ئێوەیە، ﴿وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ﴾، هەروەها پەرستراوی مووساشە، ﴿فَنَسِىَ﴾، ﴿فَنَسِىَ﴾، دەگونجێ بۆ سامیریی بچێتەوە، سامیریی بەرنامەی خوا و ڕێنماییەکانی مووسای لەبیر چوون، ئەوەی کە مووسا ﷺ پێ ڕاگەیاند بوون، کە تەنیا پەرستراو خوایە، پەروەردگاری کەون و کائینات، ئەوەی لەبیر چوو.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە: ﴿فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ﴾، گوتیان: ئەوە پەرستراوی ئێوەیە، ﴿وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِىَ﴾، مووساش پەرستراوی خۆی لە بیر چووە، ئەگەرنا ئەمە پەرستراوی مووساشە، بەڵام مووسا لە بیری چووە.

﴿أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا﴾، ئەمە فەرمایشتی خوایە: ئایا نەیاندەبینی، کە هیچ قسەیەکیان بۆ لا ناگێڕێتەوە، واتە: کە قسەی لەگەڵ دەکەن، وەڵامیان ناداتەوە! ﴿وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا﴾، هەروەها ئایا نەیاندەبینی کە هیچ زیان و سوودێکی بۆ ئەوان بە دەست نیە! واتە: ئەوە چ پەرستراوێکە کە تەنانەت قسەش ناکات و، تەنانەت ناتوانێ نە زیانیان لێ دووربخاتەوە و نە سوودیان پێ بگەیەنێ، تەنانەت ئەو شتە سادانەشی بە دەست نین؟!

لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە ئەگەر قسەی بکات و، زیانیان لێ دوور بخاتەوەو، سوودیان پێ بگەیەنێ، شایستەی پەرستن بێ، بەڵکو یانی: تەنانەت ئەو شتە سادانەشی پێ ناکرێن، چ جای ئەوە کە بتوانێ بەدیهێنەر بێ و، پەروەردگار بێ و، ژیێنەر بێ و، مرێنەر بێ و، تەصەڕووف بکات لە گەردووندا، کە تەنیا کەسێک ئەوەی لە دەست دێ، کە خوایەو، هەر خواش شایستەی پەرستراندە.

ئنجا باسی هەڵوێستی هارون دەکات: ﴿ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَٰرُونُ مِن قَبْلُ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ﴾، بە دڵنیایی پێشتر هاروون پێی گوتبوون، واتە: پێش ئەوەی مووسا بگەڕێتەوە، هاروون پێیگوتن: ﴿ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ﴾، ئەی گەلەکەم! بە دڵنیایی ئەو (گوێلک)ە، هەر شتێکە پێی تاقیکراونەوە، ﴿ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارتان تەنیا (خوای) میهرەبان و بە بەزەییە، ﴿ فَٱتَّبِعُونِى وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِى ﴾، ئنجا شوێنم بکەون و فەرمانبەریی فەرمانەکەم بکەن، فەرمانەکەم جێبەجێ بکەن.

﴿ قَالُوا۟ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَىٰ ﴾، گوتیان: ئێمە بەردەوام دەبین، لە لای دەمێنینەوە، دەیپەرستین، هەتاکو مووسا دەگەڕێتەوە بۆ لامان.

ئنجا مووسا ﷺ سەرەتا لێپرسینەوە لەگەڵ هاروونندا دەکات، هاروونی برای کە جێنیشینی بوو:

﴿ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓا۟ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِ ﴾، گوتی: ئەی هاروون! چ شتێک ڕێی لێگرتی کە کاتێک بینیت گومڕا بوون، شوێنم نەکەوی، واتە: چ شتێک بووە پەرچ کە شوێنم نەکەوی، کاتێک کە بینیت گومڕا بوون؟ چ شتێک وای لێکردی شوێنم نەکەوی؟ چ شتێک ڕێگرت بوو کە بە قسەم بکەی؟ ﴿ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِى ﴾، ئایا سەرپێچییت لە فەرمانەکەی من کرد؟ یاخود ئیجتهادێکت کرد، بۆم ڕوونبکەوە، واتە: بە ئەنقەست بە قسەت نەکردم، یاخود پۆزشێک و بیانوویەکت هەیە، بۆم ڕوونبکەوە.

﴿ قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِى وَلَا بِرَأْسِىٓ ﴾، گوتی: ئەی کوڕی دایکم! ڕیشم مەگرە و سەریشم مەگرە، واتە: قژی سەریشم مەگرە، دیارە لە سوورەتی (الأعراف)دا خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيْهِ ﴿١٥٠﴾ ﴾، واتە: سەری برایەکەی گرت، بۆ لای خۆی ڕاکێشا، مووسا سەرو ڕیشی هاڕوونی گرتوە بۆ لای خۆی ڕایکێشاوە، بۆ ئەوەی لێی بدات و سزای بدات، دەڵێ: ئەی کوڕی دایکم! دەیلاوێنێتەوە، چونکە کوڕی باب و دایکێک بوون، بەڵام دایک سۆز و بەزەیی زیاترە، واتە: هەردووکمان کوڕی دایکێکین، لە کۆشی دایکێکدا پەروەردە بووین و گەورە بووین، لەبەر ئەوە لەگەڵم بە ڕەحمبە، ڕیشم مەگرە، قژیشم مەگرە، ﴿ إِنِّى خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، من لەوە ترسام کە تۆ دوایی بڵێی: بەینی بەنوو ئیسرائیلت تێک داوە، واتە: دووبەرەکییت خستۆتە نێوانیانەوە، پەرتەوازەت کردوون، ﴿ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِى ﴾، قسەکەی منت نەپاراستوە، ئەگەر (تَرْقُبْ)، بە مانای (تَحْفَظْ)، بێ، واتە: قسەکەی منت، پەیمانەکەی منت، بەڵێنەکەی منت، نەپاراستوە، یاخود: ﴿ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِى ﴾، ترسام لەوەی کە تۆ پێم بڵێ: بەنوو ئیسرائیلت پێکوەرکردوە، لە نێو خۆیاندا دووبەرەکییت لەنێودا ناوەتەوە، چاوەڕێی قسەی منت نەکردوە، ﴿ وَلَمْ تَرْقُبْ ﴾، یانی: (وَلَمْ تَنْتَظِرْ)، چاوەڕێی منت نەکردوە تاکو من دێمەوە، خۆم چارەسەری دەکەم، ترسام وا بڵێی، بۆیە لێیان گەڕام،لە سوورەتی (الأعراف)دا هاڕوون وێڕای ئەو دوو پاساوە، پاساوێکی دیکەش دێنێتەوە، کە دەفەرمووێ: ﴿ قَالَ ٱبْنَ أُمَّ إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِى وَكَادُوا۟ يَقْتُلُونَنِى ﴿١٥٠﴾ ﴾، گوتی: ئەی کوڕی دایکم! خەڵکەکە منیان بە بێهێز زانی و خەریک بوو بشمکوژن، واتە: بێ دەستەڵات بووم و توانام نەبوو کە بیانگێڕمەوە لە گۆلک پەرستیی، ئەوانەی گۆلک پەرست بوون، زیاتر بوون، دیارە هاڕوون کەمینەیەکی لەگەڵدا ماونەوە، کە باری ئەوانی دیکەیان نەبردوە.

ئنجا مووسا ﷺ پۆزش هێنانەوەی برایەکەی وەردەگرێ و، دوایی دەگوازێتەوە بۆ لێپرسینەوە لەسەری فیتنەو بەڵا، کە بریتیە لە سامیریی: ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكَ

يَسَٰمِرِيُّ ﴾، گوتی: ئەی سامیریی! ئەوە چ کەتنێکت کردوە؟ وشەی (خَطْب)، واتە: کارێکی گەورە، شتێکی گەورە، کە شایستەی ئەوەبێ قسەی تێدا بکرێ، واتە: چ کەتنێکت کردوە، ئەی سامیریی! ئەو کەتنەت بۆچی کردوە؟.

﴿ قَالَ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُواْ بِهِۦ ﴾، سامیریی گوتی: شتێکم بینی کە ئەوان نەیانبینی، ئەوە واتایەکی، یاخود: من شتێکم زانی کە ئەوان نەیاندەزانی، پەییم بە شتێک برد، کە ئەوان پەییان پێ نەدەبرد، ﴿ فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ ﴾، لە شوێنەواری ڕەوانکراو، لە شوێنەواری نوێنەر، چەنگێکم داگرت، ﴿ فَنَبَذْتُهَا ﴾، دوایی فڕێمدا، ﴿ وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِي نَفْسِي ﴾، نەفسیشم ئاوا بۆی ڕازاندمەوە، دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باس دەکەین کە ڕوونکەرەوانی قورئان، توێژەرەوانی قورئان، لێرەدا مشتومڕێکی زۆریان بووە، کە ئایا ئەو قسەیەی سامیریی مەبەست پێی چییە؟ بەڵام لێرە هەر ئەوە دەڵێین: گرنگ ئەوەیە سامیریی بەو قسەیە ویستوویەتی خۆی بپەڕێنێتەوە، کە دەڵێ: ئەوەی من بینیم، ئەوان نەیانبینی، یاخود ئەوەی من زانیم، ئەوان نەیانزانیی، دوایی دەڵێ: ﴿ فَقَبَضْتُ قَبْضَةً ﴾ چەنگێکم داگرت، بە چەنگ داگرتن، ﴿ مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ ﴾، لە شوێنەواری (ٱلرَّسُولِ)، کە بە مانای (ڕەوانەکراو)و مانای (نوێنەر) و بە مانای (پێغەمبەر) دێ، ﴿ فَنَبَذْتُهَا ﴾، ئنجا فڕێمدا، ﴿ وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِي نَفْسِي ﴾، نەفسم وای بۆی ڕازاندمەوە، ئەمە جۆرێکە لە دانپێداهێنانی هەڵە و تاوانەکەی خۆی، کە پاڵی دەداتە لای نەفسی، واتە: نەفسم وای پێ خۆشبوو، وای پێ چاک بوو.

﴿ قَالَ فَٱذْهَبْ فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلْحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ ﴾، (مووسا) فەرمووی: دە بڕۆ، تۆ لە ژیاندا حاڵت وا دەبێ کە بڵێی: (لَا مِسَاسَ)، (لَا مِسَاسَ): واتە: دەست لە کەس نادەم و کەس دەستم لێ نەدا، (لا أَمَسُّ وَلاَ أُمَسُّ)، نە دەست لە خەڵک دەدەم و نە خەڵک دەستم لێ دەدات، یاخود: (لا أَقْتَرِبُ ولا يُقْتَرَبُ مِنِي)، نە لە کەس نیزیک دەبم، نە کەسم لێ نیزیک بێ، یانی: کەس توخنم

نەکەوێ، واتە: حاڵێکی وات بەسەر بێ، ئنجا ئەمە ئەو سزایە وابووە، کە حاڵەتێکی دەروونیی وای بۆ دروست بێ، نەتوانێ لەگەڵ خەڵک تێکەڵ بێ و، لەگەڵ خەڵک دا بژیێ، یاخود ئەوە جۆرێک بووە لە سزا کە مووسا ﷺ فەرمانی بە خەڵکەکە کردوە، کەس نەیدوێنێ و، کەسیش هەڵسوکەوتی لەگەڵدا نەکات؟ هەردوو واتایەکان هەڵدەگرێ.

﴿وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا لَّن تُخْلَفَهُۥ﴾، هەروەها تۆ بەڵێنێکت هەیە کە لێی دوا ناکەوی، لێی دوا ناخرێی، بێگومان ئەو بەڵێنەش، بریتیە لە سزای ڕۆژی دوایی، ﴿وَٱنظُرْ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِى ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا﴾، سەرنج بدە ئەو پەرستراوەت کە بەردەوام بووی لەسەر پەرستنی و لەلا مانەوەی و، بە گەورە گرتنی، ﴿لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى ٱلْيَمِّ نَسْفًا﴾، بێگومان زۆر چاک دەیسووتێنن، پاشان لە دەریادا پرژ و بڵاوی دەکەینەوە، واتە: خۆڵەمێشەکەی، پارچەکانی پرژ و بڵاو دەکەینەوە بە دەریادا، ﴿إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، بە دڵنیایی پەرستراوی ئێوە، تەنیا ئەو خوایەیە، کە جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، ﴿وَسِعَ كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا﴾، زانیاریی وی هەموو شتێکی گرتۆتەوە، بە هەموو شتێک زانایەو، لە هەموو شتێک ئاگادارە و شارەزایە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سروش کردنی خوا ﷻ بۆ مووسا ﵇ کە لە شەوگاردا گەلەکەی لە میسر بباتە دەرێ و، گۆچانەکەی لە دەریای سوور بدات، تاکو ڕێیەکی وشکانیی تێدا پەیدا دەبێ، پێیدا بپەڕنەوەو، بێباکیش بێ لە گیران و خنکان، پاشان ڕاوەدوونانی فیرعەون و سەربازەکانی بۆ مووساو گەلەکەی و نغرۆ بوونیان لە دەریای سووردا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِى فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِى ٱلْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَٰفُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَىٰ ﴿٧٧﴾ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ ﴿٧٨﴾ وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ ﴿٧٩﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿وَلَقَدْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ﴾ بە دڵنیایی سروشمان بۆ لای مووسا کرد، دیارە (و) کە، واوی بادانەوە (**عطف**)ە، ئەم ڕستەیە دەگێڕێتەوەو بایەداتەوە بۆ بابەتەکانی دیکە پێشێ هاتوون، (ل) بۆ سوێندە، یان بۆ زەمینە خۆشکەری سوێندە، (**ممهدة للقسم**)، (قد)یش بۆ دڵنیاکردنەوەو بۆ جەختکردنەوەیە.

کەواتە خوا ﷻ دەفەرموێ: بە دڵنیایی، بە مسۆگەریی، ئێمە وەحییمان بۆ لای مووسا کرد، پێمان ڕاگەیاند بە شێوەیەکی پەنهان.

٢)- ﴿أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِى﴾، کە بەندەکانم بە شەوێ ببە، شەوڕۆیان پێ بکە، پێشتر گوتمان: ﴿أَسْرِ﴾، (**سیر اللّیل**)، بریتیە لە ڕۆیشتن بە شەو، ئنجا کردارەکەی چ (**سری**)

بێ، چ (أسرى) بێ، هەردووکیان، واتە: سەفەری شەوی پێکرد، (سرى، أسرى)، واتە: (سار ليلاً).

بە دڵنیایی مەبەست لە بەندەکانم گەلی مووسایە ﷺ، وەچەی ئیسراییل، کە بە بەنوو ئیسرائیل لە قورئاندا ناوبراون، هەروەها دوایی پێیان گوتراوە: گەلی یەهوود، ئەمە بە سیاق دەزانرێ، کە ئەو بەندانەی مووسا چووە دەربازیان بکات، لە چەنگی فیرعەون، گەلەکەی خۆی بوون، کە هەموویان وەچەی یەعقووبن ﷺ کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم، کە یەعقووب نازناوەکەی بریتی بووە لە (ئیسرائیل) کە بە زمانی عیبریی واتە: عەبدوڵڵا، هەموو مرۆڤەکان بەندەی خوان، بەڵام بە زۆریی وایە کە لە قورئاندا وشەی (عِباد) بەکاردەهێنرێ بۆ حاڵەتی ستایش (مدح)ە، واتە: ئەوانەی کە بە ویستی ئازادانەی خۆیان بەندایەتیی بۆ خوا دەکەن، بەڵام کە (عبید) بەکاردێ، مەرج نیە حاڵەتی مەدح بێ، واتە: ئەوانەی کە ملکەچی خوان، دیارە هەموو مرۆڤەکان ملکەچی خوان، ئنجا هەیانە بە ناچاریی، کە هەموویان بە ناچاریی لە زۆربەی ژیانیاندا ملکەچی خوان، هیچ کەس بە دەست خۆی نیە، هاتۆتە نێو ژیان، هیچ کەس بەدەست خۆی نیە، ژیان بەجێدێڵێ، هیچ کەس بە دەست خۆی نیە قەدو قیافەی چۆنە؟ ڕەنگ و زمانی چۆنە؟ بەڵام مرۆڤ بە دەست خۆیەتی، بەندایەتیی بۆ خوا بکات، یان نەیکات، بەندایەتیی بە مانای فراوانی وشە.

بۆیە لە قورئاندا بە زۆریی وشەی (عباد)، بۆ حاڵەتی مەدح بەکاردەهێنرێ، وەک:

أ- ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا ﴾الفرقان: (٦٣).

ب- ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ﴾البقرة: (١٨٦).

ج- ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ﴾الزمر: (٥٣).

د- لێرەش: ﴿ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِى ﴾، ئنجا ئایا چۆنیان شەورۆ پێ بکات و، لە حاڵێکدا کە لە میصر بچنە دەرێ، بەرەو کوێ بچن؟.

٣)- ﴿ فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِى ٱلْبَحْرِ يَبَسًا ﴾، ﴿ فَٱضْرِبْ ﴾، لە تەفسیرەکاندا گوتراوە: (فاجعل)، (فَاجعل لَهُمْ طَرِيقاً فِي البَحْرِ يَبَساً)، ڕێیەکی وشکانییان لە دەریادا بۆ پەیدا بکە، لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە، بەڵام وەک پێشتریش باسم کرد کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱضْرِبْ ﴾، لە جیاتی بفەرموێ: (فاجعل لهم)، پێم وایە ئاماژەیە بەو ئایەتە موبارەکانەی کە لە سوورەتی (الشعراء)دان، کە خوا دەفەرموێ:

﴿ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّآ ۖ إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٦٢﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ ۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ ﴾.

واتە: فیرعەون بە سوپاو سەربازەکانیەوە شوێنیان کەوتن و، دەمەو خۆرهەڵات، (پێش بەیانیی لە میسر وەدەرکەوتوون)، کاتێک دوو کۆمەڵەکە لێک وەدەرکەوتن، هاوەڵانی مووسا، گوتیان: ئێمە گیراوین، ئێمە دەگیرێین، {(مُدرَك)، کەسێکە کە ئەوەی بەدوای کەوتوە فریای بکەوێ و بیگاتێ، یانی: پێمان دەگەن}، مووسا فەرمووی: نەخێر (هەرگیز ئەوانە زەفەرمان پێنابەن)، پەروەردگارم لەگەڵمدایەو ڕێنماییم دەکات (چی بکەم؟) ئێمە سروشمان بۆ مووسا کرد، کە بە گۆچانەکەت لە دەریا بدە، {دەریای سوور، دەریای سووریان لە پێشەوە بووە، ئەگەر کەسێک لە میسرەوە بیەوێ بەرەو شام و بەرەو دەشتی سینا بچێ، بێگومان دەریای سووری دێتە پێش، پێمان گوت: بە گۆچانەکەت لە دەریاکە بدە}، دەریایەکە شەق بوو، هەر بەشێکی وەک کێوێکی گەورە وابوو، دەریایەک بێتە دالان دالان، لەسەرێ ڕا هەتا خوارێ شەق ببێ و گلی وشک دەربکەوێ، هەر بەو جۆرە دەبێ، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِى ٱلْبَحْرِ يَبَسًا ﴾، یانی: بە گۆچانەکەت لە دەریا بدەو، سەر ئەنجام ڕێیەکی وشکیان لە دەریادا بۆ پەیدا بکە، (هەڵبەتە بە فەرمانی خوا ﷻ).

وشەی: ﴿يَبَسًا﴾، وەسفە، بەڵام بە مانای (يابس)ە، ڕێیەکی وشکانیی.

٤)- ﴿لَّا تَخَٰفُ دَرَكًا﴾، ترست نیە لە گیران، هەروەها خوێنراویشەتەوە: (لاَ تَخفْ)، مەترسێ لە گیران، (الدَّرَكُ: إسْمُ مَصْدَر الإِدْرَاكِ، أَدْرَكَ، يُدْرِكُ، إدْرَاكاً، وَدَرَكاً)، (إِدْرَاك)، واتە: فریاکەوتن، پێگەیشتن، کەسێک بەدوای شتێک بکەوێ و بیگرێ، گرتن، خوا دەفەرموێ: ﴿لَّا تَخَٰفُ﴾، یان (لا تَخَفْ)، هەردوو خوێندنەوەکەی هاتوون، ﴿دَرَكًا﴾، ناترسی، یان مەترسە، لە گیران.

٥)- ﴿وَلَا تَخۡشَىٰ﴾، هەروەها ترسی گەورەشت نەبێ، ترسی زۆریشت نەبێ، لەچی؟ لە خنکان، دەڵێ: (الخَشْيَةُ: شِدَّةُ الخَوْفِ، وحُذف مَفْعولُهُ لإِفَادَةِ العمُوم)، مەترسێ لە خنکان، مەترسێ لە هەر نارەحەتییەکی دیکە، بۆ ئەوەی هەمووی بگرێتەوە، بەڵام خنکان لە نێو دەریادا کە دەریاکە وێک بکەوێتەوە، بە دڵنیاییەوە ئەوە لە هەموو شتێ زیاتر جێگای مەترسیی بووە بۆیان.

٦)- ﴿فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ بِجُنُودِهِۦ﴾، فیرعەون بە سەربازەکانیەوە شوێنیان کەوت، دیارە (أَتْبَعَهُمْ)، لەگەڵ (تَبِعَهُم)، هەردووکیان بە مانای شوێن کەوتنن، شوێنیان کەوت، بەڵام ﴿فَأَتۡبَعَهُمۡ﴾، مانایەکەی بەهێزترە، واتە: زۆر چاک، زۆر بە توندیی، زۆر بە خێرایی شوێنیان کەوت و لێشیان وە نزیک کەوت.

٧)- ﴿فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلۡيَمِّ مَا غَشِيَهُمۡ﴾، ئنجا دایپۆشین لە دەریادا ئەوەی کە دایپۆشین، (غَشِيَهُم)، یانی: (غطَّاهم)، (يَمّ)، بە مانای دەریا دێ، کە (يمّ) بە (يموم) کۆدەکرێتەوە، واتە: دەریاکان، وەک (سَمّ: سموم) کە دەفەرموێ: ﴿فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلۡيَمِّ﴾، دایپۆشین لە دەریادا، ﴿مَا غَشِيَهُمۡ﴾، یانی: (الذي غَشِيَهُم)، ئەوەی کە دایپۆشین، واتە: ئەوەی کە دایپۆشین وەسف ناکرێ هێندە مەزن بووە، چونکە وەک گوتمان: بە بارستایی چەند سەد مەترێک، یان چەند کیلۆمەترێک ئاو بکەوێتە سەر سەربازەکانی فیرعەون، مانای وایە ئاوێکی زۆر ئەستوورو زەبەلاحیان کەوتۆتە سەرێ، کە جەنازەکانیان کەوتۆتە بنی بەحرێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلۡيَمِّ مَا غَشِيَهُمۡ﴾، لە دەریادا ئەوەی دایپۆشین

کە دایپۆشین، واتە: وەسف ناکرێ، مەگەر هەر بە خۆی وەسف بکرێ.

٨)- ﴿وَأَضَلَّ فِرۡعَوۡنُ قَوۡمَهُۥ﴾، فیرعەون، گەلەکەی خۆی گومڕا کرد، سەری لێ شێواندن، سەرگەردانی کردن، (**الإضلال: الإِيْقَاعُ فِـي الضَّلَال**)، (**إضلال**)، بریتیە لە خستنە نێو گومڕایی، (**الضَّلَال: وَهُوَ خَطأ الطَّرِيقِ المُوصِلِ، ويُستعملُ بِكَثْرَةٍ فِـي الجَهالَةِ وعَمل مَا فيهِ ضُرٌّ**)، وشەی (**ضَلَال**)، لە بنەڕەتدا بە مانای ڕێ هەڵەکردن دێ، ئەو ڕێیەی کە بتگەیەنێتە ئامانج، تۆ هەڵەی بکەی و لێی هەڵە بی، بەڵام زۆریش بەکاردەهێنرێ بۆ نەزانیی و نەفامیی و، بۆ کردارێک کە زیانبەخشە، کەواتە: فیرعەون کۆمەڵەکەی خۆی کە قیبتییەکانن و خەڵکی میسرن، گومڕای کردن.

٩)- ﴿وَمَا هَدَىٰ﴾، یانی: (**وَمَا هَدَاهُم**)، نەیتوانی ڕاستە ڕێیان بکات، ئنجا هەندێک لە زانایان گوتوویانە:

١- ئەمە: (**عَطْفُ الأَعَمِّ عَلَى الأَخَصِّ**)، بریتیە لە گێڕانەوەی شتێکی گشتیی بۆ سەر شتێکی تایبەت، دەڵێ: (**لأَنَّ عَدَمَ الهُدَى يَصدُق بَتْرْكَ الإِرْشَادِ مِنْ دُونِ الإضْلَالِ**)، چونکە ڕێنمایی نەکردن، تەنیا بەوەی مرۆڤ ڕێی پێ نیشان نەدرێ، دێتە دی، بەبێ ئەوەی گومڕاشی بکات، یانی: هەر وازی لێ بێنێ، ئەوە ڕێنمایی نەکرد، بەڵام گومڕاکردن بریتیە لە ڕێ پێ پێشان نەدان، وێڕای سەرلێ شێواندن.

کەواتە: مەرج نیە مرۆڤ ئەگەر کەسێکی ڕێنمایی نەکرد، گومڕای بکات، گومڕاکردن پلەیەکی هەڵکشیوترە لە ڕێ پێ پێشان نەدان.

٢- هەندێکیش گوتوویانە: (**أَضَلَّهم بِدَايَةً وَلَمْ يهدهم بَعْد أَنْ عَرَفَ الهُدَى**)، سەرەتا گومڕای کردوون و، دوای ئەوەی ڕێنمایی خوای بۆ هاتوە لەسەر دەستی مووسا، بەهرەمەندی نەکردوون لەو ڕێنماییەی خوا.

(**الزمخشري**) لە تەفسیرەکەی خۆی (**الكشاف**)دا، کە زۆرجار نوکتەی ڕەوانبێژیی زۆر جوان دەردەخات، زۆر لە تەفسیرەکان لێی بەهرەمەند بوون، دەڵێ: {(**وَمَا هَدَى**) **تَهَكُّمٌ بِفِرْعَونَ فِـي قَوْلِهِ**: ﴿وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ٢٩﴾غافر}.

واته: ئه‌مه جۆرێكه له گاڵته‌كردن به فیرعه‌ون، كه گوتی: (وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ)، من ڕێی ڕاست نه‌بێ، سه‌ر ڕاستیی نه‌بێ، پێشانی ئێوه‌ی ناده‌م، خوا ده‌فه‌رموێ: نا، ڕێنمایی نه‌كردن بۆ ڕێگای ڕاست، ئه‌وه جۆرێكه له گاڵته پێكردن.

٣- هه‌ندێكی دیكه گوتوویانه: كه ده‌فه‌رموێ: ﴿ وَأَضَلَّ فِرۡعَوۡنُ قَوۡمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ ﴾، ئه‌مه به‌س بۆ جه‌ختكردنه‌وه‌یه‌كی بێژه‌یی **(تأكيد لفظي)**یه.

كه له یه‌ك كاتدا ده‌گونجێ ئه‌وانه هه‌موویان مه‌به‌ست بن، هه‌ر بۆیه فه‌رمایشتی خوا له قه‌ده‌ر خوایه ﷻ، هه‌تا لێی وردبیه‌وه ورده‌كاریی تێدایه.

مەسەلەی دووەم:

بانگکردنی خوا بۆ بەنی ئیسرائیل کە لە دوژمنەکەیان دەربازی کردوون و، لای ڕاستی کێوی طووری بە ژوانگە بۆ داناون و، گەزۆو شێلاقەی بۆ دابەزاندوون، کەواتە: با لە بژیوی خۆش و بە سوودی خوا بخۆن و، سنوور شکێنیی تێدا نەکەن، ئەگەرنا توورەیی خوایان دێتە سەر، هەرچەندە کەسێکیش بگەڕێتەوە، ئیمان و کرداری باشی هەبێ و، دامەزراو بێ لە سەر ڕاستە شەقامی خوا، خوا بەرانبەری لێبووردەیە:

خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ قَدْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ عَدُوِّكُمْ وَوَٰعَدْنَٰكُمْ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنَ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ﴿٨٠﴾ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَلَا تَطْغَوْا۟ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبِى ۖ وَمَن يَحْلِلْ عَلَيْهِ غَضَبِى فَقَدْ هَوَىٰ ﴿٨١﴾ وَإِنِّى لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

چۆنیەتی دەربازکرانی مووسا و گەلەکەی لە دەریای سوور، لە فیرعەون و سوپایەکەی، ئێمە لە سوورەتی (الأعراف)دا، بە تەفصیل باسمان کردوەو، جارێکی دیکەش ئێمە لە سوورەتی (الشعراء)دا پێی دەگەینەوەو، لە سوورەتی (القصص) ش دا پێی دەگەینەوە، بۆیە لێرەدا بەم کورتەیە وازی لێدێنین، خوا ﷻ دوای ئەوەی کە بەنی ئیسرائیلی ڕزگار کردو، چوون بۆ دەشتی سینا، ئنجا دەیان دوێنێ دەفەرموێ:

١)- ﴿يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ قَدْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ عَدُوِّكُمْ﴾، ئەی وەچەی ئیسرائیل! بە دڵنیایی دەربازمان کردن لە دوژمنەکەتان، ﴿قَدْ أَنجَيْنَٰكُم﴾، خوێندنەوەیەکی دیکەشی هەیە، (**قَدْ أَنْجيْتُكم**)، بە دڵنیاییەوە دەربازم کردن.

٢)- ﴿ وَوَٰعَدۡنَٰكُمۡ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنَ ﴾، لای ڕاستی **طوور**م بە ژوانگە بۆ دانان، بە بەڵێنگە بۆم دانان، ﴿ وَوَٰعَدۡنَٰكُمۡ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**وَوَاعَدْتُكُم**)، واتە: بۆم دانان، (**المواعدة: إتّعادٌ من جانبين**)، (**مُوَاعَدَة**)، بریتیە لە ژوانگە دانان لە دوو لاوە، هەردوولا ئاگادارین کە فڵان شوێن و فڵان کات، بە بەڵێنگە دانراوەو لەوێ پێک بگەن.

کە دەفەرموێ: ﴿ جَانِبَ ٱلطُّورِ ﴾، (**جَانِب**)، واتە: لا تەنیشت، ﴿ ٱلۡأَيۡمَنَ ﴾، واتە: لای ڕاستی کێوی **طوور**، لای ڕاستی کێوی **طوور**، بە ئیعتیباری ئەو کەسە کە دەچێت، چونکە ڕاست و چەپ و سەرو خوار، شتی ڕێژەیین، بە ئیعتیباری شوێنی جوگرافیی کەسەکان جیا دەبن، بۆ وێنە: کەسێک لە باکوورەوە بەرەو باشوور بێ، کێوێک کە لە لای ڕاستیەتی، کاتێک کە بە پێچەوانەوە لە باشوورەوە بەرەو باکوور دەچێ، ئنجا دەکەوێتە لای چەپی، بێگومان ئەو شتانە شتی ڕێژەیی (**نسبي**)ن، کەواتە: بەنسبەت گەلی بەنی ئیسرائیلەوە کێوی **طوور** کەوتۆتە لای ڕاستیان، ئەو ژوانگەیەی کە خوا بۆی داناون، کێوی **طوور** کەوتۆتە لای ڕاستیان، واتە: کە لە میسرەوە هاتوون، کێوی **طوور** لە دەشتی سینا کەوتۆتە لای ڕاستیان، بەڵام ئەگەر لە شامەوە چووبانەوە بەرەو میسر، دەکەوتە لای چەپیان.

٣)- ﴿ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ ﴾، گەزۆ و شێلاقەشمان بۆ دابەزاندن، واتە: خۆراک و میوە، چونکە (**سَلْوَى**)، کە تاکەکەی (**سَلوَاة**)ە، جۆرێکە لە باڵندە، کە بە فارسیی (بلدر چین) ی پێ دەڵێن، بە کوردیی شێلاقەی پێدەڵێن، واپێدەچێ لە شێوەی کەو و سوێسکە دابێ.

(**المَنّ**)یش، واتە: گەزۆ، پێشتر باسمان کرد کە ئەویش ماددەیەکی شیرینە لەسەر گەڵای درەختان دەنیشێ، یان لەسەر بەردو ئەوانە دەنیشێ، کەواتە: گەزۆیەکە لەجێی میوە بووەو، باڵندەکە لە جێی خۆراک بووە، خوا بە شێوەی تایبەت بۆی ڕەخساندوون و بۆی دابەزاندوون.

٤)- ﴿ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ ﴾، لە بژیوە چاک و سوودبەخشەکانی کە پێمان داون، بخۆن، واتە: پێمان گوتن: بخۆن، یاخود ئێمە پێمان گوتبوون: لێی بخۆن.

٥)- ﴿ وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ ﴾، لەو ناز و نیعمەتانەدا سنوور شكێنیی مەكەن، ڕستەی: ﴿ وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ ﴾، ناچێتەوە بۆ: ﴿ طَيِّبَٰتِ ﴾، ئەگەرنا دەیفەرموو: (ولاَ تَطْغَوا فيهَا)، بەڵكو دەچێتەوە بۆ: ﴿ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ ﴾، (الذي رزقناكم)، یان دەچێتەوە بۆ: ﴿ كُلُواْ ﴾، واتە: لە خواردنەكەدا زێدەڕۆیی مەكەن، تێمەپەڕێنن، سنوور شكێنیی مەكەن، ئەمیش بە سێ حاڵەت دەبێ:

أ- یان ئەوەیە لە خواردنەكەیدا زێدەڕۆیی بكەی.

ب- یان دوای ئەوەی كە خواردت، سوپاسگوزاریی خوای لەسەر نەكەی.

ج- یان دوای ئەوەی دەیخۆی، پێی لە خۆبایی بی و لە خوا یاخیی بی.

٦)- ﴿ فَيَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبِي ﴾، ئەم (فَيَحِلَّ)، (ف)كە، دەیباتەوە بۆ: ﴿ تَطۡغَوۡاْ فِيهِ ﴾، (فاء الجزائية)یە، واتە: ئەگەر لە ناز و نیعمەتەكانی خوادا زێدەڕۆیی بكەن و سەركێشیی و سنوور شكێنیی بكەن، تووڕەیی منتان لەسەر دێتە دی، لەسەر پێویست دەبێ، ئنجا: ﴿ فَيَحِلَّ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (فَيَحُلَّ)، هەردووكیان هاتوون، (الحُلُولُ: النُّزولُ وَالإِقَامَةُ بالمَكَانِ شبِّه بحُلُولِ الجَيْش)، (حلول)، واتە: دابەزین و نیشتەجێ بوون، سەقامگیر بوون لە شوێنێك، دابەزینی ئەو سزایەی خوا، چوێنراوە بە دابەزینی سوپایەك لە شوێنێك كە دەیگرێ و، دەستی بەسەر دادەگرێ.

٧)- ﴿ وَمَن يَحۡلِلۡ عَلَيۡهِ غَضَبِي فَقَدۡ هَوَىٰ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (ومن يَحلُلْ)، هەردووكیان بەیەك واتان، واتە: هەر كەسێك تووڕەیی منی بێتە سەرێ، تووڕەیی منی دابەزێتە سەر، لەسەر پێویست بێ، ﴿ فَقَدۡ هَوَىٰ ﴾ (هَوَى: سَقَطَ مِنْ عُلُوٍ)، لەسەرێوە كەوتە خوارێ، بەڵام لێرە خوازراوەتەوە بۆ لە بەین چوون و فەوتان، واتە: هەر كەسێ تووڕەیی منی لەسەر پێویست بێ، فەوتاوە و تێچووە، سەری بە فەتارەت چووە.

٨)- ﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٞ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ﴾، بە دڵنیاییەوە من زۆر لێبوردەم بۆ كەسێك بگەڕێتەوەو، بڕوا بێنێ و، كردەوەی باش بكات، پێشێ بگەڕێتەوە لەو خراپانەی

کە کردوونی، ئنجا دوایی ئیمان بێنێ، ئنجا بە پێی ئیمانەکەی کردەوەی باش بکات، لە زۆر شوێن لە قورئاندا تۆبە پێشخراوە: ﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾، ﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٞ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا﴾، بە زۆریی وایە، چونکە کاتێک مرۆڤ بە ڕێیەکی چەوت دادەڕوات، هەتا ڕێیە چەوتەکە واز لێ نەهێنێ و، نەیەتەوە سەر ڕاستە ڕێ، نە ڕێی ئیمان هێنانی هەیەو، نە ڕێی کردەوەی باشی هەیە، هەروەها کەسێک کە گیرۆدە بووە بە کوفرەوە، دەبێ پێشێ کوفرەکە واز لێبێنێ، ئنجا دەتوانێ ئیمان بێنێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ﴾البقرة٢٥٦، دەبێ کوفر بە (طاغوت) بکات، ئنجا ئیمان بێنێ، هەر بۆیە وشەی (توحید) بریتیە لە: (**نفي، وإثبات**)، (**لا إله إلا الله**)، دەبێ پێشێ هەرچی پەرستراوی ساختەیە، لە عەقڵ و دڵی خۆت دەری بکەی، عەقڵ و دڵی خۆت، لە خڵتەو خاڵ و ژەنگ و ژاری پەرستن و، ڕووتێکردنی هەموو پەرستراوە ساختەکان پاکبکەیەوەو بژاری بکەی، ئنجا دەتوانی خوا بە یەکگرتنی تێدا بچەسپێنی، ئیمان بە خوای تێدا بچەسپێنێ، هەروەک و ئەهلی تەصەووف دەڵێن: (**التَّخلية ثم التحلية**)، خۆبژارکردن، ئنجا خۆڕازاندنەوە.

٩)- ﴿ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ﴾، (واتە: من زۆر لێبوردەم بۆ کەسێک بگەڕێتەوە، دوایی بڕوابێنێ، دوایی کردەوەی باش بکات)، ﴿ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ﴾، پاشان ڕاستە ڕێ بێ، واتە: لەسەر ئەو بڕواو کردەوە باشە بەردەوام بێ، (**اهتدى استمرَّ على الهدى وثبت عليه**)، کەواتە: (ثُمَّ)، لێرەدا (**للترتيب الرُّتبيّ**) بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەییە، چونکە بەردەوام بوون لەسەر ڕاستە شەقامی خوا، پلەیەکی بەرزترە لەسەر ئیمان هێنان و کردەوەی باش ئەنجامدان.

## مەسەلەی سێیەم:

**پرسیارکردنی خوا لە مووسا ﷺ لە هۆکاری پەلەکردنی لە چوونی بۆ جێژوانی خواو، وەڵامدانەوەی مووسا کە مەبەستی ڕازیکردنی خوا بووەو، گەلەکەشی بە دوایەوەن و، هەواڵدانی خوا بە مووسا کە گەلەکەی پاش خۆی بەلایان بەسەر هاتوەو، سامیریی لە خشتەی بردوون و گیرۆدەی گۆلک پەرستیی کردوون:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٨٣﴾ قَالَ هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ رَبِّ لِتَرۡضَىٰ ﴿٨٤﴾ قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٥﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ﴾، خوا فەرمووی: ئەی مووسا! چ شتێک پەلەی بە تۆ کرد کە گەلەکەت بەجێ بهێڵیی؟ (الإِعْجَالُ: جَعْلُ الشيءِ عَاجلاً)، (إعجال): بریتیە لەوە کە شتێک زوو پەلەی پێ بکەی، شتێک بە پەلە ئەنجام بدەی، ﴿وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ﴾، بۆچی پەلەت کرد لە بەجێهێشتنی گەلەکەت دا، ئەوانت بەجێهێشت و خۆت زووتر هاتی، لە جیاتی ئەوەی پێکەوە بێن، بۆ ئەو جێژوانە، کە خوا ﷻ بۆی بڕیاردا بوون؟.

ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا، بە تەفصیل باسمان کردوە کە خوا ﷻ، سی (٣٠) شەوی بۆ مووسا دانا بوون، کە دوای سی شەوەکە بچێتە ئەو شوێنەو لە خزمەتی خوادا گفتوگۆ بکات و تەوراتی لێوەربگرێ، دوایی دە (١٠) شەوی دیکەشی زیاد کردوە لە سی شەوەکەو بۆتە چل (٤٠) شەو: ﴿وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةٗ وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗۚ وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿١٤٢﴾﴾الأعراف،

دیارە دوای چل شەوەکە مووسا ﷵ، کەوا بڕیار بووە لەگەڵ بەنوو ئیسرائیلدا بە یەکەوە بچن بۆ ئەو جێژوانە، بەڵام مووسا پەلەی کردوە، ئنجا خوا لە هۆکاری پەلەکردنەکەی و جێهێشتنی گەلەکەی دەپرسێ؟

مووسا ﷵ وەڵام دەداتەوە:

٢)- ﴿ قَالَ هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي ﴾، گوتی: ئەوان لە پشتمەوەن، بەدوامەوەن، واتە: من لە پێش ئەواندا هاتم و ئەوانیش بەدوامەوەن، ئەوە دێن بە شوێن پێمدا.

٣)- ﴿ وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ رَبِّ لِتَرۡضَىٰ ﴾، ئەی پەروەردگارم! پەلەم کرد بۆ لای تۆ، تاکو لێم ڕازیی بی، دیارە مووسا زۆر تامەزرۆو موشتاق بووە بۆ دیداری خوا ﷻ، ئەو خەڵکەش هەموو ژن و منداڵیان پێ بووەو، کۆڵ و باریان پێ بووە، بێگومان بە پێی مووسا دەرنەچوون، مووساش پەلەی بووەو هۆکاری پەلەکردنەکەشی ئەوە بووە کە هەرچی زووترو زیاتر ڕەزامەندیی خوا بەدەست بێنێ.

٤)- ﴿ قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ ﴾، خوا فەرمووی: بە دڵنیایی ئێمە لە دوای تۆ گەلەکەتمان تاقیکردەوە، تووشی بەڵامانکردن.

٥)- ﴿ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ ﴾، بەڵاو تاقیکردنەوەکەش ئەوەیە کە: سامیریی گومڕای کردن.

## ئایا سامیریی کێ بووە؟

١- سامیریی گەنجێکی قیبتیی بووە، واتە: لە میسرییەکان بووەو چۆتە نێو ڕیزەکانی بەنی ئیسرائیلەوە، لە میسر لەگەڵ واندا ئولفەتی پەیدا کردوەو، خووی پێوەگرتوون و خۆشیویستوون، یان لەبەر ئەوەی بابایەکی صەنعەتکار بووە، شتی بۆ دروستکردوون، لەگەڵیاندا بووە، واتە: جوولەکە نەبووەو، لە بەنی ئیسرائیل نەبووە.

٢- لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە هاتوە کە دەڵێ: (كان السامري من أهل كرمان)، سامیریی خەڵکی کەرمان بووە، کەرمان شارێکە ئێستاش هەر هەیە لە ئێران.

٣- (البيضاوي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: سامیریی پاڵدراوەتە لای هۆزێک لە بەنی ئیسڕائیل، کە ئەو هۆزە پێی دەگوترێ: سامیرە.

بەڵام ئەم ڕایە ڕاست نیە، وەک (محمد الطاهر عاشور)، دەڵێ: {فَلَيْسَ بِصَحِيحٍ، لِأَنَّ السَّامِرَةَ أُمَّةٌ مِنْ سُكَّانِ فِلَسْطِينَ فِي جِهَةِ نَابُلُسَ فِي عَهْدِ الدَّوْلَةِ الرُّومِيَّةِ "الْبِيزَنْطِيَّةِ" وَكَانُوا فِي فِلَسْطِينَ قَبْلَ مَصِيرِ فِلَسْطِينَ بِيَدِ بَنِي إِسْرَائِيلَ، ثُمَّ امْتَزَجُوا بِالْإِسْرَائِيلِيِّينَ وَاتَّبَعُوا شَرِيعَةَ مُوسَى عليه السلام مَعَ تَخَالُفٍ فِي طَرِيقَتِهِمْ عَنْ طَرِيقَةِ الْيَهُودِ، فَلَيْسَ هُوَ مَنْسُوبًا إِلَى مَدِينَةِ السَّامِرَةِ الْقَرِيبَةِ مِنْ نَابُلُسَ لِأَنَّ مَدِينَةَ السَّامِرَةِ بَنَاهَا الْمَلِكُ "عَمْرِي" مَلِكُ مَمْلَكَةِ إِسْرَائِيلَ سَنَةَ 925 قَبْلَ الْمَسِيحِ. وَجَعَلَهَا قَصَبَةَ مَمْلَكَتِهِ، وَسَمَّاهَا "شُومِيرُونَ" لِأَنَّهُ بَنَاهَا عَلَى جَبَلٍ اشْتَرَاهُ مِنْ رَجُلٍ اسْمُهُ "شَامِرَ"}[1].

دەڵێ: ئەو ڕایەی (بیضاوي) ڕاست نیە کە سامیریی پاڵدرێتە لای هۆزی (سامیرە)، کە هۆزێک بوون لە بەنی ئیسڕائیل، چونکە (سامیرە)، خەڵکێک بوون لە دانیشتووانی فەڵەستین لە لای نابلوسەوە، لە ڕۆژگاری دەوڵەتی ڕۆمی بیزەنتییداو، ئەوانە لە فەڵەستین بوون، پێش ئەوەی فەڵەستین بکەوێتە دەستی بەنی ئیسڕائیل، دوایی لەگەڵ بەنی ئیسڕائیلدا تێکەڵ بوون و، شوێن شەریعەتی مووسا کەوتوون، بەڵام لەگەڵ هەندێ جیاوازیی لە شێوەی دینداریکردنی جوولەکەکاندا، شاری (سامیرە)ش، پادشایەک دروستی کردوە بە ناوی (عەمری)، کە پادشای مەملەکەتی ئیسڕائیل بووە لە ساڵی (٩٢٥)ی پێش زاینییداو، ناوی لێناوە شومیرۆن، چونکە لەسەر چیایەک دروستی کردوە کە لە پیاوێک کڕیویەتی، ئەو پیاوە ناوی (شامیر)بووە.

ئنجا دیارە ئەو وشانە (شامیر)بووە بە (سامیر)و (شومیرۆن) لە ئەصڵدا لە (شامیر)ەوە هاتوەو، دواییش گۆڕدراوە بۆ (سامیر).

---

(١) التحرير والتنوير، ج١٦، ص٢٧٩.

ئه‌و سێ ڕایه هه‌ن و هه‌ر چۆن بێ له قورئاندا باس نه‌کراوه، که ئه‌و سامیرییه پیاوێک بووه، قیبتیی بووه، یان خه‌ڵکی که‌ڕمان بووه، یان خه‌ڵکی ئه‌و شوێنه بووه که سامیره‌یه، که ئه‌وانیش نه‌ک هۆزێک بووبن له جووله‌که‌کان، به‌ڵکو خه‌ڵکێک بوون له فه‌ڵه‌ستین به‌ر له‌وه‌ی به‌نی ئیسرائیل له‌وێدا نیشته‌جێبن، ئه‌وان هه‌ر له‌وێ بوون، به‌ڵام دوایی له‌گه‌ڵ جووله‌که‌کاندا تێکه‌ڵ و ئاوێته بوون.

## مەسەلەی چوارەم:

**گەڕانەوەی مووسا بۆ لای گەلەکەی و سەرزەنشتکردنی بۆیان و، بیانوو هێنانەوەی ئەوانیش کە بە دەست خۆیان نەبووە، تووشی گۆلک پەرستیی بوون، چونکە کاتێک هەموویان وێڕای سامیریی ئەو خشڵ و کەل وپەلەی میسرییەکانیان فڕێداوەتە قاڵبێکەوە «کە سامیریی سازی کردوە» قاڵبی گۆلکێک، دوایی ئەو خشڵ و زێڕو زیوە، بۆتە پەیکەری گۆلکێکی بۆڕەدار، دوایی سامیریی پێی گوتوون: ئەوە پەرستراوەکەتانەو، مووسا لە بیری چووە، بۆیە چۆتە لای کێوی طوور بە دوای پەرستراوەکەی خۆیدا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ وَعۡدًا حَسَنًاۚ أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ أَمۡ أَرَدتُّمۡ أَن يَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُم مَّوۡعِدِي ٨٦ قَالُواْ مَآ أَخۡلَفۡنَا مَوۡعِدَكَ بِمَلۡكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلۡنَآ أَوۡزَارٗا مِّن زِينَةِ ٱلۡقَوۡمِ فَقَذَفۡنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلۡقَى ٱلسَّامِرِيُّ ٨٧ فَأَخۡرَجَ لَهُمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٞ فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمۡ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ ٨٨ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَلَّا يَرۡجِعُ إِلَيۡهِمۡ قَوۡلٗا وَلَا يَمۡلِكُ لَهُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا ٨٩ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗا ﴾، دوای ئەوەی مووسا عليه السلام خوا تعالى هەواڵی پێدەدات کە لە دوای تۆ گەلەکەتمان تووشی بەڵا کردوە، تاقیمان کردوونەوە، بەڵاو تاقیکردنەوەکەش ئەوەیە کە سامیریی هەڵیخەڵەتاندوون و گیرۆدەی گۆلک پەرستیی کردوون، مووسا عليه السلام گەڕایەوە بۆ لای گەلەکەی بە تووڕەیی و بە دڵتەنگییەوە، تووڕەیی هەڵچوونێکی دەروونییە لە ئەنجامی ئەوەدا کە مرۆڤ دەرکی شتێک دەکات، کە بۆی خراپە، بەبێ ئەوەی ترسی لێی هەبێ، ئەو حاڵەتەی بۆ دروست دەبێ، بەڵام (أَسَفْ)

دڵتەنگیی، بریتیە لەوە کە مرۆڤ خەفەت و مەراقێکی بێتە دڵ بەرانبەر بە شتێک کە پێی ناخۆشە، واتە: تووڕەیی بریتیە لە هەڵچوون، بەڵام دڵتەنگیی و ئەسەف بەبارێکی دیکەدا، بریتیە لە خەفەت خواردن و پەژارە داربوون، کە مرۆڤ نەتوانێ دەریبڕێ، واتە: مووسا هەم تووڕەیی و هەم دڵتەنگیی لە نێو دەروونیدا ئاوێتە بوون، تووڕە بوون لە بەنی ئیسرائیل و، دڵتەنگ بوون و بە پەرۆش بوون و خەفەت بۆ خواردنیان کە گومڕا بوون، تووڕە بوون لێیان کە بۆچی لایان داوەو، پەرۆش بوونی بۆیان و خەفەت خواردنی لێیان، کە بۆچی خۆیان تووشی ئەو دەردە کوشندەیە کردوە، کە بریتیە لە شیرک و گۆلک پەرستیی؟

٢)- ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ وَعۡدًا حَسَنًا﴾، گوتی: ئەی گەلەکەم! ئایا پەروەردگارتان بەڵێنێکی باشی پێنەدا بوون؟

هەڵبەتە لێرەدا ئەو پرسیارکردنە، پرسیارکردنێکی ئاسایی نیە، چاوەڕێی ئەوان بێ بڵێن: با، یان بڵێن: نا، بۆیە ئەو پرسیارلێکردنە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانە، **(الإستفهام الإنكاري)**یە، واتە: بە دڵنیاییەوە پەروەردگارتان بەڵێنێکی باشی پێدا بوون، گفتێکی باشی پێدا بوون، ئەویش ئەوەبوو کە بەیەکەوە بچین بۆ ئەو جێژوانەو، لەوێ خوا تەورات بە من بدات و، بەهۆی ئەو تەوراتەوە، (تەورات، واتە: شەریعەت)، من ژیانی ئێوە ڕێک بخەم، لە ڕووی خوا پەرستییەکانەوە، لە ڕووی ڕەوشت و ئاکارەوەو، لە ڕووی کۆمەڵایەتیی و، لە ڕووی سیاسیی و... هتدەوە، وەک کە لە تەوراتدا هاتوە، ئەم وەعدە چاکە بە دڵنیایی لێرە دیار نەکراوە، بەڵام ئەو بەڵێن و گفتە چاکە بریتی بووە، لەوە کە خوا تەورات دابەزێنی بۆ مووسا ﷺ، ئەویش دوای ئەو چل (٤٠) شەوە بووە کە باسمان کرد.

ئنجا مووسا دەفەرموێ:

٣)- ﴿أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ﴾، ئایا کاتەکە درێژ بۆوە لەسەرتان؟

ئەمە دوو واتای هەن:

أ- ﴿أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ﴾، هەڵبەتە ئەویش هەر پرسیارلێکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، ئایا ئەو کاتەی کە خوا ﷻ ئێوەی دەربازکرد لە میسر لە چەنگی فیرعەون، پاشان دەربازی کردن لە دەریای سوور، پاشان لە دەشت و بیابانی سینا، دەربازی کردن لە بێ خۆراکیی و کەم ئاویی، چونکە لێرەدا نەهاتوە، بەڵام لە سوورەتی (الأعراف)دا هاتوە، هەروەها لە سوورەتی (البقرة)شدا کە لەتکە چیایەک، گاشە بەردێکی گەورە، دوازدە سەرچاوەی بۆ لێ دەرقوڵاندوون، ئایا ئەو کاتە لە ئێوە دوور بوو، کە خوا لەو هەموو بەڵاو موسیبەتانە دەربازی کردن؟

ب- واتایەکی دیکەی: ﴿أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ﴾، واتە: ئایا ئەو ژوانگەیەی کە خوا بۆی دانابووین کە دوایی چل (٤٠) شەو بچین، پێتان زۆر بوو، دوای چل شەو بچین تەورات وەربگرین لە خوای پەروەردگارو ژیانی خۆمانی پێ ڕێک بخەین، واتە: نە ئەو کاتە زۆری بەسەردا تێپەڕیوە، کە خوا دەربازی کردن و، نە ئەو کاتەش کە بەرەو ڕووی دەچین، کە بریتیە لەو ژوانگەیەی کە لە دوای چل شەو خوا تەوراِت بەمن دەدات، هیچیان دوور نەبوون، بۆیە ئەم پرسیارکردنە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە.

٤)- ﴿أَمۡ أَرَدتُّمۡ أَن يَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾، یان ئایا ویستتان تووڕەیی خوا بێتە سەرتان، تووڕەیی خوا دابەزێتە سەرتان، لێرەدا: (**شَبَّه حَالَهُم بحَالِ من يحاول إحلال غضب الله**)، واتە: حاڵی ئێوە وەک حاڵی کەسێکە، کە بە زۆر بیەوێ تووڕەیی خوا بەسەر خۆیدا بهێنێ.

لە ڕووی ڕێزمانییەوە دەڵێ: (**العَهْدُ: مَصْدَرُ أُطْلِقَ عَلَى المَفْعولِ، كَإطْلاَقِ الخَلْقِ عَلَى المَخْلوقِ، أَي: طَالَ المَعهودُ لَكم وبعُد زمنهُ...!**)، بە هەردوو واتای (**معهود**) کە گوتمان، چونکە (**عهد**) واتە: شتێک کە لە ڕۆژگارێکدا بووە، هەروەک چۆن بە مانای بەڵێن و پەیمان دێ، (**هو قريب عهد به**)، واتە: ڕۆژگارەکەی لێوە نیزیکە، ئنجا چ مەبەست پێی دەربازبوونیان بێ، لەو بەڵایانەی کە باسمان کردن، چ مەبەست پێی ئەو ژوانگەیە بێ کە بۆی دەچن.

(عهد) چاوگە، بەڵام مەبەست پێی (معهود)ە، وەک (خلق) بە مانای (مخلوق)، واتە: ئەو شتە کە لەو ڕۆژگارەدا ڕوویداوە، یان جێژوانەکە، کە لە پێشمانە، یان (بَاقٍ عَلَى أَصْلِ الْمَصْدَرِ، وهو عهدهم الله على الإمتثال والإحتمال بالشريعة)، یان وشەی (عهد) بەمانای (معهود) نیەو هەر لەسەر ئەصڵی واتای خۆی، مانای: بەڵێن و پەیمان، ماوەتەوە، واتە: بەڵێنتاندا بە خوا کە پابەندبن بە شەریعەتەوەو فەرمانبەریی بۆ خوا بکەن، ئایا ئەو بەڵێنەی کە بە خواتان دابوو، ماوەی زۆری بەسەردا تێپەڕی بوو؟، تازە بەڵێنتان بە خوا داوە.

٥)- ﴿فَأَخْلَفْتُم مَّوْعِدِى﴾، واتە: ڕاسپاردەی منتان بە جێ نەهێنا، (أَخْلَفَ وَعْدَهُ)، واتە: پێچەوانە بوو لەگەڵ بەڵێنەکەیدا، ﴿مَّوْعِدِى﴾، واتە: ئەو جێژوانەی کە پەروەردگار لەسەر زمانی من پێی ڕاگەیاند بوون، بۆیە پاڵی داوەتە لای خۆی، ئێوە لەو جێژوانە دواکەوتن، کاتێک مووسا ﵇ ڕۆیشتوەو تەوراتی وەرگرتوە، وایزانیوە کە گەلەکەشی وردە وردە بەدوایدا هاتوون، نەیزانیوە لەوێ بەجێماون و، سامیریی سەرقاڵیی کردوون بە گۆلک پەرستییەوەو، دوورکەوتوونەوە لە مووسا، بۆیە مووسا کە تەوراتی وەرگرتوە، لەوحەکانی تەوراتی وەرگرتو و، گەڕاوەتەوە، سەیر دەکات هەر لە شوێنی خۆیانن و، نەهاتوون بۆ ئەو شوێنەی کە بڕیاربوو بێن بۆ ئەو جێژوانە.

بۆیە دەفەرموێ: ﴿فَأَخْلَفْتُم مَّوْعِدِى﴾، واتە: دواکەوتن لە جێژوانەکە، یان: ئەو ڕاسپاردەیەی کە پێم گوتوون جێبەجێتان نەکردو بە پێچەوانەی ڕەفتارتان کرد، کە بریتی بوو لەوەی لە جیاتی ئەوەی لەسەر خوا پەرستیی و یەکتاپەرستیی بمێننەوە، دەستتان کرد بە شیرک و گۆلک پەرستیی.

٦)- ﴿قَالُوا۟ مَآ أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا﴾، گوتیان: ئێمە ئەو جێژوانەی کە خوای پەروەردگار لەسەر زمانی تۆ پێی ڕاگەیاند بووین، جێژوانەکەی تۆ لێی دوانەکەوتین، بە هۆی شتێکەوە کە بە دەست خۆمان بێ.

واتایەکی دیکەی واتە: ئەو بەڵێنەی کە بە تۆمان دابوو، یان ئەو ڕاسپاردەیەی کە تۆ پێت گوتبووین و، ئێمەش وەرمانگرتبوو، کە لەسەر خواپەرستیی و تەنیا

بەندایەتیی کردن بۆ خوا بەردەوام بین و، لانەدەین، ئا ئەو بەڵێن و پەیمانەمان نەشکاند، بە ویستی ئازادانەی خۆمان، ﴿بِمَلْكِنَا﴾، خوێندراویشەتەوە: (بِمُلْكِنا)، هەروەها خوێندراویشەتەوە: (بِمِلْكِنا)، هەر سێک خوێندنەوەکەی هاتوون، هەرسێکیان واتە: (باختيارنا، وإرادتنا)، واتە: بە هەڵبژاردنی خۆمان و بەویستی خۆمان.

٧)- ﴿وَلَٰكِنَّا حُمِّلْنَآ أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ﴾، ئەدی ئایا بۆچی لە جێژوانەکە دواکەوتن، یان بۆچی بەڵێنەکەی بە مووسایان دا بوو شکاندیان؟ پاساو بەوە دێننەوە: ﴿وَلَٰكِنَّا حُمِّلْنَآ﴾، بەڵام ئێمە لێمان بارکرابوو، خرابووە سەرکۆڵ و شانمان، ﴿أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ﴾، چەند قورساییەک لە زێڕو زێوەرو خشڵی خەڵکەکە، خەڵکەکە یانی: خەڵکی میسر، کە دەڵێ: (وَلَٰكِنَّا)، دیارە (لكن)، بەڵام (إستَدراك)ە، (الإسْتدراكُ: رَاجِعٌ إلى أنَّهُم لم يقصدوا الضَّلاَلَ)، ئەم بەڵام (إستدراك)ە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەوان نەیانویستوە گومڕابن، بەڵام گومڕاییان بە مل داهاتوە، وشەی: (حُمِّلْنَآ)، واتە: خراوەتە سەر کۆڵمان، لێمان بارکراوە، خوێندراویشەتەوە: (وَلَكِنَّا حَمِلنَا أَوزَاراً مِّن زِينَةِ القَومِ)، بەڵام ئێمە چەند قورساییەکمان لە زێڕو زیو و خشڵ و کەل و پەلەکانی خەڵکی میسڕ هەڵگرتبوون.

لێرەدا: (**التفسير التطبيقي للكِتاب المقدس، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: ١٢ ص١٥٦**)، دەڵێ:

**(وَطَلَبُوا مِنَ الْمِصْرِيِّينَ آنِيَةَ فِضَّةٍ وَذَهَباً وَثِيَاباً بِحَسَبِ قَوْلِ مُوسَى، وَجَعَلَ الرَّبُّ الشَّعْبَ يَحْظَى بِرِضَى الْمِصْرِيِّينَ، فَأَعْطَوْهُمْ كُلَّ مَا طَلَبُوهُم، فَغَنِمُوا مِنَ الْمِصْرِيِّينَ).**

واتە: بەنی ئیسڕائیل لە میسڕییەکانیان داواکرد، قاپ و قاچاغی زیو و زێڕیشیان لێوەرگرتن، (واتە: خشڵ و ئەوەی کە خۆی پێ دەڕازێننەوە)، هەروەها جل و بەرگ، کە مووسا پێی گوتبوون و پەروەردگار وایکرد بوو کە گەل (شعب)، (گەلی بەنی ئیسڕائیل) خەڵکی دیکە متمانەو باوەڕیان پێ بکەن و هەرچی لێیان داواکردن پێیاندان، بۆیە دەستکەوتێکی زۆریان لە میسڕییەکان وەدەستکەوت بوو.

کە ئەوان ساڵەهای ساڵ دەیان چەوسێننەوە و سۆغرەو بیگاریان پێ دەکەن، دەبێ مووسا پێی گوتبن، هەندێک لە زێڕو زیو و خشڵ و کەل و پەلیان لێ وەربگرن، دوایی پێویستییمان پێ دەبێ بۆ ڕێیە، بۆ ئەو شوێنەی بۆی دەچین، چونکە هەموو شتێکمان جێهێشتوە، کە لە پەیمانی کۆندا زیاتر تیشک دەخاتە سەر ئەو مەسەلەیە، کەواتە: ئەوانە هەم قاپ و قاچاغ و جل و بەرگ، هەم خشڵ و زێڕو زیوەریان لە میسرییەکان وەرگرتوە، ئەوەیە کە دەڵێ: ﴿وَلَٰكِنَّا حُمِّلْنَآ أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ﴾، یاخود (وِلكنّا حَمَلْنَا)، بەڵام هەڵمانگرتبوو، یان پێمان هەڵگیرا بوو، لێمان بارکرا بوو.

٨)- ﴿فَقَذَفْنَٰهَا﴾، (أي: فَطَرَحْنَاهَا)، فڕێماندا، بۆچی فڕێیان داوە؟، واپێدەچێ دوایی کە سەیریان کردوە، ئەو خەڵکە هەمووی فەوتاوە، سەریشیان ڕۆیی ماڵەکەشیان زۆری لە لای ئێمەیە، یان بەشێک لە ماڵەکەیان لە لای ئێمەیە، دەگونجێ وەک وەرع و دینداریی و خۆپاراستن لە شتی قەدەغە و حەرام، فڕێیان دابێ، یاخود: ﴿فَقَذَفْنَٰهَا﴾، لەسەر فەرمان و ڕێنمایی سامیریی کە قۆڵتێکی هەڵکەندوە و، بۆتەو قاڵبێکی لەسەر شێوەی گۆلک، دروستکردوە، زێڕو زیو و خشڵەکەیانی تێدا قاڵکردۆتەوە، گوتوویەتی: بێنن بیخەنە ئەو بۆتەو قاڵبەوە، بۆ ئەوەی سەرەنجام گۆلکێک دەربچێ، هەردوو واتاکەی هەن:

١- فڕێماندا بۆ ئەوەی لە کۆڵ خۆمانی بکەینەوە، ئەو کۆڵە.

٢- یاخود فڕێماندا بە پێی قسەی سامیریی.

٩)- ﴿فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى ٱلسَّامِرِيُّ﴾، هەروەها سامیرییش هی خۆی هاویشت، بۆ هی سامیریی ناڵێ (قَذَفَ)، دەڵێ: (أَلْقَى)، (قَذَف)، ئەوەیە کە شتێک بە توندیی فڕێ بدەی، بەڵام (ألقى)، مەرج نیە بە توندیی فڕێی بدەی، یانی: سامیریی جۆرێک لە کارامەیی و لێزانیی و وردەکاریی تێدا بەکارهێناوە، واتە: ئەویش وەک ئێمە ئەوەی کە لە لای بوو، فڕێیدا.

ئنجا لەو بارەوە کە ئەوانە ئەگەر لە ڕووی وەرع و تەقواوە، ئەو شتانەی کە لە خەڵکی میسرِیان وەرگرتوون، زێڕو زیو و خشڵ و کەل و پەل، فرێیان دابن، بەڵام دوایی گوڵکیان پەرستوە، لەو بارەوە دەڵێ: کابرایەکی عێراقیی پرسیاری لە (**ابن عمر**) کرد (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەربارەی خوێنی مێشووله؟ ئەویش گوتی: تۆ خەڵکی کوێی؟ گوتی: خەڵکی عێراقم، ئیبنو عومەر گوتی: سەیرکەن! ئەوانە خوێنی کوڕی کچی پێغەمبەر ﷺ دەڕێژن، (دوای کوژرانی حوسێن بووە لە کەربەلا)، بەڵام لە خوێنی مێشووله دەپرسن، واتە: بە حیساب لە گوناهی گچکە خۆ دەپارێزن، بەڵام تووشی هی گەورەتر دەبن!

جولەکەکانیش ئەو خشڵ و زێڕو زیوەی کە لە خەڵکی میسرِیان وەرگرتوە، فرێیان داوە، بەڵام دوایی تووشی ئەوە بوون کە گوڵکێک بپەرستن و تووشی بتپەرستیی بن.

١٠)- ﴿فَأَخۡرَجَ لَهُمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٞ﴾، دوایی سامیریی پەیکەری گوڵکێکی بۆ دەرهێنان، بۆڕەی هەبوو، واتە: لەو بۆتە و قاڵبە، کە لە زەوی هەڵیقەند بوو، دیارە بابایەکی زۆر کارامەو صەنعەتکارو شارەزا بووە، لە شێوەی گوڵکدا ئەو قوڵتەی هەڵکەندوە، کە زێڕو زیوەکەیان قاڵکردوەو تێیان هاویشتوە، دوایی کە سارد دەبێتەوە و ڕەق هەڵدەگەڕێ، دەبێتە پەیکەری گوڵکێک، ﴿لَّهُۥ خُوَارٞ﴾، واتە: بۆڕەی هەبوو، بۆیە دەفەرموێ: ﴿فَأَخۡرَجَ لَهُمۡ﴾، لەبەرئەوەی کە قاڵب و بۆتەکەی لە زەویدا لێداوە.

١١)- ﴿فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمۡ﴾، گوتیان: ئەوە پەرستراوی ئێوەیە، واتە: خەڵکە هەڵخەڵەتاوەکە وایانگوت، یاخود ﴿فَقَالُواْ﴾، واتە: سامیریی وایگوت، بەڵام سامیریی لە لای بەنی ئیسرائیل هێندە گەورە بووە، ڕاناوی کۆی بۆ بەکارهاتوە، یاخود سامیریی و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، وایانگوت.

١٢)- ﴿وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ﴾، مووساش پەرستراوەکەی خۆی لە بیرچوو، واتە: مووسا پەرستراوی خۆی لە بیرچووە، بۆیە چووە بۆ سەر کێوی **طوور**، وا دەزانێ پەروەردگاری لەوێیە، یان لەوێ گفتوگۆی لەگەڵدا بکات، نازانێ ئەوە لێرەیەو ئەو گوڵکەیە.

واتایەکی دیکەی: سامیریی پەرستراوی مووسای لە بیرچوو، یان ئەو شەریعەت و بەرنامەیەی کە مووسا بە جێیهێشتبوو، فەرامۆشی کردو، وازی لێهێنا، چونکە وشەی (نسیان)، وەک چۆن بە مانای لە بیرچوون دێ، بە مانای وازلێهێنان و پشتگوێ خستنیش دێ.

کەواتە: (نسي)، یانی: مووسا پەرستراوەکەی خۆی لە بیرچووە.

یان: سامیریی پەرستراوی مووسای فەرامۆشکرد، یاخود ئەو ڕێباز و ڕێ و شوێنەی کە مووسا بە جێی هێشتبوو، وازیلێهێنا و پشتگوێی خست.

١٣)- ﴿ أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا ﴾، ئەمە دووبارە پرسیارلێکردنی نکوولیلێکەرانەیە ئایا نەیاندەبینی کە هیچ قسەیەکیان بۆ لا ناگێڕێتەوە، واتە: وەڵامی هیچ قسەیەکیان ناداتەوە.

١٤)- ﴿ وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ﴾، هیچ زیان و سوودێکیشی بۆ ئەوان بەدەست نیە، هەڵبەتە مەبەستی ئەوە نیە کە ئەگەر هاتباو قسەی لەگەڵ کردبان، یان زیانی لێ دورخستبانەوە، یان سوودی پێگەیاندبان، شایستەی پەرستران بووە، بەڵکو یانی: تەنانەت ئەو شتە سادانەشی لە دەست نایەت، چ جای ئەوە کە وەک پەروەردگار بتوانێ شت بەدیبێنێ و، پەروەردە بکات و بژیەنێ و بمرێنێ، کە تەنیا زاتێکی وا شایستەی پەرسترانە.

## سێ وردە سەرنج

١- سامیریی بۆیە بتێکیی لە شێوەی گوێلکدا بۆ دروست کردوون، چونکە میسڕییەکان لە میسڕ گوێلکێکیان دەپەرست، بە ناوی (ئیبیس)، ئنجا دیارە بەنی ئیسڕائیلیش کەم و زۆر کارتێکراو بوون بە فیکرو بۆچوون و نەریتی بتپەرستانەی میسڕییەکان، بۆیە سامیرییش بابایەکی فێڵباز و زۆرزان بووە، ویستوویەتی پەرستراوێک و بت و صەنەمێکیان بۆ دروست بکات، کە پێشتر پێوەی ڕاهاتوون، دیتوویەتی کە خەڵکی میصڕ، ئەو گوێلکەیان پەرستوە، هەر بۆیەش وەک لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا باسمان کرد، دوای ئەوەی هەر لە دەریا دەپەڕنەوە، بەنی ئیسڕائیل دەڵێن: ﴿ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞ ١٣٨﴾، واتە: پەرستراوێکمان بۆ دابنێ، وەک چۆن ئەوانە پەرستراویان هەیە، مووساش ﷺ زۆر بە تووڕەیی سەرزەنشتیان دەکات و، ڕەخنەیان لێدەگرێ، وەک لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا باسمان کرد.

٢- کە دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَرَوۡنَ أَلَّا يَرۡجِعُ إِلَيۡهِمۡ قَوۡلٗا﴾، ئایا نابینن، هەمزەی (أفَلا..) بۆ پرسیارلێکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، واتە: ئەوانە وەک کەسێک وان کە هەر نەبینێ.

هەڵبەتە بینین لێرەدا مەبەست پێی بینینی چاویی (**بصري**) نیە، بەڵکو مەبەست پێی بینینی عەقڵییە، واتە: ئایا نازانن، دەبوو ئەوەندە بزانن، کە ئەو گوێلکە ناتوانێ قسەیان لەگەڵدا بکات، ئەگەر پەنجا ساڵ بانگی بکەن، ئەو هەر بۆڕە بۆڕێکی دێ، بۆڕە بۆڕەکەش لە ئەنجامی ئەوە دایە، کە کونێکی لە لای پشتەوەی کردووە یەکێکی لە لای زاری کردوە، کاتێک کە با لە پشتەوەی دەدات و بە نێو زاری دادێ، دەنگی دێ، ئەو سامیرییە ئەو کاتە توانیبێتی شتێکی وا دروست بکات، بیخاتە ئەو گوێلکەوە کە با لێی بدات، ببۆڕێنێ، بە ڕاستیی دیارە بابایەکی صەنعەتکارو شارەزا و زۆرزان بووە.

لێرەدا خوای پەروەردگار ئەوانەی کە گۆلکیان پەرستوە، وەک کەسێک سەیری کردوون، کە هەر بینینی نیە، یان وەک کەسێک مامەڵەی لەگەڵدا کردوون، یان لە شوێنی کەسێکی داناون، کە هیچ نازانێ و هیچ نافامێ، ئەگەرنا مەبەستی ئەوە نیە، ئەگەر هاتباو قسەی لەگەڵ کردبان، ئەوە شایستەی پەرستران بوو، بەڵام یانی: ئەو گۆلکە تەنانەت قسەیەکی ئاسایشیی بۆ ناکرێ، جگە لە بۆڕە بۆڕ.

٣- کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا﴾، هیچ زیانێک و هیچ سوودێکی بۆ ئەوان بە دەست نیە، (ضَرّ، ونَفْع) هەردووکیان بە (نكرة) هاتوون، واتە: هیچ زیانێک و هیچ سوودێک، چ کەم و چ زۆر، بۆ ئەوان بە دەستی نیە، بۆچی (زیان) پێش (سوود) خراوە؟ چونکە بیانووی بابای ترساو لە زیان، بەهێزترە لە بیانووی بابای عەوداڵ بۆ قازانج، واتە: کەسێک بڵێ: من بۆیە ئەو پەرستراوەم پەرست، چونکە ترسام زیانم لێ بدات، یاخود بۆ ئەوەم بوو زیانم لێ دووربخاتەوە، ئەوە بەهێزترە لەوەی بڵێ: بۆ ئەوە پەرستم، تاکو سوودم پێ بگەیەنێ و بەهرەمەندم بکات.

### مەسەلەی پێنجەم:

**ئامۆژگاریی کردنی هاڕوون بۆ گەلەکەی، کە تەنیا خوا بپەرستن و، شوێنی وی بکەون و، سوور بوونی بەنی ئیسرائیل لەسەر گۆلک پەرستیی هەتا مووسا دەگەڕێتەوە لایان:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَٰرُونُ مِن قَبْلُ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِى وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِى ﴿٩٠﴾ قَالُوا۟ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَىٰ ﴿٩١﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

هاڕوون ﷺ بێ دەنگ و بێ هەڵوێست نەبووە، لە بەرانبەر گۆلک پەرستیی بەنی ئیسرائیلدا، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە لە (پەیمانی کۆن)دا هاتوە، کە بێگومان ئەوەیان، یەکێکە لەو شوێنانەی جوولەکەکان لە تەوڕات گۆڕیویانەو دەستکارییان کردوە، بەڵکو سەرو بنیان کردوەو هەڵیان گێڕاوەتەوە، کە ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا بە تەفصیل هێناومانە، لێرەش ئاماژەیەکی پێدەکەین: لە (**التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح**: ٣٢، ص١٩٤)، لە ژێر ئەم ناوونیشانەدا (**هارون يصنع العجل الذهبي**)، واتە: هاڕوون گۆلکی زێڕین دروست دەکات، کە حاشا پێغەمبەرانی خوا ﷺ زۆر لەوە پایە بەرزتر بوون، گۆلک بۆ خەڵک دروست بکەن، بڵێن: وەرن گۆلک بپەرستن، خوا مەپەرستن! یانی: مسوڵمانێکی ئاسایی و کەسێک هەر تۆزێک خوا بناسێ، دیارە بت ناپەرستێ، چ جا بت دروست بکات بۆ خەڵکی و بڵێ: وەرن بیپەرستن! چ جای پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەک هاڕوون ﷺ، ئیدی نازانم جوولەکە بە چ عەقڵێک، کتێبێک کە ئەوەی تێدایە بە کتێبی موقەددەسی دادەنێن، پیرۆزییەکەی لە کوێ دایە، ئەو کتێبەی ئەو شتە پڕو پووچ و ئەفسانانەی تێدان؟! بەڵکو هەر ئەوە ڕاستە کە لە قورئاندا هاتوە:

١)- ﴿ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَٰرُونُ مِن قَبْلُ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ﴾، بەدڵنیاییەوە پێشتریش هاروون پێیگوتبوون: ئەی گەلەکەم! ئێوە (ئەم گوێلکە) تەنیا پێی تاقیکرانەوە لێرەدا ئەو تەئکیدە، (و)کە، بۆ گێڕانەوە و بادانەوەی ئەو ڕستەیە بۆ سەر بابەتی پێشێ، بەلاّم (ل) لامی سوێندە، یان زەمینە خۆشکەرە بۆ سوێند (**لام القسم أو ممهدة للقسم**)، (قد)یش بۆ ساغکردنەوە (تەحقیق)یە، ئەم جەختکردنەوەیە، بە (ل) و بە (قد)، بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەوەیە کە لە پەیمانی کۆندا هاتوە - کە دیارە تەورات بەشێکە لە پەیمانی کۆن - گوایە: هاروون دروستکەری گوێلکە زێڕینەکەیە، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَٰرُونُ مِن قَبْلُ ﴾، بە دڵنیایی و مسۆگەریی، هاروون پێشێ پێیگوتن، واتە: پێش گەڕانەوەی پێغەمبەر مووسا ﷺ، چی پێ گوتن؟

﴿ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ﴾، ئەی گەلەکەم! بە دڵنیایی ئێوە هەر پێی تاقیکراونەتەوە، ئەوە هەر بەلاّیەکەو بە ملتاندا هاتوە، ﴿ يَٰقَوْمِ ﴾، ئەوە زەمینە خۆشکەرە بۆ ئەوە کە من بۆ ئێوە دڵسۆزم و یەکێکم لە ئێوە، ئێوە گەل و نەتەوەی خۆمن، خەڵکی خۆمن، دڵسۆزم بۆتان، ﴿ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ﴾، واتە: ئەو گوێلکە پەروەردگارتان نیە، بەڵکو تاقیکردنەوەیەو، بەلاّیەکە بۆ ئێوە.

٢)- ﴿ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگاری ئێوە، خوای میهرەبان و بە بەزەییە، واتە: پەروەردگاری ئێوە هەر ئەو کەسەیە کە بەزەیی پێتان دادێ، پەرۆشی ئێوەیەتی و لەگەڵتاندا میهرەبانە.

٣)- ﴿ فَٱتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوٓاْ أَمْرِي ﴾، ئنجا شوێنم بکەون و فەرمانی من جێبەجێ بکەن، ﴿ فَٱتَّبِعُونِي ﴾، ئەمە بە گشتییە، واتە: بە گشتیی شوێنم بکەون، ﴿ وَأَطِيعُوٓاْ أَمْرِي ﴾، بە تایبەت لە مەڕ ئەو گوێلک پەرستییەش، فەرمانی من جێبەجێ بکەن، فەرمانبەریی فەرمانەکەی من بکەن، شتی وا مەپەرستن و تەنیا خوا پەرست بن.

کەواتە: هاروون زۆر بە جەختکردنەوەوە، زۆر بە تکاو لێ پاڕانەوەوە، زۆر بە لاواندنەوەوە، زۆر بە دڵسۆزانەو بە پەرۆشانەوە، ئاگاداری کردنەوە و هۆشداریی

پێدان، کە ئەو کڵاوەی سامیرییان نەچێتە سەرو فریو نەخۆن بە قسەکانی، بەڵام ئەوان چییان گوت؟

٤)- ﴿قَالُواْ لَن نَّبۡرَحَ عَلَيۡهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرۡجِعَ إِلَيۡنَا مُوسَىٰ﴾، گوتیان: بەردەوام دەبین لەسەر هۆگر بوون و پەیوەست بوون پێیەوە، بە پەرستنی ئەو گۆلکەوە، هەتا مووسا دەگەڕێتەوە بۆ لامان.

وشەی (بـرِح)، واتە: (زال)، واتە: ڕۆیشت، نەما، (لا يَـبرَح)، واتە: ناڕوا، یانی: بەردەوام دەبێ، (لَنْ نَبْرَح)، واتە: بە دڵنیایی، بەردەوام دەبین، چونکە (لن) بۆ تەئکیدە و بۆ تەئبیدیشە (للتأكيد والتأبيد)، واتە: بەردەوام دەبین و هەمیشە بەردەوام دەبین لەسەری و هەرگیز دەستی لێ هەڵناگرین، لەو گۆلک پەرستییە، **(أي لن نزال)**، **(العكوف: الملازمة لقصد القربة والتعبّد)**، **(عكوف)**: بریتییە لە پەیوەست بوون بە شتێکەوە بە مەبەستی خۆلێ نیزیک خستنەوە و بەندایەتیی بۆ کردن، واتە: لەسەر ئەو گۆلک پەرستییە و پەیوەست بوون بە پەرستنیەوە، بەردەوام دەبین.

٦)- ﴿حَتَّىٰ يَرۡجِعَ إِلَيۡنَا مُوسَىٰ﴾، هەتا مووسا دەگەڕێتەوە لامان، هەتا مووسا دەگەڕێتەوە نێو مان، بزانین ئایا وەک سامیریی دەڵێ: ئەو گۆلکە پەرستراومانە، کە مووسا چووە کێوی طووری بۆ بپشکنێ، یان تۆ ڕاست دەکەی ئەی هاروون؟ ئێمە بە قسەی تۆ ناکەین، تاکو مووسا ﷺ دەگەڕێتەوە نێومان.

مەسەلەی شەشەم:

**سەرزەنشتی مووسا بۆ هاڕوون و سەرو ڕیش گرتنی، کە بۆچی شوێنی نەکەوتووەو، پۆزش هێنانەوەی هاڕوون، بەوەی کە مەترسیی پەیدابوونی دووبەرەکیی هەبووە لە نێو گەلەکەییداو، مەترسیی ئەوەشی بووە کە دوایی مووسا گلەیی ئەوەی لێ بکات: بۆچی چاوەڕێی فەرمانی ئەوی نەکردووەو، بۆچی قسەکەی وی نەپاراستووە، کە گوتی: هێنەوە لێرەدا لە نێو خەڵکەکەدا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِۖ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِي ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلَا بِرَأْسِيٓۖ إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِي ﴿٩٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِۖ ﴾؟، مووسا عليه السلام گوتی: ئەی هاڕوون! چ شتێک ڕێی لێ گرتی، کاتێک بینیتن گومڕا بوون، کە شوێنم نەکەوی، ئنجا بە ڕواڵەت دەبوو فەرموو بای: (**ما منعك إذْ رَأَيتَهُم ضَلُّوا أن تَتَّبعَني**)، چ شتێک بوو بە پەرچ و ڕێی لێگرتی، کاتێک بینیتن گومڕا بوون، کە شوێنم بکەوی؟

بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ أَلَّا تَتَّبِعَنِ ﴾، زانایان دەڵێن: لێرەدا ئەمە دوو ڕستەن خراونەتە نێو یەک، هەروەک لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)یشدا لە تەفسیری ئایەتەکانی سەرەتایدا باسمان کرد، کە لەوێ دەفەرموێ: ﴿ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ... ﴿١٢﴾ ﴾، چ شتێک ڕێگرت بوو کە سەجدەم بۆ نەبەی، کاتێک فەرمانم پێ کردی؟ واتە: (**مَا مَنَعَكَ أن تَسجُدَ وحَمَلَكَ عَلَى ألاَّ تَسجُدَ**)، چ شتێک ڕێگرت بوو کە کڕنووش بەری و، وایلێکردی کە کڕنووش نەبەی؟ ئەم دوو ڕستەیە خراونەتە نێو یەک، واتە: چ شتێک پەرچ بوو لە بەردەمتدا کە کڕنووش بەری و، چ شتێک هاندەرت بوو کە کڕنووش

نەبەی؟ لێرەش دەفەرموێ: ﴿يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِ﴾، واتە: چ شتێک ڕێگرت بوو، کاتێک کە بینیتن گومڕا بوون، کە شوێنم بکەوی و، چ شتێک هاندەرت بوو کە شوێنم نەکەوی؟ هەردوو ڕستەکە خراونە نێو یەک، (**أي ما منعك أن تتَّبعني، واضطرَّكَ إلى ألاَّ تتبعنِي؟**)، چ شتێک ڕێگرت بوو کە شوێنم بکەوی و، ناچاری کردی کە شوێنم نەکەوی، شوێنم نەکەوی، دوو واتای هەیە:

**یەکەم:** ئەوەیە کە هاڕوون دەبووایە وازی لەو خەڵکە هێنابایە، کە بە قسەی سامیریی هەڵخەڵەتاون و کڵاوی سامیریی ساختەچیان چۆتە سەرێ و، یەکسەر خۆی گەیاندبا بە مووسا، ئەوە ئەگەر وشەی (**إتباع**) مانا ڕاستەقینەکەی لێ وەربگرین، کە بریتیە لە شوێن کەوتنی ڕواڵەتیی.

**دووەم:** ئەگەر مانا مەجازییەکەی لێ بگرین، کە مەبەست پێی شوێن کەوتنی ڕێباز و بەرنامەکەیەتی، واتە: چ شتێک ڕێگریی لێ کردی کە لەگەڵ بەرنامەکەی مندا بی و، بەوانەی کە شوێن کەوتووی بەرنامەکەی منن، ڕووبەڕو و بەرەنگاری ئەوانە ببیەوە، کە تووشی گۆلک پەرستیی بوون؟ یانی: ڕێیان لێ بگری و دژایەتییان بکەی؟.

٢)- ﴿أَفَعَصَيْتَ أَمْرِى﴾، ئەمە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، ئایا تۆ سەرپێچییت لە فەرمانی من کردوە؟ ئەمە نکووڵییلێکردنێکی دووەمەو جۆرێکە لە هەڕەشە لێکردنیش.

٣)- ﴿قَالَ يَبْنَؤُمَّ﴾، گوتی: ئەی کوڕی دایکم! ئەمە بێگومان بانگکردنی هاڕوونە بۆ مووساو دواندوویەتی بە زمانی عاتیفەو سۆز، ویستوویەتی ئەو هەستەی تێدا بجووڵێنێ کە ئێمە هەردووکمان کوڕی دایکێکین و، لە باوەشی دایکێکدا گەورە بووین، لەبەر ئەوەی دایک سەرچاوەی حەنان و عەتف و سۆزی زیاترە، ئەگەرنا باب و دایکیان هەر یەک بوون، لە سووڕەتی (**الأعراف**)دا دەفەرموێ:

﴿وَأَلْقَى ٱلْأَلْوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيْهِ ۚ قَالَ ٱبْنَ أُمَّ إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِى وَكَادُواْ يَقْتُلُونَنِى ﴿١٥٠﴾﴾، واتە: مووسا لەوحەکانی (کە تەوراتیان تێدا نووسرا بۆوە) فڕێیدان و سەری برایەکەی گرت بۆ لای خۆی ڕایکێشا، قژی هاڕوونی گرت، بە

پێی ئەم ئایەتەی سوورەتی (طـه)، ڕیشیشی هەر گرتوە، سەرو ڕیشی گرتوەو بۆ لای خۆی ڕایکێشاوە، کە لێی بدات و ئازاری بدات، سەرو ڕیشی تێک با هەڵداوە، ئنجا هاڕوون گوتی: ﴿ابْنَ أُمَّ﴾، لێرە ﴿يَبْنَؤُمَّ﴾، لەوێ: ﴿ابْنَ أُمَّ﴾، گرنگ ئەوەیە ئەی کوڕی دایکم! هەردووکیان دەگرێتەوە، لەوێ لە سوورەتی (الأعراف)دا (یاء)ی قرتاندوە، بەڵام لە سوورەتی (طـه)، ڕەنگە جارێک گوتبێتی: کوڕی دایکم، جارێک گوتووبێتی: ئەی کوڕی دایکم، خۆ ئەو کێشمە کێشم و مشت و مڕە، مەرج نیە هەر ئەوەندە بوو بێ، کە بەکورتی باسکراوە.

٤)- ﴿لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلَا بِرَأْسِيٓ﴾، ڕیشیشم مەگرەو قژیشم مەگرە، قژی سەریشم مەگرە، ڕایمەکێشەو، ئازارم مەدە.

٥)- ﴿إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِي﴾، من ترسام تۆ بڵێی: لە نێو بەنو ئیسرائیلدا دووبەرەکییت پەیداکردوە و، چاوەڕێی قسەی منت نەکردوە، یان قسەی منت نەپاراستوە کە ئاگات لە بەنی ئیسرائیل بێ و تێکیان بەرنەدەی، لە نێو خۆیاندا یەکدی نەکوژن، کەواتە: لێرەدا هاڕوون دوو پۆزش دێنێتەوە:

١- بۆیە من هیچم نەکرد، ترسام، دوایی بڵێی: بۆچی بەنی ئیسرائیلت تێکبەرداوە، پێکت وەرکردوون، خواپەرستەکانت لەگەڵ گۆلک پەرستەکاندا، بە گژیەک وە ناون، کوشتاریان لەگەڵ یەکدی کردوە و دووبەرەکییت لە نێویاندا پەیداکردوون؟!

٢- چاوەڕێی قسەکەی منت نەکردوە، تاکو خۆم دەگەڕێمەوە چی دەڵێم، لێرەدا: ﴿تَرْقُبْ﴾، واتە: (تنتظِر)، چونکە (رقب، يرقب)، یانی: (إنتظر، ينتظِرُ)، واتە: چاوەڕێی قسەی منت نەکرد تاکو دێمەوە، داخۆ من چی دەڵێم، یاخود لێرەدا (رقب، يرقب)، یانی: (حَفِظَ، يَحْفَظُ)، واتە: قسەکەی منت نەپاراستوە، یان بەرنامەو پەیامەکەی منت نەپاراستوە، کە بریتی بووە لەوەی بەنی ئیسرائیل یەک دەنگ و یەک ڕەنگ بمێننەوەو، دەستیان نەچێتە خوێنی یەکدی، واتە: قسەکەی من و بەرنامەکەی من و ئاڕاستەکانی منت نەپاراستوون و، پێکت وەرکردوون، لێرەدا ئەو دوو پۆزشە دێنێتەوە.

٣- بەڵام لە سوورەتی (**الأعراف**)دا، پۆزشێکی دیکەی سێیەمیشی هەیە، کە دەڵێ: ﴿إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِى وَكَادُوا۟ يَقْتُلُونَنِى﴾، واتە: خەڵکەکە منیان بەبێ هێز زانی و، خەریک بوو بشمکوژن، نیزیک بوو بشمکوژن، ﴿فَلَا تُشْمِتْ بِىَ ٱلْأَعْدَآءَ وَلَا تَجْعَلْنِى مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾الأعراف: ١٥٠، دوژمنانم پێخۆش مەکەو، لەگەڵ خەڵکی ستەمکارم کۆمەکەوە، وەک ئەوانم تەماشا مەکە.

کەواتە: دیارە هەرسێکیان بوون، بەڵام خوا لە سوورەتی (**الأعراف**)دا ئەوەیانی هێناوەو لە سوورەتی (**طه**) ئەوەیانی هێناوە، بەڵام هارون ﷺ هەر سێ قسەکانی کردوون.

## ئایا مووسا هەقی بووە، یان هارون؟

لێرەدا زانایان لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوە: ئایا مووسا هەقی بووە کە سەرزەنشتی هارونی برای بکات و سزای بدات؟ یان هارون هەقی بووە کە ئەو پۆزشانەی هێناونەوە؟ زانایان گوتوویانە: مووسا ئیجتیهادو بۆچوونەکەی وابووە کە دەبووایە هارون واز لەوان بێنێ و، خۆی بگەیەنێتە مووسای برای و خەڵکەکە بەجێبێڵێ، ئەوە ئەگەر (**إتّباع**)ەکە مەبەست (پێگەیشتن) بێ و مانا ڕواڵەتییەکەی مەبەست بێ.

بەڵام ئەگەر مەبەست پێی مانا مەجازییەکەی بێ، دەڵێن: مووسا بۆیە گلەیی لە هارون کردوە، دەبووایە هارون بەو خەڵکەی کە لەسەر خوا پەرستیی ماونەتەوە، بەگژ ئەوانەدا چووبایەوە کە خەریکی گوێلک پەرستیین.

بەڵام بۆچوونی هارون وابووە کە چاکسازییان لە نێواندا بکات و، لە نێو خەڵکەکەدا بمێنێتەوە، چاوەڕێی هاتنەوەی مووسا بکات، ئەو بۆچوون و کۆششەکەی وابووە.

ئنجا ئایا کامیان، لەو دوو کۆششانە ڕاستترن؟

هەنـدێ لـە زانایـان دەڵێـن: هـاڕوون نەپێـکاوە لـە بۆچـوون و ئیجتیهادەکـەی خۆیـدا، چونکـە پاراسـتنی بناغـەی بنچینـەکانی شـەریعەت باشـترە، لـە پاراسـتنی ئـەو بنەمایانـەی کـە لێـی جیادەبنـەوە، کەواتـە: دەبـوو هـاڕوون ئـەو بناغـەی دیندارییـە کـە بریتیـە لـە تەنیا خواپەرسـتیی (التوحیـد)، یـا بـە کوشـتنی خەڵکەکـەش کۆتایـی پێبهاتبایـە، یـان یـا بـە بەجێهێشتنیشـیان کۆتایـی هاتبایـە، پاراسـتبایە.

هەندێکیـش دەڵێـن: نەخێـر بۆچوونەکـەی هـاڕوون لـە شـوێنی خۆیـدا بـووە، چونکـە پاراسـتنی یەکڕیزیـی خەڵکەکـە و خوێنڕێژیـی لـە نێوانـدا پەیـدا نەبوونیـان، گرنگـتر بـووە لـەو کاتـەدا، چونکـە دوایـی دەگونجـا ئـەوە چارەسـەر بکـەن، کـە هـەر واش بـوو، مووسـا ﷺ هاتـەوە و چارەسـەری کـرد، بـەڵام ئەگـەر دەسـتیان چووبایـە خوێنـی یەکـدی، ئـەو کاتـە ئـەو خوێنـڕژان  و کوشـتارە چارەسـەر نەدەکـرا.

منیشـم پێـم وایـە: هاڕوونیـش پێکاویـەتی و، مووسـاش هەقـی بـووە ئەو لێپرسـینەوە و سەرزەنشـتە بـکات، بـەڵام دوایـی کـە هـاڕوون بـۆ مووسـای ڕوونکردۆتـەوە، مووسـا ئـاگای لـەو وردەکارییانـە نەبـووە، کـە ئـەوە هاڕوونیـان بەبـێ هێـز زانیـوەو، هـاڕوون بۆیـە چاوەڕێـی مووسـای کـردوە، کـە ئـەو خەڵکـە تووشی کوشـتار نەبـێ لـە نێوخۆیدا، پاشـان هـاڕوون بۆیـە بەجێـی نەهێشـتوون بـۆ ئـەوەی هـەر لـە نێویانـدابـێ، دوای ئـەوەی کـە ئـەو پۆزشـانەی بـۆ هێناوەنـەوە، ئـەو پۆزشـانە ئیقناعکـەر بـوون بـۆ مووسـا ﷺ.

کەواتـە: هـەم هاڕوونیـش پێکاویـەتی لە بۆچوونەکـەی خۆیدا، لـە ئیجتیهادەکەیداو، مووسـاش دوایـی کـە گلەیـی لـە هـاڕوون کـردوە، کـە بۆچـی نەچـووە بـۆ لای، یـان بۆچـی بەوانـەی کـە بڕوایـان بـە خـوا لـە دڵـدا مـاوە، ڕووبـەڕو و بەرەنـگار نەبۆتـەوە، لەگـەڵ ئەوانـەی کـە لایـان داوە؟ وا پێدەچـێ مووسـاش ئـەو گلەییـەی خـۆی کێشـا بێتـەوە، بـە بەڵگـەی ئـەو ئایەتـەی سـوورەتی (**الأعـراف**)، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ قَالَ رَبِّ

﴿اغْفِرْ لِي وَلِأَخِي وَأَدْخِلْنَا فِي رَحْمَتِكَ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴿١٥١﴾﴾، واتە: مووسا فەرمووی: پەروەردگارم! لە من و لە برایەکەم خۆش بەو بە بەزەیی خۆت بمانخە نێو بەندە چاکەکانت و تۆش بەبەزەییترینی بەبەزەییانی.

کەواتە: مووسا داوای لێبوردنی بۆ خۆشی و بۆ برایەکەشی کردوە، بۆ خۆی کە توند بووە لەگەڵ برایەکەی داو، ئیجتیهادێکی هەڵەشی کردوە، کە پێش خەڵکەکەی کەوتوە بۆ دیدارو جێژوانی پەروەردگار، بۆ برایەکەشی، ئەگەر کەمتەرخەمییەکی کردبێ، داوای لێبوردنی بۆ لە خوای پەروەردگار کردوە، کەواتە: واپێدەچێ پۆزش و عوزر هێنانەوەکانی هارِوون بۆ مووسا، ئیقناعکەربوو بن.

## مەسەلەی حەوتەم و کۆتایی:

**لێپرسینەوەی مووسا لەگەڵ سامیرییداو، بیانوو هێنانەوەی سامیریی بەوە کە شتێکی زانیوە خەڵکەکە نەیزانیوەو، یان شتێکی دیوە خەڵکەکە نەیدیوەو ئەوەی لە بەرنامەو شوێنەواری مووسا وەریگرتووە، فڕێیداوە و نەفسی وای پێ خۆش بووە، سزادانی مووساش بۆی بە دوورخستنەوەی و قەدەغەکردنی دواندنی و، پاشان سووتاندنی گۆلکە پەرستراوەکەی و بڵاوکردنەوەی پاشماوەو خۆڵەمێشەکەی بەدەریاداو، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە پەرستراوێ شایستەی پەرستن بێ، بەس خوای تاک و تەنیا و زانایە ﷻ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ ﴿٩٥﴾ قَالَ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا۟ بِهِۦ فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ فَنَبَذْتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِى نَفْسِى ﴿٩٦﴾ قَالَ فَٱذْهَبْ فَإِنَّ لَكَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا لَّن تُخْلَفَهُۥ وَٱنظُرْ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِى ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى ٱلْيَمِّ نَسْفًا ﴿٩٧﴾ إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَسِعَ كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ﴿٩٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

### ڕوونکردنەوەو دەستپێك:

مووسا لە قۆناغی یەکەم دا گلەیی لە خەڵکەکەی کردووەو، سەرزەنشتی ئەوانی کردووە و، لێپرسینەوەی لەگەڵ ئەواندا کردووە.

لە قۆناغی دووەمدا دەگوازێتەوە بۆ لێپرسینەوە کردن لەگەڵ هاڕوونی برای، کە جێنشینی بووە، کە پێی دەڵێ: جێنشینی من بەو چاکسازیی بکەو بە دوای خراپەکاران و ئاژاوەگێڕان مەکەوە، دیارە مووسا دڵی خەبەری داوە.

ئنجا لە قۆناغی سێیەمدا لێپرسینەوە لەگەڵ بابای ئاژاوەگێڕو فیتنەچیی و فێڵباز و ساختەچییدا دەكات كە سامیرییە، ئایا ئەمە چی لێوەردەگیرێ؟

ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ كە بەرپرسیاری یەكەم خەڵك و كۆمەڵگا، خۆیەتی، ئنجا دوایی بەرپرسەكانیان، ئەوانەی كە خەڵك كردوویانن بە بەرپرسی خۆیان و كاربەدەستی خۆیان، ئنجا دەبێ گلەیی بكرێ لەوانەی كە ناحەزی ئەو كۆمەڵگایەن و، دەیانەوێ ئەو كۆمەڵگایە بەلاڕێدا بەرن و، هەڵیبخەڵەتێنن و كڵاوی لەسەربنێنن و، تووشی لادان و تاوانی بكەن، كەواتە: بەرپرسیاری یەكەم بەرانبەر هەر خراپەو تاوانێك و، بەرانبەر هەر لادان و سەرپێچییەك، كۆمەڵگا خۆیەتی، نەك كۆمەڵگا دەستی چەوری خۆی بە خەڵك بسڕێ، وەك بەنی ئیسرائیل كردیان، گوتیان: ﴿ قَالُواْ مَآ أَخۡلَفۡنَا مَوۡعِدَكَ بِمَلۡكِنَا ﴾، ئێمە بە دەست خۆمان نەبوو كە لە ژوانگەی تۆ دواكەوتین، یان ئەو بەڵێنەی كە بە تۆمان دابوو، بەدەست خۆمان نەبوو كە بەڵێنەكەمان جێبەجێ نەكرد، ئەدی بە دەست كێ بوو؟

﴿ وَلَٰكِنَّا حُمِّلۡنَآ أَوۡزَارٗا مِّن زِينَةِ ٱلۡقَوۡمِ فَقَذَفۡنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلۡقَى ٱلسَّامِرِيُّ ﴾، ئێمە چەند كۆڵێكمان لێ بار كرابوون لە خشڵ و زێڕو زیوی خەڵكەكە، واتە: خەڵكی میسر، لێرەدا بەنوو ئیسرائیل خۆیان وەك خەڵكێكی دەستە پاچەی بێ ویست و كڵۆڵ، وێنا دەكەن، كە ئێمە هیچمان بەدەست نەبوو، ئێمە بە دەست خۆمان نەبوو كە هەڵخەڵەتێنراین، ئەدی بە دەست كێ بوو؟ نا، بەرپرسیاری یەكەم خۆتانن، بۆیە مووسا ﷺ پێشێ یەخەی ئەوان دەگرێ، لێپرسینەوە لەگەڵ ئەواندا دەكات، سەرزەنشتی ئەوان دەكات، كە دەبێ تۆ بۆ خۆت وریا بی، وەك پێشینان دەڵێن: (ماڵی خۆت توند بگرەو سەگی دراوسێ بەدز مەگرە)، نابێ خەڵك و كۆمەڵگا، دەستی چەوری خۆی بە خەڵكی دیكە بسڕێ، خەتای زێڕو زیوەكە بوو، لێمان باركرا بوو، كۆڵێكی قورس بوو بە كۆڵمانەوە، فڕێمان دا!!، ئنجا فێڵبازێكیشمان لێ هەڵكەوت و هەڵیخەڵەتاندین و كڵاوی لەسەر نا‌ین!! میللەتانی دواكەوتوو، كۆمەڵگە

دواکەوتووەکان، ئەوانەن کە دەستی چەوری خۆیان بە خەڵک دەسڕن، بەڵام کۆمەڵگای تەندروست ئەوەیە، کە ئەگەر هەڵەی کرد، دان بە هەڵەی خۆیدا دێنێ و خەتای خۆی دەگرێ، نەک هەڵەکانی خۆی بە خەڵکی دیکە هەڵبواسێ و دەستی چەوری خۆی بە خەڵکی دیکە بسرێ، خۆشی وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچێ! ئەوانە کۆمەڵگا دواکەوتووەکانن کە بە دڵنیاییەوە بەنی ئیسرائیل لەو کاتەدا کۆمەڵگایەکی دواکەوتوو بوو، ئەگەرنا سامیرییەکی ساختەچیی و فێڵباز، دوای ئەوەی خوای پەروەردگار ئەو هەموو نیعمەتەی بەسەردا ڕشتوون، لە چەنگ فیرعەون دەربازی کردوون، دەریای بۆ شەق کردوون کە وەک لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا باسمان کرد، دەڵێ: دەریا بوو بە دوازدە ڕێگا، دوازدە کۆڵان و جادە بە دەریادا، چونکە بەنی ئیسرائیل دوازدە تیرە بوون، بە دوازدە ڕێیاندا بە دەریای سووردا پەڕینەوەو، دواتر لە دەشتی سینادا، خوا دوازدە سەرچاوەی لە گابەردێکی گەورە بۆ دەرهێنان، دوایی گەزۆیی بەسەردا باراندن، باڵندەی شێلاقەی بۆ ناردن، بەڵکو هەوری بەسەرەوە کردنە سێبەر لە دەشتی سیناداو، بە شەو کۆڵەگەیەکی ڕووناکیی لە پێشیانەوە دەڕۆیی، بۆ ئەوەی بزانن بەرەو کوێ دەچن؟ ... هتد، خوا ئەو هەموو نیعمەتانەی پێدان، کەچی دوایی بابایەکی ساختەچیی و فێڵباز، بتوانێ وا بە ئاسانیی هەڵتخەڵەتێنێ و تووشی گۆلک پەرستیت بکات، ئەوە بێگومان دواکەوتوویەتییە.

دوایی مووسا ﷺ وایزانیوە کە هاڕوونی برای کەمتەرخەمیی بووە، بەڵام دوای ئەوەی هاڕوون پۆزشەکانی بۆ هێنانەوە، زانی کەمتەرخەمیی نەبووە، چونکە هاڕوون هەر لە سەرەتاوە پێیگوتوون: ئەوە بەڵا و تاقیکردنەوەیە بۆتان، پەروەردگارتان تەنیا خوای خاوەن بەزەییە، ئەو زاتەی ئەو هەموو بەزەییەی لەگەڵ ئێوەدا نواندوە، ئەو هەموو چاکەو نیعمەتانەی لەگەڵ ئێوەدا کردوون، دوایی مووسا ﷺ کە بۆی دەرکەوتوە، هاڕوون کەم و کوڕییەکی نیە، ئنجا چۆتە سەر سەرو گوێلاکی سامیریی ساختەچیی و فێڵباز:

١)- ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ ﴾، گوتی: ئەی سامیریی! چ کارێکت کردوە، چ کەتنێکت کردوە، وشەی (**الخَطْب**)، (**الشأن الجلل، والأمر العظيم الذي يكثر فيه التخاطب**)، کارێکی گرنگ و مەزن کە قسەکردنی زۆر تێدا بێ، مشت و مڕی تێدا دەبێ، لە هەموو قورئاندا وشەی (**خطب**)، بۆ ئەوە بەکاردێ:

أ- مووسا بە دوو کچەکەی پیاوە ساڵحەکە دەڵێ: ﴿مَا خَطْبُكُمَاۖ قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُۖ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٞ ﴿٢٣﴾﴾**القصص**، بۆچی ڕاوەستاون؟ چ گرفتێکتان هەیە؟ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە ناتوانین ئاژەڵەکانمان ئاو بدەین تاکو شوانەکان هەموویان ئاژەڵەکانیان ئاو نەدەن، (چونکە ئەوان هەموویان پیاون)، بابیشمان پیاوێکی بە تەمەنە ( و کوڕیشمان نین، براشمان نین).

ب- هەروەها لە ئایەتی (٥١)ی سوورەتی (یوسف)دا، دەفەرموێ: ﴿مَا خَطْبُكُنَّ إِذْ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفْسِهِۦ﴾، کە پادشا بە ئافرەتەکان دەڵێ: چ کەتنێک بوو، چ کارێکی مەزن بوو، کە ئێوە گەلە کۆمەکییتان لە دژی یوسوف کرد تاکو تووشی تاوانی بکەن؟

ج- هەروەها: ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٧﴾﴾**الحجر**، ئەی نێردراوان کاری گرنگی ئێوە چیە؟ بۆچی ڕەوانە کراون؟

٢)- ﴿ قَالَ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُواْ بِهِۦ ﴾، دوای ئەوەی مووسا ﷺ ئەو پرسیارە لە سامیریی دەکات، کارت چی بوو؟ چ کەتنێکت کردوە؟ ئەویش دەڵێ: شتێکم بینی کە ئەوان نەیانبینی، یان شتێکم زانی کە ئەوان نەیانزانی، پەییم بەشتێک برد کە ئەوان پەییان پێ نەبرد بوو، ئەوان خەڵکەکە بەنوو ئیسرائیل، خوێندراویشەتەوە: (**بَصُرتُ بِما لَم تَبْصُروا بِه**)، واتە: من شتێکم بینی کە ئێوە نەتانبینی، شتێکم زانی کە ئێوە نەتانزانی، دوایی باسی دەکەین کە مەبەست لەو قسەیەی سامیریی چییە، کە شتێکی دیوە خەڵکەکە نەیبینیوە، یان شتێکی زانیوەو پەی بەشتێک بردوە، کە خەڵکەکە نەیزانیوە و پەی پێ نەبردوە.

٣)- ﴿فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ﴾، منیش چنگێکم داگرت لە شوێنی ڕەوانەکراو، ئایا ئەو ڕەوانەکراوە مەبەست پێی مووسایە ﷺ؟ یان مەبەست پێی

جیبریله؟ هەروەها ئەو (أثر)ە، مەبەست پێی شوێنەواری مەعنەوییە؟ ئەو شوێنەوارەی کە مووسا بەجێی هێشتبوو کە بەرنامەکەیەتی، یان مەبەست پێی شوێنەواری ماددییە؟ چەنگە خۆڵەکە لە بنی پێی جیبریل، یان لەبنی پێی ئەسپەکەی جیبریل، وەک لە هەندێک ڕیوایەتاندا هاتوە، چییە؟ دوایی ئێمە ڕای خۆمان لەو بارەوە دەڵێین.

وشەی ﴿ قَبۡضَةٗ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (قَبصة)، بەڵام حەوت قورئان خوێنە سەرەکییەکان هەر وشەی ﴿ قَبۡضَةٗ ﴾یان هێناوە، دەڵێ: (**وَالْقَبْضَةُ: الْوَاحِدَةُ: مِنَ الْقَبْضِ، وَهُوَ غَلْقُ الرَّاحَةِ عَلَى شَيْءٍ، فَالْقَبْضَةُ مَصْدَرٌ بِمَعْنَى الْمَفْعُولِ، وَضِدُّ الْقَبْضِ: الْبَسْطُ**)[1]، ﴿ قَبۡضَةٗ ﴾، یەکێکە لە (**قبض**)، (**قبضة**)، ئەویش ئەوەیە کە تۆ لەپە دەستت لەسەر شتێک داخەی، واتە: چەنگ، کوردیی دەڵێن: چەنگێکم لێدا، (**قبضة**)، چەنگێک، (قبضة) لێرەدا دەبێتە چاوگ، یانی: (**مقبوض**)، واتە: شتێک کە داگیراوە، پێچەوانەی (**قبض**) بریتیە لە (**بَسْط**)، یانی: کردنەوە، (**قبض**)، واتە: داخستن.

وشەی (**الأثر**)، واتە: شوێنەوار، بریتیە لەو شوێنەوارەی کە کەسێک بە شوێنێکدا دەڕوات بەجێی دەهێڵێ، کە بریتیە لە جێ پێ، ئنجا ئەگەر لەسەر لم دەڕوات، لەسەر گڵ دەڕوات، لەسەر قوڕ دەڕوات، چ مرۆڤ بێ، چ ئاژەڵ بێ، ئەو شوێنەی کە بەجێ دیڵێ، پێی دەڵێن: (**أثر**)، بەڵام دوایی ئەوە خوازراوەتەوە بۆ شوێنەواری مەعنەوییش.

کەواتە: دەگونجێ ﴿ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ ﴾، ئەو شوێنەوارە مەعنەوییەی، ئەو نێردراوە، ئەو ڕەوانە کراوە، دەگونجێ مەبەست پێی مووسا عليه السلام بێ، یان دەگونجێ مەبەست پێی جیبریل بێ، کە هەردووکیان ڕەوانەکراون، چەنگێکم لێ داگرت.

٤)- ﴿ فَنَبَذۡتُهَا ﴾، ئنجا ئەو چەنگەم فڕێدا، بە واتای ئەو چەنگە خۆڵەم فڕێدایە سەر گۆلکەکەو، گۆلکەکە ژیانی هاتەبەر، یان ئەو شوێنەوارەی کە ڕەوانە کراو، کە مووسایە

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٦، ص٢٩٥.

ﷺ بۆی بەجێ هێشتبووین، لە نێوماندا بەجێی هێشتبوو، کە بریتی بوو لەو بەرنامە و پەیامەی لە خوا وەریگرتبوو، من بەشێکم لێ وەرگرتبوو، دوایی ئەو بەشەم فڕێدا و وازم لێهێنا، واتە: ئەوەندە زانیارییە، ئەوەندە شارەزاییەی کە هەم بوو بە بەرنامەی مووسا، فڕێمدا و پشتگوێم خست و کارم پێ نەکرد، کە مەبەست پێی تەنیا خوا پەرستیی (توحید)ە، ئەوی فڕێداوەو شیرک و بتپەرستیی لە شوێندا داناوە.

٥)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِي نَفْسِي ﴾، هەر بەو شێوەیە نەفسم بۆی جوانکردم، ئەمە پێی دەگوترێ: (مِنْ تَشْبيه الشَّيءِ بنَفْسهِ)، ﴿ وَكَذَٰلِكَ ﴾، هەروەها بەم شێوەیە، ئاوا بەم شێوەیە، ئەمە وێچواندنی شتێکە بە خودی خۆی، واتە: بەو شێوە جوانکردنە، کە نەفسم جوانی کرد، بۆی جوان کردم، وەک زێدەڕۆییکردن لەوەدا کە ئەو شتە وێنەی نیە، ئەو شتە دەبێ هەر بە خودی خۆی بچوێنرێتەوە، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ﴾البقرة: ١٤٣، بەو شێوەیە کە گێڕاومانن بە کۆمەڵێکی نێوەندگیر، کۆمەڵێکی میانگیر، نە کورت بێنن، نە تێپەڕێنن، نە زێدەڕۆیی بکەن، نە کەمتەرخەمیی بکەن.

ئنجا ئەمە کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِي نَفْسِي ﴾، بەو جۆرە نەفسم بۆی جوان کردم، دەگونجێ دانپێدانانی سامیریی بێ بە گوناهەکەی خۆی دا، دەشگونجێ بڵێ: وام پێ خۆش بوو، وام کەیف پێهات، چونکە هەموو تەفسیرەکان کە سەرنجم داون دەڵێن: ئەوە دانپێداهێنانی سامیرییە بە گوناهەکەی خۆی دا.

بەڵام پێم وایە وێڕای دانپێداهێنان بە گوناهی دا، ئەوەش دەگرێتەوە کە بڵێ: من نەفسم وای پێ خۆش بوو، وام پێ چاک بوو، وام کەیف پێ هات، واتە: مەرج نیە لێرەدا خۆ بە تاوانباردانانی سامیریی بگەیەنێ، یان تەنیا ئەوە بگەیەنێ، بەڵکو ئەوەش دەگەیەنێ کە: نەفسم وای پێ خۆش بوو، پێم چاک بوو وابکەم، وشەی (**سوَّلت**) واتە: نەفسم وای بۆ جوان کردم، وای بۆ ئاسان

کردم (تسویل)، یانی: (تسهیل) ئاسانکردن، بەڵام لێرەدا یانی: جوانکردنی شتێک کە لە خودی خۆیدا جوان نەبێ.

ئنجا کاتێ کە سامیریی بۆ مووسا بەو شێوەیە بەیانی حاڵی خۆی دەکات و، بە حیساب پۆزشی بۆ دێنێتەوە، یان هەڵوێستی خۆی بۆ ڕوون دەکاتەوە.

٦)- ﴿ قَالَ فَٱذۡهَبۡ ﴾، مووسا فەرمووی: بڕۆ، بۆ کوێ بڕوا؟ واتە: بڕۆ دوور بکەوەوە.

٧)- ﴿ فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ ﴾، تۆ لەژیاندا ئەوەت بۆ هەیە، ئەوە لەسەر تۆ دەبێتە مولک، ئەوە لەسەر تۆ تاپۆ دەکرێ، کە بڵێی: ﴿ لَا مِسَاسَ ﴾، واتە: کەس دەستم لێ نەدا و دەست لە کەس نادەم.

**(مِساس: مصدر ماسَّهُ، بمعنى مَسَّهُ، و (لا) نافيةٌ للجنس)**، **(مساس)**، چاوگی **(ماسَّهُ)**، بەمانای: **(مَسَّه)**، دەستی لێدا، (لا) یش بۆ نەفسی جینسە، کەواتە: **(مساس)**یش ناوەکەیەتی وەک **(لا إله إلاَّ الله)**، هیچ پەرستراوێک نیە، ﴿ لَا مِسَاسَ ﴾ یانی: دەست لێدان نیە، ئەو کاتە (لا)ی لابردنی جینس کە دەچێتە سەر ناوێک، هەمیشە (منصوب)ی دەکات، ﴿ لَا مِسَاسَ ﴾، دەست لێدان نیە، دەست وێ کەوتن نیە، واتە: نە کەس دەستم لێ بدات و، نە دەست لە کەس دەدەم، **(لا أَمُسُّ ولا أُمَسُّ)**، دەست لە کەس نادەم و کەسیش دەستم لێ نەدا، یان لە کەس نیزیک نابمەوەو، کەسیش لێک نیزیک نەبێتەوە، توخنی کەس ناکەوم و کەس توخنم نەکەوێ، ئەمە سزایەک بووە لە لایەن مووساوە، بەسەر سامیرییدا سەپێنراوە، کە پێی دەگوترێ: سزای دابڕین لە کۆمەڵگا، پەرگیرکردن، یان گۆشەگیرکردن، یان داڕنین لە کۆمەڵگا و خەڵک.

٨)- ﴿ وَإِنَّ لَكَ مَوۡعِدٗا لَّن تُخۡلَفَهُۥ ﴾، تۆ جێژوانێکت بۆ هەیە، بەڵێنگەیەکت بۆ هەیە کە لێی دواناخرێی، خوێندراویشەتەوە: **(لن تُخْلِفَه)**، واتە: تۆ لێی دواناکەوی، بەڵام ئەگەر ﴿ لَّن تُخۡلَفَهُۥ ﴾ بێ، واتە: تۆ لێی دواناخرێی، ئنجا ئایا ئەو بەڵێنگەیە و ئەو ژوانگەیە کوێیە؟ بەدڵنیاییەوە مەبەست پێی ڕۆژی دواییە.

## قسە دابڕین لە ئەهلی بیدعەت و هەڵوەستەیەك:

لێرەدا (القرطبي) دەڵێ: (هَـذِهِ الْآيَـةُ أَصْلٌ فِي نَفْـيِ أَهْـلِ الْبِـدَعِ وَالْمَعَـاصِي وَهُجْرَانِهِمْ وَأَلَّا يُخَالَطُـوا، وَقَـدْ فَعَـلَ النَّبِـيُّ ﷺ ذَلِـكَ بِكَعْـبِ بْـنِ مَالِـكٍ وَالثَّلَاثَـةِ الَّذِيـنَ خُلِّفُـوا)[١]، واتـە: ئـەم ئایەتـە بنچینـەی ئـەو جـۆرە سـزادانەیە، کـە خەڵکـی خـاوەن بیدعـەت و گونـاح دووربخرێنـەوەو، دابڕێنرێـن و تێکەڵییـان لەگەڵـدا نەکـرێ، وەک پێغەمبـەر ﷺ لەگـەڵ کەعبـی کـوڕی مالـک و دوو هاوەڵەکـەی کـە دواخـرا بـوون، [سـزادانەکەیان دواخـرا بـوو]، بـەو شـێوەیە ڕەفتـاری کـرد.

کـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (التوبـة)دا بـە تەفصیـڵ بەسـەرهاتەکەیانمان هێنـا، کـە لـە صەحیحـی (بوخاریـی و موسـلیم)دا هاتـوە.

بـەڵام بێگومـان ئـەوە لەلایـەن دەسـەڵاتی شـەرعییەوەو، لـە لایـەن کەسـانێکی بـە ئینصـاف و شـارەزاوە، دیاریـی دەکـرێ، نـەک هـەر کـەس ڕاسـت بـۆوە بـەوی دیکـە بڵـێ: ئەهـلی بیدعـەت و بڵـێ: سـەلامی لێناکـەم و قسـەی لەگـەڵ ناکـەم! وەک ئێسـتا هەنـدێ وشـکە سـەلەفیی فەقیرۆکـە کـە ڕەنگـە ئـەوان ڕەنگـە شایسـتەی ئـەوە بـن، خەڵـک سـەلامیان لـێ نـەکات، کەچـی دێـن هـەر لـە خـۆڕا لیسـتێک دادەنێـن و دەڵێـن: ئەوانـە نابـێ سـەلامیان لـێ بکـرێ، ئەوانـە نابـێ هامـو و شـۆ بکرێـن، ئاخـر کـێ ئـەو مافـەی بـە تـۆدا؟ وەک مـن جارێـک لیسـتێکیانیان پێشـاندام گوتیـان: مامۆسـتا! ئـەوە هـی ئەوانەیـە کـە خۆیـان بـە سـەلەفیی نـاو دەبـەن، کـە ئەوانیـش جۆریـان زۆرن و دەبـێ پۆلێـن بکرێن، خەڵکـی عاقـڵ و بـە ئینصافیـان تێدایـە، بـەڵام خەڵکـی نەفـام و نـەزان و کارتێکـراو بـە حیـزب و ڕژێمـە عەلمانییەکانیشـیان تێـدا هەیـە، لیسـتێکیان پـێ پێشـاندام گوتیـان: ئـەوە هـی هەنـدێ لـە سـەلەفیی ناوەکانـە، سـەیرم کـرد: هەرچـی بانگـەوازکارو وتارخوێنـی بـاش کـە لـە نێـو خەڵکیـدا جێـی سـوودو کەڵکـن، هەموویـان لـە نێـو ئـەو لیسـتەدا ڕیـز کـردوون، گوایـە: ئەوانـە هەموویـان ئەهـلی بیدعەتـن و نابـێ سـەلامیان لـێ بکـرێ!

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١١، ص٢٠٣.

منیش گوتم: ئەو مونکەرە کێیە، ئەو هەموو مەعرووفانەی ڕاست و چەپ بەسەرداهێناون، ئەو دیار نیە کێیە و مونکەرە، بەڵام ئەوانە هەموویان خەڵکی ناسراوو زانراون، بەڵێ پارێزراونین لە هەڵە، بەڵام ئەوانەمان هەن، کە لە نێو ئەو خەڵک و میللەتەدا چوار قسەی هەق بکەن، خەڵک ئامۆژگاریی بکەن، بەرچاوی خەڵک ڕۆشن بکەنەوە، ڕاستییەکانی عەقیدە و شەرع لە خەڵکی حاڵیی بکەن، ئنجا تۆ بێنی ڕاست و چەپ بەسەر هەموویان دابێنی:

١- لەبەر ئەوەی بەپێی مەشرەب و میزاجی تۆ نین.

٢- یان نەفەرێکی سەرلێشێواو لە ئێوە، لەبەر ئەوەی کەیفی بەوانە نایەت.

٣- یان لەبەر ئەوەی تۆ چوار پێنج مەسەلەت کردوون بە پێوەرو تەرازوو، بەپێی ئەو چوار پێنج مەسەلانە، ئەوانە بە لادەر لە قەڵەم دەدرێن، بابایەکی نەکیرە بۆی نیە ڕاست و چەپ بەسەر کەسانێکی مەعرووف و ناسراودا بێنێ، کە لە مەیدانی کاری ئیسلامیی و، بانگەوازی ئیسلامیی و، قسەی خێرکردن بۆ مسوڵمانان دا ناسراون، بابایەکی نەناسراوو نەزانراو وەک (أبو بكر) بەغدادییەکە، کە خۆی کرد بە خەلیفەی مسوڵمانان، بێ ئەوەی چوار زانای موعتەبەر بیناسن و شایەدیی بۆ بدەن کە تۆ شایستەی، یان هەر ئەصڵەن تۆ ناسراوی، ناسراوی بەوەی کە لە دین تێگەیشتووی!! ئەوە بە ڕاستیی ئەوانە هەموویان بەڵان بەسەر ئوممەتدا دێن، ئەوەش هەمووی لە ئەنجامی دواکەوتوویەتیی مسوڵماناندا، ئەو حاڵەت و دیاردانە پەیدادەبن، بە هەر حاڵ کاتێک کە قەوارەیەکی ئیسلامیی هەبێ و، زانایانی موعتەبەرو باوەڕپێکراو و زانایانی شارەزاو بە ئینصاف، بۆیان هەیە بڕیار بدەن کە فلانکەس لەبەر ئەوەی بیرێکی چەوتی هەیەو ڕەفتارێکی چەوتی هەیە، یان بیرێکی نامۆی هەیەو بە داهێنەر بە (مبتدع) لە قەڵەم دەدرێ، یان بە شوێنکەوتووی ئارەزووی خۆی لە قەڵەم دەدرێ: بە گوناهبارو لادەر دادەنرێ و، خەڵکینە! تێکەڵیی لەگەڵ مەکەن، ئەوە دەستەڵاتی شەرعیی و، زانایانی موعتەبەرو باوەڕپێکراو، ئەو دەستەڵات و مافەیان هەیە، نەک هەر نەکیرەیەک ڕاست بێتەوە، زەڕب بەسەر ئەو مەعرووفانەدا بێنێ، کە کەیفی پێ نایەن.

٩)- ﴿ وَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِى ظَلۡتَ عَلَيۡهِ عَاكِفًا ﴾، سەرنج بدە ئەو پەرستراوەت، کە تۆ بەردەوام بووی لەسەر پەرستنی و پەیوەست بووی بە پەرستنییەوە، ﴿ ظَلۡتَ ﴾، لە ئەصڵدا (**ظَلَلْتَ: أي استمرت**) بەردەوام بووی، (**والعكوف: ملازمة العبادة**)، (**عكوف**) یش، پەیوەست بوونە بە پەرستنی شتێکەوە.

١٠)- ﴿ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ﴾، بە دڵنیایی، یان سوێند بە خوا دەیسووتێنین، هەروەها خوێنراویشەتەوە: (**لَنُحرِقَنَّهُ**)، ئنجا: ﴿ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ﴾، واتە: زۆری دەسووتێنین، بەڵام (**لَنُحْرِقَنَّهُ**)، واتە: دەیسووتێنین، (**تَحرِيق**)، لەگەڵ (**حرق**)دا، جیاوازییەکەیان ئەوەیە: (**حَرَّقَ، يُحَرِّقُ، تَحْرِيْقاً**)، واتە: زۆری سووتاندو سووتانەکەی جەخت لەسەرکردەوە، بەڵام (**حَرَق**)، بریتیە لە سووتاندنی ئاسایی.

١١)- ﴿ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى ٱلۡيَمِّ نَسۡفًا ﴾، دوایی بە دڵنیاییەوە پرژ و بڵاوی دەکەینەوە بە دەریادا، (**يم**)، واتە: دەریا کە بە دڵنیاییەوە مەبەست لەو دەریایە، دەریای سوور بووە، کە کاتی خۆی پێی گوتراوە: (**بحر القلزم**)، دەریای سوور، (**النَّسْفُ: تفريق وإذراء لأجزاء شيءٍ صَلْبٍ**)، (**نسف**)، بریتیە لە بڵاوکردنەوە و پرژ و بڵاوکردنی پارچەکانی شتێکی ڕەق، یانی: زێڕ کە بسووتێنرێ، وردو خاش بکرێ، ئەویش دوای سووتاندنی، وردو خاشی کردوەو پارچەکانی فڕێداوەتە نێو ئەو دەریای سوورەوە، وشەی (**ثُمَّ: للترتيب الرتبي**)، بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەییە، دوای ئەوەی دەیسووتێنین، ئنجا وردو خاشی دەکەین و پرژ و بڵاوی دەکەینەوە بە دەریادا.

١٢)- ﴿ إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ﴾، بە دڵنیاییەوە، بێگومان پەرستراوی ئێوە تەنیا خوایە ﷻ، ئەو خوایە کێیە؟

١٣)- ﴿ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، شایستەی پەرستران بێ.

١٤)- ﴿ وَسِعَ كُلَّ شَىۡءٍ عِلۡمًا ﴾، زانیاریی وی هەموو شتێکی گرتۆتەوە، ئەو گۆلکە لە زانیاریی خوادا نەبووە، کە پەرستراو بێ و، ئەی سامیریی! خوای پەروەردگار بە پەنهان و ڕواڵەتی تۆ ئاگادارو زانایە.

## سێ جۆرە لێكدانەوە بۆ
## بیانووی سامیریی لە دروستكردنی (گۆلك)ەكەدا

١- ڕای یەكەم: كە لە هەموویان باوترە: ﴿بَصُرْتُ﴾، واتە: بینیم، ﴿فَقَبَضْتُ قَبْضَـةً﴾، واتە: چەنگە خۆڵێكم داگرت، ﴿مِّنْ أَثَـرِ ٱلرَّسُولِ﴾، لە ژێر پێی جیبریل، یان لە ژێر پێی ئەسپەكەی جیبریل، ﴿فَنَبَذْتُهَا﴾، فڕێمدایە سەر پەیكەری گۆلكەكە، یەكسەر ژیانی هاتەبەر.

ئنجا ئایا ئەوە زانایان لە كوێیان هێناوە؟ نازانم، هەر لە خۆوە دەڵێن: ئەسپی جیبریل پێ لە هەر شوێنێك دابنێ، تۆ دوایی دەست بدەیە ئەو خۆڵەی ژێر سمی ئەسپەكەی جیبریل، بەسەر هەر شتێكی دابكەی، ژیانی دێتەبەرو دەبێتە خاوەن ژیان.

كە لە ڕاستیدا ئەوە هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نیەو، هیچ بەڵگەیەك نیە، كە ئەصڵەن جیبریل ئەسپی پێ بێ، یان جیبریل پێ دابنێتە شوێنێك و شوێنەكەی دیار بێ! چونكە هەندێك دەڵێن: شوێن پێی جیبریل، كە ئەوە تەفسیرەكان هەموویان هێناویانە، بەڵام هیچ بەڵگەیەكی پشت پێ بەستراو نیە بۆ ئەو قسەیە، ئەوە ڕای یەكەم كە هەموو تەفسیرەكان هێناویانە، یان زۆربەی هەرە زۆریان، بەڵام (**أبو مسلم الأصفهاني**)، ئەو ڕایەی ڕەتكردۆتەوەو، هەندێك لە زانایانیش شوێن (أبو مسلم) كەوتوون، یەكێك لەوانە (**فخرالدين الرازي**)یەو، هەندێكی دیكەش، بێگومان بەندەش ئەو ڕایە ڕەتدەكەمەوە.

٢- ڕای دووەم: دەڵێ: ﴿بَصُرْتُ﴾، واتە: (**عَلِمتُ، وفَطِنْتُ**)، واتە: زانیم و دەركم كرد، ﴿فَقَبَضْتُ قَبْضَـةً﴾، واتە: ئەندازەیەكم وەرگرت، لێرەدا ﴿قَبْضَـةً﴾، مەبەست پێی

چەنگی ماددیی نیە، واتە: کە تۆ دەڵێی: فڵانکەس عەقڵەکەی چەنگێکە، واتە: کەمە، یانی: ئەندازەیەکی کەمم وەرگرت، لەچی؟، ﴿مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ﴾، لە شوێنەواری ڕەوانەکراو، کە مەبەست پێی مووسایە ﷺ، واتە: ئەندازەیەکم لە بەرنامە و پەیامی مووسا وەرگرتبوو، ئەندازەیەکی کەم، یان ئەندازەیەک کە خۆم هەڵمبژارد بوو، چونکە ﴿قَبْضَةً﴾، ئەوەیە کە کۆمەڵە شتێک داندرا بێ، تۆش لەسەرەوە چەنگێکی لێ بدەی، واتە: ئەوەی کە خۆم مەبەستم بوو لە سەری سەرەوە، هەندێکم لێ وەرگرت، ﴿فَنَبَذْتُهَا﴾، ئنجا فڕێمدا، ﴿فَنَبَذْتُهَا﴾، بە مانای (فڕێمدا) دێ و، بە مانای (وازم لێهێنا)ش دێ، کە دەگونجێ لێرەدا مەبەست پێی ئەوە بێ، ئەوەی کە من مەبەستم بوو لە بەرنامە و پەیامی مووسا، کە ڕەوانە کراوی خوایە وەرمگرت، ئنجا فڕێمدا، ئەوەی مەبەستی بووە، فڕێی بدات، کە بریتی بووە لە تەنیا خوا پەرستیی (توحید)، واتە: تەوحیدەکەم لێ وەرگرت لەو بەرنامە و پەیامەی مووسا ﷺ کە کاکڵەکەی و کرۆکەکەی و چڵەپۆپەکەی، بریتیە لە خوا بەیەکگرتن و تەنیا خواپەرستن، ئەوەم لێ وەرگرت و فڕێمدا، ئنجا ئایین و بەرنامەی خوا، کاتێک خوا بە یەکگرتن(توحید)ی لێ دەردەهێنرێ، کەواتە: شوێن بۆ شیرک چۆڵ دەکرێ، هەر دڵێک تەوحیدی تێدا نەبێ، زەمینە بۆ شیرک لەو دڵەدا خۆش دەبێ، هەر ئایینێک ڕووحەکەی لێ دەربێنی، بە دڵنیاییەوە ئەو کات وەک جەستەیەکی مردوو دێتە بەرچاو، ئەمەش مانای دووەمی کە ئەوە زیاتر دەچێتە عەقڵەوە.

٣- **ڕای سێیەم:** کە ئەو قسانە هەموویان درۆ و دەلەسەیەک بوون، سامیریی بۆ خۆی ڕێکییخستوون، بۆ خۆپەڕاندنەوە لە سزای مووسا، کە ئەمەش ڕای **(سید قطب)**ە، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کە لە **(في ظلال القرآن)** دا هێناویەتی[1]، ئەو ڕایەی سێیەمەش شتێکی بەجێیە، کە ئەو قسەیە هەر قسەیەک بوو بێ، سامیریی بۆ خۆی ڕێکیخستبێ، کە: من چنگێکم داگرت لە شوێن پێی ڕەوانە کراو، دوایی فڕێمدا، دەگونجێ هەر قسەیەک بێ کە سامیریی خۆی ڕێکیخستبێ.

بەڵام ڕای دووەم، پێم وایە کە لە هەر سێ ڕایەکان بەجێترە و باشترە.

---

(١) ج٤، ص٢٣٤٩.

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــــــزان!

ئێمـە لـەم دەرسـەماندا کـە لـە شـازدە (١٦) ئایـەت پێکهاتـوە، ئایەتـەکانی: (٩٩ - ١١٤)و، تـەوەری سـەرەکیی بریتیـە لـە بـاسی ڕۆژی دوایـی، بـە هـەردووک قۆناغـی ئاخیـر زەمـان و هەڵسـێنرانەوە و زینـدوو کرانـەوەوە (الساعة، والقيامة)، کـە لـەو شـازدە ئایەتـەدا، خـوای زانـای شـارەزا ﷻ هـەم بـاسی بەشـێک لـە کارەسـاتەکانی ئاخیـر زەمـان دەکات، هـەم بـاسی چەنـد دیمەنێکـی ڕۆژی زینـدوو کرانـەوە و هەڵسـێنرانەوە (قیامەت)یـش دەکات.

دوو ئایـەتی کۆتاییش بـۆ بـاسی قورئـان و ئامانجـی نێردرانـی و، چۆنیـەتی مامەڵـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە خزمەتییـدا، تەرخانکـراون.

﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ ۚ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا ﴿٩٩﴾ مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وِزْرًا ﴿١٠٠﴾ خَٰلِدِينَ فِيهِ ۖ وَسَآءَ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ حِمْلًا ﴿١٠١﴾ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ يَتَخَٰفَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴿١٠٣﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا ﴿١٠٤﴾ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ ۖ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴿١٠٨﴾ يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِىَ لَهُۥ قَوْلًا ﴿١٠٩﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ۞ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا ﴿١١٢﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ

لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ۗ وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ ۖ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴿١١٤﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بەو شێوەیە (کە ڕابرد) لە هەواڵەکانی ڕابردووت بۆ دەگێڕینەوەو، لە لایەن خۆمانەوە (قورئانێکی) بیرخەرەوەمان پێداوی ﴿٩٩﴾ هەر کەس ڕووی لێوەرچەرخێنێ، ئەوە بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا قورسیی (کۆڵی گوناهان) هەڵدەگرێ ﴿١٠٠﴾ بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە (لە سزای ئەو گوناهانەیاندا)، ئەو (کۆڵ)ە، لە ڕۆژی قیامەتدا خراپترین کۆڵیانە ﴿١٠١﴾ ڕۆژێک کە فوو بە کەڕەنادا دەکرێ و، تاوانباران لەو ڕۆژەدا بەشین هەڵگەڕاویی کۆدەکەینەوە ﴿١٠٢﴾ لە نێو خۆیاندا چپە چپ دەکەن (دەڵێن): تەنیا دە (١٠) شەوان ماونەوە (لە دنیادا) ﴿١٠٣﴾ ئێمە بەوەی دەیڵێن: زاناترین، کاتێک ڕا باشترینیان (لە ڕووی ڕاستییەوە) دەڵێ: بەس ڕۆژێکتان پێچووە (لە مانەوەی ژیانی دنیا، یان بەرزەخ، یان هەردووکیاندا)! ﴿١٠٤﴾ لە بارەی چیایەکانیشەوە پرسیارت لێ دەکەن، بێژە: پەروەردگارم وردو خاشیان دەکات ﴿١٠٥﴾ ئنجا دەیانکاتە دەشتێکی تەخت و هەموار ﴿١٠٦﴾ هیچ خواریی و گرێی تێدا بەدی ناکەی ﴿١٠٧﴾ لەو ڕۆژەدا (هەموویان) شوێن (دەنگی) جاڕدەر دەکەون، بە بێ لادان و خواریی لێی (ڕێک بەرەو ڕووی دەچن) و دەنگەکانیش بۆ (خوای) میهرەبان کز و کپ دەبن، تەنیا چپە دەبیستی ﴿١٠٨﴾ لەو ڕۆژەدا تکاکردنی هیچ کەس سوود ناگەیەنێ، جگە لەو کەسەی (خوای) بە بەزەیی مۆڵەتی بدات و قسەکەی (داوایەکەی) پەسند بکات ﴿١٠٩﴾ (خوا) ئەوەی لە پێش دەستیانەوەیەو، ئەوەی لە دوایانەوەیە (داهاتو و ڕابردوویان) دەیزانێ، بەڵام زانیاریی وان دەوری وی (خوا) نادات، ﴿١١٠﴾ هەروەها (لەو ڕۆژەدا) ڕووەکان بۆ (خوای) زیندووی

مشـوورخۆر، زەبـوون بـوون و، هـەر کەسێکیش (کۆڵـی) سـتەمی هەڵگرتبـێ، بێمرادو ڕەنجـەڕۆ بـوو ﴿١١١﴾ بـەڵام هـەر کـەس کـردەوە باشـەکان بـکات و، بڕواداریـش بـێ، ئـەوە نەترسـێ سـتەمی هەیـەو، نەتـرسی لـێ کەمکردنـەوەی پاداشـت ﴿١١٢﴾ هـەر بـەو شـێوە (ناوازە)یـەش قورئانمـان بـە (زمـانی) عەرەبیـی دابەزانـدوەو، (بەرانبـەر بـە کافـران) هەڕەشـەمان بـە شـێوەی جۆراوجـۆر تێـدا باسـکردوە، بەڵکـو پارێـز بکـەن، یـان بیرکەوتنـەوەی تێدا پەیدا بکـەن ﴿١١٣﴾ هـەر پایـە بـەرزە خـوای حوکمـڕانی هـەق، پەلـەش لـە (خوێنـدن و وەرگرتنـی) قورئانـدا مەکـە، بەرلـەوەی سروشـکرانی بـۆ لات تـەواو بـێ و، بشـڵێ: پـەروەردگارم! زانیارییـم بـۆ زێـدە بکـە﴾.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وِزْرًا): (الـوِزْرُ: الحِمْـلُ الثَّقِيـلُ، الذَّنْـبُ، السِّـلاَح)، (وِزْر)، هـەم بـە کۆڵـی قـورس دەگوتـرێ، هـەم بـە گونـاه، هـەم بـە چـەک، لەبـەر ئـەوەی چەکیـش بـاری شـانی مـرۆڤ قـورس دەکات، لـە ڕووی جەسـتەییەوە، گوناهیـش بـاری شـانی مـرۆڤ قـورس دەکات، لـە ڕووی مەعنەوییـەوە.

(حِمْلًا): (الحمـلُ: مـا يُحْمَـلُ عَـلَى الظَّهْـرِ وَنَحْـوِهِ)، (حِمْـل)، بریتیـە لـەوەی کە لەسـەر پشـت، واتـە: کـۆڵ هەڵدەگیـرێ، یـان لەسـەر شـێوەی کۆڵ.

(زُرْقًا): (جَمْـعُ أَزْرَق، وَزَرْقَـاءَ، زَرِقَ: عَمِـيَ)، (زُرْق) کـۆی (أَزْرَق)ە، یـان کۆی (زرقاء)ە، (أزرق) بـۆ نێرینـە، (زرقـاء) بـۆ مێینـە، واتـە: شـین هەڵگـەڕاو، ڕەش و شـین، هەروەهـا وشـەی (زَرِقَ، يَـزْرَقُ: عَمِـيَ، يَعْمَـى)، کوێـر بـوو، کوێـر دەبـێ، بـەو واتایـەش هاتوە.

(يَتَخَٰفَتُونَ): واتـە: بـە چپـە چـپ، بـە سرکـە پێکـەوە قسـە دەکـەن، دەڵـێ: (خَفَـتَ، يَخْفِـتُ، ويَخْفُـتُ، خَفْتـاً، وَخُفُوتـاً، وخُفَاتَـاً: سَـكَنَ وَسَـكَتَ وَضَعُـفَ، خفـت صوتُـهُ، وأَغَـضَّ صَوْتَـهُ)، وشـەکانی (خَفَـتَ، يَخْفِـتُ، ويَخْفُـتُ، خَفْتـاً، وَخُفُوتـاً، وخُفَاتَـاً)

هەمووی بە مانای ئارام بوو، بێدەنگ بوو، بە مانای بێ هێز بوو، (تَخَافُت)، لەسەر كێشی (تَفَاعُل)ە، بۆ هاوبەشییە، واتە: پێكەوە بە چپە قسە دەكەن، بە سركە، دەگوترێ: (خَفَتَ صَوْتُهُ)، واتە: دەنگی كپ بوو، دەنگی نزم بوو، ئەگەر بشڵێ: (أَخْفَتَ صوته)، واتە: دەنگی خۆی نزم و كز كرد.

(قَاعًا): (القَاعُ: أَرْضٌ مُسْتَوِيَةٌ مُطْمَئِنَّةٌ عَمَّا يُحِيطُ بِهَا مِنَ الجِبَالِ وَالآكَام)، (قَاع)، سەر زەمینێكی ڕێكە، مەیلەو گۆملاییە، بە نسبەت ئەوەی كە دەوری داوە لە چیایەكان و گردۆلكەكان، واتە: شوێنێكی تەخت و گۆملایی كە گرێی تێدانەبێ.

(صَفْصَفًا ): (الصَفْصَفُ: المَسْتَوِي مِنَ الأَرْضِ لاَ نَبَاتَ فِيهِ: الفَلاَة)، (صَفْصَفاً)، بە زەوییەكی تەخت دەگوترێ، كە ڕووەكی تێدا نەما بێ، هەروەها بە دەشتێكی كاكیی بە كاكیی چۆڵی بێ گرێ و گۆڵێش دەگوترێ.

(عِوَجًا): (عوج)، واتە: لاریی و خواریی، (فُلاَنٌ مَا يَعْوَجُّ عَنِ الشَّيءِ: مَا يَرْجِعُ عَنْهُ)، لە زمانی عەرەبی دا دەڵێ: (مَا يَعْوَجُّ عَنِ الشَّيءِ)، واتە: لە هیچ شتێك ناگەڕێتەوە، خوار نابێتەوە، ڕێك دەڕوا.

(أَمْتًا ): (الأَمْتُ: المَكَانُ المُرْتَفِعُ)، شوێنی بەرز، هەروەها (الأَمْتُ: صِغَارُ التِّلاَلِ)، گردۆلكەی گچكە، بەوەش دەگوترێ، (الإِخْتِلاَفُ فِي المَكَانِ ارتفاعاً وَانْخِفَاضَاً)، بە زەوییەك دەگوترێ: كە بەرزیی و نزمیی تێدا بێ.

(هَمْسًا): (هَمَسَ فُلاَنٌ إِلى فُلاَنٍ هَمْسَاً: تَكَلَّمَ مَعَهُ كَلاَمَاً خَفِيَّاً لا يَكَادُ يُفْهَم)، ئەگەر بگوترێ: (هَمَسَ فُلاَنٌ إِلى فُلاَنٍ)، واتە: بە شێوەیەكی پەنهان قسەی لەگەڵدا كرد، كە نیزیكە قسەكەی فام نەكرێ.

(وَعَنَتِ ): (عَنَا، يَعْنُوا، عُنوّاً: خَضَعَ وَذَلَّ)، واتە: ملكەچ بوو، زەبوون بوو، (عَنَا فُلاَنٌ لِلْحَق)، واتە: بۆ هەق ملكەچ بوو، كە دەفەرموێ: ﴿ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ ﴾، واتە: ڕووەكان ملكەچ بوون، زەبوون و، تەسلیم بوون.

(خَابَ): (خَابَ، يَخِيبُ، خَيْبَةً: حُرِمَ وَمُنِعَ، وَلَمْ يَنَلْ مَا طَلَبَ)، (خَابَ، يَخِيبُ، خَيْبَةً) واتە: بێ بەش بوو، ڕێی لێگیرا، بێمراد بوو، ڕەنجەڕۆ بوو، ئەوەی کە داوای دەکرد، چەنگی نەکەوت.

(هَضْمًا ): (هَضَمَ فُلَانَاً: ظَلَمَهُ وَغَصَبَهُ، وَهَضَمَ حَقَّهُ: نَقَصَهُ)، (هَضَمَ فُلَانَاً)، واتە: ستەمی لێکرد، مافەکەی لێ زەوتکرد، دەگوترێ: (هَضَمَ حَقَّهُ، أَيْ: نَقَصَهُ)، واتە: هەقەکەی لێ کەم کردەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ دوای تـەواو بـوونی بـاس و خـواس و بەسـەرهاتی مووسـا و هـارووني بـرای (علیهـما السـلام)و، گەلەکەیـان لەگـەڵ فیرعـەون و دەسـتەو دایـەرەو، سـوپاوو سـەرباز و ئەهـلی دیوەخانەکـەی دا، دەفەرمـوێ: ﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ﴾، بـەو شـێوەیە لـە بەسـەرهاتی ئەوانـەی کـە ڕابـردوون بەسـەرتدا دەخوێنینـەوە، بـۆت دەگێڕینـەوە، بـەو شـێوەیە، واتـە: بـەو شـێوەیە کـە دەبـێ هـەر بـە خـۆی بچوێنرێ، هاووێنەیەکـی دیکـەی نیـە، پێـی بچوێنـرێ و پێـی تەشـبیهبکرێ، واتـە: بـەو شـێوە ناوازەیـە، بـەو شـێوە سەرسـوڕهێنەرە، ئێمـە لـە بەسـەرهاتی ئەوانـەی کـە ڕابـردوو ون بـۆ تـۆی دەگێڕینـەوە، ﴿وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا﴾، بـە دڵنیایـی لـە لایـەن خۆمانـەوە قورئانمـان بـە تـۆ داوە، دیـارە قورئـان پێنـج نـاوی سـەرەکیی هـەن، لەگـەڵ کۆمەڵێـک وەسـفی زۆردا، نـاوە سـەرەکییەکانی قورئـان:

١- (قرآن)، واتە: خوێنراوە.

٢- (کتاب)، واتە: نووسراو.

٣- (ذکر)، واتە: بیرخەرەوە، یان ناوبانگ و پایەی بەرز.

٤- (فرقان)، واتە: جیاکەرەوە.

٥- (کلام الله)، فەرموودەی خوا.

دەگونجـێ لێـرەدا وشـەی **(ذکـر)** مەبەسـت پێـی نـاوی قورئـان بـێ، واتـە: قورئانمان بـە تـۆ داوە، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی سـیفەتەکەی بـێ، واتـە: بیرخەرەوەمـان بـە تـۆ داوە، چـی بیـر خەڵـک دەخاتـەوە؟ ئـەو ڕاسـتییانەی کـە خـوا لـە سروشـتی

مرۆڤدا داینـاون، لـە زگـماک و خوارسـکی مرۆڤـدا داینـاون، بـەڵام دنیـاو، بـێ ئاگایـی و، ئـارەزووەکان و، فێـڵ و فەرەجـی شـەیتان، ئـەو شـتانە لـە عەقـڵ و دڵـدا کاڵ دەکەنـەوە، یـان بیریـان دەبەنـەوە، ئیـدی خـوا کتێبـەکانی دابەزانـدوون و، پێغەمبـەرانی نـاردوون، ئـەو ڕاسـتییانە بیـر مرۆڤـەکان بخەنـەوە، ﴿مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وِزْرًا﴾، هـەر کەسـێک ڕووی لـێ وەرگێـڕێ، لـەو (ذکـر)ەو، لـەو بەرنامەیـە، لـەو قورئانـە، ئـەوە بـە دڵنیایـی لـە ڕۆژی هەڵسـانەوەدا قورسـایی هەڵدەگـرێ، کۆڵـی گوناهـان هەڵدەگـرێ، ﴿خَـٰلِدِينَ فِيهِ﴾، لـە نێـو سـزای ئـەو کۆڵـە گوناهـەی خۆیانـدا، بـە هەمیشـەیی دەمێننـەوە، ﴿وَسَآءَ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ حِمْلًا﴾، (سَآءَ)، لێـرەدا بـە مانـای (بِئسَ) دێ، واتـە: خراپتریـن کـۆڵ، لـە ڕۆژی هەڵسـانەوەدا، ئـەو کۆڵەیـە کـە ئـەوان هەڵیانگرتـوە، خراپتریـن کـۆڵ و بـار، ئـەو کـۆڵ و بارانـەن کـە ئـەوان لەسـەر شـان و پشـتی خۆیـان هەڵیـان گرتـوون، کـۆڵ و بـاری گوناهـان، خراپتریـن کۆڵـە مـرۆڤ لـە کۆڵـی بنـێ.

﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا﴾، ئـەو ڕۆژە کـە فـوو بـە کەڕەنـادا دەکـرێ (**الصُّـور**)، واتـە: کەڕەنـا، بـووق، وەک دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا دەیهێنیـن، پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرمـوێ: (**صاحـب القـرن**) فـووی پێـدا دەکات، ئـەو فریشـتەی کـە خـاوەنی ئـەو صوورەیـە، هەندێکیـش دەڵێـن: ئـەوە وشـەیەکە خـوای پـەروەردگار بەکاریهێنـاوە، کـە وەک چـۆن کەڕەنـا لێـدەدرێ بـۆ سـوپایەک هەمـوو سـەربازەکان ڕیـز دەبـن و، دێنـە مەیدانێـک کـە بۆیـان دیاریکـراوە، بـە هەمـان شـێوە مرۆڤـەکان لـە ڕۆژی هەڵسـانەوە و زیندووبونـەوەدا، بـەو شـێوەیە کـە خـوا قۆناغـی دووەمـی ڕۆژی دوایـی دێنێتـە پێشـێ، ئـاوا ڕیـز دەبـن، وەک چـۆن سـەربازانی مەشـق پێکـراو ڕیـز دەبـن، بـەڵام مـادام لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوەو، بـاسی (**قرن**)مـان بـۆ دەکات، (**قـرن**)، واتـە: قـۆچ، ئـەو بووقـە دەبـێ شـتێکی زۆر گـەورە بـێ و، لەسـەر شـێوەی قۆچێـک بـێ، کـە بووقـی عەسـکەریش هـەر لەسـەر ئـەو شـێوەیە، مـادام پێغەمبـەر ﷺ بۆمـان بـاس دەکات و بۆمـان وێنـا دەکات، یـانی: ئـەوە حەقیقەتێکـی ماددییشی هەیە، ئەگەرنـا دەزانین مانـا مەعنەوییەکـەشی هـەر لـە شـوێنی خۆیـەتی.

﴿ وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴾، لەو ڕۆژەدا، ئەو تەنوینەی سەر﴿ يَوْمَئِذٍ ﴾، ئەو ڕستانەی پێشێ لە نێو خۆیدا کۆدەکاتەوە، واتە: لەو ڕۆژەدا کە ئەوە دەقەومێ و، ئەوە دەقەومێ و، ئەوە ڕوودەدات، ئێمە تاوانباران بە ڕەش و شین هەڵگەڕاویی کۆدەکەینەوە، (زرق)، لێرەدا کۆی (أزرق)، یان کۆی (زرقاء)ە، بە نسبەت نێرو مێیەوە، دەشگونجێ: ﴿ زُرْقًا ﴾، بە مانای (عُمياً) بێ، چونکە یەکێک لە واتاکانی (زَرَق)، یانی: (عمي)، کوێر بوو، واتە: بە کوێریی کۆیان دەکەینەوە، چونکە کە مرۆڤ چاوی کوێر دەبێ، چاوی شین هەڵدەگەڕێ.

﴿ يَتَخَٰفَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴾، لە نێوان خۆیاندا بە چپە چپ، بە سرکە سرک، بە دەنگی کپ و پەنهان قسان دەکەن، هەندێکیان بە هەندێکیان دەڵێن: ئێوە تەنیا دە (١٠) شەوان لە دنیا ماونەوە، لە زمانی عەرەبییدا ئەگەر ژمارە (عدد) بە نێرینە (مذكّر)ی بێ، دیارە ژمێرراو (معدُود)ەکە، مێ (مؤنث)ە، کەواتە: لێرەدا واتە: (إلاّ عَشر ليالٍ)، هەرچەند هەندێکیانیش دەڵێن: دروستیشە بلێی: ﴿ عَشْرًا ﴾ و بۆ ڕۆژان (أيّام)یش بەکار بێ، بەڵام زیاتر مەبەست پێی شەوە، واتە: تەنیا دە (١٠) شەو و دە (١٠) ڕۆژ ماونەوە، چونکە شەو بەبێ ڕۆژ نابێ، ئنجا ئایا مەبەستیان لەو مانەوەیە، مانەوەی کوێیە؟

واتە: مانەوەی نێو گۆڕ، یان مانەوە لە ژیانی دنیادا، واتە: مانەوە لە قۆناغی بەرزەخ، یان قۆناغی ژیانی دنیادا، یان لە هەردووکیاندا.

﴿ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ ﴾، ئێمە زاناترین بەوەی دەیلێن، لە نێوان خۆیانداو، مشت ومڕیانە، چەند ماونەوەو چەندیان پێچووە لە ژیانی دنیادا، یان لە قۆناغی بەرزەخدا؟ ﴿ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً ﴾، کاتێک کە ئەوەی لە هەموویان ڕێبازەکەی زیاتر پێدەچێ لە ڕاستییەوەو لە هەقەوە نیزیک بێ، واتە: جۆری بیرکردنەوەکەی و بۆچوونەکەی لە ڕاستیی و هەقەوە نیزیک بێ، دەڵێ: ﴿ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا ﴾، ئێوە تەنیا ڕۆژێک ماونەوە.

بۆیـەش خـوا دەفەرمـوێ: ئەوەیـان کـە لـە هەمـووان زیاتـر بـە هـەق دەچـێ، یـان لـە ڕاسـتییەوە نیزیکـە، چونکـە ژیـانی دنیـا وەختێـک کـە لەگـەڵ ڕۆژی دواییـدا بـەراورد دەکـرێ، یـان قۆناغـی بـەرزەخ، وەختێـک کـە لەگـەڵ ڕۆژی دواییـدا بـەراورد دەکـرێ، هەتـا بـە کەمـتر مەزەنـدە بکـرێ، ئەوەنـدە لـە ڕاسـتییەوە نیزیکـترە، بۆیـە ئەوەیـان کـە دەفەرمـوێ: تەنیـا ڕۆژێـک ماونـەوە، ئـەوە لـە ڕاسـتییەوە نیزیکـترە، بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً ﴾، واتـە: ئەوەیـان کـە تێگەیشـتنەکەی باشـترە، چونکـە وشـەی ﴿ طَرِيقَةً ﴾ بـە مانـای ڕێبـاز دێ، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـت پێـی (حاڵـەت)ە، ئـەوەی حاڵـی لـە هەمـووان لـە هـەق و پێکانـەوە نیزیکـترە، ئەویان ئـاوا دەڵـێ، دەڵـێ: تەنیـا ڕۆژێـک ماونـەوە.

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴾، هەروەهـا لـە بـارەی چیایەکانـەوە پرسـیارت لـێ دەکـەن، چییـان لـێ دێ، لـە ڕۆژی دواییـدا، بـە تایبـەت لـە قۆناغـی ئاخیـر زەمانـدا، (سـاعة)، کاتی کۆتایـی هاتنـی ژیـانی دنیـا؟ پێیـان بڵـێ: ﴿ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴾، پـەروەردگارم وردو خاشـیان دەکات، وشـەی (نَسـف)، بریتیـە لـە هەڵکەنـدنی شـتێک لـە ڕیشـەوە، ڕیشـە کێشـکردنی، وێـڕای ئـەوەی بریتیـە لـە وردو خـاش کـردنی و پـرژ و بڵاوکردنـەوەی، ﴿ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴾، ﴿ فَيَذَرُهَا ﴾، یـانی: (**فيدعها، فيتركها**)، لێـی دەگـەڕێ، دەیکاتـە گۆڕەپانێکـی تەختـی بێگـرێ و گـۆڵ، (**قاع**)، سـەر زەمینێکـە کـە گۆملایـی و، تەخـت بـێ، (**صفصف**)یـش واتـە: شـوێنێک کـە هیـچ گـرێ و گـۆڵ و کەنـدو لەنـدی تێـدا نەبـێ و، هیـچ ڕووەکـی لـێ نەبـێ، ﴿ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴾، کـە لـە شـوێنی ئـەو چیایانـەدا، کـە خـوا دەیکاتـە گۆڕەپـان و زەوییەکـی تەخـت و هەمـوارو بـێ گـرێ و گـۆڵ، تـۆ هیـچ خواریـی و لاریـی تێـدا نابینـی و، هیـچ بەرزیـی و نزمیـی و گردۆلکـەی تێـدا نابینـی.

ئـەوەی پێشـێ قۆناغـی ئاخیـر زەمـان (**سـاعة**) بـوو، ئنجـا دەگوازرێتـەوە بـۆ قۆناغـی دووەم کـە قۆناغـی هەڵسـانەوە و زیندووبوونەوەیـە، واتـە: قۆناغـی (**قيامة**) ﴿ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ ﴾، لـەو ڕۆژەدا، دیسـان ئـەو تەنوینـەی سـەر

﴿ يَوۡمَئِذٍ ﴾، واتە: لەو ڕۆژەدا كە فووو بە كەڕەنادا دەكرێ و، مرۆڤەكان زیندوو دەكرێنەوەو، هەر كەسە لە شوێنی خۆی هەڵدەستێتەوە و ڕووحیان بە بەر جەستەدا دەكرێتەوە و...هتد، ئەم تەنوینە ئەو مانایانە هەموویان كۆ دەكاتەوە، لەو ڕۆژەدا ﴿ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِيَ ﴾، خەڵكەكە شوێن جاڕدەر دەكەون، بانگكەر كە بانگیان دەكات، ﴿ لَا عِوَجَ لَهُۥ ﴾، واتە: هیچ خواریی و لاریی نیە، بۆ بابای جاڕدەر، هەر كەسێك لە ڕاست خۆیەوە ڕێك بە هێڵێكی ڕاست بەرەو ڕووی دەچێ، بۆ ئەوەی زوو پێی بگات، بگاتە ئەو شوێنەی كە ئەو جاڕی بۆ دەدات، بگاتە ئەو گۆڕەپانە، ﴿ وَخَشَعَتِ ٱلۡأَصۡوَاتُ لِلرَّحۡمَٰنِ ﴾، دەنگەكانیش بۆ خوای میهرەبان، خوای بە بەزەیی بێ دەنگ دەبن، ملكەچ دەبن دەنگە دەنگ و هەراهەرا نابێ، ﴿ فَلَا تَسۡمَعُ إِلَّا هَمۡسٗا ﴾، جگە لە چپە چپ، هیچی دیكە نابیستی، جگە لە قسەی سركە سرك، لەبەر خۆوە، بە دەنگی كپ هیچی دیكە نابیستی، دەنگە دەنگ و هەراو قیرە قیر نایەت.

﴿ يَوۡمَئِذٖ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ ﴾، لەو ڕۆژەدا تكا كردن سوودی نیە، سوود بە كەس ناگەیەنێ، ﴿ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُۥ قَوۡلٗا ﴾، (تكاكردنی هیچ كەسێك سوود ناگەیەنێ)، مەگەر كەسێ خوای خاوەن بەزەیی مۆڵەتی بدات و، قسەكەشی پەسند بكات، واتە: تكاكردنەكەشی پەسند بكات بۆ كەسێك كە بۆی دەكات، ئەمە بۆ بەرپەرچدانەوەی بتپەرستەكان و هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانە، كە پێیان وابوو ئەوانەی دەیانپەرستن لە ڕۆژی دواییدا، تكایان بۆ لە لای خوای پەروەردگار دەكەن، خوای تاك و پاك دەفەرموێ: نا، تكای هیچ كەس سوودی نیە، مەگەر كەسێك كە خوا مۆڵەتی بدات، پاشان دەبێ ئەو تكایەش كە دەیكات، لەجێی خۆیدا بێ و، بۆ كەسێك بێ كە شایستەی بێ، ﴿ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ ﴾، (خوا) ئەوەی لە پێش دەستیانەوەیە دەیزانێ و، ئەوەی لە دواشیانەوەیە دەیزانێ، واتە: ڕابردوویان دەزانێ و داهاتووشیان دەزانێ، یان داهاتوویان دەزانێ و ڕابردووشیان دەزانێ، چونكە ئەوەی لە پێش دەستیانەوەیە،

دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ کە دادێ، دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ کە رابردوە، هەروەها ﴿وَمَا خَلْفَهُمْ﴾، دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ کە تێپەڕیوەو بە جێیان هێشتوە، دەشگونجێ بگوترێ: مەبەست ئەوەیە کە لە دوایانەوە دێ و، جارێ پێیان نەگەیشتوە، واتە: ئەو دوو وشەیە هەردووکیان هەم داهاتوو، هەم رابردووش دەگەیەنن، دەشگونجێ بگوترێ: ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾، واتە: هەرچی لە دەوروبەریانە، چ لە رووی شوێنەوە، چ لە رووی کاتەوە، واتە: هەموو حاڵ و باڵیان دەزانێ، ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا﴾، بەڵام زانیاریی ئەوان دەوری خوا نادا، مەبەست ئەوە نیە کە پەی بە خوا نابەن، پەی بە بوونی خوا دەبەن، پەی بە سیفەتەکانی خوا دەبەن، بە مەرجێک بە عەقڵی سەلیم و بە فیترەتی ساغ لەگەڵ خوادا مامەڵە بکەن، بەڵام خوا لەوە مەزنترە کە زانیاریی ئەوان دەوری خوا بدات، هەموو شتێک لە بارەی خواوە بزانن، تەنیا ئەوە دەزانن کە خوا خۆی فێریان دەکات و، عەقڵ و هۆشیان دەتوانێ لە خۆیدا بیحەجمێنێ و جێی بکاتەوە و وە خۆی بگرێ، ﴿وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ﴾، رووەکانیش بۆ زیندووی مشوورخۆر، زیندووی بەڕێوەبەر، کە مەبەست پێی خوای بەرزو مەزنە، ملکەچ بوون، رووەکان بۆی زەبوون بوون، ﴿وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا﴾، بێگومان بێبەش و بێمرادو ڕەنجەڕۆ بوو، کەسێک کە ستەمی هەڵگرتوە، هەر جۆرە ستەمێک، ستەم لە نێوان خۆی و خوادا، یان لە نێوان خۆی و خەڵکدا، یان لە نێوان خۆی و خۆیدا، ﴿وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾، هەر کەسێکیش کردەوە باشەکان ئەنجام بدات، لە حاڵێکیدا کە بڕواداریشە، ﴿فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا﴾، نە ترسی ستەمی هەیە، کە ستەمی لێ بکرێ، سزایەک بدرێ لەسەر شتێک کە نەیکردوە، ﴿وَلَا هَضْمًا﴾، نە مەترسیی لێ کەمکردنەوەی پاداشتیشی هەیە لەسەر کردەوەی چاکە، کە کردوویەتی. واتە: نەترسی ئەوەی هەیە لەسەر گوناهێک سزا بدرێ، کە نەیکردوە، نەترسی ئەوەی هەیە، چاکەیەک کە کردوویەتی، پاداشتەکەی لێ کەمکرێتەوە.

ئنجا دوای باس و خواسی ڕۆژی دوایی بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و زیندوو کرانەوە (**ساعة وقیامة**)ەوە، ئنجا ئەو دوو ئایەتەی کۆتایی تەرخان دەکات، جارێکی دیکە دێتەوە سەر باسی قورئان، دەفەرمویٚ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا ﴾، هەر بەم شێوەیە قورئانێکی عەرەبییمان بۆ لای تۆ دابەزاندوە، واتە: بەو شێوە ناوازەیە کە هەر شایستەی خوایە، سروش بکات و فەرمانی خۆی دابەزێنێ، ﴿ وَصَرَّفۡنَا فِيهِ مِنَ ٱلۡوَعِيدِ ﴾، هەڕەشەشمان تێدا جۆراو جۆر کردوە، واتە: بە شێوازی جۆراو جۆر، بە دەربڕینی جۆراو جۆر، هەڕەشەو ترساندنمان تێدا خستۆتە ڕوو، بۆ بێبڕوایەکان، بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، ﴿ لَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ أَوۡ يُحۡدِثُ لَهُمۡ ذِكۡرٗا ﴾، بەڵکو پارێز بکەن، یان بیرخستنەوەیان، یان هاتنەوە بیریان، تێدا پەیدا بکات، یان پارێز بکەن، کە ئەوە حاڵەتێکی باشترە، یان بە لای کەمەوە هۆشیارییان تێدا پەیدابێتەوەو، بیریان بکەوێتەوە، ڕاستییەکانیان بیربکەونەوە.

دەشگونجێ بڵێین: ﴿ لَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ﴾، ئەوە بۆ کەسانێکە کە جارێ نەهاتوونە نێو بازنەی ئیمان و ئیسلامەوە، بەڵکو خۆیان بپارێزن لە کوفرو شیرک و، بێنە نێو بازنەی ئیسلامەوە، ﴿ أَوۡ يُحۡدِثُ لَهُمۡ ذِكۡرٗا ﴾، یان ئەوانەی کە لە نێو بازنەی ئیسلامدان، هۆشیاریی و بێداریی زیاتریان بۆ بڕەخسێنێ و، زیاتر ڕاستییەکانیان بکەوێتەوە بیر.

﴿ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّ ﴾، بەرزە خوای حوکمڕانی هەق، (ملک)، واتە: حوکمڕان، (حق)، واتە: چەسپاو، ئنجا دیارە وشەی (حق)، هەر دەبێتەوە سیفەتی خوا، ﴿ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّ ﴾، بەرزە خوای حوکمڕانی هەق، چەسپاو، نەگۆڕ، ﴿ وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مِن قَبۡلِ أَن يُقۡضَىٰٓ إِلَيۡكَ وَحۡيُهُۥ ﴾، پەلەش لە قورئان مەکە، پێش ئەوەی سروش کردنەکەی بۆ لای تۆ تەواو ببێ، واتە: پەلە مەکە لە خوێندنیداو لە وەرگرتنی دا، ﴿ وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ﴾، بشڵێ: پەروەردگارم!

زانیاریم بۆ زێدە بکە، زانیاری، واتە: زانیاری وەحی، یان زانیاری تێگەیشتن لە وەحی، یان زانیاری، هەم زانیاری وەحی، (زانیاری نەقڵی)، هەم زانیاری عەقڵی، وشەی (علم) کە لێرەدا بە نەزانراو (نكرة) هاتوە، واتە: زانیارییەکی گەورە و مەزنم بۆ زیاد بکە، بیخە پاڵ ئەو زانستەوە کە فێرت کردووم، شارەزات کردووم، بەردەوام زانیاریم بۆ زیاد بکە.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**باسی گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێشووان و، باسی قورئان كە هەر كەس پشتی تێ بكات، ڕۆژی دوایی كۆڵی قورسی گوناهان هەڵدەگرێ و، ئەو كۆڵەش خراپترین كۆڵ و بارە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ ۚ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا ﴿٩٩﴾ مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وِزْرًا ﴿١٠٠﴾ خَٰلِدِينَ فِيهِ ۖ وَسَآءَ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ حِمْلًا ﴿١٠١﴾﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ﴾، بەو جۆرە لە هەواڵەكان ئەوەی ڕابردوە بەسەرت دا دەیگێڕینەوە، ئەمە ئاماژەیە بەو بەسەرهاتەی مووسا و هاڕوونی برای سەلامی خوایان لێ بێ، لەگەڵ فیرعەون دا، ئەو گێڕانەوەی بەسەرهاتە كە بۆمان گێڕایەوە لە نەوەد (٩٠) ئایەتی ڕابردوودا، ئاوا لە هەواڵی ئەوانەی ڕابردوون، بۆ تۆ دەگێڕینەوە، بەسەرتدا دەخوێنینەوە، وشەی (ما)، (موصولةٌ): **(الَّذي سَبَقَ مِنْ أَحْوَال الأُمَم)**، ﴿مِنْ أَنبَآءِ مَا﴾، لە هەواڵەكانی ئەوەی كە ڕابردوە، لە گەلانی پێشوو، لە كۆمەڵگا پێشووەكان، دیارە كە دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ﴾، ئەم وێچوواندنە وێچوواندنە بە خودی خۆی، چونكە وێنەیەكی نیە تاكو خوای زاناو شارەزا ئەو شێوە بەسەرهات گێڕانەوە و بەسەرهات بەسەر خوێندنەوەیەی، كە خوا بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ فەڕاهەمی هێناوە، پێی تەشبیە بكات و لەگەڵیدا بەراوردی بكات.

٢)- ﴿وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا﴾، بە دڵنیایی لە لایەن خۆمانەوە (**ذكر**)مان پێ داوی، کە وشەی (**ذكر**) دەگونجێ هەر مەبەست پێی قورئان بێ، چونکە (**ذكر**) یەکێکە لە ناوەکانی قورئان، دەشگونجێ مەبەست پێی بیرخەرەوە بێ و، دەشگونجێ مەبەست پێی ناو و ناوبانگ و پایە بەرزیی بێ، چونکە قورئان شەڕەف و ناو و ناوبانگە، بۆ هەر کەسێ هەڵیبگرێ و تێیدا تێ بگات و پێ بگات.

٣)- ﴿مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وِزْرًا﴾، هەر کەسێک ڕووی لێوەرگێڕێ، ڕووی لێ وەرچەرخێنێ، لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا کۆڵی قورس هەڵدەگرێ، ﴿وِزْرًا﴾، یان بە مانای گوناه دێ، یان بە مانای قورسایی دێ، کە بە دڵنیایی مەبەست ئەوەیە کۆڵی قورسی گوناهان هەڵدەگرێ، هەر کەسێک پشت لە قورئان بکات، ڕوو لە قورئان وەرچەرخێنێ، قورئان مرۆڤ دەپارێزێ لە تاوان و لادان، دەیپارێزێ لە گوناهباریی و عەیبداریی، بۆیە کەسێک ڕوو لە قورئان وەرچەرخێنێ و پشتیی تێ بکات، ڕێی گوناه و تاوان و لادان و عەیبداریی و خلیسکانی بۆ تەخت و ئاچووغ دەبێ.

٤)- ﴿خَٰلِدِينَ فِيهِ﴾، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، لەو گوناهە قورسەدا، لە سزای ئەو گوناهە قورسەدا، کە هەڵیانگرتوە، تێیدا بە هەمیشەیی دەمێننەوە، کە مەبەست پێی دۆزەخە.

٥)- ﴿وَسَآءَ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ حِمْلًا﴾، خراپترین کۆڵیشە ئەو کۆڵەی کە لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا هەڵیان گرتوە، یانی: (**فَهُوَ أَسْوَءُ حِمْلٍ لَهُ**)، ئەوە خراپترین کۆڵی ئەوانە، کە لە کۆڵیان ناوە و هەڵیانگرتوە لە ڕۆژی قیامەتدا.

## مەسەلەی دووەم:

**باسی ڕۆژی دوایی بە تایبەت قیامەت، کە فوو بە کەڕەنادا دەکرێ و، تاوانباران بە شینهەڵگەڕاویی کۆدەکرێنەوەو لە نێوان خۆیاندا چپە چپ دەکەن، ئایا دە (١٠) شەوان ماونەوە؟ یان تەنیا ڕۆژێک لە دنیادا، یان لە بەرزەخدا، یان لە هەردووکیاندا؟:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِۚ وَنَحۡشُرُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ يَوۡمَئِذٖ زُرۡقٗا ١٠٢ يَتَخَٰفَتُونَ بَيۡنَهُمۡ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا عَشۡرٗا ١٠٣ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذۡ يَقُولُ أَمۡثَلُهُمۡ طَرِيقَةً إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا يَوۡمٗا ١٠٤ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ ﴾، ئەم (يَومَ)ە، (بَدَلٌ مِنَ يَوْمِ القِيَامَةِ)، پێشتر باسی ڕۆژی قیامەت کراوە، واتە: ئەو ڕۆژە کە فوو بە کەڕەنادا دەکرێ، بە دڵنیایی مەبەست پێی فووی دووەمە، وەک لە ئایەتی ژمارە (٦٨)ی سوورەتی **(الزمر)**دا هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ﴾، واتە: فوو بە کەڕەنادا کرا، هەر کەسێ کە لە ئاسمانەکان و هەر کەسێ کە لە زەویدا هەیە، بێ هۆش بوو، (یاخود مرد)، جگە لەوەی کە خوا بیەوێ (بێ هۆش نەبێ، یان نەمرێ)، دوایی فووێکی دیکەی پێدا کرا، واتە: کەڕەتی دووەم و قۆناغی دووەم، ﴿ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ﴾، یەکسەر بینیت هەموویان هەڵساونەوە و چاوەڕێ دەکەن.

کەواتە: لە دوای فوو بە قەڕندا کردنی یەکەم، یان فوو بە صووڕ داکردنی یەکەم، کە لە قورئاندا وشەی **(صور)**، هاتوە، بەڵام لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ وشەی **(قَرْن)** هاتوە، لە زمانی عەرەبییدا (بوق)یشی پێ دەڵێن، لە دوای

فووی یەکەم، هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هەمووی دەمرێ، هەر کەسێک کە هەیەو، ئەم گەردوونە ئەم شێوەیەی ئێستای نامێنێ، ئەم لاپەڕەی ئێستا دەپێچرێتەوە، کە ئەمە پێی دەگوترێ: ئاخیر زەمان و کۆتایی هاتنی گەردوون، بەڵام لە دوای فووی دووەم، کە قۆناغی دووەمی ڕۆژی دواییەو (قیامة)ی پێ دەڵێن، واتە: هەڵسانەوە، هەرچەندە زۆر کەس (ساعة وقیامة)ی لێ تێکەڵ دەبن، وا دەزانێ ڕۆژی دوایی هەر یەک شتە، بەڵام بە تەئکید دوو قۆناغە، وەک لەو ئایەتەی ژمارە (٦٨)ی سوورەتی (الزمر)دا، زۆر بە ڕوونیی دیارەو پێشتریش ئێمە ئەوەمان باسکردوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێک دا دەفەرمووێ: {**كَيْفَ أَنْعَمُ وَقَدْ الْتَقَمَ صَاحِبُ الْقَرْنِ الْقَرْنَ، وَحَنَى جَبْهَتَهُ، وَأَصْغَى سَمْعَهُ يَنْتَظِرُ أَنْ يُؤْمَرَ أَنْ يَنْفُخَ، فَيَنْفُخَ؟ قَالَ الْمُسْلِمُونَ: فَكَيْفَ نَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: قُولُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، تَوَكَّلْنَا عَلَى اللَّهِ رَبِّنَا**} (**أخرجه الترمذي برقم: ٣٢٤٣، وَحَسَّنهُ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ**).

واتە: چۆن لەززەت وەربگرم، (یان چۆن شادمان بم، یان چۆن خۆشحاڵیی یان خۆشگوزەرانیی ڕەچاو بکەم)، لە حاڵێکدا کە خاوەنی کەڕەنا، ئەو کەڕەنایەی بە دەمەوە گرتوەو نێو چاوانیشی بەسەردا نوشتاندۆتەوەو، چاوەڕێ دەکات کە مۆڵەتی بدرێ و، فووی پێدا بکات، مسوڵمانان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! چۆن بڵێین، فەرمووی: بڵێین: (**حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، تَوَكَّلْنَا عَلَى اللَّهِ رَبِّنَا**)، خوامان بەسەو، باشترین کارپێسپێردراو ئەوە، پشتمان بە خوا بەست.

٢)- ﴿وَنَحۡشُرُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ يَوۡمَئِذٖ زُرۡقٗا﴾، تاوانباران لەو ڕۆژەدا بە ڕەش و شینهەڵگەڕاویی کۆ دەکەینەوە، (**زُرْق جَمْعُ أَزْرَق وَهُوَ الَّذِي لَوْنُهُ الأزرق**)، کەسێک کە ڕەنگەکەی شین بێ، مرۆڤ کە زۆر خەفەتبارو داماو دەبێ و ماتەمینیی دایدەگرێ، ڕەنگی ڕەش و شین دەبێ، تۆزی تەمی لێ دەنیشێ، دەشگونجێ ﴿زُرۡقٗا﴾، کە کۆی (**أزرق**)ە، مەبەست پێی کۆی (**أَعْمَى**) بێ، واتە: (**عُمِي**)، یانی: بە کوێریی کۆیان دەکەینەوە، چونکە بابای کوێر چاوی شین هەڵدەگەڕێ.

٣)- ﴿ يَتَخَٰفَتُونَ بَيۡنَهُمۡ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا عَشۡرٗا ﴾، لە نێوان خۆیاندا بە چپەچپ قسە دەکەن، دەڵێن: تەنیا دە (١٠) شەوان ماونەوە، (**التَّخَافُتُ: الكَلَامُ الخَفِيُّ مِنْ خَوْفٍ وَنَحْوِهِ**)، (**تَخَافُت**) بریتیە لە قسەی پەنهان بە هۆی ترس و غەیری ترسەوە.

٤)- ﴿ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَقُولُونَ ﴾، ئێمە زاناترین بەوەی کە دەیڵێن، دیارە هەندێکیان ئەوەی کە زۆریان گوتوە، گوتوویانە: دە (١٠) شەو ماوینەوە.

٥)- ﴿إِذۡ يَقُولُ أَمۡثَلُهُمۡ طَرِيقَةً ﴾، کاتێک ئەوەی ڕێبازەکەی لە هەمووان چاکترە، لە هەموویان زیاتر لە ڕاستییەوە نیزیکترە، دەڵێ: ﴿إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا يَوۡمٗا ﴾، یانی: (**ما لَبِثْتُم إلاَّ يَوماً**)، تەنیا ڕۆژێک ماونەوە، وشەی (**أَمْثَل**)، کە لە (**مِثْل، مَثَل**)ەوە هاتووە، بە (**أمثال**) کۆ دەکرێتەوە، بە واتای (**الفَاضِل، أماثِلِ القَوْمِ: خِيَارُهُم**)، باشترینیان، کەواتە: ﴿أَمۡثَلُهُمۡ طَرِيقَةً ﴾، واتە: (**أَحْسَنُهُم تَفْكِيراً، أَفْضَلُهُم رَأْيَاً**)، ئەوەی کە بیرکردنەوەکەی لە هەمووان لە ڕاستییەوە نیزیکترە، لە هەمووان باشتر بیری کردۆتەوە، واتە: لە دە شەوان تاکو یەک ڕۆژ، ئاوا لەو بەینەدا مشت ومڕیانە، ڕەنگە ژمارەکانی: دە، نۆ، هەشت، حەوت، شەش، پێنج، سێ، چوار، دوو، یەک ئا بەو شێوەیە، هەموویانیان گوتبن، خوای پەروەردگاریش لای زۆرییەکەی و لای کەمییەکەی باسکردوون، ئەوەی بڵێ: زۆر ماوینەوە دەیگەیەننە دە شەو، لای کەمییەکەشی دەڵێن: ڕۆژێکمان هەر پێ چووە، هەندێ لە زانایان دەڵێن: لە ئەنجامی ئەوەدا ئەو بۆ چوونەیان بۆ دروستبووە، کە زیندوو دەکرێنەوە، سەیر دەکەن، زۆر کەمی پێچووە، واتە: ژیانی دنیایان زۆر کەمی پێچووە، یان ژیانی دوایی گۆڕو بەرزەخیان کەمی پێچووە، یان دەگونجێ مەبەست پێی هەردووکیان بێ، کەمی پێچووە، لە چاو ڕۆژی دوایی و قیامەتدا، کە واپێدەچی لەوێ کات (**زمن**) بوەستێ!!.

## زانایان دوو لێکداوەیان کردوون بۆ: ﴿أَمۡثَلُهُمۡ طَرِيقَةً ﴾:

١- (**أي: أَقْرَبهم فِي الْمَعَاذِيرِ، لإنْكَارِهِم القِيَامَةَ وَالبَعْث**)، نیزیکترینیان لە پۆزشهێنانەوە، لەبەرئەوە کە نکووڵییان دەکرد لە هەڵسانەوە و زیندووبوونەوە، چونکە پۆزش دێننەوە، بەڵێ: نکووڵییمان دەکرد، بەڵام ئێستا دیارە، ئەوە قیامەتەو هاتووە، ئێمەش دە (١٠)

شەوان ماوینەوە، یان ڕۆژێک ماوینەوە، بە پێی ئەوە کە خوا ﷻ دەفەرمویٚ: باشترینیان، نیزیکترینیان لە ڕاستییەوە، ئەو ڕایەی لە هەموویان زیاتر پێدەچیٚ، لە هەقەوە نیزیکتر بیٚ، ئەوەیە کە ڕۆژێک ماونەوە.

٢- (أو هو تهكمٌ بهم فِي سُوء تقديرهم مِنْ لَبْثِهِمْ فِي الْقُبُورِ، فالَّذِي قَدَّر الأَقَلَّ، كَانَ أقربَ إلى الصَّوَاب)، یان ئەوە گاڵتەپێکردنیانە بەوەی کە مەزەندەکەیان، ئەندازەگیرییەکەیان، بەوەی کە چەند ماونەوە لە گۆڕدا، یان لە ژیانی بەرزەخدا؟ مەزەندەکەیان زۆر ناتەواوە، بەڵام ئەوەیان کە کەمتری داناوە، لە ڕاستییەوە نیزیکتر بووە.



## مەسەلەی سێیەم:

**باسی چیاییەکان کە خوا لە ئاخیر زەماندا وردو خاشیان دەکات و، دەیانکاتە گۆراییەکی تەخت و ساف، کە هیچ لاریی و، گردو بەرزیی و نزمیی تێدا نابینیی:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ﴾، لە بارەی چیایەکانەوەش لێت دەپرسن؟ پرسیارت لێ دەکەن، چییان لێ پرسیوە؟، پرسیاریان لێکردوە: ئایا ئەو چیا سەر کەشانەو، ئەو چیا سەختانە لە ئاخیرزەماندا، چییان لێ بەسەر دێ؟ چ گۆڕانێکیان بەسەر دادێ؟.

٢)- ﴿فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا﴾، تۆ بڵێ: پەروەردگارم وردو خاشیان دەکات، (**النسف: الإقتلاع من الأصلِ**)، (**نَسْف**) بریتیە لە ڕیشە کێشکردن، لە ڕیشە دەرهێنان، وێڕای ئەوە (**نسف**)، دەڵێ: بریتیە لە: (**التفريق، و الإذراء، وَالطَّحن**) بڵاوکردنەوەو، کردنە تۆزو خۆڵ و هاڕین.

٣)- ﴿فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا﴾، ئەو چیایانە خوا دەیانکاتە دەشتاییەکی صافی بێ گرێ و گۆڵ، (**قاع**) زەوییەکە ئاسان بێ پێیدا بڕۆی، نەرم بێ و، یەکسان و تەخت بێ، گرێ و گۆڵی تێدا نەبێ، (**صفصف**)یش دەڵێ: زەوییەکی یەکسان، کە هیچ گرێ و گۆڵ و بەرزیی و نزمیی تێدا نیە، یان هیچ ڕووەکی تێدانیە.

٤)- ﴿لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا﴾، نە هیچ خوارو خێچیی و، نە هیچ گردۆلکە و بەرزیی و نزمیی تێدا دەبینی، (**العوج: ضد الإستقامة**)، (**عِوَج**) دژی ڕێکییە، واتە: خوارو

خێچیی و لاریی، (أمت)، بە مانای بەرزایی بچووک، گردۆلکەی بچووک، یان بەرزیی و نزمیی دێ، واتە: نە چاڵاییەکی تێدا دەبینی، نە بەرزاییەک، لەو شوێنەی کە خوا چیایەکانی تێدا وردو خاشکردوون و هاڕیونی، ئەگەر سەیری قورئان بکەین دەربارەی چیایەکان خوا ﷻ چەند تەعبیرێکی جیا جیای بەکارهێناون، کە چیایەکان چیان بەسەر دێ؟

## حاڵی چیایەکان لە دواڕۆژدا، لە پێنج قۆناغ دا کورت هەڵدێ:

**قۆناغی یەکەم:** خوای باڵا دەست لە سوورەتی (**الحاقة**)، ئایەتی (١٤)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً ﴾، واتە: زەوی و چیایەکان هەڵگیران و، یەکجار پێکدادران، دیارە لە ئەنجامی ئەوەدا کە پێک دادەدرێن، وردو خاش و پارچە پارچە دەبن.

**قۆناغی دووەم:** لە سوورەتی (**الكهف**)، ئایەتی (٤٧)دا، خوای بەدیهێنەر دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا ﴾، واتە: ئەو ڕۆژە کە چیایەکان دەڕۆێنین، (واتە: لایان دەبەین، دەیانجووڵێنین و لە شوێنی خۆیان هەڵیاندەکەنین و)، زەوی دەبینی کە هاتۆتە گۆڕێ، (خراوەتە بەرچاو).

هەروەها لە سوورەتی (**الطور**)، ئایەتی (١٠)دا، خوای میهرەبان دەفەرموێ: ﴿ وَتَسِيرُ ٱلْجِبَالُ سَيْرًا ﴾، واتە: ئەو ڕۆژە کە چیایەکان بە ڕۆیشتن دەڕۆن، واتە: لە شوێنی خۆیان هەڵدەقەنرێن.

**قۆناغی سێیەم:** کە لە سوورەتی (**المزمل**)، لە ئایەتی (١٤)دا هاتوە: ﴿ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ وَكَانَتِ ٱلْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا ﴾، واتە: ئەو ڕۆژە کە زەمین و چیایەکان دەلەرزنەوە، بومەلەرزە لێیان دەدات، دەلەرزنەوە، ڕادەشەقێن و، چیایەکان دەبن بە (**كثيب، مهيل**)، (**كثيب**)، لمێکی پێکەوە کۆبووەوەیە، (**مهيل**)، نەرم بە شێوەیەکی وا کە لە بن پێیاندا بڕوا، واتە: ئاوا وردو خاش دەبن و بۆ لمێکی نەرم، دەگۆڕێن.

**قۆناغی چوارەم:** ئەوەیە کە لە سوورەتی **(القارعة)**، لە ئایەتی (٥)دا هاتوە: ﴿وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ﴾، واتە: چیایەکان وەک خوری شکێنراوەیان لێ دێ، ﴿ٱلْمَنفُوشِ﴾، بە کوردیی دەگوترێ: خورییەکە شی دەکرێتەوە، دەشکنرێ و، لە پەرە دەدرێ، ئاوایان لێ دێ.

**قۆناغی پێنجەم:** ئەوەیە کە لە سوورەتی **(الواقعة)**دا هاتوە، کە دەفەرمویٚ: ﴿إِذَا رُجَّتِ ٱلْأَرْضُ رَجًّا ﴿٤﴾ وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ بَسًّا ﴿٥﴾ فَكَانَتْ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا ﴿٦﴾﴾، واتە: ئەو ڕۆژە کە زەوی تێکڕا دەشەقێنرێ و، چیایەکان هەڵدەکەنرێن و، دەبن بە تۆزو گەردی بڵاوبووەوە.

ئەمانە ئەو پێنج قۆناغەن کە خواﷻ باسی ئەو گۆڕانکارییانە دەکات کە بەسەر چیایەکاندا دێن.

## مەسەلەی چوارەم:

باسی قیامەت و زیندووبونەوەو، شوێنکەوتنی خەڵک بۆ دەنگی جاڕدەر، بەبێ لادان و، کش و مات بوون و، ڕێ نەدان بە تکاکردن، مەگەر کەسێک خوا مۆڵەتی بدات و، تکای بەجێ بکات و، باسی زانیاریی بێ سنووری خوا و، ملکەچیی و زەبوونیی هەموولایەک بۆ خواو، بێمرادیی و ڕەنجەڕۆیی ستەمکاران و، بێ باکیی و شادمانیی بڕوادارانی کردار باش:

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ ۖ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴿١٠٨﴾ يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِىَ لَهُۥ قَوْلًا ﴿١٠٩﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ۞ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا ﴿١١٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ ﴾، لەو ڕۆژەدا، واتە: لە ڕۆژی زیندوو کرانەوە و هەڵسانەوەدا، لە ڕۆژی قیامەت و سزاو پاداشتدا، ﴿يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ ﴾، خەڵکەکە، یان ئەوانەی کە ئێستا کە نکووڵیی دەکەن لە زیندوو کرانەوە و، هاتنی ڕۆژی دوایی، ئا ئەوانە شوێن جاڕدەر دەکەون، واتە: بەرەو دەنگی جاڕدەر دەچن، جاڕدەر کێیە؟ ئەو فریشتەیە کە فووی کردوە بە کەڕەنادا، کە لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەردا ﷺ بە **(صاحب القرن)** ناوی هاتوە، خاوەن کەڕەنا، خاوەن قۆچ، کە فووی پێدا دەکات، لە هەندێک شوێنەواراندا بە ئیسڕافیل ناوی هاتوە.

واتایەکی دیکەی: ﴿ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ ﴾، هەر کام لە پێغەمبەران بانگی ئۆممەتی خۆی دەکات، ئنجا ئەوانەش بەرەو ئەو دەنگە دەچن، ئنجا چ لە

دنیادا بڕوایان پێهێنا بێ، چ بڕوایان پێ نەهێنا بێ، گرنگ ئەوەیە لەسەر ئەو پێغەمبەرە حیسابن.

٢)- ﴿لَا عِوَجَ لَهُۥ﴾، واتە: بە نسبەت ئەو دەنگەوە کە بەرەو ڕووی دەچن، هیچ لاریی نیە بۆ ئەوانە کە بەرەو ڕووی دەچن، هیچ خوارە خوارو لارە لار ناکەن، بەو لاو لادا بچن، بانگکراوەکان لە ڕۆیشتنیاندا بەرەو ئەو جاڕدەرو، بانگکەرە، بەو لاو لادا ناچن، لا نادەن، خوارو خێچ نابن، ڕێک بەرەو ڕووی دەچن.

٣)- ﴿وَخَشَعَتِ ٱلۡأَصۡوَاتُ لِلرَّحۡمَٰنِ﴾، دەنگەکانیش بۆ خوای میهرەبان، خوای خاوەن بەزەیی، ملکەچ بوون، دەگوترێ: (**خَشَعَ صوته**)، واتە: دەنگەکەی کپ بوو، (**خَشَعَتْ عينهُ**)، واتە: چاوی مات بوو، زەبوونیی پێوە دیار بوو، (**خَشَعَ وجهه**)، واتە: ڕووی هەڵبزڕکا، (**خَشَعت جوارحُهُ**)، واتە: ئەندامەکانی لە جووڵە کەوتن و ملکەچ بوون.

٤)- ﴿فَلَا تَسۡمَعُ إِلَّا هَمۡسٗا﴾، دەنگەکان وا کەپ و کڕ دەبن، تۆ جگە لە چپە چپ، جگە لە قسەی نزم و پەنهان، هیچی دیکە نابیستی، (**الهَمْسُ: الصوتُ الخَفيُّ**)، دەنگی کپ و قسەی بە چپە.

٥)- ﴿يَوۡمَئِذٖ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُۥ قَوۡلٗا﴾، لەو ڕۆژەدا تکا کردن سوود ناگەیەنێ، واتە: تکاکردنی هیچ کەس سوود ناگەیەنێ، مەگەر کەسێک خوای خاوەن بەزەیی مۆڵەتی بدات و، لە قسەو داوایەکەشی ڕازی بێ و پەسندی بکات.

کەواتە: دوو مەرج هەن:

أ- کەسێک دەبێ خوا مۆڵەتی بدات، ڕێگای بدات، تکا بکات.

ب- پاشانیش ئەو داواو تکایەی کە دەیکات، دەبێ داواو تکایەک بێ لە لای خوا پەسند بێ، کەواتە: هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، بە هەموو جۆرو شێوەکانیانەوە، با ئیمانێ بە نیسکێ نەسپێرن، با خۆیان دەستخەڕۆ نەکەن، بە تەما بن کە هەر کەسێک ڕاست بۆوە، شەفاعەت و تکاو ڕجایان بۆ بکات، وەک دەروێشێک لە وەصفی شێخەکەیدا گوتوویەتی:

بۆیە لە دنیا دەســـتم گــرت وە تۆ

تاکو لە قیامەت، نەمکەی ڕەنجەڕۆ

بۆیـە لـە دنیـادا دەسـتی پێگرتـووەو، دیـارە بـە تەمـای قیامەتییـە! نـا، تـۆ پێشـێ جـارێ دەبـێ شـێخەکەت وابـێ، پێشـڕەو بـێ و، چاوسـاغ بـێ و، پێشـەوا بـێ و، لـە دنیـادا دینداریـی و دنیادارییەکـی سـەر ڕاسـتانەو، ساغ و چاک و پاکـت فێـر بـکات، لـە دنیـادا لێـی بەهرەمەنـد بـی، لـە ڕێبـاز و ڕێ و شـوێنەکەی، کـە ڕێ و شـوێن و ڕێبـازی پێغەمبـەرە ﷺ، ئنجـا لـە قیامەتیشـدا خـوا دەزانـێ ئایا شایسـتەی ئـەوە دەبێ تـکا بـکات بـۆ تـۆ، یـان غەیـری تـۆ، یـان شایسـتە نابێ.

ئـەم ئایەتـە بەرپەرچـی هەمـوو ئەوانـە دەداتـەوە کـە وەک گوتـم: لەخـۆوە خـەون و خەیـاڵ هەڵدەچنـن لەسـەر کەسـانێک کـە بـە تەمـان لـە قیامـەت دەفریایـان بێـن، کـە خـوا دەفەرمـوێ: لـەو ڕۆژەدا تـکای هیـچ کـەس سـوودی نیـە، مەگـەر کەسـێک کـە خـوای خـاوەن بەزەیـی، مۆڵـەتی دابـێ، پاشـان قسـەکەشـی لـە جێـی خۆیـدا بـێ، داواو تکاکردنەکەشـی خـوا پەسـندی بـکات.

لـە ڕووی ڕێزمـانی عەرەبییـەوە دەڵـێ: (**الشَّـفَاعَةُ: مَصْـدَرٌ فِيـهِ مَعْنَـى الفِعْـلِ، فَيَقْتَـضِي فَاعِـلاً، أي إلاَّ أَنْ يَشْـفَعَ مَـنْ أَذِنَ لَـهُ الرحمـن أن يَشْـفَع**)، وشـەی (**شـفاعة**)، واتـە: تکاکـردن، چاوگـەو مانـای کـرداری تێـدا هەیـە، بۆیـە بکەرێـک دەخـوازێ، کـە دەفەرمـوێ: ﴿لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾، واتـە: مەگـەر کەسـێک شـەفاعەت و تـکا بـکات، کـە خـوای خـاوەن بەزەیـی مۆڵـەتی داوە، تـکا بـکات، پاشـان قسـەکەشی پەسـند بـکات، کەواتە:

**یەک:** دەبێ شەفاعەت و تکاکەرەکە مۆڵەتدراو بێ.

**دوو:** دەبێ تکاکردنەکەشی پەسندکراو بێ.

هەڵبەتـە ئێمـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (یونـس)دا، بـە تەفصیـل باسـی شـەفاعەت و تـکای پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـم الصَّـلاةُ وَالسَّـلام**)و، فریشـتەکان و، قورئـان و، دۆسـتانی خـوا و زانایانمـان کـرد، هـەر کەسـە لـە قـەدەر خـۆی لـە قیامەتـدا.

٦)- ﴿ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ ﴾، واتە: (خوا) ئەوەی لە پێش دەستیانەو ئەوەی لە دوایانە، دەیزانێ، ئەمە چەند واتایەکی هەن:

١- ڕابردوو و داهاتوویان دەزانێ.

٢- داهاتوو و ڕابردوویان دەزانێ.

٣- ڕواڵەت و پەنهانیان دەزانێ.

٤- دەشگونجێ: ﴿ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ ﴾، واتە: ئەوەی کە پەنهانە و جارێ نەهاتوە، ﴿ وَمَا خَلۡفَهُمۡ ﴾، واتە: ئەوەی کە ئاشکرایە و بەجێیان هێشتوە.

٥- هەموو شتێکیان دەزانێ، چ لە پێش دەستی مرۆڤەوە و لە پشتیەوە، یانی: هەرچی لە دەوریانە، هەموو حاڵ و باڵیان دەزانێ.

٧)- ﴿ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلۡمٗا ﴾، بەڵام ئەوان زانیارییان دەوری خوا نادات، یان ئەوان ناتوانن هەموو زانیاریی خوا، یان هەموو زاندراوەکانی خوا بزانن، کەواتە: ﴿ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلۡمٗا ﴾، ئەم: ﴿ بِهِۦ ﴾، بۆ خوای بێ وێنە دەگەڕێتەوە، واتە: زاتی خوا، وەک خۆی بزانن، نەک خوا بناسن، خوا ناسین، شتێکی بەڵگە نەویستە، خوا مرۆڤەکانی وا خوڵقاندوون، بەڵکو هەموو دروستکراوەکانی خۆی وا دروستکردون، کە خاوەنی خۆیان بناسن و بزانن، بەڵکو بە پاکی بگرن و ستایشی بکەن، ﴿ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ٤٤ ﴾**الإسراء**، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە، کە دەوری خوا بدەن، یان دەوری زانراوەکانی خوا و زانیاریی خوا بدەن.

٨)- ﴿ وَعَنَتِ ٱلۡوُجُوهُ لِلۡحَيِّ ٱلۡقَيُّومِ ﴾، هەروەها ڕووەکان بۆ زیندووی مشوورخۆر، زیندووی سەرپەرشتییکار، ملکەچ بوون، تەسلیم بوون، (**عَنَت: أَي ذَلَّتْ وَخَضَعَت، خضُوع العُنَاةِ وهي الجمع العاني، أي الأسرى**)، ملکەچ بوون، زەبوون بوون، وەک چۆن دیلەکان زەبوون دەبن، چونکە (**عناة**) کۆی (**عاني**)یە، (**عاني**)، واتە: دیل، ئەسیر، کەسێک کە دیل دەکرێ، بەدڵنیاییەوە، بێ دەسەڵات دەبێ، ئەوانیش بەو شێوەیە، ڕووەکان بۆ خوای

هەمیشە زیندووی سەرپەرشتییکار، ئاوا لە ڕۆژی دواییدا زەبوون و داماو و دەستەمۆ دەبن.

٩)- ﴿وَقَدۡ خَابَ مَنۡ حَمَلَ ظُلۡمٗا﴾، پەشێمان و ڕەنج بەخەسارە، کەسێک کە ستەمی هەڵگرتوە، (الخَيْبَةُ: الحِرْمَانُ وَاليَأْس)، (خَيْبَة) بریتیە لە بێ بەشیی و نائومێدیی.

١٠)- ﴿وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ﴾، هەر کەسێکیش کردەوە باشەکان ئەنجام بدات، لە حاڵێکیشدا کە بڕوادارە.

١١)- ﴿فَلَا يَخَافُ ظُلۡمٗا وَلَا هَضۡمٗا﴾، بابای وا: نە لەستەم دەترسێ و نە لە لێکەمکرانەوە دەترسێ، (هَضْمَاً أَي: نَقْصَاً)، هەندێکیش گوتوویانە: (ظُلْمَاً: النَّقْصُ الشَّدِيدُ، هَضْمَاً أَي: بَعْضُ النَّقْصِ)، واتە: (ظُلْم) لێکەمکردنەوەی توندو، (هَضْم) لێکەمکردنەوەی کەمە، بەڵام واپێدەچێ ئەو مانایە ڕاستتربێ، کە لەوە ناترسێن، سزا بدرێن لەسەر کردەوەیەکی خراپ کە نەیانکردوە، هەروەها ناشترسێن کە پاداشتی کردەوەی چاک کە کردوویانە، لێیان کەم بکرێتەوە، بەڵکو سزاو پاداشتی پڕ بە پێست دەدرێن.

## مەسەلەی پێنجەم و كۆتایی:

**باسی دابەزێنرانی قورئان بە زمانی عەرەبیی و، جۆراو جۆركردنی هەڕەشە و ترساندنی بێبڕوایان، بە هیوای پارێزكاریی و یادەوەریی تێدا پەیداكردنیان و، باسی پایەی بەرزی خواو، ئامۆژگاریی كردنی پێغەمبەر ﷺ كە لە كاتی وەرگرتنی قورئاندا لە جیبریل، پەلە پەل نەكات و، لە خوا داوا بكات زانیاریی بۆ زێدە بكات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ۗ وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ ۖ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴿١١٤﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا ﴾، بەو شێوە دابەزێنرانە، قورئانێكی عەرەبییمان دابەزاند، كە وێنەی نیە، مەگەر بە خۆی بچوێنرێ، ئەگەرنا هاووێنەیەكی نیە لەگەڵیدا بەراورد بكرێ و، بەو بچوێنرێ، بەو شێوەیە قورئانێكی عەرەبییمان، واتە: بە زمانی عەرەبیی بۆمان دابەزاندووی، دەشگونجێ قورئان لێرەدا ناوی قورئان نەبێ، بەڵكو بەمانای (**مقروء**) بێ، واتە: خوێنراوەیەک كە بە عەرەبیی دەخوێنرێتەوە، چونكە قورئان بە مانای (**مقروء**)ە، فەرمایشتێكە كە بە عەرەبیی دەخوێنرێتەوە، بۆمان دابەزاندووی.

٢)- ﴿ وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ ﴾، هەڕەشەشمان تێدا جۆراوجۆر كردوە، (**التَّصْرِيفُ: التَّنْوِيعُ والتَّفْنِين**)، واتە: بە شێوەی جۆراوجۆرو، بە شێواز و دەربڕینی جۆراوجۆر، هەڕەشەمان تێدا خستۆتە ڕوو، بۆ مرۆڤەكان بە گشتیی، یان بۆ بێبڕوایان بە تایبەت.

٣)- ﴿ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾، بەڵكو پارێز بكەن، (لعل)، بۆ ئومێدەوار بوونە، بۆیە پەیوەندیی بەوانەوە هەیە، ئومێد وایە كە خوای بە بەزەیی بۆیە ناردوویەتی، كە ئەوان ئەو ئومێدو هیوایە بێننە دی.

٤)- ﴿أَوۡ يُحۡدِثُ لَهُمۡ ذِكۡرٗا﴾، یان ئەگەر نەشیانکاتە پارێزکار، پارێزکارییشیان تێدا پەیدا نەکات، بەلای کەمەوە: هاتنەوە بیرو هۆشیاربوونەوەیان تێدا پەیدا بکات، (**يُوجِدُ فِيهِمُ التَّذَكُّرَ لِلْحَقَائِقِ الفِطْرِيةِ المَرْكُوزَةِ فِي قُلُوبِهِم**)، هاتنەوە بیری ئەو ڕاستییە خوارِسکانەی کە لە دڵ و دەروونیاندا داکوتراون، ئەوەیان تێدا پەیدا بکات.

دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ کە ئەو خەڵکە دوو بەشن:

١- بەشێکیان جارێ نەهاتوونە نێو بازنەی ئیسلامەوە، ئەوانەیان بەڵکو ئەو قورئانە پارێزکاریی و خۆ پاراستنیان لە کوفرو شیرک و نیفاق تێدا پەیدا بکات.

٢- ئەوانەشیان کە هاتوونە نێو بازنەی هیدایەتەوە، خوای پەروەردگار هۆشیاریی و بێداریی، زیاتریان بە هۆی قورئانەوە تێدا پەیدا بکات.

دەشگونجێ مەبەست بڕواداران بێ:

١- ئەوانە کە هۆشیارو بێداربوونەوە، وێڕای هۆشیاریی و بێداریی سیفەت و خەسڵەتی تەقواشیان تێدا پەیدا بکات.

٢- ئەوانەشیان کە بێدارن، یان ئەهلی تەقوان، هۆشیاریی و بێداریی زیاتریان تێدا پەیدا بکات.

٥)- ﴿فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۗ﴾، بەرزە خوای حوکمڕانی هەق، خوای حوکمڕانی چەسپاو، یانی: (**لِلهِ العُلُو المُطْلَق، وَهُوَ الحَقّ المُطْلَقُ بِخِلَافِ الملوك**)، بەرزیی ڕەها بۆ خوا کە هەقی ڕەهایە، پێچەوانەی دەستەڵاتدارانی دیکە، کە بە ناهەق زۆرجار خۆیان دەسەپێنن و، حوکمڕانییەکی ناهەق دەکەن.

٦)- لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مِن قَبۡلِ أَن يُقۡضَىٰٓ إِلَيۡكَ وَحۡيُهُۥ﴾، پەلەش مەکە لە قورئاندا بەرلەوەی کە سروشکردنەکەی بۆ تۆ تەواو ببێ، دیارە ئەمە بە شێوەی دیکەش خوێنراوەتەوە: (**مِنْ قَبْلِ أنْ نَقْضِي إِلَيْكَ وَحْيَهُ**)، بەرلەوەی کە سروشکردنەکەی بۆ تۆ تەواو بکەین.

٧)- ﴿ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴾، بڵێ: پەروەردگارم! زانیارییم بۆ زیاد بکە، واتە: بەردەوام بە لەسەر داواکردنی زێدە بوونی زانیاریی لە خوای پەروەردەکەرو، بەخێوکەرو، مشوورخۆری خۆت.

## لەنێوان پەلە کردن و خێرایی کردن دا:

لێرەدا پێویستە بزانین کە پەلەکردن جیایە لە خێرایی کردن، چونکە پەلەکردن ئەوەیە کە شتێک لە کاتی خۆیدا نەبێ، بۆیە گوتراوە: (**مَنْ اسْتَعْجَلَ الشَّيْءَ قَبْلَ أَوَانِهِ، عُوقِبَ بِحِرْمَانِهِ**)، واتە: هەر کەسێک پەلە بکات لە وەدیهێنانی شتێکدا، پێش کاتی خۆی، بە بێبەشکرانی سزا دەدرێ.

بەڵام (**سرعة**)، خێرایی ئەوەیە کە شتێک کە کاتی خۆی دێ، خێرایی بکەی، دەستگەرمیی بکەی لە جێبەجێکردنیدا، بۆیە خوا فەرمانی کردوە بە خێرایی کردن، وەک لە ئایەتی (١٣٣)ی سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾، واتە: خێرایی بکەن بەرەو لێبوردنێک لە پەروەردگارتانەوە.

هەروەها لە سووڕەتی (**المؤمنون**)دا دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْخَيْرَٰتِ وَهُمْ لَهَا سَٰبِقُونَ ﴿٦١﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی کە خێرایی دەکەن لە ئەنجامدانی چاکەکاندا.

بەڵام ڕێگریی کردوە لە پەلە پەلکردن، وەک فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ ﴾.

زانایان سێ واتایان بۆ ئەم ڕستەیە لێکداوەتەوە: ﴿ وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ ﴾:

١- (**لا تستعجل إنزال المزيد من القرآن حِرصاً منك على إصلاحِ الناس**)، واتە: پەلە مەکە لە دابەزێنرانی قورئانی زیاتر بە هۆی مکووڕبوونتەوە، لەسەر چاککردنی خەڵک.

٢- (**لا تعجل بقراءة القرآن حال إلقاء جبريل آياته إليك**)، واتە: لە خوێندنی قورئاندا پەلە پەل مەکە، لە کاتێکدا کە جیبریل ئایەتەکانی بۆ تۆ دێنێ.

٣- لە (مجاهد وقتادة)ەوە هاتوە، گوتوویانە: (لَا تَعْجَلْ بِقِرَاءَةِ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ لِأَصْحَابِكَ وَلَا تُمْلِهِ عَلَيْهِمْ حَتَّى تَتَبَيَّنَ لَكَ مَعَانِيهِ)، واتە: ئەو قورئانەی کە خوا بۆ لای تۆ دایبەزاندوە، پەلە مەکە لە خوێندنەوەی بۆ هاوەڵانت و بەسەریاندا مەیخوێنەوە، تاکو تەواو مانا و مەبەستەکانی بۆ تۆ ڕۆشن دەبنەوە، لە ئەنجامی بیرکردنەوەی خۆت، یان لە ئەنجامی ئیلهامکردن و خورپە بۆ کران لەلایەن خوای پەروەردگارەوە.

## لەو بارەوە با ئەو دوو فەرموودەیە بێنین:

١)- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُبَادِرُ جِبْرِيلَ فَيَقْرَأُ قَبْلَ أَنْ يَفْرُغَ جِبْرِيلُ حِرْصاً عَلَى الْحِفْظِ، وَخَشْيَةً مِنَ النِّسْيَانِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ وَلا تَعْجَلْ بِالْقُرْآنِ، الْآيَةَ: ﴿وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ﴾}[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێک جیبریل قورئانی بەسەردا دەخوێندەوە، پەلەی دەکرد بەرلەوەی جیبریل لێ بێتەوە، لە ئەنجامی سوور بوونی دا لەسەر ئەوە کە لەبەری بکات و، لە ترسی ئەوە کە لە بیری بچێتەوە، بۆیە خوا ئەم ئایەتەی فەرموو: ﴿وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ﴾، پەلە مەکە لە خوێندنی قورئاندا، بەرلەوەی کە سروشکردنەکەی بۆ تۆ تەواو بێ.

٢)- {عَنْ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُعَالِجُ مِنَ التَّنْزِيلِ شِدَّةً، وَكَانَ مِمَّا يُحَرِّكُ شَفَتَيْهِ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَأَنَا أُحَرِّكُهُمَا لَكَ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُحَرِّكُهُمَا، وَقَالَ سَعِيدٌ: أَنَا أُحَرِّكُهُمَا كَمَا رَأَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ يُحَرِّكُهُمَا، فَحَرَّكَ شَفَتَيْهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ﴾، ﴿إِنَّ عَلَيۡنَا جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ﴾، قَالَ: تَجْمَعُهُ فِي صَدْرِكَ وَنَقْرَؤُهُ ﴿فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ﴾، قَالَ: فَاسْتَمِعْ لَهُ وَأَنْصِتْ: ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا بَيَانَهُۥ﴾، ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا أَنْ نَقْرَأَهُ، قَالَ: فَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَعْدَ ذَلِكَ إِذَا أَتَاهُ جِبْرِيلُ اسْتَمَعَ، فَإِذَا انْطَلَقَ جِبْرِيلُ، قَرَأَهُ النَّبِيُّ ﷺ كَمَا قَرَأَهُ}، (أخرجه البخاري: ٥، ومسلم: ٤٤٨).

---

(١) التحرير والتنوير ج١٦، ص٣١٧.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک کە قورئانی بۆ دادەبەزێنرا، زۆر ماندوو دەبوو، زۆر ناڕەحەت دەبوو، بۆیە دوو لێوەکانی خۆی دەجووڵاندن، [ بۆیە ئەو ڕاوییە کە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی دەگێڕێتەوە دەڵێ:] عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، گوتی: من لێوەکانی خۆم دەجووڵێنم وەک چۆن پێغەمبەری خوام ﷺ دەبینی لێوەکانی خۆی دەجووڵاندن (ئاوا بە پەلە پەل)، سەعید گوتی: منیش لێوەکانی خۆم دەجووڵێنم وەک چۆن عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسم بینی لێوەکانی خۆی دەجووڵاندن، بۆیە خوای زاڵی پایە بەرز ئەو ئایەتانەی ناردنە خوارەوە [لە سوورەتی (القيامة)دا، ئایەتەکانی: (١٦ و ١٧ و ١٨ و ١٩)]، ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ﴾، زمانتی پێ مەجووڵێنە تاکو پەلەی لێ بکەی، لە وەرگرتنی قورئان، یان لە خوێندنی، ﴿إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ﴾، بێگومان کۆکردنەوەی قورئان و خوێندنەوەی قورئان ئەرکی ئێمەیە، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: واتە: کۆکردنەوەی لە سینەتدا، دوایی دەیخوێنیەوە وەک خوا دایبەزاندوە، ﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ﴾، ئنجا هەر کاتێک خوێندمانەوە، شوێن خوێندنەوەکەی بکەوە، واتە: گوێ هەڵخە و بێ دەنگبە، ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ﴾، دواییش لەسەر ئێمەیە بۆت ڕوون بکەینەوە، دەڵێ: دوای ئەوە کە جیبریل دەڕۆیی، پێغەمبەری خوا ﷺ وەک چۆن جبریل پێی خوێند بوو، ئاوا دەیخوێندەوە.

## لەکۆتایی ئەم دەرسەدا دەڵێین:

٧)- کە دەفەرموێ: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا﴾، هەروەها بڵێ: پەروەردگارم! زانیاریم بۆ زیاد بکە، واتە: بەردەوام لە وەرگرتنی زانستدا، داوا لە پەروەردگارت بکەو لێی بپاڕێوە کە زانیارییت بۆ زیاد بکات، پێشتریش گوتمان: ﴿عِلْمًا﴾، بە (**نكرة**)، هاتوە، واتە: زانیارییەکی گەورە، زانیارییەکی شایستە، کە دەگونجێ مەبەست پێی زانیاریی (نقل) بێ، کە لە وەحییەوە سەرچاوە دەگرێ، یان مەبەست زانیاریی عەقڵ بێ، کە تێگەیشتنی مرۆڤە زیاتر

لە دەقەکانی وەحیی، دەشگونجێ مەبەستی پێ ئەو زانیارییە بێ کە بە پێنج هەستەکان و بە ئەزموون پەیدا دەکرێ، دەشگونجێ لە یەک کاتدا مەبەست هەموو ئەوانە بێ، پەروەردگارم! زانیاریم بۆ زیاد بکە، بە مانای فراوانی وشەی زانیاریی، چ پەیوەندیی بە وەحییەوە هەبێ، چ بە عەقڵ، چ بە ئەزموون، چ بە مێژوو، چ بە هەر کام لە جۆرو بەشەکانی زانیاریی، خوایە بەگشتی زانیاریم بۆ زیاد بکە!

ئێمەش دەڵێین: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾، پەروەردگارم! زانیاریم بۆ زیاد بکە، بەڵام زانیارییەک کە سوودمان پێ دەگەیەنێ، وەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {أَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ، وِمِنْ دُعَاءٍ لاَ يُسْمَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لاَ تَشْبَعُ، وَمِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ} (أخرجه أحمد برقم: ١٩٤٢١، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح لغيره)، واتە: ئەی خوایە! پەنا بە تۆ دەگرم لە دڵێک کە ملکەچ نیە بۆ تۆو، لە نەفسێک کە تێر نابێ و، لە دوعایەک کە نابیسترێ و گیرا نابێ و، لە زانیارییەک کە سوود ناگەیەنێ.

بێگومانیش زانیارییەک کە سوود بە خاوەنەکەی نەگەیەنێ ئەو زانیارییە یە کە کاری پێ ناکات، خۆی پێ پاک و چاک ناکات.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان سێزدە (١٣) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەكانی: (١١٥ - ١٢٧)، كە ئەم سێزدە ئایەتە هەموویان تەرخانكراون بۆ بەسەرهاتی ئادەم و حەووای هاوسەری (علیهما السلام)، لە لایەكەوە، ئیبلیسی نەفرین لێكراو لە لایەكی دیكەوە، كە ئیبلیس نەفرینی خوای لێ بێ و لێ بووە، ئادەم و حەووای فریوداون و، لە درەختە قەدەغە كراوەكەیان خواردوە، بە هۆی دنەدان و لەخشتە بردنی ئیبلیسەوەو، سەرەنجام حوكمی دەركران لە بەهەشت و ئاسمانیان، بەسەردا دراوەو تووشی ژیانی پڕ ڕەنج و میحنەت و زەحمەتی سەر زەوی كراون.

پاشان خوای زانا و كارزان، باسی ئاكامی باشی شوێنكەوتنی ڕێنمایی خواو، سەرەنجامی شوومی لادەران لە بەرنامەی خوای خستۆتە ڕوو، كە لە دنیادا ژیانی تەنگ و تاڵ و، لە قیامەتیشدا بە كوێریی حەشر كرانە، ئا ئەوە بەشێكی ئەو سەرەنجامە شوومەیە كە لە لادان لە بەرنامە و پەیامی خوا، پەیدا دەبێ.

﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِىَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ ﴿١١٦﴾ فَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَـٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴿١١٩﴾ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَـٰنُ قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجْتَبَـٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ

﴿فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَـٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِۦ ۚ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها بە دڵنیایی پێشتریش ئادەممان ڕاسپارد (بەڵێنمان لێ وەرگرت) کەچی لە بیری چوو و، ویستی پتەومان لێی چەنگ نەکەوت ﴿١١٥﴾ یادیش بکەوە کاتێک بە فریشتانمان فەرموو: کڕنووش (ی ڕێزگرتن) بۆ ئادەم ببەن، یەکسەر کڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس لاملیی کرد ﴿١١٦﴾ ئنجا گوتمان: ئەی ئادەم! ئەم (ئیبلیس)ە، دوژمنی خۆت و دوژمنی هاوسەرەکەتە، (ئنجا وریا بن!) لە بەهەشتێ وەدەرتان نەنێ، چونکە سەرەنجام نارەحەت و گرفتار دەبن (لە ژیانی سەر زەمیندا) ﴿١١٧﴾ (ئێستا ئێوە لە بەهەشتدا، ژیان و گوزەرانێکی خۆشتان هەیە)، بێگومان بۆت هەیە کە تێیدا برسیی نەبی و ڕووت نەبی ﴿١١٨﴾ هەروەها لەوێدا نە تینووت دەبێ، نە گەرمات دەبێ ﴿١١٩﴾ کەچی شەیتان خوتخوتەی بۆ لا کرد، (دنەی دا)، گوتی: ئەی ئادەم! ئایا درەختی هەر مانت پێشان بدەم و، هەبوونێکی لە بن نەهاتووت بخەمە بەرچاو! ﴿١٢٠﴾ (ئیدی ئەو درەختەی پێشانی دابوو) لێیان خوارد، یەکسەر عەورەتیان دەرکەوت و دەستیان کرد بە بە خۆوە چەسپاندنی گەڵای (درەختەکانی) بەهەشت (بە مەبەستی عەورەتی خۆداپۆشین)و ئادەم سەرپێچیی لە پەروەردگاری کردو بێمراد بوو، بێ ئاکام بوو، (لەو ئامانجەی لەبەرچاوی گرتبوو بۆ لێخواردنی درەختە قەدەغەکراوەکە، کە هەر بمێنێ و موڵکێکی لە بن نەهاتووی چەنگ بکەوێ) ﴿١٢١﴾ پاشان پەروەردگاری هەڵیبژارد (بۆ پێغەمبەرایەتیی و) تەوبەی لێوەرگرت و، ڕێنمایی

کرد ﴿١٢٢﴾ (خوا) فەرمووی: ئەو بەهەشتەی تێیدان هەردوولاتان لێی دابەزنە خوار، هەندێکتان دوژمنی هەندێکتان دەبن (لە ژیانی سەر زەمیندا)، ئنجا هەر کات لەمنەوە ڕێنماییتان بۆ هات بە پێغەمبەراندا، هەر کەس شوێن ڕێنماییەکەم بکەوێ، نە گومڕا دەبێ و نە گرفتار ﴿١٢٣﴾ هەر کەسێکیش ڕوو لە یادو بەرنامەی من وەرچەرخێنێ، ژیان و گوزەرانێکی تەنگ و تاڵی دەبێ، لە ڕۆژی قیامەتیش بە کوێریی کۆیدەکەینەوە ﴿١٢٤﴾ [ئەو کەسە کە بە کوێریی حەشر دەکرێ]، گوتی: پەروەردگارم! من (لە دنیادا) بینەر بووم، بۆچی بە کوێریی کۆتکردوومەوە؟ ﴿١٢٥﴾ (خوا) فەرمووی: وەک چۆن نیشانەکانمت بۆ هاتن و فەرامۆشت کردن، ئەمڕۆش هەر بەو شێوەیە، تۆ لەبیر دەکرێی ( و پشتگوێ دەخرێی) ﴿١٢٦﴾ بەم شێوەیەش [کە خرایە] ڕوو سزای کەسێک دەدەین، کە زێدەڕۆیی و سنوور شکێنیی کردووە، بڕوای بەنیشانەکانی پەروەردگاری نەهێناوەو، سزا و ئازاری دوارۆژیش سەختترو بەردەوامتریشە ﴿١٢٧﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(عَهِدْنَآ): (العَهْدُ: الوَصِيَّةُ، عَهِدَ إِلَيْهِ يَعْهَدُ، إِذَا أَوْصَاهُ، وَعَهِدْتُ إِلَيْهِ بالأَمْرِ: قَدَّمْتُهُ، وَالعَهْدُ: الأَمَانُ والمَوْثِقُ والذِّمَّةُ، كَمَا عَهِدتَ كما عَرَفْتَ، عَهِدتهُ مِكان كذَا: لَقيتُهُ)، وشەی (عَهِدَ)، بەپێی ئەو سیاقانەی کە تێیان دادێ، ماناکەی دەگۆڕێ: (عَهْد) بە مانای پەیمان و بەڵێن دێ، بەڵام (عَهِدَ إليه)، واتە: ڕایسپارد، وەسیەتی بۆی کرد، ئامۆژگاریی کرد، (وَعَهِدْتُ إِلَيْهِ بالأَمْرِ)، واتە: ئەو کارەم بۆ پێشخست، خستمە بەر دەمی، (عهد) بە مانای دڵنیاکردنەوە دێ، بە مانای بەڵێنی پتەو دێ، بە مانای ئۆباڵیش دێ، پەیمان و ئۆباڵ، (كَمَا عَهِدتَ)، یانی: وەک تۆ زانیوتە، (عَهِدتهُ مِكان كذَا)، یانی (لَقِيتهُ) پێی گەیشتم لە فلان شوێنە!.

(عَزْمًا): (عَزَمَ عَلَى الشَّيءِ: عَقَدَ ضَمِيرَهُ عَلَى فِعْلِهِ، عَزَمَ عَزِيْمَةً وَعَزْمَةً: اجتهدَ وَجَدَّ فِي أَمْرِهِ)، (عَزَم عَلَى الشيء) یانی: دڵی خۆی چەسپاند لەسەر ئەنجامدانی، (عَزم عَزِيْمَةً وَعَزْمَةً)، واتە: خۆی کۆششی کردو، لە کارەکەی خۆیدا ڕووی ویستی خۆی لەو کارە کرد، کە دەیەوێ ئەنجامی بدات، دڵی خۆی بۆ ساغ کردەوە، لە کوردییشدا دەڵێین: عەزمی لەسەر جەزم کرد.

(تَضْحَىٰ): (ضَحَى يَضْحَى: تَعَرَّضَ للشَّمْسِ، وَلاَ تَضْحَى أي: لَكَ أَنْ تَتَصَوَّن من حَرِّ الشَّمْسِ)، (ضَحَى يَضْحَى) واتە: کەوتە بەر خۆر، کەواتە: (ولا تضحى)، واتە: بۆت هەیە کە پارێزراو بی لە گەرمایی خۆر، یانی: گەرمات نابێ.

(فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ)، واتە: دنەدانی بۆلا کرد، هاندانی بۆلا کرد، خوتخوتەی بۆلا کرد، (الوَسْوَسَةُ: الخَطْرَةُ الرَّديئةُ وأصلهُ مِنَ الوسواس، وَهُوَ صَوْتُ الحُليِّ والهَمْسُ الخَفِيُّ)، (وَسوسَة): دنەدانی خراپە، شتێک کە بکەوێتە دڵت، بەڵام خراپ بێ، شت بە دڵداهاتنێکی خراپ، ڕیشەکەشی لە (وسواس)ەوە هاتوە، کە بە دەنگی خشڵ دەگوترێ، هەروەها بە چپەیەکی پەنهان دەگوترێ.

(ٱلْخُلْدِ)، (الخُلودُ: تَبرِّي الشَّيءِ مِنْ اعْتِرَاضِ الفَسَادِ وَبقاؤُهُ على الحالةِ التي هو عليها)، (خُلْد) کە چاوگە واتە: ئەوە کە شتێک لەوە کە تێکچوونی بەسەر دابێ، پارێزراو بێ و، لەسەر ئەو حاڵەتەی کە هەیەتی بمێنێتەوە، واتە: هەرمان، بەردەوام بوون.

(لَّا يَبْلَىٰ)، واتە: نارزێ، لە بەین ناچێ، تەواو نابێ، نابڕێ، (بليَ الثَّوْبُ بَلَىً وبلاَءً: خَلَق)، واتە: بەرگەکە شڕ بوو، پۆشاکەکە شڕ بوو، کۆن بوو، کە شڕو کۆن بوو، فڕێ دەدرێ، (بَلَوْتُهُ: أي اختبرتهُ كأني أَخْلَقْتُهُ مِن كثرةِ اختباري لَهُ)، (بَلَوْتُهُ) یانی: تاقیمکردەوە، جەڕباندم وەک بڵێی: شڕم کردوە هێندەی تاقی بکەمەوە، شەق و شڕ بووە.

(وَطَفِقَا): واتە: هەردووکیان خەریک بوون، (طَفِقَ يَفْعَلُ كَذَا: أَخَذَ يَفْعَلُ كَذَا،

**وَيُستَعْمَلُ فـي الإيجابِ دونَ النَّفي**)، ﴿يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ وَطَفِقَا﴾، دەستیان کرد بە خۆ وەچەسپاندنی گەڵای باخەکە، (**طفقا**)، تەنیا بۆ حاڵەتی ئەرێنیی بەکاردێ، بۆ حاڵەتی نەرێنیی بەکارنایەت.

(يَخْصِفَانِ): (**خَصَفَ العُريانُ الوَرقَ عَلَى بدنهِ: أَلْزَقَهُ بِهِ**)، بابای ڕووت گەڵاکانی بە جەستەی خۆیەوە چەسپاندن، (**والخصفة: قطعة مما تُخْصفُ بهِ النَّعْلُ**)، (**خصفة**)، واتە: پینە، پارچەیەکە لەوەی کە پێڵاوی پێ پینە دەکرێ، یان بەرگێکی پێ پینە دەکرێ.

(فَغَوَىٰ): (**الغيُّ: جَهْلٌ مِنْ اعْتِقادٍ فَاسِدٍ**)، (**غَيٌّ**) نەفامییەکە کە لە بڕوا پێ بوونێکی هەڵەو خراپەوە پەیدا دەبێ.

بەڵام پێم وایە: ﴿فَغَوَىٰ﴾، یانی: بێ بەخت بوو، یان ڕەنج بە خەسار بوو، چونکە وەک (**راغب الأصفهاني**) دەڵێ: (**غَوَى: أي فَسَدَ عَيْشُهُ**)، ژیان و گوزەرانی تێکچوو، وەک جاری دیکەش باسمان کردوە، (**غي**)، لە ئەنجامی (**ضلال**)دا پەیدادەبێ، ئەگەر کەسێک گومڕا بوو، بە مراد ناگات، بە ئامانج ناگات، بێ ئاکام دەبێ، دەستخەڕۆ دەبێ، هەروەک (**رُشد و رَشَد**) لە (**هدى**) و هیدایەتەوە پەیدا دەبێ، کەسێک بەڕێیە بزانێ، بە ڕێی ڕاستدا بڕوا، دیارە سەر ڕاست دەبێ و بە ئامانج دەگات.

(ضَنكًا): (**أي: ضَيْقاً ضَنَكَ عَيْشُهُ أي: ضَاقَ**)، (**ضَنْك**)، بە مانای تەنگ و تاڵ دێ، (**ضَنَكَ عَيْشُهُ**)، واتە: ژیانەکەی تەنگ بوو، ناڕەحەت بوو، ئنجا شتێک کە تەنگ بێ، مرۆڤ پێی ناڕەحەتە، هەروەک لە شیعرێکدا هاتوە:

پای پەتیم خاسەن جە پێڵاوی تەنگ
تەنیایم خاسەن، جە یانەی وە جەنگ

یانی:

پێ خواسیم باشترە لە پێڵاوی تەنگ
تەنیاییم پێ باشترە لە ماڵی پڕ جەنگ

## مانای گشتیی ئایەتەکان

ئێمە لە سەرەتای سوورەتی (**الأعراف**)ەوە، باسی بەسەرهاتی ئادەم و حەووا (**علیهما السلام**)، لەلایەک و، ئیبلیس نەفرینی خوای لێ بێ، لە لایەکی دیکەوە، بە تەفصیل لەوێ باسمان کردووە، هەموو ئەو ئایەتانەی لە هەموو سوورەتەکاندا هاتوون، لەوێ کۆمان کردوونەتەوەو، شیکردنەوەیەکی باشمان لەسەر کردوون، بۆیە ئێستا بە خێرایی مانای گشتیی ئەم ئایەتانە دەکەین و، درێژە و وردەکارییەکانی لە سەرەتای سوورەتی (**الأعراف**)دا هاتوون، بەسەرهاتی ئادەم و حەووا سەلامی خوایان لێ بێ و، ئیبلیس نەفرینی خوای لێ بێ.

﴿ وَلَقَدۡ عَهِدۡنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبۡلُ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە پێشتر ئادەممان ڕاسپارد بوو، وەصیەتمان بۆ کردبوو، ئامۆژگارییمان کرد بوو، دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ کە پەیمانمان لێ وەرگرتبوو، پێشتر واتە: پێش ئەوەی کە ئیبلیس زەفەریان پێ بەرێ، یاخود پێشتر واتە: پێش ئەو بەسەرهاتە، پێشتر خوا بە ڕەهایی فەرموویەتی، گرنگ ئەوەیە کە پێش ئەوەی ئادەم و حەووا گیرۆ دەبن بە وەسوەسە و دنەدانی ئیبلیسەوەو، کڵاویان لەسەر بنێ و، هەڵیان بخەڵەتێنێ، خوا ئاگاداری کردبوونەوە، ئامۆژگاریی کرد بوون و وەصیەتی بۆ کرد بوون، ﴿ فَنَسِيَ وَلَمۡ نَجِدۡ لَهُۥ عَزۡمٗا ﴾، بەڵام لە بیری چوو و، ویست و بڕیارێکی پتەومان لە لای وی چەنگ نەکەوت، واتە: لەو هەڵوێستەیدا، ئادەم خاوەن ویستێکی پتە وو دڵێکی دامەزراو نەبوو.

هەڵبەتە ئادەم سەلامی خوای لێ بێ، پێش ئەوەی ببێتە پێغەمبەر، وەک مرۆڤێکی ئاسایی بووە، هەر بۆیەش ئیبیلس توانیویەتی هەڵیبخەڵەتێنێ و، تووشی ئەو گوناهو لادانەی بکات.

ئنجا دێتە سەر باسی بەسەر هاتەکەو دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ ﴾، یاد بکەوە! کاتێک بە فریشتەکانمان فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم ببەن، واتە: کڕنووشی ڕێزگرتن، سڵاوی لێ بکەن، ﴿ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ ﴾، هەموویان کڕنووشیان بۆ برد، کڕنووشی ڕێزگرتن، جگە لە ئیبلیس، ئەو ئامادە نەبوو، لاملیی کرد، لە شوێنەکانی دیکە خوای بەرزی تاک وتوێژی لەگەڵ ئیبلیسدا کردوە، کە بەهانەت چییە، بیانوو و پاساوت چییە، کڕنووش بۆ ئادەم نابەی؟ ئەویش بیانوو و پاساوی خۆی بەیان کردوەو، لە شوێنەکانی دیکەدا درێژەکەی هاتوە، بۆیە وەک گوتمان: چی لێرەدا هاتوە، بە کورتیی مانای ئەوە دەکەین، بەڵام وردەکارییەکانی لە سەرەتای سوورەتی (**الأعراف**)دا هاتوون: ﴿ فَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ ﴾، گوتمان: ئەی ئادەم! ئا ئەمە (واتە: ئەو ئیبلیسە) دوژمنە بۆ خۆشت و بۆ ژنەکەشت، بۆ هاوسەرەکەشت، ﴿ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ﴾، ئنجا وریا بن! با لە بەهەشتێ وەدەرتان نەنێ، دوایی تووشی نارەحەتیی دەبی، تووشی ڕەنج و زەحمەت دەبی، واتە: تووشی ژیانێک دەبی کە تێیدا ماندوو ببی، خەفەت بخۆی، گرفتاربی، کە ژیانی سەر زەمینە، چونکە تۆ لێرە مشوورت لێخوراوەو، هەموو پێداویستییەکانت بۆ دابین کراون، بەبێ ئەوەی پێیانەوە ماندوو ببی، حازر خۆری بەر سێبەرێی.

ئنجا بۆی باس دەکات، کە چۆن خوا هەموو پێداویستییەکانی بۆ دابینکردوون: ﴿ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴾، تۆ لەم بەهەشتەدا، لەم باخ و گوڵ و گوڵزارەدا، بۆت هەیە نە برسیی ببی، نە ڕووتیش ببی، برسیەتیی بریتیە لەوە کە مرۆڤ لە هەناوی دا بۆشایی هەبێ، ڕووتیی بریتیە لەوە کە لە جەستەیدا بۆشایی هەبێ، ﴿ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴾، هەروەها تۆ لەو بەهەشتەدا بۆت هەیە نە تینووت ببێ، نە گەرماشت ببێ، گەرما بوون، ڕووی لە جەستەیە، تینوویەتییش هەر گەرمییە، بەڵام ڕووی لە هەناو و ناخی مرۆڤە، واتە: تۆ پەکت لەسەر هیچ شتێک نەکەوتوە، هەموو پێداویستییەکانت بۆ دابین کراون.

﴿ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ ﴾، بەڵام شەیتان خوتخوتەی بۆ لا کرد، خوتخوتەکەی بریتی بوو لە چی؟ ﴿ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ ﴾، گوتی: ئەی ئادەم! ﴿ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴾، ئایا درەختی هەرمانت پێشاندەم و، هەبوونێک و دەستڕۆیشتوویی و موڵک و دەستەڵاتێک، کە لە بەین نەچێ و نەڕزێ و کۆتایی پێ نەیەت! جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە ئەوەی کە ئیبلیس پێی گوتن: ڕێک پێچەوانەکەی دەرچوو، ئەگەر ئادەم بەقسەی ئیبلیسی نەکردبایە، ئەوەی کە ئیبلیس گوتی: هەر بمێنیەوەو موڵک و دەستەڵاتێکت دەستکەوێ، لە بەین نەچێ، بەوە ئادەم دەستی دەکەوت کە بە قسەی شەیتانی نەکردبایە، کە بە قسەی ئیبلیسی کرد، ئەوەی لە دەست چوو، هەر بۆیە هەمیشە ئەوانەی کە بە شوێن ئیبلیس دەکەون، پێچەوانەی ئەو مەبەستەی کە لە زەینی خۆیاندا بڕیاریان داوە، پێچەوانەی ئەوەیان بۆ دێتە دی، ﴿ فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا ﴾، هەردووکیان لێیان خوارد و عەورەتیانیان بۆیان دەرکەوت.

نەک وەک لە پەیمانی کۆندا[1] دەڵێ: حەووا لێی خوارد، مار حەووای هەڵخەڵەتاند، شەیتان چووە سەر شێوەی مارێک حەووای هەڵخەڵەتاند، دوایی حەوواش ئادەمی هەڵخەڵەتاند، لە پەیمانی کۆندا وا دەڵێ، بەڵام لە قورئاندا دەفەرموێ: هەردووکیان لێیان خوارد، بەڵکو زۆرجاران باسی ئادەم دەکات، کە بە تەنیا لێی خواردوە، کەچی زۆر کۆلکە عەلمانیی و نیمچە خوێندەوار هەن، هەرچی لە پەیمانی کۆنی جوولەکەو پەیمانی نوێی نەصرانییدا هاتوە، دێنێ لەسەر ئیسلامی دەکاتە ماڵ، ئنجا عەجایب ئەوەیە زۆر ئیعجاب و سەرسوڕمان دەردەبڕن بە هەموو شتێکی ئەوروپاییەکان، کەچی ئەو شتە ئەفسانەییانە، کە هی ئەوانن و هیچ پەیوەندییان بە ئیسلامەوە نیە، ئەو شتە ئەفسانەییانە لەسەر ئیسلام حیساب دەکەن، بەڵام ڕاستییەکانی دینەکەی خۆیان نازانن، ئەو پەندەیان بەسەردا چەسپاوە: (ماڵیان پڕ بوو لە ڕازیانە، منداڵیشیان

---

(١) لە هەرکام لە تەفسیری سوورەتی (البقرة) و (النساء) و (الأعراف)دا دەقی قسەکانی پەیمانی کۆن (العهد القديم)مان هێناون و، لێرە دووبارەیان ناکەینەوە.

بە زگ ئێشە دەمرد)، ئاگای لە ماڵی خۆی نیە چی تێدایە، هەڵەو کەم و کورییەکانی دینی تێکدراوی جوولەکە و نەصرانیی دێنی، لەسەر ئایینە هەقەکەی خۆی کە ئیسلامە، حیسابی دەکات.

﴿فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا﴾، هەردووکیان لێیان خوارد، عەورەتیان، (ئەو شوێنەی کە پێیان ناخۆش بوو دەرکەوێ)، بۆیان دەرکەوت، ﴿وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ﴾، ئنجا دەستیان کرد بە بەخۆوە لکاندنی گەڵای درەختەکانی بەهەشت، ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ﴾، ئادەم سەرپێچیی لە پەروەردگاری کردو بێمراد بوو، دەستخەڕۆ بوو، واتە: ئەو ئامانجەی کە لە دڵی گرتبوو، بە قسەی ئیبلیس و بە دنەدانی ئیبلیس، کە ژیانێکی نەبڕاوەی دەستکەوێ و، موڵک و دەسەڵاتێکی لە بن نەهاتووی دەستکەوێ، لەوەدا دەستخەڕۆ بوو، هیچی دەستگیرنەبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە تووشی گرفتاریی بوو، ﴿ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ﴾، دوایی پەروەردگاری هەڵیبژارد، واتە: بۆ پلەی پێغەمبەرایەتیی و گەڕایەوە سەری، واتە: گەڕانەوەکەی لێ وەرگرت، ﴿وَهَدَىٰ﴾، ڕێنماییشی کرد.

پێم وایە ئەوەم لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا نەگوتوە، بەڵام لێرەدا دەیڵێم:

ئەو خواردنەی ئادەم ﷺ لەگەڵ حەووای هاوسەری، لەو درەختە قەدەغەکراوە، پێش پلەی پێغەمبەرایەتیی بووە، بۆیە پێویست ناکات پینەو پەڕۆی بۆ بکەین و بڵێین: ئەوە بەهۆی لە بیرچوونەوەوە بووە، لە بیرچوونەوەش گوناه نیە، هەڵبەتە ڕایەکی واش هەیە، بەڵام مادام خوای کارزان دەفەرموێ: ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ﴾، ئادەم سەرپێچیی لە پەروەردگاری کرد، ئێمەش لەگەڵ ڕواڵەتی ئایەتەکەدا دەڕۆین و دەڵێین: ئادەم ئەو کاتە کە لەو درەختە قەدەغەکراوەی خواردوە، ئەو گوناهەی کردوە، پێغەمبەر نەبووە، هەر مرۆڤێکی ئاسایی بووە، بەڵام دوایی کە دەگەڕێتەوە، وەک دەفەرموێ:

﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ٣٧﴾البقرة،

ئادەم چەند وشەیەکی لە پەروەردگاری وەرگرتن، کە بریتین لەو وشانەی لە سووڕەتی (**الأعراف**)دا، کە دەفەرمویٚ:

﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٢٣﴾،

واتە: گوتیان: پەروەردگارمان! ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد، ئەگەر لێمان نەبووری و بەزەییت پێمان دانەیەت، ئێمە لە زیانباران دەبین، دوای ئەوەی کە ئادەم و حەووا بەو شێوەیە لە پەروەردگاریان پاڕانەوەو، دانیان بە هەڵەی خۆیاندا هێناو، چاوەڕوانییان لە پەروەردگار کرد، کە بەزەیی پێیان دابێ و لێیان ببووریٚ، خواﷻ تۆبەی لێوەرگرتن، پاشان ئادەمیشی هەڵبژارد بە پێغەمبەرو ڕێنماییشی کرد، ئنجا ئەوە دوای خواردنیان بووە لە درەختە قەدەغەکراوەکەو، دوای دابەزێنرانیان بووە.

﴿ قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا جَمِيعَۢا ﴾، خوا فەرمووی: هەردووکتان وێکڕا لێی دابەزن، واتە: لە بەهەشت، یان لە ئاسمان، ﴿بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞ ﴾، هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن، کە دیارە ئیبلیس دەبێتە دوژمنی ئادەم و حەووا و وەچەکەیان، بۆیە پێشیٚ دەفەرمویٚ: ﴿ٱهۡبِطَا ﴾، هەردووکتان، هەردوولاتان، دوایی دەفەرمویٚ: ﴿جَمِيعَۢا ﴾، چونکە دوایی هەم ئادەم و حەووا وەچەیان پەیدا دەبیٚ و، هەم ئیبلیسیش وەچەی پەیدا دەبیٚ، واتە: خۆتان و وەچەکانتان دەبنە دوژمنی یەکدی، ﴿فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى ﴾، ئنجا هەر کاتێک لە منەوە ڕێنماییتان بۆ بیٚ، بە پێغەمبەراندا (**عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَ السَّلام**)، ﴿فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ﴾، هەر کەسیٚ شوێن ڕێنمایی من بکەویٚ، ئەوە نە گومڕا دەبیٚ و، نە ماندوو دەبیٚ و تووشی میحنەت و دەردەسەریی و ناڕەحەتیی دەبیٚ، یان ﴿يَشۡقَىٰ ﴾، یانی: نە تووشی بەد بەختیی دیٚ لە ڕۆژی دواییدا، نە لە دنیادا گومڕا دەبیٚ، نە لە ڕۆژی دواییدا تووشی ناڕەحەتیی و گرفتاریی ژیانی دۆزەخ دەبیٚ.

﴿ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ﴾

هەر کەسێکیش ڕوو لە یادی من، لە بەرنامەی من، لە کتێبی من، وەرچەرخێنێ، ئەوە لە دنیادا ژیانێکی تەنگ و تاڵی دەبێ، یاخود لە نێو گۆڕ دا، یان لە قۆناغی بەرزەخدا، ئەوەش ڕایەکی زانایانە، ﴿ وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ﴾، لە ڕۆژی هەڵسانەوەشدا بە کوێریی کۆیدەکەینەوە، ﴿ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ﴾، گوتی: پەروەردگارم! بۆچی بە کوێریی کۆتکردوومەوە لە حاڵێکدا کە من بینەر بووم، لە دنیا چاوم ساغ بوون، دەمبینی، لێرە بۆچی کوێرت کردووم؟ ﴿ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ﴾، خوا فەرمووی: هەر بەو شێوەیە کە ئایەتەکانی ئێمەت بۆ لا هاتن، تۆ فەرامۆشت کردن، وازت لێهێنان، پشتگوێتخستن، ﴿ وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ ﴾، هەر بەم شێوەیە ئەمڕۆش تۆ لە بیر دەکرێی، فەرامۆش دەکرێی، پشتگوێ دەخرێی، ﴿ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَنۡ أَسۡرَفَ وَلَمۡ يُؤۡمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦۚ ﴾، بەم شێوەیەش کە باسکرا سزای کەسێک دەدەین کە زێدەڕۆیی دەکات و، بڕوا بە ئایەتەکانی پەروەردگاری ناکات، یان بە نیشانەکانی پەروەردگاری، أ- چ ڕستەکانی و فەرمایشتەکەی بن، ب- چ موعجیزەی پێغەمبەران بن (عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام)، ج- چ دیاردەکانی گەردوون بن، ﴿ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبۡقَىٰٓ ﴾، بە دڵنیایی سزای ڕۆژی دواییش، سەختتریشەو بەردەوامتریشە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی بمانپارێزێ لە سزای ڕۆژی دوایی و، لەو کەسانەمان بگێڕێ کە لە دنیادا بە چاوی عەقڵ و دڵ سەیری نیشانەکانی خوا دەکەن، سەیری ئایەتەکانی خوا دەکەن و، بە دڵ و گیان پەسەندیان دەکەن و، پێیانەوە پابەند دەبن، فەرامۆشیان ناکەن و لە بیریان ناکەن و، بە هیچ نرخێکی کەم و زۆر نایانگۆڕنەوە و نایانفرۆشن، تاکو هەم لە دنیادا سەلامەت بن و، هەم لە دوا ڕۆژدا ڕوو سووری بەر دەرگای خوا بن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**باسی ئەوە کە خوا پێشتر ئادەمی ڕاسپاردوە کە لە درەختە قەدەغەکراوەکە نەخوات، کەچی ڕاسپاردەکەی خوای لە بیر چووەو، خاوەن عەزم (ویستی پتەو) نەبووە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ عَهِدۡنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبۡلُ فَنَسِيَ وَلَمۡ نَجِدۡ لَهُۥ عَزۡمٗا ١١٥﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿وَلَقَدۡ عَهِدۡنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبۡلُ﴾، ئێمە پێشتر ئادەممان ڕاسپاردبوو، یاخود ئامۆژگارییمان بۆ لای ئادەم ناردبوو، یاخود فەرمانمان حەواڵەی لای ئادەم کردبوو، یاخود پەیمان و بەڵێنمان لە ئادەم وەرگرتبوو، بەڵێن و پەیمان و ڕاسپاردەو ئامۆژگاریی چی؟ ئەوە کە لە درەختە قەدەغەکراوەکەی نێو بەهەشت نەخوات، کە دەفەرموێ: ﴿مِن قَبۡلُ﴾، واتە: پێش ئەو کاتە، ئنجا هەندێک گوتوویانە: **(من قبل)**، دەگەڕێتەوە بۆ بەسەرهاتەکەی مووساو فیرعەون، واتە: پێش بەسەرهاتی مووساو فیرعەون، بەڵام وا باشترە بە ڕەهایی بهێڵرێتەوە، واتە: پێش ئەو کاتەی کە ئادەم لە لایەن ئیبلیسەوە فریو بدرێ.

٢)- کە دەفەرموێ: ﴿فَنَسِيَ﴾ لە بیری چوو، **(النِّسْيَانُ: ضِدُّ الذِّكْر)**، **(ذِكْر)** واتە: لەبیر بوون، لە یاد بوون **(نسیان)**یش واتە: لەبیر چوون، کە پێچەوانەی یەکدین، ئەوە واتایەکی، واتە: ئادەم لە بیری چوو و فەرامۆشی کرد، واتایەکی دیکەی، وازی لێهێنا، یاخود پشت گوێی خست، فەرمانەکەی پشت گوێ خست و وازی لێهێنا، ئەگەرنا لەبیری

بوو، ﴿فَنَسِيَ﴾ وەک چۆن لەبیرچوون دەگەیەنێ، واز لێهێنان و، پشت گوێ خستنیش دەگەیەنێ.

٣)- ﴿وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا﴾، ئێمە ویستی پتەوو مەحکەممان لەودا نەبینی، (**عَزِيْمَةً قويةً تُعينه على المُضيّ والثبات في الأمر**) واتە: ویستێکی بەهێز کە یارمەتیی بدات بۆ بەردەوام بوون و، چەسپاویی لەو کارەدا کە لە پێشیەتی، کە بریتیە لە قەدەغە نەشکاندن و نەخواردن لەو درەختە قەدەغە کراوە .

دەشگونجێ مەبەست لە (**عزم**) لێرەدا خۆڕاگریی (**صبر**) بێ، چونکە کەسێک کە ویستێکی پتەوی هەبوو، خۆڕاگریش دەبێ، واتە: (**صبر**) خۆڕاگریی بەرهەمی ئەو (**عزم**)و ویستە پتەوویە.

## دوو پرسیار لەبارەی ئادەمەوە و وەڵامەکەیان :

### یەکەم:

ئایا ئادەم گوناهێکی کردوە، ئەوەی کە لێرەدا خوا خستوویەتە ڕوو، وەک دواتر خوای پەروەردگار بە ڕاشکاویی دەفەرموێ: ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ﴾، ئادەم سەرپێچیی لە پەروەردگاری کردو بێمراد بوو و تووشی ئاکام خراپیی بوو، بەڵام ئایا لێرەش: ﴿فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا﴾، مەبەست ئەوەیە کە ئادەم گوناهێکی کردوە؟!

لەو بارەوە دوو ڕا هەن:

١)- ڕایەکیان ئەوەیە کە نەخێر، چونکە بە هەڵەدا چوونەکەی (ئادەم) لە لایەن (ئیبلیس)ەوە، یان بە هەڵەدابرانی لە لایەن (ئیبلیس)ەوە، بە هۆی لەبیر چوونەوەوە بوو، کەواتە: هەڵەیەکی بە ئەنقەست نەبووە، بەڵکو بە هۆی لەبیر چوونەوەوە بووە، ئنجا ئەو گوناهانەش کە بە هۆی لەبیرچوونەوە، یان ئەو هەڵانەی بە هۆی لەبیر چوونەوەوە، دەکرێن، لەسەر مرۆڤ هەڵگیراون، ئەم فەرمایشتە بە بەڵگە دەهێننەوە:

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِنَّ اللهَ تَجَاوَزَ لِي عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ، وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ»} (أخرجه الطبراني: ١١٢٧٤، والحاكم: ٢٨٠١، وقال: صحيح على شرط الشيخين).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە دڵنیایی خوا هەڵەو، لەبیر چوون و، ئەوەی کە بە ناچاریی پێیان کرابێ، لەسەر ئوممەتمی لابردوە، (واتە: بە گوناح لەسەری نەنووسیون).

بەڵام هەندێک لە زانایان دەڵێن: ئەوە بۆ شەریعەتی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ، ئنجا ئەویش لە حاڵێکدا کە (نِسْيَانْ) مەبەست پێی لەبیرچوونەوە بێ، بەڵام ئەگەر (نِسْيَانْ) مەبەست پێی پشتگوێ خستن و وازلێهێنان بێت، ئەوەش هەر نایگرێتەوە.

دیارە ئەوە وەڵامە بۆ ئەوانەی دەڵێن: ئایا ئادەم گوناهی کردوە یان نەکردوە؟ دەڵێن: بۆی بە گوناح لە قەڵەم نەدراوە.

٢)- ڕایەکی دیکە ئەوەیە: بەڵێ، ئادەم لەو کاتەدا مرۆڤێکی ئاسایی بووەو پێغەمبەر نەبووە، بە بەڵگەی ئەوە کە دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ﴾، دوایی پەروەردگاری هەڵیبژاردو، گەڕانەوەکەی لێ قبووڵ کردو، ڕێنمایی کرد، خستیە سەر ڕاستە ڕێ، کەواتە: ئەو کاتە کە لە درەختە قەدەغە کراوەکەی خواردوە، پێغەمبەر نەبووە، تاکو بڵێین: پێغەمبەران لە هەڵەو گوناح پارێزراون، کە بە تەئکید وایە، بەڵام لە هەڵەی بە ئەنقەست پارێزراون، ئەگەرنا لە هەڵەی ئیجتیهادیی واتە: شتێک کە بە هەڵە دەیکەن، نەک بە ئەنقەست بیزانن گوناهە، لەوە پارێزراون، ئەگەرنا لەوە پارێزراو نین کە شتێک بە ڕاست بزانن و، دوایی بە هەڵە دەربچێ، یان شتێک بە هەڵە دابنێن و، دوایی بە ڕاست دەربچێ.

ئنجا کە ئادەم لەو کاتەدا مرۆڤێکی ئاسایی بووە، وەک هەموو ئەو مرۆڤانەی دیکە، کەواتە: عەجایب نیە هەڵەو گوناهیشی لێ ڕوودا بێ.

دووەم:

ئایا (ئادەم) کاتێک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴾، عەزممان پێوە نەبینی، ئایا ئادەم هیچ عەزمی نەبووە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: تەنها لەو مەسەلەیەدا عەزمی نەبووە، نەک بە گشتیی، واتە: ﴿ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴾، (**في هذه المسألة، في هذا الموضوع**)، لەو بابەتە لەو مەسەلەیەدا، لەو پرسەدا ئێمە ئیرادەی پتەومان پێوە نەبینیوە، ئەگەرنا پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، هەموویان خاوەن عەزم بوون، وەک من لە کتێبی شەشەم لە مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلي في كتاب الله**)دا کە باسی پێغەمبەران دەکات (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، بە درێژیی باسی ئەوەم کردوە کە ئەو قسەیە ڕاست نیە، کە تەنیا پێنج لە پێغەمبەران خاوەن عەزم بووبن، وەک خوا دەفەرموێ:

﴿ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ ...﴿٣٥﴾ ﴾الأحقاف،

واتە: خۆڕابگرە وەک چۆن خاوەن عەزمان لە پێغەمبەران خۆڕاگر بوون، ئنجا دەڵێ: لەبەر ئەوەی هەم لە سوورەتی (**الشورى**)دا، هەم سوورەتی (**الأحزاب**) دا خوای پەروەردگار ئەو پێنج پێغەمبەرەی واتە: نووح و ئیبراهیم و عیسا و مووسا و موحەممەد (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، پێکەوەی هێناون، وەک دەفەرموێ:

﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ أَنْ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِ ...﴿١٣﴾ ﴾الشورى،

لە سوورەتی (**الأحزاب**)یشدا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۖ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿٧﴾ ﴾.

بەڵام، لە ڕاستییدا ئەوە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی تەنها ئەو پێنج پێغەمبەرە، خاوەن عەزم و ویستی پتەو بوون، بەڵکو ئەوانە لە پێشەوەی پێغەمبەرانی خاوەن عەزم بوون، ئەگەرنا من پێم وایە کە خوا دەفەرموێ:

﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ ...﴾ (٣٥) الأحقاف،

خۆڕابگرە وەک چۆن پێغەمبەرانی خاوەن عەزم خۆیان ڕاگرتوە، پێم وایە ئەو (من)ە، (من الرسل) بۆ بەشێک نیە (من)ی (تبعیضیة) نیە، بەڵکو (من)ی (بیانیة)یە، واتە: وەک چۆن خاوەن ویست پتەوان لە پێغەمبەران، خۆیان ڕاگرت، کە هەموویان خاوەن ویستی پتەو بوون، بەڵام ئەوە ڕێگر نیە لەوەی کە یەکێکیان لە هەڵوێستێکدا بێهێز بووبێ، نەیپێکابێ، بەبێ ئەوەی بزانێ کە گوناهە.

هەڵبەتە دوای پێغەمبەرایەتیی، ئەگەرنا پێش پێغەمبەرایەتیی، ئەوانیش مرۆڤی ئاسایی بوون، دەگونجێ هەڵەو گوناهو کەم و کوڕییشیان لێ ڕوودابێ، وەک لە ئادەمی ڕوویداوە (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ).

**مەسەلەی دووەم:**

**فەرمان کردنی خوا بە فریشتان کە کڕنووشی ڕێزگرتن بۆ ئادەم ببەن و، سەرپێچیی کردنی ئیبلیس و، هۆشداریی پێدانی خوا بە ئادەم و حەووا کە شەیتان دوژمنیانەو، با فریویان نەدات لە حاڵێکدا کە لە بەهەشتدا لەوپەڕی خۆشیی و ئاسوودەیی دان و، لە هیچ شتێکیان کەم نیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ ﴿١١٦﴾ فَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوّٞ لَّكَ وَلِزَوۡجِكَ فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلۡجَنَّةِ فَتَشۡقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعۡرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظۡمَؤُاْ فِيهَا وَلَا تَضۡحَىٰ ﴿١١٩﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ ﴾، یاد بکەوە! کاتێک بە فریشتەکانمان فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم ببەن، وەک هەموو جارێ گوتوومانە: بێگومان کڕنووش (**سجدة و سجود**)، لێرەدا مەبەست پێی (**سجدة**) بردنی سڵاو لێکردن و ڕێزلێگرتنە، نەک کڕنووش بردنی پەرستن، کە ئەوە تایبەتە بە خوای پەروەردگارەوە، بەڵگەمان لەسەر ئەوە زۆرن، وەک لە تەفسیری سوورەتی (**یوسف**)دا، لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗا ﴾، یوسف باب و دایکی بەرز کردنەوە بۆ سەر تەختەکە، (بۆ سەر ئەو کورسیی و تەختە کە لە سەری دادەنیشت)و، هەموویان بۆی بە کڕنووشدا کەوتن، کە مەبەست لە کڕنووش لێرەدا جۆرێک لە دەست بە سینگەوە نان و، خۆ چەماندنەوەیە، کە نەگاتە حاڵەتی کڕنووش بردن، کە مەبەست پێی ڕێز لێگرتنە، هەیە سەر دەجووڵێنێ، هەیە دەست بە سینگەوە دەنێ، هەیە جۆرێک لە چەمینەوەی دەبێ، هەرچەندە خۆ چەماندنەوە لەبەر ئەوەی دوایی لە ڕکوع نیزیک دەبێتەوە، شتێکی ناپەسندە، بەڵام هەرجۆرە ڕێز گرتنێک لە بەرانبەرو، سڵاو لێکردنی و بچووکیی پێشاندان،

حورمەتی گرتن، لە قورئاندا بە (سجدة) ناوی براوە، وەک لێرەدا هاتوە، ئەگەرنا بە تەئکید یەعقووب و دایکی یوسوف، (واتە: هاوسەری یەعقووب)، هەروەها یازدە برایەکەی، کڕنووشی پەرستیان بۆ یوسوف نەبردوە، نە یوسوف قبووڵ دەکات، نە یەعقووب لە خۆی و لە هاوسەری و لە کوڕەکانیشی دەوەشێنێتەوە، کە جگە لە خوا سەجدەی پەرستن بۆ کەسێکی دیکە ببەن، جگە لەوەش، هەر لەوێ باسمان کردوە بە تەفصیل کە خوای بێ هاوتا جووڵەی درەختەکان و جووڵەی سێبەری درەختەکان لە لای ڕاست و چەپیشی بە (سجدة) ناو بردوە، وەک لە سووڕەتی (النحل)دا هاتوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ يَتَفَيَّؤُا۟ ظِلَـٰلُهُۥ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَٰخِرُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾، کە گومانی تێدا نیە لێرە کە دەفەرموێ: ئایا سەرنجیان نەداوەتە هەر شتێک کە خوا دروستی کردوە، سێبەرەکانی لە لای ڕاست و لەلای چەپەکانی بە کڕنووش بردوویی بۆ خواو بە ملکەچیی، دێن و دەچن!.

مەبەست جووڵەی سێبەرەکانە، نەک کڕنووش بردن:

کاتێک خۆر لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێ، ئەگەر بەرەو قیبلە بوەستی، لای چەپت دەبێتە هەتاو و لای ڕاستت دەبێتە سێبەر، بەڵام کاتێک خۆر دەکەوێتە لای ئاوا بوون، ئنجا پێچەوانە دەبێتەوە لای ڕاستت دەبێتە هەتاو ڕوون دەبێتەوەو، لای چەپت دەبێتە سێبەر، سێبەرەکە دەجووڵێ بە پێی جووڵەی خۆر، هەڵبەتە لە پێش چاوی ئێمە، ئەگەرنا لە ڕاستییدا ئەوە زەوییە بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە لە بەرانبەری خۆردا، کەواتە لێرەدا: خوا ﷻ ناوی لەو جووڵەی سێبەرەی لای ڕاست و لای چەپی شتەکان ناوە، کڕنووش بردن (سُجَّدًا لِّلَّهِ)، (سُجَّدْ) کۆی (ساجد)ە، واتە: بە کڕنووشبەرانە سێبەرەکان دەجووڵێن، ﴿ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَٰخِرُونَ ﴾، لە حاڵێکدا کە ملکەچن.

دوایی دیسان دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن دَآبَّةٍ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا

هەیە لە زیندەوەران و، لە فریشتەکان کڕنووش بۆ خوا دەبەن و، خۆیان بە زلناگرن.

ئێمە نازانین کڕنووش بردنی فریشتان چۆنە؟ زیندەوەرانیش بە تەئکید سەجدەیان بەو شێوەیەی ئێمە نیە، کە لە نوێژدایە، واتە ئەو سەجدە، زاراوەییە نیە کە هەیە، بەڵکو مەبەست پێی ملکەچیی فریشتەکان و، زیندەوەرانە یاسا گەردوونییەکانی خواو، ملکەچییانە بۆ خوا ﷻو، بە گەورە گرتن و بە مەزن گرتنی.

٢)- ﴿ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ ﴾، هەموویان کڕنووشیان برد (فریشتەکان)، جگە لە ئیبلیس، ئیبلیس ئامادە نەبوو، ﴿ أَبَىٰ ﴾، یانی: **(امتنع)**، لاملیی کرد، سەرپێچیی کرد، ئایا هەرچی فریشتەی کە خوا دروستی کردوە، هەموویان بوون؟ یاخود بەشێکی دیاریکراویان بوون؟ ئەوە زانیارییەکەی تەنها لە لای خوایە ﷻ.

بەڵێ لە هەندێک شوێنیش دەفەرموێ: ﴿ فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ﴾، تێکڕای فریشتەکان، وێکڕا کڕنووشیان برد، تێکڕاو وێکڕا، تێکڕا یانی: هەموویان، وێکڕا یانی: پێکەوە، ﴿ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ﴾، **(وَكُلُّهُم)** واتە: هەموویان، **(أَجْمَعُونَ )** واتە: وێکڕا، نەوەک هەندێکیان ئێستاو هەندێکیان دوایی، تێکڕا و وێکڕا کڕنووشیان برد، بەڵام ئەوەش بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی دیسان تێکڕای فریشتەکانی ئاسمانەکان و زەوی بگرێتەوە، بەڵکو دەبینی کۆمەڵە فریشتەیەکی دیاریکراو دەگرێتەوە، دەشگونجێ هەموویان بگرێتەوە، وەک پێشتریش لە سوورەتی **(الأعراف)**دا باسمان کردوە.

٣)- ﴿ فَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوّٞ لَّكَ وَلِزَوۡجِكَ ﴾، گوتمان: ئەی ئادەم! ئەمە دوژمنە بۆ خۆت و، بۆ ژنەکەت، بۆ هاوسەرەکەت، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئیبلیس.

٤)- ﴿ فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلۡجَنَّةِ فَتَشۡقَىٰٓ ﴾ ئنجا لە بەهەشتێ وەدەرتان نەنێ، دوایی تووشی نارەحەتیی دەبی، تووشی زەحمەت دەبی، تووشی ژیانی پڕ مەینەتیی

دەبێ، بۆچی دەفەرموێ: (فَتَشۡقَىٰٓ)، نافەرموێ: (**فتشقيان**)؟ هەردووکتان، خۆت و هاوسەرەکەت؟ لەبەر ئەوەی مشوور لێخواردنی ژن و ماڵ، ئەرکێکە لە ئەستۆی پیاودایە، هەم لە ڕووی شەرعییەوە، هەم لە ڕووی فیترییەوە، ئەگەر تەماشای هەموو دنیا بکەین، مەگەر ئەوانەی کە لە زگماک (فطرة)ی خوا لایان داوە، ئەگەرنا ئافرەت هەر لە سێبەری پیاودایە، پیاو دەبێ مشوور لە ئافرەت بخوات و بیپارێزێ، بژیوی بۆ پەیدا بکات، ئاگای لێی بێ، بۆیە خوای پەروەردگار ڕوو لە ئادەم دەکات، پێشێ دەفەرموێ: هەردووکتان وەدەرنەنێ، ئەگەرنا تۆ ئەی ئادەم! تووشی ناڕەحەتیی و گرفتاریی دەبی، چونکە تۆی پیاو، تۆی مێردو هاوسەر، دەبێ خۆشت و هاوسەرو منداڵەکانیشت بژیەنی، سەرەنجام تووشی ناڕەحەتیی و گرفتاریی ژیانی سەر زەمین دەبی.

کە دەفەرموێ: ﴿فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا﴾، ئەمە وەک ئەو تەعبیرە وایە، (**لا أعرفك تفعل كذا**)، واتە: نەتناسم ئەوە بکەی! واتە: ئەو کارە نەکەی، کە سەرەنجام ئەو کارەت لێ بزانمەوە، یەک بە یەکێکی دیکە دەڵێت: خراپەت لێ نەبیستمەوە، هەواڵی خراپت لە بارەوە نەبیستم، واتە: خەراپە مەکە، دوایی ببێتە هەواڵ و پێم بگاتەوە .

٥)- ﴿إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعۡرَىٰ﴾، بە دڵنیاییەوە بۆ تۆ هەیە لەوێدا، نە برسیی بی، نە ڕووت بی.

٦)- ﴿وَأَنَّكَ لَا تَظۡمَؤُاْ فِيهَا وَلَا تَضۡحَىٰ﴾، هەروەها بۆشت هەیە لەوێدا کە نە تینوو بی، نە گەرمات بێ، دەگوترێ: (**ضَحِيَ، يضحى**)، وەک: (**رضيَ، يرضى**)، واتە: گەرمای بوو، ئەگەر گەرمای خۆر لێیدا لە کاتی چێشتەنگاودا، پێی دەگوترێ: (**ضحي، يَضْحى**)، ئەمەش دیسان بە هەمان شێوە، تۆ بۆت هەیە لەو بەهەشتەدا نە برسییت بێ، نە ڕووت بی، برسیی بوون، خاڵیی بوونی دەروونە، ڕووت بوون بێ پۆشاکییە، واتە: ڕووت بوونەوەی جەستەیە، برسیەتییش ڕووتبوونەوەی هەناوە لە خواردن و خۆراک، هەروەک: تینووبوون، گەرمداهاتنی هەناوە، گەرمابوونیش گەرمبوونی جەستەیە، واتە: تۆ هەموو

پێداویستییەکانت بۆ دابینکراون و، هیچ کەم و کوڕییەکیشت نیە، هیچ گرفت و کێشەیەکت نیە لەو ژیانی نێو ئەو بەهەشتەدا.

## بەهەشتی هەمیشەیی، یان باخێکی سەر زەوی؟!

ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا باسی ئەو دوو ڕایەمان کردوە، هی زانایان کە کێشمەکێشێکی زۆر هەیە، وەک زانایان لە تەفسیرەکاندا هێناویانە، هەروەها (**إبن القیم**) لە کتێبی (**مفتاح دار السعادة**)دا، بە درێژیی بەڵگەکانی هەردوو ڕایەکانی هێناون:

١- هەندێیان دەڵێن: ئەو باخە کە خوا ﷻ ئادەم و حەووای تێدا داناون، باخێک بووە لەسەر زەمین، شوێنێک بووە وەک شوێنی مەشق و ڕاهێنان، وەک مەڵبەندی ڕاهێنان (**مركز تدريب**)ێک کە لەوێ لەو باخەدا خوا ﷻ مەشقیان پێ بکات، لەسەر ئەوە کە ئایا ئیرادەی پتەویان هەیە کە خۆ لە قەدەغەکراو بپارێزن و، پابەندبن بە حەڵاڵەوە.

(**الشعراوي**) لە تەفسیرەکەی خۆی (**خواطر الشعراوي**)دا[1]، دەڵێ: (**هَكَذَا كَانَتِ جنة آدَم مَكَانَاً لتدريبه، قَبْلَ أنْ يبَاشر مهمّته كَخَلِيْفَة للهِ فِي الأَرْضِ، فَأَدْخَله اللهِ فِي هَذِهِ التجربة العَمَلِيَّة التطبيقِيَّة**).

واتە: بەهەشتەکەی، باخەکەی ئادەم بەوە شێوەیە بوو: شوێنێک بوو بۆ مەشق و ڕاهێنان پێکردنی، بەر لەوەی کە دەست بکات بە لە ئەستۆگرتنی ئەو ئەرکەی کە پێی دەسپێردرێ، وەک جێنشینی خوا لەسەر زەوی، خوا خستیە نێو ئەو ئەزموونە کردەییە، پراکتیکییە بۆ ئەوەی ڕایبهێنێ.

کەواتە: ئەو باخە، شتی هەمیشەیی (**جنة العدن**) نەبووە.

٢- هەندێکی دیکە لە زانایان دەڵێن: نەخێر هەر ئەو بەهەشتە زانراوەیە کە خوای پەروەردگار بۆ ئیماندارانی داناوە، منیش ئەو ڕای دووەمم پێ ڕاستە، وەک لە تەفسیری

---

(١) ج١٥، ص٩٤٢٣.

سوورەتی (**الأعراف**)یشدا ئەو ڕایەمان زاڵکردوە، چونکە هیچ باخێک لەسەر زەوی چنگ ناکەوێ، بەو شێوەیە بێت، برسییت نەبێ، ڕووت نەبی، تینووت نەبێ و، گەرماشت نەبێ!

پاشان هیچ باخێک نیە لەسەر زەوی، لێی بخۆی، لە بەرو بوومەکەی، بەڵام پاشەرۆکی نەبێ، ئەوە هەر بەهەشتە، ئەو بەهەشتەیە کە خوا بۆ بڕواداران داناوە، ئەو درەختەش کە ئادەم و حەووا لە بەرەکەیان خواردوە بە فێڵی شەیتان، وا پێدەچێ درەختێک بێ لە جۆری درەختەکانی کە لە دنیا دەڕوێن، هەر بۆیەش کە لێیان خواردوە، دەفەرموێ: ﴿ فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا ﴾، کاتێک لێیان خوارد، عەورەتی خۆیانیان بۆ دەرکەوت، واتە: کە لە بەری درەختەکەیان خواردوە، ئنجا خواردنەکە هەزم بووە، بەشێکی بۆتە پاشەرۆک، هەر بۆیە پێویستییان بەوە بووە پاشەرۆکەکە دابنێن، هەم لە ڕێی میزەوە، هەم لە ڕێی پیساییەوەو، سەرەنجام عەیب و عاری خۆیانیان بۆ دەرکەوتوە، واتە: ئەو کاتە زانیویانە کە ئەو دوو کۆئەندامە بۆ دەردانی پاشەڕۆکێکن، کە لە خواردنێک پەیدادەبێ، لەو درەختە قەدەغە کراوە خواردوویانە، دەنا درەختەکانی بەهەشت لە هەموویان خواردوە، بەڵام حاڵەتی پاشەرۆك پەیدا بوونیان بۆ نەهاتۆتە پێش، کەواتە: ئەگەر باخێکی دنیا بووایە، لە هەر درەختێکیان خواردبایە، ئەو شوێنەوارانەیان هەر دەبوو.

بە هەر حاڵ دەگونجێ بەڵگەی دیکەش لەو بارەوە بهێنرێنەوە، بەڵام ئەوەی کە زیاتر ئیشکال دروست دەکات، ئەو باخە بەهەشت بووبێ، ئەوەیە کە خوا ﷻ چۆنی گواستوونەوە بۆ سەر زەوی و باس نەکراوە؟ بەڵام خوا کە دەفەرموێ: (**اهبطوا**) یان (**اهبطا**) دابەزن، ئەوە فەرمانێکی هێنانە دیی (**تكويني**)ە، ئەگەرنا فەرمانێکی تەشریعیی نەبووە، خوا فەرمانیان پێ بکات، خۆیان چۆن داببەزن؟ لەو بەهەشتە دوورەوە بۆ ئەو سەر زەمینە، بە تەئکید ئەوە فەرمانێکی (**تكويني**) بووە، خوا فەرمانی پێ کردوون و یەکسەر داشیبەزاندوون.

بە هەر حاڵ نهێنییەکانی قورئانە تەنها خوا ﷻ هەموویان دەزانێ و، جگە لە خوا ﷻ هیچ کەس نایانزانێ، هەموو نهێنیی و ماناو مەبەستەکانی کە لە فەرمایشتی بێ وێنەی خوادا هەن، جگە لە خوا کە بێژەری فەرمایشتەکەی خۆیەتی، هیچ کەس ناگاتە ئەوپەڕی زانیاریی و نهێنیی مەبەستەکانی، کە لە قورئاندا شێردراونەوە.

## مەسەلەی سێیەم:

**خوتخوتەکردنی شەیتان بۆ ئادەم، هەروەها بۆ حەووای هاوسەریشی، بە بیانووی ئەوە بە خواردنیان لە بەری درەختەکە، ژیانی هەمیشەیی و، موڵکی نەبڕاوەیان چنگ دەکەوێ، ئنجا خواردنیان لە بەری درەختەکەو دەرکەوتنی عەورەتیان و، خۆ داپۆشینیان بە گەڵای درەخت و، بێمراد بوونی ئادەم، واتە: بێ ئاکام بوونی لەو ئاواتەی کە هەیبوو، کە بە هۆی خواردنی لەو درەختەوە بیهێنێتە دی، بە پێی خوتخوتەی شەیتان، پاشان تۆبە لێوەرگیرانی و گێڕدرانی بە پێغەمبەر و هیدایەتدرانی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ ﴾، شەیتان خوتخوتەی بۆ لا کرد، پێشتر باسمان کرد کە (وسوسة)، (صوت الحُليّ) دەنگی خشڵە، دەنگی خشڵ دەنگێکی کپ و پەنهانە، بەڵام سەرنج ڕادەکێشێ و ئینسان گوێ قوڵاخ دەبێ، گرنگ ئەوەیە شەیتان دنەیدا، هانیداو خستیە نێو دڵی، ئنجا چ ڕووبەڕوو قسەشی لەگەڵدا کردبێ، وەک لە ئایەتەکانی سووڕەتی (**الأعراف**)دا، ئەوە زۆر بە ڕاشکاویی وەردەگیرێ و، لێرەش هەر ئاماژەی پێ دەکرێ، گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرموێ: شەیتان خوتخوتەی خستە دڵی، واتە: دنەیداو هانیدا.

٢)- ﴿قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ﴾، گوتی: ئەی ئادەم! ئایا درەختی هەرمانت پیشانبدەم و، مولْک و هەبوونێکی لەبەین نەچوو، کە لە بەین ناچێ؟ ﴿لَّا يَبْلَىٰ﴾، یانی: (لاَ يَفْنَى) لەبەین ناچێ، نافەوتێ، دەگوترێ: (بَلِيَ الثَّوب)، واتە: شڕ بوو، شڕو وڕ بوو، کە بەرگ و پۆشاک شڕو وڕ بوو، فڕێ دەدرێ، ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە، کە ئیبلیس ئەگەر ڕاستیکردوە، دڵسۆز بووە بۆ ئادەم، وەک لە سووڕەتی (الأعراف)دا دەڵێ: ﴿إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّـٰصِحِينَ﴾، من زۆر دڵسۆزم بۆ ئێوە، کە ئەم ڕستەیەو ڕستەکانی دیکە لە سووڕەتی (الأعراف)دا هاتوون، بە ئاشکرا ئەوەیان لێ دەفامرێتەوە کە ئیبلیس ڕوو بە ڕوو، قسەشی لەگەڵدا کردوون، بەڵام کە ڕووبەڕووش قسە لەگەڵ کەسێک دەکەی، مادام قسەکانت ببنە هۆی دنەدانی و هاندانی، ئەوە هەر دەبنە وەسوەسە.

ئنجا جێی پرسیار ئەوەیە کە ئادەم ئەو پرسیارەی لە خۆی نەکردوە: باشە ئیبلیس مادام ئەو درەختەت پێ شک دێ، کە هەر کەسەی لێی بخوا، هەرماو دەبێ و، مولْک و دەستەڵاتێکی دەست دەکەوێ و نافەوتێ، بۆچی بۆ خۆت لێی ناخۆی؟ تاکو ئەوەی ئەو ئامانجە باشە بۆ تۆ بێتە دی!

٣)- ﴿فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا﴾، ئنجا لێیان خواردو یەکسەر عەورەتی خۆیان بۆ دەرکەوت، (السَّوْأَةُ: هِيَ العَوْرَة أي: المَكَان الَّذِي يَسْتَحِي الإِنْسَان أَنْ يَنْكَشِفَ مِنْهُ)، (سوأة)، واتە: عەوڕەت، ئەویش ئەو شوێنەیە کە ئینسان شەرم دەکات ئەو شوێنەی دەرکەوێ، کە زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: مەبەست پێی (پاش و پێشی) ئینسانە، واتە: کۆئەندامی کە پیسایی لێوە لە جەستە فڕێ دەدرێ و، کۆئەندامی کە میزی لێوە لە جەستە دەچێتە دەر، بە نسبەت پیاوو ئافرەتەوە، واش پێدەچێ، کە لە ئەنجامی خواردنی ئەو میوەی ئەو درەختە قەدەغەکراوەدا، کە پاشەڕۆکی لێ پەیدابووە، پاشەڕۆکەکەش دیارە کە لە پاش و پێشیانەوە دەبێ فڕێ بدرێ، بۆیە هەستیان پێکرد، کە ئەو دوو کۆئەندامەیان بۆ حاڵێکی وان، چونکە پێشتر کە لە درەختەکانی بەهەشتیان خواردوە، پاشەڕۆکی نەبووە، تاکو پێویستییان بە حاڵەتی دەردانی میز و پاشەڕۆک بێ.

٤)- ﴿وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ﴾، هەروەها دەستیان کرد بە خۆوەلکاندنی گەڵاکانی باخی بەهەشت، (يخصفان أي: يُلصِقان و يُلزِقان)، بە خۆیانەوە دەچەسپاند، بەخۆیانەوە دەلکاند، دیارە خۆداپۆشین هەر هەستێکی خوارسکە لە مرۆڤدا، منداڵێکی گچکە ئەگەر چ بڕ هەست و تەمیزی پەیدابێ، پێی خۆش نیە پێش و پاشی دیار بێ و، پێی خۆش نیە، بە ڕووتیی بکەوێتە بەر چاوی خەڵک، نەوەک هەر پاش و پێشی بگرە ئەندامەکانی دیکەشی، دیار بن، بە تایبەت ئەو هەستە لە مێینە (ئافرەت)دا زیاترە، هەر بۆیە هەندێک لە زانایان دەڵێن: لە ئەنجامی لێخواردنی بەری ئەو درەختەدا، ئەو پۆشاکەی لەبەریان بووە، لەبەریان داکەنراوە، هەروەک لە سوورەتی (الأعراف)یشدا بە ڕاشکاویی دەیفەرموێ: ﴿يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا ﴿٢٧﴾﴾، واتە: پۆشاکەکەیان لە بەر دادەڕنێ تاکو عەورەتی خۆیانیان پێشان بدات، بەڵام هەندێک لە زانایان گوتوویانە: پۆشاک لێرەدا واتە: ئەو فەرمانبەرییەیان بۆ خوا کە ڕێیان لێ دەگرێ فەرمانی خوا بشکێنن، بەڵام کە قەدەغەی خوایان نەشکاندو، لەو درەختە قەدەغە کراوەیان نەخوارد، ئەو کاتە هەست بەو دوو کۆئەندامەی خۆیان ناکەن و، پێویستییان پێیان نابێت بەکاریان بێنن.

٥)- ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ﴾، ئادەم سەرپێچیی لە پەروەردگاری کردو بێ ئاکام بوو، تووشی نارەحەتیی بوو، بێمراد بوو، ژیانی تێکچوو، کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ بە ڕوون و ڕاشکاویی دەفەرموێ: ئادەم سەرپێچیی لە پەروەردگاری کرد، بۆیە دەڵێین: ئەوە پێش ئەوە بووە کە بکرێتە پێغەمبەر، ئەو کاتە مرۆڤێکی ئاسایی بووە، هەر بۆیەش خوا ﷻ ئەو مرۆڤە ئاساییەی کردۆتە سەرمەشق بۆ وەچەکەی، کە ئەوانیش وەک بابیان، یان وەک دایکیان، ئەگەر هەڵەیەکیان کرد، قەدەغەیەکی خوایان شکاند، فەرمانێکی خوای پەروەردگاریان چواند، نائومێد نەبن لە خۆیان، ئەوانیش هەر ئەو شتەیان کردوە کە باب و دایکیان کردوویانەو، سەرمەشقیانن لە گوناح کردندا، بەڵام با بە هەمان شێوە بشیانکەنە سەرمەشق لە گەڕانەوە بۆ لای خوادا، لە پەشێمان بوونەوەو، قەرەبووکردنەوەی ئەو هەڵەو کەم و کوڕییەدا، وەک چۆن ئادەم و حەووا دانیان بە

گوناهی خۆیاندا هێنا، داوای لێبوردن و داوای بەزەیی و میهرەبانییان لە پەروەردگاریان کرد: ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾، کە دیارە خوا ئەو پاڕانەوەیەی فێر کردوون و دوایی لێشی وەرگرتوون، چونکە دەفەرموێ: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ ﴾، ئادەم چەند وشەیەکی لە پەروەردگاری وەرگرتن، ئەو وشەیەی خوا بۆی ئیلهام کردوە، کە ئاوا بڵێن لەگەڵ هاوسەری، ئاوا پەشێمانیی و تۆبەی خۆیان بخەنە ڕوو، ﴿فَتَابَ عَلَيۡهِ ﴾، خواش تۆبەی لێ وەرگرت و گەڕایەوە سەری بە میهرو بەزەیی خۆی.

٦)- ﴿ثُمَّ ٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيۡهِ وَهَدَىٰ ﴾، پاشان پەروەردگاری هەڵیبژارد واتە: بۆ پێغەمبەرایەتیی و گەڕایەوە سەری، یان تەوبەی لێ وەرگرت و ڕێنمایی کرد، لە ڕاستییدا تەوبە لێوەرگیرانی و ڕێنمایی کرانی، پێش هەڵبژێردرانی بووە بە پێغەمبەرایەتیی، واتە: پێشێ گەڕاوەتەوەو خوا ڕێنمایی کردوە بۆ چۆنیەتیی گەڕانەوە، ئنجا شایستەی ئەوە بووە کە هەڵیبژێرێ، کەواتە: گەڕانەوەکەی و ڕێنمایی کرانەکەی، پێش کرانی بە پێغەمبەر (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) بووە.

## مەسەلەی چوارەم:

**فەرمان کردنی خوا بە دابەزێرانی ئادەم و حەووا و ئیبلیس، لە بەهەشت، وەک دوژمنی یەکدی و، پێڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە هەر کەس دوای ڕێنمایی خوا بکەوێ، گومڕاو ژین تاڵ نابێ، بەڵام هەر کەس پشتی تێ بکا، لە دنیادا ژین تاڵ و، لە دواڕۆژیشدا بە کوێریی حەشر دەکرێ، لە سۆنگەی فەرامۆشکردنی ئایەتەکانی خوا لە دنیاداو، سزای سنوور شکێنانیش لە ڕۆژی دواییدا سەختترو بەردەوامترە لە هی دنیا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا جَمِيعَۢاۖ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ١٢٣ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ١٢٤ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ١٢٥ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَاۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ ١٢٦ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَنۡ أَسۡرَفَ وَلَمۡ يُؤۡمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦۚ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبۡقَىٰٓ ١٢٧ ﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا جَمِيعَۢا ﴾، خوا فەرمووی:هەردووک لاتان لێی دابەزن وێکڕا، **(جَميعاً اسْم مُفْرَد يَدُلُّ عَلَى التَّعَدُّدِ مثْل: الفَرِيق، وَيسْتَوِي فِيهِ المذكَّر وَغَيْرِه، وَالوَاحِد وَغَيْرِه)،** (جميع) ناوێکی تاکە دەلالەت لەسەر چەندێتیی (ژمارەیەک) دەکات، وەک وشەی (فريق) واتە: کۆمەڵێک، نێرینەو مێینەو، تاک و دووانی تێدا یەکسانن.

دەشگونجێ مەبەست لە: ﴿ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا ﴾، هەردووک لاتان لێی دابەزن، ﴿ جَمِيعَۢا ﴾، واتە: پێکەوە و وێکڕا، هەردووکتان واتە ئادەم و حەووا، لە لایەک، ئیبلیس لە لایەک، بەڵام پێکەوە لێی دابەزن بۆ ژیانی سەر زەوی.

٢)- ﴿بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞ﴾، هەندێکتان دوژمنن بۆ هەندێکتان، کە لێرە ڕووی دواندن لە ئادەم و حەووا لە لایەک و، ئیبلیس لە لایەک، بۆیەش بە ڕاناوی کۆ دوێنراون، چونکە دوژمنایەتیی نێوان خۆیان و وەچەکەیان ڕەچاو کراوە، کە ئەو کاتە دیارە کۆمەڵی جندو کۆمەڵی مرۆڤ، هەڵبەتە لە نێو مرۆڤانیشدا، کەسانێک دەبن بە شوێنکەوتووی شەیتان و، لە نێو جندیش دا کە وەچەی ئیبلیسن، کەسانێک دەبن بە شوێنکەوتەی ئادەم، کەسانێکیش هەر بە دوای بابی خۆیان دەکەون، گرنگ ئەوەیە دوژمنایەتیی پەیدا دەبێ لە نێو ئەو دوو کۆمەڵەدا، بۆیە بە کۆ ناوی هێناون.

٣)- ﴿فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى﴾، (ف)ی (فَإِمَّا) دەڵێ: (تَفْرِيعٌ علَى الأَمْرِ بالهبوط)، واتە: ئێوە دابەزن، ئنجا کە دابەزین، هەر کاتێک لە منەوە ڕێنماییتان بۆ هات، (ڕێنماییتان بۆ هات) هەندێک لە زانایان گوتوویانە: واتە: ئەی مرۆڤەکان! بەڵام، نا، ڕێنماییتان بۆ هات یانی: بۆ هەردووک لاتان، هەم بۆ مرۆڤەکان، هەم بۆ جند، هەم بۆ وەچەی ئادەم، هەم بۆ وەچەی ئیبلیس.

٤)- ﴿فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ﴾، هەر کەسێک شوێن ڕێنمایی من کەوت، واتە: ئەو ڕێنمایییەی کە لەسەر زمانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَامِ)و لە دوو توێی پەیام و کتێبەکانی خۆیدا، خوا دایدەبەزێنێ، ئەوە نە گومڕا دەبێ و نە ناڕەحەت دەبێ، واتە: لە دنیادا گومڕا نابێ و، لە دواڕۆژیشدا تووشی ژین تاڵیی و ناڕەحەتیی نابێ.

یاخود: لە دنیادا گومڕا نابێ کە سەرەنجام تووشی ژین تاڵیی ببێ، هەر لە دنیادا.

دیارە (يَشۡقَىٰ)، پێچەوانەی (يَسْعد)ە، (شَقَاوَة) پێچەوانەی (سَعَادَة)ە، (سَعَادَة) واتە: بەختەوەریی، سەرفرازیی، خۆشحاڵیی، کامەرانیی، بەڵام (شَقَاء، شَقَاوَة) یانی: بەدحاڵیی، ژینتاڵیی، ناڕەحەتیی، گرفتاریی.

٥)- ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا ﴾، بەڵام هەر کەسێک ڕوو وەرچەرخێنێت لە یادی من، لە بەرنامەی من، بە دڵنیایی ژیانێکی تەنگ و تاڵی دەبێ، واتە: ژیانێکی تاڵ لە دنیادا، یاخود وەک هەندێک لە زانایان دەڵێن: لە دوای مەرگ و گۆڕ، واتە: لە قۆناغی بەرزەخدا، هەندێکیشیان گوتوویانە: هەر مەبەست پێی دوارۆژە، ژیانێکی تەنگ و تاڵی دەبێ لە دۆزەخدا، دەشگونجێ مەبەست پێی هەر سێ قۆناغەکان بێ، واتە: هەم لە دنیادا تووشی ژیانی تەنگ و تاڵ و ناڕەحەت دەبێ، هەم لە قۆناغی بەرزەخدا، سزایەکە لە دوای مردنەوە دەست پێدەکات، ﴿ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾، هەم لە دوارۆژیشدا، کە ژیانێکی ناڕەحەت و گرفتارانەی نێو دۆزەخە، (**الضَّنْك: هُوَ الضِّيقُ الشَّدِيدُ الَّذِي تحَاول أَنْ تُفلْتَ مِنْهُ هُنَا أَو هُنَاكَ، فَلَا تَسْتَطِيع**)، (**ضنك**) بریتیە لەو تەنگیی و سەغڵەتییە قورسەی کە بەملاو لادا دەتەوێ خۆتی لێ دەرباز بکەی، بەڵام ناتوانی.

کە دەفەرموێ: هەر کەسێ بە دوای ڕێنمایی من بکەوێ، نە گومڕا دەبێ، نە ناڕەحەت و بەدبەخت و گرفتار دەبێ، ئەمە هەم لە سوورەتی (**الأنعام**)دا، هەم لە سوورەتی (**الزمر**)دا خوا باسی کردوە: ﴿ فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ﴿١٢٥﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێک خوا بیەوێ بیخاتە سەر ڕاستە ڕێ، سینەی بۆ ئیسلام بۆ ملکەچیی بۆ خوا، ئاوەڵاو گوشاد دەکات، دڵی فەڕاح دەکات، بۆ ئەوەی هیدایەتی خوای زۆر بچێتە نێو دڵ.

هەر لە سوورەتی (**الزمر**)دا لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: ئایا کەسێک کە خوا سینەی ئاوەڵا کردۆتەوەو، گوشاد کردوە بۆ ئیسلام، (واتە: بۆ ملکەچیی بۆ خوا، بەندایەتیی بۆ خوا)و کەوتۆتە سەر ڕۆشناییەک لە پەروەردگاریەوە، واتە: ئایا ئەوەو کەسێکی دیکەی کە پێچەوانەی ئەوە یەکسانن؟ بە تەئکید نەخێر.

ئنجا وشەی (**ضنك**) چاوگە، (**ضَنُكَ «مثل كَرُمَ ضناكة وضنكاً**)، واتە: تەنگ بوو، (**كَرُمَ**)، واتە: بەڕێز بوو، (**ولكونه مصدراً لم يتغير لفظه باختلاف موصوفه**)، چاوگ

بۆ (**مذكر و مؤنث**)، وەک یەکە، چونکە چاوگە، یانی: پێویستیی بەوە نیە کە شوێن وەسفکراوەکەی بکەوێ، ئەگەر ئەو (**مؤنث**) بێ ئەویش (**مؤنث**) بێ و، ئەگەر (**مذكر**) بوو (**مذكر**) بێ، ئەگەر کۆ بوو کۆ بێ، ئەگەر تاک بوو، تاک بێ.

بۆیە لێرە دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا﴾، نەیفەرمووە: (**مَعِيشَةً ضنكة**)، چونکە چاوگەو چاوگ (**مصدر**)یش لەسەر یەک حاڵەت دەمێنێتەوە.

٦)- ﴿وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ﴾، لە ڕۆژی دواییدا - سەرباری ژیانی تەنگ و تاڵی دنیا، یان بەرزەخ، یان دنیاو بەرزەخ و دواڕۆژ، لە ڕۆژی هەڵسانەوەو زیندوو کرانەوەش دا-، بە کوێریی کۆیدەکەینەوە، بە کوێریی زیندووی دەکەینەوەو کۆی دەکەینەوە، دەیهێنینە مەیدانی لێپرسینەوەو سزاو پاداشت.

٧)- ﴿قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا﴾، گوتی: پەروەردگارم! بۆچی بە کوێریی کۆت کردوومەوە، یان زیندووت کردوومەوە؟ لە حاڵێکدا پێشتر بینەر بووم؟ خوا ﷻ بە کرداری ڕابردوو دەیهێنێ، نافەرموێ: (**يقول**)، چونکە بۆ لای خوا ﷻ ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو، وەک یەکن، بۆ ئێمە ئەو ماوەی کە تێیداین پێی دەگوترێ: ئێستاو، هی پێشتر پێی دەگوترێ: ڕابردوو، ئەوەی کە نەهاتوە، پێی دەگوترێ: داهاتوو، بەڵام بۆ خوا هەمووی وەک یەکە، خوا لە دەرەوەی کات و شوێنە.

بۆیە یەکسەر بە ڕابردوو دەیهێنێ، مانایەکی دیکەشی هەیە کە: خوا ﷻ ئەوەندە بە توانایە لەسەر شتەکان، کە داهاتوو وەک ئێستا دێنێ، چونکە هیچ شتێک لە بەرانبەر ویستی ڕەهایی خوادا، نابێتە پەرچ و کۆسپ.

﴿وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا﴾، بە دڵنیایی پێشتر، (لە ژیانی دنیادا)، بینەر بووم.

٨)- ﴿قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا﴾، خوا فەرمووی: هەر بەو شێوەیەمان سزادای کە نیشانەکانی ئێمە، یان ئایەتەکانی ئێمە بۆ تۆ هاتن و، تۆش لە بیرت کردن، (**كَذَٰلِكَ أي: مِثْلَ ذَٰلِكَ الحال الَّذِي تساءلت عن سببها، كنت نسيت آياتنا حين أتتك**)، وەک ئەو حاڵەتەی لە

هۆكارەكەی دەپرسی، هەر ئاواش بوو كە ئایەتەكانی ئێمە، (واتە: ڕستەكانی فەرمایشتی خوا، یاخود: موعجیزەی پێغەمبەران، یان دیاردە گەردوونییەكان، كە لە وەحیی خوادا باسیان دەكرا)، بۆ تۆ هاتن، بەڵام تۆ لە بیرت بردنەوەو فەرامۆشت كردن، وەك چۆن كەسێك شتێكی لە بیر دەچێ، ئاوا لە بیر خۆتت بردنەوەو پشت گوێت خستن.

٩)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ ﴾، هەر بەو شێوەیە ئەمڕۆ تۆش فەرامۆش دەكرێی و پشت گوێ دەخرێی و لە بیر دەكرێی، یاخود (تُنسَىٰ) یانی: (تُحْرَمُ من رحمة الله)، لە بەزەیی خوا بێبەش دەكرێی، یاخود وازت لێدەهێنرێی (تُهْمَلُ أو تترك).

١٠)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَنۡ أَسۡرَفَ وَلَمۡ يُؤۡمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦۚ ﴾، هەر بەو شێوە سزادانەش، سزای كەسێك دەدەین كە زێدەڕۆیی دەكات و بڕوا بە نیشانەو ئایەتەكانی پەروەردگاری ناهێنێ، (أي: مثل ذَلِكَ الجزاء نَجْزِي كَأَنَّ ذَلِكَ الجَزَاء لاَ مَثِيلَ لَهُ، إشارة إلى مَعِيشَة الضَّنْكَ فِي الدُّنْيَا، وَالحَشْر أَعْمَى يَوْمَ القِيَامَة)، واتە: وەك ئەو سزا دانە سزات دەدەین، ئەو سزادانەی كە وێنەی نیە، بۆیە بە خۆی دەچوێنرێتەوە، ئەوە ئاماژەیە بۆ ئەو ژیانە تەنگ و تاڵە لە دنیاداو، ئەو كۆكردنەوەیە بە كوێریی لە ڕۆژی قیامەتدا.

١١)- ﴿ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبۡقَىٰٓ ﴾، بە دڵنیایی سزای دواڕۆژ، سەختترەو بەردەوامتریشە، سەختترە لە سزای دنیا، یان لە سزای بەرزەخ، بەردەوامتریشە و نابڕێتەوە، دیارە ئینسان لەسەر چی بژی، لەسەر ئەوەش دەمرێ، هەروەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيهِ} (أخرجه عبد بن حميد برقم: ١٠١٣، ومسلم برقم: ٢٨٧٨، وابن حبان برقم: ٧٣١٩، والحاكم برقم: ٣٦٨٨)، واتە: هەر بەندەیەك لەسەر چی مردبێ، لەسەر ئەوەش زیندوو دەكرێتەوە.

بە تەئكید ئینسان لەسەر چی بژی، لەسەر ئەوەش دەمرێ و، لەسەر چی بمرێ، لەسەر ئەوەش زیندوو دەكرێتەوە.

## وەڵامی سێ پرسیار:

**پرسیاری یەکەم:** لێرەدا خوا دەفەرموێ: بە کوێریی کۆی دەکەینەوە، کەچی لە سوورەتی **(الكهف)** دەفەرموێ: ﴿ وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُواْ عَنْهَا مَصْرِفًا ﴾، واتە: تاوانبارەکان ئاگریان بینی، واتە: ئاگری دۆزەخ و دڵنیابوون کە دەیچنە نێو، بەڵام هیچ ڕێی لێ لادانیشیان وەچەنگ نەکەوت، لەوێ دەفەرموێ: تاوانبارەکان ئاگر دەبینن، کەچی لێرە دەفەرموێ: بە کوێریی حەشریان دەکەین، ئنجا ئەگەر بە کوێریی کۆبکرێنەوە، ئاگر نابینن و دۆزەخ نابینن!

وەڵامەکەی ئەوەیە کە ڕۆژی دوایی، قۆناغ قۆناغە، لە قۆناغێکدا کوێر دەکرێن، لە قۆناغێکدا بۆ ئەوەی کە زیاتر سام و هەیبەت و ترسی دۆزەخیان بچێتە دڵ، چاویان دەکرێتەوە، هەروەک لە بارەی شتی دیکەشەوە هاتوە، لە شوێنێک خوا دەفەرموێ: ﴿ ...وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾القصص، واتە: تاوانبارەکان لە گوناهەکانیان لێیان ناپرسرێ، لە شوێنێکی دیکەش دەفەرموێ: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾الصافات، واتە: ڕایانگرن لێیان دەپرسرێ، لە شوێنێک لێیان ناپرسرێ، پێیان دەگوترێ: بڕۆن، لە شوێنێک لێیان دەپرسرێ، یاخود لێیان ناپرسرێ، پرسیار کردنی ئەوە کە بزانن وەڵامەکەی چیە؟ بەڵام پرسیاریان لێدەکرێ، وەک پرسیار کردنی سەرزەنشت و سەرکۆنە کردن.

**پرسیاری دوومیان:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى مَنْ أَسْرَفَ ﴾، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە دەڵێ: **(الجزاء من جنس العمل)**، سزاو پاداشت بە پێی توخم و ڕەگەزی کردەوەکەیە، لە ڕاستییدا ئەوەی کە لە دنیادا ئینسان لە خۆیدا دەیهێنێتە دی، لە نیەت لە ئیمان و عەقیدە، لە قسە، لە ڕەوشت و ڕەفتار، لە ئاکار، ئەوەی کە لە خۆیدا دەیهێنێتە دی، لە دوارۆژدا ئەوە بۆی بەرجەستە دەبێتەوە، سزایەکەی، بە پێی ئەوەی کە لە دنیادا لە عەقیدەی خراپ، بیری خراپ، نیەتی خراپ، کردەوەی خراپ لە خۆیدا هێناویەتە دی و، بەرجەستەی کردوە، لە قیامەتدا ئەوەی بۆ بەرجەستە دەبێتەوە، هەروەها بە پێچەوانەشەوە: ئەگەر چاکەکار بووبێ، کردەوە چاکەکانی خۆی بۆ بەرجەستە دەبنەوە.

**پرسیاری سێیەم:** کە دەفەرموێ: (مَعِيشَةً ضَنكًا ) ژیانێکی تەنگ و تاڵ، یەکێک بۆی هەیە بڵێ: زۆر لە خەڵکی بێبڕواو کافرو بێ دین دەبینین، کە ژیانیان خۆشە، لە ڕابواردن و خۆشگوزەرانیی دان، بەڵام خوا دەفەرموێ: کەسێک پشت لە بەرنامەو یادی من بکات، تووشی ژیانی تەنگ و تاڵ دەبێ، وەڵامەکەی چییە؟

وەڵامەکەی ئەوەیە کە ژیانی تەنگ و تاڵ، هەر ئەوە نیە کە مرۆڤ پارەی نەبێ و، ئیمکانیەتی نەبێ و کۆشک و تەلاری نەبێ، نا، یانی: لە دەروونیدا موڕتاح و ئاسوودە نیە، هەمیشە لە دڵە ڕاوکەدایە، کە ئەو دنیایە بە جێ دەهێڵێ! لە ڕاستییدا ئینسان بە دڵ و دەروون بە ڕووح شادمان دەبێ، نەک بە جەستە، ئنجا پێشتریش باسمان کرد: ئەو ژیانە تەنگ و تاڵە، دەگونجێ مەبەست پێی ئەو ژیانە مەعنەوییەی دنیا بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی سزای قۆناغی بەرزەخ بێ، کە بە سزای گۆڕ ناوی هاتوە، دەشگونجێ مەبەست پێی سزای ڕۆژی دوایی بێ، دەشگونجێ لە یەک کاتدا مەبەست پێی هەرسێکیان بێ، واتە: هەر کەسێ لە ئایین و بەرنامەی خوا لایدا، لە ژیانی دنیاو، لە قۆناغی بەرزەخ و، لە ڕۆژی دوایی دا، تووشی ژیان و گوزەرانی تەنگ و تاڵ و ناڕەحەت و پڕ سەغڵەتیی دەبێ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان هەشـت (٨) ئایەتـەکانی کۆتایـی سـوورەتی (طـە) دەگرێتـە خـۆی، کـە بریتیـن لـە ئایەتـەکانی: (١٢٨ - ١٣٥) کـە تییانـدا پـاش ئامـاژە کـردن بـە کۆمەڵـگە پێشـووەکان و سـەرەنجامی شـوومیان، چەنـد ڕێنماییەکـی گـەورەو گرنـگ بـۆ پێغەمبـەر ﷺ خراونـە ڕوو:

١- خۆڕاگریی لەسەر قسەو قاڵی کافرەکان.

٢- خوا بە پاکگرتن و ستایشکردنی لە کاتە جیاوازەکانی شەوگارو ڕۆژگاردا.

٣- چاو نەبڕینە نازو نیعمەت و زرق و برقی ژیان و گوزەرانی ملهوڕانی بێبڕوا.

٤- فەرمان کردنی بە خاووخێزان و نیزکانی، بە نوێژو پشوو درێژیی کردن.

سـەرەنجام قسـەیەکی بـێ جێی کافـرەکان - کـە زۆر دووپات کراوەتـەوە - دەهێنێ، کە داوای موعجیزەیەکـی وەک هـی پێغەمبـەرانی پێشـوو دەکـەن، خوای بەرزیش سـەرنجییان بـۆ بەڵگەی سـەلمێنراوی ڕاسـتیی موحەممـەد ﷺ لە کتێبە پێشـوەکاندا ڕادەکێشـێ.

دەفەرموێ: بۆیە پێغەمبەرمان بۆ ناردوون، تاکو هیچ بەڵگەو بیانوویان نەبن.

لە کۆتاییشدا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

پێیـان بڵـێ: هەموومـان چاوەڕێـن ئێـوەش چـاوەڕێ بـن، داخـۆ کـێ خـاوەن ڕێـی ڕاسـت و ڕێکـەو ڕێنمایـی کـراوەو، کێـش گومـڕاو بێمـرادە؟!

﴿ أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ الْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَاكِنِهِمْ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّأُولِي النُّهَىٰ ﴿١٢٨﴾ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى ﴿١٢٩﴾ فَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ

وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ۖ وَمِنْ ءَانَآيِٕ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ ﴿١٣٠﴾ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿١٣٢﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَا يَأْتِينَا بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّهِۦٓ ۚ أَوَلَمْ تَأْتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٣٣﴾ وَلَوْ أَنَّآ أَهْلَكْنَٰهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِۦ لَقَالُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ ﴿١٣٤﴾ قُلْ كُلٌّ مُّتَرَبِّصٌ فَتَرَبَّصُوا۟ ۖ فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ أَصْحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِىِّ وَمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴿١٣٥﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئایا بۆیان نەبۆتە مایەی ڕێنمایی و بۆیان دەرنەکەوتوە لە پێش واندا چەندنمان لە (خەڵکی) سەدەکان فەوتاندوون، کە ئێستا ئەوان (کافرانی ڕۆژگاری پێغەمبەر) بە نێو خانووبەرەکانیاندا دێن و دەچن (لە کاتی سەفەر کردنیاندا) بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ خاوەن عەقڵان ﴿١٢٨﴾ ئەگەر وشە (بڕیار)ێکیش لە پەروەردگارتەوە ڕانەبردبایەو، کاتێکی ناوبراو دانەنرابایە (بۆ سزادانیان کە قیامەتە) ئەوە (سزادان) پێیانەوەپەیوەست دەبوو ﴿١٢٩﴾ کەواتە: لە بەرانبەر ئەو (کوفرو شیرک و قسەی پووچ)ەدا کە دەیڵێن، خۆڕاگربە بە ستایشکردنەوە پەروەردگارت بە پاک بگرە، بەر لە خۆرهەڵاتن و لە پێش ئاوابوونی دا، هەروەها لە کاتەکانی شەوگارداو لە لایەنەکانی ڕۆژگاریشدا (خوا) بە پاک بگرە، بەڵکو (لە پاداشتی خوا) ڕازی بێ ﴿١٣٠﴾ چاویشت مەبڕە جوانیی و زرق و برقێکی ژیانی دنیا، کە چەند کۆمەڵێک لەوان (بێبڕوایان)مان لێ بەهرەمەند کردوە، بەڵکو تێیدا تاقییتان بکەینەوەو بژیو (ی حەڵاڵ و زەڵاڵ)ی پەروەردگاریشت باشترو بەردەوامترە ﴿١٣١﴾ فەرمانیش بە خاووخێزانت بکە بە نوێژ

کردن و، خۆیشت لە سەری خۆراگرو بەردەوامبە، هیچ بژیوت لێ ناخوازین، ئێمە بژیوت دەدەین و، سەرەنجامیش بۆ پارێزکارییە ﴿١٣٢﴾ هەروەها (بێبڕوایەکان) گوتیان: دەبووایە نیشانەیەکمان لە پەروەردگاریەوە بۆ بهێنێ، ئەدی ئایا ئەو بەڵگە ڕۆشنەی لە پەڕاوە پێشووەکاندایە بۆیان نەهاتووە؟! ﴿١٣٣﴾ (بۆیەش پێغەمبەرمان بۆ ناردوون) چونکە ئەگەر پێش ئەوە بە ئازارو سزایەک فەوتاندبامانن، دەیانگوت: پەروەردگارمان! دەبووایە ڕەوانەکراوێکت بۆلا ناردبن، تاکو بەر لەوەی زەبوون و شەرمەزار بین، شوێن ئایەتەکانت کەوتباین ﴿١٣٤﴾ بڵێ: هەموو لایەک چاوەڕوانین، ئێوەش چاوەڕوان بن، لەمەودوا دەزانن کێن خاوەنانی ڕێی ڕاست و ڕێک و، کێ ڕاستە ڕێ بووە! ﴿١٣٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَفَلَمۡ يَهۡدِ لَهُمۡ): (أي: أفلم يبين لهم) واتە: ئایا بۆی ڕوون نەکردوونەوە، یان (أفلم يتبين لهم) ئایا بۆیان ڕوون نەبۆتەوە.

(لِزَامًا): (الملازمُ جِدًّا) شتێک کە لە شتێک جیانابێتەوە.

(أَزۡوَٰجًا): وشەی (أزواج) ئەگەر کۆی (زوج) بێ، (زوج) واتە: شتێک کە لە جۆری خۆی چ نێر بێ، چ مێ بێ، بە هەر کامێکیان دەگوترێ: (زوج) نەک هەر بە یەکێکیان بگوترێ، ئنجا (أزواج) دەگونجێ کۆی ئەو نێرو مێیانە بێ، دەشگونجێ بە مانای (أصناف) بێ واتە: چەند کۆمەڵێک لەوان.

(زَهۡرَةَ): (الزَّهْرَةُ: وَاحِدَةُ الزَّهْرِ، زَهْرَةُ الدُّنيَا: بَهْجَتُهَا وَمَتَاعُهَا)، (زَهْرَة): بریتیە لە یەک دانە لە گوڵ، (زَهْرَةُ الدُّنيَا) واتە: جوانیی و ڕابواردنی ژیانی دنیا.

(ٱلسَّوِيِّ): (المسْتَوِي، المُعْتَدِل، لاَ إِفْرَاطَ فِيه، وَلاَ تَفْرِيط، الوَسَط)، (سَوِيّ): بە مانای ڕێک و، بە مانای زێدەڕۆیی و کورتهێنانی تێدانیەو، بە مانای میانجییش دێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ وەک لـە بەرایـی ئـەم سـوورەتەدا کـە هەشـت ئایـەت بـوون و، کۆمەڵێـک ڕاسـتیی مەزنیـان تێـدا خرابوونـە ڕوو و، پێغەمبـەری خاتەمیـان ڕاسـتەوخۆ پـێ دوێنرابوو و، لـە کۆتایـی ئـەم سـوورەتەش دا، وەک بەراییەکـەی، دیسـان هەشـت ئایەتە، ئەو هەشـت ئایەتـەش ڕێنمایـی و ئامۆژگاریـی گـەورەو گرنگـی گرتوونـە خـۆی، بۆ پێغەمبـەری خاتەم ﷺ.

سـەرەتا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَلَمۡ يَهۡدِ لَهُمۡ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ ﴾، ئایا ئـەوە کـە زۆرێـک لـە سـەدەکانمان لـە پێـش ئەوانـدا لـە بەیـن بـردوون، ئـا ئـەوە بـۆی ڕوون نەکردوونـەوە؟ واتـە: بـۆی ڕوون نەکردوونـەوە، ئەوانیـش ئەگـەر هـەر لەسـەر ڕچـەو ڕێبـازی وان بـڕۆن و، هـەر عـادەت و نەریتـی وان ڕەچـاو بکـەن، هەمـان سـزا بـۆ ئەوانیـش لـە بۆسـەدا هەیـە؟!

وشـەی (قـرون) کـە کـۆی (قـرن)ە، واتە: سـەدە، مەبەسـت پێـی ئـەو کۆمەڵگایانەن کـە لـە ڕۆژگارێکـی دیارییکـراودا پێکـەوە ژیـاون، ﴿ يَمۡشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمۡ ﴾، کـە ئـەوان واتـە: کافـرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ، یـان کافـرەکانی هەمـوو ڕۆژگارەکان، بـە شـوێنەوارەکانیاندا دێـن و دەچـن، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ ﴾، بـە ڕاسـتیی لـەوەدا نیشـانە هـەن بـۆ خـاوەن عەقـڵان، ﴿ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامٗا وَأَجَلٞ مُّسَمّٗى ﴾، ئەگـەر وشـەیەک لـە پەروەردگارتـەوە تێنەپەڕیبایـە، (خـوا بـە پێـی عەقڵـی ئێمـە ئێمـە دەدوێنـێ، وەک چـۆن ئێمـە بڕیـار دەدەیـن و وشـەیەک، یـان ڕسـتەیەک دەنووسـین، بۆیـە خـوای پـەروەردگار بـە وشـە تەعبیـر دەکات، لـە بڕیـارە ڕابردووەکـەی خـۆی)، ئـەوە سـزایان لەسـەر پێویسـت دەبـوو، ئەگـەر کاتێکـی ناوبـراو

دانەنرابایە بۆ سزادانیان، بەڵام خوا ﷻ لە ئەزەلەوە سیستمی خۆی داناوە بۆ بەشەر کە دنیا شوێنی تاقیکردنەوەیە، بەرزەخ قۆناغێکی ڕاگوزەرەو، دواڕۆژیش قۆناغی کۆتاییە، بۆیە خوا ﷻ ئەوەی کە لە ڕۆژی دواییدا دەیکات، نایهێنێ بۆ دنیا، کاتێکی ناوبراوی دیاریی کردوە، ئەوەی کە ئەوانەی پەلەی لێدەکەن، نەخێر لە کات و ساتی خۆی دا دێ.

ئنجا خوا ﷻ چەند ڕێنماییەک ئاراستەی پێغەمبەر ﷺ دەکات، دەفەرمووێ: ﴿ فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ ﴾، لەسەر ئەوەی کە دەیڵێن: خۆڕاگربە، ئەوەی کە دەیڵێن: وەک پێشتر ئاماژەمان پێدا، چ بێ ئەدەبییان بەرانبەر بە خوا، کە هاوبەشی بۆ دادەنێن، ڕۆڵەی بۆ بڕیار دەدەن، لە کوڕان، لە کچان، چ ئەوە کە نکووڵیی لە تەنیا پەرستراوێتیی خوا دەکەن و، نکووڵیی لە ناوو سیفەتەکانی دەکەن، یاخود کە هەندێ لە دروستکراوەکانی دەبەنە ڕیزی خوای پەروەردگار، یان بەرانبەر پێغەمبەر ﷺ، کە بە جادووگەر، شێت، فاڵچیی، ناوزەدیان دەکرد، یان بەرانبەر قورئان، کە دەیانگوت: موحەممەد لە خۆوە گوتوویەتی، یان هەڵیبەستوە، یان بەرانبەر ڕۆژی دوایی، یان بەرانبەر بە ڕاستییەکانی ئیسلام ... هتد، لەسەر هەموو ئەوانەی ئەوان دەیڵێن و تۆش لەسەر دڵت ناخۆشە، خۆڕاگربە، ﴿ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ ﴾، بۆ ئەوەش بتوانی خۆڕاگربی، پشوو درێژبی، بە حەوسەڵە بی، پەروەردگارت بە ستایشکردنەوە بە پاک بگرە، واتە: هەم بە پاکی بگرە، هەم ستایشی بکە، عەقڵ و دڵی خۆت پڕ بکە لە ستایش و مەدح و سەنای خوا، چونکە خوا لە زاتی خۆیدا، هەم پاکە، هەم چاکە، هەم بە پاکگیراوە، هەم ستایشکراوە، ﴿ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ غُرُوبِهَاۖ ﴾، با ئەو بە پاکگرتن و ستایش کردنەی خوا، پێش هەڵهاتنی خۆر بێ و، پێش ئاوا بوونی خۆریش بێ، ﴿ وَمِنۡ ءَانَآيِٕ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡ وَأَطۡرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرۡضَىٰ ﴾، هەروەها لە کاتەکانی شەوگارداو، لە لایەکانی ڕۆژگاردا، کە بەیانیان و ئێواران، بە پاکی بگرە، بەڵکو لە ئەنجامی ئەم بەندایەتیی کردنەت دا، پاداشتێکت دەستبکەوێ، کە نەفست ڕازی بێ لەو پاداشتەی کە دەستت دەکەوێ.

﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ﴾، چاویشت مەبڕە ئەوەی کە چەند کۆمەڵێکمان لەوان لە جوانیی ژیانی دنیا بەهرەمەند کردوون، ئەویش بۆ تاقیکردنەوە، ﴿ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴾، بژیوی پەروەردگاریشت باشترەو، بەردەوامتریشە.

دەگونجێ ئەمە مەبەست پێی بژیوی حەڵاڵ بێ، کە با کەمیش بێ، بەڵام مادام حەڵاڵە، خوا بە هی خوی دابنێ، چونکە هەموو بژیوو ڕۆزییەک هی خوای بەخشەرە، بەڵام وەک تەشریف ڕزقی حەڵاڵی پاڵداوەتە لای خۆی، کە پاکترەو بەردەوامتریشە.

دەشگونجێ مەبەست پێی ئەو بژیوە بێ کۆتاییە بێ، کە لە بەهەشتدا بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺو شوێنکەوتووانی داناوە.

﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ﴾، فەرمان بە خاووخێزانت خزم و نیزیکانت بکە بە نوێژ، خۆشت لەسەری خۆڕاگربە، بەردەوام بە، ئێمە بژیوت لێ داوا ناکەین، ئێمە بژیوی تۆ دەدەین، ﴿ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴾، سەرەنجامی چاکیش بۆ پارێزکارییە.

ئنجا قسەیەکی دیکەی بێبڕوایەکان باس دەکات و بەرپەرچی دەداتەوە، کە زۆر باسیان کردوە: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَا يَأْتِينَا بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّهِۦٓ ۚ أَوَلَمْ تَأْتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴾، هەروەها گوتیان: دەبووایە نیشانەیەک لە پەروەردگاریەوە بۆ ئێمە بێنێ، ئایا نیشانە ڕۆشنەکەی کە لە پەڕەکانی پێشەوەدا هەیە، بۆیان نەهاتوە؟ کە دوایی تیشکی زیاتری دەخەینە سەر، کە دەکرێ بە چەند شێوەیەک مانا بکرێ، یەکێکیان ئەوەیە کە ئەو موژدە پێدان و هەواڵپێدانەی پەڕاوە پێشووەکانە، بە هاتنی موحەممەد ﷺو، دابەزێنرانی دوا کتێبی خوای پەروەردگار، یاخود ئەو پەڕاوەی کە لە کتێبە پێشووەکان دایە، مەبەست پێی قورئانە کە ئەو هەواڵ و دەنگ و باسەی گەلە پێشووەکان دەگێڕێتەوە، کە لە پەڕاوە پێشووەکاندا

هاتوە، بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کە ئەو قورئانەی باسی ئەو بابەتە پەنهانانە دەکات، کە لە گەڵە پێشووەکاندا ڕوویان داوە، هەڵەی خاوەن کتێبەکانیش ڕاست دەکاتەوە، بەڵگەو ئیسپاتێکی ڕوون و ڕۆشنە لەسەر ڕاستیی موحەممەد ﷺ.

ئنجا خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّآ أَهْلَكْنَٰهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِۦ ﴾، ئەگەر ئێمە پێش هاتنی موحەممەد ﷺ یان پێش دابەزینی قورئان، ئەوانمان بە سزایەک لەلایەن خۆمان فەوتاندبایە، بەڵایەکمان بۆ ناردبان، ﴿ لَقَالُواْ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ ﴾، دەیانگوت: پەروەردگارمان! دەبووایە ڕەوانەکراوێکمان بۆلا بنێری، ئێمە شوێن ئایەتەکانی تۆ بکەوین، پێش ئەوەی زەبوون بین و، سەرشۆڕو شەرمەزار بین.

﴿ قُلْ كُلٌّ مُّتَرَبِّصٌ فَتَرَبَّصُواْ ﴾ بڵێ: هەموو لایەک چاوەڕێن، ئێوەش چاوەڕێ بن، ﴿ فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ أَصْحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِيِّ وَمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴾ لەمەودوا دەزانن کێ خاوەنانی ڕێی ڕاستن و، کێش ڕێنمایی کراوەو ڕاستە ڕێ کراوە، لە لایەن خواوە، کێ خاوەنی ڕێی چەوت و لارەوە، کێش سەرگەردان و سەر لێشێواوە!



## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سەرزەنشتکردنی کافرەکان کە دەبووایە پەند لە کۆمەڵگا پێشووەکان وەربگرن و، ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە، کە ئەوانیش شایستەی سزان، بەڵام بە پێی سیستمی خواو بڕیاری ئەزەلیی، لە کاتی خۆیدا قیامەت دێ و، سزا دەدرێن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ الْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَاكِنِهِمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّأُولِي النُّهَىٰ ﴿١٢٨﴾ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى ﴿١٢٩﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ ﴾، وشەی (يهدي) واتە: ڕێنمایی دەکات، بەڵام کە بە (ل) بەرکاری خواستوە، دەڵێن: (**الهِدايَةُ: هُنَا مُسْتَعَارَةٌ للإرشاد إلى الأمور العقليةِ، فمعناها التبيين، ولذلك عُدِّي فِعْلُها باللاّم**)، ئەم وشەی (**يهدي**)یە لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ ڕێنمایی کردن، بۆ ئەو شتانەی کە بە عەقڵ دەرک دەکرێن، هەر بۆیەش (**فعل**)ی (**يهدي**) بە (ل)م تەعەددای پێکراوە، تاکو مانای ڕوونکردنەوەی بچێتە نێو، واتە: ئایا ڕێنمایی نەکردوون و بۆی ڕوون نەکردوونەوە؟!

٢)- ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ الْقُرُونِ ﴾، (**كم**) لێرەدا بۆ هەواڵ پێدانە، واتە: زۆر، لە پێش واندا زۆر سەدەمان فەوتاندوون، واتە: ئایا فەوتاندنی ئێمە بۆ زۆر لە سەدەو گەلە پێشکەوتووەکان، نەبۆتە هۆی ڕێنمایی کردنیان و بەرچاو ڕوونکردنەوەیان و، لێ حاڵی کردنیان، کە ئەوانیش سزایەکی هاوشێوە چاوەڕێیان دەکات، ئەگەر بێت و هەر لەسەر ڕچەی ئەوان بڕۆن؟ واتە: دەبووایە زۆر فەوتاندنمان بۆ گەلە پێشووەکان،

ببێتە ڕێنماییکارو بەرچاو ڕوونکەرەوەیان بۆ ئەوە، کە ئەگەر بێت و ئەوانیش دەست هەڵنەگرن لە کوفرو شیرک و لە گوناهو تاوان و ستەم و لادان، لە هەمان سزا بۆ ئەوانیش لە بۆسە دایە، چونکە وەک چۆن خوا لە گەردووندا یاسا گەردوونییەکانی داناون، لە ژیانی مرۆڤیشدا، یاسا مرۆییەکانی داناون.

٣)- ﴿ يَمۡشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمۡ ﴾، واتە: بە نێو خانووبەرەکانیاندا دێن و دەچن، مەبەست پێی کاتی سەفەر بووە، هەڵبەتە ئەگەر دوێنراوەکان ڕەچاو بکرێن کە گەلی عەرەب بوون، مەبەست پێی شوێنەواری عادو سەموودو ئەوانە بووە، کە کاتێک لە حیجازەوە چوون بۆ شام، بە شوێنەواری گەلی عادو سەموددا ڕۆیشتوون، پێشتریش باسمان کردوە.

٤)- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانە هەن، بۆ خاوەن عەقڵان، (**نُهَى جمع نُهيَة اسم للعَقْلِ، وَقَد يُستَعمَلُ النُّهى مُفْرَداً بِمَعْنَى العَقل**)، وشەی (**نهى**) کۆی (**نهية**)یە، کە (**نُهية**) ناوە بۆ عەقڵ، چونکە مرۆڤ قەدەغە دەکات و لە شتی خراپ دەیگێڕێتەوە، هەروەها جاری واش هەیە وشەی (**نُهى**) بە مانای تاک بەکاردەهێنرێ بۆ عەقڵ.

٥)- ﴿ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامٗا وَأَجَلٞ مُّسَمّٗى ﴾، ئەگەر وشەیەك لە پەروەردگارتەوە تێنەپەڕیبایەو کاتێکی ناوبراو ڕانەبردبایە.

(وشە) مەبەست پێی بڕیارە، واتە: ئەوە کە خوا دایناوە لە دواخستنی هاتنی سزاو ئازار، کە مەبەست ئەوەیە: خوا لە ئەزەلەوە سیستمەکەی وا داناوە، سزای دواڕۆژ لە دواڕۆژدابێ، پێش نەخرێ نە بۆ قۆناغی ژیانی دنیاو، نە بۆ بەرزەخ، ئنجا خوا دەفەرموێ: ئەگەر بڕیارێک لە پەروەردگارت پێشنەکەوتبایەو، کاتێکی ناوبراو دانەنرابایە سزا لەسەریان پێویست دەبوو.

﴿ لَكَانَ لِزَامٗا وَأَجَلٞ مُّسَمّٗى ﴾، یانی: (**لَكَانَ العَذَابُ لِزَامَاً**)، سزا لەسەریان پێویست دەبوو، پێیانەوە دەچەسپا، ﴿ وَأَجَلٞ مُّسَمّٗى ﴾، یانی: (**ولولا أجلٌ مُسَمىً**)، (**أَجَلُ**)، یانی: کاتێکی دیارییکراو، (مُّسَمّٗى )، یانی: ناوبراو، ئەگەر کاتی دیارییکراوو ناوبراو نەبووایە، کە

بریتیە لە ڕۆژی دوایی، ئەوە سزایان بەسەردا دەچەسپا، کە دەفەرموێ: ﴿ لَكَانَ لِزَامًا ﴾، (أي: لَكَانَ الإهلاكُ الشَّديدُ لازماً لَهُمْ)، فەوتاندنی سەخت، پێیانەوە پەیوەست دەبوو، کەواتە: مانای ئەم تەعبیرە ئاوای لێدێتەوە، (لولا كَلِمَةٌ سبَقت منْ ربِك، وأجلٌ مُسَمًّى يَقَعُ عنده الهَلاَك، لَكَانَ إهلاكهُمْ لازِماً)، ئەگەر وشەیەک لە پەروەردگارتەوە تێنەپەڕیبایەو، کاتێکی ناوبراو دیاریی نەکرابایە، کە لەو کاتەدا فەوتاندنیان دێتە پێش، ئەوە فەوتانیان لەسەر پێویست دەبوو، یاخود سزادانیان لەسەر پێویست دەبوو.

## نوکتەیەکی ڕەوانبێژیی:

لێرەدا (الخطیبُ الإسکافِي)، لە کتێبەکەی خۆی (درّة التنزیل وغرة التأویل)دا[1]، دەڵێ: ئەم تەعبیرە: ﴿ أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ الْقُرُونِ ﴾، کە لە ئایەتی (١٢٨)ی سوورەتی (طه)دا هاتوە، هەمان تەعبیر بە تۆزێک جیاوازییەوە، لە سوورەتی (السجدة)شدا هاتوە، لەوێ دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْقُرُونِ ﴿٢٦﴾ ﴾، کە دوو جیاوازیی هەن:

١- لەوەی سوورەتی (طه)دا، دەفەرموێ: (أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ).

٢- بەڵام لەوەی سوورەتی (السجدة)دا، دەفەرموێ: (أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ).

٣- لە هی سوورەتی (طه)دا، دەفەرموێ: (مِّن قَبْلَهُم مِّنَ الْقُرُونِ).

بەڵام لە هی سوورەتی (السجدة)دا، دەفەرموێ: (قَبْلِهِم مِّنَ الْقُرُونِ)، واتە: لەوێ (مِّنَ)ێک زیاد کراوە، بۆچی وایە؟

زۆر جاران گوتوومانە: شتێکی ئاشکرایە لە قورئاندا (ف)ێک، کە لە جێی (و) واوێک دادەنرێ، کە لەوێ فائە، لەوێ واوە، لەوێ (مِّنَ)، هەیە، لەوێ نیە، هەمووی حیکمەتی تێدایە.

---

(١) ص ٢٠٦،٢٠٧.

ئنجا دەڵێ: ئەگەر تەماشا بکەین، لە سوورەتی (طه)دا، ئەوە لە پێشەوە هاتوە: ﴿ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ۚ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾ ﴾، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ فِى مَسَٰكِنِهِمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ ﴿١٢٨﴾ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى ﴿١٢٩﴾ ﴾، لەبەر ئەوە لە سوورەتی (طه)دا بە (ف) ئەو ڕستانە هاتوون: ﴿ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ﴾، هەروەها ئەویش دووبارە بۆتەوە، بۆیە لێرەشدا: ﴿ أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ ﴾، ئەم (ف)ە، وەک (ف)ی (**جزائية**)یە، ئایا بۆیان ڕوون نەبۆتەوە، بۆی ڕوون نەکردوونەوە؟ بەڵام لە سوورەتی (**السجدة**)دا، شتێک نەهاتوە کە لێرەدا پێویست بکات بە (ف)، عەتف بکرێت، بەڵکو بە واو بادراوەتەوە، گێڕدراوەتەوە سەری، ئەم ڕستەیە گێڕدراوەتەوە سەر ڕستەی پێشێ، لە سوورەتی (**السجدة**)دا، ئاوا هاتوە:

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَلَا تَكُن فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآئِهِۦ ۖ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٣﴾ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟ ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾،

ئنجا لەوێ دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْقُرُونِ ﴾، کەواتە لەبەر ئەوەی ڕستەکانی پێشێ دا (ف)یان تێدا نەهاتوە، لێرەش بە پێویست نەزانراوە.

(من)یش کە لە ئایەتی (٢٦)ی سوورەتی (**السجدة**)دا هاتوە، ئەمە بۆ ئەوەیە کە ئەگەر (من) بێ لە شتێکدا، واتە: سەرەتای دەستپێکردنی کاتەکە دیاریی دەکات:

﴿ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْقُرُونِ ﴾،

واتە: لە سەرەتای پێش ئەوانەوە لە سەدەکان، لێرەدا زیاتر ماناکەی فراوان دەکات، ماناکەی زیاتر دەباتەوە پێشێ، بەڵام ئەگەر هەر (قَبْلِهِم )، بێ، واتە: لە پێش واندا، ئنجا ئایا ئەو پێش ئەوانە، لە کەیەوە دەستی پێ کردوە؟ لە سەرەتاوە، یان لە نێوەڕاست، یان لە کۆتایی دا؟ دیار نیە.

## مەسەلەی دووەم:

**فەرمان کردنی خوا بە پێغەمبەر ﷺ کە لەسەر قسەو قاڵی کافرەکان خۆڕاگربێ و، بە ستایشکردنەوە خوا بە پاک بگرێ، پێش خۆرهەڵاتن و پێش ئاوا بوونی و، لە کاتەکانی شەوگارو لایەکانی ڕۆژداو، چاوی نەبڕێتە ماڵ و سامان و زرق و برقی بێبڕوایان و، فەرمانیش بە خاووخێزانی بکات، بە نوێژو، دڵنیابێ لە بژێودرانی لەلایەن خواوەو، مسۆگەربێ کە سەرەنجامی چاک بۆ پارێزکارانە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ غُرُوبِهَاۖ وَمِنۡ ءَانَآيِٕ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡ وَأَطۡرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرۡضَىٰ ﴿١٣٠﴾ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ زَهۡرَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا لِنَفۡتِنَهُمۡ فِيهِۚ وَرِزۡقُ رَبِّكَ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰ ﴿١٣١﴾ وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَاۖ لَا نَسۡـَٔلُكَ رِزۡقٗاۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكَۗ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلتَّقۡوَىٰ ﴿١٣٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ ﴾، ئنجا لەسەر ئەوەی دەیڵێن، خۆڕاگربە، یانی: لە بەرانبەر قسەکانیاندا خۆڕاگرو دامەزراوو نەلەخشاو بە، کە بەرانبەر خوا شیرک و کوفر دەکەن و، تۆ بە شێت و جادووگەر دادەنێن و، با قسەکانیان هەر سست و خاویشت نەکەن، چ جای پاشەکشەت پێ بکەن!.

٢)- ﴿ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ ﴾، پەروەردگاریشت بە ستاییشکردنیەوە بە پاک بگرە، یانی: هاوکات لەگەڵ بە پاکگرتنی دا ستایشیشی بکە، چونکە خوا عزوجل لە هەموو هەڵەو پەڵەیەک دوورەو، هەرچی سیفەتی ئەوپەڕی بەرزو پەسندە، هەیەتی.

٣)- ﴿ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ غُرُوبِهَا ﴾، بەر لە خۆرهەڵاتن و بەر لە ئاوابوونیشی، واتە: بەیانیان زوو و ئێوارانیش، ئەو دوو کاتە زۆر سەرنجڕاکێشەی هێما (رمز)ی پەیدابوون و نەمانن!.

٤)- ﴿ وَمِنْ ءَانَآيِ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ ﴾، هەروەها خوا بە پاک بگرە لە کاتەکانی شەوگارو، لایەکانی ڕۆژگاریش دا: سەرەتاو نێوەڕاست و کۆتایی و ...هتد، یانی: شەوو ڕۆژ سەرگەرمی بە پاکگرتن و ستاییشکردنی خواو ڕازو نیازبە لە خزمەتی دا.

٥)- ﴿ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ ﴾، بەڵکو ڕازی بی، یانی: لە ئەنجامی ئەوەدا خوای بەرزو بێ هاوتا هێندەت پاداشت بداتەوە، کە پێی ڕازی و شادمان و بەختەوەر بی.

٦)- ﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، چاویشت مەبڕە ئەو زرق و برق و جوانییەی کە چەند خێزان و بنەماڵەیەک لەوانمان لێ بەهرەمەند کردوون، یان چەند کۆمەڵێک لەوان، چونکە: **(أزواج)** دەگونجێ کۆی **(زوج)**بێ، یانی: جووت، واتە: چەند ژن و مێردو خێزانێک، یان چەند ماڵ و بنەماڵەیەک، دەشگونجێ **(أزواج)** بە مانای **(أصناف)**و **(مجموعات)** بێ، یانی: جۆرەکان و کۆمەڵەکان.

٧)- ﴿ لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ﴾، تاکو لەوەدا تاقییان بکەینەوە، یانی: لەو زرق و برق و جوانیی و ڕازاوەییەدا بیانجەڕبێنین، نەک لەبەر ئەوەی خۆشمان دەوێن و لەلامان بەڕێزن!.

٨)- ﴿ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴾، بژیوی پەروەردگاریشت باشترو بەردەوامتریشە، هەم لە خودی خۆیدا چاکترە، هەم لە ڕووی کاتیشەوە بەراورد ناکرێ، چونکە نەبڕاوەو بێ کۆتاییە.

٩)- ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ ﴾، فەرمانیش بە خاوو خێزانت (یان بە هاوسەرو منداڵەکانت) بکە بە نوێژ بەرپاکردن، ئەمە لێی دەفامرێتەوە کە ئەرکی بابە لە خێزاندا، مشووری دینداریی خێزانەکەشیی بخوات، وێڕای مشووری دیناداریی و بژیو پەیداکردن.

١٠)- ﴿ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ﴾، خۆیشت لەسەر نوێژ زۆر خۆڕاگربە، **(الإصطبار)** لەسەر کێشی **(إفتعال)** یانی: زۆر لە خۆ کردن لە خۆڕاگریی و پشوو درێژیی دا.

١١)- ﴿ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ﴾، داوای هیچ ئەندازەیەک بژیو، یان: هیچ جۆرە بژیوێکت لێ ناکەین، نە بۆ خۆت و نە بۆ ماڵ و خێزانت.

١٢)- ﴿نَّحۡنُ نَرۡزُقُكَ﴾، ئێمە بژیوت دەدەین، یانی: پێداویستییەکانت لەلایەن ئێمەوە دابین دەکرێن، بەڵام بێگومان ئەوە مانای وانیە مرۆڤ هیچ هەوڵ نەدات! وەک پێغەمبەری خاتەم ﷺ فەرموویەتی: {**لو أنكم تتوكلون على الله حق التوكل، لرزقكم كما يرزق الطَّير، ألم تَرَى كيف تغدوا خماصاً وتروح بطاناً** }، **أخرجه أحمد: ٢٠٥، والترمذي: ٢٣٤٤، وقال: حسن صحيح**، کەواتە: باڵندەش جووڵەیەکی هەر هەیە بەیانییان بە سکی خاڵیی دەردەچێ و، ئێواران بە تێریی دەگەڕێتەوە!

١٣)- ﴿وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلتَّقۡوَىٰ﴾، سەرەنجامی چاکی دنیاو دوارۆژیش هەر لە گرەوی پارێزکاریی دایە، کەواتە: ئاگاداریی پارێزکاریی بەو خاترجەم بە، بەڵام پارێزکاریی بە مانای وشە.

## دوو کورتە سەرنج

١)- وشەی (زهرة)، دەڵێ: (**الزَهْرَةُ: وَاحِدَةٌ الزهر، وَهُو نَوْرُ الشَّجرِ والنَّبَاتِ، وتستعَارُ للزِّيْنَةِ المُعجِبَةِ المُبهِيَةِ، لأن مَنْظَرَ الزَّهْرَةِ يزينُ النَّبَاتَ ويُعجبُ النَّاظَر، أي: زِيْنَةُ الحَيَاة الدُّنْيا مِنَ اللِّبَاسِ، وَالأَنْعَامِ، وَالجَنَّانِ، وَالنِّسَاءِ وَالبَنِيْن**).

(**زهـرةٌ**) تاکـی (**زهْـر**)ە، (**زَهر**)یـش، یانـی: گـوڵ، (**زهـرةٌ**)، یانـی: گوڵێـک، لـە ئەصڵـدا وشـەی (**زهـر**)، بـە گوڵـی درەخـت و ڕووەک دەگوتـرێ، کـە گوڵەکـە کوڵوکـە دەردەکاو، دەخوازرێتـەوە بـۆ جوانیـی، جوانییەکـی سەرسـامکەری حەیرانکـەر، ئینسـان حەیـران بـکات و سەرسـامی بـکات، چونکـە دیمەنـی گـوڵ، ئـەو ڕووەکـە جـوان دەکات و بابـای بینـەرو تەماشـاکەریش سەرسـام دەکات.

کەواتـە: ﴿زَهۡرَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾، یـانی: جوانیـی ژیانـی دنیـا، کـە بـەرگ و پۆشـاک دەگرێتـەوە، ئـاژەڵ دەگرێتـەوە، بـاغ و بێسـتان دەگرێتـەوە، ئافرەتـان دەگرێتـەوەو کـوڕان و کچـان دەگرێتـەوە، هەمـوو ئـەو کـەل و پـەل و شـمەکانە دەگرێتـەوە، کـە جوانیـی دەدەن بـە ژیانـی دنیـا و ڕەونەقـی پـێ دەدەن.

٢)- ﴿أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ﴾، وەک پێشتریش ئاماژەمان پێدا: دەگونجی لێرەدا (أَزْوَٰجًا)، ئاماژە بێ بۆ چەند ماڵ و خێزانێک و بنەماڵەیەک لە بێبڕوایەکان، هەروەها دەشگونجێ وشەی (أَزْوَٰجًا)، هەرچەندە کۆی (زوج)، بەڵام وشەی (أَزْوَٰجًا)، بە مانای (أصناف)، واتە: کۆمەڵانێک، چەند پۆلێک، چەند دەستەیەک لەوانمان بەهرەمەند کردو، لەو جوانییەی ژیانی دنیامان پێدان.

لێرەدا ئەو فەرموودەیە دێنین:

**{أَنَّ فَاطِمَةَ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، بَلَغَهَا أَنَّ سَبْيًا جِيءَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَأَتَتْ تَشْتَكِي إِلَيْهِ مَا تَلْقَى مِنَ الرَّحَى تَسْأَلُهُ خَادِمًا مِنَ السَّبْيِ فَلَمْ تَجِدْهُ، فَأَخْبَرَتْ عَائِشَةُ بِذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺفَجَاءَهَا النَّبِيُّ ﷺ، وَقَدْ أَخَذْتُ وَعَلِيٌّ مَضْجِعَهُمَا، فَجَلَسَ فِي جَانِبِ الْفِرَاشِ، وَقَالَ لَهَا وَلِعَلِيٍّ: أَلَا أُخْبِرُكُمَا بِخَيْرٍ لَكُمَا مِمَّا سَأَلْتُمَا: تُسَبِّحَانِ وَتَحْمَدَانِ وَتُكَبِّرَانِ، دُبُرَ كُلِّ صَلَاةٍ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، فَذَلِكَ خَيْرٌ لَكُمَا مِنْ خَادِمٍ»}**[1].

واتە: فاتیمە (خوای لێی ڕازی بێ)، کچی خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ، هەواڵی پێگەیشت کە کۆمەڵێک دیل کە کەنیزەکیشیان تێدان، هێندراون بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە یەکێک لە جەنگەکاندا بە دیل گیراون، ئەویش هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، سکاڵای خۆی لە لا بکات، کە بە هۆی دەستارەوە دەستی نارەحەت بووە، (ئەوان ئەو کاتە مەرج نیە، ئاشیان بوو بێ باراش لێبکەن، گەنمیشیان هەر بە دەستاڕ هاڕیوە، ساوار بووە، گەنمەکوتا بووە، هەر شتێک بووە)، هات کە خزمەتکارێکی لێ داوا بکات، لەو دیلانەی ئەو جەنگە، بەڵام

---

(١) {عَنْ عَلِيٍّ، أَنَّ فَاطِمَةَ، عَلَيْهَا السَّلَامُ، شَكَتْ مَا تَلْقَى مِنْ أَثَرِ الرَّحَا فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ سَبْيٌ فَانْطَلَقَتْ فَلَمْ تَجِدْهُ فَوَجَدَتْ عَائِشَةَ، فَأَخْبَرَتْهَا، فَلَمَّا جَاءَ النَّبِيُّ ﷺ، أَخْبَرَتْهُ عَائِشَةُ بِمَجِيءِ فَاطِمَةَ فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ، إِلَيْنَا، وَقَدْ أَخَذْنَا مَضَاجِعَنَا فَذَهَبْتُ لأَقُومَ، فَقَالَ: عَلَى مَكَانِكُمَا فَقَعَدَ بَيْنَنَا، حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ قَدَمَيْهِ عَلَى صَدْرِي وَقَالَ: أَلَا أُعَلِّمُكُمَا خَيْرًا مِمَّا سَأَلْتُمَانِي؟ إِذَا أَخَذْتُمَا مَضَاجِعَكُمَا تُكَبِّرَا أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ، وَتُسَبِّحَا ثَلاَثًا وَثَلاثِينَ، وَتَحْمَدَا ثَلاَثَةً وَثَلاَثِينَ، فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمَا مِنْ خَادِمٍ} أخرجه البخاري: ٣٥٠٢.

پێغەمبەر ﷺی چەنگ نەکەوت لەو کاتەدا، بەڵام دوایی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، هەواڵی بە پێغەمبەری خوا ﷺدا کە فاتیمە بۆ کارێکی وا هاتبوو، پێغەمبەری خواش ﷺ چوو بۆ لای فاتیمە لە حاڵێکدا ئەو و عەلی چوو بوونە بن جێ بۆ خەوتن، ئەویش لە لایەکی جێیەکەیانەوە، کە ڕایان خستبوو، دانیشت، (ئنجا بە فاتیمە و بە عەلی فەرموو: ئایا هەواڵتان پێ بدەم بە شتێکی باشتر لەوەی داواتان کردوە؟ لە دوای هەر نوێژێک (٣٣) جار (سبحان اللە)، (٣٣) جار (الحمد للە)، (٣٣) جار (اللە أكبر)، بکەن ئەوە باشترە بۆ ئێوە لە خزمەتکار.

لە ڕیوایەتێکدا هاتوە کە عەلی و فاتیمە گوتیان: ئێمە بۆ دنیا چوو بووین، پێغەمبەر ﷺ خێری قیامەت و ڕۆژی دوایی پێ داین.

هەڵبەتە ئینسان ئەگەر لە ڕووی مەعنەوییەوە بەهێزبێ، جەستەشی زیاتر تەحەمولی ئێش و ئازارو، ناڕەحەتیی و، ڕەنج و زەحمەت دەکات.



## مەسەلەی سێیەم:

**باسی داواکردنی کافرەکان کە پێغەمبەر ﷺ نیشانەیە و موعجیزەیەکیان لە پەروەردگارەوە بۆ بهێنێ، وەک بەڵگەی ڕاستیی خۆی و، سەرنج ڕاکێشانیان بۆ بەڵگەی ڕۆشنی نێو پەڕاوە پێشووەکان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا لَوْلَا يَأْتِينَا بِآيَةٍ مِّن رَّبِّهِ ۚ أَوَلَمْ تَأْتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِي الصُّحُفِ الْأُولَىٰ ﴿١٣٣﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿وَقَالُوا لَوْلَا يَأْتِينَا بِآيَةٍ مِّن رَّبِّهِ﴾، هەروەها گوتیان: دەبووایە نیشانەیەکمان لە پەروەردگاریەوە بۆ بهێنێ، واتە: موعجیزەیەک، بەڵگەیەک بۆ ئیسپاتی ئەوە کە پێغەمبەری خوایە ﷺ و ڕاست دەکات، وەک موعجیزە و بەڵگەی پێغەمبەرانی پێشوو **(عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)**.

هەڵبەتە ئەوان لە بیانوو گرتن بوون، ئەگەر نا ئەوەی موحەممەد ﷺ خوا پێی داوەو، بریتی بووە لە قورئان، کە هەم بەرنامەکەی بووە، هەم موعجیزە و بەڵگەشی بووە، سەرو زیاد بووە لە سەلماندن و ئیسپاتی ئەوە کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، بەڵام دیارە ئەوانە بە دوای بیانوودا گەڕاون، ئنجا کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (ئەگەر دز دز بێ، تاریکە شەو زۆرن)، یان دەڵێن: (کەسێک بە تۆبزیی بینێر بۆ مازووان، لە داریْ هەڵناڕوانێ) دێتەوە دەڵێ: هیچ مازووم نەبینی" ئەگەر تەماشا نەکات، مازووان نابینێ، کەسێک کە بیەوێ بڕوا بە شتێک نەهێنێ، دەتوانێ بڕوای پێ نەهێنێ، بۆیە خوا لە وەڵامیاندا دەفەرموێ.

٢)- ﴿أَوَلَمْ تَأْتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِي الصُّحُفِ الْأُولَىٰ﴾، (أَوَلَمْ تَأْتِهِم)، خوێندراویشتەوە: **(أَوَلَمْ يأتِهِم)**، چونکە وشەی (بَيِّنَةُ)، لەبەر ئەوەی مێیەنەی مەجازییە، بۆیە دەگونجێ کە

ڕاناوی نێرینەشی بۆ بەکاربێ، ئایا بەڵگەیەک کە لە پەڕاوە پێشووەکاندا هەیە، بۆیان نەهاتوە؟ ئەمە زانایان سێ واتایان بۆ لێکداونەوە:

١)- ئایا هەواڵی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) و گەلەکانیان کە لە کتێبە ئاسمانییە پێشووەکاندا هەیە، ئایا ئەو هەواڵەیان بۆ نەهاتوە؟ کە کاتێک داوایان کردوە موعجیزەیان بۆ بێ و، دوایی بۆیان هاتوەو، بڕوایان بەو موعجیزانە نەهێناوە، فەوتاون، واتە: ئایا ئەو بەڵگە ڕۆشنەیان بۆ نەهاتوە، کە گەلە پێشووەکانیش ئەو داوا و تەکلیفەیان لە پێغەمبەرانی خۆیان کردوە، کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، داواکارییەکانیان ئاڕاستەی خوا کردوەو، خواش بۆی جێبەجێ کردوون، بەڵام دوای ئەوەی کە بڕوایان پێ نەهێناوە، فەوتاون، ئایا ئەوانیش دەیانەوێ بفەوتێن!.

٢)- **(أَوَلَمْ تَأْتِهِمُ الأَنْبَاءُ الصَّادِقَة عَنِ الأَقْوَامِ السَّابِقَة المُدْرَجَة فِي كُتُبِهِم، وَالَّتِي جَمَعَها كِتَابُ الله الأَخِير؟)**، دیارە ئەمە قسەی ژمارەیەک لە زانایانە کە من خۆم دامڕشتۆتەوە، ئایا هەواڵە ڕاستەکانیان لە گەلە پێشووەکان، کە لە نێو کتێبەکانیاندا تۆمار کراون، بۆ نەهاتوون؟ کە کتێبی کۆتایی خوا، هەموو ئەو هەواڵانەی لە خۆیدا کۆ کردوونەوە؟ یانی: ئەوە بەڵگەیەکی ڕوون و ڕۆشنە کە ئەم کتێبەی کۆتایی لە لایەن خواوە هاتوە، چونکە: ﴿أَوَلَمْ تَأْتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِي ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ﴾، ئەم قورئانە هەرچی لە کتێبە پێشووەکاندا هەیە، ئەو هەواڵە و دەنگ و باسانەی هەموویان کۆکردوونەوە، کەواتە: ئەم قورئانە بەڵگەی ڕۆشنی ئەو هەواڵانەیە، کە لە کتێبە پێشووەکاندا هەن و، بەسە بۆ ئەوە کە سەلێمێنەری ڕاستیی پێغەمبەر (محمد) ﷺ بێ.

٣)- **(أَوَلَمْ تَأْتِيهُمُ البَيِّنَةُ الوَاضِحَة الَّتِي هِيَ القُرآنُ والنَّبِيُّ الخَاتَمْ اللَّذَيْن بَشَّرَت بهَا الكُتُبُ السَّابِقَة؟)**، ئایا ئەو بەڵگە ڕۆشنەیان بۆ نەهاتوە، کە بریتیە لە قورئان و پێغەمبەری خاتەم ﷺو کتێبە پێشووەکان، موژدەیان داوە بە هاتنیان؟ واتە: (بَيِّنَةٌ)، مەبەست پێی قورئانە، مەبەست پێی موحەممەدە ﷺ، کە لە پەڕاوە پێشووەکاندا، هەواڵیان پێدراوە و موژدەیان پێ داون.

زانایان پرسیویانە: بۆچی خوا فەرموویەتی: (ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ)، نەیفەرمووە: (الْكُتُبُ الأولَى)؟

دەڵێن: {الصحُفُ: جَمْعُ صَحِيفَةٍ، وَهِيَ قِطْعَةٌ مِنْ وَرَقٍ أَوْ كَاغَدٍ أَوْ خِرْقَةٍ يُكْتَبُ فِيهَا، وَلَمَّا كَانَ الْكِتَابُ مَجْمُوعَ صُحُفٍ، أُطْلِقَ الصُّحُفُ عَلَى الْكُتُبِ، وَوَجْهُ اخْتِيَارِ الصُّحُفِ هُنَا عَلَى الْكُتُبِ، أَنَّ فِي كُلِّ صَحِيفَةٍ مِنَ الْكُتُبِ عِلْمًا، وَأَنَّ جَمِيعَهُ حَوَاهُ الْقُرْآنُ، فَكَانَ كُلُّ جُزْءٍ مِنَ الْقُرْآنِ آيَةً وَدَلِيلًا}[1].

(محمد الطاهر بن عاشور)، ئەم تەعبیرەی وا هێناوە، کە زۆرم بە دڵە، دەڵێ: (صحف)، کۆی (صَحيفة)یە، کە بریتیە لە پەڕێک، ئنجا لە کاغەز بێ، یاخود لە پەڕۆیەک بێ، یاخود لە گەڵا بێ، کە لەسەری دەنووسرێ، (كتاب)یش بریتیە لە کۆی ئەو پەڕانە، بۆیە وشەی (صحف)، بە مانای (كُتُب)، هاتوە، بەڵام لێرە بۆچی وشەی (صحف) هاتوە، لە جیاتی (كتب)؟ چونکە هەر پەڕەیەک لەو کتێبانە، زانیارییەکی تێدایەو، قورئانیش هەموو ئەو زانیارییانەی لە هەموو پەڕەکاندان، لە خۆیدا کۆی کردوونەوە، بۆیە هەر پەڕێکی قورئان و هەر بەشێکی قورئان بەڵگەو، نیشانەیەکە لەسەر ڕاستیی موحەممەد پێغەمبەری خاتەم ﷺ.




(١) ج١٦، ص٣٤٥.

## مەسەلەی چوارەم:

**ڕوونکردنەوەی حیکمەتی نەفەوتاندنی خوا بۆ کافرەکان بەر لە ناردنی پێغەمبەر ﷺو، دابەزاندنی دوایین کتێب، تاکو بواری گلەییان نەبێ:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّآ أَهْلَكْنَٰهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِۦ لَقَالُواْ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ ﴿١٣٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَوْ أَنَّآ أَهْلَكْنَٰهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِۦ ﴾، ئەگەر ئێمە ئەوانمان فەوتاندبایە، بە سزا و ئازارێک لە پێش ویدا، واتە: پێش هاتنی موحەممەد ﷺ یان پێش دابەزینی قوڕئان، ئەم ڕاناوە دەگونجێ بۆ موحەممەد بچێتەوە، یانی: (**مِنْ قَبْلِ مجئ مُحَمَّدٍ**)، یان بۆ دابەزینی قوڕئان (**مِنْ قَبْلِ إنْزالِ القُرآن**)، ئەگەر بەو جۆرە فەوتاندبامانن.

٢)- ﴿ لَقَالُواْ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا ﴾، ئەو کاتە دەیانگوت: ئەی پەروەردگارمان! دەبووایە ڕەوانەکراوێکمان بۆ لا بنێری، (لَوْلَآ ) لێرەدا: (**حَرْفُ تَحْضِيضٍ مُسْتَعْمَلٌ فِي اللَّوْمِ أو الإحْتِجَاجِ، لأَنَّهُ قَدْ فَاتَ وقت الإرسال**)، ئەم (لَوْلَآ ) پیتی هاندانە، بەڵام بەکارهێنراوە بۆ سەرزەنشت و بەڵگە لەسەر هێنانەوە، چونکە کاتی ڕەوانەکرانی پێغەمبەر ﷺ و کاتی هاتنی سزا تێپەڕیوە، واتە: بەس بۆ لۆمە کردنە، نەک بۆ هاندان، دوای ئەوە کە سزای پەروەردگار دێ، بێگومان پێغەمبەر نانێردرێ، ئنجا ئەگەر فەوتاندبامانن بە سزا و ئازار لە لایەن خۆمانەوە، پێش دابەزینی قوڕئان و پێش هاتنی موحەممەد ﷺ، بۆیان هەبوو ئەو قسەیە بکەن و بڵێن: ئەی پەروەردگارمان! دەبووایە پێغەمبەرێکت بۆلا ناردبایەن.

٣)- ﴿ فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ ﴾، ئەو کاتە ئێمە شوێنی ئایەتەکانی تۆ دەکەوتین.

٤)- ﴿مِن قَبۡلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخۡزَىٰ﴾، بەر لەوەی زەبوون بین و سەرشۆڕ بین، دەڵێ: (الذل: الهوان، الخزي: الإفتضاح)، (ذل)، بریتیە لە زەبوونیی و (خزي)، بریتیە لە سەرشۆڕیی و عەیبداریی، کەواتە:

ئەوان شایستەی سزا بوون، بەڵام خوا بەزەیی پێیاندا هاتوە و مۆڵەتی داون.

## وەرگرتنی دوو حوکمی گرنگ لەم ئایەتە بەپێزە:

**حوکمی یەکەم:** ئەم ئایەتە لێی وەردەگیرێ، کە بەر لە هاتنی ئیسلام خەڵک بە **(أهلُ الفترة)**، واتە: کەسانێک کە لە دابڕانی وەحییدا ژیاون، لە قەڵەم دراون، بۆیەش خاوەن پۆزش بوون، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە چ دایک و بابی پێغەمبەر ﷺو، چ باپیری و خزمانی دیکەی بە تایبەت و، چ خەڵکەکەی دیکەش بەگشتیی، بەر لەوەی پێغەمبەر ﷺ، بێ، لەبەر ئەوەی خاوەنی پاساوو پۆزش بوون، ناگونجێ بە ئەهلی عەزاب لە قەڵەم بدرێن، با هەندێک ڕیوایەتیش لەو بارەوە هەبن، بەڵام ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەگەر خوا سزای دابان، پێش هاتنی قورئان، پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ دەیانگوت: پەروەردگارمان! بۆچی پێغەمبەرێکت بۆلا نەدەناردین، تاکو شوێن ئایەتەکانت بکەوین، بەر لەوەی زەبوون و سەرشۆڕ بین؟!

کەواتە: دەرفەتی ئەو گلەییەیان هەبوو، دەرفەتی ئەو قسەیان هەبوو، کەواتە: هەموو ئەوانەی پێش هاتنی موحەممەد ﷺو، پێش دابەزینی قورئان، ژیاون و مردوون، بە ئەهلی عەزاب لە قەڵەم نادرێن، مەگەر شارەزای بەرنامەی پێغەمبەرێک بووبن و لێیان لادابێ، وەک جوولەکە و نەصرانییەکان، ئەگەرنا ئەوانی دیکە کە شارەزای کتێبە ئاسمانییەکان نەبوون و، وەحیی خوایان لەبەر دەستدا نەبووە، بە پێی ئەم ئایەتە بێ، نابێ سزا بدرێن، هەروەک لە سوورەتی **(الإسراء)** یشدا باسێکمان لەو بارەوە کرد، کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولًا ١٥﴾، واتە: ئێمە سزا دەر نین، تاکو پێغەمبەر ڕەوانە نەکەین.

هەندێک کەس (سبحان الله!) داڵغەی بەو شتانەوە لێداوە، وەک هیچ شتێک لە ئاییندا نەمابێ تەواوی بکات، ئەوە نەبێ کە دایک و بابی پێغەمبەر ﷺ، بەرێتە دۆزەخێ! ئنجا بەڵێ لەو بارەوە هەندێ گێڕراوە (روایة) هاتوون، بەڵام ئێمە تاکو وەحیی خوامان لەبەر دەستنەبێ و، فەرمایشتی روون و ڕاشکاوی خوامان پێ نەبێ، ئەمە رێمان لێ دەگرێ بڕۆین بۆ هەندێک ریوایەت کە نازانین سەنەدیان چۆنە و، نازانین ئەگەر پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر فەرموونی، چۆنی فەرموون و، مەبەستی پێیان چی بووە؟.

**حوكمی دووەم:** هەروەها حوکمێکی دیکەش لەم ئایەتە وەردەگیرێ، ئەویش ئەوەیە کە ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێش هاتنی وەحیی "وەک پێشتریش باسمان کرد" سزادان لەسەر کوفرو گوناهو تاوان، نیە.



## مەسەلەی پێنجەم:

**فەرمان كردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەرەكەی ﷺ، كە بە كافەرەكان بڵێ: چاوەڕێ بن، داخۆ كێ خاوەنی ڕێی ڕاست و دروست و، هیدایەت دراوە، كێش سەرگەردان و سەر لێشێواوە؟:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ كُلٌّ مُّتَرَبِّصٌ فَتَرَبَّصُوا۟ فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ أَصْحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِىِّ وَمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴿١٣٥﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ كُلٌّ مُّتَرَبِّصٌ ﴾، بڵێ: هەر كامێك چاوەڕێیە، یانی: ئێوە چاوەڕێ دەكەن، كە نیشانە و موعجیزەیەكتان بۆ بێ، كە كردووتانە بە بیانوو بۆ بڕواهێنان، ئێمەش چاوەڕێ دەكەین كە سزای دنیاتان بۆ بێ، یاخود سزای بەرزەخ و، پاشان ڕۆژی دواییتان بۆ بێ.

٢)- ﴿ فَتَرَبَّصُوا۟ ﴾، ئنجا ئێوە چاوەڕێ بن، واتە: بەردەوام بن لەسەر چاوەڕوانییەكەتان، ئەمە ترساندن و هەڕەشە لێكردن و هۆشداریی پێدانە.

٣)- ﴿ فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ أَصْحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِىِّ وَمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴾، لەمەودوا بۆتان دەردەكەوێ: كێ خاوەنانی ڕێی ڕێك و ڕاستن و، كێش ڕێ پێشان دراو و ڕاستە ڕێ كراوە! وشەی (ٱلسَّوِىِّ)، (**فَاعِلٌ بِمَعْنَى مفعول مشتقٌ من تسوية**)، (ٱلسَّوِىِّ)، واتە: (مُسَوَّى)، یانی: ڕێك و پێخراوە، كەندو لەندی تێدا نیە.

یانی: لەمەودوا بۆتان دەردەكەوێ، كێ خاوەنانی ڕێی ڕاستن و، كێ ڕێ پێشان دراون؟ هەروەها بە پێچەوانەوەش: بۆشتان دەردەكەوێ كێ بە ڕێی لارو خواردا دەڕوات و كێ سەرگەردان و سەر لێشێواو بووە؟.

ئـەم ئایەتـە موبارەکـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ أَصْحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِيِّ وَمَنِ ٱهْتَدَىٰ﴾، لـە سـوورەتی (ص)یشـدا ئایەتەکانـی: (٨٦ و ٨٧ و ٨٨)، هەمـان مەبەسـت دەگرنـە خۆیـان، بـەڵام بـە شـێوەی ڕوونـتر، کـە بـە پێـی حـاڵ و مەقام دەگـۆڕێ، خـوا ﷻ هەنـدێ مەبەسـت لـە هەنـدێ شـوێن دا، ڕوونـتر دەکاتـەوە، دەفەرمـوێ:

﴿قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينٍۭ ﴿٨٨﴾﴾.

واتـە: بڵـێ: مـن کرێتـان لـێ داوا ناکـەم و لـە لافلێدەرانیـش نیـم، یـان: لـە بـاری شـانگرانکەران نیـم، لەوانـە نیـم ئـەرک بخەمـە سـەر خەڵـک، قورسایی بخەمـە سـەر خەڵـک، چاوەڕوانییـم لێیـان هەبـێ، ئـەم قورئانـە تەنیـا بیرخەرەوەیـە بـۆ جیهانییـان، ﴿وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينٍۭ﴾، بـە دڵنیاییـش دوای ماوەیەکـی دیکـە هەواڵەکەی دەزانن، هەواڵەکـەی دەزانـن کـە ئەمـە خـوا بـۆ هەمـوو جیهانییانـی ناردووە، ئەمـە ئایینـی هەقـی خوایـەو، دوا پەیامـی خوایـە بـۆ هەمـوو مرۆڤایەتیـی، (بَعْدَ حِينٍۭ) واتـە: دوای ماوەیەکـی کـەم بۆتـان دەردەکـەوێ، ئـەوەی کـە ئێـوە بەربەرەکانێـی دەکـەن و دژایەتیـی دەکـەن، شـتێک نیـە لـە دۆڵ و شـێوەکانی مەککـەدا بفەوتـێ، شـتێک نیـە ئێـوە بتوانـن قەتیـسی بکـەن لـە چـوار چێـوەی شـاخ و چیاکانـی مەککـەدا، بەڵکـو خـوا بـۆ هەمـوو جیهانییانـی ناردووە، هەواڵەکەشـیتان بـۆ دەردەکـەوێ.

ئـەم دوو ئایەتـە نەمبینـوە توێژەرەوانـی قورئـان ئاماژەیـان پـێ کردبـن، کـە بەهێزتریـن بەڵگـەی هەقانیەتـی قورئـان و موحەممـەدن ﷺ، چونکـە ئایەتەکـەی سـوورەتی (طـه)، خـوا دەفەرمـوێ: لەمـەدوا بۆتـان دەردەکـەوێ: کـێ لەسـەر ڕێـی ڕێـک و ڕاسـتەو کـێ ڕێنمایـی کـراوە؟

ئنجـا ئایـا بۆمـان دەرنەکـەوت، دوژمنانـی موحەممـەد ﷺ، چییـان لێهـات؟ ئەوانەی قورئانیـان کـردە ئەفسـانەی پێشـینان، چییـان لێهـات؟ فـرێ درانـە زبڵدانـی مێـژوو!

هەروەها ئەوانەی شوێن موحەممەد ﷺ کەوتوون و شوێن قورئان کەوتوون لە کوێن؟

هەروەها ئەم ئایەتەش کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعۡدَ حِينِۭ ﴾، هەواڵەکەشی دەزانن دوای ماوەیەکی کەم.

هەر لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ، لە بیست و سێ (٢٣) ساڵی تەمەنی موبارەکی دا، نامەی نارد بۆ پادشای ڕۆم، بۆ فارس و میسرو شوێنەکانی دیکەو، بانگەوازی ئیسلام بە هەموو دنیادا بڵاویوۆوەو، لە دوای خۆی بە کەمتر لە پەنجا ساڵ، نیوەی دنیای ئەو کاتە، پەیام و بانگەوازی ئیسلامی پێ گەیشت و خەڵکێکی زۆر هاتە ژێر چەترو سێبەری ئیسلامەوە، ئەمە بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر هەقانیەتی قورئان و لەسەر ڕاستیەتی موحەممەد ﷺ.

لێرەشدا پاش سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار، دێینە کۆتایی تەفسیر کردنی سوورەتی موبارەکی (طه).



## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـرۆ کـە: (٣٠)ی موحەڕڕەمـی سـاڵی (١٤٣٩)ی کۆچییـە، بەرانبـەر: ٢٠١٧/١٠/٢٠ زایینـی، بـە پشـتیوانیی خـوا لـە شـاری دێرینـی هەولێـر، دەسـت دەکەیـن بـە ڕوونکردنـەوەی مانـاو مەبەسـتەکانی ئایەتـە بەپێزەکانـی سـوورەتی (الأنبیـاء).

## پێناسەی سوورەتی (الأنبیاء) و بابەتەکانی

سـەرەتا دێینـە سـەر پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەو سـوورەتەو، لـە حـەوت (7) بڕگـەدا پێناسـەی ئـەم سـوورەتە موبارەکـەو نێوەڕۆکەکـەی دەکەیـن:

### ا)- ناوی ئەم سوورەتە:

زانایـانی پێشـیین ناویـان لێنـاوە (**سـورة الأنبیـاء**)، وەک لـەم دەقـەدا دیـارە، کـە (**بخـاري**) هێناویـەتی هەروەهـا (**إبـن الضریـس**) و (**إبـن مردویـە**): {**عَـنْ عَبْـدِ اللهِ** ﷺ **قَـالَ: بَنُـو إِسْرَائِیـلَ، وَالْكَهْـفُ، وَمَرْیَـمُ، وَطـه، وَالأَنْبِیَـاءُ، هُـنَّ مِـنَ الْعِتَـاقِ الأُوَلِ، وَهُـنَّ مِـنْ تِـلَادِي**}، واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود ﷺ دەڵـێ: سـوورەتی (**بَنُـو إِسْرَائِیـلَ، وَالْكَهْـفُ، وَمَرْیَـمُ، وَطـه، وَالأَنْبِیَـاءُ**) واتـە: ئـەم پێنـج سـوورەتە لـەو سـوورەتانەن، کـە مـن لـە لام زۆر بـە نـرخ و بەڕێـزن و، لەوانـەن کـە زوو لەبـەرم کـردوون و وەدەسـتم هێنـاون.

(العِتَاقُ: جَمعُ عَتيقٍ، وَهُوَ كُلُّ ما بَلَغَ فـي الجَودَة)، واتـە: (عِتاق) کـۆی (عتيق)ە، هـەر ماڵێکـی زۆر بـە نـرخ و بەهایـە، وشـەی (تِلاد)یـش (التَّالـد والتِّـلاد والتَّـلاد: المَالُ القَديـمُ الأَصلِي الَّـذي وُلِـدَ عِنـدَكَ وَهُـوَ ضِـدُّ الطَّـارِف)، واتـە: (التَّالِـد وَالتِّـلاد وَالتَّـلاد)، بەو ماڵـە لـە مێژینـە ڕەسـەنە دەگوتـرێ کـە لـە لای خـۆت پەیدابـووە، کـە پێچەوانـەی (الطَّـارِف)ە، (طـارف) ماڵێکـی تازەیـە کـە لـە لات پەیدادەبـێ، بـەڵام (التَّالِـد والتِّلاد)، ماڵێکـی لەمێژینەیـە، وەک (مُختـار الصِّحـاح) دەڵـێ: (السُّـوَرُ الَّتـي أَخَذتهُـنَّ قَدِيمًـا)، واتـە: ئـەم پێنـج سـوورەتە لـەو سـوورەتانەن، هـەر لـە سـەرەتاوە وەرمگرتـوون و لەبەرمکـردوون، ئنجا بۆیـەش نـاوی لێنراوە سـوورەتی (الأنبيـاء)، چونکـە نـاوی شـازدە (١٦) لـە پێغەمبـەرانی تێـدا هاتـوە: (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)و، نـاوی (مريم)یـشی تێـدا هاتـوە، بەڵکـو نـاوی (عيسـا)شی بـە ئامـاژە تێداهاتـوە، وەک دوایـی پێـی دەگەیـن، لـە ئایەتـەکانی کۆتاییـداو، لـە هیـچ کام لـە سـوورەتەکانی قورئانـدا، نـاوی ئەوەنـدە لـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام) بەسـەر یەکـەوە نەهاتـوە، جگـە لـە سـوورەتی (الأنعـام) کـە لەوێـدا نـاوی هـەژدە (١٨) لـە پێغەمبـەران هاتـوەو، ژمـارەی پێوانەیـی شـکاندوە لـە ڕووەوە کـە زۆرتریـن نـاوی پێغەمبـەرانی بەسـەر یەکـەوە تێـدا هاتـوە.

## ٢)- شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە سـوورەتێکی مەککەییـە، بـە یـەک دەنگیـی زانایـان، هەرچەنـدە هەندێکیـان ئـەو ئایەتەیـان هـەڵاواردوە کـە دەفەرمـوێ: ﴿أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِي ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَآ ﴿٤٤﴾﴾، وەک دوایـی پێـی دەگەیـن، بـەڵام لە ڕاسـتییدا ڕایەکەیـان پشـت ئەسـتوور نیـە بـە هیـچ بەڵگەیـەک، ئـەم سـوورەتە هەمـووی وا پـێ دەچـێ بـە یەکـەوە هاتبـێ و، لـە یـەک قۆناغـدا دابەزیـوە.

### ٣)- ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ئەم سوورەتە موبارەکە لە ڕیزبەندیی (**مصحف**)دا، ژمارە بیست و یەک (٢١)ە، واتە: بیست سوورەت لە پێشیەوە ڕیزکراون، لەو (**مصحف**)ەی کە لەبەر دەستماندایە، بەڵام لە ڕیزبەندیی دابەزین (**ترتیب النزول**)دا، زۆربەیان بە حەفتاو یەک (٧١)یان داناوە، هەندێکیان بە حەفتاو سێ (٧٣)، هەندێکیش بە حەفتاو دوو (٧٢)، واتە: بە ڕای زۆربەیان لەو سوورەتانەیە کە حەفتا (٧٠) سوورەت لە پێشیەوە دابەزیون، ئەوانەی کە دەڵێن: بە ڕیزبەندیی (٧١)ە، دەڵێن: دوای سوورەتی (**حم**)ی (**السجدة**) و، لە پێش سوورەتی (**النحل**)دا دابەزیوە، واتە: لە کۆتاییەکانی سوورەتەکانی پێش کۆچکردنی پێغەمبەرە ﷺ بۆ مەدینە، ئەوە ڕای زانایانە، بەڵام بە پێی ئەوە کە ئایەتی (57)ی سوورەتی (**الزخرف**) کە خوا ﷻ تێیدا دەفەرمووێ: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ۝٥٧﴾، واتە: کاتێک کە کوڕی مەریەم بە وێنە هێنرایەوە، گەلەکەت کردیان بە گاڵە لە بارەیەوە، ئەم ئایەتەی سوورەتی (**الزخرف**)، واتە: ئایەتی (٥٧) لە سوورەتی (**الزخرف**)، کە سوورەتی (**الزخرف**) لە ڕیزبەندیی دابەزیندا (٦٢)یە، ئاماژە دەکا بۆ ئایەتی (٩٨)ی سوورەتی (**الأنبیاء**)، کە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ۝٩٨﴾، واتە: خۆتان و ئەوەی کە لە جیاتی خوا ﷻ دەیانپەرستن، دەبن بە بەردو چەوی دۆزەخ و ئێوە دەیچنە نێو، ئنجا ئەگەر ئایەتی (٥٧) سوورەتی (**الزخرف**) کە ڕیزبەندییەکەی (٦٢)یە، ئاماژە بکاتەوە بە ئایەتێک لە سوورەتی (**الأنبیاء**)دا، کەواتە: دەبێ (**الأنبیاء**) لە پێش (**الزخرف**)دا دابەزیبێ، ئەگەر ئەو هۆی هاتنە خوارەوەیە بکرێتە بەڵگە، کە ئەوەش ئەگەرێکە و ئەگەرێکی بەهێزیشە، کەواتە: دەبێ ڕیزبەندییەکەی نەک (٧١ و ٧٣) نەبێ، بەڵکو دەبێ لە پێش (٦٢) شەوە بێ، چونکە سوورەتی (**الزخرف**) ڕیزبەندییەکەی (٦٢)یە، ئەوەش هەر ئەگەرێکە و ویستم ئاماژەی پێ بدەم.

## ٤)- ژمارەی ئایەتەكانی:

پێشتریش باسم كردوە، كە هیچ كام لە زانایان دەربارەی كەمیی و زیادیی وشەیەك، یاخود پیتێك لە قورئاندا، ڕاجیاییان نیە، بەڵام درێژیی و كورتیی ئایەتەكان پەیوەستە بەوەوە كە لە كوێ ئەو ڕستەیە كۆتایی دێ، هەندێكیان ڕستەیەكیان لە شوێنێك كۆتایی پێ هێناوەو، هەندێكیان لە نێوەڕاستیدا كۆتاییان بەو ڕستەیە هێناوە و، سەرەنجام درێژیی و كورتیی ڕستەكانە، كە ژمارەی ئایەتەكان كەم و زیاد دەكات، بۆ وێنە: ئەگەر لە سووڕەتی (**الفاتحة**) ئایەتی: ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ﴾ ئەگەر لێرە بوەستی، ئەوە دەبێتە ئایەتێك و، ﴿ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧ ﴾ دەبێتە ئایەتێكی دیكە، بەڵام ئەگەر هەمووی بەسەر یەكەوە بێ، دەبێتە یەك ئایەت، ئنجا ئەهلی: (مەدینە و مەككە و شام و بەصرە) واتە: زانایانێك كە لەو چوار شارە سەرەكییە دانیشتوون، گوتوویانە: ژمارەی ئایەتەكانی: سەدو یازدە (١١١)یە، بەڵام زانایانی دانیشتووی (كووفە)، گوتوویانە: ئایەتەكانی: سەدو دوازدە (١١٢)ن و، ئەو (**مصحف**)ەی لەبەر دەستی ئێمەدایە، ئەو ڕایەیان تەبەننیی كردوە كە زانایانی كووفە گوتوویانە.

## ٥)- نێوەڕۆكی:

مادام سووڕەتێكی مەككییە، هەمان نێوەڕێكی قورئانی مەككەیی هەیە، كە وێڕای بووناسیی، باسی خوا ﷻ بە یەكگرتن (**توحید الله**)یشی تێدایە، خوا بە یەكگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و، لە پەروەردگارێتیی و، لە خاوەندارێتیی و، تەنیا پەرستراوێتیی و، لە ناو و سیفەتەكانیدا، پاشان باسی پێغەمبەرایەتیی و وەحیی و، باسی ڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ و، بەسەرهاتی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) و ئەو جۆرە بابەتانە، كراوە. بەڵام لەم سووڕەتەدا پانتاییەكی باش بۆ ڕۆژی دوایی بە هەردوو قۆناغی (**ساعة**) و (**قيامة**)ەوە تەرخان كراوە، (**ساعة**):

ئـەو کاتـە دیاریکـراوەی کـە ئـەم دنیایـەی تێـدا دەپێچرێتـەوە، ئـەم گەردوونـەی تێـدا دەپێچرێتـەوە، کـە بـە کوردیـی دەڵێـن: ئاخیـر زەمـان.

(**قیامة**)ش: قۆناغـی دووەمـی ڕۆژی دواییـە، کـە بریتیـە لـەو کاتـەی کـە خەڵـک هەڵدەستێتەوە، وەک دەفەرمـوێ: ﴿ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾﴾، واتـە: دوایـی بـۆ جـاری دووەم فـوو بـە کەڕەنـادا کـرا، یەکسـەر هەموویـان هەسـتانەوە و چـاوەڕێ بـوون.

هەروەهـا لـەم سـوورەتەدا (٤٥) ئایـەت بـۆ بەسـەرهات و ناوهێنانـی شـازدە (١٦) لـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام)، وێـڕای مەریـەم و عیسـای کـوڕی، کـە بـە ئامـاژە باسـکراون، تەرخانکـراوە، کـە لـە ئایەتـەکانی: (٥١ - ٩٥)ن، شـایانی باسیشـە: لـە حـەوت (٧) شـوێندا و زیاتریـش باسـی ڕۆژی دوایـی کـراوە لـەم سـوورەتەدا، هەروەهـا بـاسی پێغەمبـەر ﷺ و بـاسی قورئانیـش لـە چەنـد شـوێنێکدا کـراوە.

## ٦)- تایبەتمەندییەکانی:

لێـرەدا تەنیـا پشـتم بەسـەرنجدان و تێوەڕامـانی خـۆم بەسـتووە، لـە سـەرچاوەیەکی دیاریکـراوەوە نەمهێنـاوەو، دەشـگونجێ ئـەو تایبەتمەندییانـە زیاتریـش بکرێـن، لـەوەی کـە مـن گوتوومـن، بـەڵام مـن پێنـج (٥) تایبەتمەندییـم لـەو سـوورەتەدا کەوتوونەتـە بەرچـاو:

١)- شەش تۆمەتی کافرەکان بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ کە لە ئایەتەکانی: (٣ و ٥)دا هاتوون، کە تەنیا لێرەدا ئەو شەش تۆمەتە پێکەوە باسکراون، وەک لە دەرسی یەکەمدا پێیان دەگەین، ڕەنگە لە سوورەتەکانی دیکەشدا، ئەو تۆمەتانە هاتبن، بەڵام تەنیا لێرەدا ئەم شەش تۆمەتە پێکەوە هاتوون.

٢)- باسی ئەوە کە ئاسمانەکان و زەوی پێشتر پێکەوە لکاو بوون و، خوا لێکی کردوونەوەو، دواتریش وەک تۆماری نووسراو دەپێچرێنەوەو، دەگێڕدرێنەوە حاڵەتی سەرەتایان، کە ئەمەش لە ئایەتی (٣٠) و لە ئایەتی: (١٠٤)دا، ئەم دوو ڕاستییە مەزنە خراونە ڕوو.

٣)- باسی ئەوە کە خوا ﷻ پێش پێغەمبەری خاتەم (محمد) ﷺ هیچ مرۆڤێکی لە ژیاندا نەهێشتووەتەوە، لە ئایەتی (٣٤)دا هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ﴾، واتە: لە پێش تۆدا هیچ مرۆڤێکمان نەهێشتۆتەوە، ئەم ڕاستییەش تەنیا لێرەدا هاتوە، بەڵێ لە سوورەتی (**الزمر**)دا هاتوە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ۝٣٠﴾، واتە: تۆ دەمری و ئەوانیش دەمرن، بەڵام مەبەستم پێش پێغەمبەر (محمد)ە ﷺ.

٤)- پێکەوە پەیوەست کردنی دەرگا لێکرانەوەی (**يأجوج ومأجوج**) و هاتنی ئاخیر زەمان، کە لە ئایەتەکانی: (٩٦ ، ٩٧)دا دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ۝٩٦ وَٱقْتَرَبَ ٱلْوَعْدُ ٱلْحَقُّ﴾، کە خوا ﷻ ئەو دوو ڕووداوە پێکەوە پەیوەست دەکات:

**یەکەم:** دەرگا لێکرانەوەی (يأجوج ومأجوج)، کە دەبێ خەڵکێکی زۆر زۆر بن، وەک پێشتر باسمان کردوون و، دواییش باسیان دەکەین.

**دووەم:** هاتنی ئاخیر زەمان و کۆتایی ئەم ژیانی دنیا و ئەم گەردوونە.

٥)- باسی بە ڕەحمەت نێردرانی موحەممەد ﷺ بۆ تێکڕای جیهانیان: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ۝١٠٧﴾، ئەمیش لە ئایەتی (١٠٧)ی ئەم سوورەتە موبارەکەدا هاتووە، بەو تەعبیرە لە قورئاندا، تەنیا لەم ئایەتە موبارەکەدا، بەو شێوەیە باسی پێغەمبەری خاتەم (محمد) ﷺ کراوە.

## ٧)- دابەشکردنی بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە وەک عادەتی خۆمان لەگەڵ هەموو سوورەتە موبارەکەکاندا، هەر سوورەتێک کە دەمەوێ تەفسیری بکەم، پێشان باش باش لێی ورد دەبمەوە و

سەرنجی دەدەم: لە كوێ تاكو كوێ دەگونجێ بكرێتە بابەتێك و، لە كوێوە تاكو كوێ لەگەڵ بابەتێك دا تێكهەڵكێشە، دیارە كە قورئان وەك لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (الأنعام)دا، گوتوومانە: زۆرجار ئایەتەكانی قورئان وەك شەپۆلی دەریا وان، هەر شەپۆلێك بە دوای شەپۆلێكدا دێ و، لێك دابڕاو نین، بەڵام هەر چۆنێك بێ كە ئەمەش یەكێكە لە ڕووەكانی ئیعجازی قورئان، تۆ دەشتوانی نێوە نێوە بۆ چەند بابەتێك ئایەتەكان بە یەكەوە پەیوەست بكەی، كە من هەر وامكردوە، ئنجا جوگرافیای دابەشكردنی ئەو دەرسانەم بە شێوەیەك لێكردوە، كە بۆ شەش (٦) دەرس دابەشم كردوون:

**دەرسی یەكەم:** ئایەتەكانی: (١ - ١٥)ە، كە باسی ڕۆژی دوایی و باسی پڕوپاگەندەی كافرەكان دژی قورئان و، دژی پێغەمبەر ﷺ و بەرپەرچدانەوەیان و، پاشان باسی لە بەین بردنی خوا ﷻ بۆ گەلە پێشووەكان، دەكات.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەكانی: (١٦ - ٣٥)ە، واتە: بیست (٢٠) ئایەت، باسی حیكمەتی خوا ﷻ لە دروستكرانی گەردوون و، باسی خوا بەیەكگرتن و، باسی چەند نیشانەیەكی گەردوونیی لەسەر باڵا دەستیی و، بێ وێنەیی خوا ﷻ و، چەند وردە بابەتێكی دیكەش، باسكراون.

**دەرسی سێیەم:** ئایەتەكانی: (٣٦ - ٥٠)ە، ئەویش پازدە (١٥) ئایەتە، لەو پانزە ئایەتەدا باسی هەڵوێستی كافرەكان لە بەرانبەر پێغەمبەری خوا ﷺو، لە بەرانبەر ڕۆژی دوایی و، لە بەرانبەر قورئاندا، بەرپەرچدرانەوەیان، باسی ئەوانە كراوە.

**دەرسی چوارەم:** ئایەتەكانی: (٥١ - ٧٥)ە، كە بیست و پێنج (٢٥) ئایەتە، بەسەرهاتی ئیبراهیم عليه السلام و بابی (ئازەر)و، گەلەكەی كە بێبڕواو بتپەرست بوون و، پاشان چۆن ئیبراهیم ڕەخنەیان لێ دەگرێ لەسەر پەرستنی ئەو بت و صەنەمانەو، دوایی هەڕەشە دەكا كە بیانشكێنێ و، دوایی بە كردەوە هەموویان دەشكێنێ، جگە لە بتە گەورەكەیان و، دوایی مشت و مڕیان لەگەڵ ئیبراهیمدا دەبێ و، سەرەنجام بڕیار دەدەن كە

بیسووتێنن و بیخەنە نێو ئاگری سوورەوە، بەڵام خوای باڵادەست دەفریای دێ و، ئاگرەکە بە فەرمانی خوا ساردو سەلامەت دەبێ لەسەر ئیبراهیم و، پاشان باسی ئەوە کە چۆن خوا ﷻ ئیسحاق و یەعقووبی (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) پێ دەدات، کە کوڕو نەوەی بوون و، دوایی ئاماژەیەکیش بە بەسەرهاتی **لووط** ﷺ کراوە، کە برازای بووە، بە پێ قسەی پەیمانی کۆن وەک پێشتر باسمان کردوە.

**دەرسی پێنجەم:** ئایەتەکانی: (٧٦ - ٩٥)ە، کە بیست (٢٠) ئایەتە، باسی ژمارەیەک لە پێغەمبەران دەکات (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، کە: (**نوح، داود، سلیمان، أیوب، إسماعیل، إدریس، ذي الكفل، ذو النون، زكريا، يحيا، مريم** و کوڕەکەی) (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، خوا لە (**مريم**)یش ڕازی بێ.

**دەرسی شەشەم:** ئایەتەکانی: (٩٦ - ١١٢)ە، کە حەڤدە (١٧) ئایەتە، باسی هاتنی ئاخیر زەمان، پاشان هەڵسان و زیندوو بوونەوەو، سەرەنجامی مرۆڤەکان و، باسی پێچرانەوەی گەردوون و، گێڕانەوەی بۆ حاڵەتی سەرەتای و، باسی ڕاستییەکی مەزنی بواری بووناسیی و ئیمان و عەقیدەو، چەند ڕێنماییەک بۆ پێغەمبەر ﷺ، باسی هەموو ئەوانە کراوە، لەو (١٧) ئایەتەدا.



## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە پـازدە (١٥) ئایـەتی سـەرەتا پێـک دێ، ئایەتـەکانی: (١ - ١٥)و، ئـەم دەرسـەمان چەنـد بابەتێکـی گـەورە و گرنگـی تێـدا خراونـە ڕوو، کـە دەتوانیـن بڵێیـن حـەوت (٧) بابـەتی سـەرەکیین و ئەمانـەن:

١)- نیزیک کەوتنەوەی لێپرسینەوەی خوا ﷻ بۆ خەڵک: ﴿ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ﴾.

٢)- بە یاریی و گەمەکردنەوە مامەڵەکردنی کافرەکان لەگەڵ قورئاندا.

٣)- تۆمەتبارکردنی کافرەکان بۆ پێغەمبەر ﷺ بە شەش جۆر:

**یەکەم:** مرۆڤ بوونی.

**دووەم:** جادووگەر بوونی و، بە جادوو لە قەڵەمدانی قورئان.

**سێیەم:** وڕێنەی نێو خەون کردنی.

**چوارەم:** هەڵبەستنی بۆ قورئان (کە گوایە قورئانی هەڵبەستوەو، لە خۆیەوە گوتوویەتی بە ناوی خواوە).

**پێنجەم:** شاعیربوونی پێغەمبەر ﷺ.

**شەشەم:** نەهێنانی موعجیزەی وەک هی پێغەمبەرانی پێشوو (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام).

٤)- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە، کە گەلە پێشووەکانیش بە هۆی ئەو موعجیزانەوە بڕوایان نەهێناوەو، کاتێکیش موعجیزەی داواکراویان لە لایەن ئەو پێغەمبەرەی خۆیان بۆ هاتوەو، بڕوایان نەهێناوە، لە بەین براون و، ئەوەش یاساییەکی گشتیی خوایە ﷻ، کەواتە: کە موعجیزەی وەک هی پێغەمبەرانی پێشوو بۆ پێغەمبەری کۆتایی نانێرێ، بۆ ئەوەیە کە ئەو خەڵکەی ئەو بۆیان ڕەوانە کراوە، بهێڵدرێنەوە و لە بەین نەچن.

٥)- خستنە ڕووی ئەوە کە پێغەمبەرانی پێشووش (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) سەرجەمیان پیاوان بوون و، خواردن و خۆراکیشیان هەبووە و، مرۆڤی ئاسایی بوون، لە ڕووی جەستەییەوە.

٦)- خستنە ڕووی ئەو ڕاستییە کە قورئان مایەی یاد خستنەوەو سەربەرزییە، بۆ هەر کەسێ کە بڕوای پێ بهێنێ و، لە عەقڵ و دڵی خۆیدا بیچەسپێنێ.

٧)- پێشاندانی لاپەڕەیەکی سامناک لە چارەنووسی ڕەشی ستەمکاران لە دنیادا، کە چۆن خوا ﷻ قڕەبڕی کردوون و دوایی کەس لەفریایان نەهاتووەو، هاواریان بە کەس ڕانەگەیشتوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ٱقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ ﴿١﴾ مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا ٱسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٢﴾ لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ ۗ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ هَلْ هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ۖ أَفَتَأْتُونَ ٱلسِّحْرَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّى يَعْلَمُ ٱلْقَوْلَ فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٤﴾ بَلْ قَالُوٓا۟ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍۭ بَلِ ٱفْتَرَىٰهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِـَٔايَةٍ كَمَآ أُرْسِلَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٥﴾ مَآ ءَامَنَتْ قَبْلَهُم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَآ ۖ أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِمْ ۖ فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧﴾ وَمَا جَعَلْنَٰهُمْ جَسَدًا لَّا يَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَمَا كَانُوا۟ خَٰلِدِينَ ﴿٨﴾ ثُمَّ صَدَقْنَٰهُمُ ٱلْوَعْدَ فَأَنجَيْنَٰهُمْ وَمَن نَّشَآءُ وَأَهْلَكْنَا ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٩﴾ لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ كِتَٰبًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠﴾ وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿١١﴾ فَلَمَّآ أَحَسُّوا۟ بَأْسَنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ﴿١٢﴾ لَا تَرْكُضُوا۟ وَٱرْجِعُوٓا۟ إِلَىٰ مَآ أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْـَٔلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿١٤﴾ فَمَا زَالَت تِّلْكَ دَعْوَىٰهُمْ حَتَّىٰ جَعَلْنَٰهُمْ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ ﴿١٥﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، خەڵک لە حاڵێکدا کە لە بێ ئاگاییدان، ڕوو وەرگێڕن (لە هەق)، (کاتی) لێپرسینەوەیان نیزیک کەوتەوە (١) هیچ بیرخەرەوەیەکی تازەیان لە پەروەردگاریانەوە بۆ نایەت، مەگەر بە گەمە و گاڵتەکردنەوە گوێی بۆ هەڵدەخەن (٢) دڵەکانیان خافڵاون و ئەوانەی ستەمیان کردوە، بە چپە چپ پەنهانکردنەوە (گوتیان:) ئایا ئەم (پیاو)ە، هەر مرۆڤێکی وەک خۆتانە؟ ئنجا ئایا لە حاڵێکدا کە (دەشبینن) دەچنە لای جادوو (تاکو بڕوای پێ بێنن)؟! (٣) (پێغەمبەر) گوتی: هەر قسەیەک کە لە ئاسمان و زەویدا بکرێ، خوا دەیزانێ و بەس ئەو بیسەری زانایە (٤) (کافرەکان نەک هەر ئەوەندەیان گوت) بەڵکو گوتیان: ئەو (قورئان)ە (وڕێنەی نێو) خەونی تێکەڵ و پێکەڵە، بەڵکو (موحەممەد) هەڵیبەستوە، بەڵکو ئەو شاعیرە، (ئەگەر ڕاست دەکات) با نیشانە و موعجیزەیەکمان بۆ بێنێ، وەک چۆن (پێغەمبەرە) پێشووەکان بە (نیشانە و بەڵگەو) موعجیزەوە ڕەوانە کراون (٥) (هۆی نەناردنی موعجیزەی لەو جۆرە ئەوەیە کە) لە پێش ئەواندا هیچ کام لەو ئاوەدانییانەی کە فەوتاندوومانن (بە هۆی موعجیزەوە) بڕوایان نەهێناوە، ئنجا ئایا ئەوان بڕوا دێنن؟! (٦) لە پێش تۆشدا تەنیا پیاوانمان ناردوون، سروشمان بۆ لایانکردوە، ئنجا ئەگەر نازانن با لە زانایان (وخاوەن بەرنامەکانی خوا) بپرسن (٧) ئنجا ئەو (ڕەوانە کراو) انەشمان نەگێڕابوون بە پەیکەرێک کە خواردن نەخۆن و، هەر ماویش نەبوون لە ژیانی دنیادا (٨) دوایی بەڵێنمان لەگەڵ ڕاست بردنە سەر، ئیدی ئەوان و هەر کەس ویستمان دەربازمان کردن و، زێدەڕۆییکارانیشمان فەوتاندن (٩) بە دڵنیایی کتێبێکمان بۆ لاتان دابەزاندوە کە بیرخستنەوەتانی تێدایە، ئایا نافامن؟!

﴿١٠﴾ زۆر ئاوەدانیی ستەمکاریشمان تێشکاندوون و، دوای ئەوان خەڵکی دیکەمان پێگەیاندوە ﴿١١﴾ ئنجا کاتێک هەستیان بە هاتنی سزای سەختمان کرد، یەکسەر لێی ڕایانکرد ﴿١٢﴾ ڕامەکەن و بگەڕێنەوە نێو خانو وبەرەکانتان و، ئەو حاڵەی تێیدا خۆشگوزەران کرابوون، بەڵکو پرسیارتان لێ بکرێ ﴿١٣﴾ کەچی گوتیان: ئەی هاوار بۆ ئێمە! بێگومان ئێمە ستەمکار بووین ﴿١٤﴾ ئیدی بەردەوام هەر ئەوە هاوار و پاڕانەوەیان بوو، هەتا کردمانن بە (وێنەی) کشتوکاڵێکی دروەکراوی دامرکاو ﴿١٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(حِسَابُهُمْ): واتە: لێپرسینەوەیان، (**الحِسَابُ: اسْتِعْمَالُ الْعَدَدِ، حَسَبْتُ أَحْسُبُ حِسَاباً وَحُسْبَاناً**)، (**حِسَاب**) بریتیە لە بەکارهێنانی ژمارە، دەگوترێ: (**حَسَبْتُ أَحْسُبُ**)، ژماردم، دەیژمێرم، (**حِسَاباً وَحُسْبَاناً**) واتە: ژماردن، ئەوە ئەصڵی واتاکەیەتی، بەڵام دوایی بەکاریشهێنراوە بۆ لێپرسینەوە: (**حَاسَبَهُ مُحَاسَبَةً وحِسَاباً: أي نَاقَشَهُ الحِسَابَ، أو جَازَاهُ**)، (**حَاسَبَهُ مُحَاسَبَةً وحِسَاباً**)، واتە: مشت ومڕی لێپرسینەوەی لەگەڵدا کردو، هەروەها بە مانای سزای دا، دێت.

(مُّحْدَثٍ): واتە: تازە، نوێ، (**أَحْدَثَ الشَّيءَ: ابْتَدَعَهُ وَأَوْجَدَهُ، حَدَثَ الشَّيءُ يَحْدُثُ حُدُوثاً وَحَدَاثَةً: نَقِيْضُ قَدُم**)، (**أحْدَثَ الشَّيءَ**) واتە: شتەکەی پەیداکردو دایهێنا، بەڵام (**حَدْثَ الشَّيء يَحْدُثُ حُدُوثاً وَحَدَاثَةً**) شتەکە پەیدابوو، پەیدادەبێ، پەیدا بوون، ئەمە (**نَقِيْضُ قَدُم**)یە، (**قَدُم**)، واتە: لە مێژ بوو، لە مێژینە بوو، بەڵام (**مُحْدَث**) واتە: پەیدا بوو، یانی: لە تازەیی پەیدا بوو.

(لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ): (**لَهَا بالشَّيء لَهْواً**)، واتە: دڵیان بێ ئاگایە، (**لَهَا بِالشَّيء لَهْواً: لَعِبَ بِهِ وَأَولَعَ بِه**)، یاریی پێکردو، هۆگریی بوو، (**وَلَهَا عَنِ الشَّيءِ لُهِيّاً ولِهيَاناً:**

سَلا عَنْهُ وَتَرَكَ ذِكْرَه)، (لَهَا عَنْ الشَّيء)، واتە: ئەو شتەی فەرامۆش کردو وازی لە باسکردنی هێنا، (لَهْو) بە مانای خافڵان و سەرگەرم بوون دێ.

(أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ): (حُلْم) کۆیەکەی (أَحْلَام)ە، واتە: خەونەکان، (أَضْغَاث) کۆی (ضِغْث)ە، (ضِغْث): واتە: چەپکی پووش و گیا، یان گوڵ، یان هەر شتێک، (أَضْغَاث) کۆیەکەیەتی، دەڵێ: (الضِّغْثُ وَالمَضْغُوثُ: كُلُّ مَا جُمِعَ وَقُبِضَ عَلَيْهِ بِجُمْعِ الكَفِّ وَنَحْوِهِ)، (ضِغْثٌ وَمَضْغُوثٌ) کە بە (أَضْغَاث) کۆ دەبێتەوە، هەر شتێکە کە بە لەپە دەست بگیرێ، یان بە لەپە دەست، یاخود ئەندازەی ئەوە بێ، یاخود چەپکێک، (أَضْغَاثُ أَحْلَام: مَا كَانَ مِنْهَا مُلْتَبِساً مُضْطَرِباً يَصْعُبُ تَأوِيْلُهُ)، واتە: بریتیە لەو جۆرە خەونە تێکەڵ و پێکەڵانەی کە بە زەحمەت مانا بکرێن.

(جَسَدًا): (الجَسَدُ: الجِسْمُ، جَسِدَ الدَّمُ جَسَداً: يَبِسَ)، (جَسَدْ): بە مانای جەستە و پەیکەر دێ، بەڵام دەگوترێ: (جَسِدَ الدَّمُ جَسَداً: يَبِسَ)، واتە: خوێنەکە وشک بوو.

(وَكَمْ): (کم) دەگونجێ (خبریة) و بۆ هەواڵدان بێ و ئەوکاتەش مانای ژمارەی زۆر دەگەیەنێ، ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ ﴿٥٨﴾﴾ القصص، واتە: زۆرمان ئاوەدانیی فەوتاندوون، هەروەها دەگوترێ: (كَمْ كُتُباً قَرَأْتُ)، زۆر کتێبم خوێندوونەوە، ئەمە ئەگەر بۆ هەواڵدان بێ، یانی: زۆر، بەڵام جاری وایە بۆ پرسیارکردن (إستفهامية)ە، وەک: (كَمْ دَرْساً دَرَسْتَ؟)، چەند دەرست خوێندوون، واتە: چ ژمارەیەک؟

(قَصَمْنَا): واتە: تێکمان شکاندوون، (القَصْمُ: الكَسْرُ الَّذي فِيْهِ انْفِصَالُ)، (قَصْم): بریتیە لە شکاندنێک کە لێک جیابوونەوەی تێدابێ و، بە مانای فەوتاندن دێ، دەگوترێ: (قَصَمَ اللهُ ظَهْرَهُ) واتە: خوا پشتی شکاند.

(أَحَسُّواْ): واتە: هەستیان پێکرد، (الحِسُّ: الإِدْرَاكُ بِإِحْدَى الحَوَاسِّ الخَمْسِ)، (حِسّ): بریتیە لە هەستکردن بە یەکێک لە پێنج هەستەکان، دەگوترێ: (أَحَسَّ الشَّيءَ وَأَحَسَّ بِالشَّيءِ)، هەردووکیان بە مانای ئەو شتەی زانی و دەرکی پێکرد.

(بَأْسَنَآ): (البَأْسُ: الشِّدَةُ فِي الحَرْبِ)، (بَأْس): بریتیە لە سەختیی لە جەنگدا، هەروەها بە مانای خودی جەنگ و، سزای توند و، ترس، دێ.

(يَرْكُضُونَ): واتە: ڕایاندەکرد، (رَكَضَ، يَرْكُضُ، رَكَضاً: عَدَا مُسْرِعاً)، واتە: بە خێرایی ڕایکرد، یاخود (رَكَضَ أي: ضَرَبَ بِرِجْلِهِ)، پێی بە زەوی دادا، دەگوترێ: (رَكَضَ مِنْهُ، أي: فَرَّ وَهَرَبَ)، واتە: لێی ڕایکردو لە دەستی ڕایکرد.

(حَصِيدًا): (حَصَدَ الزَّرْعَ وَالنَّبَاتَ حَصْداً وَحَصَاداً: قَطَعَهُ بِالمِنْجَلِ)، کشتوکاڵەکەی بە داس بڕی و درەوی کرد، کە: (حَصَد، حَصَاد) چاوگەکەیەتی، بەڵام ئەگەر بگوترێ: (حَصَدَ القَومَ بِالسَّيْفِ)، یانی: (قَتَلَهُم واستأصَلَهُم)، بە شمشێر خەڵکەکەی کوشت و ڕیشەکێشی کردن، (حَصِيد)یش: بە مانای کشتوکاڵێکی درەوکراو (الزَّرْعُ المَحْصُود) دێ.

(خَامِدِينَ): (خَمَدَتِ النَّارُ تَخْمُدُ خَمْداً وخُمُوداً: سَكَنَ لَهَبُها وَلَمْ يَطْفَأْ جَمْرُهَا، وَخَمَدَ فُلَانٌ: أي مَاتَ، وَخَمَدَتِ الحُمَّى: سَكَنَت)، (خَمَدَتِ النَّارُ تَخْمُدُ خَمْداً وخُمُوداً) واتە: ئاگرەکە بڵێسەکەی کوژایەوە، بەڵام پشکۆیەکانی نەکوژانەوە و هەر دەئایسان، هەروەها وشەی (خَمَد) خوازراوەتەوە بۆ (مَاتَ)، (خَمَدَ فُلَانٌ) واتە: فڵان کەس مرد، چونکە ئینسان کە مرد دادەمرکێ و جووڵەی نامێنێ و، ئاگریش کە کوژایەوە، خامۆش دەبێ و دادەمرکێ، دەگوترێ: (خَمَدَتِ الحُمَّى)، واتە: تایەکەی نەما، یاخود دامرکا، کە لێرەدا (تا) ئەو تایەی دێتە مرۆڤ، بە ئاگرێک تەشبیه کراوە و نەمانەکەشی بە دامرکانی.

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

خـوا ﷻ لـەم سـووڕەتەدا ژمارەیەكـی زۆر بابـەتی گـەورە وگرنگـی باسـكردوون، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی - وەک پێشـتر باسـمان كـرد: بـە لای كەمـەوە شەسـت (٦٠) سـووڕەت، یاخـود حەفتـا (٧٠) سـووڕەت، لـە پێـش ئـەم سـووڕەتەدا دابەزیـون - بۆیـە زۆر بەكورتیـی دواوە و بەسـەرهاتی هەندێـک لـە پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـم الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم**) هـەر ئاماژەی كـورتی پێكـردوون، چونكـە پێشـتر لـە سـووڕەتەكانی دیكـەدا، بەسـەرهاتەكەیان بـە تەفصیـڵ هاتـوە، هەروەهـا هەندێـک بابـەتی دیكـەش كـە لـەم سـووڕەتەدا باسـكراون، خـوا ﷻ لێـرەدا بـە ئاماژەی كـورت بـاسی كـردوون، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە كـە تەفصیـڵ و وردەكارییـەكان لـە سـووڕەتەكانی دیكـەدا هاتـوون.

سـەرەتا ئـەم سـووڕەتە موبارەكـە ئـاوا دەسـت پێـدەكات: ﴿بِسۡـمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيـمِ﴾، بـە نـاوی خـوای بەزەیـی بەخشـندە، هـەركات دەڵێـی: بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: بـە نـاوی خـوای بەزەیـی بەخشـندە ئـەم كارە دەسـت پێدەكـەم، یاخـود: نـاوی خـوای بـە بەزەیـی و بەخشـندە هێنـان، دەسـتپێكی كارەكەمـە، ئنجـا دەبـێ لـە كاتی گوتنـی ئـەم ڕستەیەدا، ئـەم چـوار واتایـە لـە عەقڵ و دڵ دا ئامادەبـن:

١- ئەم كارە بەناوی خواوە دەست پێدەكەم.

٢- ئەم كارە بۆ ڕازیكردنی خوا دەكەم.

٣- ئەم كارە بە پێی شەرعی خوا دەكەم.

٤- بە پشتیوانیی خوا ﷻ ئەم كارە ئەنجام دەدەم، بەهێزووزەی خۆم.

پێویسـتە هـەر كارێكـی گرنـگ ئینسـان لـە سـەرەتایەكەیەوە (**بسـم اللـه**) بـكات و ئـەو مانـا و مەبەسـتانەی خسـتمانە ڕوو لـە دڵـی خـۆی دا ئامـادە بـكات.

﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ﴾، لە حاڵێکدا کە خەڵک لە بێ ئاگاییدا ڕووو وەرچەرخێنەرن، واتە: ڕووو وەرچەرخێنەرن لە هەق، لێپرسینەوەیان نیزیک کەوتەوە، (قَرُبَ) واتە: نیزیک بۆیەوە، بەڵام (إقْتَرَبَ) واتە: زۆر نیزیک کەوتەوە، ﴿حِسَابُهُمْ﴾، لێپرسینەوەیان، واتە: لێپرسینەوە لەگەڵ کرانی خەڵک زۆر نیزیکە، لە حاڵێکدا کە ئەوان لە بێ ئاگاییدان و، ڕووو وەرچەرخێنەرن و ڕووو وەرگێڕن لە هەق، ﴿مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا اسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ﴾، لە پەروەردگاریانەوە هیچ بیرخستنەوەیەکی تازەیان بۆ نایەت، مەگەر گوێی بۆ هەڵدەخەن لە حاڵێکدا کە یاریی و گەمە دەکەن، واتە: گاڵتەی پێ دەکەن و، پێی ڕادەبوێرن، ﴿لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ﴾، دڵەکانیان خافڵاون، (لَهْو) یانی: خافڵان و بێ ئاگایی و سەرگەرم بوون بە شتێکەوە کە سوودی نەبێ، ﴿لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ﴾، دڵەکانیان خافڵاون و سەرگەرمن و سەرقاڵن.

﴿وَأَسَرُّوا النَّجْوَى الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾، ئەوانەی کە ستەمیان کردوە، چپە چپی خۆیان بە پەنهانیی کرد، هەر چپە چپ خۆی پەنهانە، ئنجا ئەو چپە چپەش، یان سرکە سرکە بە پەنهانیی بکەی، واتە: زۆر بە پەنهانیی قسەکانیان کرد، چی بوو ئەوەی کە پەنهانیان کرد، ئەو چپە چپە؟ ﴿هَلْ هَٰذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾، لە نێو خۆیاندا ئەو پرسیارەیان کرد: ئایا ئەوەش هەر مرۆڤێکی وەک خۆتان نیە؟ کە مەبەستیان پێغەمبەرە ﷺ، ئایا ئەم پیاوە مرۆڤێکی وەک خۆتانە؟ واتە: کە مرۆڤێکی وەک خۆتانە، چۆن دەبێ شوێنی بکەون؟ بە ناوی خواوە بەرنامەتان بۆ بهێنێ، ئایا مرۆڤ لێی دەوەشێتەوە، نوێنەری خوا ﷻ بێ؟ ﴿أَفَتَأْتُونَ السِّحْرَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ﴾، ئایا ئێوە دەچنە لای جادوو لە حاڵێکدا کە دەشبینن؟ واتە: ئێوە دەبینن، عەقڵتان هەیە و چاوتان هەیە و فامیدەن (فام دەکەن)، چۆن دەچن بۆ لای جادوو؟ دیارە قورئانیان بە جادوو لە قەڵەم داوە، پێغەمبەریشیان ﷺ بە جادووگەر لە قەڵەم داوە، واتە: چۆن دەچن بۆ لای ئەو جادووەو، گوێ بۆ ئەو جادووگەرە دەگرن؟

﴿ قَالَ رَبِّي يَعْلَمُ ٱلْقَوْلَ فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، گوتی: کێ گوتی؟ پێغەمبەری خاتەم ﷺ، لە وەڵامیاندا ئەوە دەفەرمووێ، گوتی: پەروەردگارم هەر قسەیەک لە ئاسمان و زەویدا بکرێ، بێگومان ئەو دەیزانێ، بەس ئەو بیسەری زانایە، واتە: ئەو قسانەی کە ئێوە دەیانکەن و، ئەو تۆمەتانەی کە ئێوە پاڵیان دەدەنە لای من، خوا ﷻ هەمووی گوی لێیەو، لەسەرتان تۆمار دەکات، بۆیە بزانن چێ دەڵێن؟! ئەوە هەڕەشەیەکەو، دڵدانەوەی پێغەمبەریشە ﷺ، کە خوا ﷻ لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ ئەوە دەفەرمووێ، واتە: تۆ بڵێ: پەروەردگارم هەموو قسەیەک لە ئاسمان و زەویدا دەزانێ، لە سەرێ و لە خوارێ و، هەر ئەو بیسەری زانایە.

ئنجا دێتە سەر خستنەڕوو چەند تۆمەتێکی دیکەیان: ﴿ بَلْ قَالُوٓاْ ﴾، بەڵکو گوتیان: نەک هەر بڕوایان پێ نەکرد، بەڵکو کافرەکان گوتیان: ﴿ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ ﴾، ئەوە خەونی تێکەڵپێکەڵە، ﴿ بَلِ ٱفْتَرَىٰهُ ﴾، بەڵکو ئەو قسەیەی بە ناوی خواوە هەڵبەستوە، ﴿ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ ﴾، بەڵکو ئەو شاعیرە و هۆنەرێکە شیعر دەڵێ.

واتە: قورئانیان بە شیعر لە قەڵەم دەدا، بۆیە لە سووڕەتی (یس)دا خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُۥٓ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ ﴿٦٩﴾ ﴾، واتە: نە شیعرمان فێرکردوە و نە بۆشی دەگونجێ، ئەم قورئانە تەنیا یادخەرەوەیەو، قورئانێکی ڕوون و ئاشکرایە، یانی: پێغەمبەر ﷺ نەیتوانیوە شیعر دابنێ، خوای کاربەجێ ڕێی لێ گرتوە کە شاعیر بێ و شیعر دابنێ، بەڵام شیعری خەڵکی دیکەی کە زانیبی، گوتوویەتی، نەک خۆی شیعری دابنێ، بەڵام شیعری کەسی دیکەی خوێندۆتەوە، زۆر کەسیش شیعری شاعیران دەخوێنێ و یاخود دەیگێڕێتەوە، بەڵام مانای ئەوە نیە کە بۆ خۆی شاعیرە.

ئنجا تۆمەتێکی دیکە دەخاتەڕوو کە پاڵی دەدەنە لای پێغەمبەر ﷺو، بیانوویەکی دیکەیان کە دەڵێن: ﴿ فَلْيَأْتِنَا بِـَٔايَةٍ كَمَآ أُرْسِلَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴾، با

نیشانەیەکمان بۆ بهێنێ وەک پێغەمبەرانی پێشوو کە ڕەوانە کراون، واتە: موعجیزەیەکمان بۆ بێنێ، وەک هی ئەو پێغەمبەرانەی کە لەگەڵە پێشووەکاندا ڕەوان کراون، موعجیزەیەکی بەرهەست، کە هەستەوەرەکانی مرۆڤ بدوێنێ، نەک عەقڵ و شعووری، بەڵام خوا ﷻ کاتی خۆی، لە قۆناغی ساوایی مرۆڤایەتییدا، ئەو موعجیزانەی بۆ پێغەمبەران ناردوون، کە لەگەڵ قۆناغی ساوایی مرۆڤایەتییدا بگونجێن، ئەو کاتە مرۆڤەکان زیاتر پشتیان بە هەستەوەرەکانیان دەبەست، کە ئەوە قۆناغێکی سەرەتاییترو ساواترە لە ژیانی مرۆڤدا، بەڵام دوای ئەوەی مرۆڤایەتیی گەیشتووەتە قۆناغی گەیشتن و کامڵ بوون، ئنجا خوا ﷻ موعجیزەیەکی بۆ ناردوون کە عەقڵ و هەست و ناخیان بدوێنێ، ئەوە لەگەڵ ئەو قۆناغی پێگەیشتنی مرۆڤایەتییدا دەگونجێ، بۆیە خوا ﷻ وەڵامیان دەداتەوە: ﴿ مَآ ءَامَنَتْ قَبْلَهُم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَآ أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ ﴾، واتە: لە پێش ئەواندا هیچ ئاوەدانییەک کە فەوتاندوومانە، بڕوای نەهێناوە، ئایا ئەوان بڕوا دێنن؟ واتە: ئەو موعجیزەیەی کە داوای دەکەن، لەو شێوە موعجیزانەمان بۆ کۆمەڵگا و گەلە پێشووەکان ناردن، بەڵام بڕوایان پێیان نەهێناو، سەرەنجام فەوتاندمانن، چونکە یاسای خوا ﷻ وایە، هەر کۆمەڵێک داوای موعجیزەیەک بکەن، خوا موعجیزەکەیان پێ بدات و، دوایی بڕوا نەهێنن، خوا ﷻ دەیانفەوتێنێ و، بۆ ئەوەی خەڵک تەمبێێ، هەر ڕۆژە و بیانوویەک نەگرێ بە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)و، داواکارییەک لە خوا نەکات، دوایی شتەکە بێنموود (**مبتذل**) و بێ ئیعتیبار دەبێ، ئنجا یەکێکیان دەڵێ: ئەدی بۆچی بۆ فلان عەشیرەت ئەوەتان کردوە؟ ئێمەش دەبێ ئەوەمان بۆ بێنێ، یەکێکی دیکە دەڵێ: بۆچی ئەوەت بۆ ئەمە کردوە، دەبێ ئەوەش بۆ من بێنن، ئەوە دەبێتە گاڵتەجاڕو ئەوەش لەگەڵ پایەی بەرزی خوا ﷻو، لەگەڵ ئەرکی بەرزی پێغەمبەراندا (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**) شتێکی گونجاو نیە، بۆیە هەر کۆمەڵگایەک بیانوویان بە پێغەمبەرەکەی خۆیان گرتبێ و داوای موعجیزەیەکیان لێ کردبێ، ئەو پێغەمبەرە

(عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ئەو موعجیزەیەی لە خواوە پێ درابێ و، ئەو خەڵکە بڕوایان پێ نەهێنابێ، فەوتاون، کە بە زۆریی گەلە پێشووەکان هەروا فەوتاون.

بۆیە خوا دەفەرموێ: لە پێش ئەواندا هیچ ئاوەدانییەک بڕوای نەهێناوە، واتە: داوای موعجیزەکانیان کرد، بەڵام هیچیان بڕوایان پێ نەهێنا و فەوتاندمانن، ﴿أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ﴾، ئایا ئەگەر ئەو موعجیزەیەی کە داوای دەکەن، بۆیان بنێرین، ئیمان دەهێنن؟ بێگومان ئیمان ناهێنن، بۆیە نایانێرین، تاکو نەیانفەوتێنین، بەڵکو خوا موعجیزەیەکیان بۆ دەنێرێ، کە خۆی دیاریی کردوە و، ئەگەر بڕواش بەو موعجیزەیە نەهێنن، لە دنیادا نایانفەوتێنێ، بەڵام لە دوارۆژدا سزایان دەدات.

﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِمْ﴾، لە پێش تۆدا تەنیا پیاوانمان ناردوون و سروشمان بۆلا کردوون، چونکە ئەوان دەیانگوت: چۆن دەبێ مرۆڤ پێغەمبەر بێ، خوا دەفەرموێ: لە پێش تۆشدا تەنیا پیاوانمان وەک ڕەوانەکراو ناردوون و، نەک فریشتەکان، ﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾، لە خاوەن زیکران بپرسن، ئەگەر نازانن، واتە: لە خاوەن کتێبەکان بپرسن، لە زانایان و شارەزایانی کتێبە پێشووەکان بپرسن، ئەگەر نازانن، ئایا هیچ کام لە پێغەمبەرانی خوا فریشتە بوون؟! هەموویان هەر پیاو بوون و، هەموویان هەر مرۆڤ بوون و لە نێو مرۆڤەکانیشدا پیاوان، چونکە وەک پێشتر باسمان کرد، ئەو پایە بەرزە، ئەو پێگە و بەرپرسیاریەتە قورسە، بە پیاوان هەڵدەگیرێ و لە توانای ئافرەتاندا نیە، کە ئافرەتان بە لای سۆز و عەتف و هەستی ناسک و جەستەی ناسک و دەنگی ناسکدان.

﴿وَمَا جَعَلْنَٰهُمْ جَسَدًا لَّا يَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَمَا كَانُواْ خَٰلِدِينَ﴾، ئنجا ئەو پێغەمبەرانەشمان نەکردوون بە جەستەیەک کە خواردن نەخۆن و، هەر ماویش نەبوون، واتە: لە ژیانیشدا نەماونەوە، ئەوان مرۆڤ بوون وەک مرۆڤەکان خواردن و خواردنەوە و خەو و هەموو حاڵەتە سروشتییە جەستەییەکانیان بوون و،

دواییش وەک باقی مرۆڤەکان نەخۆش بوون و ساغیش بوون و، پاشان کۆتایی بە ژیانیان هاتوە.

﴿ثُمَّ صَدَقْنَٰهُمُ ٱلْوَعْدَ فَأَنجَيْنَٰهُمْ وَمَن نَّشَآءُ﴾، دوایی بەڵێنمان لەگەڵ ڕاست بردنە سەر، ئەوان و هەر کەسێک کە ویستمان دەربازمان کردن، دوای ئەوەی خوا سزای نارد، ﴿وَأَهْلَكْنَا ٱلْمُسْرِفِينَ﴾، زێدەڕۆییکارانمان فەوتاندن و لەبەینمان بردن.

﴿لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ كِتَٰبًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾، بە دڵنیایی ئێمە کتێبێکمان بۆ لاتان دابەزاندوە، کە بیرخستنەوەتانی تێدایە، ئایا نافامن؟ وشەی (ذِکْر) هەم بە واتای بیرخستنەوە دێ و، هەم بە واتای ناو و ناوبانگیش دێ، کە بە پێی ڕەوتەکە مانایەکەی دیاریی دەکرێ، لێرەدا زیاتر وا پێدەچێ، مەبەست ئەوە بێ کە بیرخستنەوە و یادخستنەوەتانی تێدایە.

ئنجا بۆچی خوای کارزان لەو پێنج ناوەی کە بۆ قورئانی، بەکارهێناون (**فرقان، قرآن، ذکر، کتاب، کلام الله** ) بۆچی یەکێکیان (**ذکر**)ە؟

چونکە خوا مرۆڤی وا خوڵقاندوە، ئەو ڕاستییانەی لە دوو توێی وەحییدا دەیانبێنێ، لەگەڵ زگماک و سروشتی ساغی مرۆڤیشدا تێکیهەڵشێلاون، وەحیی خوا و کتێبەکانی خواش هاتوون، ئەو ڕاستییانە بیر مرۆڤ بخەنەوە، بۆیە یەکێ لە ناوەکانی قورئان بریتیە لە (**ذکر**)، هەروەها وشەی (**ذکر**) بۆ تەوڕاتیش هەر بەکارهاتوە.

ئنجا خوا ﷻ لە کۆتایی دا، باسی سەرەنجامی شوومی ئەوانە دەکات، کە ئەهلی ستەم بوون و، بێبڕوا بوون و خراپەکار بوون، دەفەرموێ: ﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً﴾، زۆر ئاوەدانییمان تێکشکاندوون کە ستەمکار بوون، (**کم**) واتە: چەند، بەڵام لێرەدا (**کم الخبرية**)ی پێدەڵێن، نەک (**کم الإستفهامية**)، خوا ﷻ ناپرسێ: چەندمان فەوتاندن؟ بەڵکو دەفەرموێ: چەندمان فەوتاندن!

واتە: زۆرمان فەوتاندن، زۆر ئاوەدانیی کە ستەمکار بوون، ﴿وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ﴾، لە دوای وانیش کۆمەڵێک خەڵکی دیکەمان پێگەیاند، ﴿فَلَمَّآ أَحَسُّواْ بَأْسَنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ﴾، ئنجا کاتێک هەستیان بە سزای سەختی ئێمە کرد، هەستیان بە سەرەتا و پێشەکییەکانی کرد، تۆ - ئەگەر لەوێ بای - دەتبینی: ئەوانە لەو ئاوەدانییانە، لە شارو دێیەکانی خۆیان، رایاندەکرد، هەڵدەهاتن، ﴿لَا تَرْكُضُواْ وَٱرْجِعُوٓاْ إِلَىٰ مَآ أُتْرِفْتُمْ فِيهِ﴾، رامەکەن و بگەڕێنەوە بۆ ئەو ژیانە خۆشەی کە تێیدا خۆشگوزەران کرابوون، ﴿وَمَسَٰكِنِكُمْ﴾، هەروەها بگەڕێنەوە بۆ خانووبەرەکانتان، ﴿لَعَلَّكُمْ تُسْـَٔلُونَ﴾، بەڵکو پرسیارتان لێ بکرێ، واتە: خەڵک بێ داوای شتتان لێ بکات، کە ئەوە جۆرێکە لە گاڵتە پێکردن، یاخود: ﴿لَعَلَّكُمْ تُسْـَٔلُونَ﴾، بۆ ئەوەی کە لێپرسینەوەتان لەگەڵدا بکرێ.

﴿قَالُواْ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾، گوتیان: ئەی هاوار بۆ ئێمە! ئەی سزای سەخت بۆ ئێمە، لە کوێی وەرە! بێگومان ئێمە ستەمکار بووین.

﴿فَمَا زَالَت تِّلْكَ دَعْوَىٰهُمْ حَتَّىٰ جَعَلْنَٰهُمْ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ﴾، ئیدی هەر ئەوە پاڕانەوەیان بوو، بەردەوام هەر ئەو قسەیان دووبارە دەکردەوە: ﴿يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾، هەتاکو هەموویانمان گێران، بە (وەک) کشتوکاڵێکی درەوکراوی دامرکاو، (حَصِيداً) بە مانای (مَحْصُوداً)ە، واتە: کشتوکاڵێک کە درەو کرابێ و حاسەڵاتی هەڵگیرابێتەوەو، (خَٰمِدِينَ)، (خَمَدَ) واتە: (سَكَنَ) واتە: دامرکاو و هەست لێبڕاو و بێ نووزە، کە دیارە خەڵکێک کە دەفەوتێ، بەو شێوەی لێ دێ، هەم وەک پەرێزێکی رووت، کشتوکاڵێک کە دەدوورێتەوە، هەم وەک ئاگرێکی دامرکاو، کە قرچە قرچ و گرفەو لرفە و هەست و خوستی نامێنێ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

باسی نیزیکی لێپرسینەوەی خوا بۆ خەڵک، لە حاڵێکدا کە ئەوان لە بێ ئاگاییدان، (دیارە مەبەست پێی خەڵکی بێبڕوایە)، هەر وەحییەکی تازەشیان بۆ بێ، بە گەمە و یارییەوە و بە دڵ خافڵاوییەوە گوێی بۆ دەگرن و، بەشەر بوونی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ دەکەنە بیانووی بڕوا پێنەهێنانی و، قورئانیش بە جادوو تۆمەتبار دەکەن:

خوا دەفەرموێ: ﴿ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ مُّعۡرِضُونَ ۝١ مَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّن رَّبِّهِم مُّحۡدَثٍ إِلَّا ٱسۡتَمَعُوهُ وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ ۝٢ لَاهِيَةٗ قُلُوبُهُمۡۗ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ هَلۡ هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡۖ أَفَتَأۡتُونَ ٱلسِّحۡرَ وَأَنتُمۡ تُبۡصِرُونَ ۝٣﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ﴾، لێپرسینەوە بۆ خەڵک نیزیک کەوتەوە، دیارە (**حِسَاب**) وەک پێشتر باسمان کرد، مانا ڕیشەییەکەی بریتیە لە: ژماردن (**إستعمال العدد**)، بەکارهێنانی ژمارە (١، ٢، ٣...) ئەوە حیسابە، بەڵام دوایی وشەی (**حِسَاب**) خوازراوەتەوە بۆ لێپرسینەوەو، پاشان خوازراوەتەوە بۆ سزادان، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنۡ حِسَابُهُمۡ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّيۖ لَوۡ تَشۡعُرُونَ ۝١١٣﴾، واتە: سزادانیان، یاخود لێپرسینەوەیان هەر لەسەر پەروەردگارمە، ئەگەر ئێوە هەست پێ بکەن، هەروەها یەکێک لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی، بریتیە لە (**يَوْمُ الحِسَاب**)، واتە: ڕۆژی لێپرسینەوە، یاخود ڕۆژی سزادان، کە دەفەرموێ:

﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ﴾، وشەی (النَّاس) دیارە (ال)ەکەی (ال العَهد)ە، واتە: بۆ خەڵکەکە، کە خەڵکە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکەن، چونکە خەڵکە بڕواوادارەکە، بێ ئاگا نەبوون و، پشت هەڵکردوو نەبوون، پاشان ئەو وەحییە تازەیەی کە لە پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ پێیان گەیشتوە، بە گاڵتە و گەمەوە مامەڵەیان لەگەڵدا نەکردوەو، دڵیان لێی بێ ئاگا نەبووە، کەواتە: وشەی (النَّاس) ئەو (ال)ەی کە لەسەریەتی بۆ ناساندن (تعریف)ە، بەڵام بۆ (تعریف العهد)ە، واتە: خەڵکەکە، خەڵکە بێبڕوایەکە، وشەی ﴿اقْتَرَبَ﴾ش بە پێی بنچینەی: (زيادة المَبْنى تدلُّ على زيادة المعنى)، (قَرُبَ) یانی: نیزیک بۆوە، بەڵام (اقْتَرَبَ) یانی: زۆر نیزیک کەوتەوە، کە دەفەرموێ: نیزیک کەوتەوە، دیارە بە پێی ئەندازەگیریی خوا ﷻ دنیاو قیامەت و ڕابردوو و، ئێستاو داهاتوو هەمووی یەک شتە، بۆ ئێمە کات (زمن) دابەش دەکرێ بۆ ڕابردوو، کە تێپەڕیوە و، ئێستا کە تێیداین و، داهاتوو کە نەهاتوە، بەڵام بە نسبەت خواوە ﷻ هەمووی وەک یەکە، خوا ﷻ لە دەرەوەی بازنەی کات و شوێنە، بۆیە خوا ﷻ ئێستا لێرە دەفەرموێ: بۆ خەڵکی هاوبەش بۆ خوا دانەرو بێبڕوا، لێپرسینەوەیان، زۆر نیزیک کەوتەوە، بەڵام لە شوێنی دیکە، دەفەرموێ: چوونە نێو بەهەشتەوە، یان چوونە نێو دۆزەخەوە، یان لێپرسینەوەیان لەگەڵدا کرا، بە ڕابردوو دەیهێنێ.

٢)- ﴿وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ﴾، واتە: لە حاڵێکدا کە ئەوان لە بێئاگایی دان، ﴿مُّعْرِضُونَ﴾ە یانی: ڕوو وەرچەرخێنەریشن (ڕوو وەرگێڕیشن) (مُعرِض) واتە: ڕوو وەرگێڕ، (مُعرِضُون) کۆیەکەیەتی، یانی: هەم بێ ئاگان، هەم ڕووشیان وەرچەرخاندوە (ڕووشیان وەرگێڕاوە) (الغَفْلَةُ: الذُّهُولُ عَنِ الشَّيء)، (غفلة) بێ ئاگابوونە لە شتێک، (وَالإِعْرَاضُ: صَرْفُ العَقْلِ عَنْ الإشْتِغَالِ بِشيء)، وشەی (إِعْرَاض) یانی: ڕوو وەرگێڕان، بەڵام مانا مەجازییەکەی پێ مەبەستە، نەک مانا حەقیقییەکەی کە ڕوو وەرگێڕانی جەستەییە، واتە: ئەوە کە ئینسان عەقڵ و هەستی خۆی لە شتێک لابدات و تێیدا بەکاری نەهێنێ و، گرنگیی پێ نەدا و لێی ورد نەبێتەوە و تێیڕانەمێنێ.

٣)- ﴿مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ﴾، لە پەروەردگاریانەوە هیچ بیرخستنەوەیەکی تازەیان بۆ نایەت، (المُحْدَث: الجَدِيْد نُزُوله مُتَكَرِّرًا) واتە: ئەوە کە دابەزینەکەی دووبارە دەبێتەوە و تازەیە.

لێرەدا هەندێک لە زانایان زۆر مشت و مڕیان لەسەر ئەوە بووە، کە ئایا قورئان دروستکراوە، یاخود دروستکراو نیە؟

کە بە پێویستی نازانم، بچمە نێو ئەو باس و خواسانەوە و کاتی خۆی کێشەو فەرتەنەیەکی زۆر لەسەر ئەوە بووە، کۆمەڵێک زانا زۆر لەسەر ئەوە ئەزیەت دراون، بە تایبەت ئیمام ئەحمەد، بەڵکو هەندێکیان ئیعدام کران و کوژران و، خەڵکێکی زۆر تووشی مەینەتیی بوو، کە دەستەڵاتی سیاسیی ئەو کاتە، وەک دەستەڵاتی سیاسیی هەموو کاتەکانی دی، هەر جارە شتێک بۆ خەڵک دێنێتە پێشێ و دەیورووژێنێ و خەڵکی پێ سەرقاڵ دەکات، بۆ ئەوەی خەڵک ئاگایان لە گرفت و کێشە ڕاستەقینەکانی خۆیان نەمێنێ، ئەو کاتەش هەر وابووە، ئەگەرنا خوا ﷻ باسی قورئان دەکات، وەک فەرمایشتی خۆی، هیچ گومانی تێدا نیە قورئان کە فەرمایشتی خوایەو، ئەو سیفەتە سیفەتێکی لەمێژینەیە لە خوادا، واتە: سیفەتێکی بێ سەرەتایە، هەروەک چۆن زانیاریی خوا نەبوونی پێش نەکەوتوە، دەستەڵاتی خواو، ژیانی خوا و، ویستی خوا ...هتد، بە هەمان شێوە، ئەوەش کە خوا فەرمایشت دەفەرموێ، نەبوونی پێش نەکەوتوە، واتە: کاتێک بووبێ کە خوا ﷻ فەرمایشتی نەبوو بێ و، دواتر فەرمایشتی پەیدابوو بێ، بەڵام ئەم قورئانە بۆ ئێمە دوای ئەوەی کە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دابەزیوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی زانیوە، بە نسبەت ئێمەوە لە دوای هاتنی پێغەمبەر ﷺ ئێمە بە قورئان ئاشنا بووین و، خوا ئەو فەرمایشتەی بۆ ئێمە ناردوە، بەڵام سیفەتی فەرمایشتکردنی خوا ﷻ بێ سەرەتایە و لە مێژینەیە، ئنجا هەر ئایەتێک کە دابەزیوە بۆ وێنە، ئێستا دەگوترێ: قورئانی مەککەیی و قورئانی مەدینەیی، دیارە قورئانی مەککەیی لە مەککە دابەزیوەو، قورئانی مەدینەیی لە مەدینە دابەزیوە،

کەواتـە: قورئـانی مەدینەیـی بـۆ ئەوانـەی کـە چوونەتـە قۆناغـی مەدینـەوە، تازەتـر بـووە لـە قورئـانی مەککەیـی، دابەزینەکـەی تازەتـر بـووە و نوێتـر بـووە، بـەڵام سـیفەتی فەرمایشـتکردنی خـوا ﷻ سـیفەتێکی لەمێژینەیـەو بـێ سـەرەتایە، ئیـدی سـیفەتەکانی خـواش، ئێمـە لـەوە بچووکتریـن عەقـڵ و خەیـاڵ و ئەندێشـەی ئێمـە لـەوە بچووکـترە، کـە ئیسـتیعابی هەنـدێ لـە دروسـتکراوەکانی خـواش بـکات، چ جـای سـیفەتەکانی خـوا ﷻ، چ جـای خـوا ﷻ کـە لـە سـەرووی دروسـت کراوەکانیـەتی.

ئنجـا خــوا دەفەرمــوێ: هیــچ یــاد خســتنەوەیەکیان لــە پەروەردگاریانــەوە بــە تازەیــی بــۆ نایــەت:

٤)- ﴿ إِلَّا ٱسۡتَمَعُوهُ وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ ﴾، واتـە: مەگـەر گوێـی بـە هەڵدەخـەن، لـە حاڵێکـدا کـە یاریـی دەکـەن، واتـە: بـە جیددیـی نایگـرن و گاڵتـەی پـێ دەکـەن.

٥)- ﴿ لَاهِيَةً قُلُوبُهُمۡ ﴾، واتە: لە حاڵێکدا کە دڵیان خافڵاوە، پێشتر گوتمان: (لَهى، يَلْهُو) یانی: خافڵ و سەرگەرم بوو و سەرقاڵ بوو، ﴿ لَاهِيَةً قُلُوبُهُمۡ ﴾، واتە: لە حاڵێکدا گوێ دەگرن، لەو یاد خستنەوە تازەیەی خوا کە بۆیان دادەبەزێ، کە دڵیان بێ ئاگایە، واتە: تێگەیشتنی تێدا نیە.

٦)- ﴿ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ﴾، ئەوانەش کە ستەمیان کردوە، چپە چپی خۆیان پەنهان کرد، ئنجا خوا نەیفەرمووە: ﴿ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَى ﴾، ئەگەر وای فەرمووبایە واتە: ئەو کافرانەی کە قسەی لە بارەوە دەکردن، ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، بەڵام لێرەدا: ﴿ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ﴾ی بۆ زیاد کردوە، تاکو بزانرێ ئەوانە، وێڕای ئەوەی هاوبەش بۆ خوا دانەرو کافر بوون، سیفەتی ستەمیشیان هەبووە، ئەوانەی کە ستەمیان کرد، ﴿ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ﴾، دیارە ئەمە جێدار (بدل)ە کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَسَرُّواْ ﴾، ئەم: ﴿ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ﴾، (بدل)ە بۆ ئەو.

(ٱلنَّجۡوَى)، لـە ﴿ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَى ﴾ دا، (**المُحَادَثَـة: الخَفِيَّـة**) کـە بـە کوردیـی پێـی دەڵێیـن: چپـە چـپ، یـان فسـکە فسـک، یـان سرکـە سرک، وشـەی (**الإسرار: الكِتْمَان**)،

یانی: پەنهانکردن، ئنجا ئامانجیان لە پەنهانکردنی ئەو چپە چپەیان، ئەوە بووە کە مسوڵمانان بە پیلان و فێڵەکەیان نەزانن، وێڕای ئەوەی کە چپە چپ، هەر بۆ خۆی پەنهانە، کەچی پەنهانتریشیان کردوە، بەڵام ئەوەتا خوا ﷻ لێی ئاشکرا کردوون، ئنجا ئەو چپە چپەی کە پەنهانیان کرد، ئەوانەی ستەمیان کردبوو، بریتی بوو لە چی؟

٧)- ﴿هَلْ هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾، ئەم چپە چپە بریتی بووە لەوە کە دەیانگوت: ئایا ئەمە هەر مرۆڤێکی وەک خۆتانە؟ کە بێگومان ئەم پرسیار کردنە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە.

٨)- ﴿أَفَتَأْتُونَ ٱلسِّحْرَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ﴾، ئەمەش دیسان ئەم هەمزەیە (أ)ی سەر ﴿أَفَتَأْتُونَ﴾، دیسان ئەوەش بۆ پرسیارلێکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، واتە: ئایا دەچن بۆ لای جادوو ﴿وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ﴾، لە حاڵێکدا کە ئێوە دەشبینن؟ کە بە تەئکید مەبەستیان لە جادوو، ئەو فەرمایشتە بووە کە پێغەمبەر ﷺ خوێندوویەتەوە (قورئان)، کە دەفەرموێ ﴿وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ﴾، ئەوە حاڵە، یانی: لە حاڵێکدا کە ئێوە دەبینن و، چاوتان ساغە، چۆن دەچن بۆ لای جادوو؟ جادوویەک کە موحەممەد ﷺ دەیخوێنێتەوە، گوێی بە هەڵدەخەن، بێگومان لێرەدا کە دەڵێن: ﴿وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ﴾، مەبەستیان تەنیا چاوی سەر نەبووە، بەڵکو مەبەستیان ئەوە بووە، کە ئێوە وەک چۆن شتێک کە بە چاو دەبینرێ زۆر دیارە، ئاواش ئەو شتە زۆر جوان دیارە، کە ئەوەی موحەممەد ﷺ دەیلێ، جادوویە! ئنجا وەک چۆن ئەوەی بینراوە، پێویستیی بە بەڵگە لەسەر هێنانەوە ناکات، ئەوەش موحەممەد ﷺ دەیلێ، کە جادوویە، پێویستیی بە بەڵگە لەسەر هێنانەوە ناکات، هەر تۆزێک عەقڵتان هەبێ، بەڵگە نەویستە کە جادوویە! مەبەستیان پێی ئەوە بووە، کە بێگومان درۆیەکی شاخداریان کردوە، بەڵام بەشەر کە دایە نەفامیی، هیچ زیندەوەرێکی ناگاتێ، ئنجا بەشەر خۆشی هەڵدەخەڵەتێنێ جاری وا هەیە، دەزانێ کە ئەوە ناهەقە، بەڵام دوایی کە زۆر دووبارەی دەکاتەوە، خۆشی دوایی لە خۆی دەکەوێتە گومانەوە!

## مەسەلەی دووەم:

**لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ هاتووە: ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوا هەموو قسەیەکی پەنهان و ئاشکرا، لە ئاسمان و زەمیندا دەزانێ و، هیچی لێ پەنهان نیە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ قَالَ رَبِّي يَعْلَمُ ٱلْقَوْلَ فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ  ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿ قَالَ رَبِّي يَعْلَمُ ٱلْقَوْلَ فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، فەرمووی: پەروەردگارم هەر قسەیەک لە ئاسمان و زەوییدا دەزانێ، کێ فەرمووی؟ بێگومان مەبەست پێی موحەممەدە ﷺ، بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، لێرەدا خوا ﷻ پێغەمبەری خۆی ﷺ ئاگادار کردۆتەوە، لەو چپە چپەی کە بە پەنهانیی کردوویانە، بۆیە کە چپە چپ بووە و پەنهانییشیان کردوە، واتە: لە شوێنێکی لاچەپ ئەو چپە چپەیان پێکەوە کردوە، یان بە دەنگێکی زۆر نزم و کپ کردوویانە، کەچی خوا ﷻ پێغەمبەری خۆی ﷺ لێ ئاگادار کردۆتەوە، کە فەرموویەتی: ﴿ رَبِّي يَعْلَمُ ٱلْقَوْلَ فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، پەروەردگارم هەر قسەیەک لە ئاسمان و زەوی دا دەزانێ، وشەی (ٱلْقَوْلَ): (**ال تعريف**)ی لەسەرە و بۆ جینسە، یانی: پەروەردگارم تێکڕای قسەکان دەزانێ لە ئاسمانێ و لە زەویی دا، وشەی: ﴿ قَالَ رَبِّي يَعْلَمُ ٱلْقَوْلَ ﴾، خوێندنەوەیەکی دیکەشی هەیە: (**قُلْ رَبِّي يَعْلَمُ القَوْلَ فـي السَّمَاءِ وَالأرْض**)، ئەگەر بفەرمووێ: ( قَالَ )، واتە: موحەممەد ﷺ فەرمووی، بەڵام ئەگەر (**قُلْ**) بێ، واتە: تۆ بفەرموو: پەروەردگارم هەموو قسەیەک دەزانێ، کە واتاکەی هەر دەبێتەوە یەک.

٢)- ﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، هەر ئەو بیسەری زانایە، واتە: ئەو (خوا) وەسف کراوە بە تەواوی سیفەتی بیستن، بۆ هەموو بیستراوەکان و، سیفەتی زانین، بۆ هەموو زانراوەکان و، هەموو سیفەتەکانی دیکەی خوا ﷻ لە لووتکە دان و لەو پەڕییدان و، بێ سنووورو ڕەهان.

### مەسەلەی سێیەم:

**خستنە ڕووی چوار تۆمەتی دیکەی کافرەکان بۆ پێغەمبەرو قورئان، لەو شەش تۆمەتەی کە لەم چەند ئایەتەدا بەسەر یەکەوە هاتوون:**

**یەک:** ئەوەیە کە ئەم قورئانە خەونی تێکەڵ و پێکەڵە.

**دوو:** موحەممەد قسەی هەڵبەستوە بە ناوی خواوە (قورئان).

**سێ:** شاعیر بوونی پێغەمبەر ﷺ.

**چوار:** نەهێنانی موعجیزەیەکی وەک هی پێغەمبەرانی پێشوو، کە بۆ گەلە پێشووەکان هاتوون.

ئەم چوار تۆمەتە و لەگەڵ ئەو دووەی ڕابردن: (مرۆڤ بوونی پێغەمبەر ﷺو، پاشان بە جادوو لە قەڵەم دانی قورئان) ئەوە شەش تۆمەت، ئنجا وەڵامدانەوەیان لە لایەن خوای پەروەردگارەوە، کە گەلە پێشووەکانیش کە بڕوایان بە موعجیزان نەهێناوە، سەرەنجام سزادراون و فەوتاون، بەڵام خوا ﷻ نایەوێ ئەوان، واتە: ئەو خەڵکەی کە پێغەمبەری خاتەمیان ﷺ بۆ ڕەوانە کراوە، بیانفەوتێنێ، بۆیە ئەو موعجیزەیان بۆ نانێرێ کە کەسێک بڕوای پێ نەهێنێ، شایستەی سزادرانی فەوتێنران بێ:

خوا دەفەرموێ: ﴿ بَلْ قَالُوٓا۟ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍۭ بَلِ ٱفْتَرَىٰهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِـَٔايَةٍ كَمَآ أُرْسِلَ ٱلْأَوَّلُونَ ۝٥ مَآ ءَامَنَتْ قَبْلَهُم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَآ ۖ أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ ۝٦ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ بَلْ قَالُوٓا۟ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍۭ ﴾، واتە: نەک هەر بە جادوویان لە قەڵەم داو، نەک هەر پێی بێبڕوا بوون، بەڵکو گوتیان: ئەم قورئانە کە موحەممەد ﷺ دەیخوێنێتەوە،

وڕێنەی بابای خەونی تێکەڵ و پێکەڵ بینەرە. پێشتر باسمان کرد: (أَضْغَٰثُ) کۆی (ضِغْثٌ)ە و ئەویش: (الحِزْمَةُ مِنْ أَعْوَادٍ، أو العُشْبِ، أو الحَشِيْشِ المُخْتَلَط)، (ضِغْثٌ) بریتیە لە چەپکێک لە چیلکە یاخود، لە گژ و گیا، یاخود لە پووش و پەڵاشی تێکەڵ، ئنجا ئەو خەونانەی کە وەک کوردەواریی خۆمان گوتوویانە: (هەر تیرەی لە کەنداڵێک) کە هیچ شتێک پێکیەوە نابەستێتەوە، پێی دەڵێن: خەونی تێکەڵ و پێکەڵ و، بە عەرەبیی دەڵێن: (أَضْغَاثُ الأحلام)، وشەی (أحلام) کۆی (حُلْمٌ)ە واتە: خەون، ئەو تۆمەتەشیان پاڵداوەتە لای قورئان.

٢)- ﴿بَلِ ٱفۡتَرَىٰهُ﴾، واتە: (بَلْ قَالُوا هُوَ افْتَرَاهُ)، بەڵکو گوتیان: کە موحەممەد ﷺ قورئانی هەڵبەستوە، بە ناوی خواوە.

٣)- ﴿بَلۡ هُوَ شَاعِرٌ﴾، ئەمیش دیسان واتە: (بَلْ قَالُوا هُوَ شَاعِر)، بەڵکو گوتیان: ئەو شاعیرە و هۆنەرە، بەڵام لە هەردوو ڕستەکان: ﴿بَلِ ٱفۡتَرَىٰهُ﴾، ﴿بَلۡ هُوَ شَاعِرٌ﴾، (قَالُوا)ی لێ لابراوە، چونکە ئەوەی پێشێ دەیگەیەنێ: (بَلْ قَالُوا)، ئەمیش هەر لەو سیاقەدایە، یانی: (بَلْ قَالُوا هُوَ افْتَرَاهُ، بَلْ قَالُوا هُوَ شَاعِر).

٤)- ﴿فَلۡيَأۡتِنَا بِـَٔايَةٖ كَمَآ أُرۡسِلَ ٱلۡأَوَّلُونَ﴾، با نیشانەیەکمان بۆ بێنێ، وەک چۆن پێشووەکان ڕەوانە کراون، واتە: وەک چۆن ئەوانەی پێشێ ڕەوانە کراون، بە چەند جۆرە موعجیزەیەکەوە، با لەو جۆرە نیشانە و موعجیزەیەمان بۆ بهێنێ، خوا ﷻ وەڵام دەداتەوە و دەفەرمویێ:

٥)- ﴿مَآ ءَامَنَتۡ قَبۡلَهُم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآ﴾، لە پێش واندا هیچ ئاوەدانییەک بڕوایان نەهێناوە کە فەوتاندوومانن، واتە: فەوتاندوومانن بەهۆی ئەوەوە کە ئەو موعجیزەیەی، داوایان کردوە، پێمان داون، کەچی بڕوایان پێ نەهێناوە، ئنجا سەرەنجام ئیمانیان نەهێناوە، فەوتاندوومانن.

وشەی (ما) لابەرە (نافية)یە، ﴿مَآ ءَامَنَتۡ قَبۡلَهُم﴾، یانی: بڕوای نەهێنا لە پێشواندا، وشەی ﴿مِّن قَرۡيَةٍ﴾ (مِنْ) (مَزِيْدَةٌ للتأكِيدِ)، (مِنْ) بۆ جەختکردنەوە

زیادکراوە، واتە: هیچ ئاوەدانییەک لە ئاوەدانییەکان کە لە پێش واندا ڕابردوون و، داوای ئەو جۆرە موعجیزانەیان کردووە، ئێمەش پێمان داون، هیچیان بڕوایان نەهێناو، سەرەنجامیش فەوتاندمانن.

کە دەفەرمووێ: ﴿ مَآ ءَامَنَتۡ ﴾، ئەوەی کە (ءَامَنَتۡ) پێیەوە پەیوەستە، قرتێندراوە، لەبەر ئەوەی سیاقەکە دەلالەتی لەسەر دەکات، یانی: (**مَا آمَنَتْ بِآياتنا قَبْلَهُمْ مِنْ قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا**)، بڕوای بەو نیشانانەمان نەهێنا، هیچ کام لەو ئاوەدانییانە کە لە پێش ئەواندا بوون، سەرەنجام بە هۆی بڕوا نەهێنانیانەوە، فەوتاندمانن، بێگومان کە دەفەرمووێ: ﴿ مَآ ءَامَنَتۡ قَبۡلَهُم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآ ﴾، وشەی (قَرۡيَةٍ) مەبەست پێی خەڵکەکەیەتی، واتە: خەڵکی ئەو ئاوەدانییە، پێشووتریش زۆر باسمان کردوە، وشەی (قَرۡيَةٍ) بە ئاوەدانیی و شاری گەورە دەگوترێ، نەک مانا زاراوەییە عورفییەکەی ئێستای کە (قَرۡيَةٍ) واتە: گوندو لادێ، نەخێر لە قورئاندا وشەی (قَرۡيَةٍ) مانای شاری گەورە یاخود ئاوەدانیی گەورە.

٦)- ﴿أَفَهُمۡ يُؤۡمِنُونَ﴾، ئنجا ئایا ئەوان بڕوا دەهێنن؟ ئەمە پرسیارکردنێکی نکووڵیلێکەرانەیە، واتە: ئەوان کە بڕوایان بە موعجیزەی پێغەمبەرەکانی خۆیان نەهێناوەو، سەرەنجام بە پێی یاسای خۆمان فەوتاندوومانن، ئایا ئەوان پێیان وایە بڕوا دەهێنن؟ ئەوانیش بڕوا ناهێنن هەرچەندە ئەو جۆرە موعجیزانەشیان بۆ بنێرین، ئنجا کە بڕواشیان نەهێنا، وەک چۆن ئەوانی پێشوومان فەوتاندن، ئەوانیش دەفەوتێنین، ئنجا بۆ ئەوەی نەفەوتێن، ئەو جۆرە موعجیزانەیان بۆ نانێرین، بەڵکو موعجیزەیەکیان بۆ دەنێرین، کە ئەگەر بڕواشی پێ نەکەن، لە دنیادا نەیانفەوتێنین، مۆڵەتیان پێ دەدەین.

پێشتر حیکمەتەکەشم ڕوونکردەوە: چونکە موعجیزەیەکی بەرهەست، کە بە هەستەوەرەکانی مرۆڤ هەست دەکرێ، کاتێک کە خوا دەینێرێ، ئەگەر ئەو خەڵکە بڕوایان پێ نەهێنا، دوایی خەڵکی دوای ئەوانیش بۆیان هەیە بڵێن: ئێمەش موعجیزەیەکی دیکەمان بۆ بهێنن و، خەڵکی دوای ئەوانیش بۆیان

هەیە بڵێن: بۆ ئێمەش بێنن هەروەها بە هەمان شێوە، ئنجا ئەوە لەگەڵ ئەو جیددییەتەی کە لە ئایین و بەرنامەی خوادا هەیەو، لە ئەرکی پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ) هەیە، ناگونجێ! هەر بۆیە خوا ﷻ هەر موعجیزەیەکی بۆ پێغەمبەرانی پێشوو ناردوە، ئەو موعجیزانە و ئەو پێغەمبەرانە پەیوەست بوون بە کات و شوێن و کۆمەڵگایەکی دیاریکراوەوە، بەڵام بۆ پێغەمبەری خاتەم (محمد) ﷺ ئەگەر موعجیزەیەکی لەو شێوەیەی ناردبایە، بۆ وێنە: کێوی کرد بایە بە زێڕ، خەڵکی ئێستا دەیگوت: ئنجا کێ دەڵێ وا بووە؟! ئەوە هەر گۆڕانێکی جیۆلۆجیی بووەو، بەسەریدا هاتوە، یان ئەگەر نەمابووایە دەیانگوت: نەخێر ڕاست نیە، یان بە شتێکی دیکە تەفسیریان دەکردو دەیانگوت: ئێستا با فلان شتە بێ، بەڵام ئێستا فەرموو، ئەوە قورئانە و لەبەر دەستیانە، کەواتە: خوا ﷻ موعجیزەیەکی بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ و بۆ مرۆڤایەتییەک کە پێغەمبەری خاتەمی ﷺ بۆ لا نێردراوە، ڕەخساندوە، کە عەقڵ و دڵیان دەدوێنێ، ئنجا بەردەوامیشە و لەبەر دەستیانە.



## مەسەلەی چوارەم:

**خوا پێش پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ تەنیا پیاوانی بە پێغەمبەر ناردوون و حەوجێی خۆراک بوون و، هەر ماویش نەبوون، پاشان خوا ﷻ گفتی خۆی لەگەڵ پێغەمبەراندا ڕاست بردۆتە سەرو، خۆیان و ئەوانەشی کە خوا ویستبێتی و بە پێویستی زانیبن دەربازی کردوون و، زێدەڕۆییکارانیشی فەوتاندوون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِمْ ۖ فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧﴾ وَمَا جَعَلْنَٰهُمْ جَسَدًا لَّا يَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَمَا كَانُوا۟ خَٰلِدِينَ ﴿٨﴾ ثُمَّ صَدَقْنَٰهُمُ ٱلْوَعْدَ فَأَنجَيْنَٰهُمْ وَمَن نَّشَآءُ وَأَهْلَكْنَا ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلَّا رِجَالًا ﴾، لە پێش تۆدا تەنیا پیاوانمان ڕەوانە کردوون، واتە: بە پێغەمبەر، لەوبارەوە زانایان دەڵێن: (**الرِّسَالَةُ مَحْصُورَةٌ فِي الرِّجَالِ بِلَا خِلَافٍ، فَإِنَّمَا الخِلَافُ فِي النبوَّة**)، ڕەوانە کراویەتیی کورت هەڵهێنراوە لە پیاواندا، ئەوە ڕاجیایی لەسەر نیە، بەڵام هەندێک لە زانایان لەو بارەوە ڕایان جیایە کە پێغەمبەرایەتیی (نبوة) {خوا بە شێوەیەکی تایبەت هەواڵ بە کەسێک بدات} دەڵێن: ئەوە تەنها لە پیاواندا کورت هەڵنەهاتووەو، دەگونجێ هەندێ لە ئافرەتانیش خوای پەروەردگار هەواڵی تایبەتی پێدابن، بە تایبەت دایکی مووسا: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ ﴾، هەروەها مەریەم: ﴿ وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾آل عمران، (خوا لێیان ڕازی بێ)، بەڵام ڕای ڕاست هەر ئەوەیە کە وەک چۆن ڕەوانەکراویەتیی (رسالة) تەنیا لە پیاواندا کورت هەڵهاتوە، پێغەمبەرایەتییش هەر لە پیاواندا کورت هەڵهاتوە، بەڵام هی ئەو ئافرەتە ناوازە و هەڵکەوتووانە، خورپە و ئیلهام بووە، خوای میهرەبان بۆی کردوون.

٢)- ﴿ نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡ ﴾، واتە: سروشمان بۆ لایان دەکردن، بە شێوەی پەنهان ئاگادارمان دەکردنەوەو، پەیاممان بۆ دەناردن.

٣)- ﴿ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴾، ئەگەر نازانن لە ئەهلی زیکر بپرسن، واتە: لە خاوەن کتێبان و لەوانەی کە بیرخستنەوەکانی خوایان لەبەر دەستدان، کە لە کتێبەکانی خوادا هاتوون، ئەمەش وەڵامی ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرو بێبڕوایانەیە کە دەیانگوت: ﴿ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرٗا رَّسُولٗا ٩٤ ﴾ الإسراء، ئایا خوا مرۆڤێکی کردوەتە ڕەوانەکراو؟ خوا ﷻ دەفەرمویَ: لە پێش تۆشدا تەنیا پیاوانمان ناردوون، لە خاوەن کتێبان بپرسن، ئەگەر نازانن، ئایا هیچ کام لە پێغەمبەرانی خوا، جگە لە مرۆڤە پیاوەکان، هیچ کەسی دیکە بووە؟ کەواتە موحەممەد ﷺ شتێکی ناوازە و ڕیزپەڕ نیە، وەک لە سووڕەتی **(الأحقاف)**دا دەفەرمویَ: ﴿ قُلۡ مَا كُنتُ بِدۡعٗا مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴾، واتە: من داهێنراوێک و تازە پەیدابوویەک نیم لە پێغەمبەران، پێغەمبەرانی پێش منیش کە هاتوون، هەر پیاو بوون و لە مرۆڤان بوون.

ئنجا ئەم ئایەتە موبارەکە، ئەوەشی لێ وەردەگیرێ، کە دروستە ئێمە قسەی خاوەن کتێبەکان بە بەڵگە بهێنینەوەو، بۆ بەرچاو ڕوونیی زیاتر، بۆ بابەتێک کە لە قورئاندا هاتوە، بەڵام لە کتێبی خاوەن کتێبەکاندا تیشکی زیاتری خراوەتە سەر، مادام لەگەڵ قورئاندا تێکناگیرێ و، لەوە نیە کە دڵنیابین گۆڕدراوەو لە بیر کراوە، دروستە بیهێنین بۆ بەرچاو ڕوونیی زیاتر، بۆیە ئێمە لەم تەفسیرەدا هەر لە دەرسەکانی سەرەتاوە لە (پەیمانی کۆن) و (پەیمانی نوێ)، واتە: کتێبی خاوەن کتێبەکانەوە، جار جار هەندێک قسە دێنین، بەڵکو جاری وا هەیە ئەوەی کە گۆڕیویانەو دەستکارییان کردوە و لەگەڵ قورئان دا تێک دەگیرێ، ئەوەش دەهێنین، تاکو خەڵک ئەوەی کە لە پەیمانی کۆن و نوێدا هاتوە، لەسەر ئیسلام و لەسەر دین و، لەسەر وەحیی خوای حیساب نەکات.

٤)- ﴿ وَمَا جَعَلۡنَٰهُمۡ جَسَدٗا لَّا يَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ ﴾، ئێمە ئەو پێغەمبەرانەی کە لە پێش تۆدا لە پیاوانی مرۆڤ ڕەوانەمان کردوون، نەمان گێڕاون بە جەستەیەک کە خواردن نەخۆن، واتە: وا نەبوون کە مرۆڤ نەبووبن، یان پێویستییان بە خواردن و خۆراک

نەبووبێ، ئەمە وەک ئەوەیەکە لە سوورەتی (الفرقان) لە ئایەتی (٢٥)دا دەفەرمووێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمۡ لَيَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشُونَ فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ﴾، واتە: لە پێش تۆدا هیچ کام لە پێغەمبەرانمان نەناردوون، مەگەر خواردنیان خواردووەو، بە بازاڕاندا ڕۆیشتوون و کارو کەسابەتیان کردوە.

٥)- ﴿وَمَا كَانُواْ خَٰلِدِينَ﴾، هەر ماویش نەبوون، (خَلَدَ) واتە: مایەوە، (خَالِد) واتە: کەسێک کە هەر دەمێنێتەوە و لە بەین ناچێ و نامرێ، ئەمە وەک دواییش خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿وَمَا جَعَلۡنَا لِبَشَرٖ مِّن قَبۡلِكَ ٱلۡخُلۡدَ﴾، واتە: لە پێش تۆشدا هیچ مرۆڤێکمان نەهێشتۆتەوەو، ئەمە بێگومان بەڵگەی زیاتر هێنانەوەیە لەسەر ئەوە کە ئەوانە مرۆڤ بوون، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) مرۆڤی ئاسایی بوون، لە ڕووی جەستەییەوە.

٦)- ﴿ثُمَّ صَدَقۡنَٰهُمُ ٱلۡوَعۡدَ﴾، دوایی بەڵێنمان لەگەڵ دا ڕاست بردنە سەر، ئەم (ٱلۡوَعۡدَ)ە، (مَنْصُوبٌ بِنَزْعِ الخَافِضِ أي: صَدَقْنَاهُم فـي الوَعْد)، ئەو بەڵێنەی کە لەگەڵماندا دابوون، ڕاستمان کرد لەگەڵیان و بردمانە سەر.

٧)- ﴿فَأَنجَيۡنَٰهُمۡ وَمَن نَّشَآءُ﴾، خۆشیان و ئەوەش کە بمانەوێ دەربازمان کردن، واتە: پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) و ئەوانەی کە لەگەڵیاندا بوون، لە هاوسەرو منداڵیان و، ئەوانەی کە بە ئیمانەوە لەگەڵیاندا بوون، قوتارو ڕزگارمان کردن.

٨)- ﴿وَأَهۡلَكۡنَا ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾، زێدەڕۆییکارانمان لە کوفرو بێبڕوایی و کەللە ڕەقیی، لە بەرانبەر پێغەمبەراندا، واتە: ئەوانەی کە زێدەڕۆییکاربوون لەوانەدا، فەوتاندمانن و لەبەینمان بردن و، جۆماڵمان کردن و گەسکێکمان لێیاندا و زەوییمان لێ پاککردنەوە.

(جمال الدين القاسمي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] قسەیەکی جوان دەکات و دەڵێ:

**(وفي هذا التعريف الربَّانيّ عن حال المرسل، أكبر رادع لأولئك المنزوين عن الناس المتصيدين، به قلوب الرعاع، إذ يرون تناول الطعام في المحافل وتكثير سواد الناس في المجامع والخروج للأسواق لقضاء الحاجات، من أعظم الهوادم لصروح الإعتقاد فيهم).**

---

(١) محاسن التأويل ج٧، ص٢٣٥.

واتە: لەم پێناسەی پەروەردگاردا بۆ حاڵی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) گەورەترین بەرپەرچدەرەوە هەیە، بۆ ئەوانەی کە خۆ لە خەڵکی گۆشەگیر دەکەن و، ئەوانەی کە دڵی خەڵکی سادە و ڕەشۆکیی ڕاو دەکەن، چونکە ئەوانە پێیان وایە، ئەگەر لەگەڵ خەڵکی خواردنێ بخۆن، یاخود بچنە نێو ئاپۆرایی خەڵکەوە، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵک بروایان پێیان نەمێنێ و، لەبەرچاویان بکەون، وا بێنە بەرچاویان کە ئەوانەش مرۆڤی ئاسایین و وەک خەڵکن.

واتە: مادام پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) وابوون، کەواتە: بە ناوی دینەوە خۆ لە خەڵک پەنادان و خۆ لە خەڵک گۆشەگیرکردن و تێکەڵ نەبوون لەگەڵیان، بە حیساب بۆ ئەوەی هەیبەتیان نەیەتە خوار، شتێکی خراپە، ئنجا ئەو بە ناوی دینەوە وایگوتوە، بەڵام ئێستا چینێکی سیاسییمان پەیدا بووە لە درێژایی و پانایی و جیهانی ئیسلامییدا، ئنجا لەم هەرێمی کوردستانی خۆمان دەڵێی، لە عێراق دەڵێی، لە دەوڵەتانی ناوچەکە دەڵێی، چینێکی سیاسیی کە خۆیان لە خەڵک دوور دەگرن و، نایەنە نێو خەڵک و تێکەڵ بە خەڵک و جەماوەر نابن و، لە بورجی عاجییدا دەژین و، لەسەرێ ڕا تەماشای خەڵک دەکەن، بۆیە خەڵکی زۆر وردو گچکە دەبینن، نازانن ئەو خەڵکەش کە لە خوارێ ڕا تێیان هەڵدەڕوانێ ئەوانیش وردو گچکەیان دەبینن! بە هەر حاڵ ئینسان نابێ خۆی پێ لە خەڵک زیاد بێ و، نابێ خۆ بەزلگر بێ، ئنجا لە بەرگی دیندا بێ، لە بەرگی سیاسەتدا بێ، لە بەرگی حیزبایەتییدا بێ، یان لە هەر بەرگێکدا، ئینسان ئەگەر خۆی پێ لە خەڵک زیاد بێ و خۆ بەزلگر بێ، لە ڕاستییدا لە لای خەڵک و لە لای خوا ﷻ بچووک دەبێتەوە، هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ} **(أخرجه أحمد: ٧٢٠٥، ومسلم: ٢٥٨٨، والترمذي: ٢٠٢٩، وقال: حسن صحيح، وابن حبان: ٣٢٤٨)**، واتە: هیچ کەسێک خۆی لەبەر خوا بە کەم نەگرتوە، مەگەر خوا بەرزی دەکاتەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە، هەر کەسێک خۆی بەزل بگرێ، خوا بچووکی دەکاتەوە.

## مەسەلەی پێنجەم:

**خوا قورئانی دابەزاندوە کە مایەی بیرخستنەوە و ڕێز و پایەیە بۆ مرۆڤەکان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ كِتَٰبًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ (٣) بڕگەدا:

١- ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ كِتَٰبًا﴾، بە دڵنیایی ئێمە کتێبێکمان بۆ لای ئێوە دابەزاندوە، وشەی (لَقَدْ): (ل) بۆ سوێندە یاخود بۆ زەمینە خۆشکەرە بۆ سوێند (قَد) بۆ دڵنیاکردنەوەیە، ئنجا مەبەست پێی چییە، لێرەدا؟ مەبەست پێی ئەوەیە: دڵنیا بن، ئەم کتێبە کە موحەممەد ﷺ بەسەرتاندا دەیخوێنێتەوە، ئێمە بۆ لای ئێوەمان دابەزاندوەو، لەوە دڵنیا بن کە قسەی خۆی نیەو، لە گیرفانی خۆی دەری نەهێناوەو، شەیتان و خەڵکی دیکە فێری نەکردوە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿إِلَيْكُمْ﴾، واتە: ئەم قورئانەمان لەبەر خاتری ئێوە و بۆ لای ئێوە دابەزاندوە، بۆیە پاڵی داوەتە لای خۆیان.

٢)- ﴿فِيهِ ذِكْرُكُمْ﴾، (ذِكْر) بە مانای بیرخستنەوە دێ، بیرخستنەوە بۆ چاکیی و پاکیی، هەروەها دەشگونجێ مەبەست پێی ناوبانگ و پێگەو پلەی بەرز بێ.

٣)- ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾، ئایا نافامن، واتە: بیرخستنەوەی خۆتانی تێدایە، یاخود ناو و ناوبانگی خۆتانی تێدایە، ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾، ئایا نافامن؟ ئەم پرسیارە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، چونکە بڕوا نەهێنانیان بەم قورئانە، کە بیرخستنەوەیە بۆ خۆیان و، ناو و ناوبانگ و بەرزییە بۆ خۆیان، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە کەودەنن و نەفامن و، عەقڵییان بە شت ناشکێ و، عەقڵی خۆیان بەکارناهێنن و، لە عەقڵی خۆیان بەهرەمەند نابن، چونکە ئەگەر بە چاوی عەقڵ تەماشای قورئان بکەن، دەبینن کە بۆ ئەوان دابەزێنراوەو، بیرخستنەوەیە بۆ ئەوان و، ڕاستییەکانیان دەخاتەوە بیرو، ناو و ناوبانگ و بەرزییە بۆ خۆیان.

## مەسەلەی شەشەم و کۆتایی:

ئاوەدانییەکان خوا بە هۆی ستەمەوە فەوتاندوونی و کاتێک بەڵایان بینیوە، ڕایانکردوە، بەڵام بە زمانی حاڵ پێیان گوتراوە: بگەڕێنەوە نێو حاڵ و گوزەرانی خۆتان و، نێو خانوو بەرەکانتان و، لەو کاتەشدا دانیان بە ستەمکاریی خۆیاندا هێناوەو، هەتا دامرکاون و بێ هەست بوون، هەر خەریکی هاوارو بڕۆ بوون:

خوا دەفەرمووێ: ﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿١١﴾ فَلَمَّآ أَحَسُّواْ بَأْسَنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ﴿١٢﴾ لَا تَرْكُضُواْ وَٱرْجِعُوٓاْ إِلَىٰ مَآ أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْـَٔلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُواْ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿١٤﴾ فَمَا زَالَت تِّلْكَ دَعْوَىٰهُمْ حَتَّىٰ جَعَلْنَٰهُمْ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ ﴿١٥﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً﴾: زۆر ئاوەدانییمان لەبەین بردوون کە ستەمکار بوون (كَمْ)، واتە: چەند، ئنجا کە لێرەدا دەفەرمووێ: ﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ﴾، مەبەستی پێ پرسیارکردن نیە، بزانرێ: چەند؟ بەڵکو بۆ زۆرییە، پێشتریش گوتمان: وشەی (كَمْ) لێرەدا: (**خَبَرِيَة اسْمُ إِسْتِفْهَامٍ عَنِ العَدَدِ، وَشَاعَ اسْتِعْمَالُه عَنْ كَثْرَة الشَّيءِ أي: كَثِيراً مِنَ القُرَى**)، واتە: ناوی پرسیارکردنە لە ژمارە، بەڵام زۆر جار بەکارهێنراوە بۆ زۆریی شت، واتە: زۆر ئاوەدانییمان لە بەین بردوون، لەبەرچی؟!

﴿كَانَتْ ظَالِمَةً﴾، ئەو ئاوەدانییانە ستەمکاربوون، وشەی (**ظَالِم**) ستەمکار، لە قورئاندا بە مانای دەستدرێژیی بۆ سەر مافی ئەوانی دیکە، دێ و، بە مانای لە کەوڵی خۆ دەرچوون، دێ و، بە مانای شیرک، دێ ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾لقمان، بە مانای کوفریش دێ ﴿وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾﴾، وشەی (**ظُلم**) لە ئەسڵدا: (**الظُّلْمُ: وَضْعُ شَيْءٍ فِي غَيْرِ مَوْضِعِهِ**)، واتە: شتێک لە شوێنی شایستەی خۆیدا دانەنێی، ئنجا هەم کوفرو، هەم شیرک

و، هەم دەستدرێژیی بۆ سەر مافی ئەوانی دیکە و، هەم لە کەوڵی خۆ دەرچوون و لە خوا یاخیی بوون، ئەوانە هەموویان بێ جێن، گرنگ ئەوەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: کە زۆر ئاوەدانییمان تێک شکاندوون، لە ئەنجامی ئەوەدا کە ستەمکار بوون، بە هەموو مانا و چەمکەکانی ستەم (ظلم).

٢)- ﴿ وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴾، لە دوای ئەوان خەڵکێکی دیکەمان پێگەیاندوە.

٣)- ﴿ فَلَمَّآ أَحَسُّواْ بَأْسَنَآ ﴾، واتە: خەڵکی ئەو ئاوەدانییانەی کە تێکمان شکاندوون، کاتێک هەستیان کرد بە سزای ئێمە، (**الإِحْسَاسُ: الإِدْرَاكُ بِالحسِّ فَيَكُونُ بِرُؤْيَةِ مَا يُزْعِجُهُم، أو سَمَاعِ أَصْوَاتِ مُؤْذِنَةٍ بِهَلَاكٍ**)، کە دەفەرموێ: (أَحَسُّواْ)، ئیحساس بریتیە لە هەستکردن بە هۆی هەستەوە، دەرککردنی شتێک بە هۆی هەستپێکردنەوە، ئەویش یان بە هۆی بینینی ئەو شتانەوە، کە بێزاریان کردوون، یاخود بەهۆی بیستنی ئەو دەنگانەوە، کە ئاگادارکردنەوەی ئەوەیان تێدا بوو، کە لە بەین دەچن، وشەی (**بَأْس**) بە ئازاری زۆرو بە سزا دەگوترێ، واتە: کاتێک کە ئازارو سزا و بەڵاکەی ئێمەیان هەست پێکرد.

٤)- ﴿ إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ﴾، تۆ دەتبینی ئەوان ڕایاندەکرد لێیان، واتە: لەو ئاوەدانییەی خۆیان ڕایان دەکرد، (**الرَّكْضُ: سُرْعَةُ سَيْرِ الفَرَسِ، وَأَصْلُهُ: الضَّرْبُ بِالرِّجْلِ فَيُسَمَّى بِهِ العَدْو**)، وشەی (**رَكْض**): بە واتای بە خێرایی ڕۆیشتنی ئەسپە، بەڵام مانا ڕیشەییەکەی: پێ بە زەوی داکوتانە، لەوەشەوە ڕاکردن، وشەی (**رَكَضَ**)ی بۆ بەکارهاتوە.

٥)- ﴿ لَا تَرْكُضُواْ ﴾، واتە: ڕامەکەن، هەڵبەتە ئەمە بە خەیاڵ هێنرانە پێش چاویانە، کە خوا ﷻ دەیاندوێنێ: ڕامەکەن، واتە: بە زمانی حاڵ پێیان دەگوترێ: ڕامەکەن.

٦)- ﴿ وَارْجِعُوٓاْ إِلَىٰ مَآ أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْـَٔلُونَ ﴾، واتە: بگەڕێنەوە بۆ نێو ئەوەی کە تێیدا خۆشگوزەران کرابوون و، بگەڕێنەوە بۆ نێو خانو وبەرەکانتان، بەڵکو لێتان بپرسێ (**الإِترَافُ: إِعْطَاءُ التَّرَفِ، وَهُوَ النَّعِيمُ ورَفَهُ العَيْشِ**)، وشەی (**إِتْرَاف**) بریتیە لە پێ بەخشرانی (**تَرْف**) و، (**تَرَف**)یش بریتیە لە ناز و نیعمەت و خۆشگوزەرانیی.

﴿لَعَلَّكُمْ تُسْـَٔلُونَ﴾، واتە: بەڵكو پرسیارتان لێ بكرێ، ئنجا ئەمە زانایان بە زۆر جۆر لێكیان داوەتەوە، بەڵام دەتوانین بڵێین: سێ واتایان هەڵدەگرێ:

**یەكەم:** بگەڕێنەوە بەڵكو داوای هاوكارییتان لێ بكرێ لە سواڵكەرانەوە، لە كەسانێكەوە كە داوای هاوكاریی دەكەن، كە ئەمە بێگومان جۆرێك لە گاڵتە پێكردنە، كە زۆر جار سواڵكەرو هەژارو نەدار داوایان لێكردوون و، هیچیان پێنەداون، بڕۆن بگەڕێنەوە نێو ئاوەدانیی و خۆشگوزەرانییەكەی خۆتان، بەڵكو ئەوجار كە خەڵكی سواڵكەرو هەژارو نەدار هاتە بەر دەرگاتان، نائومێدیان نەكەن!!

**دووەم:** لێتان بپرسرێ دەربارەی ئەوەی كە چیتان بەسەر هات؟ چ بەڵایەكتان بەسەر هات؟

**سێیەم:** واتایەكی دیكەشی ئەوەیە: بۆ ئەوەی لێپرسینەوەتان لەگەڵدا بكرێ، كە ئایا چیتان كردوە و چیتان نەكردوە؟

٧)- ﴿قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾، گوتیان: هەی هاوار بۆ ئێمە! بەدڵنیایی ئێمە ستەمكار بووین، هەڵبەتە لێرەدا (يَٰوَيۡلَنَآ) وشەیەكە بۆ پەشێمانیی بەكاردێ، كە (يَٰوَيۡلَنَآ) لە كوردییدا واتە: هەی هاوار بۆ ئێمە! یاخود (وَيْل) ئەگەر بە واتای سزابێ، واتە: ئەی سزایەكەی ئێمە! ئامادە بە ئێستا كاتیەتی بێی، بەڵام وەک لە كوردییشدا دەڵێ: هەی هاوار، بە هەمان شێوەش لە قورئاندا (يَوَيْلَنَا، يَوِيلَتَا، يَوَيْلَتِي) هەر بەو واتایە هاتوە، دیارە لە عورفی گەلانی دیكەشدا، ئەم وشەیە بەكاردەهێنرێ بۆ ئەو بابایەی لێقەوماوی، گیرخواردووی، داماوی دەست لە هەموو پچكانبڕاو، كە دەڵێ: هەی هاوار!

٨)- ﴿فَمَا زَالَت تِّلۡكَ دَعۡوَىٰهُمۡ﴾، هەر ئەوە پاڕانەوەیان بوو، واتە: هەر ئەو وشەیان دووبارە دەكردەوە، بۆیەش دەفەرموێ: ﴿دَعۡوَىٰهُمۡ﴾ چونكە وشەی (دَعْوَى) بە واتای دوعاش دێ، بە واتای دەعواش دێ، واتە: ئینسان هەقێک لەسەر كەسێكی دیكە داوا بكات، ئەوانەش داوای هەقێكیان دەكرد لەسەر خۆیان، داوای سزایان دەكرد بۆ خۆیان، پەشێمان بوونەوە، لەوەی كە خۆیان بە خۆیانیان كردوە، هەر ئەوەیان دووبارە دەكردەوە.

٩)- ﴿ حَتَّىٰ جَعَلْنَٰهُمْ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ ﴾، تاكو گێڕامانن بە پەرێزێكی دامركاو، وشەی (حَصِيْد): (الحَصْدُ: جَزُّ الزَّرْعِ وَالنَّبَاتِ بِالْمِنْجَلِ وشَاعَ اسْتِعْمَالُ الحَصِيْد، للْزَّرعِ المَحْصُودِ)، وشەی (حَصْد) بریتیە لەوەی كشتوكاڵێك ڕووەكێك بە داس ببڕدرێ، كە بە كوردیی پێی دەگوترێ: درەوكردن، بەڵام وشەی (حَصِيْد) بەكارهێنراوە بۆ كشتوكاڵێكی درەوكراو، واتە: پەرێز، بوونە پەرێزێكی ڕووت، وشەی (خَٰمِدِينَ) كۆی (خَامِد)ە، كە ناوی بكەر (إسم فاعل)ە، (مِنْ خَمَدَتِ النَّارُ تَخْمُدُ إِذَا زَالَ لَهِيْبُهَا)، واتە: ئاگرەكە دامركا، كاتێك كە بڵێسەی نامێنێ.

ئنجا ﴿ خَٰمِدِينَ ﴾، واتە: ئەوانە دامركان، بە دامركاویی گێڕامانن بە كشتوكاڵێكی درەوكراوو، دامركاوی بێ هەست و خوست، هەندێك لە زانایان دەڵێن: لێرەدا خوا ﷻ دەیانچوێنێ بە كشتوكاڵێكی درەوكراوەوە، كە تەنیا پەرێزە ڕووتەكەی ماوەتەوەو، هەم بە ئاگرێكی كوژێنراوەوە، كە دامركاوەو، تەنیا خۆڵەمێشەكەی ماوەتەوە، هەندێكیش دەڵێن: خوا وشەی (حَصِيْد) و (خَامِد)ی لە یەك سیاقدا بەكارهێناون، لە یەك وێكچواندندا، واتە: ئەوانە وەك كشتوكاڵێكی درواوە بوون و، پاشانیش لەو ڕووەوە كە جووڵەیان نەمابوو دامركابوون، وشەی (خَامِد)ی بۆ بەكارهێناون، نەك بیانچوێنێ بە ئاگرێكی كوژاوەی دامركاوەوە.

كەواتە: دەگونجێ وشەی یەكەم و دووەم، هەردووكیان: ﴿ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ ﴾، دوو وەسفی سەربەخۆ بن، واتە: كردمانن بە كشتوكاڵێكی درواوەو، بە ئاگرێكی دامركاو، یاخود دەشگونجێ بەم شێوەیە بێ: (أي جَعَلْنَاهُم كَالْزَّرْعِ المَحْصُودِ وَالنَّار الخَامِدَةً الهَامِدَة التي، لا حَرَكَةَ فيهَا، فَالأولُ مَوْصُوفٌ بالثاني)، گێڕامانن بە كشتوكاڵێكی درەوكراو، كە چەند جەستەیەكی بێ جووڵە كەوتوون، كە هیچ هەست و خوستیان نەماوە، واتە: (حَصِيْد)ەكە وەسف دەكرێ بە (خَٰمِدِينَ)، هی دووەم دەبێتە وەسف بۆ یەكەمیان، بە هەرحاڵ لێرەدا خوا ﷻ وەسفی حاڵەتی ئەو گەلە فەوتاوانە دەكات، كە لە ئەنجامی ستەمكارییدا، تەختی كردوون، تەشبیهیان دەكات بە كشتوكاڵێك كە پێشتر كشتوكاڵێكی جوان و ڕێك و بەرچاو و بە دیمەن و

سەرنجڕاكێش، بووە، یاخود ئاگرێكی بڵێسەداری بەرز، بەڵام دوایی كشتوكاڵەكە دەدروێتەوە و دەبێتە پەرزێكی ڕووت، ئاگرەكەش دادەمركێ و خامۆش دەبێ و دەبێتە خۆڵەمێش، ئەوانەش بەو دەردە چوون.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە بیسـت (٢٠) ئایـەت پێـک دێ، ئایەتـەکانی: (١٦ - ٣٥)، لـەم بیسـت ئایەتـەدا ژمارەیـەک بابـەتی جـۆرا وجـۆر خراونـە ڕوو، بـەڵام تـەوەری سـەرەکییان باسـی حیکمـەت و یەکتایـی خـوای بـەرزی مەزنـە، لـە پەروەردگارێتیـی و لـە پەرسـتراوێتیی داو، لـە بەپاکگیراوێتیـی و لـە ستایشـکراویەتییدا.

هەروەهـا بـاسی ژمارەیـەک لـە دیـاردە و دیمەنـە سروشـتییەکان کـراوە، کـە هـەر کامێکیـان نیشـانەو بەڵگەیەکـە بـۆ پەروەردگارێتیـی خـوای بـێ وێنـەو تـاک و پـاک و، هەروەهـا بـاسی هەڵوێسـتی فریشـتە پـاک و چاکـەکان کـراوە، لـە بەرانبـەر خـوای بـەرز و مەزنـدا، کـە بریتیـە لـە پاکگرتـن و پەرسـتنی، بـە شـێوەیەکی بـەردەوام و نەپسـاوەو، ملکەچیـی و فەرمانبەریـی بـێ خڵتەیـان بـۆ خـوای بـێ وێنـەو تـاک.

﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿١٦﴾ لَوْ أَرَدْنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّٱتَّخَذْنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٧﴾ بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَى ٱلْبَٰطِلِ فَيَدْمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ ۚ وَلَكُمُ ٱلْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَنْ عِندَهُۥ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴿١٩﴾ يُسَبِّحُونَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ ﴿٢٠﴾ أَمِ ٱتَّخَذُوٓا۟ ءَالِهَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ ﴿٢١﴾ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ۚ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ۖ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ ۖ هَٰذَا ذِكْرُ مَن مَّعِىَ وَذِكْرُ مَن قَبْلِى ۗ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْحَقَّ ۖ فَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٤﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ ﴿٢٥﴾ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ۗ سُبْحَٰنَهُۥ ۚ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسْبِقُونَهُۥ

بِٱلْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِۦ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ﴿٢٨﴾ ۞ وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّىٓ إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ وَجَعَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا لَّعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٣١﴾ وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ ءَايَٰتِهَا مُعْرِضُونَ ﴿٣٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ ۖ أَفَإِي۟ن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً ۖ وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها ئاسمان و زەمینمان بە گاڵتە و یاریی دروست نەکردوون ﴿١٦﴾ ئەگەر گریمان ویستبامان سەرگەرمیی و خافڵانێک بۆ خۆمان دابنێین، لە لای خۆمان (لە ئاسمان) دامان دەنا ﴿١٧﴾ (نەخێر ئەوە ڕاست نیە) بەڵکو ئێمە (لە ڕێی قورئانەوە) هەق بە ناهەقدا دادەدەین، یەکسەر مێشکی دەپرژێنێ، ئیدی دەبێتە فەوتاو، سزای سەختیش بۆ ئێوە لەسەر ئەو باسکردنەتان (بۆ خوا) ﴿١٨﴾ هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەمین دایە، هی ویەو، ئەو (فریشتە پاک)انەی لەلاشنی لە ئاست بە پەرستنیدا، خۆیان بەزل ناگرن و ماندوو و کولیش نابن ﴿١٩﴾ شەو و ڕۆژ (خوا) بە پاک دەگرن و ناوەستن ﴿٢٠﴾ یان ئایا ئەوان چەند پەرستراوێکیان لە زەمیندا داناون، کە (مردووان) دەژیەننەوەو بڵاویان دەکەنەوە؟ ﴿٢١﴾ بە دڵنیایی ئەگەر (ئاسمانەکان و زەوی) جگە لە خوا پەرستراوانێکی دیکەیان

تێدابوونایە، تێک دەچوون، ئنجا پاکیی بۆ خوای خاوەنی بارەگا لەوەی (خوای پێ) وەسف دەکەن ﴿٢٢﴾ ئەو (خوا) لەوەی دەیکات لێی ناپرسرێتەوەو، ئەوان لێیان دەپرسرێتەوە ﴿٢٣﴾ یان ئایا جگە لەوی چەند پەرستراوێکیان داناون! بڵێ: بەڵگەکەتان بێنن، ئەمە کتێب و بەرنامەی ئەوانەیە کە لەگەڵمن و، کتێب و بەرنامەی ئەوانەشە کە پێش من بوون، (شتی وایان تێدا نیە)، بەڵکو زۆربەیان (لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان) هەق نازانن، بۆیە ڕوو وەرگێڕن ﴿٢٤﴾ لە پێش تۆش دا هیچ ڕەوانەکراوێکمان نەناردوە، مەگەر سروشمان بۆ کردوە، کە جگە لە من هیچ پەرستراوێک نیە، تەنیا من بپەرستن ﴿٢٥﴾ هەروەها هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان گوتیان: خوای بە بەزەیی ڕۆڵەی بۆ خۆی داناون! پاکیی بۆ وی، بەڵکو فریشتەکان بەندەی ڕێز لێگیراون ﴿٢٦﴾ لە هیچ قسەیەکدا پێشی خوا ناکەون و، فەرمانی وی جێبەجێ دەکەن ﴿٢٧﴾ هەرچی لە پێش دەستیانەوەیەو هەرچی لە پشتیانەوەیە، دەیزانێ و، مەگەر کەسێک خوا پەسەندی بکات، ئەگەر نا تکای بۆ ناکەن و، لە سام و بیمی وی بە ترس و لەرزن ﴿٢٨﴾ هەر کەسێکیش لەوان بڵێ: من لە جیاتی وی (خوا) پەرستراوم، ئەوە بە دۆزەخ سزای دەدەین، (چونکە ئەوە ستەمە) و هەر ئاواش ستەمکاران سزا دەدەین ﴿٢٩﴾ ئایا ئەوانەی بێبڕوان (بە چاوی عەقڵ) نەیاندیوە کە ئاسمانەکان و زەمین پێکەوە لکاو بوون، ئنجا لە یەکمان جیا کردنەوەو، هەموو ژیاندارێکیشمان لە ئاوێ پەیدا کردوە، ئایا (دوای دەرکەوتنی ئەو ڕاستییانەش) هەر بڕوا ناهێنن؟ ﴿٣٠﴾ چیایە چەسپاوەکانیشمان لە زەمیندا دانان، تاکو (دانیشتووەکانی) زەمین نەیان لەرزێنێ و، دابڕاوایی و کەلێن و ڕێیەکانیشمان تێدا داناون (لە زەمیندا)، بەڵکو (بەو کەلێن و ڕێیانەدا) بگەنە ئامانجەکانیان ﴿٣١﴾ ئاسمانیشمان کردوە بە بانێکی پارێزراو، کەچی ئەوانیش ڕوو وەردەچەرخێنن لە نیشانەکانی (سەرنجیان نادەن) ﴿٣٢﴾ هەروەها ئەو (خوا) ئەو کەسەیە کە شەوگارو ڕۆژگارو خۆرو مانگی هێناونە دی، هەر کامێکیان لە سووڕگەیەکدا مەلە دەکەن (دێن و دەچن و دەخولێنەوە) ﴿٣٣﴾ لە پێش تۆشدا

(ئەی موحەممەد!) هەر مامان بۆ هیچ مرۆڤێک نەڕەخساندوە، ئنجا ئایا کە تۆ مردی، ئەوان (ناحەزەکانت) دەمێننەوە؟ ﴿٣٤﴾ هەموو کەس چێژەری (تامی) مردنەو بۆ تاقیکردنەوە، خراپەو چاکە (ناخۆشیی و خۆشی)تان بەسەر دێنین و، هەر بۆ لای ئێمەش دەگێڕرێنەوە ﴿٣٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لَٰعِبِينَ): واتە: یارییکەرانە، گاڵتەپێکەرانە، (لَعِبَ: عَمِلَ عَمَلاً لَا يُجْدِي عَلَيْهِ نَفْعاً)، واتە: کارێکی کرد کە هیچ سوودێکی پێناگەیەنێ، وشەی (لَعِبْ) لە بەرانبەر شتی جیددییە، یان لە بەرانبەر هەقە، یان لە بەرانبەر کارێکی بە سوودو کەڵک، وەک (لَغْو) ئەو کاتە لە بەرانبەر کارێک دا دەبێ کە سوودی دەبێ.

(لهى لَهْوًا): یاریی پێکرد، سەرگەرم بوو، (لَهَا بِالشَّيء: لَهْواً: أي لَعِبَ بِه، أولَعَ به، لَهَا عَنْهُ: إنْشَغَلَ)، واتە: (لَهَا بِالشَّيء) یاریی پێکرد، پێیەوە سەرگەرم بوو وخافڵا، بەڵام (لها عنه) یانی: ئاگای لێی نەما و ئاگای لێبڕا، کەواتە: (لَهْوًا) بە مانای سەرگەرمیی خافڵان دێ و، بە مانای ئەو شتەش دێ کە ئینسان پێی سەرگەرم دەبێ و دەخافڵێ.

(نَقْذِفُ): (قَذَفَ بِالشَّيءِ: رَمَى بِه بِقُوَة)، (قَذْف) ئەوەیە کە شتێک بە توندیی فڕێ بدەی، کە دەفەرموێ: ﴿ بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَى ٱلْبَٰطِلِ ﴾، واتە: هەق بە باطیڵ دادەدەین بە توندیی، کە مەبەست لە هەق قورئانە، (ٱلْبَٰطِلِ)یش مەبەست پێی بیرۆکەی هاوبەش بۆ خوا دانانە، یاخود بە بێ حیکمەت لە قەڵەمدانی نووسراوەکانی خوای پەروەردگارە، کە خوا بە هۆی قورئانەوە کە هەقە، ئەو بیرۆکە پووچ و بە تاڵانە، بەرپەرچدەداتەوە.

(فَيَدْمَغُهُ): (دَمَغَهُ: أي شَجَّهُ حَتَّى بَلَغَتِ الشَجَّةُ الدِّمَاغِ، واسْمُهَا الدَامِغَة)، (دَمَغَهُ): واتە: سەری شکاند، تاکو ئەو شکاوییە گەیشتە مێشك (دِمَاغ) کە ئەو جۆرە برینە پێی دەگوترێ: (الدَّامِغَة) واتە: برینێک کە گەیشتۆتە مێشک، ئنجا چ مێشکی سەر بێ، یاخود مۆخی ئێسقان بێت.

(زَاهِقٌ): (زَهَقَتْ نَفسُهُ: خَرَجَتْ مِنَ الأَسَفِ عَلَى الشَّيء)، واتە: ڕووحی دەرچوو بە هۆی خەفەتباریی و داخ و خەفەتەوە لەسەر شتێک.

(وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ): واتە: ماندوو نابن و ناپسێن و کول نابن، (الْحَسْرُ: كَشْفُ المَلْبَسِ عَمَّا عَلَيْهِ)، (حَسْر) ئەوەیە کە پۆشاکێک لەسەر شتێک هەیە، لای بدەی (حَسَرَ عَنْ ذِرَاعِهِ)، واتە: قۆڵی هەڵکرد، لەبەر ئەوەی پۆشاکەکە لەسەر باسک لا دەچێ، (الحَاسِرُ: المُعْيَا وَكَذَلِكَ المَحْسُور)، (حَاسِرُ) واتە: بابای ماندوو، (مَحْسُور) و (حَسِير)یش واتە: کەسێک کە توانا و بڕستی لێبڕاوە و ماندوو بووە.

(لَا يَفْتُرُونَ): (الفُتُور: سُكُونٌ بَعْدَ حِدَّة، ولِيْنٌ بَعْدَ شِدَّةٍ، وَضُعْفٌ بَعْدَ قُوَّةٍ)، (فُتُور) بریتیە لە وەستان لە دوایی توندیی، شتێک کە بە توندیی بجووڵێ، دوایی بوەستێ و، نەرمییە لە دوایی سەختیی و، بێ هێزییە لە دوایی بەهێزیی، (لَا يَفْتُرُونَ): (فَتَرَ: أي سَكَنَ وانقَطَعَ) واتە: وەستا، کول بوو، بەڵام فریشتەکان لە یادی خوا و پەرستنی خوا، ماندوو نابن و کول نابن.

(يُنشِرُونَ): واتە: بڵاودەکەنەوە، (نَشَرَ الثَّوْبَ: بَسَطَهَا)، پۆشاکەکەی بڵاوکردەوە، هەڵیخست، (نَشَرَ اللهُ المَيِّتَ وَأَنْشَرَهُ)، خوا مردووەکەی زیندوو کردەوە، (نَشَرَهُ، وَأَنْشَرَهُ)، واتە: هەم بە (ثُلاثي) و هەم بە (رُباعِي) هەردوو کردارەکەی هاتوون، بە مانای زیندووکردنەوە، لە ئەصڵدا بە مانای بڵاوکردنەوە دێ، دوایی خوازراوەتەوە بۆ مانای زیندووکردنەوە، ئنجا بۆیە ناوی بکەر (اسم فاعل)ەکەی (نَاشِر وَمُنْشِر)، بە مانای بڵاوکەرەوە، دێ، ئەمە کە بۆ کەسێک کە چاپخانەی هەیە، پێی دەگوترێ: (نَاشِر)، واتە: ئەو کەسەی کە ئەو کتێبەی چاپکردوە و بڵاوی کردۆتەوە.

(مُشْفِقُونَ): (الإشْـفَاق: عِنَايَـةٌ مُخْتَلَطِـةٌ بِخَـوْفٍ، لأَنَّ الْمُشْـفِقَ يُحِـبُّ الْمُشْـفَقَ عَلَيْـهِ، وَيَخَـافُ مَـا يَلْحَقُـهُ)، (إشـفاق) بریتیـە لـە گرنگیـی پێدانیکـی تێکـەڵ لەگـەڵ تـرس، چونکـە باباى (مُشْـفِق) ئـەو کەسـەی کـە (شَـفَقَة)ی بەرانبـەری هەیـە، خـۆشی دەوێ، مەترسییشی هەیـە کـە تـووشی زیـان ببـێ.

(رَتْقًا ): (الرَّتْـقُ: الضَّـمُّ وَالإلتِحَـامُ خِلْقَـةً كَانَـتْ أَم صُنْعَـةً)، (رتْـق) بریتیـە لـە پێکـەوە لکاویـی و پێکـەوە جۆشـدراویی، بـە شـێوەی خەڵقیـی بـێ (واتـە: لـە ئەصڵـدا خـوا وای دروسـتکردبێ)، یاخـود بـە هـۆی دەسـتکاریی بەشـەرەوە وای لـێ هاتبـێ، کەواتە: (كَانَتَـا رَتْقَـاً: كَانَتَـا مُنْضَمَّتَيْن)، پێکـەوە لـکاو بـوون و پێکـەوە پەیوەسـت بـوون، ئاسـمان و زەوی.

(فَفَتَقْنَٰهُمَا ): لێکـمان جیاکردنـەوە، (الفَتْـقُ: الفَصْـلُ بَـيْنَ المتَّصَليْنَ، وَهُـوَ ضِـدُّ الرتْـق)، (فَتْـق) بریتیـە لـە جیاکردنـەوەی دوو شـتی پێکـەوە پەیوەسـت، پێچەوانـە و دژی (رَتْـق)ە، واتـە: پێکـەوە لـکان، (فَتْـق) لێـک جیاکردنـەوە.

(رَوَٰسِيَ ): کـۆی (رَاسِي) یـە، چەسـپاو، (رَسَـا الـشَّيءُ يَرْسُـو رَسَّـاً: ثَبَـتَ وَأَرْسَـاهُ غَـيْرُهُ أي: ثَبَّتَـهُ)، واتـە: ئـەو شـتە چەسـپا و دەچەسـپێ و چەسـپاو، بـەڵام ئەگـەر بویسـترێ پـاڵ بدرێتـە لای یەکێکـی دیکـە دەگوتـرێ: (أَرْسَـاهُ) ئـەو شـتەی چەسـپاند، بۆیـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا ﴿٣٢﴾ ﴾النازعـات، چیایـەکانی چەسـپاندن، خـوا ﷻ لـە زەوییـدا، چیایـەکانی چەسـپاندن.

(أَن تَمِيدَ بِهِمْ ): (المَيْـدُ: اضْطِـرَابُ الـشَّيء العَظِيْـم كاضْطِـرَابِ الأَرْضِ، مَـادتِ الأَغْصَـانُ تَمِيْـدُ مَيْـداً). (مَيْـد) بریتیـە لـە جـووڵانی شـتێکی مـەزن، وەک زەوی و، لقـەکانی درەختێکیـش کـە دەجووڵێـن (مَيْـد)ی پێدەگوتـرێ، (أَن تَمِيدَ بِهِمْ ): واتـە: بـۆ ئەوەی زەوی نەیانجووڵێنـێ، بۆیـە چیایەکانمـان تێـدا دانـاون، بـۆ ئـەوەی نەیـان لەرزێنـێ، ئـەو مرۆڤانـەی کـە لەسـەر پشـتینی، چیایـەکان لەنگەریـان پـێ گرتـوە.

(فِجَاجًا ): (فَـجّ) بـە (فِجَـاج) کۆدەکرێتـەوە، (الفَـجُّ: شِـقَّةٌ يَكْتَنِفُهَـا جَبَـلَانِ)، (فـج) کەلێنێکـە لـە نێـوان دوو چیایـان دابـێ، (ويُسْـتَعْمَلُ فِي الطَّرِيْقِ الوَاسِـعِ، وَالجَمْـعُ: فِجَاج)، وەک چـۆن بـە دابڕاوایـی و کەلێنـی دوو چیایـان دەگوتـرێ: (فَـج)، هەروەهـا بـە ڕێـی فراوانیـش دەگوتـرێ: (فَـج)، وەک لـە سـوورەتی (الحـج)دا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴿٢٧﴾﴾، واتـە: لـە هـەر ڕێیەکـی قووڵـەوە، واتـە: ڕێیەکـی دوورەوە، دێـن بـۆ سـەردانی ماڵـی خـوا.

(فَلَكٍ ): (الفَلَـكُ: مَجْـرَى الكَوَاكِـبُ وَتَسْـمِيَتُهُ بِذَلِـكَ لِكَوْنِـه كَالْفُلْـكِ، وَفَلَكَـةُ المِغْـزَلِ)، وشـەی (فَلَـك) بـە سـوورگەی ئەسـتێرەکان و خڕۆکـەکان دەگوتـرێ، ئـەو مەجالـەی کـە تێیـدا دەسـووڕێنەوە، بۆیـەش ئـەو نـاوەی لێنـراوە، چونکـە وشـەی (فُلْـك)ش بـە کەشـتیی دەریـا دەگوتـرێ، کـە مەیلـەو خـڕە، هەروەهـا سـەری تەشـیی کـە ڕیـسی پێ دەڕێـسرێ و تەختەیەکـی بازنەیـی لەسـەرێیە، پێـی دەگوتـرێ: (فَلَكَـة).

(يَسْبَحُونَ ): (السَّبْحُ: الْمَرُّ السَّرِيْعُ فِي المَاءِ أو فِي الهَـوَاءِ)، (سَـبْح) بریتیە لە ڕۆیشـتنی خێـرا لـە ئـاودا یاخـود لە هـەوادا، (سَـبَحَ سَـبْحاً سِبَاحَةً)، ئـەوە چاوگەکەیەتی، (واسْـتُعِيْرَ لِمَـرِّ النُّجُـومِ فِي الفَلَـكِ)، خوازراوەتـەوە بـۆ ڕۆیشـتنی ئەسـتێرەکان لـەو سـووڕگەیەدا کـە تێیـدان، هەروەهـا (يَسْبَحُونَ ) بـۆ ڕۆیشـتنی ئەسـپیش بـەکاردێ، وەک خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبۡحٗا ﴿٣﴾﴾النازعـات، ئـەو وڵاخـە بەرزانـەی کـە زۆر بـە خێرایـی دەڕۆن، هەروەهـا بـۆ خێرایـی کـردن لـە ڕۆیشـتن، لـە کارێکـدا، وەک خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ سَبۡحٗا طَوِيلٗا ﴿٧﴾﴾المزمـل، واتـە: بێگومـان لـە ڕۆژگاردا بـۆ تـۆ ماوەیەکـی جموجۆڵـی کارکـردنی بـاش هەیـە، هەروەهـا وشـەی (تَسْـبِيح) بـۆ خـوا بەکارهاتـوە و مەبەسـت پێـی بـە پاکگرتنـی خوایـە، کـە لـە ئەصڵـدا مانـای ڕۆیشـتنی خێرایـە لـە پەرسـتنی پـەروەردگاردا، ئـەو وشـانە لـە یەکـدی دەتاشرێـن و وەردەگیرێـن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ وەک لـە پێناسـەی ئـەم دەرسـەدا گوتمـان، لـەم بیسـت (٢٠) ئایەتـەدا، ئایەتـەکانی: (١٦ - ٣٥)، بـاسی کۆمەڵێـک بابـەت دەکات، بـەڵام کۆکـەرەوەی هەموویـان و تـەوەری سـەرەکییان، واتـە: ئـەو بازنەیـەی کـە تێیدا دەسـووڕێن، بریتیـە لـە بـاسی خـوا ﷻ و بـاسی یەکتایـی خـوا ﷻو، بـاسی حیکمـەت و زانیاریـی خـوا، یەکتایـی خـوا ﷻ، هـەم لـە بەدیهێنەرایەتیـی داو، هـەم لـە پەروەدگارێتیـی دا و، هـەم لـە تەنیـا پەرسـتراویەتیی دا و، هـەم لـە نـاو و سـیفەتەکانی دا و، دەربڕینـی پاکیـی و بـێ خەوشـیی و بـێ هەڵـە و پەڵەیـی خـوا ﷻ لـە هەمـوو گەردوونـدا، بـە تایبـەت لـە لایـەن فریشـتەکانەوە، کـە هـەردەم سـەرگەرمی بەندایەتیـی بـۆ خـوا کـردن و بەپاکگرتنـی و، فریشـتەکانیش باشـترین دروسـتکراوی خـوان، بـێ هەڵـە و پەڵـەن، کەچـی ئـەوان لـە هەمـوو دروسـتکراوەکان زیاتـر، خوا بـە پـاک دەگـرن و، بەندایەتیی بـۆ دەکـەن و بـۆی ملکەچـن و، بـێ فەرمانیـی ناکـەن.

ئنجـا خـوا ﷻ هـەر لـەو سـیاقەدا بـاسی کۆمەڵێـک لـە دیـاردەو دیمەنـەکانی گەردوونیـش دەکات، کـە بـە هـۆی سـەرنجدانیانەوە، مـرۆڤ زیاتـر دڵنیـا دەبـێ لـە یەکتایـی خـوا، لـە حیکمـەتی خـوا، لـە زانیاریـی بـێ سـنووری خـوا، لـە دەسـتەڵاتی بـێ سـنووری خـواو، لـە میهرەبانیـی و بەزەیـی و بەخشـندەیی بـێ سـنووری خـوا، لـە بەرانبـەر مرۆڤەکانـدا.

ئنجـا لەگـەڵ ئـەو بـاس و بابەتـە سـەرەکییەش دا، هەنـدێ بابـەتی دیکـەش نێواخن دەکرێـن، کـە پێغەمبـەری پێشـەویان ﷺ پـێ دەدوێـنرێ، سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَـٰعِبِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـە ئاسـمان و زەوی و، ئـەوەی دەکەوێتـە نێوانیانـەوە، بـە گاڵتـە و گەمـە و یاریـی نەمانهێناونـە دی، ﴿ لَوْ

أَرَدْنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّٱتَّخَذْنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ ﴾، ئەگەر ویستبامان شتێک بۆ خافڵان و سەرگەرمیی دابنێین، لە لای خۆمان دامان دەنا، ﴿ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴾ یانی: ئەگەر وامان کردبایە لە لای خۆمان هۆکارێکمان بۆ سەرگەرمیی و خافڵان دەڕەخساند، یاخود (إن) لێرەدا (نافية)یە، واتە: ﴿ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴾، (مَا كُنَا فَاعِلِيْن)، ئێمە شتی وا ناکەین و، ناگونجێ کاری وابکەین، کاری لەو شێوەیە شایستەی خوا ﷻ نیە، کە یاریی و گاڵتە و گەمە بکات.

ئنجا مادام گەردوون بەسەرو خوارییەوە بە گاڵتە نەخوڵقابێ، کەواتە: بە حیکمەت خوڵقاوە و بۆ هەق خوڵقاوە، دیارە ئێمە لە سەرەتای سوورەتی (یونس)دا، باس و بابەتێکی سەربەخۆمان لەوبارەوە کردوە، بە درێژیی، هەموو ئەو ئایەتانەی کە لەوبارەوە هاتوون، هەوڵمان داوە هەموویان کۆبکەینەوەو، باسێکی تێرو تەسەلمان کردوە لەوبارەوە.

ئنجا خوا ﷻ بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو بیرۆکەیە دەفەرموێ: ﴿ بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَى ٱلْبَٰطِلِ ﴾، بەڵکو ئێمە هەق بە ناهەقدا دادەین و، هەق بە ناهەقدا دەکێشین، هەق فڕێ دەدەینە سەر ناهەق، هەق کە بریتیە لە خوا بە یەکگرتن (توحيد الله) و، دەرخستنی حیکمەت و زانیاریی و لێ زانینی خواو، ئەوە کە خوا ﷻ دوورە لە شتی ناهەقەوە، کە گاڵتە و گەمەکردن و یاریی شتێکی ناهەقە، خوا لەوە دوورە، ئنجا ئەو هەقەش کە لە قورئاندا ڕوون دەکرێتەوە، بەو (باطل)ەی دادەین، واتە: بەو بیرۆکە و بیرکردنەوە پووچانەی، کە هاوبەش بۆ خوا دانەران هەیانن، کە پێیان وایە ئەم گەردوونە گاڵتەجاڕە و گەمە و یارییەو، هەق و حیکمەتێکی لە پشتەوە نیە!! خواش دەفەرموێ: ئێمە هەق بە ناهەقدا دەکێشین، ﴿ فَيَدْمَغُهُۥ ﴾، دەیشکێنێ هەتا سەر مۆخ، یاخود هەتا سەر مێشکی دەیبات، ﴿ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ ﴾، یەکسەر ئەو ناهەق و باطیڵە، لە بەین دەچێ و دەفەوتێ، بەوەی کە هەقی پێدا دەکێشرێ، ﴿ وَلَكُمُ ٱلْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ ﴾، هاواریش بۆ ئێوە، یاخود سزای سەخت بۆ ئێوە، لەسەر ئەوەی وەسفی دەکەن، واتە: خوای تاک و پاک و بەرز و بێ وێنەی

پێ وەسف دەكەن، كە بریتیە لەوەی كە ئەم گەردوونەی بە گاڵتە و بە هەوەنتە هێنابێتە دی!!

﴿ وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، هەر كەس كە لە ئاسمانەكان و لە زەویدا هەیە، هەمووی هی خوایە، هەموویان بەندەی خوان و، هەموویان موڵكی خوان، ﴿ وَمَنۡ عِندَهُۥ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَلَا يَسۡتَحۡسِرُونَ ﴾، ئەوانەش كە لەلاینی، مەبەست پێی فریشتە زۆر لە خوا نیزیكەكانن، ئەوانیش لە بەرانبەر پەرستنیدا، خۆ بە گەورە ناگرن، ﴿ وَلَا يَسۡتَحۡسِرُونَ ﴾، كولیش نابن و ناوەستن و، ماندوو نابن، ﴿ يُسَبِّحُونَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ ﴾، بە شەوگارو ڕۆژگار، سەرگەرمی بە پاكگرتنی خوان، ﴿ لَا يَفۡتُرُونَ ﴾، واتە: ناوەستن، كۆڵ نادەن و بەردەوامن.

﴿ أَمِ ٱتَّخَذُوٓاْ ءَالِهَةً مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ ﴾، یان ئایا هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، هەندێ پەرستراویان لە زەمین دا پەیدا كردوون، ﴿ هُمۡ يُنشِرُونَ ﴾، كە ئەو پەرستراوانە دەتوانن مردووان زیندوو بكەنەوە؟ یاخود: دەتوانن دروستكراوەكان بە زەوییدا بڵاوبكەنەوە؟ ئەو واتایەشی هەیە، هەرچەندە نەمبینیوە لە تەفسیرەكاندا ئەو واتایە باس كرابێ، بەڵام ئەو واتایەش دەگەیەنێ، واتە: ئایا ئەو پەرستراوانەی كە ئەوان لە زەمیندا پەیدایان كردوون، توانای ئەوەیان هەیە كە دروستكراوان دروست بكەن، خەڵكی دروست بكەن، یاخود دروستكراوەكانی دیكە لە ئاژەڵ و زیندەوەران و مرۆڤ، دروست بكەن و بڵاویان بكەنەوە بە زەویدا؟

﴿ لَوۡ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ﴾، ئەگەر جگە لە خوا ﷻ لە ئاسمانەكان و زەویدا پەرستراوانی دیكە هەبوونایە، تێكدەچوون، چونكە هەر كامێكیان ڕازی نەدەبوو دەستەڵاتی لەوی دیكەیان كەمتر بێ، یاخود هەر كامێكیان ڕازی نەدەبوو، ئەوی دیكە بپەرسترێ و، خۆی بە خاوەن بزانێ، بۆیە لە بەینی خۆیاندا تێك دەچوون و، سەرەنجام ئەم گەردوونە بەسەرو خواریەوە، تێكدەچوو، كەواتە: كە تێك نەچووە و چاك بەڕێوە دەچێ، مانای وایە یەك

پەرستراوو، یەک پەروەردگارو، یەک خاوەن، ئیدارەی دەکات و بەڕێوەی دەبات، ﴿ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾، پاکیی بۆ خوای خاوەنی بارەگا، لەوەی کە وەسفی دەکەن، یاخود لەوەی کە خوای پەروەردگاری پێ وەسف دەکەن، یاخود لەوەی کە پەرستراوە ساختەکانی خۆیانی پێ وەسف دەکەن، ئەو بت و صەنەمە بێ ژیان و گیانانە، کە ئەوانی پێ وەسف دەکەن، ئەو وەسفانەی کە تەنیا بۆ خوا شایستەن، پاڵیان دەدەنە لای ئەو پەرستراوانە، وەک شیفا هێنان و، سەرخستن و، ژێرخستن و، دەوڵەمەند کردن و فەقیر کردن و، بیستنی پاڕانەوە و هتد...

﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ ﴾، ئەو (خوا ﷻ) لێی ناپرسرێ لەوەی دەیکات، ﴿ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴾ بەس ئەوان لێیان دەپرسرێ، بۆیەش خوا لێی ناپرسرێ، چونکە خوا ﷻ خاوەن و بەدیهێنەرو پەروەردگارەو، خاوەنی ئەوپەڕی دەستەڵاتە، ئنجا کەسێک دەتوانێ لێپرسینەوە لەگەڵ کەسێکدا بکات، کە وەک ئەو بێ، یاخود دەستەڵاتی لەو زیاتر بێ، بەڵام ئەوان هەموو دروستکراو و بەندەی خوان، کەس تواناو دەستەڵاتی ئەوەی نیە کە لە خوا بپرسێتەوە و سزای بدات و سەر کۆنەی بکات، بەڵکو ئەوان لێیان دەپرسرێتەوە، ئەوە واتایەکی.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە: خوا ﷻ لە کارەکانی دا لێی ناپرسرێ ئەوەت چۆن کردو، بۆچی کرد؟ چونکە خوا خاوەنی ئەوپەڕی حیکمەتەو، هیچ کەسێک ناتوانێ ڕەخنە لە خوا بگرێ و، نیشانەی پرسیار بخاتە سەر کارێک لە کارەکانی خوا، یاخود ڕەفتارێک، یان دروستکراوێک لە دروستکراوەکانی خوا، بەڵام ئەوە بەندەکانن کە لێیان دەپرسرێتەوە، لەبەر ئەوەی کارەکانیان کەم و زۆر، هەڵەو پەڵە و کەم و کوڕیان ئاوێتە دەبێ.

﴿ أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ﴾، یان ئایا جگە لە خوا پەرستراوانێکی دیکەیان گرتوون و پەیدا کردوون؟ ﴿ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ ﴾، بڵێ: بەڵگەکەتان بهێنن، ﴿ هَٰذَا ذِكْرُ مَن مَّعِىَ ﴾، ئەوە بەرنامەی ئەوانەیە کە لەگەڵمن، ئەوە بەرنامەکەمانە کە

قورئانە، ﴿وَذِكۡرُ مَن قَبۡلِي﴾، ئەوەش کتێب و بەرنامەی ئەوانەیە کە پێش من بوون، بەرنامەی پێغەمبەرو گەلەکانی پێش من، تەماشایان بکەن، پێشێ خوا ﷻ بە بەڵگەی عەقڵیی بەرپەرچی بیرۆکەی شیرک و هاوبەش بۆ خوا دانانی دایەوە، ئنجا بە بەڵگەی نەقڵیی، یانی: نە بەڵگەی عەقڵیی لەسەر پەرستراوێتیی جگە لە خوا هەیە، نە بەڵگەی نەقڵییش هەیە، ﴿بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٱلۡحَقَّ﴾، بەڵکو زۆربەیان هەق نازانن، ﴿فَهُم مُّعۡرِضُونَ﴾، بۆیە ڕوو وەرچەرخێنەرن و ڕوو وەرگێڕەرن، بۆچی نافەرموێ: هەموویان؟ چونکە هەیانبووە، هەقی زانیوە، بەڵام بەرژەوەندیی لەگەڵ هەقدا نەبووە، یاخود لەبەر ئەوە بووە کە هەندێک لەو موشریکانەی کە ئەو ئایەتەیان بۆ هاتوونەتە خوار، دوایی بڕوایان هێناوەو، ڕوو وەرگێڕ نەبوون لە هەق، بەڵکو ئەوەی لەسەری بوون بە هەقیان زانیوەو، قورئانیان بە ناهەق زانیوە، ئەگەرنا مەبەستیان بووە، بگەنە هەق، بۆیە خوا دەفەرموێ: زۆربەیان هەق نازانن و، پێی ئاشنا نین، بۆیە ڕەفزی دەکەن و ڕوو وەرگێڕن، ئەگەرنا ئەگەر پێی ئاشنا بن و دەرکی بکەن کە هەقە، ڕووی تێدەکەن، بۆیە خوا نەیفەرمووە: هەموویان، بەڵکو فەرموویەتی: زۆربەیان.

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ﴾، لە پێش تۆدا هیچ ڕەوانەکراوێکمان نەناردوە، مەگەر سروشمان بۆ کردوە، کە جگە لە من هیچ پەرستراوێك نیە، تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن.

ئەوە بە هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمَ) ڕاگەیەنراوە و بۆ هەموویان سروشکراوە و، هەموویان ئەو پەیامەیان پێدا نێردراوە، کە یەکتایی خوا لە پەرستراوێتیی دا ڕابگەیەنن و، مرۆڤەکان بانگ بکەن بۆ تەنیا خوا پەرستیی، واتە: پەرستنی خوا بە تەنیا.

ئنجا دێتە سەر بەرپەرچدانەوەی هەندێ لە قسەی هاوبەش بۆ خوا دانەران دەربارەی فریشتەکان، کە لە زۆر شوێنی قورئاندا، ئەو بیرۆکە ئەفسانەییانە بەرپەرچدراونەوە:

﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴾، گوتیان: خوای خاوەن بەزەیی ڕۆڵەی بۆ خۆی پەیدا کردوون و ڕۆڵەی بۆ خۆی داناون، کە مەبەستیشیان پێی فریشتەکان بوون، وەک لە تەفسیری سوورەتی (الأنعام)دا باسمان کرد، کە خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَخَرَقُوا لَهُ بَنِينَ وَبَنَاتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾، کوڕان و کچانیان بە بێ زانیاریی بۆ خوا هەڵبەستن، کە مەبەست لە کوڕان شەیتانەکان بوون، گوتوویانە: شەیتانەکان کوڕانی خوان و، فریشتەکانیش کچانی خوان، لێرەدا وشەی (ولد)ی بەکار هێناوە، کە وشەی (ولد) هەم کوڕو هەم کچیش دەگرێتەوە، دەفەرمووێ: ﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴾، گوتیان: خوای بە بەزەیی ڕۆڵەی هەیە و پەیدای کردوە، ﴿ سُبْحَانَهُ ﴾ پاکیی بۆ وی، ﴿ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴾، بەڵکو فریشتەکان بەندەی ڕێز لێگیراوی خوان، ﴿ لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ ﴾، لە هیچ قسەیەکدا پێشی ناکەون، واتە: هیچ قسەیەک ناکەن، پێش ئەوەی مۆڵەتی خوا بزانن، پێش ئەوەی خوا پێیان ڕابگەیەنێ کە ئەو قسەیە بکەن، یاخود نا؟ ﴿ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ ﴾، بە فەرمانی خواش کار دەکەن، واتە: نە لە گوفتارو نە لە کرداردا، پێش خوا ناکەون و، هیچ قسەیەک ناکەن و، هیچ کردەوەیەک ناکەن، تاکو مۆڵەتی خوایان پێ نەبێ، ﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ﴾، ئەوەی لە پێش دەستیانەو، ئەوەی لە دوایانە هەمووی دەزانێ، یاخود ئەوەی دادێ و ئەوەی ڕابردوە، هەمووی دەزانێ، یان مەبەستی ئەوەیە کە هەموو شتێکیان لە بارەوە دەزانێ، ﴿ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ ﴾، تکاش ناکەن مەگەر بۆ کەسێک کە خوا پەسندی بکات، کە تکای بۆ بکرێ، ﴿ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ ﴾، لە ترسی خواش ئەوانە لە حاڵەتی پەرۆش (إشفاق) دان.

(إشفاق)یش ئەوەیە گرنگیی بە شتێک بدەی لە ڕووی خۆشویستنەوەو، لە ڕووی لێ ترسانیشەوە، یاخود پەرۆشیشت بێ و لێشی بترسێی، ئنجا ئەگەر بڵێ: (أشفق منه)، واتە: لێی ترسا لەگەڵ گرنگیی پێدانەوە، یان لەگەڵ خۆشویستنەوە، بەڵام (أشفق عليه)، واتە: ترسی لێی هەبوو کە تووشی زیانێ ببێ، پەرۆشی

بوو لەگەڵ خەم لێخواردنیشەوە، ﴿وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّيٓ إِلَٰهٞ مِّن دُونِهِۦ﴾، هەر کەسێک لەوان بڵێ: من پەرستراوم جگە لەو، واتە: جگە لە خوا، ﴿فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ﴾، ئا ئەوە سزای دەدەینەوە بە دۆزەخ، ﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، هەر بەو شێوەیەش ستەمکاران سزا دەدەین.

ئنجا دێتە سەر باسی خستنە ڕووی چەند دیاردە و دیمەنێکی گەردوون، کە هەر کامێکیان نیشانەیە لەسەر پەروەردگارێتی خواو، لەسەر تەنیا پەرستراوێتیی خوا ﷻ:

﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾، ئایا ئەوانەی بێبڕوان نەیانبینیوە، کە بە تەئکید لێرەدا مەبەستی ئەوەیە بە چاوی عەقڵ و دڵ نەیانبینیوە و نەیانزانیوە، واتە: ئایا بێبڕوایەکان بە چاوی عەقڵ و دڵ نەیانبینیوە و بەدییان نەکردوە؟ ﴿أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا﴾، کە ئاسمانەکان و زەوی پێکەوە نووساوو پێکەوەلکاو و پێکەوە جۆشدراو بوون، ﴿فَفَتَقْنَٰهُمَا﴾، لە یەکمان جیاکردنەوە.

بێگومان ئەو ڕووداوە بە چاوی سەر هیچ کەس نەیبینیوە، ئەو کاتە هیچ کەس نەبووە، تاکو ببینێ جگە لە خوا ﷻ، بۆیە مەبەست پێی بینینی عیلمییە، بینینی بە چاوی عەقڵ و دڵ، واتە: ئایا نەیانزانیوە کە ئەم گەردوونە هەمووی پێکەوە لکاو بووە، دوایی لێکمان جیا کردۆتەوە، کە ئەوە لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر باسی دەکەین، ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾، ئایا نەیانبینیوە کە ئێمە هەموو زیندەوەرو ژیاندارێکمان لە ئاو بەدیهێناوە! ﴿أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾، ئایا هەر بڕوا ناهێنن؟ واتە: دوای ئەوەی خوا ﷻ لەم ئایەتی ژمارە سی (٣٠) سوورەتی (الأنبياء)دا، لەم تاکە ئایەتەدا، هەم باسی سەرەتای گەردوون و چۆنیەتی دروستبوونی گەردوونی کردوە، هەم باسی سەرەتای دروستبوونی ژیانی کردوە، کە هەموو ژیاندارێک لە ئاوەوە سەرچاوەی گرتوە، لە یەک ئایەتدا خوا ﷻ باسی سەرەتای گەردوون و سەرەتای ژیانی بۆ کردوون، ئایا هەر بڕوا ناهێنن

بەم قورئانە؟ کە ئەم قورئانە ناگونجێ لە لای جگە لە خواوە بێ، هەر دەبێ فەرمایشتی خوا بێ، جگە لە خوا ﷻ کێ ئاگاداری سەرەتای گەردوونە؟ کێ ئاگاداری سەرەتا و دروستبوونی ژیان و پەیدابوونی ژیانە؟ کە ژیان سەرچاوەکەی ئاوەو، ئەم گەردوونەش کاتی خۆی پێکەوە لکاو و پێکەوە جۆشدراو بووە، دوایی بەم شێوەیەی ئێستا کە بۆ چەند گەلە کەهکەشانێک و، کەهکەشانەکان بۆ ملیۆنان ئەستێرەو، ملیۆنان خڕۆکە دابەشبوون، کە لە نێویاندا خۆرەکەی ئێمەیە ئەو نۆ (٩) خڕۆکەیەی کە لەگەڵیدان، پێیان دەگوترێ: کۆمەڵەی خۆر، کە خۆری ئێمە بۆ خۆی ئەستێرەیەکە لە ئەستێرەکانی کەهکەشانی کاکێشان، وەک لە چەند شوێنێک لەم تەفسیرەی خۆماندا - هەم لە تەفسیری سووڕەتی **(الأنعام)**داو، لە تەفسیری سووڕەتی **(الأعرافدا)** و بە تایبەت لە تەفسیری سووڕەتی **(یونس)**دا - بە درێژیی لەو بارەوە قسەمان کردوە[١].

﴿ وَجَعَلْنَا فِي ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ ﴾، هەروەها لە زەمیندا چیایە چەسپاوەکانمان گێڕاون و دامانناون، بۆ ئەوەی نەیانجووڵێنێ و نەیانهەژێنێ، **(مَادَ يَمِيدُ مَيْداً)** واتە: جوڵا و هەژاو لەرزیەوە، بۆ ئەوەی نەیان لەرزێنێ و ئارام بێ، ئێمە ئەو چیایانەمان تێدا داناون، ﴿ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا ﴾، دیسان لەو زەمینەدا چەندان دۆڵ و شیو کە دەبن بە ڕێگا، تێماندا داناون، چەندان دابڕاوایی و کەلێن لە نێوان چیایەکاندا، ﴿ لَّعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴾، بەڵکو بە ڕێگایەکانی خۆیان بزانن، بەڵکو لەو ڕێیانەو لەو دۆڵ و شیو و دابڕاوانەوە، بگەنە ئامانجەکانی خۆیان، ئەوە واتایەکی، یاخود: بەڵکو بە هۆی سەرنجدانی دابڕاوایی نێوان چیایەکان، کە مرۆڤەکان دەیانکەنە ڕێگا و بان، پەی بەوە ببەن کە ئەمە پەروەردگارێک و خاوەن و مشوورخۆرێکی خاوەن بەزەیی و میهرەبان، بەو شێوەیە زەوی بۆ هەڵخستوون، کە بە ئاسانیی پێیدا بڕۆن و

---

(١) دواتریش لەکاتی تەفسیرکردنی : (فصلت) و (الرحمن)دا، لەوبارەوە کورتە باسی دیکەمان کردوون.

بچن، هەموو جارێک پێویست نەکات کە بچنەوە لووتکەی چیایەکان، بەڵکو بە نێو دابڕاوییەکاندا بڕۆن، کە ئەو جۆگەو ڕووبارانەی هاتوون، ئەو چیایانەیان لێکدابڕیون، ئاوا خوای پەروەردگار دروستکردنی ڕێگا و بانی بۆ مرۆڤەکان ئاسان کردوە، کە سەرەنجام بە هۆی ئەو حاڵەت و دیاردەو دیمەنەوە، کە لەسەر زەوی هەیە، بگەنە ئەوەی خوایەک ﷻ ئەم سەر زەوییەی بەو شێوەیە هەڵخستوەو، پەی بە بوونی ئەو پەروەردگارە ببەن.

﴿ وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ﴾، ئاسمانیشمان کردوە بە بانێکی پارێزراو، (سَقْف) واتە: بان یاخود سەربان کە پارێزراوە، ﴿ وَهُمْ عَنْ ءَايَٰتِهَا مُعْرِضُونَ ﴾، کەچی ئەوان پشت لە نیشانەکانی ئاسمان دەکەن، لەو نیشانانەی کە تێیدان، لەو دیاردە و دیمەنانەی کە تێیدان، پشت هەڵکردو و ڕوو وەرچەرخێنن بەرانبەریان.

ئنجا دێتە سەر باسی شەو و ڕۆژ و مانگ و خۆر: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴾، خوا ئەو کەسەیە کە شەوگارو ڕۆژگاری هێناونە دی، ﴿ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ﴾، هەروەها خۆرو مانگی هێناونە دی، ﴿ كُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴾، هەر کامێکیان لە خولگەیەکی سەربەخۆی خۆیدا، مەلە دەکەن و دەخولێنەوە و دێن و دەچن.

کە لێرەدا خوا ﷻ باسی مانگ و خۆری کردوە، بەڵام دوایی بە ڕاناوی کۆ (يَسْبَحُونَ ) هێناویەتی، هەرچەند هەندێک لە شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: جاری وا هەیە دووانیش لە زمانی عەرەبییدا ڕاناوی کۆیان بۆ بەکاردێ، بەڵام لێرەدا خوا وێڕای خۆرو مانگ، باسی شەو و ڕۆژیش دەکات، بێگومان شەو و ڕۆژیش بەسەر زەوییدا دابەش دەبن، کەواتە: زەمینیش لە نێو (ضمن)دا باسکراوە، بۆیە ڕاناوی کۆ بەکارهاتوە، واتە: هەر کام لە زەوی و خۆرو مانگ، لە سووڕگەیەکی سەربەخۆی خۆیدا دەخولێتەوە، ﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ

﴿ٱلْخُلْدَ﴾، لە پێش تۆش دا هیچ مرۆڤێکمان هەرماو نەکردوە، واتە: هەر مانمان بۆ هیچ مرۆڤێک لە پێش تۆدا نەڕەخساندوە و کەسمان نەهێشتۆتەوە، ﴿أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ﴾ ئنجا ئایا ئەگەر تۆ مردی، ئەوان دەمێننەوە و هەرماو دەبن؟

لەبەر ئەوەی هاوبەش بۆ خوا دانەران، هەمیشە خەونیان بەوەوە دەبینی و دەیانگوت: ئەگەر موحەممەد ﷺ مرد، شتەکەی کۆتایی پێ دێ، دیارە بەرنامەیەک پەیوەندیی بە مرۆڤێکەوە هەبێ، دەگونجێ دوای خۆی لە نێو بچێ، بەڵام بەرنامەیەک خوایەک ﷻ کە خاوەنی گەردوونە، ناردبێتی، بە کۆچی دوایی و مردنی ئەو پەیامبەرە، لە بەین ناچێ، ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ﴾، با ئەوان دڵی خۆیان بەوەوە خۆش نەکەن کە تۆ دەمری، هەموو کەسێک چێژەری مردن و مەرگە، هەموو کەس دەبێ تامی بکات، ﴿وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً﴾، بە ناخۆشیی و خۆشیی، یاخود بە خراپە و چاکە، تاقیتان دەکەینەوە بە تاقیکردنەوە، ﴿وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾، تەنیا بۆ لای ئێمەش دەگێڕدرێنەوە، نەک بۆ لای کەسی دیکە، کەواتە: با دڵی خۆیان بەوە خۆش نەکەن، چاوەڕێی مردنی تۆ بن، چونکە ئەوانیش و تۆش، هەمووتان دەبێ مردن بچێژن، بەڵام بە خۆشیی و ناخۆشیی، بە چاکە و خراپە، بە خێرو شەڕ تاقیتان دەکەینەوەو، دواییش هەر بۆ لای ئێمە دەگێڕدرێنەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**خوا گەردوونی بەسەرو خوارەوە، بە گاڵتە دروست نەکردوە، ئەگەر کارێکی وای کردبایە، لە لای خۆی دەیکرد (لە ئاسمان)، ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەش پووچە و هەڵگرانی شایستەی سزان و، هەر کەس کە لە ئاسمانەکان و زەمیندایە، تەنانەت فریشتە لە خوا نیزیکەکانیش کە زۆر لە خوا نیزیکن، سەرجەمیان سەرگەرمی پەرستنی خوا و بەپاکگرتنینی بۆ پسانەوە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿١٦﴾ لَوْ أَرَدْنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّٱتَّخَذْنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٧﴾ بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَى ٱلْبَٰطِلِ فَيَدْمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ ۚ وَلَكُمُ ٱلْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَنْ عِندَهُۥ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴿١٩﴾ يُسَبِّحُونَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴾، ئاسمان و زەوی و ئەوەی کە دەکەوێتە نێوانیان، بە گاڵتە و بۆ گەمە و یاریی دروستمان نەکردوون.

وەک پێشتر باسمان کرد: ئێمە لە سووڕەتی (یونس)دا، باسێکی تایبەتمان لەو بارەوە کردوە، هەموو ئەو ئایەتانەی کە لە قورئاندا هاتوون، کە زیاتر لە پازدە (١٥) شوێنن، باس لەوە دەکەن کە خوا ﷻ ئەم گەردوونەی بە هەق

دروستکردوەو، بە حیکمەت دروستکردوەو، بە گاڵتە دروستی نەکردوەو، بە پووچیی دروستی نەکردوەو، بە هەوەنتە دروستی نەکردوە، بە تەفصیلی لەوێدا باسمان کردوە.

٢)- ﴿ لَوْ أَرَدْنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّٱتَّخَذْنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ ﴾، ئەگەر گریمان ویستبامان شتێک خۆمانی پێ بخافڵێنین، وەک گەمە و یاریی و سەرگەرمیی پەیدای بکەین، لە لای خۆمان پەیدامان دەکرد، واتە: لە ئاسمانەکان، لەسەرێ، نەک لەسەر زەوی، واتە: نەک لەو سەر زەوییەی کە تایبەتە بە ئێوەوە، بەڵکو لەو ئاسمانەی کە فریشتە زۆر لە خوا نیزیکەکانی لێن و، خوا لە سەرووی ئاسمانەکانەوەیە، لەوێ ئەو کارەمان دەکرد، بەڵام وامان نەکردوە.

٣)- ﴿إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴾، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- ئەگەر ئەنجامدەری ئەوە بووواین، لەسەرێ ئەنجامامان دەدا، ﴿إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴾ (إرْتبَاطُ شَرْطٍ بِجَزَائِهِ) واتە: ئەگەر ویستبامان کارێکی وابکەین و ئەنجامدەری کارێکی وابین، لەلای خۆمان دەمانکرد.

ب- یاخود (إِن) بۆ (نافية)یە، واتە: (مَا كُنَّا فَاعِلِيْن) ئەنجامدەری کاری وا نین، هەڵبەتە پێشتر باسمان کرد، (لَعِب) واتە: کردەوەیەک، یاخود قسەیەک کە سوودێکی نەبێ، کە پێچەوانەکەی بریتیە لە (جِدّ)، واتە: شتێک کە ئامانجێکی لە پشتەوە بێ، بەڵام (لَهْو) بریتیە لە خافڵان و سەرگەرمیی، ئنجا جاری وا هەیە (لَعِب) بە شتێک کە (لَهْو)یە ئەنجام دەدرێ، بەڵام وشەی (لَهْو) بە خافڵان و سەرگەرمیی دەگوترێ، بەڵام (لَعِب) واتە: گاڵتە و یاریی.

٤)- ﴿ بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَى ٱلْبَٰطِلِ فَيَدْمَغُهُۥ ﴾، بەڵکو ئێمە هەق بە ناهەق و پووچدا دادەدەین، ئنجا دەیشکێنێ، تاکو دەگاتە سەر مۆخی.

٥)- ﴿فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ ﴾، یەکسەر ئەو ناهەقە دەمرێ و لە بەین دەچێ، بەهۆی ئەوەوە کە هەقی پێکەوتوە.

(بَـلْ: لـلإضْرَابِ عَـنْ اتِّخَـاذِ اللَّهْـوِ، وَعَـنْ أَنْ يَكُـونَ الخَلْـقِ لَعِبَـاً، أَي بَـلْ نَحْـنُ نَعْمَـدُ إِلى بَاطِلِكُـم فَنَقْـذِفُ عَلَيْـهِ بِالْحَـقِّ)، (بـل) بـەڵام بـۆ گواسـتنەوەیە لـە گرتنـی خافـڵان و دروسـتکردنی دروسـتکراوان بەگاڵتـەو یاریـی، ئـەم گەردوونـە، نـەک هـەر بەناهـەق و گاڵتـە دروسـت نەکـراوە، بەڵکـو ئێمـە هـەق بـە ئـەو بیرکردنـەوە پووچـەی ئێـوەدا دادەدەیـن و، دەماغـی دەشـکێنێ و، دەگاتـە سـەرمۆخی و، لە بەین دەچێ، مەبەسـت لـە هـەق ئـەو ڕوونکردنەوانـەن، کـە لـەم قورئانـەدا هاتـوون، بۆیـە خـوا ﷻ لێـرەدا بـاسی ئـەوە دەکات کـە ئاسـمانەکان و زەوی بـە یاریـی و گاڵتـە نەخوڵقانـدوون، واتـە: ئێـوە بـۆ ئامانـج و حیکمەتێـک خوڵقێنـدراون، دەبـێ بزانـن ئـەو حیکمـەت و ئامانجە چییـەو، لـە ژیـانی خۆتانـدا بیهێننـە دی، چونکـە ئـەم گەردوونـە بـێ خـاوەن نیـە و، بێ حیکمـەت و بـە هەوەنتـەو گاڵتـە نەخوڵقـاوە، کەواتـە: ئێـوەش وریـای ژیـانی خۆتـان بـن، وەک شـاعیرێک دەڵێ:

لَقَدْ خُلِقْتَ لأمرٍ عَظِيْمٍ لَو فَطِنْتَ لَهُ ... فَارْبَأْ بِنَفْسِكَ أَنْ تَرْعَى مَعَ الهَمْلِ

واتـە: تـۆ بـۆ کارێکـی مـەزن خوڵقـاوی، ئەگـەر فیکـرت پێـی بشـکێ، لـە خـۆتی مەوەشـێنەوە لەگـەڵ ئاژەڵانـدا بلەوەڕێـی، واتـە: کـە ژیانێکـی ئاژەڵانـە ببەیـە سـەر.

(الدَّمْغُ: كَسْرُ الجِسْـمِ الصَّلْـبِ الأَجْـوَف)، (دَمْغ) بریتیـە لـە شـکاندنی جەسـتەیەکی ڕەق کـە بـۆش بـێ، واتـە: کـە شـکاندت، بگاتـە سـەر مۆخەکـەی.

٦)- ﴿وَلَكُمُ ٱلْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ﴾، سزای سەخت، یاخود هاواریش بۆ ئێوە، لەوەی وەسفی دەکەن، واتە:

أ- کە خوای پەروەردگاری پێ وەسف دەکەن، گوایە: گەردوونی بە بێ حیکمەت خوڵقاندوە.

ب- یان موحەممەدی ﷺ پێ وەسف دەکەن، کە لە خۆیەوە ئەو قسەیەی هێناوە، یاخود شیعرە، یاخود جادوویە.

ج- یاخود قورئانی پێ وەسف دەکەن کە جادووویە، یان قسەی هەڵبەستراوە.

د- یاخود سزای سەخت و هاوار بۆ ئێوە، لەوەی کە پەرستراوەکانی خۆتانی پێ وەسف دەکەن، لەوە کە هاوبەشی خوا بن.

٧)- ﴿وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾، هەر کەس کە لە ئاسمانەکان و زەویدایە، هی خوایە، هەموویان موڵکی خوان و هەموویان بەندەی خوان، واتە: هی غەیری خوا نین، بە مرۆڤ و جندو فریشتە و بە هەموو ئەو دروستکراوانەی دیکەوە، کە دەیانزانین و نایانزانین.

٨)- ﴿وَمَنۡ عِندَهُۥ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَلَا يَسۡتَحۡسِرُونَ﴾، ئەوانەش کە لەلاینی، لە بەرامبەر پەرستنی دا خۆیان بەزل ناگرن و، ماندوو و شەکەتیش نابن [ئەو فریشتە تایبەتانەی کە لە لاینی]، وەک لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَ﴾، فریشتە زۆر لە خوا نیزیکخراوەکان، تەنانەت ئەوانیش.

٩)- ﴿يُسَبِّحُونَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفۡتُرُونَ﴾، بە شەو و بە ڕۆژ، واتە: لە هەموو کاتەکاندا، خوا بە پاک دەگرن، ناوەستن، شل نابن و کۆڵنادەن.

﴿لَا يَفۡتُرُونَ﴾، یانی: بۆ تاوێکیش ناوەستن و، بەردەوام سەرگەرمی بەپاکگرتنی خوان، کەواتە: ئەم گەردوونە و هەرچی تێیدایە، هەموو موڵکی خوایە، هەمووی بەندەی خوایە، تەنانەت فریشتە زۆر لە خوا نزیکەکانیش، هەمیشە خەریکی بە پاکگرتن و ستایشکردن و بەندایەتیی بۆ خوان و، ناشوەستن، کەواتە: ئێوەش ئەی مرۆڤەکان! وەک فریشتەکان بکەن، لەسەر ڕێبازی ئەوان بڕۆن، بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و خوا بە پاک بگرن، لە جیاتی ئەوەی هاوبەشی بۆ پەیدا بکەن و، جگە لە خوا بپەرستن.

### مەسەلەی دووەم:

**ئەو پەرستراوانەی کە هاوبەش بۆ خوا پەیداکەرەکان گرتوویانن و پەیدایان کردوون، مردووان زیندوو ناکەنەوە، کەواتە: هیچ نین، ئنجا ئەگەر جگە لە خوا پەرستراوانی دیکە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەبوونایە، ئاسمانەکان و زەمین تێک دەچوون، خواش پاک و دوورە لە وەسفە خراپەکانی بێبڕوایان و، لەوەی کە دەیکا لێی ناپرسرێتەوە، بەڵکو ئەوان لێیان دەپرسرێتەوە:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿أَمِ ٱتَّخَذُوٓاْ ءَالِهَةً مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ هُمۡ يُنشِرُونَ ﴿٢١﴾ لَوۡ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَاۚ فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿أَمِ ٱتَّخَذُوٓاْ ءَالِهَةً مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ﴾ یان ئایا لە زەوییدا پەرستراوانی دیکەیان گرتوون؟! وشەی ( أَمِ ) لێرەدا، هەم هەمزەی پرسیارکردن (**همزة الإستفهام**)ە، هەم (بل)ە، کە بۆ (**إضراب**) و گواستنەوە لە مەبەستێکەوە بۆ مەبەستێکی دیکەیە، واتە: (**بَلِ أَتَّخَذُوا آلِهَةً مِنَ الْأَرْضِ**) یانی: یان ئایا لە زەوییدا پەرستراوانی دیکەیان پەیدا کردوون؟ کە دەفەرمویٚ: ﴿مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ﴾، واتە: لە جیهانی سەر زەوی، یاخود ﴿مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ﴾، واتە: لە بەشەکانی زەوی و پێکهاتەکانی زەوی، واتە: چۆن دەبێ پەرستراو لە زەویدا پەیدا بکرێ؟! یاخود لە بەشەکان و پێکهاتەکان و کەرەستەکانی زەویدا، پەرستراو پەیدا بکرێ؟! شتێکی زۆر بێ مانایە.

٢)- ﴿هُمۡ يُنشِرُونَ﴾، ئەو پەرستراوانە زیندوو دەکەنەوە، ئایا توانایان هەیە، مردووان زیندوو بکەنەوە؟ ئەوە واتایەکی، کە هەموو تەفسیرەکان ئەوەندەی من سەرنجم داون، هەر ئەو واتایەیان هێناوە.

واتەیەکی دیکەشی کە پێم وایە ئەویش دەگرێتەوە، هەرچەندە تەفسیرەکانیش نەیانهێناوە: ﴿هُمۡ يُنشِرُونَ﴾، کە ئەو پەرستراوانە دەتوانن دروستکراوان بڵاو بکەنەوە بە زەویدا، ئایا توانای هێنانە دی و پرژ و بڵاوکردنەوەیانیان بە زەوییدا هەیە؟ واتە: توانایان هەیە کە دروستکراوان دروستبکەن و، بە زەویدا بڵاویان بکەنەوە؟ ئەمە پرسیار کردنێکی نکووڵیلێکەرانەی سەرزەنشتکەرانەیە، واتە: نابێ پەرستراوان لە زەوییدا پەیدا بکرێن، یاخود لە کەرەستەی زەوی پەیدا بکرێن و، یاخود نابێ شتانێک بکرێنە پەرستراو، کە توانای زیندوو کردنەوەی مردووان، یاخود توانای دروستکردن و بڵاوکردنەوەی دروستکراوانیان، نیە، کەواتە: دەبێ زاتێک بپەرسترێ پەیوەندیی بە زەمین و بە کەرەستەکانی زەمین و ماددەوە نەبێ و، لە سەرووی ئەو دروستکراوانەوە بێ و، پاشان توانای وەدیهێنان و بڵاوکردنەوە، یاخود زیندوو کردنەوەی هەبێ، ئەویش تەنیا خوایە ﷻ.

٣)- ﴿لَوۡ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا﴾، ئەگەر جگە لە خوا تێیان دا پەرستراوانی دیکە ببوونایە، تێکدەچوون، (تێیاندا) واتە: لە ئاسمان و زەویدا، ڕاناوەکە (فِيهِمَآ) بۆ ئەو دووانە دەچێتەوە، کە پێشتر باسکراون، ئەگەر لە ئاسمانەکان و زەویدا، پەرستراوانی دیکەی جگە لە خوا ببوونایە، تێک دەچوون، (**الفَسَادُ: اخْتِلَالُ النظَامِ وَانْتفَاءُ النَّفْعِ مِنَ الأَشْيَاء**)، (**فَسَاد**) بریتیە لە تێکچوونی سیستەم و، شتێک کە سوودی لێوەردەگیرێ، سوودەکەی نەمێنی و بێ کەڵک بێ و بشێوێ، ئنجا هۆکاری تێکچوونیان چییە؟ بۆچی ئەگەر جگە لە خوا پەرستراوانی دیکە هەبوونایە لە ئاسمان و زەویدا، تێک دەچوون؟ (**لأن التعَدُّدَ يَسْتَلْزِمَ اخْتِلَاف الإِرَادَاتِ وَحُدُوثَ الخِلَافِ**)، چونکە بێگومان ئەگەر چەند پەرستراوێک ببوونایە، ئەوانە هەر کامێکیان شتێکی دەویست، پێچەوانەی ئەوەی دیکەو، لێرەدا ڕاجیایی و کێشمە کێش و تێکگیران پەیدا دەبوو، وەک لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: «یەکێک لە یەکێکی پرسی بەڵگەت چییە لەسەر بوونی خوا ﷻ؟ گوتی: بەڵگەم ئاشی مام ئاودەڵە {مام ئاودەڵێک هەبووە ئاشێکی هەبووە} گوتیان: چۆن؟ گوتی: مام ئاودەڵ تاکو بۆ خۆی مابوو، ئاشەکەی دەگێڕا، ئاشەکە زۆر چاک ئیشی دەکرد،

کاتێک بۆ خۆی نەما و وەفاتی کردو، ئاشەکەی کەوتە دەست کورەکانی، ئاشەکە تێک چوو»، یەکێکیان بەرداشەکەی وا لێکردووەو، یەکێکی دیکەیان بە شێوەیەکی دیکەی لێکردوە، یەکیان ئاوی زیاد کردووەو، یەکی دیکەیان کەمی کردوە، یەکیان لە نۆرەی خۆیدا، بە جۆرێک ئیشی لەسەر کردووەو، ئەوی دیکەیان بە جۆرێکی دیکە، هیچ گومانی تێدا نیە هەر کارێک کە چەند سەرپەرشتیارێکی هەبن، تێکدەچێ، کەواتە: ئەم بوون و گەردوونە کە وەک سەعات دەگەڕێ و، هیچ کەم و کوڕیی و نارێکیی تێدا نیە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە یەک سەرپەرشتیارو خاوەنی هەیە، ئەویش خوای تاکی پاکە ﷻ، بۆیە دەبێ بەس ئەو بەندایەتیی بۆ بکرێ و، هەر ئەو بپەرسترێ، بۆیەش دەفەرموێ:

٤)- ﴿ فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾، ئنجا پاکیی بۆ خوای خاوەن بارەگا، لەوەی خوای پێ وەسف دەکەن، کە گوایە هاوەڵی هەن و پەرستراوانی دیکەی لەگەڵدا دەپەرستن، یاخود: ﴿ فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾، واتە: پاکیی بۆ خوای خاوەن بارەگا، لەوەی کە ئەو پەرستراوانەی دیکەی پێ وەسف دەکەن، کە ئەوەش نەمبینیوە لە تەفسیرەکانی دیکەدا، هاتبێ، بەڵام ئەو واتایەش دەگرێتەوە، واتە: (**عَمَّا يَصِفُوْنَ بِهِ شُرَكَائَهُمْ وَآلِهَتَهُمْ المُزَيَّفة**)، ئەو پەرستراوە ساختانەی خۆیانی پێ وەسف دەکەن، کە پێیان وایە ئەوانیش توانایان هەیەو، بەشدارن لە بەڕێوەبردنی گەردووندا، بە تایبەت لە ژیانی مرۆڤدا، دەتوانن خەڵک نەخۆش بکەن و، ساغ بکەن و، سەربخەن و، ژێربخەن، فەقیرو دەوڵەمەند بکەن، دەتوانن وەڵامی داوای خەڵک بدەنەوە و لە گوناهیان ببوورن، ئەوە ئەو شتانەن کە پەرستراوانی خۆیانیان پێ وەسف دەکەن، پاکیی بۆ خوا ﷻ! چونکە ئەو سیفەتانە تەنیا هی خوان ﷻ.

٥)- ﴿ لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ ﴾، خوا ﷻ لێی ناپرسرێتەوە لەوەی دەیکات.

وشەی (سُؤَال) لێرەدا: (**سُؤَال هَنَا بِمَعْنَى الْمحَاسَبَة وَطَلَب بَيَانِ سَبَبِ الفِعْل، وإِبْدَاءِ المَعْذِرَةِ عَنْ فِعَلِ بَعْضَ مَا يُفْعَل**)، وشەی پرسیار لێرەدا مەبەست پێی لێپرسینەوەیەو، داواکردنی ڕوونکردنەوەی ئەوە، کە ئەو کارە بۆچی کرا وەو، ڕوونکردنەوەی عوزرێکە

لەسەر کارێک کە نەدەبوو بکرێ، واتە: خوا ﷻ لێی ناپرسێتەوە، بەو واتایەی کە هیچ شتێک ناکات، شایستەی ئەوە بێ کەسێک لێی بپرسێ، چونکە کارەکانی خوا ﷻ هەموویان لەو پەڕی حیکمەتدان.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە: هیچ کەس نیە لە گەردووندا هاوتای خوا بێ، یاخود لەسەرووی خوا بێ، کە لێی بپرسێتەوە: ئەوەت بۆچی کردو ئەوەت بۆچی نەکرد؟!

٦)- ﴿ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴾، ئەوان لێیان دەپرسرێتەوە، واتە: مرۆڤەکان لێیان دەپرسرێتەوە کە ئەوەتان بۆچی کردو ئەوەتان بۆچی نەکرد؟ چونکە خوا ﷻ خاوەنیانە لە لایەکەوەو، لە لایەکی دیکەشەوە ئەوان کارو هەڵسوکەوتەکانیان کە دەیکەن، کەم و زۆر نەفامیی و نەزانیی لە کارەکانیاندا دەبێ و، هەڵە و پەڵەیان تێ دەکەوێ، ئنجا کاری نەفامانە و نەزانانە و، کاری هەڵە و پەڵەش، دەبێ لێپرسینەوە و سزای لە بەرانبەردا هەبێ، ئەم مەبەستە کە لێرەدا هاتوە، توێژەرەوانی قورئان زۆری لەسەر ڕۆیشتوون و، گوتوویانە: ئەوە بەڵگەیە لەسەر تاکێتیی و تەنیا پەرستراوێتیی خوا!

بەڵام من پێم وایە بەڵگە لەسەر تەنیا پەرستراوێتیی خوا ﷻ، پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە، ئێمە ئەو ئایەتە زیاد لەوەی کە دەیگەیەنێ، شتی دیکەی بخەینە نێو، وەک هەندێ لە کتێبەکانی (**علم الكلام**) وایان کردوە، ئنجا ئەو مەبەستە تەنیا لێرەدا نەهاتوە، بۆ نموونە: لە سوورەتی (**المؤمنون**) لە ئایەتی ژمارە (٩١)دا، لەوێشدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ ﴾، واتە: خوا هیچ ڕۆڵەی نەگرتوون و، هیچ پەرستراوێکی دیکەی لەگەڵدا نیە، ئەگەرنا هەر پەرستراوێک ئەوەی کە بەدیهێناوە، بۆ خۆی سەرپەرشتیی دەکردو، جیای دەکردەوەو، هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا زاڵ دەبوون، واتە: دەبوو بە کێشمە کێشمیان، پاکیی بۆ خوا لەوەی کە ئەوان باسی دەکەن، لە بارەی خواوە ﷻ، یاخود لە بارەی هاوبەشەکانی خواوە، کە لە

وەهمی ئەواندا هەن، ئەگەرنا لە دنیای واقیعدا، خوا خوایە و جگە لە خوا هەمووی کاو بایە، واتە: جگە لە خوا، هەمووی دروستکراوی خوایەو، هیچی خاوەنی بوونێکی خودیی تەنانەت خۆیشی نیە، چ جای ئەوەی پشک و بەشیان هەبێ لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و پەرستراوێتیی دا.

### مەسەلەی سێیەم:

**ئەوانەی جگە لە خوا پەرستراوانێکی دیکە دەگرن، هیچ بەڵگەیەکی نەقڵییان نیە و زۆربەیان بە هەق نائاشنان و نایزانن، چونکە خوا پێش موحەممەد ﷺ هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە، مەگەر پێیڕاگەیاندوە، کە جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە و تەنیا ئەو بپەرستن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةًۖ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡۖ هَٰذَا ذِكۡرُ مَن مَّعِيَ وَذِكۡرُ مَن قَبۡلِيۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٱلۡحَقَّۖ فَهُم مُّعۡرِضُونَ ﴿٢٤﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ﴾، بەڵکو ئایا جگە لەو (خوا) پەرستراوانی دیکەیان گرتوون؟ ئەم تەعبیرەش: (**أَكَّدَ ذَلِكَ الإِضْرَابَ الإِنْتِقَالِي بِمِثْلِهِ اسْتِعظَامَاً لِفَظَاعَتِهِ وَبُنِيَ عَلَيْهِ اسْتِدلَالٌ آخر كَمَا بُنِيَ عَلَى نَظَيْرِهِ السَّابِقْ**)، لێرەدا ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ﴾، واتە: (**بَلِ اتَّخَذُوا مِنْ دُوْنِهِ آلِهَهِ**)، {بەڵکو ئایا جگە لەو پەرستراوانی دیکەیان پەیداکردوون و داناون} ئەمە جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی پێشێ، تاکو دەریخات کە ئەگەر جگە لە خوا پەرستراوانی دیکە بپەرستن، شتێکی زۆر ناماقووڵ و بێ جێیە و، تاکو بەڵگە هێنانەوەی دیکەشی لەسەر بنیات بنرێ، لەسەر ئەوەی کە پەرستنی جگە لە خوا، هیچ بەڵگەیەکی نەقڵیی لەسەر نیە، وەک چۆن لە ئایەتی پێشوودا دەرکەوت کە هیچ بەڵگەیەکی عەقڵیی لەسەر نیە، بۆیە دەفەرموێ:

٢)- ﴿ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ ﴾، بڵێ: بەڵگەکەتان بێنن، (**بُرهَان**) واتە: بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا، کە هیچ کەس نەتوانێ نکووڵیی لە بەرانبەردا بکات، کە لێرەدا بە تەئکید مەبەست پێی بەڵگەی نەقڵییە، چونکە دوایی دەفەرموێ:

٣)- ﴿هَٰذَا ذِكْرُ مَن مَّعِيَ﴾، ئا ئەمە {مەبەست قورئانە} ئەو یادخەرەوەیە بۆ ئەوانەی کە لەگەڵمدان، واتە: هی خۆم و هاوەڵانم، کە خوا ﷻ بۆی ناردووین.

٤)- ﴿وَذِكْرُ مَن قَبْلِي﴾، هەروەها بیرخەرەوەی ئەوانەی پێشووش واتە: کتێبەکانی پێشووش، کە لەبەر دەستتانن، فەرموون دەتوانن دەستیان بگەیەنێ، کە پەیمانی کۆن و نوێن، واتە: تەماشایان بکەن بزانن داخۆ باسی جگە لە خوایان تێدا هەیە، کە تەنیا خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن و پەرستراوە، واتە: هەموو قورئان و کتێبە پێشووەکانیش (پەیمانی کۆن و نوێ و جگە لەوانیش) تەماشا بکەن، بزانن ئایا جگە لە خوا، باسی کەسێکی دیکەیان تێدایە، کە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن و مشوورخۆری گەردوون بێ؟ بە دڵنیایی نەخێر.

٥)- ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ الْحَقَّ﴾، بەڵکو زۆربەیان هەق نازانن، بۆچی دەفەرموێ زۆربەیان؟ چونکە هەندێکیان هەقیان زانیوە، بەڵام نکووڵییان لێکردووە، بۆ ئەوەی بەزم و بازاڕێک کە بە هۆی ناهەق و بتپەرستییەوە ساز بووە، لێیان تێکنەچێ، هەروەک خاوەن کتێبەکانیش دانیان بە پێغەمبەرایەتیی موحەممەددا ﷺ نەدەهێنا، بۆ ئەوەی ئەو بەزم و بازاڕو، ئەو خواردن و خۆراک و ماڵ و سامان و پیتاکەی، کە بەهۆی ئەو دووکان و بازاڕەی ئایینە تێکدراوەکەیانەوە، چنگیان دەکەوت، لێیان تێک نەچێ، ئەگەر بڕوایان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هێنابایە، ئەو بەزم و بازاڕەی کە دایاننناوە، دەبوو بیپێچنەوە و ببنە مسوڵمانێکی سادە و شوێنکەوتوویەکی سادەی پێغەمبەر ﷺ، ئەو کاتە ئەگەر بە هۆی شوێنکەوتنی ئەو ئیمان و ئیسلامەوە، پێگەیەکیان بۆ دروست بووبایە، بۆیان دروست دەبوو، بەڵام ئەوان ئامادە نەبوون دەست بەرداری ئەو بەرژەوەندییە ناشەرعییانەیان بن، کە بە هۆی ئایینە تێکدراوەکەی خۆیانەوە بۆیان دروست بووە، هەروەک هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی مەککە و غەیری مەککەش، ئامادە نەبوون ئەو بەزم و بازاڕو ئەو خۆ فەڕزکردنە، ئەو گەندەڵییە، ئەو ستەمە زۆرە، ئەو قۆرخکارییەی کە لەسەر بناغەی بتپەرستیی بۆیان دروست بووە، ئامادە نەبوون ئەو بەزم و بازاڕە لە خۆیان تێکبدەن و، بێنەوە ئاستی خەڵکی هەژارو ڕەش و ڕووت، هەموویان بەندەی

خوابن و پێکەوە براو تەبا بن، بۆیەش خوا ﷻ دەفەرموێ: زۆربەیان هەق نازانن، لەبەر دوو هۆکار:

أ- کەمێکیان زانیویانە، بەڵام لەبەر بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانیان دەستبەرداری ئەو ناهەقیەی خۆیان نەبوون و، شوێن هەق نەکەوتوون.

ب- هەندێکیان دوایی بڕوایان هێناوە، واتە: هەندێکیان ئەوە نەبووە کە هەق نەزانن لە ئەنجامی پشت تێکردن و ئیهمال کردنی دا، بەڵکو بە دوای هەقدا گەڕاون و عەوداڵی هەق بوون، بەڵام جارێ ڕێیان تێنەکەوتوە و بەرچاویان ڕۆشن نەبۆتەوە، چونکە ئەوانەش کە هەق نازانن دوو جۆرن:

أ- جۆرێکیان کە پشت لە هەق دەکەن و هەر ئەسڵەن گرنگیی پێنادەن.

ب- جۆرێکیشیان دەیانەوێ بگەن بە هەق و عەوداڵنیی و بەدوایدا دەگەڕێن، بەڵام جارێ بەرچاویان ڕۆشن نەبۆتەوە و چاوپێچیان لەسەر چاو لا نەچووە.

٦)- ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ﴾، لە پێش تۆدا هیچ ڕەوانەکراوێکمان نەناردوە، مەگەر سروشمان بۆ لای کردوە، کە جگە لەمن هیچ پەرستراوێك نیە دەجا بەس من بپەرستن، وشەی (مِن رَّسُولٍ)، (من : **مَزِيْدَةٌ لتَوْكِيْد النَّفِي**)، یانی: (من) زیاد کراوە بۆ جەختکردنەوەی لابردن، لابردنی ئەوە کە هیچ پێغەمبەرێکمان لە پێش موحەممەددا ﷺ ڕەوانە نەکردوە، مەگەر خوا ﷻ سروشی بۆ کردوە، کە تەنیا ئەو بپەرستن.

وشەی (إِلَّا نُوحِيٓ) خوێنراویشەتەوە: (**إلا يُوحى إليْهِ**)، مەگەر سروشی بۆ کراوە، هەردووکیان یەک واتایان هەیە.

لێرەدا پرسیارێک دروست دەبێ: خوای پەروەردگار لە سوورەتی (**الحديد**) لە ئایەتی ژمارە (٢٥)دا دەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِ﴾، واتە: بە دڵنیایی پێغەمبەرانمان بە

بەڵگە ڕوون و ئاشکرایەکانەوە ناردوون، کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوون، تاکو خەڵکی بە دادگەریی هەڵسن.

لێرەش دەفەرموێ: هەموو پێغەمبەرانمان ناردوون کە تەنیا خوا بپەرسترێ، کەواتە: بە ڕواڵەت جۆرێک لە تێکگیران هەیە؟

وەڵامەکەی ئەوەیە وەک لە زۆر جێگای دیکەدا باسمکردووە، پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) بۆ چەسپاندنی دوو ئامانجی گەورە و سەرەکیی هاتوون:

١- تەنیا خواپەرستیی و، خوا بەیەکگرتن (**توحيد الله**) ئەوە وەک پەیوەندیی نێوان خۆیان و خوا ﷻ.

٢- چەسپاندنی دادگەریی، ئەوەش وەک پەیوەندیی نێوان خۆیان.

کەواتە: ئەو دووانە تێک ناگیرێن و، لە ڕاستییدا یەکتا پەرستیی (**توحيد**) بناغەی دادگەرییە، تەنیا کاتێک خەڵک ڕزگاری دەبێ لە زوڵم و ستەم و، یەکدی چەوساندنەوە و چینایەتیی و قڕیی و پڕیی، کە تەنیا خوا بپەرسترێ و، شیرک زەمینە خۆش دەکات بۆ ستەم و قۆرخکاریی و خۆ بەسەر یەکدا فەرزکردن و، خۆ لە یەکدی کردنە پەرستراو و پەروەردگار، مەگەر فیرعەون بە خەڵکی میسری نەگوت: ﴿أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾النازعات، من پەرستراوی هەرە بەرزتانم؟ هەروەها پێی نەگوتن: ﴿مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي ﴿٣٨﴾﴾القصص، جگە لە خۆم پەرستراوێکی دیکەم بۆ ئێوە پێ شک نایەت؟ بەڵێ شیرک زەمین خۆش دەکات بۆ فیرعەون و، قارِوون و نەمروودو، تاغووت و خۆ بەزلگرەکان کە بڵێن: ئێمە پەرستراوی ئێوەین، ئێمە جیاین لە ئێوە و، دەبێ ئێمە تەقدیس بکەن و بە مەزن و گەورە بگرن، دەبێ ئێمە خاوەنی هەموو شتێک بین و ئێوە خاوەنی هیچ نەبن، کۆیلە و ژێردەست و بەردەستی ئێمە بن! شیرک زەمینە بۆ ئەوە خۆش دەکات، بەڵام خوا پەرستن و تەنیا خوا بەیەکگرتن، ڕێگا لە فیرعەون و تاغووتەکان دەبەستێ و دەڵێ: نەخێر هەموومان بەندەی خواین، هەموو پێکەوە

براین، کەس لە کەس گەورەتر نیە، خوا ئەو نیعمەتانەی کە دروستکردوون، بۆ هەمووانن، بۆیە خوا بەیەکگرتن و چەسپاندنی دادگەریی، دوو ڕووی دراوێکن، دوو ڕووی هەقیقەتێکن: تەنیا خوا بپەرسترێ و، دادگەریی پیادە بکرێ، بێگومان کاتێک دادگەریی پیادە دەکرێ، کە تەنیا خوا پەرستراو بێ و، هیچ کەس خۆی لە بەندەکانی خوا، نەکاتە پەروەردگارو پەرستراو.

## مەسەلەی چوارەم:

**بەرپەچدانەوەی قسەی هاوبەش بۆ خوا پەیداکەرەکان کە گوایە فریشتەکان رۆڵەی خوان و، روونکردنەوەی چەند راستییەکی گرنگ لە بارەیانەوەو، جەختکردنەوە لەسەر ئەوە کە فریشتەکان بەندەی چاک و پاک و ملکەچی بەردەوامی خوان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ۗ سُبْحَانَهُ ۚ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ ﴿٢٨﴾ وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾

لەم چوار ئایەتەدا خوا باسی فریشتەکان دەکات، چونکە هەم هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی عەرەب و، هەم هی نەتەوەکانی جگە لە عەرەبیش، واتە: سەرجەم هاوبەش بۆ خوا دانەران، کەم و زۆر فریشتەکانیان کردوونە، بیانووی شیرک و هاوبەش بۆ خوا دانان، لە میزۆپۆتامیا و هیندو چین و گریک و یۆنانییەکان و میسرییەکان و، لە هەموو وڵاتانی دنیا کە تۆ مێژووی شیرک دەخوێنینەوە، مەگەر چۆن دەنا هاوبەش بۆ خوا دانان، رەگ و ریشەکەی دەچێتەوە سەر فریشتەکان و، لە کەوڵی خۆ بردنە دەری فریشتەکان و، بە پاککرتن و بە مەزن گرتنیان لەسەر حیسابی خوا ﷻ.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە برگەدا:

١)- ﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴾، گوتیان: خوای خاوەن بەزەیی رۆڵەی پەیدا کردوە و دایناوە، وشەی (وَلَدْ): (إِسْمُ جَمْعٍ مُفْرَدُهُ مِثْلُه)، وشەی (وَلَدْ) ناوی کۆیە و تاکەکەشی هەروەک خۆیەتی، کەواتە: (وَلَدْ) واتە: یەک رۆڵە، یاخود رۆڵەکان، هەمووی دەگرێتەوە،

نێرو مێش دەگرێتەوەو، (إبن) واتە: کوڕو، (بِنْت) واتە: کچ، بەڵام (وَلَدْ) هەردووکیان دەگرێتەوە، واتە: ڕۆڵە، مەبەستیان پێی فریشتەکان بووە، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿سُبْحَٰنَهُۥ﴾.

٢)- ﴿سُبْحَٰنَهُۥ﴾، پاکیی بۆوی، (يَعْنَي تَنْزِيَهاً لَهُ عَنْ ذَلِك)، واتە: پاکیی بۆ خوا، (سَبِّحُوهُ تَسْبِيْحَاً) واتە: بە پاکی بگرە بە پاکگرتن، یاخود (يُسَبِّحُ تَسْبِيْحَاً) واتە: بە پاک دەگیرێ بەپاکگرتن، لەوەی ئێوە دەیڵێن.

٣)- ﴿بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ﴾، بەڵکو ئەوان بەندەی ڕێزلێگراوی خوان، واتە: ئەو فریشتانەی ئێوە بە ڕۆڵەی خوایان دەزانن، ڕۆڵەی خوا نین، بەڵام خوا ڕێزی لێگرتوون.

٤)- ﴿لَا يَسْبِقُونَهُۥ بِٱلْقَوْلِ﴾، لە قسەدا پێشی ناکەون، دەڵێ: (السَّبْقُ: التَّقَدّم فِي سائرٍ عَلَى سَائِرِ الآخَرِ) وشەی (سَبْق) ئەوەیە کە کەسێک بڕوات و پێش کەسێکی دیکە بکەوێت لە ڕۆیشتندا، مانا ئەسڵییەکەی لە ڕووی زمانەوانییەوە ئەوەیە، بەڵام دوایی بۆ هەر جۆرە پێشکەوتنێک بەکارهاتوە، واتە: لە پێش فەرمانی خواوە قسە ناکەن، هیچ قسەیەک ناکەن تاکو فەرمانی خوایان پێ نەبێ.

٥)- ﴿وَهُم بِأَمْرِهِۦ يَعْمَلُونَ﴾، تەنیا بە فەرمانی خواش کار دەکەن و دەجووڵێن، کەواتە: (لَا يَعْمَلُوْنَ إلاّ بَعْدَ أمْرِه، وَلَا يَقُولُونَ إلاّ بَعْدَ قَوْلِهِ)، تەنیا دوای فەرمانی خوا کار دەکەن و، تەنیا دوای فەرمایشتی خوا، قسە دەکەن، واتە: نە لە قسەو، نە لە کردوەشدا بە مۆڵەتی خوا، نە ورتەیان لە دەمەوە دێ، نە قسە دەکەن و، نە هیچ جووڵەیەک دەکەن.

٦)- ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾، هەرچی لە پێش دەستیانەوەیە و هەرچی لە دوایانەوەیە دەیزانێ، لە پێش دەستیانەوەیە واتە: داهاتوو کە ئێستا نەهاتوە، بەڵکو بەرەو ڕووی دەچن، لە پشتیانەوەیە واتە: ڕابردوو، هەندێکیش گوتوویانە: لە پێش دەستیانەوە، ئەوەیە کە تێپەڕیوەو، ئەوەی لە پشتیانەوە، ئەوەیە کە جارێ نەهاتوە، هەندێکیش لە زانایان - وەک لە شوێنی دیکەشدا باسمان کردوە - دەڵێن: ﴿يَعْلَمُ

﴿مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾، واتە: هەرچی کە پەیوەندیی بەوانەوە هەیە، لە ڕووی:١- شوێن (مکان) و، ٢- کات (زمان) و، ٣- حاڵەوە، واتە: هەموو شتێکیان لە بارەوە دەزانێ، چ لە ڕووی شوێنەوە لە پێشیانەوە بێ، یان لە پاشیانەوە بێ، یان لە لای ڕاست یان چەپیانەوە بێ، چ لە ڕووی کاتەوە ڕابردوو داهاتوو ئێستا، چ بە نسبەت کردەوەکان و حاڵی خۆیانەوە، خوا ﷻ هەمووی دەزانێ.

٧)- ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ﴾، تکاش ناکەن، مەگەر بۆ کەسێک خوا پەسندی کردبێ، واتە: (**لِمَنْ ارْتَضَاه الله**)، مەگەر کەسێک خوا پەسندی کردبێ و لێی ڕازی بێ، یاخود بۆ کەسێک کە (**إرْتَضَى لَهُ شَفَاعَة**) خوا تکاکردنی بۆ پەسند کرد بێ، واتە: وشەی ﴿ارْتَضَىٰ﴾، کە بەرکار (**مفعول به**)ەکەی قرتێنراوە، دەگونجێ شەفاعەت بێ (**إرْتَضَى لَهُ شَفَاعَة**)، یاخود خوا (**مشفوع له**) ئەو کەسەی لەلا پەسند بێ، کە تکای بۆ بکرێ (**إرْتَضَاهُ الله**).

٨)- ﴿وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ﴾، هەروەها لە ترسی وی بە ترس و بیمن، واتە: لە سام و هەیبەتی خوا بە ترس و لەرزن.

٩)- ﴿وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِ﴾، هەر کەسێک لەوان بڵێ: من پەرستراوم جگە لەو، گریمان ئەگەر یەکێک لەوان بڵێ: من پەرستراوم جگە لە خوا.

١٠)- ﴿فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ﴾، بێگومان کەسی وا بە دۆزەخ سزای دەدەین، ئەو (مَنْ)ی پێشێ مەرج (**شرط**) بوو: ﴿وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِ﴾، (**هَذَا شَرطٌ عَلَى سَبِيْل الفَرض**)، واتە: ئەمە مەرجە، بەڵام حاڵەتێکی گریمانەیی و، وەڵامەکەی: ﴿فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ﴾، ئەوە وەڵامی مەرجەکەیە: بێگومان بە دۆزەخ سزای دەدەین، (**يَعْنِي نَجْزِيه بِجَهَنَّم**) ئەمە لە زمانی عەرەبییدا (**مَنْصُوبٌ بِنَزْع الخَافِض**) بەهۆی دارنینی ژێردار کەرەکەیەوە سەردار (**منصوب**) بووە.

١١)- ﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ﴾، چونکە ئیددیعا کردنی پەرستراوێتیی و لەگەڵ خوادا پەرستران ستەمە: ستەمکارانیش هەر بەو شێوەیە سزا دەدرێن، کە ئەمە لەبەر

ڕا هاویشتن، (**تعریض**)ە، بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، واتە: خوا تەنانەت لە فریشتە بەڕێزەکانی لای خۆیشی، کە هەمیشە سەرگەرمی بەندایەتیی بۆ خوان و، بە بێ فەرمانی ئەو نەکردەوە دەکەن و نە قسەش دەکەن، ئەوانیش هەر یەکێکیان لافی ئەوە لێبدات کە پەرستراوە، جگە لە خوا، یاخود لە جیاتی خوا، بە دۆزەخ سزای دەدەین، کەواتە: ئێوەش ئەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان! بترسن، ئەگەر خوا لە فریشتەکان قبووڵ نەکات، لە ئێوە هەر قبووڵ ناکات.

## مەسەلەی پێنجەم:

**خستنە ڕووی ژمارەیەکی بەر چاو لە دیاردە و دیمەنە سەرنج ڕاکێشەکانی گەردوون، کە هەر کامێکیان نیشانەیەکی گەورەی پەروەردگارێتیی خوای تاک و پاکە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ وَجَعَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا لَّعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٣١﴾ وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ ءَايَٰتِهَا مُعْرِضُونَ ﴿٣٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ﴾، ئایا ئەوانەی بێبڕوا نەیاندیوە، نەیانزانیوە خوێنراویشەتەوە: (أَلَمْ يَرَ الَّذِيْنَ كَفَرُوْا)، کە لە هەردوو حاڵدا هەمزەکەی سەرەتا بۆ پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، بە هۆی ئەوەوە کە ورد نەبوونە وەو ڕانەماون و سەرنجیان نەداوە، واتە: سەرنجی عەقڵ، وەک پێشتریش گوتمان، چونکە ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ﴾، ئایا ئەوانەی بێبڕوان نەیاندیوە؟ واتە: بە چاوی عەقڵ نەیاندیوە، چونکە بێگومان ئەوەی دوایی باسی دەکات، کەس بەچاوی سەر نەیبینیوە، کە بریتیە لە چی؟

٢)- ﴿ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا ﴾، {ئایا نەیانبینیوە} کە ئاسمانەکان و زەوی پێکەوە لکاو و جۆشدراو بوون، لە یەکمان جیا کردنەوە و پچڕاندن، بێگومان هیچ کەس ئەوەی بە چاوی سەر نەبینیوە، تاکو خوا نکووڵیی بکات لەوەی بۆچی نەیانبینیوە؟ بەڵام هەموو کەس بە چاوی عەقڵ و دڵ دەگونجێ ببینێ و، بزانێ دوای ئەوەی کە

خوا هەواڵت پێدەداو، دوای ئەوەی کە زانیاریی گەردووناسییش دەریخستوە، کە ئەم بوونەوەرە کاتی خۆی هەمووی پێکەوە بووە، وەک لە سەرەتای سوورەتی **(یونس)** و، لە چەند شوێنی دیکەش لەم تەفسیرەدا باسمان کردوە، بەڵام لە سوورەتی **(یونس)**دا باسێکی فراوان و خەست و قووڵمان لەو بارەوە کردوە، هەروەها دواتر لە تەفسیری سوورەتی **(فصلت)** و سوورەتی **(الرحمان)** یش دا.

﴿أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾، کە ئاسمانەکان و زەوی، یانی: نەک تەنیا زەوی و کۆمەڵەی خۆر، چونکە لێرەدا خوا باسی ئاسمانەکان و زەوی دەکات، کە مەبەست هەموو گەردوونە، هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێی جیابوونەوەی زەوییە لە کۆمەڵەی خۆر، زەوی و کۆمەڵەی خۆر، کە لە خۆر جیا بوونەوە، چونکە هەمان ئەو ماددەو توخم و پێکهاتانەی کە لە زەویدانە، لە پێکهاتەی خۆریشدا هەن، کە بە هۆی تیشکەکەیەوە بۆمان دەرکەوتوە، هەروەها پێکهاتەکانی دیکەی خڕۆکەکانیش، بەڵام خۆریش بۆ خۆی ئەستێرەیەک بووە لە نێو کەهکەشانی کاکێشاندا، ئەو کەهکەشانەی بەشێک بووە لەو هەموو گەردوونەی کە خوای زانا و توانا دوایی دابەشی کردوە، بۆ چەندان گەلە کەهکەشان و، کەهکەشانەکانیش بۆ ئەستێرەکان و، ئەستێرەکانیش وێرای ئەو خڕۆکانەی بە دەوریاندا دەخولێنەوە.

**(الرَّتْقُ: الإتِّصَالُ وَالتَّلَاصُقُ بَيْنَ أَجْزَاءِ الشَّيء)**، **(رتق)** بریتییە لە پێوەلکان و پێکەوە جۆشدرانی بەشەکانی شتێک.

٣)- ﴿فَفَتَقۡنَٰهُمَا﴾، لە یەکمان جیاکردنەوە، واتە: ئاسمان و زەوی، هەڵبەتە زەوی لە بەرانبەر ئاسمانەکاندا، شتێکی بچووکە، تەنانەت خۆر ملیۆنێک و سێ سەد هەزار (١٣٠٠٠٠٠) جار لە زەوی گەورەترە، واتە: ئەو خۆرەی ئێمە جێگای (١٣٠٠٠٠٠) خڕۆکەی وەک زەوی ئێمەی تێدا دەبێتەوە، ئنجا خۆر یەکێکە لە تریلیۆنێک (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ئەستێرە کە لە کەهکەشانی کاکێشاندا هەن و، تریلیۆنێک کەهکەشان هەن لە گەردووندا، بەڵام بە نسبەت ئێمەوە ئەم زەوییە شتێکی یەکجار گرنگە، چونکە ژیانی ئێمە هەر

لێرەیە، بۆیە خوا ﷻ هەمیشە لە قورئاندا باسی **(السماء ولأرض)** یان **(السماوات ولأرض)** دەكات، چونكە ئاسمانەكان چەندە بۆ ئێمە گرنگن، زەویش ئەگەر لەوان گرنگتر نەبێ، هێندەی ئەوان گرنگە، چونكە بە بێ زەوی، ئێمە لە كوێ دەبووین؟ ئەم زەوییەی كە لە سەری دەژین، بە بێ زەوی ژیانی ئێمە چاوەڕێ نەدەكرا پەیدا بێ.

ئنجا: **(الفَتْقُ: الإنْفِصَالُ وَالتَّبَاعُدُ بَيْنَ أَجْزَاءِ الشَّيء)**، **(فَتْق)** بریتیە لە یەك جیابوونەوە و لە یەك دووركەوتنەوەی بەشەكانی شتێك، كە دەفەرمووێ: ﴿كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا﴾، واتە: هەر كامێكیان پێكەوە لكاو بوون، لەیەكمان جیاكردنەوە، ئاسمانەكانمان كردنە حەوت ئاسمان و، هەموو ئەو كەهكەشانەش و، زەوییش پێكەوە جۆشدراو بوو، دوایی وامان لێكرد كە بەرگە هەوای بۆ پەیدا بێ، بەرگە دەریای بۆ پەیدا بێ، دەریاكان كە (٤/٣)ی پانتایی زەوی دەگرنەوەو، بەرگە هەوا كە بە بەرزایی (١٠٠٠) كیلۆمەتر وەك چەترو قەڵغانێك بە دەوری زەویدا هەیە، خوا چیایەكان و لەوەڕگاكانیشی تێدا پەیدا كردوون، كە ئەوانە پێشتر هەمووی یەك پارچە ئاگر بوو كە لە خۆر جیا بوو بۆوە، دەگونجێ ماناكەی ئاوا بێ:

أ- هەر كامێك لە ئاسمان و، لە زەوی، پێكەوە لكاو و یەك شت بوو، دوایی وردە وردە دابەشمان كرد.

ب- هەردووكیان پێكەوە بوون و لە یەكمان جیاكردوونەوە، هەردوو واتاكەی هەن، بەڵام واتای دووەمیان زیاتر دێتە زەینەوە.

٤)- ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾، هەموو شتێكی زیندوو، ژیاندارمان لە ئاوێ پەیدا كرد، وشەی **(جَعَلَ)** لێرەدا بە واتای **(خَلَقَ)** دێ، واتە: **(وَخَلَقْنَا مِنَ المَاءِ كُلَّ شيءٍ حَيٍّ)**، چونكە تەعەددای پێكراوە بۆ یەك بەركار **(مفعول)**، چونكە **(جَعَلَ)** جاری وا هەیە دوو بەركار **(مفعول)**ی هەیە، وەك: **(جَعَلَ زَيْدٌ مُحَمَّداً مُدَرِّسَاً)**، واتە: زەید موحەممەدی كرد بە مامۆستا، كە دوو بەركار **(مفعول)**ی ویستوون، بەڵام لێرەدا ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ

﴿ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّ ﴾، تەنها یەک بەرکار (**مفعول**)ی ویستوە، کەواتە: لێرەدا (**جَعَلَ**) یانی: (**خَلَقَ**) واتە: هەموو شتێکی ژیاندارمان لە ئاو پەیدا کرد.

٥)- ﴿ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ ﴾، ئایا هەر بڕوا ناهێنن؟ ئەمە پرسیارلێکردنی نکوولٚییلێکەرانەیە، واتە: دوای ڕوونکردنەوەی ئەو دوو ڕاستییە مەزنە لە یەک ئایەتدا، کە خوا ﷻ هەم سەرەتای گەردوون و چۆنیەتی دروستبوونی، هەم سەرەتا و چۆنیەتی دروستبوونی ژیان لەسەر زەوی، لە یەک ئایەتدا دەخاتەڕوو، کە زانستی ئێستاش هەر بەوە گەیشتوەو، ئەگەر ئێستاش پێی نەگەیشتبێ، دواتریش هەر تەنیا بەوە دەگات کە قورئان فەرموویەتی، دەبوو ئەوە ببێتە هاندەریان بۆ بڕواهێنان.

٦)- ﴿ وَجَعَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ ﴾، هەروەها لە زەوییدا چیایە چەسپاوەکانمان داناون، وشەی (رَوَٰسِيَ ) کە کۆی (**راسي**)یە سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراو (**موصوف محذوف**)ە، واتە: (**الجِبَالَ الرَّوَاسِي**)، چیایە چەسپاوەکانمان داناون،

یانی: چیایە چەسپاو و بە ناخی زەوییدا چووە خوارەکان، دەگوترێ: (**رَسَى يَرْسُو رَسْاً، أي رَسَخَتْ وَثَبَتَت**)، واتە: چەسپا، دەچەسپێ، چەسپان، لەبەر ئەوەی چیایەکان لە زەوییدا چەسپاون، وەک لە شوێنی دیکەش باسمان کردوە، بە تایبەت لە سەرەتای سوورەتی (**یونس**)[1] دا کە هەر چیایەک کە دەیبینین، چەندەی بە دەرەوەیە، بەلای کەمەوە شەش حەوت هێندەی بە ناخی زەوییدا چووەتە خوار، هەر بۆیەش لە سوورەتی (**النبأ**)دا خوای بەرز ومەزن چیایەکانی تەشبیە کردون بە گوڵمیخ: ﴿ وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا ٧ ﴾، وشەی (**أوتاد**) کۆی (**وتد**)ە، واتە: گوڵمیخ، کە سینگێکە شتێکی پێ دەبەسترێتەوە، کە بە دڵنیایی سینگ و گوڵمیخ، چەندەی بە دەرەوەیە، شەش حەوت هێندە بە زەوییدا دەچێتە خوار، بۆ ئەوەی ئەو شتەی پێیەوە بەستراوە، توند بیگرێ، کە ئەمە تەعبیرێکی زۆر واقیعییانەیەو، ئیعجازێکی زانستیی تێدایە، کە ئێستا دوای ئەوەی کە زانستیی

---

(١) هەروەها لە تەفسیری سوورەتی (نبأ)یشدا.

زەویناسیی (جیۆلۆجی) بەرەو پێش چووە، بۆیان دەرکەوتوە کە هەر چیایەک چەندەی بە دەرەوەیە، شەش حەوت هێندەی لە زەویدایە، ئنجا ئایا بۆچی خوا چیایە چەسپاوەکانی لە زەویدا داناون؟

٧)- ﴿أَن تَمِيدَ بِهِمْ﴾، واتە: بۆ ئەوەی نەیانجولێنێ، (يَعْنِي: كَرَاهَةَ أَنْ تَمِيْدَ بِهِم) نەوەک لە بنیان دا بجوولێ، یاخود (أَنْ لَا تَمِيْدَ بِهِمْ)، بۆ ئەوەی نەجوولێ، وشەی (ميد) واتە: هاتن و چوون و لەرزین، کە بە دڵنیایی چیایەکان دەوریان زۆرە، لەوەدا کە رووبەرو پانتایی زەوی نەیەت و نەچێ، بە تایبەتی کە لە نێو هەناوی زەویدا، هەمیشە ئاگرو ئاسنی تواوە هەیەو، جار جار لە شێوەی ئاگرپرژێندا دێتە دەرێ و، دەبێتە هۆی بوومە لەرزە و تسۆنامیی، ئەگەر چیایەکان نەبوونایە، ئەو توێکڵەی زەوی، بەرگەی ئەم هەموو فشارو گەرماییەی چەقی زەوی نەدەگرت، بەڵام چیاییەکان توێکڵێکی رەقی وەک دەمارو پەیکەری ئێسکن، کە چۆن جەستەی مرۆڤ رادەگرێ، چیایەکانیش بەو شێوەیە زەوییان راگرتوە.

٨)- ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا﴾، هەروەها لە زەویدا دابراوایی و کەلێن و رێگامان داناون، (الفِجَاجُ: جَمْعُ فَجّ: الطَّرِيْقُ الوَاسِعُ، وَالسُّبلُ: جَمْع سَبِيْل)، وشەی (فِجَاج) کۆی (فَجّ)ە، واتە: رێگای فراوان، یان دابراوایی و کەلێن، وشەی (سُبُل)یش کۆی (سَبِيْل)ە، واتە: رێگا، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿فِجَاجًا سُبُلًا﴾، دەگونجێ (فِجَاج) وەسف بێ، کە پێشکەوتوە لەسەر وەسفکراوەکەی، کە بریتیە لە (سبل)، واتە: (سُبُلًا فِجَاجاً)، رێگایە فراوانەکان و رێگایە دابڕاوەکانمان داناون، دەشگونجێ وشەی (سُبُل)، جێدار (بدل) بێ بۆ (فِجَاج)، واتە: کەلێنمان داناون، کە دواییش کەلێنەکان کراون بە رێگا، یاخود کەلێن و دابراوایی نێوان چیایەکانمان لەسەر زەوی داناون، لە حاڵێکدا ئەو دابڕاوایی و کەلێنانە، دەکرێن بە رێگا، کەواتە: سێ واتای هەن:

١- (فِجَاج) وەسفە بۆ (سُبُل) کە لێی پێش کەوتوە، واتە: رێیە فراوان و دابڕاوایيەکان.

٢- یاخود (سُبُل) جێدارە بۆ (الفِجَاج).

٣- یاخود حاڵ (حَالٌ)ە لە حاڵێکدا کە ئەو دابڕاوییانە کراون بە ڕێگا.

٩)- ﴿لَّعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾، بەڵکو بە ڕێیە بزانن، واتە: بەڵکو بگەنە ئامانجەکانیان، یاخود بەڵکو خاوەن و بەدیهێنەرو پەروەردگارو پەرستراوی خۆیان، پەی پێ ببەن، بە هۆی ئەو ناز و نیعمەتانەوە کە خوا بۆی داناون لە گەردوون (بوونەوەرو دەوروبەر)دا.

١٠)- ﴿وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا﴾، ئاسمانیشمان گێڕاوە بە بانێکی پارێزراو، (السَّقْفُ: غِطَاء فَضَاءِ البَيْتِ المَوْضُوعِ عَلَى جُدْرَانِهِ، وَهُوَ مِنَ التَّشْبِيه البَلِيْغ)، واتە: (سَقْف) بریتیە لەو پۆششەی کە بەسەر بۆشایی ماڵدا دادەدرێ و لەسەر دیوارەکانی دادەنرێ، کە لێرەدا ئەمە وێچواندنێکە لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە پێی دەگوترێ: ئەوپەڕی وێچواندن (التَّشْبِيه البَلِيْغ)، چونکە وێچوێندراو و وێچوێنەری تێدانین، نەیفەرمووە: (وَجَعْلَنا السَّمَاء كَسَقْفٍ للبَيْت)، بەڵکو هەر فەرموویەتی: ﴿سَقْفًا مَّحْفُوظًا﴾، واتە: بانێکی پارێزراو، کە دوایی باسی دەکەین چۆن پارێزراوە؟

١١)- ﴿وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ﴾، لە حاڵێکدا کە ئەوان پشتیان لە نیشانەکانی ئاسمان کردوە، ڕوویان لێ وەرگێڕاون و، ڕوو وەرچەرخێنەرن لە نیشانەکانی، چونکە ئاسمان نیشانەی زۆری تێدا هەن، هەم ئەستێرەکان، هەم کەهکەشانەکان، هەم مانگ و خۆر، ئەو باران و، ئەو تیشک و، ئەو بایە و، ئەو هەمموو شتانە کە لە ئاسماندا هەن، ئاسمان نیشانەی زۆری هەن، کەچی ئەوان پشت هەڵکردو و ڕوو وەرچەرخێنەرن لە نیشانەکانی ئاسمان.

١٢)- ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ﴾، خوا ئەو کەسەیە شەوگارو ڕۆژگارو خۆرو مانگی هێناونە دی.

١٣)- ﴿كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾، هەر کامێکیان لە سوورگەیەکدا مەلە دەکات و دەخولێتەوە، پێشتریش باسمان کرد: لێرەدا خوا تەنیا باسی خۆرو مانگی کردوە، بەڵام دوایی بە ڕاناوی کۆ هێناویەتی، کەواتە: دەبێ لە دووان زیاتر بن، نەیفەرمووە: (كِلاهما فِي فَلَكٍ يَسْبَحَان)، ئنجا سێیەمیان ئەوەیە کە خوا ﷻ باسی شەوگارو ڕۆژگاری کردوە و،

شەو و ڕۆژیش بەسەر زەویدا دابەش دەبن، هەمیشە ئەو ڕووەی زەوی کە بەرە و خۆرە ڕۆژەو، ئەو ڕووەی زەوی کە پشتی لە خۆرە و خۆری لێ دیار نیە، شەوە، کەواتە: شەو و ڕۆژ یانی: زەوی، ڕووبەری زەوی هەمیشە نیوەی تاریکە و نیوەی ڕووناکە، کەواتە: شەو و ڕۆژ بەبێ وێنا کردن و، لەبەرچاوگرتنی زەوی پەیدانابن.

کە دەفەرموێ: ﴿كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴾، وشەی (سَبْح) خوازراوەتەوە بۆ ڕۆیشتن، وشەی (فَلَك)یش واتە: سوورگەی ئەستێرەکان، کە لە ئەسڵدا وشەی (فَلَكِ) بە شەپۆلی دەریا دەگوترێ کە خڕە، (فلكة المغزل) یش سەری (تەشی) یە، کە دارێکی بازنەییە لەسەرێی بزمارێکی نوشتاوەی تێ چەقێنراوە و ئەو ڕیس و چنینەی دەچنرێ، دەچێتەوە نێو ئەو بزمارە چەمێنراوەوە، تاکو بهۆنرێتەوە، بابای تەشی ڕێس تەشییەکەی با دەدا و دەیڕێسێ.

پێویستە لێرەدا ئەوە بڵێین: کە لە تەفسیری سوورەتی (یونس)دا، هەم بە جیا باسی گەردوونمان کردوە، هەم بە جیا جیا باسی خۆرمان کردووە، باسی زەوییمان کردوەو، لە نێو زەوییدا باسی چیایەکانمان کردوەو، باسی مانگمان کردوە، بۆیە ئەو باسانەی کە لەوێدا کردوومانن، لێرە دووبارەیان ناکەینەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ﴾، ئەمەش ڕاستییەکی زانستییە و دەرکەوتوە، بۆ وێنە: جەستەی مرۆڤ (٧٠٪)ی ئاوەو، جەستەی هەندێ لە ژیانداران بەشی زیاتریشی ئاوەو، کە دەفەرموێ: ﴿كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ﴾، هەموو شتێکی زیندوو، بگرە دەکرێ ڕووەکیشی پێ بگرینەوە، بۆ وێنە: میوەیەکی وەک شووتیی و کاڵەک لەوانەیە زیاتر لە (٩٠٪) یان ئاو بێ، هەروەها زۆر لە میوەکان بەشی زۆریان ئاوەو، ژیاندارانیش بە هەمان شێوە، لە نێویشیاندا مرۆڤ، کەواتە: ئەوە حەقیقەتێکە کە زانستیش هەر ئەوەی دەرخستوە، لە واقیعیشدا هەر وایە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ ﴾، پێشتر باسمان کرد کە (رَوَاسِيَ) کۆی (راسي)یە و ئەم (رَوَاسِيَ) یە سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، واتە: (الجبال

**الرواسي**) چیایە چەسپاوەکان، ﴿أَن تَمِيدَ بِهِمْ﴾، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: (**كَرَاهَةَ أَنْ تَمِيْدَ بِهِم**) پێمان ناخۆش بووە کە بیانجووڵێنێ، یاخود: (**لأن لَّا تَمِيْدَ بِهِم**) بۆ ئەوەی نەیانجووڵێنێ، گرنگ ئەوەیە: ﴿أَن تَمِيدَ بِهِمْ﴾، بۆ ئەوەیە کە زەوی نەیانجووڵێنێ و نەیانهەژێنێ و نەیانلەرزێنێ، چیاکان بۆ زەوی، وەک پەیکەری ئێسک وان بۆ جەستەی مرۆڤ، جەستەی مرۆڤ، ئەگەر پەیکەری ئێسقانی تێدا نەبووایە، بە زەوییەوە پان دەبووەوە.

﴿وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا﴾، هەروەها ئاسمانمان کردوە بەسەربانێکی پارێزراو، ئەمە هەرچەندە پێشتریش قسەمان لێ کردوە، بەڵام پێویستە چەند شتێکی دیکەی لە بارەوە بڵێین:

### چەند قسەیەك لەبارەی بەرگە هەوای دەوری زەوییەوە:

١- ئەو بەرگە هەوایەی کە دەوری زەوی داوە، هەندێک لە زانایان دەڵێن: هەزار (١٠٠٠) کیلۆمەتر بەرزاییەکەیەتی (ئەستوورە)، یەکێک لە زانایانی گەردووناس (فرانک ئالن) دەڵێ: (لە شەو و ڕۆژێک دا بیست (٢٠) ملیۆن بەرد بە خێرایی نیزیکەی پەنجا (٥٠) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا بەرەو زەوی دێن)، لە هەر شەو و ڕۆژێکدا (٢٠) ملیۆن بەرد، کە ئەو پارچانەن لە ئەستێرە و خڕۆکەکان دەبنەوە، بە خێرایی (٥٠) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا بەرەو زەوی دێن، واتە: زۆر زۆر خێراتر لە هەر جۆرە فیشەک و گوللەیەک، بەڵام بۆچی ناکەونە سەر زەوی؟ چونکە ئەو بەرگە هەوایە دەیانسووتێنێ و دەبن بە خۆڵەمێش و بە شێوەی خۆڵەمێش بە نێو بەرگە هەواکەدا بڵاودەبنەوە.

٢- یەکێک لەو بەردانە لە ساڵی (١٩٠٨)ی زایینیدا لە سیبیریا کەوتە خوار، کە زۆر گەورە بوو و، بەرگە هەوای زەوی فریا نەکەوتوە هەمووی بسووتێنێ، تیرەکەی چل (٤٠) کیلۆمەتر (٤٠کم٢) دووچای گرتەوە، لەو شوێنەی کە لێی کەوتۆتە سەر زەوی.

یەکێکی دیکە لەو بەردانە لە ئەریزۆنای ئەمریکا، کەوتە خوار، کە تیرەکەی یەک کیلۆمەتر (١کم²) دووجا بوو و، ئەو چاڵەی هەڵیکەند قووڵییەکەی دووسەد (٢٠٠) مەتر بوو.

٣- ئەو بەردانە ئەگەر خێراییەکەیان کەمتر بووایە، بۆ وێنە: هێندەی گوللەیەک خێرا بوونایە، هەموویان لەسەر زەوی دەکەوتن، چونکە بە هۆی خێراییە زۆرەکەیانەوە، دەسووتێن و لەگەڵ ئۆکسجین و نایترۆجینی هەوادا کارلێک دەکەن و دەسووتێن.

٤- (کریسی مۆریسۆن) کە یەکێکە لە زانایان، کتێبێکی هەیە[1] تێیدا دەڵێ: ئەگەر بەرگی هەوا تەنکتر بووایە لەوەی کە ئێستا هەیە، کە ئەستوورییەکەی (٥٠٠)[2] کیلۆمەترە، هەموو پارچە نەیزەکەکان دەکەوتنە سەر زەوی، کە ئەو کاتە نەک هیچ مرۆڤێک، بەڵکو هیچ ژیاندارێک و هیچ ڕووەکێک لەسەر زەوی نەدەما، پاشان تیشکە زیان بەخشەکانیش کە لە نێو هەوادا هەن و، ئەو تیشکانەی کە لە نێو ئەو پارچە ئەستێرە و نەیزەک و بەردانە هەن، بەرگە هەوا ئەوانەش دەگرێتەوە، ناهێڵێ زیان بگەیەنن.

٥- هەروەها ئەو تیشکە زیانبەخشانەش کە لە خۆرەکە و ئەستێرەکانەوە دێن، ئەو بەرگە هەوایە ناهێڵێ بگەنە مەودای زەوی، بەڵام  ئەوانەی کە سوود بەخشن، ڕێیان پێدەدا بێن، هەڵبەتە مەگەر بەشەر بۆ خۆی لە ئەنجامی دەستکاریی کردنی بەرگە هەوای زەویدا، بۆ وێنە: کە چینی ئۆزۆن کون دەکات، ئەو کاتە بەشێک لەو تیشکە زیانبەخشانە دێن، وەک کە ئێستا هەیە، ئەو تیشکە گەردوونییەش کە دێ، هەرچی میکرۆب و ڤایرۆس و شتی زیان بەخشە، زۆریان دەکوژێ، بەڵام  لە هەمان کاتدا ڤیتامینە سوود بەخشەکان دروست دەکات.

---

(١) (Man Does Not Stand Alone) (الإنسان لا يقوم وحدة). وەگێڕراوە عەرەبییەکەی بەناوونیشانی: (العلم يدعو للإيمان)ە.

(٢) لە ڕاستیی دا بەرگەهەوا کە پێنج چینی سەرەکییە، بەرزییەکەی (١٠٠٠) کلم زیاترە.

## مەسەلەی شەشەم و کۆتایی:

**خوا هیچ مرۆڤێکی لە پێش پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ نەهێشتۆتەوەو هیچ کەس نیە تامی مردن نەچێژێ و، هەموویان بە ناخۆشیی و خۆشیی تاقی دەکرێنەوە، پاشان بۆ لای خوای خاوەن و پەروەردگاریان دەگەڕێنەوە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ الْخُلْدَ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾.

## شیکرنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ الْخُلْدَ ﴾لە پێش تۆش (ئەی موحەممەد!) هیچ مرۆڤێکمان هەرماو نەکردوە، هەمیشە کافرو هاوبەش بۆ خوادانەرە نەیارەکانی پێغەمبەر ﷺ، لە بیری ئەوەدا بوون، کە موحەممەد ﷺ هەر خۆیەتی و هەر کاتێک کە کۆچی دوایی کردو مرد، ئەوە لەو بەڵایە (بە بۆ چوونی خۆیان) قوتاریان دەبێ و، کارەکەی کۆتایی پێ دێ!

ئنجا خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ الْخُلْدَ ﴾، واتە: لە پێش تۆدا هیچ مرۆڤێکمان نەهێشتۆتەوە، وشەی (الْخُلْدَ) واتە: هەرمان و ژیانی بەردەوام، وەک لە سوورەتی (الطور)دا لە ئایەتی (٣٠ و ٣١)دا دەفەرمووێ: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِ رَيْبَ الْمَنُونِ ﴿٣٠﴾ قُلْ تَرَبَّصُوا فَإِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُتَرَبِّصِينَ ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: یان ئایا دەڵێن: شاعیرێکە و چاوەڕێ دەکەین بەڵایەکانی مردنی بەسەر بێن، (واتە: بەڵایەکی بەسەر بێ و بمرێ و کۆتایی پێ بێ)، پێیان بڵێ: چاوەڕێ بن و لە بۆسەدا بن، ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا لە چاوەڕوانانین، واتە: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ مرۆڤێکە و دەمرێ، خۆ ئێوەش هەر دەمرن، بەڵام ئەو کە دەمرێ، کارو پرۆژە و پەیامەکەی کۆتایی نایەت، بەڵام ئێوە دەبنە بەردی بن گۆمێ، مەگەر وەک

پەندو عیبرەت لێ وەرگرتن، ئەگەرنا هیچ کەس باستان ناکات و یادتان ناکات، بەڵام ، ناو و ناوبانگی موحەممەد ﷺ لە بەرەکەتی ئەو پەیام و بەرنامە خواییەی کە هێناویەتی، وەک چۆن پەیامەکەو بەرنامەکەی دەمێنێتەوە و بەردەوام دەبێ، خۆشی ناو و ناوبانگی بەردەوام دەبێ.

هەڵبەتە ئەو ڕستە قورئانییە لێشی وەردەگیرێ، کە لە پێش پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ هیچ مرۆڤێک نەماوە، کەواتە: وەک لە تەفسیری سووڕەتی **(الكهف)** دا باسمان کرد، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە **(خضر)** ئەو بەندە ساڵحەی کە لەگەڵ مووسادا بوو، بۆتە هاوەڵ و مامۆستای مووساو، چەند شتێکی لێ فێر بووە، وەک هەندێ لە ئەهلی تەصەووف، بەڵکو زۆربەیان، ڕایان وایە کە هەر ماوە، واتە: ژیانی بەردەوامە و نەمردوە، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نەخێر ئەمە ڕاست نیە: ﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ ﴾، لە پێش تۆدا هیچ مرۆڤێکمان نەهێشتۆتەوە، نە **(خضر)** و نە غەیری **(خضر)**.

ئەمە دیسان دەبێتەوە بەڵگەش لەسەر ئەوە، کە ئەوەی شیعە بە ئیمامی دوازدەیەمی دەزانن، کە لە ئەسڵدا بوونی هەر نیە، واتە: موحەممەدی کوڕی حەسەنی عەسکەریی، حەسەنی عەسکەریی نەزۆک بووە، بێ پاشەوار بووە، بەڵام گوتوویانە: گوایە کە کوڕێکی بووە و شێرراوەتەوە بەناوی **(محمد)**، کە لە ڕووی مێژووییەوە هیچ بەڵگەیەکی سەلمێنەر نیە بۆ بوونی، وەک هەندێ لە لێکۆڵەرەوانی شیعە خۆشیان وا دەڵێن، ئەویش دیسان بیرۆکەیەکی ئەفسانەییە، کە گوایە هەیە و ماوەتەوە، چونکە بەڵێ لێرەدا خوا ﷻ باسی پێش پێغەمبەر ﷺ دەکات، بەڵام لە سیاقەکەوە بۆمان دەردەکەوێ، کە خوا هیچ مرۆڤێک لەسەر زەوی ناهێڵێتەوە، بەڵام لێرە باسی پێش پێغەمبەر ﷺ دەکات، واتە: ئەو پێغەمبەرانەی پێش تۆشمان نەهێشتوونەوە تاکو تۆ بهێڵینەوە.

ئنجا ئەگەر خوا ﷻ پێغەمبەرانی نەهێشتبنەوە، غەیری پێغەمبەرانی بە ڕێگای لە پێشتر **(بالطريق الأولى)** نەهێشتۆتەوە، چونکە پێغەمبەران **(عَلَيْهِمُ**

**الصَّلاةُ وَالسَّلاَم**) لەلای خوا ﷻ لە هەموو مرۆڤەكان بەڕێزترو موعتەبەرترو خۆشەویستترن، ئەگەر كەسێكی هێشتبایەوە، ئەوانی دەهێشتەوە، كە ئەوانی نەهێشتبنەوە، كەسانێک كە لە خوار پێغەمبەرانەوەن، كە زانایان و دۆستانی خوان، ئەوانیش بە هەمان شێوە نەهێڵراونەوە.

٢)- ﴿أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ﴾، ئایا هەر كاتێک تۆ مردی، ئەوان هەر ماو دەبن و دەمێننەوە و لە ژیاندا بەردەوام دەبن؟ واتە: با خەونی ئەوەت پێوە نەبینن، كە بە مردنت پەیام و بەرنامەكەتیان لە كۆڵ دەبێتەوە و كۆتایی پێ دێ! بەڵێ تۆ دەمری، بەڵام ئەوانیش دەمرن، بەڵام پەیام و بەرنامەكەی تۆ لەبەر ئەوەی پەیوەستە بە خواوە، خواش ﷻ زیندووی مشوورخۆر (**الحي القيوم**)ە، بەردەوام دەبێ، واتە: پەیامەكەی خوا بە هۆی هێشتنەوەی خواوە بۆ پەیامەكە، بەردەوام دەبێ.

٣)- ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ﴾، هەموو كەسێک چێژەری مردنە، وشەی (نَفْسٍ) لێرەدا دوو واتای هەن:

**یەكەمیان:** بە واتای (ذات) دێ، واتە: خودی ئەو شتە.

**دووەمیان:** بە واتای (**روح**)یش دێ، كە لێرەدا مەبەست پێی ڕووحە، واتە: هەموو ڕووحێک مردن دەچێژێ، ئەگەرنا وشەی (**ذات**) كە واتای یەكەمی (نَفْسٍ)ە، واتە: خودی ئەو شتە كە هەم ڕووحەكەی و، هەم جەستەكەی دەگرێتەوە، بەڵام بە دڵنیایی لێرەدا مەبەست پێی ڕووحەكەیەتی، هەر بۆیەش ڕاناوی مێینەی بۆ بەكارهێنراوە، چونكە ڕووح و نەفس هەردووكیان مێیینەی مەجازیی (**المؤنث المجازي**)ن.

٤)- ﴿وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً﴾، ئێمە بە ناخۆشییان و بە خۆشییان، یاخود بە زیان و بە سوود، یاخود بەوەی كە حەزی پێ دەكەن و بەوەی كە حەزی پێ ناكەن، تاقییتان دەكەینەوە، (**فَتْنَةً أي: اخْتِبَاراً**)، (**فِتْنَةً: مَفْعُول مُطْلَق لِنَبْلُوكُم، لأَنَّ الفِتْنَةَ تُرَادِف البَلْوَة**)، وشەی (**فِتْنَة**) لێرەدا دەبێتە بەركاری ڕەها (**مفعول مطلق**) بۆ ڕستەی (**لِنَبْلُوكُم**)، چونكە وشەی (**فِتْنَة**) واتای نیزیكە لە وشەی (**البَلْوَة**) یان (**لِنَبْلُوكُم**)، (**فَتْنَةً**) یان (**إبتلاءً**)

مانایان زۆر لێک نیزیکن، ئنجا بۆچی وشەی (شرّ)ی پێش خستوە؟ (قُدِّمَ الشَّرُّ لأَنَّهُ هُوَ الأَلْيَقُ بِالمَخَاطِبِ) وشەی (شَرّ) - ئنجا چ مەبەست پێی زیانبێ، چ مەبەست پێی ناخۆشیی، یان گرفتاریی بێ - بۆیە پێشخراوە، چونکە ئەوە شایستەی ئەو خەڵکە دوێنراوەیە، کە بریتی بوون لە هاوبەش بۆ خوا دانەرو کافرەکان، کە ئەوان شایستەی زیان و خراپە و گرفتاریی و نارەحەتیین.

٥)- ﴿وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ﴾، تەنیا بۆ لای ئێمەش دەگێڕدرێنەوە، لێرەدا ئەم (وَإِلَيۡنَا) پێش (فعل) و (فاعل) خراوە، وەک ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾، کە کاتێک بەرکار (مفعول به) پێش (فعل و فاعل) کاروبکەر، دەکەوێ، دەلالەت دەکات لەسەر کورت هەڵهێنان، واتە: تەنیا بۆ لای ئێمە دەگێڕدرێنەوە، نەک بۆ لای کەسی دیکە، کەواتە: باش سەرنج بدەن! بە چ چاو و ڕوویەک دێنەوە لامان و چی لەگەڵ خۆتان دەهێننە وە و، چۆن بۆ لای ئێمە دەگەڕێنەوە؟! بە ڕاستیی کەسێک بزانێ دەچێتەوە خزمەت خواو، دەچێتەوە دیداری خوا، هەوڵ دەدات بە دیاریی و کۆڵ و بارێکەوەو، بە حاڵێکەوە بچێتەوە بۆ لای خواو، بۆ خزمەتی خوا، کە شایستەی دیداری خوا بێ و، شایستەی مەقامی بەرز و بێ وێنەی خوا بێ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان پازدە (١٥) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە ئایەتەکانی: (٣٦ - ٥٠) ن، لەم پازدە (١٥) ئایەتەدا، خوا ﷻ باسی هەڵوێستی نەفامانە و کەللە ڕەقانەی کافرەکان دەکات:

١- لە بەرانبەر پێغەمبەری خاتەم موحەممەد دا ﷺ.

٢- لە بەرانبەر ڕۆژی دواییدا، بە تایبەت قیامەت و کاتی زیندوو بوونەوە و هەڵسانەوە.

٣- لە بەرانبەر خوای بەرز و مەزن و، سزا و جەزرەبەی خوا، لە ژیانی دنیادا.

٤- لە بەرانبەر قورئان و هەڕەشە و ترساندنەکانیدا، بۆ کافران.

٥- هەروەها لەم پازدە (١٥) ئایەتەدا، باسی دادگەریی خوا لە قیامەتدا کراوە.

٦- دوایی ئاماژەیەک بەو کتێبە دەکات کە بە مووسا و هاڕوونی برای درا بوو، کە بە جیاکەرەوە و ڕووناکیی و بیرخەرەوە، وەسفی دەکات (**فُرقان، ضِياء، ذِكْر**)، بەڵام بۆ پارێزکاران، پارێزکارانێک کە سام و بیمیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان هەیە و، ترس و لەرزیان بەرانبەر بە ئاخیر زەمان هەیە.

٧- لە کۆتاییشدا ئاماژەیەکی کورت بە قورئانی پڕ پیت و پێز دەکات و، نکووڵیی لە نکووڵییلێکردن و بێبڕوایی کافرەکان دەکات، لە بەرانبەر دوا کتێب و دوا فەرمایشتی خوادا ﷻ، کە قورئانی بەهێز و پێزە.

﴿وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِى يَذْكُرُ ءَالِهَتَكُمْ وَهُم بِذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٣٦﴾ خُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ مِنْ عَجَلٍۚ سَأُوْرِيكُمْ

ءَايَٰتِي فَلَا تَسۡتَعۡجِلُونِ ﴿٣٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ لَوۡ يَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمۡ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٣٩﴾ بَلۡ تَأۡتِيهِم بَغۡتَةٗ فَتَبۡهَتُهُمۡ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴿٤٠﴾ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٤١﴾ قُلۡ مَن يَكۡلَؤُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ مِنَ ٱلرَّحۡمَٰنِۗ بَلۡ هُمۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِم مُّعۡرِضُونَ ﴿٤٢﴾ أَمۡ لَهُمۡ ءَالِهَةٞ تَمۡنَعُهُم مِّن دُونِنَاۚ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَ أَنفُسِهِمۡ وَلَا هُم مِّنَّا يُصۡحَبُونَ ﴿٤٣﴾ بَلۡ مَتَّعۡنَا هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۗ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَنَّا نَأۡتِي ٱلۡأَرۡضَ نَنقُصُهَا مِنۡ أَطۡرَافِهَآۚ أَفَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ قُلۡ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلۡوَحۡيِۚ وَلَا يَسۡمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَئِن مَّسَّتۡهُمۡ نَفۡحَةٞ مِّنۡ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَلَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗاۖ وَإِن كَانَ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٍ أَتَيۡنَا بِهَاۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ٱلۡفُرۡقَانَ وَضِيَآءٗ وَذِكۡرٗا لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشۡفِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَهَٰذَا ذِكۡرٞ مُّبَارَكٌ أَنزَلۡنَٰهُۚ أَفَأَنتُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٠﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەر کاتێک ئەوانەی بێبڕوان بینیتیانی، بەس گاڵتەت پێ دەکەن (دەڵێن:) ئایا ئەمەیە کە (بە خراپە) باسی پەرستراوەکانتان دەکات! لە حاڵێکدا کە خۆیشیان بە بەرنامەی (خوای) بە بەزەیی بێبڕوان ﴿٣٦﴾ مرۆڤ لە پەلەکردن دروستکراوە، بە دڵنیایی نیشانەکانی خۆمتان پیشان دەدەم، پەلەم لێ مەکەن ﴿٣٧﴾ هەروەها (کافرەکان) دەڵێن: ئەگەر لە ڕاستانن، ئەو بەڵێنە کەنگێیە؟ ﴿٣٨﴾ ئەوانەی بێبڕوان، ئەگەر زانیبایان ئەو کاتەی ئاگریان، نە لە ڕوویان، نە لە پشتیان بۆ ناگێڕرێتەوە و سەریش ناخرێن، (دەکەونە چ حاڵێکی ناخۆشەوە، ئاوا پەلە پەلیان لە سزای خوا نەدەکرد) ﴿٣٩﴾ (بەڵێنی خوا ڕاستە) بەڵکو کت و پڕ بۆیان دێ و، سەراسیمەیان دەکات، نە دەتوانن بەرپەرچی بدەنەوەو، نە چاوەڕێشیان دەکرێ ﴿٤٠﴾ بە دڵنیایی گاڵتە بە پێغەمبەرانی پێش تۆش کرا، ئنجا سەرەنجام ئەوەی کە گاڵتەیان پێ دەکرد، ئابلۆوقەی ئەوانەی دا کە گاڵتەیان پێ دەکرد ﴿٤١﴾ بڵێ: کێ بە شەوێ و بە ڕۆژێ لە (سزا و تۆڵەی خوای) بە بەزەیی دەتانپارێزێ؟ بەڵکو ئەوانە ڕوو وەرگێڕاون لە یادو بەرنامەی پەروەردگاریان ﴿٤٢﴾ یان ئایا پەرستراوانێکیان هەن، کە لە جیاتی ئێمە پێشگیریی (سزا)یان لێ دەکەن؟ (بەڵکو) نە دەتوانن خۆیان سەر بخەن و، نە لە لایەن ئێمەشەوە هاوەڵێتییان دەکرێ ﴿٤٣﴾ بەڵکو (هۆی یاخیی بوونیان ئەوەیە کە) ئێمە ئەو (کافر)انەو باب و باپیرانیشیانمان (لە ژیانی دنیادا) بەهرەمەند کرد، هەتا تەمەنێکی زۆریان بەڕێ کرد، ئنجا ئایا نابینن، کە ئێمە لە کەنارەکانی زەمین کەم دەکەینەوە؟ (خەڵکەکەی دەمرێنین)! ئایا ئەوان زاڵبووانن (یان ئێمە)؟! ﴿٤٤﴾ بڵێ: بە دڵنیایی تەنیا بەهۆی وەحییەوە، هۆشیارتان دەکەمەوە (دەتانترسێنم)، بەڵام کەڕان گوێ بیستی بانگکران نابن، کاتێک وریا دەکرێنەوە ﴿٤٥﴾ هەر کاتیش تۆزێک لە سزا و ئازاری پەروەردگارتیان گەیشتێ، مسۆگەر دەڵێن: ئەی هاوار بۆ

ئێمە! بەڕاستیی ئێمە ستەمكار بووین ﴿٤٦﴾ تەرازووە دادگەرو ڕاستەكانیش لە ڕۆژی قیامەتدا دادەنێین، ئیدی هیچكەس تۆزقاڵێك ستەمی لێ ناكرێ و (كردەوەكەی) ئەگەر هاوكێشی دەنكە خەرتەلەیەكیش بێ، دەیهێنین و، ئێمەش بەسین بۆ ژماردنی ڕاست و ورد ﴿٤٧﴾ بێگومانیش ئێمە (تەوراتی) جیاكەرەوەو ڕۆشن و بیرخەرەوەمان بۆ پارێزكاران بە مووسا و هاروون دا ﴿٤٨﴾ ئەوانەی بە پەنامەكیی سام لە پەروەردگاریان دەكەن و، ترس و لەرزیان بەرانبەر بە ئاخیر زەمان هەیە ﴿٤٩﴾ ئەم (كتێب)ەش بەرنامەیەكی بە پێزە دامانبەزاندوە، ئنجا ئایا ئێوە نكووڵیی لێ دەكەن؟ ﴿٥٠﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(هُزُوًا): (الهُزْءُ: مَزْحٌ فِي خِفْيَةٍ، هَزِئْتُ بِهِ واَسْتَهْزءت)، (هُزْء) بریتیە لە گاڵتە پێكردنێك و گەمە پێكردنێك بە پەنهانیی، دەگوترێ: (هَزِئْتُ بِهِ واَسْتَهْزَءْت)، دیارە (زِيَادَةُ المَبْنَى تَدُلُّ عَلَى زِيَادَةِ المعْنَى)، (اَسْتَهْزَءْتَ بِهِ)، واتە: زۆرم گاڵتە پێكرد، یاخود خەفتام بۆ ئەوەی گاڵتە بكەم.

(عَجَلٍ): (العَجَلَةُ: طَلَبُ الشَّيءِ وَتَحَرِّيهِ قَبْلَ أَوَانِهِ)، (عَجَلَة) بریتیە لە داواكردنی شتێك و لێ خەفتانی، پێش كاتی خۆی، وەك گوتراوە: {الأَنَاةُ مِنَ اللهِ، وَالعَجَلَةُ مِنَ الشَّيْطَانِ}[1]، واتە: پەلە نەكردن {یاخود بە كاوەخۆبوون و لەسەرخۆیی} لە خواوەیە، پەلەكردن لە شەیتانەوەیە، كوردەواریی خۆشمان دەڵێن: شەیتان پەلەی كرد، چاوی خۆی كوێر كرد.

كە دەفەرموێ: ﴿ خُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ مِنۡ عَجَلٍ ﴾، یانی: ئەو ماددە و كەرەستەی مرۆڤی لێ دروستكراوە، بریتیە لە پەلە پەلكردن، ئەمە بۆ وەسفی ئینسانە بەوە كە زۆر پەلە دەكات، وەك لە پەلە پەل دروستكرا بێ، پەلە دەكات.

---

(١) أخرجه: الترمذي: ٢٠١٢، وقال: غريب، وضعَّفهُ الألباني.

(لَا يَكُفُّونَ): واتە: (لَا يَدْفَعُون، كَفَفْتُهُ: أَصَبْتُهُ بِالْكَفِّ وَدَفَعْتُهُ بِهَا)، (كَفّ) ئەم لەپە دەستەیە، ئەگەر تۆ بتەوێ کەسێک پاڵ پێوەبنێی یان بیگێڕیەوە بە لەپە دەست ئەوکارە دەکەی، (كَفَفْتُهُ) واتە: بە لەپی دەستم پاڵم پێوەنا، لەوەوە خوازراوەتەوە بۆ مانای بەرپەرچدانەوەو، بەرگریی لە خۆ کردن و پاڵ پێوەنان.

(بَغْتَةً): (البَغْتُ: مُفَاجَأَةُ الشَّيءِ مِنْ حَيْثِ لَا يُحْتَسَبُ)، (بغت) بریتیە لە هاتنی شتێک بە کت و پڕیی و بە شێوەیەک کە لە ڕوویەکەوەو، لە حاڵێکدا کە حیسابی بۆ نەکرابێ و بیری لێ نەکرابێتەوە.

(فَتَبْهَتُهُمْ): واتە: سەراسیمەیان دەکات، (بُهِتَ: دَهِشَ وَتَحَيَّرَ، وَقَدْ بَهَتَهُ)، (بُهِتَ) واتە: سەرسام بوو و، سەراسیمە بوو، (وَقَدْ بَهَتَهُ) واتە: سەرسامی کردو سەراسیمەی کرد، (بُهْتَان: كَذِبٌ يُبْهِتُ سَامِعَهُ لِفَظَاعَتِهِ)، (بُهْتَان)، یانی: قسەیەک، یان تاوانێک، کە مرۆڤ بەریی بێ لێی، ئنجا (بهتان) درۆیەکە کە بیسەرەکەی سەراسیمە و سەرسام دەکات، تووشی سەرسووڕمانی دەکات.

(يُنظَرُونَ): واتە: (يُمْهَلُوْن، يُؤَخَّرُوْن)، مۆڵەت دەدرێن، یاخود چاوەڕوانیی دەکرێن، (أَنْظَرْتُهُ: أَخَّرْتُهُ)، واتە: دوامخست و مۆڵەتم دا، (وَكَذَلِكَ: نَظَرْتُه وَآنْتَظَرْتُه)، واتە: مۆڵەتمدا و دوامخست، (أَنْظَرَهُ: أمهَلَهُ)، واتە: مۆڵەتی دا، بواری دا، (لَا يُنْظَرُوْن) واتە: مۆڵەتیان نادرێ.

(فَحَاقَ): واتە: دەوری دا، ئابڵووقەی دا، (حَاقَ بِه: أَصَابَهُ وَأَحَاطَ بِه)، هەم بە مانای تووشی بوو، هەم ئابڵووقەی دا، دێ، (وَحَاقَ بِهِ الأَمْر: لَزِمَهُ وَوَجِبَ عَلَيْه)، واتە: پێوە پەیوەست بوو، لەسەری پێویست بوو.

(يَكْلَؤُكُم): (يَحْفَظُكُمْ، يَرْعَاكُم)، واتە: دەتانپارێزێ و چاودێریتان دەکات.

(يُصْحَبُونَ): دەگوترێ: (صَحِبَكَ اللهُ: أي حَفِظَكَ، وَرَافَقَتْكَ عِنَايَتُه)، خوا بتپارێزێ، سەرپەرشتیی و ئاگایی خوا لەگەڵت بێت، ﴿وَلَا هُم مِّنَّا يُصْحَبُونَ﴾، واتە: لەلای ئێمەوە هاوەڵێتییان ناکرێ و پارێزگارییان لێناکرێ.

(نَفۡحَةٞ): پشوویێک، یان تۆزێک لە شتێک (النَّفْحَةُ: الطِّيْبُ الَّذِي تَرْتَاحُ لَهُ النَّفْسُ)، ئەو بۆنەی کە نەفس پێی ئاسوودە دەبێ، (والنَّفْحَةُ: العَطِيَّةُ) واتە: بەخشش، (أَصَابَتْنَا نَفْحَةٌ مِنْ سُمُومٍ: حَرٌّ وَغَمٌّ وَكَرْبٌ)، واتە: تۆزێک لەو گڕە بایە لێی داین، ئەویش دەخوازرێتەوە بۆ گەرما و خەم و خەفت.

(مِثۡقَالَ): واتە: هاوکێش، (مِثْقَالُ الشَّيءِ: مِثْلُهُ فِي وَزْنِهِ)، واتە: هاوکێشی شتێک، بریتیە لەوەی لە قورساییدا وەک وی بێ، (مِثْقَالُ مفرد وَالجَمْعُ: مَثَاقِيْل)، لە کوردییش دا هەر مسقاڵ بەکاردێ، وەک یەک مسقاڵ، واتە: تۆزێک، یان هەندێک، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا (مِثْقَال) واتە: هاوکێش و هاوسەنگ، یانی: کە سەنگی بە قەدەر وی بێ، یان کێشی بە قەدەر وی بێ.

(خَرۡدَلٍ): (الوَاحِدَةُ: خَرْدَلَة: يُضْرَبُ بِهَا المَثَلُ فِي الصِّغَرِ)، وشەی (خَردَل) ناوی (جِنْس)ە، تاکەکەی (خَرْدَلَة)، وێنەی پێ دەهێنرێتەوە لە بچووکیی دا، دەنکە خەرتەلەی خۆمان، دواییش پێناسەیەکی زانستیی و وردی دەکەین لە مەسەلە گرنگەکان دا.

(مُشۡفِقُونَ): واتە: لێی دەترسن و ترس و لەرزیان بەرانبەری هەیە، (أَشْفَقَ مِنْهُ: خَافَهُ وَحَذِرَ مِنْهُ)، لێی ترسا و لە بەرانبەریدا وریایی وەرگرت، (أَشْفَقَ عَلَيْهِ: عَطَفَ وَخَافَ عَلَيْه)، واتە: سۆزیی بەرانبەری بوو، ترسی بەرانبەری بوو، کە تووشی زیانێک بێ، (الشَّفَقَةُ: الرَّحْمَةُ وَالحَنَانُ)، واتە: بەزەیی و سۆز، (وَالخَوْفُ مِنْ حُلُولِ مَكْرُوهٍ)، (شَفَقَة) واتە: مەترسییت هەبێ خراپییەک و ناخۆشییەک بەسەرت بێ، (الشَّفِيْقُ: المُشْفِقُ، جَمْعُهُ شُفَقَاء)، (شفيق) واتە: کەسێک کە سۆز و بەزەیی و پەرۆش و بە تەنگەوە بوونی بووبێ، کە بە (شُفَقَاء) کۆدەکرێتەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێزان! لەم پازدە (١٥) ئایەتەدا، حەوت بابەتی سەرەکیی کراونە تەوەر، کە لە پێناسەکەیدا ئاماژەمان پێیاندا، لەم (١٥) ئایەتەدا خوا ﷻ بە هەڵوێستی کافرو هاوبەش بۆ خوا دانەرە ناحەزەکانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەست پێ دەکات، هەڵوێستی ئەوان دەخاتە ڕوو و، دوایی باسی سروشتی مرۆڤ دەکات بە گشتیی، بە تایبەتی مرۆڤێک کە دەستی هیدایەتی خوای نەگەیبێتێ و دەستکاریی نەکردبێ و، پاشان باسی هەڵوێستی پەلە پەلکەرانەی بێبڕواییەکان دەکات و، لەو نێوانەشدا دڵی پێغەمبەر ﷺ دەداتەوە، کە ئەو بێبڕوایانەی ڕۆژگاری تۆ، هەر ئەوان وا نەبوون، ئەوانەی پێش تۆش هەر گاڵتەیان بە پێغەمبەران کردووە، پەلەیان کردوە لە سزای خوا، بەو شێوەیە خوا ﷻ لەم ئایەتە موبارەکانەدا، هەم هەڵوێستی کافرەکان دەخاتە ڕوو، هەم دڵی پێغەمبەری خوا ﷺ دەداتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ و شوێنکەوتووانی لە هاوەڵانی بەڕێزی لە ڕۆژگاری خۆیداو، شوێنکەوتووانی تاکو ڕۆژی دوایی.

﴿وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾، هەر کاتێک ئەوانەی کە بێبڕوان، تۆیان بینی، ﴿إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا﴾، (إِن) بریتییە لە (**إِنَّ النَّافِيَة**) واتە: (**مَا يَتَّخِذُونَكَ إِلاَّ هُزُواً**)، تەنیا تۆ بە گاڵتە دەگرن، واتە: هیچ شتێک ناکەن، بەس گاڵتەت پێ دەگەن و، دەتکەن بە گاڵتە پێکراو، ئنجا گاڵتە پێکردنەکەیان ڕوون دەکاتەوە کە چییە؟ ﴿أَهَـٰذَا ٱلَّذِى يَذْكُرُ ءَالِهَتَكُمْ﴾، ئەم هەمزەیە (أ) یە بۆ پرسیارلێکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، دەڵێن: ئا ئەوەیە کە باسی پەرستراوەکانتان دەکات؟ وشەی (يَذْكُرُ) واتە: باسیان دەکات، بەڵام بە پێی سیاقەکە دەزانین، واتە: (**يَذْكُرُهُمْ بِالسُّوء**) بە خراپە باسیان دەکات، دەڵێ: هیچیان لە دەست نایەت و

ئەوانە شەفاعەت و تکا ناکەن، نابیستن و نابینن و، عەقڵیان نیە و قسە ناکەن و، هیچیان لە دەست نایەت و هیچ کارەن، نە زیانیان بە دەستە و نە قازانجیان بە دەستە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ کە ئەو شتانەی فەرموون، ئەوان ئەوانەیان بە جنێو لە قەڵەم داون بۆ پەرستراوەکانیان و، بە قسەی سووک و بە باسکردنی خراپیان لە قەڵەم داون، ئەگەرنا وشەی ناشیرین لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەوەشاوەتەوە، ئەوان لەسەر ئەو پەرستراوە، بێ ژیان و کەڕو لاڵ و هیچ کارانەی خۆیان قەڵس بوون، کە پێغەمبەر ﷺ وەک خۆیان وەسفیان بکات، بڵێ: هیچیان لە دەست نایەت، کە فیعلەن هیچیان لە دەست نەهاتوە، ﴿وَهُم بِذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَٰنِ هُمۡ كَٰفِرُونَ﴾، کەچی بە بەرنامە و بە یادی خوای خاوەن بەزەییش بێبڕوان، هەڵوێستیان ئاوایە بەرانبەر بە خوا ﷻ، کەچی لەسەر ئەو دارو بت و پەیکەرو صەنەمانە قەڵس دەبن، کە پێغەمبەر ﷺ وەک خۆیان پێناسەیان دەکات.

﴿خُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ مِنۡ عَجَلٖ﴾، مرۆڤ لە پەلە پەل دروستکراوە، بێگومان مرۆڤ لە قوڕ دروستکراوەو، لە رووحێکی خوایی، کە رووح دروستکراوێکی تایبەتی خوایەو، لە شێوەی ماددە نیە، کە بە بەر جەستەیدا کراوە، بەڵام لێرەدا وەک زانایان دەڵێن: ئەمە زێدەڕۆیی کردنە لە وەسفکردنی مرۆڤدا، بەوە کە زۆر پەلە پەل و تاڵووکە دەکات، واتە: وەک لە ماددە و کەرەستەی پەلە پەل دروستکرابێ، ئەو سیفەتی پەلە پەلەی هێندە تێدا هەیە، بە تایبەتی مرۆڤێک دەستی هیدایەتی خوای نەگەیشتبێتێ و دەستکاریی نەکردبێ و پاک و چاکی نەکردبێ، ئەگەرنا مرۆڤ دوای ئەوەی هیدایەتی خوا لە عەقڵ و دڵیدا جێگیر دەبێ، سروشتەکەی لە باری خراپەوە دەگۆڕێ بۆ باری چاک، هەروەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ٧ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ٨ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ١٠﴾، بە ڕاستیی سەرفرازە ئەو کەسەی کە خۆی پاک و چاک کردوە، بەهۆی تەقواوەیە ئینسان پاک و چاک دەبێ، بە ئەندازەی ئەوە کە تەقوا لە مرۆڤدا ڕەگ دادەکوتێ، ڕەوشت و سروشت و ئاکارەکانی مرۆڤ لە خراپەوە دەگۆڕێ بۆ چاکە.

﴿سَأُوْرِيكُمْ ءَايَٰتِي فَلَا تَسْتَعْجِلُونِ﴾، بە دڵنیایی لەمەودوا نیشانەکانی خۆمتان پێ نیشان دەدەم، پەلە مەکەن.

لێرەدا کە دەفەرمووێ: ﴿ءَايَٰتِي﴾ بە سیاق دەزانرێ کە مەبەستی پێی ئایەتەکانی قورئان نیە، چونکە ئایەتەکانی قورئان ئەوە نەبووە، کە ئەوان پەلەیان لێکردبێ، بەڵکو مەبەست پێی ئەو بەڵایانەن کە خوا بەسەر گەلە پێشووەکانی هێناون، واتە: ئەو جۆرە بەڵایانە بەسەر ئێوەش دەهێنین، پەلە مەکەن، ﴿فَلَا تَسْتَعْجِلُونِ﴾، لێرەدا (ي) قرتێنراوە (فَلَا تَسْتَعْجِلُونِي)، پەلەم لێمەکەن و هەڵم مەپێچن، لە کاتی خۆیدا و لە شوێنی خۆیدا نیشانەکانی خۆمتان پێ نیشان دەدەم، کە بریتیە لە سزایەکانی خواو، ئەو بەڵایانەی خوا دەیاننێرێ بۆ کەسانێک کە دژایەتیی پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دەکەن کە دوایی خوای دادگەر هەم تووشی گرانیی کردن و، هەم تووشی قات و قڕیی و وشکە ساڵیی بوون و، پاشان لە جەنگی بەدردا و لە جەنگەکانی دیکەدا تووشی کوشتار بوون و، زلە زلەکانیان کوژران و خوا ﷻ نیشانەکانی خۆی نیشان دان.

﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾، دەشڵێن: ئەو بەڵێنە کەنگێیە، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن؟ ئەو بەڵێنە بە دڵنیایی مەبەستیان پێی:

١- یان هاتنی سزای خوایی بووە.

٢- یان مەبەست پێ هاتنی سزای ڕۆژی دوایی بووە.

بەڵام بە پێی سیاق و بە پێی ئایەتی دوای خۆی دەزانرێ، کە مەبەستیان پێی هاتنی سزای ڕۆژی دواییە، واتە: ئەو سزایەی کە لە دۆزەخدا لەگەڵی دەستە و یەخە دەبن.

بۆیە دەفەرمووێ: ﴿لَوْ يَعْلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمْ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٣٩﴾﴾، لێرەدا وەڵامی (لَوْ) قرتێنراوە، چونکە مرۆڤ بە سیاق و سەلیقە دەیزانێ، ئەگەر ئەوانەی بێبڕوان زانیبایان لە

کاتێکدا کە ئاگر، نە لە دەم و چاویان دەگێڕنەوەو، نە لە پشتیان دەگێڕنەوەو، نە سەریش دەخرێن، واتە: ئەگەر زانیبایان، ئێستا پەلەیان لێ نەدەکرد، ئەگەر زانیبایان ئەو کاتە تووشی چ حاڵێکی بێ حاڵ و، چ وەزعێکی تەنگ و تاڵ دەبن، ئێستا پێغەمبەری خوایان ﷺ هەڵنەدەپێچا، بڵێن: زووکە دۆزەخمان بۆ بێنە، دەی سزای خوامان بۆ بێنە، بەڵام ئەو کاتە نازانن تووشی چ جۆرە تەمێک دێن، تووشی چ بەڵا و گرفتارییەک دێن، بۆیە ئێستا پەلە پەل دەکەن.

﴿ بَلۡ تَأۡتِيهِم بَغۡتَةٗ فَتَبۡهَتُهُمۡ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴾، ئەم ( بَلۡ )ە، بۆ (إضراب)ە، واتە: نەک هەر سزایان بۆ دێ و پەشێمان دەبنەوە، بەڵکو ئەو سزایە کە بۆیان دێ، کت و پڕو لە ناکاو بۆیان دێ، ﴿ فَتَبۡهَتُهُمۡ ﴾، سەراسیمەیان دەکا و سەرسامیان دەکات، ﴿ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴾، نە دەتوانن بەرپەرچی بدەنەوەو، نە چاوەڕێشییان دەکرێ و مۆڵەتیشیان دەدرێ، یانی: نەدەتوانن سزایەکە بەرپەرچ بدەنەوە و بیگێڕنەوە بۆ دواوەو، نەسزایەکەشیان لێ دوا دەخرێ و مۆڵەتیان بدرێ تۆبە بکەن و بگەڕێنەوەو پەشێمان ببنەوە، ﴿ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ ﴾، ئنجا دێتە سەر دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ دیارە ئایەتەکانی پێشتریش هەر دڵدانەوەی پێغەمبەریان ﷺ تێدابوو، هی هەر کەسێکیش کە بە دوای پێغەمبەر ﷺ دەکەوێ، کە: ئەو کافرانەی ئاوا بێبڕوان و گاڵتە دەکەن، کاتێک دێ، پەشێمان دەبنەوە لەسەر ئەوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ ﴾، بە دڵنیایی لە پێش تۆشدا گاڵتە بە پێغەمبەران کرا، پێغەمبەرانێک لە پێش تۆدا گاڵتەیان پێکرا، ﴿ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾، بەڵام ئەوانەی کە گاڵتەیان بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام) کرد بوو، ئەوەی گاڵتەیان پێ دەکرد، دەوری دان، واتە: گاڵتە پێکەرانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام) ئەو سزا و جەزرەبەیەی گاڵتەیان پێ دەکرد، دەوری دان و ئابڵووقەی دان و، بەرەنگاریان بۆوە، بە شێوەیەک کە ڕێی هەڵاتن و دەرەتانی ڕاکردنیان نەبوو، ﴿ قُلۡ مَن

﴿ يَكْلَؤُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ مِنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ﴾، پێیان بڵێ: بە شەو و بە ڕۆژێ کێ لە خوای خاوەن بەزەیی چەپاڵەتان دەدا و، دەتانپارێزێ و پەناتان دەدا؟ (**مِنَ الرَّحْمَن أي: مِنْ عَذَابِ الرَّحْمَن، أو مِنْ بَلَاءِ الرَّحْمَن**)، لە سزای خوا، یان لە بەڵای خوای خاوەن بەزەیی، کێ دەتانپارێزێ و دەربازتان دەکات؟

بۆچی لێرەدا وشەی (**الرَّحْمَن**)ی بەکار هێناوە؟ واتە: خوا ﷻ زۆر بە بەزەییە، بەڵام ئێوە کردەوەکانتان وا دەکەن، کە ئەو خوایە خاوەن بەزەییە، سزاتان بدات، ئنجا خوایەکی خاوەن بەزەیی سزای کەسێک بدا، دیارە شتی زۆر خراپی کردوە، وەک گوتراوە: (**إتَّقُوا غَضَبَ الحَلِيْم**) واتە: خۆتان لە تووڕە بوونی بابای هێدیی و مەند، بپارێزن، بابای هێدیی و مەند کە تووڕە بوو، یانی: شتی زۆر ناقۆڵا کراوە و گەیشتۆتە ئەوپەڕی، ئنجا تووڕە بووە، چونکە هەندێک کەس تەنگە پرێسکەیە و دڵ گچکەیە زوو تووڕە دەبێ، بەڵام بابای هێدیی و مەند، کاتێک تووڕە دەبێ کە سنوورەکان هەموو شکێنرابن، خوای خاوەن بەزەییش کاتێک مرۆڤەکان سزا دەدات، کە شتی زۆر ناماقووڵ و بێجێ و خراپیان کردبێ، ئنجا بڵێ: کێ دەتان پارێزێ بە شەوێ و بە ڕۆژێ لە سزا و بەڵای خوای بەبەزەیی؟! ﴿ بَلْ هُمْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِم مُّعْرِضُونَ ﴾، بەڵکو ئەوان نەک هەر حیساب ناکەن بۆ سزای خوا، بەڵکو پشت لە بەرنامە و یادی پەروەردگاریان دەکەن، پشت هەڵکردوون و ڕوو وەرچەرخێنەرن، لە یادو بەرنامەی خاوەن و پەروەدرگاری خۆیان.

﴿ أَمْ لَهُمْ ءَالِهَةٌ تَمْنَعُهُم مِّن دُونِنَا ﴾، یان ئایا چەند پەرستراوێکیان هەن، کە لە ئێمە دەیانگێڕنەوە و دەیانپارێزن و بەرگرییان لێ دەکەن؟ واتە: سزای ئێمەیان لێ دەگێڕنەوە و لە سزای ئێمە چەپاڵەیان دەدەن، ﴿ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَ أَنفُسِهِمْ ﴾، نە دەتوانن خۆیان سەربخەن، ﴿ وَلَا هُم مِّنَّا يُصْحَبُونَ ﴾، نە لە لایەن ئێمەشەوە هاوەڵەتییان دەکرێ و، دەپارێزرێن و پەنا دەدرێن! واتە: نە خۆیان توانای سەرکەوتن و خۆ سەرخستنیان هەیە، نە لە لایەن

ئێمەشەوە، بە چاوی مەرحەمەت تەماشایان دەکرێ و، نە هاوەڵەتیی پاراستنی ئێمە دەبێتە هاوەڵیان و، لە پەنای ئێمەدا پارێزراو دەبن، ﴿ بَلْ مَتَّعْنَا هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ ﴾، واتە: بەڵکو ئەوەی کە وای لێکردوون ئاوا گومڕا بن، ئاوا یاخیی و سەرکێش بن، ئەوەیە کە ئێمە ئەوانە و باب و باپیرانی ئەوانەمان بەهرەمەند کرد، ژیانێکی ماددیی خۆشمان بۆ ڕەخساندن، ﴿ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ ﴾، تاکو تەمەنێکی دوورو درێژیان بردە سەر، تەمەنیان لێ درێژ بووە، واتە: لە حاڵی خۆشگوزەرانییدا زۆریان تەمەن بەڕێ کرد، بە هۆی ئەوەوە وا یاخیی بوون و لە خۆبایی بوون، پێیان وایە هەر بەو شێوەیە تەمەنەکە دەچێتە سەر، ﴿ أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَآ ﴾، ئەدی ئایا سەرنج نادەن، کە ئێمە دێین زەوی لە کەنارەکانیەوە لێی کەم دەکەینەوە، لە زەمین کەم دەکەینەوە، ﴿ أَفَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾، ئایا ئەوان زاڵن یان ئێمە؟ ئەدی نابینن لە چوار دەوریان لەسەر زەمین کەم دەکەینەوە، کە مەبەست پێی مراندنی خەڵکەکەیە، واتە: نابینن چۆن دانیشتووانی زەوی، لەملا ولایان لە گۆشە و کەنارەکانی زەمیندا، دەمرێنین، جیل بە جیل، چین بە چین دەڕۆن، سەر زەوی بەجێ دەهێڵن، ئەوانیش بە هەمان شێوە کاتێک دێ، کە ئەو سەر زەوییە بەجێ بهێڵن و، کۆتایی بە ژیانیان بێ.

﴿ قُلْ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلْوَحْىِ ﴾، بڵێ: بە دڵنیایی من بە هۆی وەحییەوە، دەتانترسێنم و هۆشیارتان دەکەمەوە و وریاتان دەکەمەوە، واتە: ئەوەی کە دەیڵێم وەحیی و پەیام و سروشی خوایە، قسەی خۆم نیە، ﴿ وَلَا يَسْمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ ﴾، بەڵام کەڕان گوێ لە بانگەواز و بانگکردن ناگرن، کاتێک کە دەترسێنرێن و هۆشیار دەکرێنەوە، ئەوانەش هەستەوەرەکانی خۆیان بە هۆی گوناهو تاوانەوە، پەکخستوون، بۆیە گوێیان لەو بانگکردن و لەو هۆشیارکردنەوە نیە، لێرەدا وشەی (ٱلدُّعَآءَ) واتە: بانگکردن نەک پاڕانەوە، ئەمە وەک ئەوە وایە کە خوا لە سوورەتی (النور)دا دەفەرموێ: ﴿ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ

﴿ٱلرَّسُولِ بَيۡنَكُمۡ كَدُعَآءِ بَعۡضِكُم بَعۡضٗا﴾، بانگکردنی پێغەمبەر ﷺ وەک بانگکردنی هەندێکتان بۆ هەندێکتان تەماشا مەکەن، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردن، یەکسەر دەبێ بە دەمیەوە بچن، وەک هی هەندێکتان بۆ هەندێکتان نیە، لێرەدا وشەی (ٱلدُّعَآءَ) واتە: بانگکردن، هەروەک بە مانای پاڕانەوەش دێ، ئنجا بە پێی سیاق دەزانرێ کام لە مانایەکان مەبەستن.

﴿وَلَئِن مَّسَّتۡهُمۡ نَفۡحَةٞ مِّنۡ عَذَابِ رَبِّكَ﴾، ئەگەر تۆزێک و پشوویێک لە سزای پەروەردگارتیان پێ بگات، ﴿لَيَقُولُنَّ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾، بە دڵنیاییەوە دەڵێن: ئەی هاوار بۆ ئێمە! بە دڵنیایی ئێمە ستەمکار بووین، وشەی (نَفۡحَةٞ) هەم بە تۆزە بۆنێکی خۆش دەگوترێ، کە ئینسان پێی ئاسوودە بێ و، هەم (نَفۡحَةٞ) بە تۆزە بەخشینێک دەگوترێ، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿نَفۡحَةٞ مِّنۡ عَذَابِ رَبِّكَ﴾، مەبەست تۆزە سزایەکە، واتە: هەروا پشوویەک لێیان بدات لە سزای خوا، هەروەک لە سوورەتی (الفجر)دا دەفەرموێ: ﴿سَوۡطَ عَذَابٍ﴾ **الفجر** - ١٣ -، واتە: قەمچییەک لە سزای خوا.

﴿وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾، تەرازووەکانی دادگەرییش بۆ ڕۆژی هەستانەوە دادەنێین، ﴿فَلَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗا﴾، هیچ کەس تۆزقاڵێک ستەمی لێ ناکرێ، ﴿وَإِن كَانَ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٍ أَتَيۡنَا بِهَا﴾، کردەوەکانیان ئەگەر هێندەی گرانایی دەنکە خەرتەلەیەکیش بێ، دەیهێنین، ئەو کردەوانە هەموویان دەهێنین، ﴿وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ﴾، ئێمەش بەسین بۆ ژماردن، واتە: ئێمە بەسین بۆ ژماردن و سەرژمێرکردن و تۆمارکردنی کردەوەکان.

﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ٱلۡفُرۡقَانَ وَضِيَآءٗ وَذِكۡرٗا لِّلۡمُتَّقِينَ﴾، دیسان بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی و شوێنکەوتووانی لە لایەک و، لە لایەکی دیکەوە بۆ ئەوەی لە کافرو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان حاڵیی بکات، کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بیدعەتێک نەبووەو، شتێک نیە کە پێشینەی نەبێ، بەڵکو

لـە پێش ئەویشـدا پێغەمبـەرانی دیکـەش هەبـوون، بـە تایبـەت مووسـاو هـاڕوون، کـە زۆر ناوداربـوون، لـە نایـو گەلـی عەڕەبیشـدا، لەبـەر ئـەوەی کـە جوولەکـە و نەصرانییـەکان، نیزیـک بـوون لـەو کۆمەڵگایـەی کـە قوڕئـانی تێـدا هاتۆتـە خـوارو، پێغەمبـەری خاتەمـی ﷺ تێـدا هاتـوە، کـە بـاس و خواسـی مووسـا و عیسـایان زانیـون و، بـاس و خواسـی تـەوڕات و ئینجیلیـان بـاش زانیـون، بەڵکـو هەندێکیـان کـە خوێنـدەوار بـوون، تـەوڕات و ئینجیلیشـیان خوێندوونـەوە، دەفەرمـوێ: ئێمـە بـە دڵنیایـی (ٱلْفُرْقَانَ) و (وَضِيَآءً )و (وَذِكْرًا )مـان بـە مووسـا و هاڕوونـدا، کـە (ٱلْفُرْقَانَ) واتـە: جیاکـەرەوەو، (وَضِيَآءً ) واتـە: ڕۆشـن کـەرەوە یـان ڕۆشـنایی و، (وَذِكْرًا ) واتـە: بیرخـەرەوە، کـە هـەر سـێکیان وەسـفی تەوڕاتـن، واتـە: کتێبێکـمان بـە مووسـا و هـاڕوون دا، کـە هـەم جیاکـەرەوەی هـەق و ناهـەق و، حـەڵاڵ و حـەڕام و، ڕاسـت و چـەوت و، چـاک و خـراپ بـوو، هـەم (وَضِيَآءً ) ڕۆشـنکەرەوە و ڕۆشـنیی بـوو و، بەرچـاو ڕوونیـی دەدا بـە مـرۆڤ و، (وَذِكْرًا ) هـەم یادخـەرەوە و بیرخـەرەوە بـوو و، نـاو و ناوبانـگ و پایـە بەرزیـی بـوو، بـۆ هـەر کەسـێک کـە دەسـتی تـێ بگـری، بـەڵام بـۆ کـێ؟ ﴿ لِّلْمُتَّقِينَ ﴾، بـۆ پارێـزکاران، ئـەوان بەهرەمەنـد دەبـن لـە کتێبـی خـوا، ئەگەرنـا خـوا ﷻ کتێبەکـەی بـۆ هەمـوو لایـەک نـاردوە، بـەڵام کـێ لێـی بەهرەمەنـد دەبـێ؟ بـە دڵنیاییـەوە پارێـزکاران، وەک لـە سـەرەتای سـووڕەتی (البقـرة) دا دەفەرمـوێ: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ۝٢ ﴾، ئـەم کتێبـە هیـچ دوو دڵیـی تێـدا نیـە، ڕێنماییـە بـۆ پارێـزکاران.

دواتـر دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ ﴾، پێناسـەی پارێـزکاران دەکات، ئەوانـەی کـە بـە پەنامەکیـی سـام و هەیبـەت لـە پەروەردگاریـان دەکـەن، ﴿ وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشْفِقُونَ ﴾، بەرانبـەر بـە (ٱلسَّاعَةِ)ش واتـە: ئاخیـر زەمـان تـرس و لەرزیـان هەیـە، ڕاچڵـە کاو و بـە تـرس و لـەرزن.

ئنجـا دێتـە سـەر باسـی قوڕئـان دەفەرمـوێ: ﴿ وَهَٰذَا ذِكْرٌ مُّبَارَكٌ أَنزَلْنَٰهُ ﴾، ئـا ئەمـەش بیرخەرەوەیەکـی بەپیـزە، دامانبارانـدوە، ﴿ أَفَأَنتُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴾، ئنجـا

ئایا ئێوە نکووڵیی لێ دەکەن؟ ئایا ئێوە لە بەرانبەریدا لە نکووڵیلێکەرانن؟ چۆن شایستەی ئەم یادخەرەوە بەپێز و بەرهەمدارەن، کە خوا ﷻ بۆ ئێوەی دابەزاندوە، کەچی ئێوە لە بەرانبەردا نکووڵیلێکەر بن و، بێبڕوا بن پێی؟ دیارە ئەم هەمزەیە بۆ پرسیارکردنی سەرزەنشتکەرانە و نکووڵیلێکەرانەیە، واتە: ئێوە نەدەبوو وابن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**گاڵتەکردنی کافرەکان بە پێغەمبەر ﷺ و سەرسوڕمانیان لە باسکردنی بۆ پەرستراوەکانیان و، پەلەکردنیان لە هاتنی سزا و بەڵای خوا و، هاتنی ئاخیر زەمان، لە حاڵێکدا کە هەر کات قەوما، دەستە پاچە و زەبوون دەبن و، هیچیان پێ ناکرێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِي يَذۡكُرُ ءَالِهَتَكُمۡ وَهُم بِذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَٰنِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ٣٦ خُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ مِنۡ عَجَلٖۚ سَأُوْرِيكُمۡ ءَايَٰتِي فَلَا تَسۡتَعۡجِلُونِ ٣٧ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٣٨ لَوۡ يَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمۡ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ٣٩ بَلۡ تَأۡتِيهِم بَغۡتَةٗ فَتَبۡهَتُهُمۡ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ٤٠﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە (١٥) بڕگەدا:

١)- ﴿وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾، ئەوانەی بێبڕوان هەرکات تۆیان بینی، واتە: ئەوە عادەت و پیشەیانە هەر کاتێک تۆیان بینی، چی دەکەن؟

٢)- ﴿إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا﴾، تەنیا تۆ بە گاڵتە دەگرن، بەس گاڵتەت پێ دەکەن، وشەی (هُزُوًا) پێشتر باسمان کرد، واتە: (مَهْزُوءاً بِهِ) گاڵتە پێکراو، ئنجا ئەمە بە سێ جۆر خوێندراوەتەوە: (هُزُواً وَهُزْءاً وَهُزُءاً)، هەرسێک خوێندنەوەکان یەک واتایان

هەیە، واتە: ئەو شتەی گاڵتەی پێ دەکرێ و، پێی ڕادەبوێردرێ و بە مەسخەرە دەگیرێ، ئنجا شێوەی گاڵتە پێکردنەکەیان ڕوون دەکاتەوە.

٣)- ﴿أَهَـٰذَا ٱلَّذِى يَذْكُرُ ءَالِهَتَكُمْ﴾، ئایا ئەمە ئەو کەسەیە کە باسی پەرستراوەکانتان دەکات؟ واتە: بە خراپە باسی پەرستراوەکانتان دەکات، کە لە مانا گشتییەکەدا ڕوونمان کردەوە، کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ پەرستراو و پەیکەرو بت و صەنەمەکانی ئەوانی، وەک خۆیان پێناسە کردوون، کە ئەوانە نە زیانیان هەیە، نە سوودیان هەیە، نە دەبیستن و نە دەبینن و، نە هۆشیان هەیە و، نە دەڕۆن و نە دەست جووڵاندنیان هەیە، وەک لە سوورەتی (**الأعراف**)دا و، لە سوورەتەکانی دیکەدا باس دەکات، ئەوان ئەو وەسفکردنەی پێغەمبەر ﷺ بۆ پەرستراوەکانیان، بە گاڵتەپێکردن و بە خراپە باسکردن و بە جنێودان لە قەڵەم داون، دیارە پرسیارکردنەکە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە ﴿أَهَـٰذَا ٱلَّذِى يَذْكُرُ ءَالِهَتَكُمْ﴾؟ واتە: ئا ئەوەیە کە پەرستراوەکانی ئێوە بە خراپ باس دەکات؟

٤)- ﴿وَهُم بِذِكْرِ ٱلرَّحْمَـٰنِ هُمْ كَـٰفِرُونَ﴾، لە حاڵێکدا ئەوان بە بەرنامەی بەبەزەیی بێبڕوان، لەسەر پەرستراوە ساختەکانیان ئاوا وەدەنگ دێن و، بە نکووڵیلێکردن و بە سەرزەنشتکردنەوە، باسی پێغەمبەر ﷺ دەکەن، کە باسی پەرستراوەکانیان دەکات وەک خۆیان هەن لە دنیای واقیعدا، کەچی لەو لاشەوە: تەنیا بێبڕوان بە یادو بەرنامەی خوای خاوەن بەزەیی، ئەم (هُمْ)ی دووەمە بۆ جەختکردنەوەیە، یاخود بۆ کورت هەڵهێنانە، واتە: تەنها بێبڕوان بەرانبەر بە یادو بەرنامەی خوای خاوەن بەزەیی.

٥)- ﴿خُلِقَ ٱلْإِنسَـٰنُ مِنْ عَجَلٍ﴾، مرۆڤ لە پەلە پەل دروستکراوە، وەک پێشتریش گوتمان: لە پەلە پەل دروستکراوە، واتە: هێندە پەلە پەل دەکات، وەک ئەو ماددە و کەرەستەیەی کە مرۆڤی لێ دروستکراوە، بریتی بێ لە پەلە پەل کردن، (**العَجَلُ: السُّرْعة**) بریتیە لە خێرایی کردن و تاڵووکە، کە دەفەرموێ: مرۆڤی لێ دروستکراوە، ئەمە خوازراوەتەوە بۆ ئەوە کە ئەم وەسفە ئەوەندە لە سروشتی مرۆڤدا ڕۆچووە، وەک لە خودی ئەو وەسفە دروستکرابێ.

٦)- ﴿سَأُوْرِيكُمْ ءَايَٰتِي﴾، نیشانەکانی خۆمتان پێ نیشان دەدەم، کە بە دڵنیاییی لێرەدا مەبەست لە نیشانەکان، ئەو بەڵا و گرفتارییانەن کە بەسەر کافرەکانی هێناون، یاخود سەرخستنی خوایە بۆ ئیسلام و مسوڵمانان و، پەرەپێدانی ئیسلامە، هەروەک دوایی دەرکەوت، چونکە وەک چۆن سزادانی خوا بۆ کافرەکان، نیشانەی خوا بووە بۆ کافرەکان، بە هەمان شێوە سەرخستنی خواش بۆ مسوڵمانانێکی چەوسێنراوەی کەم دەستەڵاتی بێ ئیمکانیەت، ئەویش هەر نیشانەی پەروەردگارێتیی و ڕاستیی ئایین و بەرنامەی خوا بووە و، نیشانەی پەروەرگارێتیی و مشوورخواردنی خوا بووە بۆ بەندەکانی.

٧)- ﴿فَلَا تَسۡتَعۡجِلُونِ﴾، ئنجا پەلەم لێمەکەن، وشەی ﴿تَسۡتَعۡجِلُونِ﴾ تەنها ژێری (كسرة)ی هەیە، بەڵام لە ئەصڵدا ئاوایە: (فَلَا تَسْتَعْجِلُوْنِي) پەلە لە من مەکەن، کە نیشانەکانی خۆمتان پێ نیشان بدەم و، بەڵا و سزای خۆمتان بۆ بنێرم، یاخود سەرخستنی خۆم بۆ مسوڵمانان بڕەخسێنم، ئەوە لە کات و شوێنی خۆیدا دێ.

٨)- ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ﴾، دەشڵێن: ئەو بەڵێنە کەنگێیە؟ واتە: أ- بەڵێنی سەرخستنی خوا بۆ بڕواداران، ب- یاخود بەڵێنی قیامەت، ج- یاخود بەڵێنی ڕۆژی دوایی، د- یاخود بەڵێنی خوا بۆ سزادانی کافرەکان، هەر چواری دەگرێتەوە.

٩)- ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن، ئەمە جۆرێکە لە گاڵتە پێکردن بە مسوڵمانان، واتە: ئێوە ڕاست ناکەن، ئەگەر نا کوا ئەو بەڵێنە بۆ نایەت؟

١٠)- ﴿لَوۡ يَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمۡ﴾، ئەگەر ئەوانەی بێبڕوان بزانن، [(لَوْ) واتە: ئەگەر، کە لێرەدا وەڵامی دەوێ، بەڵام وەڵامەکەی قرتێندراوە، چونکە سیاقەکە دەیگەیەنێ]، لە کاتێکدا کە نە دەتوانن لە دەم و چاویان ئاگر دووربخەنەوە و بەرپەرچ بدەنەوە، نە لە پشتیان.

وشەی (حِينَ) دەڵێ: (إسْمٌ مَنْصُوبٌ عَلَى المَفْعُولِيَة لَا عَلَى الظَرْفِية أي: لَوْ عَلِمُوا وَقْتَهُ)، (حِينَ)ە، ناوێکە (مَنْصُوبٌ)ە و دەبێتە بەرکار (مفعول بە) بۆ (يَعَلَمُوا)، ئەگەر ئەو کاتەیان زانیبایە، کە ئەوەیان بەسەر دێ، کە ناتوانن ئاگری دۆزەخ نە

لە پشت و دواوەیان و، نە دەم و چاو و پێشیان دووربخەنەوەو، هەروەها سەریش ناخرێن و دەربازیش ناکرێن، ئەگەر زانیبایان، ئەو پەلە پەلەیان نەدەکرد.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿حِينَ لَا يَكُفُّونَ﴾، هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێی فریشتەکانە کە ئاگر لە پاش و پێشیان دوور ناخەنەوە، بەڵام مانای دووەمی کە دەڵێ: کافرەکان خۆیان ناتوانن ئەو ئاگرە لە خۆیان دوور بخەنەوە، ئەوەیان زیاتر پێ دەچێت.

١١)- ﴿وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ﴾، نە سەریش دەخرێن، ئنجا ئەگەر زانیبایان ئە و کاتە چییان بەسەر دێ، ئێستا پەلە پەلیان نەدەکرد لە هاتنی سزای خوا.

١٢)- ﴿بَلۡ تَأۡتِيهِم بَغۡتَةٗ﴾، بەڵکو کت و پڕ دێ، واتە: ئەو سزایەی خوایان کت و پڕ بۆ دێ.

١٣)- ﴿فَتَبۡهَتُهُمۡ﴾، واتە: سەرسام و سەراسیمەیان دەکات، ئەو سزایە هێندە کت و پڕو لە ناکاو بە ملیاندا دێ، لەبەر ئەوە کە بڕواشیان پێی نەبووە، کەسێک کە بڕوای بە شتێک نەبووبێ، کە ئەو شتە هات، بۆ ئەو کت و پڕ و ڕاچڵەکێنەر دەبێ.

١٤)- ﴿فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ رَدَّهَا﴾، ئنجا کە بۆشیان دێ، نە دەتوانن بەرپەرچی بدەنەوە.

١٥)- ﴿وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ﴾، نە مۆڵەتیشیان دەدرێ و، نە چاوەڕوانیشیان دەکرێ و نەدواش دەخرێن، کە بوارو دەرفەتیان پێ بدرێ، تۆبە بکەن و بگەڕێنەوە و پەشێمان ببنەوە.

## مەسەلەی دووەم:

گاڵتە پێکردنی بێبڕوایان بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ) و، سزادرانیان لە لایەن خواوە، ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە و، بێجگە لە خواش هیچ کەس مرۆڤەکان لە بەڵایەکانی شەو و ڕۆژ، کە خوا بە ملیاندا دێنێ، ناپارێزێ و، پەرستراوەکانیان لەو بارەوە هیچ کارە نین، بەڵام لە سۆنگەی ژیان و گوزەرانی دوورو درێژی پڕ ناز و نیعمەتەوە، کافرەکان لە خۆیان بایی بوون و لە خۆیان بایی دەبن:

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدِ اسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِالَّذِينَ سَخِرُوا مِنْهُم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٤١﴾ قُلْ مَن يَكْلَؤُكُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مِنَ الرَّحْمَٰنِ ۗ بَلْ هُمْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٢﴾ أَمْ لَهُمْ آلِهَةٌ تَمْنَعُهُم مِّن دُونِنَا ۚ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَ أَنفُسِهِمْ وَلَا هُم مِّنَّا يُصْحَبُونَ ﴿٤٣﴾ بَلْ مَتَّعْنَا هَٰؤُلَاءِ وَآبَاءَهُمْ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيْهِمُ الْعُمُرُ ۗ أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِي الْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا ۚ أَفَهُمُ الْغَالِبُونَ ﴿٤٤﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿وَلَقَدِ اسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ﴾، بە دڵنیایی گاڵتە کرا بە پێغەمبەرانێک لە پێش تۆدا، (لَقَدْ) (ل) بۆ سوێندە، یاخود زەمینە خۆشکەرە بۆ سوێند، (قَدْ)یش بۆ ساغکردنەوە و (تحقيق) و دڵنیاکردنەوەیە، واتە: دڵنیابە لەوەی ئەو حاڵەتەی تۆ ڕووبەڕووی بوویەوە، کە بریتیە لە گاڵتە پێکرانت لە لایەن بێبڕواکانەوە، بەس تۆنی، لە پێش تۆشدا پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ) وابوون و، لە پێش ئێوەشدا ئەی بڕواداران لە شوێنکەوتووانی پێغەمبەر ﷺ تاکو قیامەت! لە پێش ئێوەشدا پێغەمبەران گاڵتەیان پێکراوە، چ جای بڕواداران! ئەمە دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و بۆ بڕوادارانیش.

٢)- ﴿فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾، سەرەنجام دەوری ئەوانەی دا کە گاڵتەیان پێ دەکردن، ئەوەی کە گاڵتەیان پێدەکرد، واتە: گاڵتە پێکراوەکە کە بریتی بوو لە سزاو بەڵای خوا، دەوری گاڵتە پێکەرەکانی بە پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)دا، هەندێ لەو ڕاستییانەی کە خوا ﷻ باسیان دەکات، جاری وا هەیە کت و مت، هەر بە هەمان بێژە و بە هەمان وشە و، بە هەمان دەربڕین، دووبارەیان دەکاتەوە، کە ئەمەش یەکێکە لەو ڕاستییانەی لە ئایەتی (١٠)ی سووڕەتی (الأنعام)دا هاتوون و، لە ئایەتی دیکەشدا هاتوون، بەڵام بە شێوە و داڕشتنی دیکە.

٣)- ﴿قُلۡ مَن يَكۡلَؤُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ مِنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾، بڵێ: کێ لە شەو و ڕۆژدا، لە خوای خاوەن بەزەیی دەتانپارێزێ؟ (مَنْ) بۆ پرسیارکردنە، بۆ نکووڵییلێکردن و سەزەنشتکردن، کێ دەتانپارێزێ، لە خوای خاوەن بەزەیی؟ واتە: لە سزای خوای خاوەن بەزەیی، کە وەک پێشتر باسمان کرد، بۆیە وشەی (ٱلرَّحۡمَٰنِ)ی بەکارهێناوە، واتە: ئەو خوایەی ئێوە، کە خاوەنی ئەوپەڕی بەزەیی و سۆز و پەرۆشە بەرانبەر بە بەندەکانی، کەچی ئەو ئەگەر سزاتان بۆ بنێرێ بە شەو و بە ڕۆژ، مانای وایە زۆرتان تووڕە کردوە و، کارێکی هێندە ناقۆڵاو خراپتان کردوە، کە تەنانەت ئەو خوایە خاوەن بەزەییەتان تووڕە کردوە و واتان لێکردوە سزاتان بۆ بنێرێ، پێشتریش گوتمان: لە زمانی عەرەبییدا دەڵێ: (إتَّقُوا غَضَبَ الحَلِيْمِ)، واتە: خۆتان بپارێزن لە توڕەبوونی بابای هێدیی و مەند، کە تووڕە دەبێ مانای وایە شتی زۆر ناماقووڵ و بێجێ کراوە، بۆیە جامی تووڕەیی لەسەری ڕژاوە و، خۆی پێ مەرزەم نەکراوە و، تووڕە بووە.

کە دەفەرمووێ: ﴿بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾، بە شەوێ و بە ڕۆژێ، بۆ ئەوەی هەموو کاتەکان بگرێتەوە، واتە: کێ لە هەموو کاتەکان دا، لە سزا و بەڵای خوای خاوەن بە بەزەیی دەتانپارێزێ؟ بێگومان بەس خوا بۆ خۆی، ئەگەرنا سزا و بەڵایەک کە خوا بە شەوێ و بە ڕۆژێ و، لە هەر کاتێکدا بینێرێ، کێ دەتوانێ بەرپەرچی بداتەوە؟

٤)- ﴿بَلْ هُمْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِم مُّعْرِضُونَ﴾، واتە: نەک هەر گوێ نادەنە سزای خوا، کە بە شەوێ و بە ڕۆژێ یەخەیان بگرێ، کە کارێک نەکەن خوا وا لێبکەن سزایان بدات و بەڵایان بۆ بنێرێ، بەڵکو زیاد لەوەش، لەو بەرنامە و پەیامە کە پەروەردگاریان بۆی ناردوون، ڕوو وەرچەرخێنەرو پشتتێکەرن، واتە: نەک هەر گوێ نادەنە سزای خوا، کە بە شەوێ و بە ڕۆژێ یەخەیان بگرێ، بەڵکو بەرنامەکەی خواش بە هەند هەڵناگرن و، بەرانبەری پشتتێکەرو ڕوو وەرچەرخێنەرن.

٥)- ﴿أَمْ لَهُمْ ءَالِهَةٌ تَمْنَعُهُم مِّن دُونِنَا﴾، یان ئایا پەرستراوێکیان هەن لە ئێمەیان دەپارێزن؟ وشەی (أَمْ) لە زمانی عەرەبییدا واتە: (بَلْ أ)، لێرەدا واتە: (**بَلْ أَلَهُمْ آلِهَةٌ تَمْنَعُهُم مِنْ دُونِنَا**)، یان ئایا پەرستراوانێکیان هەن، کە لە سزای ئێمە دەیانپارێزن؟ یان دەکەونە نێوان ئەوان و سزا و جەزرەبەی ئێمە؟

نەخێر ئەوە ڕاست نیە، چونکە:

٦)- ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَ أَنفُسِهِمْ﴾، نە خۆیانیان پێ سەردەخرێ و پێ دەرباز دەکرێ.

٧)- ﴿وَلَا هُم مِّنَّا يُصْحَبُونَ﴾، نە لە لایەن ئێمەشەوە هاوەڵێتیی دەکرێن، ئنجا ئەمە ئەگەر مەبەست پێی کافرەکان بێ، واتە: کافرەکان خۆیانیان پێ سەرناخرێ و توانای زاتییان نیە، لە لایەن ئێمەشەوە هاوەڵییەتیی ناکرێن و پەنا نادرێن و چەپاڵە نادرێن.

دەشگونجێ مەبەست پێی پەرستراوەکانیان بێ، بەڵام بۆیە خوا ﷻ ڕاناوی عاقڵانی بۆ بەکارهێناون، (**هَذَا مُجَارَاةٌ لَهُمْ فَنُزِّلَت الآلِهَةُ مُنْزِلَةَ العُقَلَاءِ**)، ئەمە بە پێی عەقڵی ئەوان قسەکردن و، بە پێی عەقڵی ئەوان دواندنیانە، کە پەرستراوەکانیان بە خاوەن عەقڵ دانراون، واتە: ئەو پەرستراوانەی ئێوە، نە دەتوانن خۆیان سەربخەن، نەک ئێوە، خۆشیان پێ سەرناخرێ و دەرباز ناکرێ، ﴿وَلَا هُم مِّنَّا يُصْحَبُونَ﴾، هەروەها ئەوەش ڕاست نیە کە لە لای ئێمە ڕێز

لێگیراوبن و، تکا لە لای ئێمە بکەن، بەڵکو لە لای ئێمەشەوە هیچ هاوەڵێتییان ناکرێ و، هیچ ڕێز و حورمەتێکیان بۆ دانانرێ.

**واتای یەکەم:** کافرەکان ناتوانن خۆیان سەربخەن و دەرباز بکەن و، لە لای خواشەوە ﷻ هاوەڵێتیی ناکرێن و ناپارێزرێن.

**واتای دووەم:** بت و صەنەمە پەرستراوەکانیشیان نە خۆیان پێ دەرباز دەکرێ و، نە لە لای خوای پەروەردگاریش حورمەت و ڕێزێکیان هەیە، کە هاوەڵێتیی بکرێن و، چەپاڵە بدرێن و بپارێزرێن.

وشەی ﴿يُصۡحَبُونَ﴾، زانایان سێ واتایان بۆ لێکداوەتەوە:

١- (أي لَا يَصْحَبُهُم اللهُ فَلَا يُؤَيِّدُهُم)، واتە: خوا هاوەڵێتییان ناکات و پشتیان ناگرێ.

٢- (أي لَا يَصْحَبُهُم صَاحِبٌ وَلَا يُجِيرُهُمْ جَارٍ، فَإِنَّ الجِوَارَ يَقْتَضِي الحِمَايَة)، واتە: نە هاوەڵێک هاوەڵێتییان دەکات و، نە پەنادەرێکیش پەنایان دەدات، چونکە پەنادان خوازیاری چەپاڵەدان و پاراستنە.

٣- (يُصْحَبُون: مُضَارِعُ أَصْحَبَهُ، أي حَفِظَهُ وَمَنَعَهُ مِنَ السُّوءِ)، واتە: ناپارێزرێن و چەپاڵە نادرێن.

٨)- ﴿بَلۡ مَتَّعۡنَا هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۗ﴾، لێرەدا بەڵکو ( بَلۡ ) دیسان بۆ (إضْرَاب)ە، واتە: بەڵکو ئەوەی کە ئەوانی گومڕا کردوە، ئەوەیە کە ئێمە خۆیان و باب و باپیرانمانیان خۆشگوزەران و بەهرەمەند کردوە لە ناز و نیعمەتەکانی دنیا، تاکو تەمەنێکی دوورو درێژیان بردە سەر، تەمەنێکی درێژیان بەسەردا ڕابرد، کۆی مانایەکەی ئاوایە: (أَطَلْنَا أَعْمَارَهُمْ فِي النَّعِيمِ، فَاغْتَرُّوا وَطَغَوا)، تەمەنیانمان لە ناز و نیعمەتدا درێژ کرد، بۆیە لە خۆبایی بوون و یاخیی بوون.

با بەوە کە خوا ﷻ لە نازو نیعمەتدا تەمەنی درێژکردوون فریو نەخۆن، پێیان وابێ هەرماو دەبن.

٩)- ﴿أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِي ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَآ﴾، ئایا نابینن (بەچاوی عەقڵ و دڵ) کە دەچینە لای زەوی و لە کەنارەکانیەوە لێی کەم دەکەینەوە؟! ئایا نابینن؟ دیسان ئەو هەمزەیە بۆ پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: نکوڵییی لەوە دەکەم کە ببینن، ئایا نابینن، نازانن؟ چونکە وشەی (يَرَوْنَ) لێرەدا: (**الرُّؤيَةُ عِلْمِيَةٌ وَلَيْسَ بَصَرِيَّةً**)، واتە: ئایا نازانن؟ بە چاوی عەقڵ و دڵ نابینن؟ کە ئێمە دەچینە لای زەمین، ﴿نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَآ﴾، لە کەنارەکانیەوە لێی کەم دەکەینەوە، کە دەفەرموێ: لە کەنارەکانیەوە، ئەوە بە نسبەت ئەوانەوە، هەر کەسێک لە هەر شوێنێکی دنیا بێ، ئەو شوێنەی کە لێیەتی چەقە و، ئەو خەڵکەی کە لە دەوروبەری دەژین، دەکەونە کەناریەوە.

١٠)- ﴿أَفَهُمُ ٱلْغَـٰلِبُونَ﴾، ئایا ئەوان زاڵبووان؟ واتە: ئایا نابینن چۆن خەڵکی دیکەی دەوروبەریان، کە لە گۆشەو کەنارەکانی زەویدا دەژین، ئێمە لە زەوی کەم دەکەینەوە، واتە: ئەو خەڵکە دەمرێنین، وشەی (ٱلْأَرْضَ) لێرەدا کە ناسێنراو (**مُعَرَّف**)ە، ناساندنەکە یان بۆ (**عَهْد**)ە، واتە: ئەو سەر زەمینەی کە ئەوان لەسەری دەژین، یاخود ناساندنەکە بۆ (**جنس**)ە، واتە: جینسی ئەو سەر زەوییەی کە ئەوان و غەیری ئەوانیشی لەسەر دەژین.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿نَنقُصُهَا﴾، دەڵێ: (**النُّقْصَان: تَقْلِيلُ كَمِّيَّةِ الشَّيء**)، (**نقصان**) بریتیە لەوە کە تۆ ئەندازە و چەندیەتیی شتێک کەم بکەیەوە، (**أَطْرَافْ: جَمْعُ طَرَفٍ، وَهُوَ مَا يَنْتَهِي بِه الجِسْمُ، مِنْ جِهَةٍ مِنْ جِهَاتِه، وَضِدُّه الوَسَط**)، واتە: (**أَطْرَاف**) کۆی (**طَرَف**)ە، ئەویش ئەوەیە کە تەنێک شتێک لەلایەکیەوە کۆتایی دێ و، پێچەوانەی (**طَرَف**) بریتیە لە نێوەند (**وَسَط**)، (**وَالمُرَادُ بِنُقصَانِ الأَرْضِ نُقْصَانِ مَن عَلَيْهَا مِنَ النَّاسِ، لا نُقْصَانُ مِسَاحَتِها، لأَنَّ هَذِهِ الآيَةَ مَكِّيَة**)، مەبەست لە کەمکردنەوەی زەوی، کەمکردنەوەی ئەو خەڵکەیە کە لەسەری دەژین، نەک کەمکردنەوەی پانتایی زەوی، پانتایی زەوییەک کە لەبەر دەستی کافراندا هەیە، چونکە ئەم ئایەتە مەککییە، مەدینەیی نیە تاکو بگوترێ: بەهۆی جەنگ و ڕوو بە ڕوو بوونەوەی بڕواداران، لەگەڵ کافرانی ستەمکاردا، زەوییان لە بن پێ دەردەهێنن و، بەڕەیان لە ژێر پێ دەردەکێشن و، سەر زەمینی ئیسلام فراوان

دەبێ و، سەر زەمینی ئەهلی کوفر وەتەنگ دێ، چونکە هەندێکیان وایان لێکداوەتەوە، بەڵام مەبەست پێی ئەوەیە ئەو خەڵکەی کە لەسەر زەویین و، بە نسبەت ئەوانەوە کە لەو لا و لای زەوین، دەیانمرێنین، یانی: ئەوانیش کاتێک هەردێ، نۆرەی مردنیان بگاتێ.

هەڵبەتە هەندێکیشیان گوتوویانە: ئەوە باسی ئیعجازێکی عیلمیی جوگرافیی دەکات، کە بەردەوام پانتایی دەریاکان لەسەر زەوی زۆر دەبێ، بەستەڵەکەکانی سەرووی دنیا و خوارووی دنیا، هەردووک جەمسەری زەوی دەتوێنەوەو، دەبنە رووبارو، تێکەڵ بە دەریا و زەریاکان دەبن، بۆیە پانتایی دەریا زۆر دەبێ و، پانتایی وشکاینی کەم دەبێتەوە، کە ئەوەش دەگونجێ شتێکی ڕێژەیی بێ، بە نسبەت هەندێ شوێنەوە، ڕەنگە وشکانیی کەم بێتەوەو، پانتایی دەریا زیاد بێ، بە نسبەت هەندێ شوێنی دیکەوە ڕەنگە بە جۆرێکی دیکە بێ، بە هەر حاڵ نەمزانیوە تا ئەوە تاکو ئێستا بووبێت بە حەقیقەتێکی عیلمیی سەلمێنراو، بۆیە هەروەک ڕواڵەتی خۆی تەفسیری بکەین باشترە.

کە دەفەرموێ: ﴿أَفَهُمُ ٱلْغَـٰلِبُونَ﴾، دیارە ئەم هەمزەیە بۆ پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەوە و سەرسووڕماندنە (**للإنكار والتعجيب**)، ئایا ئەوان زاڵ دەبن؟ واتە: بە دڵنیایی مسوڵمانان زاڵ دەبن، چ لە ڕووی بەڵگەوەو، چ لە ڕووی بەرەنگار بوونەوەوە، کاتێک کە بە ڕاستیی ئەهلی ئیمان لەگەڵ ئەهلی کوفردا ڕوو بەڕوو دەبنەوە، ئەهلی کوفر باری ئەهلی ئیمان نابن.

## مەسەلەی سێیەم:

**ترسێنرانی خەڵک لە ڕێی وەحیی خواوە و، نەبیستنی بێبڕوایانی کەڕو، لە کاتی لێدانی پشووە بایەکی سزای پەروەردگاریشدا، هاوار لێ هەڵسان و دانپێدا هێنانیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلْوَحْىِ ۚ وَلَا يَسْمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٤٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿قُلْ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلْوَحْىِ﴾، بڵێ: تەنیا بە هۆی وەحیی و پەیامیی خواوە، ئێوە دەترسێنم و هۆشدارییتان پێ دەدەم، واتە: ئەم قورئانەی کە ئاگادارکردنەوە و ترساندنی تێدایە، ئەوە سروش و پەیامی خوایە، قسەی گیرفانی خۆم نیە، (**إِنَّمَا أداة الحَصْرِ والإِثْبَات**)، (**إنما**) ئامرازی کورت هەڵهێنان و چەسپاندنە، واتە: ئەوەی کە دەیڵێم تەنها وەحیی خوایە، من هەر لە خۆمەوە قسە ناکەم، ئێوەی پێ بترسێنم و، ئێوەی پێ وریا بکەمەوە.

٢)- ﴿وَلَا يَسْمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ﴾، بەڵام کەڕان گوێیان لە بانگکردن نابێ، کە بترسێندرێن و وریا بکرێنەوە، (**صُمّ جَمْعُ أَصَمّ، مُسْتَعَارٌ لِعَدَمِ الإِنْتِفَاعِ بِالكَلَام المُفِيد**)، وشەی (**صُمّ**) کۆی (**أَصَمّ**)ە واتە: کەڕ، لێرەدا کە دەفەرموێ: ئەوانە کەڕن، ئەمە خوازراوەتەوە بۆ حاڵەتی بەهرەمەند نەبوونیان لە فەرمایشتی سوود بەخشی خوای پەروەردگار.

لە کاتێکدا کە وریا دەکرێنەوە، واتە: لە کاتێکدا کە دەترسێنرێن و، هۆشدارییشیان دەدرێتێ، گوێ لەو بانگە ناگرن و، ئەو بانگە نابیستن، لەبەر ئەوەی هەستەوەرەکانی

خۆیانیان پەکخستوون، کە لێرەدا مەبەست لە بیستن، بیستنی لێ بەهرەمەند بووانەیە، ئەگەر نا، بیستنی ڕواڵەتیی، دەبیستن، بەڵام بە گوێی عەقڵ و دڵ نابیستن، کە ببێتە هۆی ئەوەی هەڵوێستیان بگۆڕێ، ئنجا کەسێک لە کاتێکدا هۆشداریی دەدرێتێ و، وریا دەکرێتەوە، کە لە دوای ترسێندران و هۆشداریی پێدران، فەوتێنران دێتە پێشێ، وەک گوتراوە: (قَدْ أَعْذَرَ مَنْ أَنْذَر)، هەر کەسێک کە بەرانبەرەکانی وریا بکاتەوە، بیانووی بە دەستەوە نەهێشتوون، فەوتێنران دێتە پێشێ، بۆیە ئەمە جۆرێکە لە زۆر ناقۆڵا دەرخستنی ئەوان، کە تەنانەت لە حاڵێکدا هۆشدارییشیان دەدرێتێ، کە دوای ئەوە سزایان بۆ دێ، دیسان گوێیان لە بانگگردن نیە و بانگکردنەکەش لە خواوەیە ﷻ!!

٣)- ﴿ وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ ﴾، ئەگەر تۆزێک لە سزای پەروەردگارتیان بگاتێ، چونکە وشەی (نفح) بریتیە لە پشووە بایەک، یاخود بۆنێکی خۆش کە لێت دەدات، ئنجا ئەوە خوازراوەتەوە بۆ تۆزە سزایەک، لێرەدا وشەی (مَسّ) بە مانای پەیوەست بوونە بە ڕواڵەتی جەستەیەکەوە، (مَسّه) واتە: دەستی لێکوتا، یاخود شتێک بە شتێکەوە نووسا و، ئەگەر تۆزێک لە سزای پەروەردگارتیان بگاتێ:

٤)- ﴿ لَيَقُولُنَّ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴾، بە دڵنیایی دەڵێن: ئەی هاوار بۆ ئێمە، یاخود سزای سەخت بۆ ئێمە! بێگومان ئێمە ستەمکار بووین.

ئنجا کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ ﴾، ئەمە چوار جۆرە زێدەڕۆیی تێدان، بۆ کەمکردنەوەی ئەندازەی ئەو سزا و بەڵایەی خوا، کە پێیانەوە دەنووسێ، کەچی لەگەڵ ئەو سزا کەمەی خواشدا، هاواریان لێ هەڵدەستێ و، دەڵێن: هەی هاوار بۆ ئێمە! ئێمە ماڵوێران بووین، یاخود دەڵێن: سزای سەخت بۆ ئێمە و، دانیش بە ستەمی خۆیاندا دێنن، چوار زێدەڕۆییەکانیش ئەمانەن:

**یەکەم:** وشەی (نَفْح)ی بەکارهێناوە، کە وشەی (نَفْح) واتە: پشووێک لە شتێک، بۆنێک لە شتێک، تۆزێک لە شتێک.

**دووەم:** کە فەرموویەتی: ﴿ نَفۡحَةٞ ﴾، واتە: جارێک لەو تۆزە، چونکە (**نَفْحَة يَعْنِي مَرَّةٌ مِنَ النَّفْحِ**)، واتە: یەکجار لە شتێک، لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە دەفەرموێ: (**إِنَّ لِرَبِّكُمْ مِنْ أَيَّامِ دَهْرِكُمْ نَفَحَاتِ فتعرَّضِوا لَها**)، (**أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي الكبير: ٥١٩**)، واتە: پەروەردگارتان لە ڕۆژگارەکانتاندا جۆرێک لە پێز و بەرەکەتی هەیە، کە لە خواوە دێ، خۆتانی بدەنە بەر، ئنجا کەواتە: وشەی (نَفۡحَةٞ) واتە: یەکجار لەو سزایە، لەو سزا کەمە.

**سێیەم:** دووبارە کە دەفەرموێ: ﴿ نَفۡحَةٞ ﴾، کە بە نەزانراویی (**نكرة**) هێناویەتی، واتە: سزایەکی نەزانراو کە زۆر کەم بێ.

**چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ مَّسَّتۡهُمۡ ﴾، وشەی (**مَسّ**)یش واتە: هەر تۆزێک بیگاتێ، نەک زۆر بە ملی دابێ.

کەواتە خوای تاک و پاک بە چوار جۆر، ئەو سزایەی کەمکردوەتەوە، کەچی لە بەرانبەر ئەو تۆزە و، ئەو کەمە سزایەی پەروەردگاردا، چییان لێ دێ؟ ﴿ لَيَقُولُنَّ ﴾، بە دڵنیایی و بە جەختکردنەوەوە دەڵێن: ﴿ يَٰوَيۡلَنَآ ﴾، هەی هاوار بۆ ئێمە! یاخود هەی سزای سەخت بۆ ئێمە! وەرە، یاخود ماڵوێرانیی بۆ ئێمە، ﴿ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ستەمکار بووین.

## مەسەلەی چوارەم:

**دانـرانی تـەرازووەکانی دادگەریـی لـە ڕۆژی قیامەتـدا و، سـتەم لێنەکـرانی هیـچ کـەس و، تەنانـەت هێنـدەی گرانایـی دەنکـە خەرتەلەیەکیـش و، حیسـابی وردی خـوای پـەروەردگار:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَـٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ ﴾، تەرازووەکانی دادگەریی دادەنێین، (**مَوَازِيْن**)، تەرازووەکان، کۆی (**مِيْزَان**)ە، تەرازوو، وشەی (**قِسْط**) لێرەدا بەرکارە و چاوگە، کار (**فعل**)ەکەی بریتیە لە (**أَقْسَطَ يُقْسِطُ إِقْسَاطَاً، وَهَذَا قِسْطٌ**)، (**المَوَازِيْن القِسْط**) واتە: تەرازووەکانی دادگەریی، وەک خودی دادگەریی بن.

٢)- ﴿ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، ئەو (ل)ە، (**لام التَّوْقِيت**)، واتە: بۆ کاتی هاتنی قیامەت (هەڵسانەوە)، یاخود (**لامُ التَّعْلِيل**)ە، واتە: لەبەر قیامەت تەرازووەکان، دادەنێین، کە لەو ڕۆژەدا کردەوەی مرۆڤەکان هەڵسێنگێنرێ و، مرۆڤەکان خۆشیان هەڵسەنگێنرێن.

٣)- ﴿ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ﴾، هیچ کەسێک، هیچ ئەندازەیەک ستەمی لێ ناکرێ.

٤)- ﴿ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ﴾، ئەگەر هێندەی گرانایی دەنکێک بێ لە خەرتەلەش بێ دەیهێنین.

٥)- ﴿ وَكَفَىٰ بِنَا حَـٰسِبِينَ ﴾، ئێمە بەسین بۆ ژماردن و، سەرژمێریی کردن و حیساب و کیتاب کردن.

وشەی (مِثْقَالَ) خوێندراویشەتەوە: (وَإِنْ كَانَ مِثْقَالُ حَبَّةٍ).

وشەی (مِثْقَالَ) (مَا يُمَاثِلُ شَيْئاً فِي الثِّقَلِ وَالوَزْنِ، فمِثْقَالُ الحَبَّةِ مِقْدَارهَا)، واتە: ئەوەیە کە هاوتای شتێک بێ لە کێش و قورساییدا.

کەواتە: ﴿مِثْقَالَ حَبَّةٍ﴾، واتە: ئەندازەی دەنکێک، کە لێرەدا خوای پەنهانزان دەنکی خەرتەلەی هێناوە، تۆو دەنکی خەرتەلەش زۆر زۆر وردە.

لە (المعجم الوسيط)دا ئاوا پێناسەی (خردل) دەکات، کە بە کوردیی دەڵێن: خەرتەلە: (الْخَرْدَلُ: نَبَاتٌ عُشْبِيٌّ حريفٌ من الفصيلة الصليبية يَنْبُتُ فِي الحُقُولِ وَعَلَى حَوَاشِي الطُّرُقِ تُسْتَعْمل بزوره فِي الطِّبِّ وَمِنْه بزور يُتَبَّلُ بهَا الطَّعَام، الْوَاحِدَة خردلة)[1]، واتە: (خردل) ڕووەکێکی گیاییە، زۆر تیژە، لە (الفصيلة الصليبية) یە، {زانایانی ڕووەکناس ڕووەکەکان بۆ چەند جۆرێک دابەش دەکەن، (صليبي) واتە: خاچیی} لە کێڵگە و کەناری ڕێ و بانەکاندا دەڕوێ، دەنکەکەی لە پزیشکییدا بەکاردەهێنرێ و، هەندێک جۆرە دەنکیشی هەن، کە بۆ تیژکردنی خواردن بەکاردەهێنرێن، سووتێنەرو تیژن و، تاکی (خردل) بریتیە لە (خردلة).

کە دەفەرموێ: ﴿وَكَفَىٰ بِنَا حَاسِبِينَ﴾، واتە: ئێمەیان بەسە کە ژمێرەر بین، واتە: لە دوای ئێمە پێویستییان بە کەسێکی دیکە نیە، کە کردەوەکان سەرژمێر بکات.

کە دەفەرموێ: ﴿وَكَفَىٰ بِنَا﴾، دەیتوانی بفەرموێ: (وكَفَانَا حَاسِبِيْنَ)، یان بفەرموێ: (كَفَاهُمْ نَحْنُ حَاسِبِيْنَ)، بەڵام ئەو (ب) یە، بۆ زیاتر جەختکردنەوە زیادکراوە، (حَاسِبِيْنَ: مَنْصُوبٌ تَمييزاً أو حَالًا) واتە: وشەی (حَاسِبِين) تەمیزە یاخود حاڵە، لە زمانی عەرەبییدا شتێک کە (مَنْصُوب) دەبێ، جاری وا هەیە تەمیز (تمييز)ە، یان بەکار (مفعول بە) یان حاڵ (حال)ە.

---

(١) المعجم الوسيط ص٢٥٥.

شایانی باسە ئێمە بە درێژیی باسێکمان دەربارەی تەرازوو و کێشرانی کردەوەکان کردوە، لە بەرگی شەشەمی ئەم تەفسیرە و لە کاتی ڕوونکردنەوەی نۆ (٩) ئایەتی سەرەتای سووڕەتی (الأعراف)دا، بۆیە ئەوەی لەوێ گوتوومانە، لێرەدا دووبارەی ناکەینەوە.

### مەسەلەی پێنجەم:

**خوا تەوراتی بە مووسا و هارووندا، کە جیاکەرەوە و ڕۆشنایی و بیرخەرەوە بوو، بۆ پارێزکارانێک کە بە پەنامەکیی سامیان لە پەروەردگاریان دەکردو، بە ترس و لەرزیش بوون بەرانبەر بە ئاخیر زەمان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ٱلْفُرْقَانَ وَضِيَآءً وَذِكْرًا لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشْفِقُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ٱلْفُرْقَانَ وَضِيَآءً وَذِكْرًا لِّلْمُتَّقِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە جیاکەرەوەو ڕۆشنایی و بیرخەرەوەمان بۆ پارێزکاران بە مووسا و هاروون دابوو، پێشتر باسمانکرد کە ئەو دڵنیاکردنەوە و جەختکردنەوەیە، بۆ ئەوەیە کە: ئەی گەلی عەرەب! یان ئەی ئەو خەڵکەی دیکە، کە پێغەمبەری خاتەمتان ﷺ بۆ ڕەوان کراوە! وامەزانن ئەوە کە تاکە پێغەمبەرێکە و، وێنەی نیە و، شتێکی بیدعەت و داهێنراوە، بەڵکو لە پێش ئەویشدا، پێغەمبەرانی دیکە هەبوون، هەر زۆر دوور نەڕۆین مووسا و هاروون (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، کە ئێوە زۆر پێیان ئاشنان.

﴿ ٱلْفُرْقَانَ وَضِيَآءً وَذِكْرًا لِّلْمُتَّقِينَ ﴾، وەک پێشتر گوتمان: هەر کام لە: (ٱلْفُرْقَانَ) و (وَضِيَآءً) و (وَذِكْرًا) سیفەتی تەوراتن، سیفەتی ئەو کتێبەن کە خوا بۆ هاروون و مووسای ناردوە، کە ناوی تەورات بووە، تەوراتیش واتە: شەریعەت، ئەو کتێبە سێ سیفەتی هەبوون:

أ- (ٱلْفُرْقَانَ) بوو، واتە: جیاکەرەوە بوو، جیاکەرەوەی هەق و ناهەق، ڕاست و چەوت، چاک و خراپ، حەڵاڵ و حەرام، دۆست و دوژمن، جیاکەرەوەی هەموو ئەو شتانە بوو، کە دژ و پێچەوانەی یەکدین.

ب- (وَضِيَآءً ) بوو، واته: ڕۆشن و ڕۆشنکه‌ره‌وه بوو.

ج- (وَذِكۡرًا) بوو، واته: بیرخه‌ره‌وه بوو، به‌رنامه بوو، ﴿لِّلۡمُتَّقِينَ ﴾، بۆ پارێزکاران.

هه‌ر کام له: (ٱلۡفُرۡقَانَ)، (ضِيَآءً)، (ذِكۡرًا) که وه‌ک گوتمان: وه‌صفی ئه‌و کتێبه‌ن (ته‌ورات)، که خوا ﷻ به مووسا و هاروونی دابوو، سێ سیفه‌تی زۆر گه‌وره‌و گرنگن، چونکه کتێبه‌کانی خوا ﷻ، ئنجا ته‌ورات، یاخود هه‌ر کام له کتێبه‌کانی دیکه‌ی خوای به‌رز، ئه‌رکیان ئه‌وه بووه، که ڕاست و چه‌وت، ئیمان و کوفر، چاک و خراپ، دۆست و دوژمن، حه‌ڵاڵ و حه‌ڕام، بۆ خه‌ڵکی له یه‌ک جیابکه‌نه‌وه، پاشان ئه‌رکیان ئه‌وه بووه، که ڕۆشنکه‌ره‌وه بن، واته: به‌رچاویان ڕۆشن بکه‌نه‌وه، ڕابردوو و ئێستاش و داهاتوویان و، دنیا و دوارۆژیان و، (وَذِكۡرًا) بیرخه‌ره‌وه بوون، هاتوون ئه‌و ڕاستییانه‌ی که خوا ﷻ له زگماکی مرۆڤدا دایناون، بیریان بخه‌نه‌وه، به‌ڵام کێ به‌هره‌مه‌ند بووه له‌و کتێبانه‌ی خوا ﷻ؟ بێگومان پارێزکاران.

٣)- ﴿ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ﴾، ئه‌وانه‌ی که به په‌نامه‌کیی له په‌روه‌ردگاریان ترساون، واته: بێ ئه‌وه‌ی په‌روه‌ردگاریان ببینن، یاخود له کاتێکدا که خۆیان غائیب بوون، کاتێک که‌سیان لێ دیار نه‌بووه، سام و هه‌یبه‌تیان به‌رانبه‌ر به په‌روه‌ردگاریان هه‌بووه.

٤)- ﴿وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشۡفِقُونَ﴾، به‌رانبه‌ر به ئاخیر زه‌مانیش، کاتی دنیا تێدا کاول بوون و، کاتی گه‌ردوون تێدا کۆتایی هاتنیش، ترس و له‌رزیان هه‌بووه، ترسێکی ئاوێته به وریایی و هۆشیارییان هه‌بووه، یاخود ترسێکی ئاوێته به‌وه بووه، که به‌رانبه‌ر به خۆیان به ته‌نگه‌وه بن، په‌رۆشی خۆیان بووه که به‌ڵایه‌کیان به‌سه‌ر بێ.

که‌واته: که‌سانێک له کتێبه‌کانی خوا، ئنجا چ ته‌ورات بێ، چ غه‌یری ته‌ورات، به‌هره‌مه‌ند ده‌بن، که خاوه‌نی ئه‌و سیفه‌تانه بن:

**یه‌که‌م:** پارێزکار بن.

**دووه‌م:** ترس و سام و هه‌یبه‌تیان به‌رانبه‌ر به په‌روه‌ردگاریان هه‌بێ به په‌نامه‌کیی.

**سێیەم:** بەرانبەر بە ئاخیر زەمان، هەست بە ترس و لەرز بکەن، ئەوانە بەهرەمەند دەبن لە کتێبەکانی خوا ﷻ.

## مەسەلەی شەشەم و کۆتایی:

**پێناسەی قورئان بە بیرخەرەوەیەکی بەهێز، کە جێی سەرسووڕمانە نکوڵیی لێ بکرێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَهَٰذَا ذِكْرٌ مُّبَارَكٌ أَنزَلْنَٰهُ أَفَأَنتُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿ وَهَٰذَا ذِكْرٌ مُّبَارَكٌ أَنزَلْنَٰهُ ﴾، ئا ئەمەش (ئەم قورئانە)، بیرخەرەوەیەکی بەپێزە ئنجا خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ئا ئەمە بیرخەرەوەیەکی بە پێزە، چۆن دەزانین کە مەبەست پێی قورئانە؟ بە هۆی ڕەوتەوە دەزانین، بە هۆی ئایەتەکانی پێشێ و دوایی، ئەدی ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندوویەتەوە چی بووە؟ هەر قورئان بووە، ئا ئەمەش (ئەم قورئانە) بیرخەرەوەیەکی، یاخود بەرنامەیەکی بە پێز و بەرەکەتدارە، دامانبەزاندوە.

٢)- ﴿ أَفَأَنتُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴾، ئنجا ئایا ئێوە بۆ ئەو (قورئان) لە نکووڵییلێکەرانن؟ ئەمە پرسیارکردنێکی سەرسووڕمانانەی نکووڵییلێکەرانەی سەرزەنشتکەرانەیە، چونکە نکووڵییان کردوە لە قورئان، واتە: ئەم قورئانە بیرخەرەوەیە، بە پێزە، خوا لە لای خۆیەوە بە جیبریل (**روح القدس**) دا دایبەزاندوە، کەچی ئێوە بەرانبەر بەو بەرنامەیە، بەرانبەر بەو کتێبە بیرخەرەوەیە، کە بە پێز و بەرهەمدارە و، خوا دایبەزاندوە، بێبڕوان؟ هەڵوێستەکەتان جێی نکووڵییلێکران و، ئێوەش مایەی سەرزەنشتکرانن، بە هۆی ئەو هەڵوێستە چەوتەتانەوە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــــزان!

ئـەم دەرسـەمان بیسـت و پێنـج (٢٥) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، کـە بریتیـن لـە ئایەتـەکانی: (٥١ - ٧٥)، ئـەم (٢٥) ئایەتـەش هەمـووی تەرخانکـراوە بـۆ بەسـەرهاتی ئیبراهیـم ﷺ (**خلیـلُ الله**)، لەگـەڵ بابـی و گەلەکەیـدا و، شـکاندنی ئیبراهیـم بـۆ بتەکانیـان و، پاشـان گـەڕان و پشـکنین و سـۆراغ کردنیـان بـۆ ئیبراهیـم و، دوایـی پەلکێـش کـردنی و، دادگایـی کـردنی و، سـەرەنجام ئاگرکردنەوەیـان بـۆ تێفرێـدانی ئیبراهیـم ﷺ و، فەرمانکـردنی خـوا بـە ئاگـر کـە ساردو سـەلامەت بـێ و، زیـان نەگەیەنـێ بـە ئیبراهیـم ﷺ و، پاشـان دەربازکـردنی خـۆی و لووطـی بـرازای ﷺ و، پێـدرانی هـەر کام لـە ئیسـحاق و یەعقـووب، واتـە: کـوڕو نـەوەی و، ئاماژەیەکـی کورتیـش بـە بەسـەرهاتی لـووط ﷺ.

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٦﴾ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾ فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴿٥٨﴾ قَالُوا۟ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُوا۟ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٠﴾ قَالُوا۟ فَأْتُوا۟ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴿٦١﴾ قَالُوٓا۟ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ

إِن كَانُواْ يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓاْ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُواْ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُواْ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓاْ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ وَأَرَادُواْ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ ﴿٧٠﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً ۖ وَكُلًّا جَعَلْنَا صَٰلِحِينَ ﴿٧٢﴾ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ ۖ وَكَانُواْ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ۗ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَوْمَ سَوْءٍ فَٰسِقِينَ ﴿٧٤﴾ وَأَدْخَلْنَٰهُ فِى رَحْمَتِنَآ ۖ إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها بە دڵنیایی لەمەوبەر سەر ڕاستییمان بە ئیبراهیم دابوو و، ئێمە پێی زانا بووین (کە شایستەیە) ﴿٥١﴾ (یاد بکەوە) کاتێک ئیبراهیم بە بابی و گەلەکەی گوت: ئەم پەیکەرانە چین کە ئێوە هەمیشە سەرگەرمی پەرستنیانن؟! ﴿٥٢﴾ گوتیان: باب و باپیرانمان بینیون کە هەر پەرستەریان بوون ﴿٥٣﴾ گوتی: بێگومان خۆتان و باب و باپیرانتان لە گومراییەکی ڕووندا بوون ﴿٥٤﴾ گوتیان: بە ڕاستتە (هەقت بۆ هێناوین)؟! یان تۆ لە گاڵتەکارانی؟! ﴿٥٥﴾ گوتی: (بە ڕاستمەو، ئەوانە شایستەی پەرستران نین)، بەڵکو خاوەنتان تەنیا (خوای) خاوەنی ئاسمانەکان و زەمینە، کە لە نەبوو هێناونیە دی، منیش بۆ ئەو بابەتەتان لە شایەدانم ﴿٥٦﴾ سوێندیش بە خوا، دوای ئەوەی کە لێرە دەڕۆن { و، بە جێی

دەهێڵن} فێڵێک لە دژی بتەکانتان ساز دەکەم (دەیانشکێنم) ﴿٥٧﴾ ئیدی هەموویانی وردو خاش کردن، جگە لە بتە گەورەکەیان، بەڵکو بگەڕێنەوە لای ﴿٥٨﴾ (کە گەڕانەوە) گوتیان: کێ ئەوەی بە پەرستراوەکانمان کردوە؟ بە دڵنیایی لە ستەمکارانە ﴿٥٩﴾ گوتیان: گوێبیستی لاوێک (جوامێرێک) بووین (بە خراپە) باسی دەکردن، پێی دەگوترێ: ئیبراهیم ﴿٦٠﴾ گوتیان: بە بەرچاوی خەڵکەوە بیهێنن، بەڵکو ببینن، (شایەدیی لەسەر بدەن) ﴿٦١﴾ (کە هێنایان) گوتیان: ئەی ئیبراهیم! ئایا تۆ ئەوەت بەسەر پەرستراوەکانمان هێناوە؟ ﴿٦٢﴾ گوتی: بەڵکو گەورەکەیان کردوویەتی، دە لێیان بپرسن ئەگەر قسە دەکەن! ﴿٦٣﴾ ئیدی بە خۆیاندا چوونەوە، گوتیان: بێگومان ئێوە خۆتان ستەمکارن، (کە ئەو بتە هیچ لە دەست نەهاتووانە دەپەرستن) ﴿٦٤﴾ دوایی هەڵگەڕانەوە سەر سەریان، (گەڕانەوە بۆ حاڵەتی نەفامیی) و، گوتیان: بێگومان تۆ (ئیبراهیم) زانیوتە ئەوانە نادوێن! ﴿٦٥﴾ گوتی: ئەدی چۆن لە جیاتی خوا شتێک دەپەرستن، کە هیچ سوودێکتان پێ ناگەیەنێ و، (هیچ) زیانتان لێ نادات؟ ﴿٦٦﴾ ئۆف (بێزاریی) بۆ خۆتان و، بۆ ئەوانەی کە لە جیاتی خوا دەیپەرستن، ئایا نافامن؟ ﴿٦٧﴾ گوتیان: ئەگەر نیازتانە کارێک بکەن بۆ پەرستراوەکانتان، بیسووتێنن و، پەرستراوەکانتان سەربخەن ﴿٦٨﴾ (پاش خرانە نێو بڵێسەی ئاگری)، فەرموومان: ئەی ئاگر! ساردو سەلامەت بە لەسەر ئیبراهیم ﴿٦٩﴾ ئەوان پیلانیان لە دژ گێڕاو، ئێمەش گێڕامانن بە زیانبارترین ﴿٧٠﴾ خۆی و لووط (ی برازای)یشمان بەرەو لای ئەو سەر زەمینە، کە بۆ جیهانییان پێزمان تێخستوە، دەرباز کردن ﴿٧١﴾ ئیسحاق و یەعقووبیشمان بە زێدە و سەربار پێدان و، هەر کامێکیشیانمان گێڕا بە چاکەکار ﴿٧٢﴾ هەروەها گێڕامانن بە پێشەوایانێک، کە بە فەرمانی ئێمە (خەڵکی) ڕێنمایی دەکەن و، ئەنجامدانی کردەوە پەسندەکان و، بەرپاکردنی نوێژ و زەکاتدانیشمان بۆ سروش کردن و، بۆ ئێمە پەرستەری بەردەوام بوون ﴿٧٣﴾ هەروەها پێشتر حیکمەت و زانیارییشمان بە لووط دابوو، لەو ئاوەدانییەشمان قوتار کرد، کە ڕەفتارە قێزەونەکانیان دەکردن، بە دڵنیایی ئەوان خەڵکێکی خراپەکارو لارێ بوون ﴿٧٤﴾

خستیشمانه نێو (بازنەی) بەزەیی خۆمانەوە، بە دڵنیایی ئەو (لووط) لە بەندە چاکەکان بوو ﴿٧٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(رُشۡدَهُۥ): (الرُّشْدُ: إِصَابَةُ الصَّوَابِ، الرُّشْدُ: الصَّلَاحُ)، (رُشْدُ) بریتیە لەوەی کە ئینسان ڕاستیی بپێکێ و بە مانای چاکیی دێ و، دەگوترێ: (رَشِدَ رَشَداً، رَشَدَ يَرْشُدُ)، کارەکەی بەم شێوەیە دێ، دەگوترێ: (هُوَ لِغَيْرِ رِشْدَةٍ، أَي غَيْرِ صَحِيْحِ النَّسَبِ)، ئەگەر کەسێک گومانی لێ بکرێ کە کوڕی بابی خۆی نیە (زۆڵە)، دەگوترێ: (هُوَ لِغَيْرِ رِشْدَةٍ).

(ٱلتَّمَاثِيلُ): (جَمْعُ التِّمْثَال: الصُّورَةُ المُصَوَّرَة)، (تَمَاثِيل) کۆی (تِمْثَال)، وێنەیەکی کێشراوە، ئنجا چ پەیکەر بێ، چ لەسەر قوماشێک و یان دارو بەردێک وێنەکە کێشرابێ، دەگوترێ: (فِي ثَوْبِهِ تَمَاثِيل)، لە پۆشاکەکەیدا وێنە هەن، واتە: (تَمَاثِيل) کۆی (تِمْثَال)ە، کە دەبێتەوە بە وێنە، (تَمَاثِيل: أَي صُوَرٌ حَيْوَانَات مُصَوَّرَة)، وێنەی ئاژەڵانێکی وێنە کێشراو.

(عَٰكِفُونَ): (عَكَفَ عَلَى الشَّيءِ عُكُوفاً وَعَكْفاً: لَازَمَهُ وَواظَبَهُ)، واتە: پەیوەست بوو بەو شتەوە، یاخود پێوەی پەیوەست بوو و، لەسەری بەردەوام بوو، بەڵام زیاتر بۆ پەرستن بەکاردەهێنرێ، لەبەر ئەوەش (الإعْتِكَاف) واتە: مانەوە لە مزگەوت و پەیوەست بوون بە مزگەوتەوە بە مەبەستی خوا پەرستن.

(فَطَرَهُنَّ): (إِبْتَدَأَهُنَّ وَاخْتَرَعَهُن)، واتە: هێناونی و دایهێناون، (فَطَرَ يَفْطِرُ فَطْراً: أَي شَقَّ) واتە: شەقی کرد، ئنجا (فَاطِر) واتە: کەسێک یان زاتێک کە دروستکراوەکان شەق دەکات و لە دەریای نەبوون دەریاندەهێنێ بۆ دەریای بوون.

(لَأَكِيدَنَّ): واتـە: پیلانێکیـان لـە دژ دەگێـڕم و فێڵێکیـان لێدەکـەم، (كَادَ فُلَانـاً: خَدَعَـهُ وَمَكَـرَ بِـه)، واتـە: فێڵـی لێکـردو پیـلانی لـە دژ گێـڕا، (كَادَلَـهُ: احْتَـالَ)، فێڵـی بـۆ کـرد، (وَكَادَهُ: أَي أَرَادَهُ بِسُـوءٍ) واتـە: نیـازی لەگەڵـی خـراپ بـوو، (الكَيْـدُ: إِرَادَةُ مَـضَرَّةِ الغَـيْرِ خِفْيَـةً)، (کَیـد) ئەوەیـە بویسـترێ زیـان بـە بەرانبـەر بگەیەنـرێ، بـەڵام بـە شـێوەیەکی پەنهـان.

(جُذَاذًا ): (جَـذَّهُ يَجُـذُّهُ جَـذّاً: أَي كَـسَرَهُ أَو قَطَعَـهُ، فَهُـوَ جَذِيْـذ وَمَجْـذُود، والجُـذَاذَة: القَرَاضَـةُ والجَمْـعُ جُـذَاذ، وَالجَذِيْـذُ: القِطْعَـةُ مِـنَ الحُطَـامِ وَالجَمْـعُ: جِـذَاذ وجُـذَاذ)، واتـە: شـکاندی، یاخـود بڕیـی، دوایـی ئـەوەی کـە دەبـڕدرێ پێـی دەگوتـرێ: (جَذِيْـذ وَمَجْـذُود)، واتـە: بـڕا و یـان شـکاو، (جُـذَاذَة) قەڵەمێـک کە دەتـاشرێ، یان شووشـەیەك کـە دەشـکێنرێ، ڕیشـاڵە وردەکانی پێیـان دەگوتـرێ: (جُـذاذَة)، کـە کۆیەکـەی بریتیـە لـە (جُـذاذ)، ﴿ فَجَعَلَهُمْ جُذَاذًا ﴾، واتـە: وردو خـاشی کـردن، (جَذِيْـذ)، واتـە: پارچـە، پارچەیـەک لـە شـتێکی شـکێنراو، وشـەی (جَذِيْـذ) هـەم بـە (جَـذاذ) و هـەم (جُـذاذ) کۆدەکرێتـەوە، هـەروەک لـە هـەردوو خوێندنەوەکـەدا ئـەوە هاتـوە.

(فَتًى): (الفَتَـى: الشَّـاب أَوَّلُ شَـبَابِه بَـيْنَ المُرَاهَقَـةِ وَالرُّجُولَـةِ، وَالفَتَـى: السَّـخِيُّ، أَو ذُو النَّجْدَة)، (فَتًى) بـە گەنـج دەگوتـرێ لـە سـەرەتای گەنجیـەتی و هەرزەکاریـی و لـە نێوان هەرزەکاریـی و پیاوەتیـی دا، لاو، گەنـج، بـە بابـای سـەخیی و بەخشـندەش دەگوتـرێ: (فَتًى)، هەروەهـا بـە پیـاوی جوامێـر کـە لـە فریـای خەڵـک دێ، دەگوتـرێ: (فَتًى).

(نُكِسُواْ ): (نَكَسَ الـشَّيء يَنْكُـسُ نَكْسَـاً: قَلَبَـهُ، وَجَعَلَ أَعْـلَاهُ أَسْـفَلَهُ، أَو مُقَدَّمَـهُ مُؤَخَّرَهُ)، واتـە: هەڵگێڕدرانـەوەو، لینگـە و قـووچ کـران، سـەرە وبـن کـران، چونکـە (نَكَـسَ الـشَّيءَ يَنْكُـسُ نَكْسَـاً: قَلَبَـهُ)، واتـە: هەڵیگێڕایـەوە لای سـەرێی کـردە خـوارێ و، لای خوارێـی کـردە سـەرێ، یاخـود لای پێشـێی کـردە دوایـە و، لای دواوەی کـردە پێشـێ.

(أُفِّ لَّكُمْ ): (أُفّ: كَلِمَـةُ تَضَجُّرٍ وَتَكَره، تُضَمُّ هَمْزَتُهَا وَتُكْسَرُ)، (إِفّ) و (أُفّ) دەگوترێ وشـەیەکە ئەمـە پێـی دەگوتـرێ: (إسـم الفعـل)، نـاوی کـردارە، واتـە: (أَتَضَجَّرُ) مـن

بێـزارم، بێزاریــی دەردەبــڕم، وشــەیەکە بــۆ بێزاریــی دەربڕیــن و پێناخــۆش بــوون بــەکاردێ.

(نَافِلَةً ): (النَّافِلَـةُ: مَـا زَادَ عَـلَى النَّصيْـبِ أوِ الحَـقِّ، أو الفَـرْضِ وَالجَمْـعُ: نَوَافِـل)، واتـە: شـتێک کـە لـە پشـک زیاتـرە، لـەو هەقـەی کـە مـافی خۆتـە لـەو شـتەی کـە فـەرز کـراوە، (نَافِلَـةٌ) بـە (نَوَافِـل) کۆدەکرێتـەوە، (نَوَافِـل العِبَـادَات) ئـەو خـوا پەرسـتیيانەن لـە فـەرزەکان زیاتـرن.

کـە لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: (نَافِلَـة)، وەک لـە مەسـەلە گرنگـەکان بـاسی دەکەین بۆ هـەر کام لـە ئیسـحاق و یەعقـووب خـوای بەخشـەر (نَافِلَـة)ی بەکارهێنـاوە، چونکـە ئیبراهیـم داوای کوڕێکـی لـە خـوا کـرد، ئیسـماعیلی پێـدا، بـەڵام دوایـی ئیسـحاقیشی پێـدا، کـە هـەر کـوڕی خـۆ بـووە، یەعقووبیـشی بـە ئیسـحاقدا، بـێ ئـەوەی کـە بـۆ خـۆی داوای کردبـێ، واتـە: ئەوانـە زیـادە بـوون لـە داواکردنەکـەی.

(ٱلۡخَيۡرَٰتِ ): (الخَـيْرُ: اسْـمُ تَفْضيْـلٍ عَـلَى غَـيْرِ قِيَـاس)، واتـە: باشـتر، نـاوی بـە باشـتر دانانـە، بـەڵام بەبـێ قیـاس، (الخَـيْرُ: الحَسَـنُ لِذَاتِـهِ) شـتێکە لـە خـودی خـۆی دا باشـە و، بـە مـاڵ و سـامانی زۆری حەڵاڵیـش دەگوتـرێ، دەگوتـرێ: (ذو الخَـيْر) واتـە: خـاوەنی چاکـە، (خَيْر)یـش بـە (أَخْيَـار) کۆدەکرێتـەوە.

(حُكۡمًا ): (الحُكْـمُ: العِلْـمُ وَالتَفَقُّـهُ وَالحِكْمَـة)، (حُكْـم) بریتیــە لــە زانیاریــی و شــارەزایی و لێزانیــی.

(ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ): (جَمْـعُ خَبِيْثَـة، خَبُـثَ الـشَّيءُ يَخْبُـثُ خُبْثَـاً وَخَبَاثَـةً: صَـارَ فَاسِـدَاً)، (خَبَائِـث) کـۆی (خَبِيْثَة)یـە، واتـە: شـتەکە تێکچـوو، خـراپ بـوو، پیـس بـوو.

(سَوۡءٍ): (رَجُـلٌ سَـوْءٌ وَعَمَـلٌ سَـوءٌ: السَّـوءُ: يُقَـالُ فِي القُبْـحِ، السَّـوُء: كُلُّ مَـا يَغُـمُّ الإنْسَـانَ وَكُلُّ مَـا يَقْبُـح)، (سَوۡءٍ): واتـە: خـراپ، دەگوتـرێ: (رَجُـلٌ سَـوْءٌ) پیاوێکـی خـراپ، (وَعَمَـلٌ سَـوْءٌ) کـردەوەی خـراپ، (السَّـوءُ: يُقَـالُ فِي القُبْـحِ) بـۆ شـتی ناقـۆڵا و

خراپ وشەی (السَّوءُ) بەکاردێ، (السُّوءُ: كُلُّ مَا يَغُمُّ الإنْسَانَ وَكُلُّ مَا يَقْبُح) وشەی (سُوء) هەر شتێکە کە ئینسان خەفەتی لێ بخوا و هەر شتێکە ناشیرین و ناقۆڵا بێ و، دزێو بێ، وشەی (سُوء) چاوگە، بەڵام (سَوءْ) دەبێتە وەسف و ناو.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــزان!

ئەم (٢٥) ئایەتە، خوا ﷻ تێیاندا باسی بەسەرهاتی ئیبراهیم (خلیل الله) ﷺ دەکات، لەگەڵ باپی و گەلەکەی دا کە بتپەرست بوون و، ئیبراهیم لێیان یاخیی بووە، لە خۆیان و لە بتەکانیان، ئنجا دیارە بتەکانیان دەشکێنێ، جگە لە بتە گەورەکە، ئەوانیش بانگی دەکەن بۆ دادگایی و، سەرەنجام بڕیار دەدەن کە بیخەنە نێو ئاگرەوە و بیسووتێنن، بەڵام خوا ﷻ فەرمان بە ئاگر دەکات، کە ساردو سەلامەت بێ لەسەر ئیبراهیم و، پاشان دەربازی دەکات بەرەو ئەو سەر زەمینەی کە پێزی تێخستوە، واتە: سەر زەمینی شام، خۆی و لووطی برازاشی و، هەروەها لە کۆتاییدا خوا ﷻ ئاماژەیەک بە لووط ﷺ و بەسەرهاتەکەی، دەکات.

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە پێشتر سەر ڕاستییمان بە ئیبراهیم بەخشیبوو، (رُشْدَهُۥ) (الرشد): (إصَابَةُ الصَّوَاب) ئەوەیە کە ئینسان هەق بپێکێ، لە نیشانە بدات، بۆیە وشەی سەر ڕاستییم بۆ بەکارهێناوە، یان: بە مراد گەیشتن، بە ئامانج گەیشتن، کە (رشد) بەرهەمی هیدایەتە، هەروەک چۆن (غَيّ) بەرهەمی (ضَلَال)ە، ئینسان کە گومڕا بوو، بێمرادیش دەبێ، ژین تاڵیش دەبێ، بە هەمان شێوەش کاتێک کە بە ڕێی زانیی و، بە ڕێگای ڕاستدا ڕۆیی، بە ئامانج دەگا و سەر ڕاست دەبێ.

پێویستە ئەوە بڵێین: کە ئێمە لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (**إبراهیم**)دا، بە درێژیی باسی بەسەرهاتی ئیبراهیممان کردوە، بۆیە لێرە هەر ئەوەندەی کە لێکدانەوەی واتای ئایەتەکان و، تێگەیشتن لە چەمک و واتای ئایەتەکان بیخوازێ، باسی بەسەرهاتی ئیبراهیم دەکەین ﷺ، ئەو بەسەرهاتەی لەگەڵ گەلەکەیدا، چونکە لە تەفسیری سوورەتی (**إبراهیم**)دا، بە درێژیی قسەمان لە بارەی ئیبراهیمەوە ﷺ و، هەڵوێستەکانی و قۆناغەکانی ژیانیەوە کردوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ إِبۡرَٰهِيمَ رُشۡدَهُۥ مِن قَبۡلُ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە پێشتر سەر ڕاستییمان بە ئیبراهیم دابوو و، بە ئامانج گەیشتنمان پێی دابوو، پێشتر یانی: پێش مووسا و هاروونی برای ﷺ، یان بەر لەوەی وەحیی بۆ بنێرین و بیکەینە پێغەمبەر ﷺ، خوا ﷻ پێغەمبەرانی لە پێش پێغەمبەرایەتیشدا پاراستوون، لە شیرک و بتپەرستیی، ئەگەر نا دەگونجێ تووشی هەڵە و پەڵەی دیکە بووبن، بەڵام چونکە خوا ﷻ ئامادەی کردوون بۆ پلەو پێگەی بەرزی پێغەمبەرایەتیی، پێش پێغەمبەرایەتییش پاراستوونی لە شتێک کە پێی ناشیرین بن، بە تایبەت بیرۆکەی بتپەرستیی و پەرستنی غەیری خوا، لەبەر ئەوەی ڕێک پێچەوانەی فیترەت و خواڕسکی ساغی مرۆڤ و، پێچەوانەی عەقڵ و مەنتیقی سەلیمە، پێغەمبەرانیش (**عَلَيۡهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، لە لووتکەی عەقڵ و مەنتیقدا بوون، بۆیە لەوە پارێزراو بوون، بەڵام شتی دیکە لێی ڕوودراون، کە بە زگماک و عەقڵ نەزانرێ و، وەک ئەو خەڵک و کۆمەڵگای کە لە نێویدا ژیاون، دەگونجێ کەم و زۆر تووشی هەندێ هەڵە و پەڵە بووبن، نەک شتێکی وا کە پێی ناشیرین بن و، کەسایەتییانی پێ لەکەدار ببێ.

﴿ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴾، ئێمە پێشتر پێی زانا بووین، واتە: پێی زانا و ئاشنا بووین، کە هەڵدەگرێ بەوجۆرە سەر ڕاستیی و بە ئامانج گەیشتنی پێ ببەخشین.

﴿ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ ﴾، یاد بکەوە! کاتێک بە بابی و بە گەلەکەی خۆی گوت: ئەو پەیکەرانە چین کە ئێوە بەردەوامن لەسەریان، بەردەوامن لەسەر پەرستنیان، بە گەورەیان دەگرن، بە پیرۆزیان دەگرن و، دەیانپەرستن و، ملکەچییان بۆ دەردەبڕن؟

چونکە وشەی (عُكُوف) : (العُكُوفُ: مُلَازَمَةُ الشَّيء) ئەوەیە کە ئینسان بە شتێکەوە پەیوەست بێ و، لەسەری بەردەوام بێ، بەڵام لێرەدا بە پێی ڕەوت (سیاق) دەزانین، کە مەبەست پێی پەیوەست بوونە بە بەرزگرتن و، بە مەزنگرتن و، بە پەرستش ئەنجامدان بۆ بتەکانەوە، ﴿ قَالُواْ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴾، وەڵامەکەیان ئەوەیە گوتیان: ئێمە باب و باپیران و پێشینانی خۆمانمان وابینیوە، کە هەر پەرستەری ئەم پەیکەرانە بوون.

(ٱلتَّمَاثِيلُ) کۆی (تِمْثَال)ە و، ئەویش بە وێنە دەگوترێ و، بە پەیکەریش دەگوترێ، وێنە یاخود پەیکەری ژیاندار، ئنجا مرۆڤ بێ، بە خەیاڵی خۆیان فریشتە بێ، یاخود هەر ژیاندارێکی دیکە بێ.

﴿ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، ئیبراهیم فەرمووی: بە دڵنیایی خۆتان و باب و باپیرانتان لە گومڕاییەکی ڕوون و بێ چەندو چووندا بوون، واتە: پەرستنی ئەو پەیکەرە بێ ژیان و بێ هەست و ویستانە، گومڕاییەکی ئاشکرایە کە ئێوە تێیدا بوون، خۆتان و باب و باپیرانتان.

ئاوا بەو شێوەیە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، بەبێ لام و جیم و منجە منج، بە ڕوون و ڕاشکاویی قسەیان لەگەڵ خەڵک کردوە، نەک بە پێچ و گەوەو، بە لە ژێر لێوەوەو، بە توێکڵەوە، بەڵکو ڕێک و ڕوون قسەیان لەگەڵ خەڵکدا کردوە و، هەر کەسێک شوێن پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بکەوێ، هەر دەبێ وابێ، بە تایبەتی لەو شتانەدا کە پێویست دەکات، کە بە ڕوونیی و ڕاشکاویی بگەیەندرێن، ئەو بابەتانەی کە پەیوەستن بە بووناسیی و، بە ئیمان و

عەقیدەوەو، بە حەڵاڵ و حەرام و، بە چاکە و خراپەوە، دەبێ ڕێک و ڕاشکاو بە بێ تویکڵ، نوقتە بخرێتە سەر پیت، بۆ ئەوەی خەڵک بە باشیی لێیان تێبگات و، دوایی بیانووی تەئویل و تەئویلکارییان نەبێ.

﴿ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا بِٱلۡحَقِّ أَمۡ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴾، باب و خەڵکەکەی گوتیان: ئایا تۆ هەقت بۆ هێناوین، یاخود تۆ لە گاڵتەکارانی؟ واتە: هەر بە ڕاستتە و بە جیددیی ئەو قسانە دەکەی، یاخود جەفەنگ و گاڵتە و سوعبەتمان لەگەڵ دەکەی؟! (لَاعِبْ) کۆیەکەی (ٱللَّٰعِبِينَ)ە، کە ئێستا پێی دەگوترێ: یارییزان و یاریچیی، ئنجا هەر جۆرە یارییەک بێ، بەڵام لێرە واتە: ئایا یاریی بە وشان دەکەی و بە جەفەنگ و گاڵتە قسەمان لەگەڵدا دەکەی، یاخود بە جیددیی، هەقت بۆ هێناوین، یاخود تۆ لە گاڵتە و جەفەنگ کارانی؟

﴿ قَالَ بَل رَّبُّكُمۡ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلَّذِي فَطَرَهُنَّ ﴾، واتە: پێویستی نەکرد بڵێ من بە جیددییمە، هەر یەکسەر پەیامەکەی خۆی گەیاند، گوتی: بەڵکو پەروەردگاری ئێوە، خاوەن و پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە، کە ئێوەی هێناونە دی، لە نەبوونەوە پەیدای کردوون، ﴿وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾، من لەسەر ئەو ڕاستییەتان کە پێتان ڕادەگەیەنم لە شایەدانم، واتە: ئامادەم بۆتان ئیسپات بکەم، چونکە شایەد بە کەسێک دەگوترێ، بتوانێ شتێک ئیسپات بکات، بلێ: ئەو شتەم بینیوە، ئنجا لەوەوە خواستوویانەتەوە بۆ هەر کەسێک کە پەیامێک بگەیەنێ، دەڵێ: من شایەدم لەسەر ئەوە، واتە: دەتوانم ئیسپاتی بکەم و بیسەلمێنم، با بە چاوی سەریش شتێکی نەبینیبێ، ئەگەر نا شایەد: (الشَّاهِدُ مَنْ شَهِدَ)، وشەی (شَهِدَ) یان بە واتای (رأى) شتەکەی بینیوە، یاخود بە واتای (حَضَر) ئامادە بووە لەو کاتەدا کە کارەکە ئەنجامدراوە.

﴿ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصۡنَٰمَكُم بَعۡدَ أَن تُوَلُّواْ مُدۡبِرِينَ ﴾، سوێند بە خوا پیلانێک لە دژی بتەکانتان دەکەم، دوای ئەوەی دەڕۆن و ئێرە بەجێ دێڵن، پیلانێکیان لە

دژ دەگێڕم، تەگبیرێكیان لێ دەكەم، تەگبیرەكەشی بریتی بووە لە وردو خاش (**تدمیر**) كردنیان، ئنجا ئایا ئەم قسەیەی ڕووبەڕوو بە بابی و گەلەكەی گوتوە، یاخود لە دڵی خۆیدا ئەو قسەیەی كردوە؟ وا پێدەچێ ڕووبەڕوو پێی گوتبن، بەڵام ئەدی چۆن بەجێیان هێشتوە؟ چۆن دەرفەتیان داوە بتەكان بشكێنی؟ وا پێدەچێ تێیان ڕانەبینیبێ، یاخود پێیان وابووبێ بتەكانیان بەرگریی لە خۆیان دەكەن، یاخود بەڵایەكی بەسەر دەهێنن، بۆیە وا پشت ئەستوور بوون، یاخود ڕەنگە پێیان وابووبێ ئەو هەڕەشەیەی كە دەیكات بە جیددیی نیە، ئەگەرنا دەبوایە پاسەوان و ئێشكچییان لە بتخانەكەیاندا دانابان، بۆ ئەوەی ئاگادارییان لێ بكەن، بەڵام ڕەنگە وەك گوتم: یان بڕوایان وابووە ئەو بتانە بەرگریی لە خۆیان دەكەن، هەر كەسێك بە مەبەستی خراپە توخنیان بكەوێ، زیانی پێ دەگەیەنن، یان مەبەستیان ئەوە بووە: ئیبڕاهیم ناوێرێ شتی وا بكات، تەنیا قسەیەكی كاتی هەڵچوون و تووڕەبوونە، كردوویەتی، ﴿ فَجَعَلَهُمْ جُذَاذًا ﴾، گێڕانی بە شكاو و پكاو.

(**جُذَاذ**) یاخود (**جِذاذ**) كۆی (**جُذاذة**)یە، شتێكی ڕەق كە شكابێ، پارچە پاچەكانی پێیان دەگوترێ: (**جُذَاذ**)، واتە: وردو خاشی كردن و، كردنی بە لەتك و پەتكی ورد، لەبەر ئەوەی بتەكان لەبەردو شووشە و ئەو شتانە بوون، كە بشكێنرێن، یاخود ئەگەر لە دارو تەختەش بووبن، تەشوویەكی بەدەستەوە گرتوە و وردو خاشی كردوون، ﴿ إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ ﴾، جگە لە گەورەیەكیان، واتە: بتە گەورەكەیانی هێشتەوە، ﴿ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴾، بەڵكو بگەڕێنەوە بۆ لای، ئەمە یان بە توانج و تەوسەوەیە، واتە: بگەڕێنەوە بۆ لای: تۆ كە گەورەی ئەو بتانە بووی، بۆچی ئاگات لەوانە نەبوو، كێ ئەو بتانەی شكاندوون، پێمان بڵێ و هەواڵمان پێبدە؟

یاخود ﴿ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴾، ئەم ڕاناوی (إِلَيْهِ) بۆ خوا دەگەڕێتەوە، بەڵكو بۆ لای خوا بگەڕێنەوە، كە وەك چۆن ئەو بتە گەورە قبووڵی نەكردوە،

ئەو بتە گچکانە لەگەڵیدا بپەرسترێن، خوای پەروەردگاریش چۆن قبووڵ دەکات، هەندێ لە دروستکراوەکانی لەگەڵیدا بپەرسترێن؟

هەندێکیش گوتوویانە: ﴿لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ﴾، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە لای ئیبراهیم و، سەرەنجام بانگی بکەن و، دادگایی بکەن و، ئەویش پەیامی هەقی خوایان پێ ڕابگەیەنێ، لە کاتی وتویێژ و دیالۆگ لەگەڵیاندا، بەڵام وا پێدەچێ زیاتر ئەوەی یەکەمیان مەبەست بێ، واتە: بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو بتە گەورەیە.

﴿قَالُواْ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، گوتیان: کێ ئەوەی بە پەرستراوەکانمان کردوە، بە دڵنیایی ئەو لە ستەمکارانە؟ ئەوەی بە پەرستراوەکانمان کردوە، واتە: ئاوا سەرو گوێی شکاندوون و، کردوونی بەلەت و پەت.

﴿قَالُواْ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ﴾، گوتیان: گوێمان لە گەنجێک بوو باسی دەکردن، واتە: بە خراپە باسی دەکردن و، دژایەتیی دەکردن، کە پێی دەگوترا: ئیبراهیم، یانی: بابایەکی نەناسراو بووە، ڕەنگە ئەو کاتە ئیبراهیم گەنج بووبێ و، تازە گەیبێتێ، یاخود ویستبێتیان نادیدەی بگرن، واتە: بابایەکی کەس نەناسە، بابایەکە کەس نایناسێ، بابایەکی نامۆیە و ناسراو نیە، وشەی (فَتًى)ش بۆ لە دوای باڵغ بوونەوە، بەکاردێ، ئەو کاتەی ئینسان دەکەوێتە حاڵەتی تین و تاقەت، واتە: لاو و گەنج، ﴿قَالُواْ فَأْتُواْ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ﴾، گوتیان: بە بەرچاوی خەڵکەوە بیهێنن، بەڵکو ببینن، یاخود بەڵکو ئامادەبن لە کاتی دادگایی کردنیدا، بچن سۆراغی بکەن و بیهێنن.

﴿قَالُوٓاْ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ﴾، دیارە خوای کارزان هەمووی دەپێچێتەوە، کە چوون لێی گەڕاون و سۆراغیان کردوە و پشکنیویانە، ئنجا داخۆ ئیبراهیم لە کوێ بووە، هێناویانە و ئامادەیان کردوە، ئنجا گوتیان: ئایا تۆ ئەوەت بە پەرستراوەکانمان کردوە، ئەی ئیبراهیم؟ نەیانگوتوە: تۆ شکاندووتن؟

یاخود تۆ لەت و پەتت کردوون؟ بەڵکو گوتوویانە: تۆ ئەوەت پێ کردوون؟ لە زاریان ڕا نەهاتوە کە پەرستراوەکانیان بە لەت و پەتکراو وەسف بکەن، یان بە شکاو و پکاو وەسف بکەن!

﴿ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ ﴾، ئیبراهیم گوتی: بەڵکو ئەو گەورەیان وایکردوە، لێیان بپرسن، ئەگەر دەدوێن، ئەگەر ئەوان قسە دەکەن و دەدوێن، لێیان بپرسن، گەورەکەیان وای لێکردوون، چونکە قبووڵی نەکردوە ئەوان لەگەڵیدا بپەرسترێن، لێرەدا (وەک دواتریش لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین) کە ئیبراهیم دەڵێ: بەڵکو گەورەکەیان وایکردوە، ئەو قسەیە ئاشکرایە لەگەڵ واقیعدا ناگونجێ، چونکە ئیبراهیم خۆی وایکردوە، ئنجا ئایا مەبەست پێی چییە؟ وا دێتە بەرچاو ئەو تەئویلە ڕاست بێ، وەک چۆن کەسێک لێت دەپرسێ: تۆ ئەو کتێبەت داناوە؟ تۆش لە وەڵامدا دەڵێی: نەخێر تۆ دابتاناوە! واتە: ئەدی ئەگەر من دام نەنابێ، کێ دایناوە؟ یان شتێک دەکرێ کەسێک دەپرسێ و دەڵێ: ئەرێ ئەوە کێ کردوویەتی؟ یەکێک دەڵێ: جەنابت کردووتە (بە تەوسەوە)، واتە: شتێکی وایە کە لە توانای تۆدا نیە، خۆتی لێ بکەی بە خاوەن، هەڵبەتە تەئویلی دیکەش کراون، کە دوایی باسیان دەکەین.

﴿ فَرَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ﴾، ئنجا گەڕانەوە بۆ لای خۆیان، واتە: چاویان بە خۆیاندا گێڕایەوە، کە دەڵێ: گەڕانەوە بۆ لای خۆیان، بێگومان خۆیان هەر لەگەڵ خۆیان بوون، بەڵام یانی: موراجەعەی خۆیان کردەوەو، چاویان بە خۆیاندا گێڕایەوە، ﴿ فَقَالُوٓا۟ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، لە نێو خۆیاندا هەندێکیان بە هەندێکیان گوت: بە دڵنیایی ئێوە ستەمکارن، ئەو شتانە دەپەرستن کە توانای قسەکردنیان نیە، نەک نەیانتوانیوە بەرگریی لە خۆیان بکەن، بەڵکو دوای ئەوەی کە شکێنراویشن، ئەوەتا بتە گەورەکەشیان توانای ئەوەی نیە، هەر هەواڵیشتان پێ بدات، کە کێ وایلێکردوون؟ کەواتە: ئێوە ستەم لە خۆتان دەکەن ئەوانە دەپەرستن، کە هیچ کارە نین و هیچیان لە دەست نایەت و، ئاوا دەستە پاچەن!

﴿ ثُمَّ نُكِسُوا عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ ﴾، دوایی هەڵگەڕانەوە بۆ سەر سەریان، (نَكْس) ئەوەیە شتێک لای خوارێی بکەیە لای سەرێ و، لای سەرێی بکەیە لای خوارێی، واتە: سەرەوبن بوونەوەو، لینگەو قوچ بوونەوەو، هەڵگێڕدرانەوە سەر سەریان، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ نُكِسُوا ﴾، واتە: هەڵگێڕدرانەوە، وەک ئیرادەو ویستی خۆیانیان لە دەستدا بێ، ئەگەرنا هەڵوێستەکە هەر هی خۆیان بووە، ئنجا لە پێشدا بە تەما بوون: بینە بەشەر، کە خۆیان تاوانبارو ستەمکار ناوزەند کرد، خەریک بوو ڕێگای ڕاست بگرن، بەڵام ئەوە هەر تاوێک بو و، هەر تۆزێک بوو کە فیترەت و خواڕسکیان هاتە هۆش و بێدار بوونەوە، خەریک بوو بێدار ببنەوە و وەک بەشەرو مرۆڤێکی عاقڵ و فامیدە قسە بکەن، بەڵام ئەوە هەر تۆزێک بوو، دوایی جارێکی دیکە هەڵگێڕدرانەوە سەرسەریان و، سەرەو بن کرانەوە، ﴿ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰؤُلَاءِ يَنطِقُونَ ﴾، گوتیان: تۆ دەزانی ئەوانە قسە ناکەن! (هَٰؤُلَاءِ) ڕاناوی کۆی عاقڵانیان بەکارهێناوە، چونکە پێیان وا بووە، ئەوانە (بتەکان) عاقڵن و، خاوەن ویست و هەست و شعوورن، گوتیان: تۆ دەزانی کە ئەوانە قسە ناکەن، چۆن لێیان بپرسین؟ چۆن لە گەورەکەیان بپرسین؟!

﴿ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْئًا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴾، گوتی: ئایا لە جیاتی خوا، لە خوار خواوە و لەگەڵ خوادا، شتێک دەپەرستن کە هیچ سوودێکتان پێ ناگەیەنێ و، هیچ زیانێکتان لێ نادات، تەنانەت قسەشتان لەگەڵ ناکات؟ ئیبراهیم ﷺ ئامانجە سەرەکییەکەی لە شکاندنی بتەکان و پاشان دادگایی کرانی، هەر ئەو دیالۆگە بووە کە بڵێ: ئەوەتا ئێوە شتانێک دەپەرستن کە هیچ سوودێکتان پێ ناگەیەنن و، هیچ زیانێکیشتان لێ نادەن و، تەنانەت توانای دووان و قسەکردن و هەواڵدانیشیان نیە!

﴿ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ ﴾، وشەی (أُفٍّ) ناوی کار (**إسم فعل**)ە، وەک (**صَهْ**) واتە: (**أسكت**) بێدەنگ بە، هەروەها (**دونك**) واتە: (**خُذْ**) بیگرە، (أُفٍّ) دەڵێ: (**كَلِمَة تَضَجُّرٍ وَتَكَرُّهٍ**) واتە: من بێزاریی دەردەبڕم و، نارەحەتیی

دەردەبڕم لە ئێوە و، لەوەی کە لە جیاتی خوا، یان لەگەڵ خوادا دەیپەرستن، ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾، ئایا نافامن؟ ئایا عەقڵتان بەکارناهێنن؟ کە نابێ شتێک بپەرستریّ نە سوودی هەیە و نە زیان و، نە توانای بەرگریی لەخۆ کردنی هەیەو، نە توانای دووانی هەیە؟

﴿قَالُواْ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓاْ ءَالِهَتَكُمۡ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ﴾، گوتیان: بیسووتێنن و پەرستراوەکانتان سەربخەن، ئەگەر ئێوە ئەنجامدەرن، واتە: ئەگەر ئەنجامدەری کارێکن کە سوودێکتان پێ بگەیەنێ، دەبێ هەر ئەوە بکەن.

ئنجا ئەمە هەمووی دەپێچێتەوە کە لە کتێبە مێژووییەکاندا هاتوە، چۆن داریان کۆکردوونەوە، ئەو کاتە سووتەمەنی زیاتر دار بووە، کۆڵە داریان هێناون و، داریان کۆکردوونەوە و کردوویانە بە لێژنەیەکی گەورە، ئنجا ئاگریان نێڵداوە و، بڵێسەی چۆتە ئاسمانێ و، لەسەری سەرەوە باڵندەی پرووکاندوون، ئنجا ئیبراهیم چۆن بخەنە نێو ئەو ئاگرەوە، کە بڵێسەی بەرەو کەهکەشان بەرز بۆتەوە، خۆیان نیزیک بینەوە خۆشیان دەسووتێن بە ئاگرەکە؟ ئیبراهیمیان خستۆتە نێو مەنجەنیق، مەنجەنیق وەک تۆپهاوێژ (**مدفع**) وابووە، وەک ئەوەی کە تۆپ و هاوەنی پێ هەڵدەدرێ، خستوویانەتە نێو مەنجەنیقەوەو، بەو مەنجەنیقە هەڵیانداوەتە چڵە پۆپەی ئاگرەکە، بۆ ئەوەی بچێتە نێو ئاگرەکە لە باری سەرێیەوە، ئنجا هەندێک کەس وا دەزانێ کە مەنجەنیقەکە خودی ئاگرەکەیە، دەڵێ: مەنجەنیقیان بۆ داخست، نا، مەنجەنیق ئەوە بووە کە پێیان هەڵداوەتە نێو ئاگرەکە و، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ یەکەمجار لە نیوە دوورگەی عەرەبییدا هەر کام لە دەبابە و مەنجەنیقی بەکارهێناون، لە جەنگ دا لە دژی کافرەکان، بە تایبەت لە کاتێکدا کە قەڵاکانی شاری (**طائف**)یان ئابڵووقە داون، مێژوونووسان دەڵێن: لە نیوە دوورگەی عەرەبیی دا، بۆ یەکەم جار دەبابە و مەنجەنیق لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لە لایەن سوپای ئیسلامەوە بەکارهاتوون، دەبابەی ئێستاش، هەر لەسەر شێوەی دەبابەی ئەو کات دروستکراوەتەوە، کە شێوەیەکی سادەی هەبووە،

لە نێوە دوورگەی عەرەبییدا بۆ یەکەمجار، ئەگەرنا پێشتر دیارە لەنێو دەوڵەتانی دیکەدا هەبووە.

﴿ قُلْنَا يَـٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَـٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴾، ئێمەش گوتمان: ئەی ئاگر! سارد بە و سەلامەت بە (واتە: بێ زیان بە) لەسەر ئیبراهیم، ﴿ وَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَـٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ ﴾، ئەوان پیلانیان لە دژی گێڕا، پیلان و فێڵیان بۆی ویست، بەڵام ئێمە ئەوانمان گێڕا بە زیانبارترین، واتە: فێڵەکەیان هیچ زیانێکی بە ئیبراهیم نەگەیاندو، ماندووبوونەکەشیان بە فیڕۆ چوو، تێشیدا شەرمەزارو عەیبدار بوون.

﴿ وَنَجَّيْنَـٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَـٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَـٰلَمِينَ ﴾، ئەویش و لووطیشمان دەربازکرد بۆ ئەو سەر زەمینەی کە پێزمان تێخستوە و، بەرهەمدارو بەرەکەتدارمان کردوە، بە دڵنیایی مەبەست پێی سەر زەمینی شامە، بە زۆر بەڵگان، یەکێک لە بەڵگەکان ئەوەیە هەر لە قورئاندا، خوا ﷻ لە سەرەتای سوورەتی (**الإسراء**) ئایەتی (١)دا دەفەرموێ: ﴿ سُبْحَـٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَـٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَـٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾، وەک لە تەفسیری سوورەتی (**الإسراء**)دا بە تەفسیل باسمان کردوە.

﴿ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً ﴾، ئیسحاق و یەعقووبمان بە زیادە پێ بەخشین، ﴿ وَكُلًّا جَعَلْنَا صَـٰلِحِينَ ﴾، هەر کامێکیانمان گێڕا لە چاکان، کە دەفەرموێ: ﴿ نَافِلَةً ﴾، واتە: بێ ئەوەی خۆی (ئیبراهیم) داوای کردبێ، ئیسحاقمان پێبەخشی و، دواتریش یەعقووبیش کە کوڕی ئیسحاقە و ئیبراهیم عليه السلام یەعقووبیشی هەر بینیوە، وەک نەوەی خۆی، لەبەر ئەوەی کاتێک ئیبراهیم دەپاڕێتەوە، خوای پەروەردگار ئیسماعیلی پێدەدات، بەڵام بە بێ پاڕانەوە، ئیسحاقی پێداوە و، دوای ئیسحاقیش یەعقووبی بە ئیسحاق داوە، کە نەوەی ئیبراهیمە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ نَافِلَةً ﴾، چونکە (نَافِلَةً ) بریتیە لە: زیادە لە شتی داواکراو و فەرزکراو، یاخود زیادە لەوەی کە تۆ هەتە.

﴿ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا ﴾، گێڕاشمانن بەسەر مەشق و پێشەوا بۆ خەڵک، کە بە فەرمانی ئێمە خەڵکیان ڕێنمایی دەکرد، ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ ﴾، ئەنجامدانی کردەوە باشەکانمان بۆ سروشکردن، هەروەها بەرپاکردنی نوێژ و زەکاتدان، بەرپاکردنی نوێژ و زەکات، کاکڵەی کردەوە باشەکانن، ئەوە پێی دەگوترێ: (**ذِكْرُ الخَاصّ بَعْدَ العَام**)، باسی شتی تایبەت دوای شتی گشتیی، ئەگەرنا (فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ ) ئەنجامدانی کردەوە چاکەکانە و، دیارە لە نێو کردەوە چاکەکاندا، کردەوە چاکترەکانی نوێژ و زەکات لە هەموویان تایبەتترن، بۆیە خوا ﷻ دوای ئەوەی بە گشتیی باسی کردەوە چاکەکانی کردوە، بە تایبەتی باسی نوێژ و زەکات دەکات، ﴿ وَكَانُواْ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴾، ئەوان بۆ ئێمە پەرستەر بوون و، ملکەچ بوون و، فەرمانبەر بوون و بەندایەتییان بۆ ئێمە ئەنجام دەدا.

ئنجا لە کۆتاییدا ئاماژەیەکی کورت دەکات بە بەسەرهاتی لووط عليه السلام: ﴿ وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ﴾، هەروەها حیکمەت و زانیارییشمان بە لووط بەخشیبوو، ﴿ وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ﴾، لەو ئاوەدانییەی کە کردەوە قێزەون و خراپەکانیان ئەنجام دەدان، یانی: لە خەڵکەکەیان، خەڵکی ئەو شارەی کردەوە قێزەون و خراپ و تاوانەکانیان ئەنجام دەدان (کە یەکێکیان بریتی بوو لە نێربازیی) دەربازمان کرد، ﴿ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَوْمَ سَوْءٍ فَٰسِقِينَ ﴾، بێگومان ئەوان خەڵکێکی خراپەکارو ناقۆڵا و ناشیرین و، لارێ و لادەر بوون، ﴿ وَأَدْخَلْنَٰهُ فِى رَحْمَتِنَآ ﴾، خستمانە نێو بەزەیی خۆمانەوە، ﴿ إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەو لە چاکان بوو، لەو بەندە چاکانەی خوا بوو، کە چاکە نەبێ لێی چاوەڕوان نەدەکرا.

ئێمە بەسەرهاتی لووطیشمان عليه السلام، پێشتر بە تەفصیل لە تەفسیری سوورەتی (هود)دا باسکردوە، لێرەش خوای موتەعال تەنها ئاماژەیەکی کورتی پێداوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بەسەرهاتی ئیبراهیم ﷺ کە خوا ﷻ پێشتر سەر ڕاستیی و بە ئامانج گەیشتنتی پێدا بوو، پێی زانا بوو، باسی وتووێژی لەگەڵ بابی و گەلەکەیدا، لەسەر پووچیی بیرۆکەی بتپەرستیی و، بیانووی ئەوان بەوە کە پێشینانیان لەسەر ئەو ڕێچکەیە بینیوە و، ڕەخنە گرتنی ئیبراهیم ﷺ لە خۆیان و باب و باپیرانیان و، ڕاگەیاندنی خاوەنداریتیی و پەروەردگاریتیی خوا بۆ ئەوان، کە هاو کات خاوەن و پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە و، هەڕەشەکردنی بە شکاندنی بتەکانیان و، جێبەجێکردنی هەڕەشەکەی و، وردو خاشکردنی پەیکەری بت و صەنەمەکانیان، جگە لە بتە گەورەکەیان بۆ ئەوەی بۆ لای بگەڕێنەوە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٦﴾ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾ فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴿٥٨﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئێمە پێشتر سەر ڕاستییمان بە ئیبراهیم بەخشیبوو، ئەمە بۆچی تەئكید کراوەتەوە؟ پێشتریش گوتوومانە: (و) بۆ

بادانەوە و گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتەیە، بۆ سەر بەسەرهاتی پێشێ، بەڵام ئایا (ل) لامی سوێند (**لام القَسَم**) یاخود لامی زەمینە خۆشکەر (**لام الْمُمَهِّدة للقسم**) لەگەڵ (**قَدْ**) کە بۆ ساغکردنەوە (**تحقیق**) و دڵنیاکردنەوە و جەختکردنەوەیە، بۆچی بەکارهاتوون؟ وەڵامەکەی: (**تَأْكِيْدُ الخَبَرِ لِتَنْزِيْلِ العَرَبِ مَنْزِلَةَ الْمُنْكِرِ لِكَوْنِ إِبْرَاهِيم أُوتِي رُشْدَاً مِنْ قَبْلِ أَنْ يُؤتَى مُوسَى التَّوْرَاة**)، واتە: ئەم هەواڵە بۆیە جەختی لەسەر کراوەتەوە، وەک گەلی عەرەب {کە یەکەمین دوێنراوی قورئان بوون، ئەگەرنا بۆ هەموو گەلانی دیکەش دابەزێنراوە} نکووڵیی بکەن لەوەی کە ئیبراهیم ﷺ پێغەمبەری خوا بووە و، بەرلەوەی مووسا تەوراتی بدرێتێ، ئەو سەر ڕاستیی پێداوە، بە بەڵگەی ئەوە کە ئەوان جگە لە خوا بت دەپەرستن، لە حاڵێکدا کە خۆشیان بە شوێنکەوتووی ئیبراهیم دەزانن، ئنجا ئەوان هەرچەندە بە زمانی وتار (**مَقَال**) دەڵێن: ئیبراهیم باپیرەمانە و، لەسەر ڕێبازی ئەوین، بەڵام بە زمانی حاڵ پێچەوانەی ئیبراهیم دەجووڵێنەوە، بۆیە خوا ﷻ وا دەیاندوێنێ کە: ئێوە نکووڵیی دەکەن لەوەی ئیبراهیم ﷺ پێش مووسا و هاڕوونی برای، سەر ڕاست کراوەو بە ئامانج گەیەنراوە و، هەق و ڕاستیی پێدراوە و لێی حاڵیی کراوە، بە بەڵگەی ئەوە کە ئێوە وەک ئەو ناکەن.

پێشتریش گوتمان: (**رُشْد**) واتە: (**إِصَابَةُ الصَّوَاب**) پێکانی ڕاستیی، بە ئامانج گەیشتن، سەر ڕاستیی.

٢)- ﴿وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ﴾، ئێمە پێشتر پێی زانا بووین و ئاشنا بووین، واتە: ئێمە پێشتر پێی زانا بووین و ئاشنا بووین، کە شایستەی ئەوەیە ئەو چاکەیەی لەگەڵدا بکەین و، بەو شێوەیە ڕێزی لێبگرین.

ئنجا دێتە سەر باسی بەسەرهاتەکەی لەگەڵ بابی و گەلەکەیدا:

٣)- ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ﴾، یاد بکەوە! کاتێک بە بابی و بە گەلەکەی خۆی گوت، بێگومان بابی (ئازەر) بووە، وەک لە سوورەتی (**الأنعام**)دا هاتوە و، بە درێژیی لەوێدا باسمان کردوە، ئنجا هەندێک لە توێژەرەوانی قورئان، کە پێم وایە زیاتر لە ژێر کاریگەریی

هەندێک لە زانایانی شیعە دان، دەڵێن: ئازەر مامی ئیبراهیم بووە، چونکە ئەوان قەناعەتیان وایە کە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، ناگونجێ بابیان کافر بووبێ، وەک بەرگریی کردنێک لە ئەبووتاڵیبی مامی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش بە مسوڵمان دادەنێن، بەڵام بە هەر حاڵ ئەو قسەیە هیچ نیە، لە کاتێکدا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ٧٤﴾ الأنعام، واتە: کاتێک ئیبراهیم بە بابی خۆی ئازەری فەرموو: ئایا تۆ بتان دەکەیە پەرستراو، من خۆت و گەلەکەت لە گومڕاییدا دەبینم، یان لە سوورەتی (مريم)دا، کە بە تەفصیل لەوێشدا مشت و مڕی دەبێ لەگەڵ بابیدا، (**يا أبت**) (**يا أبت**) ئەی بابی خۆم! ئەی بابی خۆم! ئنجا ئەگەر مامی بووایە، یەکجار دەیگوت: ئەی مامی خۆم!

بۆیە ئەو قسانە هیچ نین، کە پێچەوانەی ڕواڵەتی قورئانن و، ئەو قسانە لە ژێر کاریگەریی تەئویل و پینە و پەڕۆیەکدان، کە مەبەستێک ئەو جۆرە کەسانە ناچار دەکات، بیکەن، ئەگەرنا ڕواڵەتی ئایەتەکان چۆنە بە پێی زمانی عەرەبیی، دەبێ ئاوا لێکی بدەینەوەو بەملاولادا نەچین!

کاتێک ئیبراهیم بە بابی و بە گەلەکەی گوت:

٤)- ﴿مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِيٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ﴾، ئەم پەیکەرانە چین کە ئێوە پێیانەوە پەیوەستن؟ وشەی (**عَٰكِفُونَ**) (**ضُمِّنَ عَاكِفُونَ مَعْنَى العِبَادَة فَعُدِّيَ بِاللام**)، (**عَكَفَ لَهُا**) ئەصڵی خۆی (**عَكَفَ عِنْدَها**)یە، لە لای مایەوە و پێیەوە پەیوەست بوو، بەڵام کە دەفەرموێ: (**عَكَفَ لَها: يَعْنِي عَكَف عِنْدهَا عَابِداً لَهَا**)، لێرەدا وشەی (**عَٰكِفُونَ**) هەم مانا ئەصڵییەکەی خۆی، کە بریتیە لە پەیوەست بوون، دەگەیەنێ و، هەم بە هۆی ئەوەوە کە تێپەڕی پێکراوە بە (ل) مانای پەرستنیشی خراوەتە نێو، واتە: (**أنْتُم لَهَا عَابِدُون وَعَاكِفُون عِنْدَهَا**) ئێوە پەرستەری ئەو پەیکەرانەن و، پێشیانەوە پابەندن و لەلایان دەمێننەوە.

(**الإِنْـكَارُ مُنْصَـبٌّ عَـلَى عِبَادَتِهِـم لِلأَصْنَـام، لَكِـنْ جَـاءَ الإِسْـتِفْهَامِ عَـنْ ذَاتِ الأَصْنَـام لإِسْـتِنْطَاقِهِم بِمَـا يُرِيْـد!**)، بێگومـان نکووڵییکردنەکـەی ئیبراهیـم عليه السلام ڕووی پـێ

لە پەرستنیان بۆ پەیکەرەکان کراوە، بەڵام کە دەڵێ: ﴿مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ﴾، پرسیارکردنەکە لە بارەی خودی پەیکەرەکانەوەیە، مەبەستی ئەوەیە کە لەسەر زمانی خۆیان دانیان پێ پێدا بێنێ، کە بۆچی ئێوە لە لای ئەو بتانە دەمێننەوە و دەیانپەرستن و بە گەورەیان دەگرن؟ تاکو خۆیان تەعبیر بکەن لەو هاندەرو پاڵنەرەی کە وای لێکردوون ئەو پەیکەرانە بپەرستن، کە سەرەنجام دەڵێن:

٥)- ﴿قَالُواْ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ﴾، گوتیان: باب و باپیرانی خۆمان وا بینیون کە پەرستەریان بوون،پەرستەری ئەو پەیکەرانە بوون،واتە:پەرستنی ئەو پەیکەرو بت و صەنەمانە، نەریتێکی لە مێژینەی ئێمەیە و، بەشێکە لە کەلتوورمان و، بەشێکە لە نەریتێکی لە مێژینەمان، کە هەروا بووین، ئنجا ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە هەر کەسێک بەڵگە بێنێتەوە، بەوەی کە شتێک دەکات، یان شتێک دەڵێ، کە لە پێش ئەودا کراوە و گوتراوە، بەبێ ئەوەی سەرنج بدات: کە ئەو شتەی لە پێش ئەودا کراوە و گوتراوە، ڕاستە یان چەوتە؟ لە ڕاستییدا ئەوە بزانێ یان نەزانێ، دانی پێدابنێ یان نەهێنێ، نەریتی کافرو بتپەرستەکانی ڕەچاو کردوە، کە بە داخەوە ئەوە کەم و زۆر لە نێو ئەهلی ئیسلامیشدا هەیە، ئنجا کەسێک کە عادەتێک، یان نەریتێک، یان هەڵوێستێک، یان شتێک دەکات، چ وەک دینداریی، چ وەک دنیاداریی، چ وەک لایەنی کۆمەڵایەتیی، چ وەک لایەنی سیاسیی، چ وەک لایەنی خێزانیی و، پێی دەڵێی: بۆچی وا دەکەی؟ دەڵێ: ئێمە هەر عادەتمان وایە، یان هەروا بووە، یان ئەوە بەشێک بووە لە کەلتوورمان، یان فلان زانا وایگوتوە!! هەر بۆیە زانایان گوتوویانە: (أَقْوَالُ العُلَمَاءِ يُسْتَدَلُّ لَهَا وَلَا يُسْتَدَلّ بِهَا)، واتە: قسەی زانایان بەڵگەی لەسەر دەهێنرێتەوەو، بە بەڵگە ناهێنرێتەوە، نابێ بڵێی: من بۆیە وا دەکەم، چونکە فلان زانا وایگوتوە، ئایا کە فلان زانا وایگوتوە، بەڵگەی چییە؟ ئەگەر نا قسەی هیچ کەس لە خودی خۆیدا دین نیە، جگە لە هی خوا ﷻ و، پاشان پێغەمبەر ﷺ، ئەویش دوای ئەوەی: ئەگەر ڕاستەوخۆ وەحیی خوا بووبێ، گەیاندبێتی، بەڵام ئەگەر ئیجتیهادو هەڵهێنجانی خۆی بووبێ، دوای ئەوەی خوای پەروەردگار دانی بۆ پێدا هێناوە و، چەسپاندوویەتی، لەسەر ئەو کۆشش و ئیجتیهادەی و، بە ڕاست و لە نیشانە دەری لە قەڵەم دابێ.

٦)- ﴿قَالَ لَقَدۡ كُنتُمۡ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمۡ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾، ئیبراهیم گوتی: بە دڵنیایی خۆتان و باب و باپیرانتان لە گومڕاییەکی ڕووندا بوون، کە دەفەرمویٚ: ﴿فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾:

**یەکەم:** گومڕایی چوێنراوە بە چاڵێک و جلێتاوێکەوە کە ئەوانیش کەوتوونەتە تێی، تێینیشتوون و تێیدا نغرۆ بوون، واتە: زۆر بە گومڕاییدا چوونە خوار.

**دووەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾، واتە: گومڕاییەکە ڕوونە، لە هەموو کەس دیارە کە ئەوە گومڕاییە، هەر کەسێک بە عەقڵی سەلیم تێی بفکرێ و تەماشا بکات، دەزانێ کە ئەوە گومڕاییە و سەرگەردانیی و سەرلێشێواوییە، مسوڵمان دەبێ بەو شێوەیە بێ لەگەڵ خەڵکدا و، ئەو شتانەی پێویستە بە ڕوونیی بگوترێن، بە ڕوونیی ڕاشکاویی بیانڵێ و، لەبەر خاترخوازیی و ڕوو دەربایسیی و دڵی خەڵک ڕاگرتن، هەق نەخاتە ژێر لێو، بە منجە منج و لە پەنادا نەیڵێ، بە توێکڵەوە نەیڵێ، بەڵکو بە کاکڵیی و بە ڕوون و ڕاشکاویی بیخاتە بەر دەستیان، بە تایبەت مەسەلەکانی ئیمان و عەقیدە، سنوورەکانی حەڵاڵ و حەرام، ڕاست و چەوت، ئنجا چ لە بواری هەڵسوکەوتەکان و، چ لە بواری ڕەوشت و ئاکارەکان دا، پێغەمبەریش ﷺ هەروا بووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەوپەڕی ڕەوشتی بەرز و جوانی هەبووە و، ئەو پەڕی نەرم و نیانیی هەبووە و، ئەو پەڕی هێدیی و مەندیی هەبووە، بەڵام کەسێک کە قسەیەکی هەڵەی کردبێ، کە لەگەڵ ئیمان و عەقیدەدا تێک بگیرێ، یاخود لەگەڵ تەنیا خواپەرستییدا تێک بگیرێ، یاخود ناڕاست و چەوت بووبێ، یەکسەر بە زەقیی و بە ڕوون و ڕاشکاویی ئاگاداری کردۆتەوە، بۆ وێنە:

١)- {عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ أَنَّ رَجُلاً خَطَبَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ مَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ رَشَدَ، وَمَنْ يَعْصِهِمَا فَقَدْ غَوَى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بِئْسَ الْخَطِيبُ أَنْتَ، قُلْ: وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ»} (أخرجه مسلم: ٢٠٤٧، وأبو داود: ١١٠١، وابن حبان: ٢٧٩٨، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح).

واتە: پیاوێک لە لای پێغەمبەر ﷺ وتاری دا، گوتی: هەرکەس فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، سەر ڕاست بووە و، هەرکەسیش سەرپێچییان لێ بکات بێمراد بووە، پێغەمبەری خواش فەرمووی: تۆ وتاربێژێکی خراپی! بڵێ: هەرکەس سەرپێچیی لە خواو لە پێغەمبەرەکەی بکات.

هەروەها لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە:

**٢)- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ مَا شَاءَ اللَّهُ وَشِئْتَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: أَجَعَلْتَنِي وَاللَّهَ عَدْلًا بَلْ مَا شَاءَ اللَّهُ وَحْدَهُ} (أخرجه أحمد: ١٨٣٩، والنسائي في الكُبرى: ١٠٨٢٥).**

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازبێ)، دەڵێ: پیاوێک بە پێغەمبەر ﷺی گوت: ئەگەر خواو تۆ بتانەوێ و ویستتان لەسەر بێ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا منت کردە هاوتای خوا؟ (چۆن دەبێ بەو شێوەیە قسە بکەی؟) بەڵکو بڵێ: بە تەنیا ئەگەر خوا بیەوێ.

**٣)- {عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: تَصَدَّقَ عَلَيَّ أَبِي بِبَعْضِ مَالِهِ، فَقَالَتْ أُمِّي عَمْرَةُ بِنْتُ رَوَاحَةَ: لاَ أَرْضَى حَتَّى تُشْهِدَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَانْطَلَقَ أَبِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِيُشْهِدَ عَلَى صَدَقَتِي، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفَعَلْتَ هَذَا بِوَلَدِكَ كُلِّهِمْ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: اتَّقُوا اللَّهَ وَاعْدِلُوا فِي أَوْلاَدِكُمْ، فَرَجَعَ أَبِي، فَرَدَّ تِلْكَ الصَّدَقَةَ»} (أخرجه البخاري: ٢٥٨٧، ومسلم: ١٦٢٣، واللَّفظ لمسلم).**

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: بابم لە هەندێک لە ماڵەکەی بە دیاریی دایمێ، دایکیشم کە عومڕەی کچی ڕەواحە گوتی: ڕازی نابم هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ شایەد نەبێ لەسەری، بابیشم چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی شایەد بێ، لەسەر ئەو ماڵەی بە منی داوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئایا ئەو کارەت بۆ هەموو منداڵەکانت کردوە؟ گوتی: نەخێر، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: پارێز لە خوا بکەن و، لە نێوان منداڵەکانتان دا دادگەربن، بابیشم گەڕایەوەو دیارییەکەی لێوەرگرتمەوە.

٤)- {عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كُنْتُ غُلَامًا فِي حَجْرِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَا غُلَامُ سَمِّ اللهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ، فَمَا زَالَتْ تِلْكَ طِعْمَتِي بَعْدُ} (أخرجه البخاري: ٥٣٧٦).

عومەری کوڕی ئەبوو سەلەمە (خوا لێیان ڕازیبێ) دەڵێ: من گچکە بووم، لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم، دەستم لە قاپەکە دەگێڕا (لە کاتی خواردندا)، {دیارە (بسم الله)شی نەکردوە}، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی کوڕیژگە! ناوی خوا بهێنە و، بە دەستی ڕاستت بخۆ و، لە پێش خۆشتەوە بخۆ، ئیدی بەردەوام دوای ئەوە، خواردنی من هەر وابوو.

بە یەک ڕستە، سێ ئەدەبی بەرزی نانخواردنی فێرکردوون، ئیدی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا پێویست بووبێ کە هەق ڕابگەیەنرێ، بە ڕوون و ڕاشکاویی و بە کورتیی و پوختیی گەیاندوویەتی، لێرەشدا ئیبراهیم ﷺ زۆر بە ڕوونیی دەڵێ: خۆتان و باب و باپیرانتان لە گومراییەکی ڕووندا بوون.

٧)- ﴿ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا بِٱلۡحَقِّ أَمۡ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴾؟، پێیانگوت: ئایا تۆ هەقت بۆ هێناوین؟ یاخود تۆ لە گاڵتە کەرانی، واتە: گومانیان هەبوو، ئایا بە جیددیی ئیبراهیم ئەو قسەیان لەگەڵدا دەکات، یاخود جەفەنگ و گاڵتەیان لەگەڵدا دەکات؟ پێیان شتێکی زۆر چاوەڕوان نەکراو بووە، کە گەنجێکیان (ئیبراهیم) لێ پەیدابێ، ڕەخنە بگرێ لە بت پەرستیی و پەیکەر پەرستیی ئەوان، کە چەندان جیلی لەسەر ڕاوەنەوە، بۆیە لە جیاتی ئەوەی بڵێن: ئایا بەڕاستتە؟ (أَأَنْتَ جَادٌّ)، گوتوویانە: ﴿ أَجِئۡتَنَا بِٱلۡحَقِّ ﴾، ئایا تۆ هەقت بۆ هێناوین؟ واتە: ئایا بە جیددییتە کە ئەو قسانە دەکەی؟

﴿ أَمۡ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴾، یان تۆ لە گاڵتەکەرانی؟ (لاعِب) واتە: یاریزان، کەسێک کە یاریی و گەمە دەکات بە شتێک، بەڵام لێرەدا واتە: گاڵتەکردن بە قسە، جاری وا هەیە کەسێک کەسێکی دیکە دەدوێنێ بە گاڵتە و بە جەفەنگ، ئەوانیش جۆرێک لە نەرمیی نواندن (مُلَاطَفَة)ی ئیبراهیمیان ﷺ کردوە، نەیانگوتوە: ئایا تۆ بە ڕاستیتە؟ یاخود تۆ قسەیەکی باتڵ و ناهەقمان لەگەڵدا دەکەی؟.

٨)- ﴿ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ ﴾، فەرمووی: بەڵکو پەروەردگارتان پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە، کە هێناونیە دی، (فَطَرَهُنَّ أي: أَبْدَعَهُنَّ وَ أَوْجَدَهُنَّ) وەدیهێناون و پەیدای کردوون، واتە: لە نەبوونەوە هێناونیە دی، واتە: نەک هەر گاڵتە ناکەم، نەک هەر هەقم بۆ هێناون و بە جیددییمە، بەڵکو خاوەن و پەروەردگاری ئێوە، ئەو کەسەیە کە خاوەن و پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە کە هێناونیە دی، واتە: ئێوەشی لە نێو ئەو ئاسمان و زەوییەدا هێناوەتە دی.

٩)- ﴿ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾، من لەسەر ئا ئەو ڕاستییەی کە پێتان ڕادەگەیەنم لە شاهێدانم، (شَاهد) وەک پێشتریش گوتمان: کەسێکە بڵێ: ئەو شتە بە هەق دەزانم و، بتوانێ ئیسپاتیشی بکات، ئنجا (شَاهد) دەگونجێ لێرەدا لە: (شَهِدَ)، واتە: (حَضَر) ئامادە بوو، لە لای ئەو شتە کە ئەنجامدرا، یاخود لە: (شَهِدَ) بە واتای (رَأى) بينى؛ بێ، واتە: من شایەدیی دەدەم وەک چۆن کەسێک لەوێ بووبێ، کە ئەو کارە ئەنجام دراوە، یاخود ئەو بینیوەتی کە ئەو کارە ئەنجام دراوە، واتە: من ئامادەم بۆشتان بسەلمێنم و ئیسپاتی بکەم، کە پەروەردگاری ئێوە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە، کە هێناونیە دی.

کە دەفەرموێ: ﴿ مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾، واتە: لەوانەی کە شایەدییان داوە بە یەکتایی خوا، لە کات و شوێنە جۆراو جۆرەکاندا، من یەکەم کەس نیم و دوا کەسیش نابم.

١٠)- ﴿ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم ﴾، سوێند بە خواش، پیلانێک لە دژی بتەکانتان دەگێڕم، (التَاءُ تَخْتَصُّ بِالقَسَمِ عَلَى أَمْرٍ مُتَعَجَّبٍ مِنْهُ، وَتَخْتَصُّ بِاسمِ الجَلالَةِ)، واتە: پیتی (ت) کە سوێندی پێ دەخورێ، تایبەتە بە سوێند خواردن لەسەر شتێک کە جێی سەرسوڕمان بێ و، تایبەتیشە بە بێژەی (ألله)وە، ناوی خوا ﷻ.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەستی ئەوە بووە کە بتەکانیان دەشکێنێ، بەڵام شکاندنی بتەکانی ناو ناوە (كَيْد) واتە: پیلان، لەسەر شێوەی خواستنەوە و وشەی (كَيْد)ی خواستوەتەوە بۆ شکاندنیان، یاخود بۆ وێکچوون (مشاكلة)، چونکە ئەوان پێیان

وابووه ئەو بتانە بەرگریی لە خۆیان دەكەن و، هیچ كەسێك ناتوانێ زیانیان پێ بگەیەنێ، مەگەر بە شێوەی پیلان و فێڵ و نەخشەی پەنهان دانان، ئنجا بە پێی عەقڵی ئەوان ئیبراهیم دواندونی، كە من بە شێوەیەك وەك بچێتە قاڵبی فێڵ و نەخشەیەكی پەنهانەوە، زەفەر بەو پەیكەرانەتان دەبەم و، شتێكیان بەسەر دێنم.

١١)- ﴿بَعۡدَ أَن تُوَلُّواْ مُدۡبِرِينَ﴾، دوای ئەوەی ئێوە دەڕۆن و لێرە نامێنن.

هەڵبەتە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: دەبێ ئەوە لە دڵی خۆیدا وایگوتبێ، ئەگەرنا چۆن ڕێگایان دەدا، ئەو هەڕەشەیە بكات، ئنجا لێشی بگەڕێن و شوێنەكەی بەجێ بهێڵن و، مەیدانەكەی بۆ چۆڵ بكەن، بەڵام دەگونجێ كە:

أ- ئەوان قەناعەتیان وابووبێ كە ئیبراهیم هەروا هەڵچوونێكی كاتییە و، تووڕە بووە، قسەیەكە لە كاتی تووڕەییدا كردوویەتی، واتە: بە جیددیی نیە كە شتێك بەسەر بتەكان بهێنێ.

ب- ڕەنگە قەناعەتیان وابووبێ، كە ئەو بتانە بەرگریی دەكەن لە خۆیان و، هەر كەسێك كە دەستیان بۆ بەرێ بە خراپە، تووشی بەڵای دەكەن، بۆیە لێی دڵنیا بوون، كە ناتوانێ زیانیان لێ بدات.

ئەگەرنا بەڵگە لەسەر ئەوە لە دڵی خۆیدا نەیگوتوە، بەڵكو بە ئاشكرا و بە ڕوونیی پێی گوتوون، ئەوەیە كە دوایی لە درێژەی ئایەتەكاندا دەفەرموێ: ﴿قَالُواْ سَمِعۡنَا فَتًى يَذۡكُرُهُمۡ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبۡرَٰهِيمُ﴾، گوتیان: گوێمان لە گەنجێك بوو، گوێبیستی لاوێك بووین، باسی دەكردن، باسكردنەكەی ئێرەیە، كە دەڵێ: دوای ئەوەی ئێوە دەڕۆن، شتێكیان بەسەر دەهێنم، مادام وایە كەواتە: بە ڕوونیی و ڕاشكاویی باسی كردوون، واتە: هەڕەشەی لێكردوون و، بە خراپە باسی كردوون.

١٢)- ﴿فَجَعَلَهُمۡ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمۡ﴾، خوا ﷻ ئەوە هەموو دەپێچێتەوە كە ئەوان ڕۆیشتن، ئنجا ئایا بۆ جەژن بوو، چ بۆنەیەكیان هەبوو؟ هەندێك دەڵێن: جەژنی

نەورۆز بووە، گرنگ ئەوەیە چوونە دەشت و دەر، لە نێو شاردا نەماون، یاخود لە نێو پەرستگاکەدا نەماون، ئەویش چووە بۆ نێو پەرستگاکە و، هەموویانی وردو خاشکردن، جگە لە گەورەکەیان، ئەو بتەیان کە لە هەموویان گەورەتر بوو هێشتیەوە.

١٣)- ﴿لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ﴾، بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ لای، واتە:

أ- بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو بتە گەورەیەو، پرسیاری لێ بکەن: کێ وای بەسەر هێناون و کێ وای لێکردوون؟

ب- یاخود بگەڕێنەوە بۆ لای ئیبراهیم ﷺ لێی بپرسن: بۆچی وات لێ کردوون؟ ئەویش بۆیان ڕوون بکاتەوە.

ج- یاخود بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ لای خوا ﷻ و، بزانن کە وەک چۆن ئەو بتە گەورە ڕازی نەبووە، ئەو بتە بچووکانە بکرێنە هاوبەشی، خواش ڕازی نیە و ڕازی نابێ، کە هەندێک لە دروستکراوەکانی بکرێنە هاوبەشی.

## مەسەلەی دووەم:

**پرسیارو لێکۆڵینەوەی گەلی ئیبراهیم کە ئایا کێ پەرستراوەکانیانی بەو دەردە بردوە و؟ ناوهێنانی ئیبراهیم و، ڕێککەوتنیان لەسەر پەلکێشکردنی ئیبراهیم بۆ دادگایی کردنی لەسەر ئەو تۆمەتەی دراوەتە پاڵی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالُواْ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُواْ سَمِعۡنَا فَتًى يَذۡكُرُهُمۡ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبۡرَٰهِيمُ ﴿٦٠﴾ قَالُواْ فَأۡتُواْ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعۡيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡهَدُونَ ﴿٦١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ قَالُواْ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ ﴾، گوتیان: کێ ئەوەی بە پەرستراوەکانمان کردووە؟ ئەو خەڵکە کە دەگەڕێنەوە لەو دەشت و دەرە، یان لە جەژنەکە، کە چوونە دەرو شاریان چۆڵکردوە و بەجێهێشتوە، یان بەلای کەمەوە لە پەرستگاکەدا نەماون، تەماشا دەکەن ئەو بت و پەیکەرانەی کە پەرستوویانن، وەک پەرستراو لە جیاتی خوا، یاخود لەگەڵ خوادا، هەموویان وردو خاش کراون و سەرو گوێیان شکاوە، لە بەینی خۆیاندا دەڵێن: کێ وای لە پەرستراوەکانمان کردوە؟

لێرەدا پێویستە بزانین کە (**آلهة**) کۆی (**إله**)ە، و (**إله**) واتە: (**معبود**) پەرستراو، ئنجا ئایا پەرستراو دەبێ هەر پەیکەر بێ؟ پەرستراوی ڕاستەقینە تەنیا خوایە ﷻ، (**لا إله إلا الله**) واتە: هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە، کە شایستەی پەرستران بێ، جگە لە خوا ﷻ، کە بە داخەوە وەک جاری دیکەش گوتوومە: زۆر لە مەلا و وتاربێژەکان ئێستاش لەگەڵ بێ، وشەی: (**إله**) و (**ألله**) لێک جیاناکەنەوە، لە حاڵێکدا کە لە شایەتماندا، خوا وشەی (**إله**)ی لە (**ألله**) جیا کردۆتەوە، (**لا إله**) هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە، (**إلا الله**) جگە لە خوا، وشەی (**إله**) دووان و کۆ (**تثنية وجمع**)ش دەکرێتەوە، وەک (**إله، إلاهان، إلاهين، آلهة**)، بەڵام

(ألله) نە دەكرێتە دووان و نەكۆش دەكرێتەوە، چونكە هەریەك زات هەیە، كە خاوەنی ئەم گەردوونە بێ، بەڵام دەگونجێ لەگەڵ ئەو زاتەدا، كە تەنیا ئەو پەرستراوی بە هەقە و شایستەی پەرستنە، پەرستراوانی دیكەی ساختە و ناهەق هەبن، بۆیە پەرستراو (إله) خوا لایدەبات، (لا إله) ئەم (لا)یە پێی دەگوترێ: **(لا النّافية للجنس)** (لا)ی لابەری تێكڕا، واتە: هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق، ئەگەرنا پەرستراوی بە ناهەق هەن و زۆرن، بەڵام پەرستراوی بە هەق، تەنیا یەكێكە كە خوا (ألله)یە ﷻ، بۆیە دەبێ جیاوازیی بكرێ لە نێوان: وشەی خوا (ألله) و پەرستراو (إله)دا، زۆر كەس وشەی (إله) هەر بە خوا مانا دەكات! كە هەڵەیە، وشەی (إله) واتە: **(معبود)** پەرستراو، بەڵام (ألله) خوا، خُدا (God) واتە: ئەو بەدیهێنەرو پەروەردگارەی كە خاوەنی ئەو ناو و سیفەتانەیە، كە بەس ئەو هەینی، هەر یەكێكە كە خوایە ﷻ و، دەبێ هەر ئەویش بپەرسترێ، بەڵام (إله) وەك گوتم: دەگونجێ خوا بێ، كە ئەو كاتە پەرستراوی بە هەقە و، دەشگونجێ غەیری خوا بێ، كە پەرستراوی بە ناهەقە.

ئنجا هەر كەسێك مامەڵە لەگەڵ هەر شتێكدا بكات، وەك ئەو مامەڵەیەی كە دەبێ تەنیا لەگەڵ خوادا بكرێ، ئەوە ئەو شتەی پەرستوە، وەك شاعیرێك دەڵێ:

**وَمَنْ أَبَاحَ النَّفْس مَا تَهْوَاهُ ... فَإِنَّما إلهـــَهُ هَـــوَاهُ**

واتە: هەر كەسێك نەفسی چی ئارەزووی كرد، ڕێی پێبدا، ئەوا ئارەزووی خۆی كردوە بە پەرستراوی خۆی.

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ﴿٢٣﴾﴾ الجاثية، واتە: تەماشای ئەو كەسە ناكەی، كە ئارەزووی خۆی كردوەتە پەرستراوی خۆی! نافەرموێ: كردوویەتە خوای خۆی، بەڵكو پەرستراوی خۆی، چونكە خوا ﷻ یەك زاتە، بێ وێنەیە، پەروەردگارە، بەدیهێنەرە و، هەر ئەویش شایستەی پەرستنە.

٢)- ﴿إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، بەدڵنیایی ئەو کەسە، لە ستەمکارانە، لەبەر ئەوەی بێ ڕێزیی کردوە بە پیرۆزییەکانمان، ستەمی لە ئێمە کردوە و، ستەمی لە پەرستراوەکانمان کردوە و، ستەمی لە خۆیشی کردوە، ئەوانە هەموویان دەگونجێ، مەبەست بن.

٣)- ﴿قَالُواْ سَمِعۡنَا فَتٗى يَذۡكُرُهُمۡ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبۡرَٰهِيمُ﴾، گوتیان: گوێمان لێبوو گەنجێك (بەخراپە) باسیدەکردن ئیبراهیمی پێدەگوترێ، لە نێو خۆیاندا دەبێتە مشت و مڕیان، دەڵێن: کێ وای لە پەرستراوەکانمان کردوە؟ بێگومان ئەو لە ستەمکارانە، دوایی هەندێکی دیکەیان وەڵام دەدەنەوە و دەڵێن: گوێبیستی لاوێک بووین باسی دەکردن، واتە: بە خراپە باسی دەکردن، یان هەڕەشەی لێ دەکردن، پێی دەگوترێ: ئیبراهیم، یاخود ئیبراهیمی پێ دەڵێن، وشەی (يَذۡكُرُهُمۡ) وەک گوتمان: یانی:

١- هەڕەشەی لێ دەکردن؟

٢- ڕەخنەی لێ دەگرتن.

٣- بە خراپە باسی دەکردن.

٤)- ﴿قَالُواْ فَأۡتُواْ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعۡيُنِ ٱلنَّاسِ﴾، گوتیان: بیهێنن بەبەرچاوی خەڵکەوە.

٥)- ﴿لَعَلَّهُمۡ يَشۡهَدُونَ﴾، بەڵکو ئامادە بن، یانی: ئامادە بن کە دادگایی دەکەین، بزانن ئێمە ستەمی لێناکەین، یاخود: ئامادەبن کە چۆن سزای دەدەین، تاکو خەڵکی دیکەی پێ تەمبێ بێ و، عیبرەتی لێوەربگرێ.

دیارە ئیبراهیمیش عليه السلام ئامانجی هەر ئەوەبوو لە شکاندنی بتەکان، ئەگەرنا ئەو دارو بەردانە چین بیانشکێنێ یاخود بمێننەوە! بەڵام مەبەستی ئەوەبوو کە بتەکان بشکێنێ و، ئەوانیش بانگی بکەن و، لەگەڵیاندا ئەو وتووێژ و دیالۆگە بکات، کە خوا تعالى باسی کردوە.

## مەسەلەی سێیەم:

هێنانی ئیبڕاهیم بۆ لێکۆڵینەوە و پرسیارلێکردنی، کە ئایا ئەو ئەو بەڵایەی بەسەر پەرستراوەکانیان هێناوە؟ وەڵامدانەوەی ئیبڕاهیم: کە گەورەکەیان وایکردوە، ئنجا سەرەتا بە خۆدا چوونەوەیان و، خۆ تاوانبار کردنیان و خۆ بەستەمکار لە قەڵەمدانیان، پاشان تێهەڵگەڕانەوەیان و سەرەوبن بوونیان جارێکی دیکە و، ڕەخنە لێگرتنی توندو ڕاشکاویی ئیبڕاهیم، کە چۆن دەبێ شتێکی بێ سوودو بێ زیان بپەرستن:

خوا دەفەرمووێ: ﴿ قَالُوٓاْ ءَأَنتَ فَعَلۡتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلۡ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمۡ هَٰذَا فَسۡـَٔلُوهُمۡ إِن كَانُواْ يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ فَقَالُوٓاْ إِنَّكُمۡ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُواْ عَلَىٰ رُءُوسِهِمۡ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ أَفَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا يَضُرُّكُمۡ ﴿٦٦﴾ أُفّٖ لَّكُمۡ وَلِمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ قَالُوٓاْ ءَأَنتَ فَعَلۡتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ﴾، گوتیان: ئەی ئیبڕاهیم! ئایا تۆ ئەوەت بە پەرستراوەکانمان کردوە؟ لێرەدا ئەوە پێچراوەتەوە کە سۆراغ و پشکنینیان بەدوای ئیبڕاهیم دا کردو، گەڕان و سووڕان و پەیدایان کردو هێنایان، ئەوە هەمووی قرتێنراوە، چونکە مرۆڤ بە سیاق و سەلیقە دەیزانێ، بە ڕەوت دەزانرێ و، سەلیقەش یەکسەر پەی پێ دەبات، کە پێویست بە باسکردنێ ناکات، یەکسەر لەوەوە دەست پێدەکات کە گوتیان: ئەی ئیبڕاهیم! ئایا تۆ ئەوەت بە پەرستراوەکانمان کردوە؟ ئەو شتە ناڵێن کە بە پەرستراوەکانیان کراوە! واتە: بۆ وێنە ناڵێن: (**أأنَتَ كَسَرْتَ آلِهَتَنَا، أو جَذَذْتَ آلِهَتَنَا؟**)، ناڵێن: تۆ پەرستراوەکانمانت تێک و پێک داون و، لەت و پەتت کردوون و،

شکاندووتن؟! چونکە نایانەوێ وشەیەک بەکاربێنن، لەگەڵ پایە و پیرۆزیی و گەورەیی پەرستراوەکانیاندا ئایا گونجاو نەبێ، کە بریتیە لە لەت و پەتکران و تێکشکێنران و وردو خاش کران، بەس دەڵێن: تۆ وات بەسەر هێناون؟ تۆ وات لێ کردوون؟

ئنجـا دەگونجـێ ئـەو جـۆری پرسـیارکردنە، بـۆ داوای وەڵام بـێ، واتـە: ئایـا تـۆ وات لێکـردوون؟ ئـەوە لـە حاڵێکـدا کـە نەیانزانیبـێ، بـەڵام ئەگـەر زانیبێتیـان کـە ئیبراهیـم وایکـردوە، ئـەوە جـۆری پرسـیارکردنەکە پرسـیارکردنی نکووڵیلێکەرانـە و سەرزەنشـتکەرانەیە، واتـە: ئایا تـۆ چـۆن وات لێکـردن؟ ئێمـە نکووڵیـی لـەوە دەکەیـن؟ بەسـەر زەنشـتکردنەوە.

٢)- ﴿قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا﴾، گوتی: بەڵکو ئەم گەورەیان وایکردوە، وشەی (بَلْ ) دەڵێ: (**إذَا جَاءَ بَعْدَ الإسْتِفْهَام، أفَادَ إبْطَالِ المُسْتَفْهَم عَنْهُ**)، کەواتە: بە ڕواڵەت ئیبراهیم نکووڵیی لەوە دەکات کە ئەو وایکردبێ، چونکە دەڵێ: وشەی (بَلْ ) ئەگەر لە دوای پرسیارکردنەوە بێ، ئەو شتەی پرسیاری لە بارەوە کراوە، هەڵیدەوەشێنێتەوە، ئەوان دەڵێن: ﴿ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا﴾، ئەویش دەڵێ: ﴿بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا﴾، واتە: من نەمکردوە، بەڵکو ئەم گەورەیان کردوویەتی، دوایی ئێمە کورتە باسێکی تایبەت دەربارەی ئەو جۆرە وەڵامدانەوەی ئیبراهیم ﷺ دەکەین، کە چۆن نکووڵیی کردوە، لەوەی کردوویەتی، لە کاتێکدا کە خۆشی کردوویەتی؟!

٣)- ﴿فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ﴾، ئنجا لێیان بپرسن ئەگەر دەدوێن و قسە دەکەن، واتە: مادام قسە ناکەن، شایستەی پەرستران نین، ئیبراهیم ﷺ ویستوویەتی پێیان بڵێ: کە ئەوانە تەنانەت توانای قسەکردنیشیان نیە، ئەگەرنا مەرج نیە هەر شتێک توانای قسەکردنی هەبوو، شایستەی پەرستران بێ، بەڵام واتە: ئەو پەرستراوانەی ئێوە، هێندە دەستە پاچەن و، هێندە دوورن لەوەی کە بپەرسترێن، تەنانەت توانای قسەکردنیشیان نیە، کە مرۆڤ و جندو فریشتەکان توانای قسەکردنیشیان هەیە، بەڵام شایستەی پەرسترانیش نین، بەڵام ئەوان تەنانەت ئەوەشیان لە باراندا نیە، واتە: هەر هیچ نین و هیچیان لێ هەڵناوەرێ.

٤)- ﴿ فَرَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ ﴾، واتە: گەڕانەوە بۆ لای خۆیان.

أ- هەندێکیان بۆ لای هەندێکیان گەڕانەوە.

ب- یاخود چاویان بە خۆیاندا گێڕایەوە و وریا بوونەوە، یانی: ئەو ناخ و خواڕسکەی کە خوا هەموو مرۆڤەکانی لەسەر خوڵقاندوە، (**كُلُّ مَوْلُودٍ عَلَى الْفِطْرَةِ**)[1]، (**الفِطْرَة**) واتە: خواڕسکی تەنیا خواپەرستن، تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن، ئەوەیان وەک چۆن لە تاریکە شەوێکدا کە چرایەک تۆزە شۆقێک دەدات، ئاوا دڵ و دەروونەکەیان لە ژێر ئەو کەمڕە و ژەنگی عادەت و نەریت و کەلتووری سەقەتی بتپەرستیی و هتد، دێتە دەرێ و یەک سەرەتاتکە دەکا و تۆزە شەوقێک دەدات.

٥)- ﴿ فَقَالُوٓاْ إِنَّكُمۡ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، گوتیان: بە دڵنیایی ئێوە ستەمکارن، واتە: ئێوە ستەمکارن نەک ئیبراهیم، لەبەر ئەوەی بتەکانی شکاندوون، ستەمی لێکردبن، بەڵکو ئێوە ستەمکارن کە نەدەبوو ئەو بتانە هەر بپەرستن.

٦)- ﴿ ثُمَّ نُكِسُواْ عَلَىٰ رُءُوسِهِمۡ ﴾، دوایی هەڵگێڕدرانەوە سەر سەریان و سەرە وبن کرانەوە، واتە: گەڕانەوە بۆ نەزانیی و سەرکەشیی و سەرەخەریی خۆیان، ئنجا ئەم گەڕانەوەی خۆیان بۆ ناهەق، خوا ﷻ تەشبیهی کردوە و چواندوویەتیی بە شتێکەوە کە پێشێ ڕاست دەبێتەوە و لەسەر پێیان دەوەستێ، سەری لەسەرێیەو پێی لە خوارێن، وەک حاڵەتی سروشتیی، بەڵام جارێکی دیکە دووبارە خۆی لینگەو قووچ دەکا و، خۆی سەرەوبن دەکاتەوەو هەڵدەگەڕێتەوە، گەڕانەوەیان بۆ ناهەق و بۆ نەفامیی و نەزانیی، ئەو حاڵەتەی ئەوانی چواندوە بە کەسێکەوە، کە پێشێ لەسەر پێیان وەستاوە، دوایی جارێکی دیکە خۆی سەرەوبن دەکاتەوە.

---

(١) {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلَّا يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ؟، ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: (فِطْرَةَ اللهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لاَ تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللهِ، ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ)} أخرجه البخاري في: ٢٣ كتاب الجنائز: ٨٠ باب إذا أسلم الصبي فمات هل يصلى عليه؟.

٧)- ﴿ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَـٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴾، گوتیان: تۆ دەزانی: ئەوانە قسە ناكەن و نادوێن! واتە: قسەنەكردنی ئەوان بۆ تۆ شتێكی زانراوە، كەواتە: چۆن پێمان دەڵێی لێیان بپرسن! لە گەورەكەیان بپرسن!

٨)- ﴿ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴾، واتە: گوتی: ئایا ئێوە لە جیاتی خوا، لەگەڵ خوادا شتێک دەپەرستن، كە هیچ سوودێكتان پێناگەیەنێ و، زیانیشتان لێ نادات؟ پرسیارلێكردنەكە پرسیاركردنی نكووڵییلێكردن و سەرزەنشتكردنە، ئنجا كە دەڵێ: ﴿ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا ﴾، یانی: تۆزقاڵێک، هەر تۆزێكیش سوودتان پێ ناگەیەنێ، ﴿ وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴾، دیسان ئەویش واتە: هەر تۆزێكیش ناتوانێ زیانتان پێ بگەیەنێ، ئەگەر لێتان تووڕە بێ.

٩)- ﴿ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، من بێزاریی دەردەبڕم، بۆ ئێوە و بۆ ئەوەش كە لە جیاتی خوا دەیپەرستن، (**التَّأَفُّفُ: صَوْتٌ يَدُلُّ عَلَى التَّضَجُّرِ**)، واتە: (**تَأَفُّفُ**) دەنگێكە بێزاریی دەربڕین و ناخۆشحاڵیی دەگەیەنێ، (**أف: إسم فعل**)، وشەی ( أُفٍّ ) كە بە (**إف**)یش هاتوە، ناوی كردارە، واتە: (**أَتَضَجّر، أَتَكَرَّه**) بێزاریی دەردەبڕم، یان ناڕەحەتم.

١٠)- ﴿ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾، ئایە نافامن؟! واتە: ئایا عەقڵ و هۆشێكتان نیە كە هەق و ناهەقی پێ لێک جیابكەنەوەو، عەقڵ و هۆشێكتان نیە ڕێنماییتان بكات، كەئەو بت و پەیكەرانە شایستەی پەرستران نین؟!

## کورتە باسێک دەربارەی وەڵامی ئیبراهیم ﷺ: گەورەکەیان شکاندوونی

لێرەدا باسێکی ئەو وەڵامەی ئیبراهیم ﷺ دەکەین کە دەفەرموێ: من ئەو بتانەم نەشکاندوون، کاتێک لێی دەپرسن: ئایا تۆ ئەو پەرستراوانەی ئێمەت شکاندوون، تۆ وات بەسەر هێناون؟ دەڵێ: بەڵکو گەورەکەیان وایکردوە، لێیان بپرسن، ئەگەر قسە دەکەن! دیارە زانایان لێرەدا مشت و مڕێکی زۆریان بووە، کە ئیبراهیم ﷺ چۆن ڕێگای بە خۆی داوە پێیان بڵێ: من وام نەکردوە و ئەو بتەیان وای کردوە و لێیان بپرسن! بۆیە چەند وەڵامێکیان داونەوە:

١- وەڵامێکیان ئەو ڕیوایەتەیە کە پێشتریش ئێمە لە تەفسیری سوورەتی ئیبراهیمدا و، لە کاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئیبراهیمدا هێنامان، لەوێدا ئەو ڕیوایەتەمان هێنا و درێژەی ئەو بەسەرهاتەمان هێنا، بەڵام لێرەدا تەنیا کورتەیەکی ئەو بەسەرهاتە دێنین.

**{قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَمْ يَكْذِبْ إِبْرَاهِيمُ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلَّا فِي ثَلَاثٍ كُلُّهُنَّ فِي اللَّهِ: قَوْلُهُ: إِنِّي سَقِيمٌ" وَلَمْ يَكُنْ سَقِيمًا، وَقَوْلُهُ لِسَارَةَ: أُخْتِي، وَقَوْلُهُ: بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا} (أخرجه: البخاري: (٢٢١٧، ٢٦٣٥، ٣٦٥٧، ٦٩٥٠)، ومسلم: ٢٣٧١، أبو داود: ٢٢١٢، والترمذي: ٣١٦٦، إسناده حسن ورجاله ثقات).**

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیبراهیم هەرگیز لە هیچ شتێکدا درۆی نەکردوە، مەگەر سێ جاران، ئەویش هەرسێکیان لە پێناوی خوادا بوون:

أ- کە گوتی: من نەخۆشم {وەک لە سوورەتی (**الصافات**)دا هاتوە، کاتێک کە خەڵکەکە دەچنە دەرێ، چاوەڕێ دەکەن کە ئیبراهیمیش ﷺ لەگەڵیاندا بچێتە دەر، ئنجا سەیران

دەبێ، یان جەژنی نەورۆز دەبێ، یان گەشتێک دەبێ، ئیبراهیم لەگەڵیان ناچێ و دەڵێ: ﴿إِنِّي سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾﴾، من نەخۆشم واتە: ناتوانم بێمە دەرێ، کە نەخۆشیش نەبووە}.

ب- کاتێک بە سارە دەڵێ ئەوە خوشکمە. {کە هاوسەریشی بووە، کاتێک کە دەچێت بۆ میسر، دیارە عادەتی فیرعەونی میسر وابووە، کە هەر کەسێک هاوسەرێکی جوانی لەگەڵدا بووبێ، لێی زەوت کردوە، بۆیە ئیبراهیم ﷺ دەڵێ ئەوە خوشکمە، بۆ ئەوەی لێی زەوت نەکات}.

ج- کە گوتوویەتی: گەورەکەیان وای بەسەر ئەو بت و پەیکەرانە هێناوە و تێک و پێکی شکاندوون، {کە خۆیشی وایلێکردوون}.

ئنجا هەندێک لە زانایان گوتوویانە کە ئیبراهیم ﷺ لێرەدا لەبەرخوا ئەو قسەیەی کردوە کە ڕاست نەبووە و واش نەبووە، بەڵام لە پێناوی خوادا بووە، بە پێی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ.

هەڵبەتە کە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: کە ئیبراهیم ئەو سێ شتەی گوتوون لە پێناوی خوادا و، ئەو سێ درۆیەی کردوون، هەرسێکیان درۆی ڕوون و ڕاشکاو نین، بۆ نموونە:

أ- کە دەڵێ: ﴿إِنِّي سَقِيمٌ﴾، من نەخۆشم، واتە: دڵم بێزارو نەخۆشە لەو بتانەی ئێوە.

ب- کە بە سارە دەڵێ: خوشکمە **(أختي)**، گوتوویەتی: سارە جگە لە من و تۆ هیچ بڕوادارێک لەسەر زەوی نیە، کەواتە: ئەگەر هاوسەرم نەبووبای، لە ئیماندا خوشک و براین.

ج- کە دەفەرموێ: ﴿بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا﴾، واتە: من ڕقم لەو گەورەیان هەستا، بە هۆی ڕق هەڵسانم لەو بتە گەورەیان، کە زۆری دەپەرستن و زۆر بەندایەتیی بۆ دەکەن، ئەوانەشم شکاند، کەواتە: بە هۆی ڕق هەڵسانم لەو بتە گەورەیە، ڕقم چووە ئەوانیش و ئاوا وردو خاشم کردن، یانی: هەر سێکیان دەگونجێ کە بە جۆرێک تەئویل بکرێن.

بۆیەش وا دەڵێم، چونکە هەندێک لە زانایان ئەو بەسەرهاتە ڕەت دەکەنەوە، ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ئیبراهیم ئەو سێ درۆیەی کردوون، دەڵێن: درۆکردن شایستەی پێغەمبەران نیە و، پێغەمبەر ﷺ شتی وای نەفەرمووە، وەک لە تەفسیری سوورەتی ئیبراهیمیشدا باسمان کرد.

٢- ڕایەکی دیکە ئەوەیە کە فەرموویەتی: ﴿بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا﴾، ئەمە وەک ئەوەیە کە تۆ شتێکی گرنگ و بەرچاوت کردبێ، یەکێک لەو لای ڕا بێ بڵێ: ئەوە تۆ کردووتە!؟ تۆش بڵێی: نەخێر! بەڵکو تۆ کردووتە!! بە توانج و تەوسەوە، ئەمە وەک لە سوورەتی (الدخان)دا هاتوە، کە خوای بەرز دەفەرمووێ: ﴿ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ ﴿٤٩﴾﴾، واتە: بیچێژە تۆ زاڵ و بەڕێزی! کە بە پێچەوانەوەیە، واتە: ئەمە بە توانجەوەیە و یانی: تۆ ژێر دەستی و بێ ڕێزیشی، ﴿ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ﴾، واتە: تۆ پێت وابووە کە زاڵی و بەڕێزیشی، کەچی ئێستا بە پێچەوانەوەیە، دیارە بە توانج و بە تەوسەوە ئەو قسەیە دەکرێ.

٣- تەئویلێکی دیکەی ئەوەیە، کە ئەم قسەی ئیبراهیم ؑ، بۆیە دەفەرمووێ: ﴿بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا﴾، واتە: ئەو بتە زلە ڕازی نەبووە ئەو هەموو هاوبەشانەی هەبن، کە دەفەرمووێ: ئەو وایکردوە، دەیەوێ سەرنجیان ڕابکێشێ بۆ ئەوە، کە ئەو بتە گەورەیە ڕازی نەبووە، ئەو وردە بتانەی لەگەڵدا بپەرسترێن، ئەدی خوای بەرز ومەزن چۆن ڕازی دەبێ هەندێک لە دروستکراوەکانی لەگەڵیدا بپەرسترێن!

لێرەدا پرسیارێک دێتە پێش، بۆچی پێغەمبەر ﷺ ئەو قسەیەی ئیبراهیمی ؑ ناو ناوە درۆ؟ سێ وەڵام هەن:

**یەکەم:** ئەو فەرموودەیە سەنەدەکەی ڕاست نیە و، پێغەمبەر ﷺ درۆی پاڵنەداوەتە لای ئیبراهیم، ئەو فەرموودەیە پێغەمبەر ﷺ نەیفەرمووە.

**دووەم:** ئەو قسانەی ئیبراهیم کە دەربارەی (نەخۆشیی و، سارە و، بتەکان) کردوونی، لە شێوەی درۆدا بوون بە ڕواڵەت، بەڵام لە ڕاستییدا مەبەستی پێ **(کنارە)** بووە، بە کوردیی پێی دەڵێن: لەبەر ڕا هاویشتن، بە **(تعریض وكناية)** ئەوەی فەرمووە.

**سێیەم:** لەو حاڵەتەدا درۆ دروستە، مادام ئامانجێکی هێندە گەورە پەکی لەسەر درۆیەک کەوتبێ، دروستە لەو حاڵەتە، مادام ئەو ئامانجە گەورەیە بەو درۆیە نەبێ نایەتە دی، دروستە بکرێ.

بەهەر حاڵ ئەوانە سێ وەڵامن، بەڵام من ئەوەی کە زیاتر بە دڵمەوە دەنووسێ، ئەوەیە کە ئیبراهیم ﷺ بە توانج و بە تەوسەوە فەرموویەتی: ﴿ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا ﴾، ئەو گەورەیان کردوویەتی! دەشزانن ئەو گەورەیان هیچ ناکات، کەواتە: یان دەبێ ئیبراهیم بێ، یان دەبێ بتە گەورەکەیان بێ، چونکە ئەوان دەڵێن: ئیبراهیم تۆ کردووتە، ئەویش دەڵێ: بەڵکو بتە گەورەکەیان کردوویەتی، ئنجا دەزانن کە بتە گەورەکەیان ئەوەی پێ ناکرێ، کەواتە: ئیبراهیم کردوویەتی، یانی: لێرەدا دوو تۆمەتبار هەن:

أ- بتە گەورەکەیان.

ب- ئیبراهیم ﷺ بتە گەورەکەش پێی ناکرێ، کەواتە: ئیبراهیم کردوویەتی، بەڵام وەک گوتم: تۆ کەسێک پرسیاری ئەوەت لێ دەکات، کە تۆ ئەو کارەت ئەنجام داوە؟ تۆش دەڵێی: نەخێر بەڵکو تۆ! واتە: بە دڵنیاییەوە من کردوومە، چونکە بە تۆ ناکرێ، واتە: ئەگەر من نەبم ئەو بتانەم ورد خاش کردبێ، خۆ ئەو بتە گەورەیەشیان نیە!؟ من ئەوەیانم زیاتر بە دڵەوە دەنووسێ، بە هەر حاڵ ئەوانی دیکەش هەرکامێکیان بەشێک لە زانایان قبووڵیان کردوون.

ئەوەی بە لامەوە گرنگە بە ڕاستیی ئەوەیە، کە چۆن پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، لە شتێک پاک بکەینەوە و بە دووریان بگرین، کە شایستەی پایە و مەقامی بەرز و ناوازەیان نەبێ، ئەوەی کە بە لامەوە گرنگە ئا ئەوەیە، چونکە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، لە لووتکەی بەرزی هەموو ڕەوشتێکی جوان و پەسندا بوون و، دوور بوون لە هەر خوویەکی دزێو و ناپەسند، ئەمە مەبدەئە، بەڵام بێگومان کاتێک کە مرۆڤ دێتە نێو دنیای واقیعیشەوە، جاری وا هەیە

پاراستنی ئەو پڕەنسیپ و مەبدەئانە، واقیع جۆرێک لە نەرمش و نەرم و نیانیی (خۆ گونجاندن) پێویست دەکات، بۆ ئەوەی ئەو پڕەنسیپ و مەبدەئانەت پارێزراو بن، هەروەک پێغەمبەر ﷺ هەرگیز ئامادە نەبووە مسوڵمانێکی چەوسێنراوە، تەسلیمی کافران بکات، بەڵام لە صوڵحی حودەیبییەدا، کاتێک ڕێککەوتننامەکە ئیمزا دەکەن، کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر (ئەبوو بەصیر) و، دوای ئەو ئەبوو جەندەل، کە هەردووکیان لەو کاتەدا مسوڵمان دەبن، کافرەکان دەڵێن دەبێ تەسلیممان بکەنەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بیاندەن بە من، با تەسلیمتان نەکەمەوە، دەڵێن: نەخێر، یان ڕێککەوتننامە و صوڵحەکە هەڵدەوەشێنینەوە، یان دەبێ تەسلیممان بکەیەوە، پێغەمبەر ﷺ بە ناچاریی تەسلیمیان دەکاتەوە، وەک پڕنسیپ (مبدأ) پێغەمبەر ﷺ هەرگیز مسوڵمانێکی تەسلیمی کافران نەکردوە بیچەوسێننەوە، بەڵام لێرەدا بۆچی تەسلیمیان دەکات؟ لەبەر ئەوەی واقیعەکە وا دەخوازێ و ئامانجێکی گەورەتر پەکی لەسەر ئەوە کەوتوە، ئنجا لە کاتێکدا دوو شتی باش تێکدەگیرێن، دەبێ تەماشایان بکەی: کامیان باشییەکەی زیاترە، دەبێ ئەویان هەڵبژێری و، کامیان باشییەکەی کەمترە، بیکەیە قوربانی ئەوی دیکەیان، هەروەک کاتێک دوو زیان ڕووت تێدەکەن، دەبێ تەماشایان بکەی: کامیان زیانەکەی گەورەترە، ئەویان لە خۆت دووربخەیەوە، بە تەحەممول کردنی ئەوی دیکەیان، هەروەک زانایان گوتوویانە: (**إِحْتِمالُ أَخَفِّ الضرَرَيْن**)، یاخود (**إِحْتِمالُ أَهْوَنِ الشَّرَّيْن**)، واتە: لە دوو زیانان زیانە کەمترەکە دەبێ تەحەممول بکرێ، بەڵام (**تفويط أدنى المصلحتين**)، لە دوو بەرژەوەندیی، کامیان گچکەترە، ئەویان بفەوتێنرێ و بەرژەوەندییە گەورەکە دابین بکرێ.

## مەسەلەی چوارەم:

**بڕیاردانی گەلی ئیبراهیم بە سووتاندنی ئیبراهیم و، فەرمانکردنی خوا بە ساردو سەلامەت بوونی ئاگرەکە لەسەر ئیبراهیم و، پووچەڵ کردنەوەی خوا ﷻ بۆ پیلانەکەیان و، سەرەنجام گێڕانیان بە زیانبارترین:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَـٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا يَـٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَـٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ وَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَـٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ ﴿٧٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ ﴾، گوتیان: بیسووتێنن و پەرستراوەکانتان سەربخەن، واتە: دوای ئەوەی کە لە مەیدانی بەڵگە و دەلیلدا شکست دەخۆن، پەنا دەبەنە بەر هەڕەشەو گوڕەشە و ئاسن و ئاگر، کە دەڵێن: (**حَرِّقُوهُ: التحريق مُبَالَغَةٌ فِي الحَرْق**)، (**تحريق**) زێدەڕۆییکردنە لە سووتاندا، واتە: زۆر چاکی بسووتێنن، بیکەنە قەرەبرووت.

جێی سەرنج ئەوەیە لە زۆربەی تەفسیرەکاندا، تەنانەت (**محمد الطاهر بن عاشور**) دەڵێ: (**قِيلَ الَّذِي أَشَارَ بِالرَّأْيِ بِإِحْرَاقِ إِبْرَاهِيمَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ كُرْدِيٌّ اسْمُهُ: هِينُون**)[1]، واتە: گوتراوە: ئەوەی ئاماژەی داوە بە سووتاندنی ئیبراهیم، پیاوێک بووە لە گەلی کورد، ناوی (**هِينُون**) بووە.

هەڵبەتە ئەگەر وابێ دەبێ ئەو خەڵکەی لەوێ بوون، زیاتر کورد بووبن، ئەگەرنا کوردێکی غەریب و غەوارە و ئاوارە، ئەو دەسەڵاتەی نیە ئەو تەگبیرە

---

(١) التحرير والتنوير، ج١٧، ص١٠٥.

بکات و ئەو ئاماژەیە بکات، بە هەر حاڵ ئەو گێردراوەیە سەنەدێکی واشی نیە، گرنگ ئەوەیە ئەو قسەیە لە تەفسیرەکاندا هاتوە، ئنجا گەلی کوردیش وەک هەمــوو گەلانی دیکە، چاک و خراپیان هەیە، ئەو کاتە ئەو خەڵکەش هەمــووی ئەهلی کوفرو شیرک بووە، بە کوردو غەیری کوردیشەوە.

کە دەڵێن: ﴿ وَٱنصُرُوٓاْ ءَالِهَتَكُمۡ ﴾، پەرستراوەکانتان سەربخەن، ئەمە تەعبیرێکی زۆر سەرسوڕهێنەرە! چونکە پەرستراو دەبێ پەرستەرەکانی سەربخات، پەروەردگارو پەرستراو، دەبێ ئاگای لەوانە بێ کە دەیپەرستن و لێی دەپاڕێنەوە، کەچی ئەوان دەڵێن: پەرستراوەکانتان سەربخەن، ئەوە چ پەرستراوێکە کە پێویستیی بەوە بێ پەرستەرەکانی سەری بخەن؟ هەروەک کاتی خۆی لە شاری مەککە، یەکێک لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بتێکی دەبێ دەیپەرستێ، تەماشا دەکات ڕێوی میزی پێدا دەکات، ئنجا بە شیعر دەڵێ: من پەرستراوێک ناپەرستم ڕێوی میزی پێدا بکات و، نەشتوانێ بەرگریی لە خۆی بکات!

٢)- ﴿ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ﴾، ئەگەر ئێوە ئەنجام دەرن، واتە: ئەگەر ئێوە ئەنجام دەری سەرخستنی پەرستراوەکانتانن، ئیبراهیم بسووتێنن، یاخود ئەگەر دەتانەوێ شتێک بکەن کە سوودتان پێ بگەیەنێ، ئەوەیە کە ئیبراهیم بسووتێنن، ئنجا خوا ﷻ ئەوە هەمووی دەپێچێتەوە کە چۆن دارو باریان هێنا و، ئاگریان تێ بەرداو، ئاگرەکە مەشخەڵی بەرز بۆوەو، مەنجەنیقیان هێنا و ئیبراهیمیان خستە نێو مەنجەنیقەکەوە، وەک چۆن گوللە تۆپێک بە (مَدْفَع)ێک فڕێ دەدەی، ئاوا ئیبراهیمیان هەڵدایە نێو مەشخەڵ و بڵێسەی ئاگرەکە، خوا ﷻ ئەوە هەمووی دەپێچێتەوە.

٣)- ﴿ قُلۡنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرۡدٗا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾، دوای ئەوەی ئەوان ئاگریان کردەوەو، ئیبراهیمیان خستە نێو مەنجەنیقەوەو هەڵیاندا، ئێمەش گوتمان: ئەی ئاگر! ساردو بێ زیان بە لەسەر ئیبراهیم، ساردیی پێچەوانەی سروشتیەتی و، سەلامەتییش بە، یانی: هێندەش سارد مەبە زیانی پێ بگەیەنی، واتە: ساردێکی سەلامەت و بێ زیان بە.

٤)- ﴿وَأَرَادُواْ بِهِۦ كَيۡدٗا﴾، ئەوان پیلانیان بۆی مەبەست بوو، پیلانیان بۆی ویست، نەخشەیەکی خراپیان بۆی ویست، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە پیلانی سووتاندنی ئیبراهیمیان ﷷ بە پەنهانیی دارشتوە و ئیبراهیم نەیزانیوە چی لێ دەکەن و چی پێدەکەن! یاخود بۆ ئەوەی خۆی پەنهان نەکات و، خۆی نەشارێتەوە، ڕەنگە وایان گومان بردبێ، بۆیە کە دەفەرموێ: ﴿وَأَرَادُواْ بِهِۦ كَيۡدٗا﴾، واتە: پیلانیان بۆی ویست، فێڵێکیان بۆی ویست، پیلان و فێڵ ئەوەیە کە بە پەنهانیی بکرێ.

٥)- ﴿فَجَعَلۡنَٰهُمُ ٱلۡأَخۡسَرِينَ﴾، کەچی ئێمە ئەوانمان گێڕا بە زیانبارترین.

وشەی: ﴿ٱلۡأَخۡسَرِينَ﴾ زێدەڕۆییە لە (خَاسِر)، کە (أَخْسَر) واتە: زیانبارترین و، (خَاسِر) واتە: زیانبار، (الأَخْسَرِين: إِسمُ تَفضِيلٍ مَسْلُوب المُفَاضَلَة)، لێرەدا نەیفەرموە زیانبارترین لەچی؟ لە خودی خۆیان دا زیانبارترین بوون، یانی: زیانبارییەکەیان تاکە لە جۆری خۆیدا، کە هیچ جۆرە زیانبارییەکی دیکەی ناگاتێ.

لێرەدا ئەم فەرموودەیە دێنین: {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ إِبْرَاهِيمَ حِينَ أُلْقِيَ فِي النَّارِ لَمْ تَكُنْ دَابَّةٌ إِلَّا تُطْفِئُ عَنْهُ النَّارَ، غَيْرَ الْوَزَغِ، فَإِنَّهُ كَانَ يَنْفُخُ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِقَتْلِهِ} (أخرجه أحمد: ٢٤٥٧٨، وابن ماجه: ٣٢٣١، قال البوصيري: هذا إسناد صحيح، وابن حبان: ٥٦٣١، وابن أبي شيبة: ١٩٨٩٨، وأبو يعلى: ٤٣٥٧).

واتە: دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ (هاوسەری پێغەمبەر ﷺ و کچی ئەبووبەکری صیددیق خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئیبراهیم کاتێک فڕێدرایە نێو ئاگر، هیچ ژیاندارێک نەبوو، مەگەر ئاگرەکەی لە ئیبراهیم دەکوژاندەوە (هەر کامێکیان بە پێی خۆی) جگە لە قۆڕیی (الْوَزَغِ)[1]،

---

(١) (الوَزَغ) کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردوە بە کوشتنی، لە (المعجم الوسيط)دا ص ١٠٢٩، دەڵێ: (الوَزَغَةُ: سامٌ أَبرَصٌ لِلذَّكَرِ وَالأُنثى، أَوِ الوَزَغُ لِلذَّكَرِ، وَالوَزَغَةُ لِلأُنثى)، واتە: ژەهردارێکی بەڵەکە، بۆ نێر و مێ دەگوترێ: (الوَزَغَة)، یاخود (وَزَغ) بۆ نێرە و (وَزَغَة) بۆ مێینەیە، لە کوردەواریی خۆماندا قۆڕیی پێ دەڵێین، هەندێک سەرما زەڵەی پێ دەڵێن، بەڵام سەرما

فووی لە ئاگرەکە دەکرد، بۆ ئەوەی ئاگرەکەی ئیبراهیم خۆشتر بکات، بۆیە پێغەمبەر فەرمانی کردوە بە کوشتنی قۆڕیی (الْوَزَغِ) لە هەر شوێنێک بینیتان.

ئەمەش وەک هاودەردیی دەربڕینێک لەگەڵ ئیبراهیمدا، ئەگەرنا ئەو قۆڕییەی کە ئێستا هەیە، ئەوە نەبووە کە فووی لە ئاگرەکەی ئیبراهیم ﷺ کردوە، بەڵام وەک هەڵوێست نواندنێکی ئیمانیی و، مادام پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی بیکوژن، حەتمەن دیارە زیانێکی هەیە، هەروەک (**المعجم الوسيط**) دەڵێ: ژەهردارێکی بەڵەکە.

خاوەنی (**التحرير والتنوير**) لە تەفسیرەکەیدا[1] دەڵێ: ئەو گەلەی کە ئیبراهیم لە نێویاندا بووە کلدانیی بوون و، نازناوی پادشایەکەیان نەمرود بووە و، هەندێکیش گوتوویانە: ئەو پادشایەی کە لە سەردەمی ئیبراهیمدا بووە، هەر ناوی نەمروود بووە، نەک نازناوی پادشایەتیی، واتە: هەر ناوی شەخسیی خۆی نەمروود، یاخود (**نَمْرُوذ**) بووە، دوایی گەلی کلدانییەکان لە (**أور الكلدانيين**) کە لە باشووری عێراق بووە، موڵک و دەسەڵاتیان لەسەر دەستی ئاشوورییەکان کۆتایی هاتوە و ئاشوورییەکان بەسەریاندا زاڵ بوون و، مێژوو ئەوەی چەسپاندوە کە عیلامییەکان (**العِلاميين**) کە خەڵکی (سووس) بوون، ئەوان دەسەڵاتیان ڕاناوە و هەبووە بەسەر وڵاتی کلداندا، لە سەردەمی ژیانی ئیبراهیمدا ﷺ، لە دەوری ساڵی (٢٢٨٦) پێش زایین (پێش لە دایک بوونی عیسا ﷺ)، ئنجا بەو پێیە بێت: (٢٢٨٦ + ٢٠٢٠ = ٤٣٠٦) ساڵ لەمەوبەر، واتە: ئیبراهیم ﷺ بە نیزیکەیی (٤٣٠٦) ساڵ لەمەوبەر ژیاوە.

---

زەڵە گچکەترە، قۆڕیی گەورەترەو، بە قەدەر لەپە دەستێک دەبێ، بە زۆریی لە چیاو چۆڵ و نێو دارو بەردو دەوەن دا هەیە، بەڵام نەمزانیوە ژاردار (سام) بێ، مەگەر مەبەست جۆرێکی سەرمازەڵە بێ.

(١) ج١٧، ص١٠٧.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**دەربازکرانی ئیبراهیم ﵇ و، لووطی برازای بەرەو سەر زەمینی شام، کە خوا ﷻ پیت و پیزی تێخستوە و، پێ بەخشرانی، هەر کام لە ئیسحاقی کوڕی و یەعقووبی نەوەی و، گێڕانیان بە پێشەوا و، سروش بۆ کرانیان، کە خواپەرست و نوێژکەرو زەکاتدەر بن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿وَنَجَّيْنَٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِي بَٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً ۖ وَكُلًّا جَعَلْنَا صَٰلِحِينَ ﴿٧٢﴾ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴿٧٣﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿وَنَجَّيْنَٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِي بَٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَٰلَمِينَ﴾، ئەویش و لووطیشمان دەرباز کردن بۆ ئەو سەر زەمینەی کە پیت و پیزمان تێخستوە بۆ جیهانییان، کە مەبەست پێی سەر زەمینی شامە، هەروەک پێشتریش گوتمان: ئایەتی یەکەمی سوورەتی **(الإسراء)**یش زۆر بەڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ، کە خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾﴾.

وشەی (نَجَّيناهُ) (ضُمِّنَ نَجَّيْنَاهُ مَعْنَى الإِخْرَاجِ، فَعُدِّيَ بِحَرفِ إِلى)، واتە: وشەی (نَجَّيْنَاهُ) مانای دەرهێنرانی خراوەتە نێو، هەر بۆیە بە پیتی (إِلى) بەرکاری خواستوە، ئەگەر نا دەیفەرموو: (نَجَّيْنَاهُ مِن) دەربازمان کرد لە، بەڵام کە دەفەرمووێ: دەربازمان کرد بۆ، واتە: دەربازمان کردو دەرمان هێنا و کۆچمان پێ

کرد، بەرەو ئەو سەر زەمینەی کە پیت و پێزمان تێخستوە و بۆ جیهانییان، کە مەبەست پێی شامە.

٢)- ﴿ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً ﴾، ئیسحاق و یەعقووبیشمان پێ بەخشین بە زیادە، وشەی (نَافِلَةً ) هەندێکیان گوتوویانە: (حَال)ە، لە یەعقووب، واتە: یەعقووبمان بە زیادە پێ بەخشی، بەڵام دەگونجێ (حال) بێ لە ئیسحاق و لە یەعقووبیش، چونکە خوا ﷻ هەر کام لە ئیسحاق و یەعقووبی کوڕی ئیسحاقیشی بە ئیبراهیم بەخشیین، بەبێ ئەوەی کە ئیبراهیم داوا بکات، ئنجا (نَافِلَةً )ش (الزِّيادَةُ غَيْرُ المَوعُودَة)، زیادەیەک کە بەڵێن نەدراوە (بەڵێنی لەسەر نەدراوە)، ئنجا ئەو زیادە لەسەر چی؟ واتە: زیادە لەسەر ئیسماعیل ؑ، چونکە خوا ﷻ ئیسماعیلی بە ئیبراهیم بەخشیی لە ئەنجامی پاڕانەوە و داواکردنی دا لە خوا ﷻ، بەڵام ئیسحاقی پێدا و یەعقووبیشی بە ئیسحاقدا و، هەردووکیشیانی بە ئیبراهیم ؑ دان، زێدە لەسەر ئیسماعیل کە هەیبوو، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیسماعیل کوڕی گەورەی ئیبراهیمە ؑ، کە ئێمە پێشتر لە تەفسیری سوورەتی (مريم)دا، لە باسی ژیانی ئیسحاق و یەعقووبدا و، لە باسی ژیانی ئیسماعیلدا ئەوەمان خستۆتە ڕوو، کە جوولەکەکان دەڵێن: (ذَبِيْح) واتە: ئەوەی کە هێنراوتە سەر سەربڕین، ئیسحاق بووە، بەڵام ئەم ئایەتەش و لەوێش بەڵگەی دیکەمان هێناوەتەوە، کە نەخێر ئیسماعیل بووە، چونکە هەر لە پەیمانی کۆندا هاتوە کە ئیسحاق پازدە ساڵ لە دوای ئیسماعیل بە ئیبراهیم دراوە و، واتە: ئیسماعیل پازدە (١٥) ساڵ لە ئیسحاق گەورەتر بووە، هەر لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: کوڕە گەورەکەی ئیبراهیم بوو کە هێنرایە سەر سەربڕان، کە کوڕە گەورەکەشی ئیسماعیل بووە[1].

٣)- ﴿ وَكُلًّا جَعَلْنَا صَٰلِحِينَ ﴾، وشەی (وَكُلًّا) لە بارەی ئەم تەنووینە سەری گوتراوە: (عِوَضٌ عَن المُضَافِ إليهِ، أي: كُلَّهُم جَعَلْنَا صَالِحِيْن)، (تەنوین) قەرەبووی پاڵوەلادراوە، یانی: هەر کامێک لەوان (ئیسحاق و یەعقووب)مان لە چاکان گێڕان.

---

(١) لە تەفسیری سوورەتی (الصافات)دا، بەدرێژیی باسی ئەوە مەسەلەیەمان کردوە.

٤)- ﴿ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً ﴾، گێڕاویشمانن بە پێشەوا، وشەی (أَئِمَّة) کۆی (إِمَام)ە، ئەویش بریتیە: لەو پێشڕەو و سەر مەشقەی کە خەڵکێک کاری وەک کاری ئەو بکات.

٥)- ﴿ يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا ﴾، بە فەرمانی ئێمە ڕێنماییان دەکرد (ڕێنمایی خەڵکیان دەکرد)، کە ئەو ڕێنماییە بریتی بووە: لە چاککردنی خەڵک لە ڕووی بووونناسییەوە، لە ڕووی ئیمان و عەقیدەیان، لە ڕووی پەرستشەکانیان، لە ڕووی ئاکارو ڕەوشتی شەخسییان، لە ڕووی ئاکارو ڕەوشتی خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییان و ... هتد، ئەوانە هەمووی دەگرێتەوە.

٦)- ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ ﴾، ئەنجامدانی کردەوە هەرە باشەکانیشمان بۆیان سروشکرد (**أَي: وَأَوحَيْنَا إِلَيْهِم هَذَا الكَلَامُ وَالتَّقْدِيْرُ: وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِم أَنِ افْعَلوا الخَيْرَات**)، بۆمان سروشکردن کە کردەوە هەرە باشەکان (کردەوە باشترەکان) ئەنجام بدەن، چونکە (**خَيْر**) بریتیە لە کردەوەی باشتر، ئنجا (**خَيْرَات**) کۆی (**خَيْرَة**)یە، واتە: کردەوە باشترەکان.

٧)- ﴿ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ ﴾، بۆشمان سروش کردن: بەرپاکردنی نوێژ و، زەکات دان، لێرەدا دوای ئەوەی خوا بە گشتیی فەرموویەتی: (فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ ) کردەوە باشترەکان، بەرپاکردنی نوێژ و زەکات دان، تایبەت کراون، ئەم دووانەی بە تایبەت باس کردوون، کە ئەمەش باسکردنی تایبەتە لە دوای گشتی (**ذكر الخاص بعد العام**)، بۆ ئەوەی سەرنجمان ڕا بکێشێ بۆ گرنگیی نوێژ و زەکات، کە نوێژ هەقی خوایە و، زەکات هەقی خەڵکە، نوێژ پایەی مەعنەویی دیندارییە و، زەکات پایەی ماددیی و ئابووریی دینداریە.

٨)- ﴿ وَكَانُواْ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴾، ئەوان بۆ ئێمە پەرستەر بوون، ملکەچ بوون، واتە: سیفەتی پەرستن و بەندایەتیی کردن بۆ ئێمە، لە ئەواندا ڕۆچوو و ڕیشەدارو جێگیر بوو.

## مەسەلەی شەشەم و کۆتایی:

**پێدانی حیکمەت و زانست بە لووط و، دەربازکرانی لە ئاوەدانیی خراپەکارو، خسترانیە نێو بەزەیی خواوە، بە هۆی چاک بوونیەوە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ۗ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَٰسِقِينَ ﴿٧٤﴾ وَأَدْخَلْنَٰهُ فِى رَحْمَتِنَآ ۖ إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ﴾، ئێمە حیکمەت و زانیارییمان بە لووط بەخشین، حوکم بە تەئکید مەبەست پێی حیکمەتە، نەک حوکم بە واتای حوکمڕانیی و، (علم)یش بەکوردیی: مەبەست پێی زانست و زانیارییە.

جیاوازیی حیکمەت و عیلم چییە؟ حیکمەت: بریتیە لە لێزانیی و کارامەیی، زانیاریی: بریتیە لە زانینی شتەکان، ئنجا جاری وا هەیە کەسێک زانیاریی هەیە، بەڵام حیکمەتی نیە و، جاری وا هەیە حیکمەتی هەیە و زانیاریی نیە، بەڵام هەردووکیان بە یەکەوە کۆببنەوە، زۆر گرنگە، زانیاریی ئەوەیە کە شتەکان وەک خۆیان بزانی، حیکمەت ئەوەیە کە وەک شایستەیە مامەڵە بەو زانیارییەی خۆت بکەی، لەگەڵ شتەکان و دەوروبەردا، کەواتە: زانست زیاتر حاڵەتێکی تیۆریی بە خۆیەوە دەگرێ، بەڵام حیکمەت زیاتر حاڵەتێکی کردەیی بە خۆیەوە دەگرێ، لێرەدا واتە: هەم ناسین و زانینی هەقمان پێ دابوو بە **لووط**، هەم مامەڵەکردنێکی ڕاست و دروست و بەجێ لەگەڵ دەوروبەردا، ئەوەشمان پێ دابوو.

کە دەفەرمووێ: ﴿ وَلُوطًا ءَاتَيْنَـٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ﴾، دەیتوانی بفەرمووێ: (**وَآتَيْنَا لُوْطَاً حُكْمَاً وَعِلْمَاً**)، بەڵام لێرەدا وشەی (**لوط**) کە بەرکار (**مَفعول بِه**)ە و پێشخراوە، ئەمە بۆ دەرخستنی گرنگیی پێدانە بە **لووط** عليه السلام، واتە: ئەو لێزانیی و زانست و شارەزاییەمان بە **لووطدا** بوو و، **لووط** جێگای گرنگیی پێدان و بایەخی ئێمە بوو.

٢)- ﴿ وَنَجَّيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَـٰٓئِثَ ﴾، دەربازیشمان کرد لەو ئاوەدانییەی (لە خەڵکی ئەو ئاوەدانییەی) کردەوە قێزەونەکانی ئەنجام دەدا، کە لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: ئاوەدانیی: سەدووم و عامورا، کە لە تەفسیری سوورەتی (**هُود**)دا بە درێژیی باسمان کردوە و، جگە لە سەدووم و عامورا، ناوی چەند شارو ئاوەدانییەکی دیکەش هاتوە، کە ئەوانە هەموویان شارەکانی گەلی لووط عليه السلام بوون، کە خوای دادگەریش دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلْمُؤْتَفِكَـٰتِ ﴾، هەڵگێڕدراوەکان، واتە: دەبێ زیاتر لە ئاوەدانییەک بووبن، کە ئێستا شوێنەکەیان بووەتە دەریاچەی مردوو، کە شوێنەوارناسەکان دەڵێن: لە ژێر دەریای مردوودا، شوێنەواری ئەو ئاوەدانییە هەڵگێڕدراوانە هەن و، ئەو شوێنەوارانەشیان دۆزیونەوە کە ئایەتەکانی قورئان باسی دەکەن، کە خوای کاربەجێ بەردی سوورەوەکراوی بەسەردا باراندوون.

کە دەفەرمووێ: ﴿ ٱلَّتِى كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَـٰٓئِثَ ﴾، کە کردەوە خراپەکانیان ئەنجام دەدان، وشەی (**الخَبائِث**) کۆی (**الخَبيْثَة**)یە، بەڵام بۆچی بە (**مَؤَنَّث**) هاتوە؟ (**يَعْني: الفِعْلَةُ الشَّنِيْعَة**) واتە: کردەوەی قێزەون و خراپ، مەبەست ئەو کردەوانە بوون، کە گەلی **لووط** عليه السلام ئەنجامیان داون، کە دووانیان: نێربازیی و ڕێگاگرتن لە خەڵک بوون، هەروەک دەفەرمووێ: ﴿ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ﴾، لە کۆڕو مەجلیسانتان دا شتی خراپ دەکەن، خوا ﷻ بە گشتیی فەرموویەتی و هەر کردەوە و ڕەفتارێکی خراپ، دەگرێتەوە.

٣)- ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَـٰسِقِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان کۆمەڵێکی خراپەکاری لاڕێ بوون، (سَوْءٍ) چاوگە، واتە: شتی ناقۆڵا و خراپ، خوا گەلەکەی لووط بەوە وەسف

دەکات، کە خەڵکێکی خراپ و لاڕێ بوون، خراپ بوون و لاڕێیی، دوو وەسفن، کە هەموو جۆرە خراپیی و لاڕێی بوون و لەڕێ دەرچوونێک دەگرنەوە.

٤)- ﴿وَأَدۡخَلۡنَٰهُ فِي رَحۡمَتِنَآ﴾، خستمانە نێو بەزەیی خۆمانەوە، واتە: (لووط)مان خستە نێو بەزەیی خۆمانەوە لە دنیا و دوارۆژدا، خوا ﷻ (لووط)ی لەو خەڵکە دەرباز کردو لە نێویان دەری هێنا و، لەو بەڵایەش قوتارو دەربازی کرد، کە بەسەر گەلە خراپە کارەکەی هێنا، ئەویش ئەوەبوو کە نغرۆی کردن، دێ و ئاوەدانییەکانی هەڵگێڕانەوە، سەرەو بنی کرد، بەرد بارانی کردن، وەک پێشتر بەسەرهاتەکەیمان بە درێژیی باس کردوە، لە تەفسیری سووڕەتی (هود)دا.

٥)- ﴿إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾، بە دڵنیایی ئەو لە چاکان بوو، بێگومان لووط لە چاکان بوو، کەواتە: (صَالِح) یانی: چاک و هەموو ڕەهەندەکانی چاکیی دەگرێتەوە.

خوا بە لوتف و کەرەمیی خۆی، ئێمەش لە چاکان بگێڕێ و، لەو کەسانەمان بگێڕێ کە بە دوای ئەو پێغەمبەرە باش و چاکانە دەکەون و، دەیانکەنە سەرمەشقی خۆیان.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان بیست (٢٠) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە ئایەتەکانی: (٧٦ - ٩٥) ن، کە لەو بیست (٢٠) ئایەتەدا، باسی کورتەیەک لە بەسەرهاتی هەر کام لە: (نووح، داوود، سولەیمان، ئەییووب، یونوس، زەکەریا، مەریەم و کوڕەکەی عیسا) کراوە و، ناوی هەر کام لە: (ئیدریس و ئیسماعیل و زەلکیفل و یەحیا)ش هێنراوە.

شایانی باسیشە لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەم سووڕەتە بە سووڕەتی: **(الأنبیاء)** ناونراوە و، لە دوای سووڕەتی **(الأنعام)** دووەمین سووڕەتە کە تێیدا ناوی ژمارەیەکی هێندە زۆر لە پێغەمبەرانی خوا **(علیهم الصلاة والسلام)** باسکرا بێ، کە بە عیساوە حەڤدە (١٧) پێغەمبەرن، بەڵام لە سووڕەتی **(الأنعام)**دا ناوی هەژدە (١٨) پێغەمبەر بە دوای یەکدا هاتوە، ناوی عیسا نەهاتوە، بەڵام ئاماژەی پێدراوە، بۆیە ئێمە لەم دەرسەماندا ئەو پێغەمبەرانەی کە ماون ژیان و بەسەرهاتیان بخەینە ڕوو، لێرەدا، باسیان دەکەین، کە سوپاس بۆ خوا ئێمە ژیان و بەسەرهاتی هەر کام لەو بیست و پێنج (٢٥)[1] پێغەمبەرەی کە لە سووڕەتەکانی قوڕئاندا ناویان هاتوە، کە ڕابردوون و تەفسیرکردنیانمان گوزەراندوە و، بەسەرهاتی هەموویانمان باسکردوە، تەنها مووسا ﷺ پێنج قۆناغێکی ژیانی ماوە، کە وەک بەڵێنمان داوە لە سەرەتای سووڕەتی **(القصص)**دا، ئەو پێنج قۆناغەی ژیانی کە ماون، لەوێدا باسیان دەکەین، ئەگەر نا پێغەمبەرەکانی دیکە ﷺ هەموویان بەسەرهاتەکانیانمان خستوەتە ڕوو، جگە لەم شەشە: (داوودو سولەیمان و ئەییووب و زەلکیفل و ئەلیەسەع و ئیلیاس).

---

(١) ژیانی سەروەری پێغەمبەرانیش (محمد) ﷺ لە میانی تەفسیرکردنی سووڕەتەکان دا زۆری خراوەتەڕوو، جگە لە کتێبی (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا) ﷺ.

ئنجا ئێمە لەمیانی تەفسیرکردنی ئەم (٢٠) ئایەتەدا، باسی ئەو شەش پێغەمبەرەش دەکەین، کە چوار لەوانەی کە بەسەرهاتەکەیانمان نەگێڕاونەوە: (داوودو سولەیمان و ئەییووب و زەلکیفل)ن، ناویان هاتوە، لێرەدا دوو پێغەمبەرەکەی دیکە (ئەلیەسەع) ناوی لە سوورەتی **(الأنعام)**دا هاتوە و، (ئیلیاس)یش ناوی لە سوورەتی **(الصافات)**دا هاتوە، بەڵام ئێمە لێرە بەسەر یەکەوە کورتەیەک و پوختەیەک لە بەسەرهات و ژیانی هەر کام لەم شەش پێغەمبەرانە **(عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)**، دەخەینە ڕوو، تاکو دوایی ئەگەر ویسترا ژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەران **(عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)**، لەم تەفسیرە دەربهێندرێ، ئەم شەشانە لێرەدا لە سوورەتی **(الأنبیاء)** بەسەریەکەوەو، چواریان لە سوورەتی (هود)دا باس کراون و، حەوتیشیان لە سوورەتی (مریم)دا ئەوانی دیکەش هەر کامێکیان لەو سوورەتەدا کە ناوی هاتوە، یاخود ئەو سوورەتەی کە بە ناوی ئەوەوەیە، یاخود کام سوورەتە باشتر لەگەڵ بەسەرهاتی ئەودا گونجاوە، لەوێدا بە درێژیی باسکراون.

﴿وَنُوحًا إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَنَجَّيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَنَصَرْنَـٰهُ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَأَغْرَقْنَـٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٧٧﴾﴾ ﴿وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِى ٱلْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَـٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾ فَفَهَّمْنَـٰهَا سُلَيْمَـٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ ۚ وَكُنَّا فَـٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾﴾ وَعَلَّمْنَـٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ ۖ فَهَلْ أَنتُمْ شَـٰكِرُونَ ﴿٨٠﴾ وَلِسُلَيْمَـٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَـٰرَكْنَا فِيهَا ۚ وَكُنَّا بِكُلِّ شَىْءٍ عَـٰلِمِينَ ﴿٨١﴾ وَمِنَ ٱلشَّيَـٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعْمَلُونَ عَمَلًا دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَكُنَّا لَهُمْ حَـٰفِظِينَ ﴿٨٢﴾ ۞ وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ ۖ وَءَاتَيْنَـٰهُ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَـٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾

وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٨٥﴾ وَأَدْخَلْنَٰهُمْ فِى رَحْمَتِنَآ ۖ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٦﴾ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْغَمِّ ۚ وَكَذَٰلِكَ نُۨجِى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَزَكَرِيَّآ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرْنِى فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٨٩﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَوَهَبْنَا لَهُۥ يَحْيَىٰ وَأَصْلَحْنَا لَهُۥ زَوْجَهُۥٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾ وَٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلْنَٰهَا وَٱبْنَهَآ ءَايَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٩١﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُونِ ﴿٩٢﴾ وَتَقَطَّعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ ۖ كُلٌّ إِلَيْنَا رَٰجِعُونَ ﴿٩٣﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا كُفْرَانَ لِسَعْيِهِۦ وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ ﴿٩٤﴾ وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَآ أَنَّهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿٩٥﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها یادی نووح بکە کە پێشتر (بەر لەو پێغەمبەرانەی باسکران) بانگی (پەروەردگاری کرد)، ئێمەش وەڵامـمان دایەوە (بە دەنگیەوە چووین) و خۆی و خێزان و نیزیکەکانیمان لە بەڵای مەزن قوتار کردن ﴿٧٦﴾ هەروەها سەرمانخست بەسەر ئەو خەڵکەدا، کە ئایەتەکانمانیان بە درۆ دانا و لێیان دەربازمان کرد، بە دڵنیایی ئەوان کۆمەڵێکی خراپ بوون، بۆیە تێکڕایانمان لە تۆفاندا خنکاندن ﴿٧٧﴾ هەروەها یادی داوودو سولەیمان (ی کوڕی) بکەوە، کاتێک لە بارەی ئەو کشتوکاڵەوە کە بە شەوێ مەڕی کۆمەڵە خەڵکێکی بەرهەڵدا بوو بۆیە {زەڕی تێدا کرد بوو، زیانی پێگەیاندبوو} دادوەرییان دەکردو، ئێمەش ئامادەی

دادوەرییەکەیان بووین ﴿٧٨﴾ سەرەنجام دادوەریی کردنی ڕاستمان لە بارەیەوە لە سولەیمان گەیاندو، حیکمەت و زانیارییشمان بە هەر کامێکیان دابوو، چیایەکان و باڵندەکانیشمان لەگەڵ داوودا ڕام و دەستەمۆ کردبوون بەپاکیان دەگرت (خوا) و هەر ئێمەش بکەر(ی ئەوە) بووین (کە باسکرا) ﴿٧٩﴾ هەروەها دروستکردنی پۆشاکێکمان فێر(ی داوود) کرد کە لە زەبرو ئازاری جەنگتان بتانپارێزێ، ئنجا ئایا ئێوە سوپاسگوزارن؟! ﴿٨٠﴾ هەروەها بای توندمان بۆ سولەیمان ڕامکرد، بە فەرمانی وی بەرەو ئەو سەر زەمینەی پێزمان تێخستوە، دەڕۆیی و بە هەموو شتێکیش زانا بووین ﴿٨١﴾ هەندێک کەسیشمان لە شەیتانەکان بۆ دەستەمۆ کردبوون، بۆی بە دەریادا ڕۆ دەچوون (کە گەوهەرو مرواریی بۆ دەربێنن) و، کاری دیکەشیان جگە لەوانە بۆ دەکردو، ئێمەش پارێزەریان بووین (کە یاخیی نەبن و زیان بە خەڵکی نەگەیەنن) ﴿٨٢﴾ هەروەها یادی ئەییووب بکەوە کە بانگی پەروەردگاری کردو (گوتی:) من ئازارو ناڕەحەتییم تووش بووەو، تۆش بە بەزەییترینی بە بەزەییانی ﴿٨٣﴾ ئێمەش بە دەنگیەوە هاتین و ئازارو ناڕەحەتییەکەیمان لێ لابردو، خێزان و نیزیکەکانیمان پێ بەخشیی و، وێڕاشیان هێندەی خۆشیان، وەک بەزەییەک لە لایەن خۆمانەوەو، پەندو یاد خستنەوەش بوو بۆ (خوا) پەرستەران ﴿٨٤﴾ هەروەها یادی ئیسماعیل و ئیدریس و زەلکیفل بکە، هەموویان لە خۆڕاگران بوون ﴿٨٥﴾ خستیشماننە نێو بەزەیی خۆمانەوە، بە ڕاستیی ئەوان لە چاکان بوون ﴿٨٦﴾ هەروەها یادی خاوەنی نەهەنگ (یونوس) بکەوە، کاتێک بە تووڕە بوون (لە گەلەکەی) ڕۆیی و پێیوابوو کە سەر زەمینمان لێی وەتەنگ نەهێناوە {و بۆ هەر کوێیەک بچێ ڕێی پێدراوە، بەڵام چونکە بەبێ مۆڵەت ڕۆیشتبوو لە سکی نەهەنگدا حەپسمان کرد}، ئنجا لە تاریکاییەکاندا (تاریکایی سکی نەهەنگ و دەریا و شەوگار) بانگی کردو (گوتی: ئەی خوایە!) بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراوێک نیە، پاکییت ڕادەگەیەنم، مسۆگەر من لە ستەمکارانم ﴿٨٧﴾ ئێمەش بە دەنگیەوە هاتین و لە خەم و تەنگانە دەربازمان کردو، ئاواش بڕواداران لە خەم و تەنگانان قوتار دەکەین ﴿٨٨﴾ هەروەها یادی

زەکەریيا بکەوە کاتێک بانگی پەروەردگاری کرد: پەروەردگارم! مەهێڵە تەنیا بکەومەوەو، تۆش باشترینی میراتگرانی ﴿٨٩﴾ ئێمەش بە دەنگیەوە هاتین و یەحیا (ی کوڕیمان) پێدا و، هاوسەرەکەشمان بۆ چاککرد {کە منداڵی ببێ} بە دڵنیایی ئەوان هەمیشە لە (کردەوە) چاکەکاندا خێراییان دەکردو، بە ئومێدو ترسەوە لێمان دەپاڕانەوە و بۆمان زۆر ملکەچ بوون ﴿٩٠﴾ هەروەها یادی ئەو ئافرەتە بکەوە کە داوێنی خۆی (لە هەڵەو پەڵە) پاراست، ئێمەش لە ڕووحی خۆمان فوومان پێدا کردو، خۆی و کوڕەکەیشیمان کردە نیشانەیەک بۆ جیهانییان (کە دەسەڵاتی ڕەها و بێ سنووری خوای پەروەردگاری پێ دەرک بکەن) ﴿٩١﴾ ئا ئەمە کۆمەڵەکەتانە (ئەی بڕوادارینە!) یەک کۆمەڵە، لەسەر ڕاستە شەقامی خوا و منیش پەروەردگارتانم، دەجا تەنیا من بپەرستن ﴿٩٢﴾ (ئەو پێغەمبەرانە یەک کۆمەڵی سەر ڕاست بوون) کەچی (زۆرێک لە پاشینەکانیان ئایینەکەیانیان) لە نێو خۆیاندا بەش بەش کرد، هەمووشیان تەنیا بۆ لای ئێمە دەگەڕێنەوە ﴿٩٣﴾ ئنجا هەر کەس لە کردەوە چاکەکان بکات و بڕواداریش بێ، کۆششەکەی نادیدە ناگیرێ (و ناسوپاسیی بەرانبەر ناکرێ) و ئێمە (پاداشتی تەواوی) بۆ دەنووسین ﴿٩٤﴾ هەر ئاوەدانییەکیش کە فەوتاندوومانە، لێیان قەدەغەیە کە نەگەڕێنەوە بۆ لای خوا (بۆ سزادرانیان) ﴿٩٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلۡكَرۡبِ): (**الحُزْنُ وَالغَمُّ يَأْخُذُ بِالنَّفْسِ، والجَمْعُ: كُرُوب، الكُرْبَةُ: الكَرْبُ، والجَمْعُ: كُرَبٌ**)، (**كَرْب**)، واتە: دڵتەنگیی و خەمێکە، کە دڵی ئینسان دادەگرێ، (**كَرْب**) بە (**كُرُوب**) کۆدەکرێتەوە، (**كُرْبَةٌ**) ش یانی: یەک خەم، کە بە (**كُرَب**) کۆدەکرێتەوە، هەروەها (**كَرْب**) و (**كُرَب**) بە یەک واتاش هاتوون، هەردووکیان یانی: خەم و خەفەت و دڵتەنگیی.

(ٱلۡحَرۡثِ ): (الزَّرْعُ: الأَرْضُ المَحْرُوثَةُ)، (حَرْث) واتە: كشتوكاڵ، هەروەها بە زەویی كێڵدراویش دەگوترێ، (حَرْثُ الدُّنْيَا: مَتَاعُهَا)، ڕابواردن و گوزەرانی ژیانی دنیا، (حَرْثُ الأَخِرَة: العَمْلُ الصَّالِح)، كێڵگەی دواڕۆژ یان كشتوكاڵی دواڕۆژ، كردەوەی چاك.

(نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ ٱلۡقَوۡمِ ): (نَفَشَتِ المَاشِيَةُ فِي الزَّرعِ: انْتَشَرَتِ فِيْهِ وَرَعَتْهُ لَيْلًا)، (نَفْش) بە مانای بڵاوبوونەوە دێ، بەڵام (نَفَشَتِ المَاشِيَةُ فِي الزَّرعِ)، واتە: ئاژەڵەكە بە شەوێ بەربووە نێو كشتوكاڵەكە و زەڕی كردو تێیدا لەوەڕا و خواردیی.

(لَبُوسٍ ): (اللَّبُوسُ: مَا يُلْبَسُ، وَالجَمْعُ: لُبُس، الدِّرْعُ)، بە مانای پۆشاك دێ و، تایبەت بە مانای زرێ دێت، واتە: پۆشاكی جەنگیی، هەندێكیش دەڵێن: (لَبُوس) هەم بە مانای زرێ دێ، هەم بە مانای خوودە دێ، هەم بە مانای هەموو ئەو شتانە دێ كە لە جەنگدا بەكاردەهێنرێن.

(بَأۡسِكُمۡ ): (البَأْسُ: الشِّدَّةُ فِي الحَرْبِ، الحَرْبُ، العَذَابُ الشَّدِيْدُ، الخَوْفُ)، وشەی (بَأْس) هەم بەم مانای سەختیی جەنگ و زەبری جەنگ دێ و، هەم بە مانای خودی جەنگ دێ و، هەم بە مانای سزای سەخت دێ و، هەم بە مانای ترسیش دێ.

(عَاصِفَةً): (عَصَفَتِ الرِّيْحُ عَصْفَاً وَعُصُوفاً: اشْتَدَّ هُبُوبُهَا فَهِيَ عَاصِفٌ وَعَاصِفَةٌ، وَالجَمْعُ: عَوَاصِف)، (عَصَفَتِ الرِّيْحُ عَصْفَاً وَعُصُوفاً)، واتە: بایەكە هەڵیكرد زۆر بە توندیی، بای توند پێی دەگوترێ: (عَاصِف)، پێشی دەگوترێ: (عَاصِفَة)، كە بە (عَوَاصِف) واتە: بایە توندو بە هێزەكان، كۆدەكرێتەوە.

(يَغُوصُونَ ): واتە: بۆی دەچوونە نێو دەریا، (غَاصَ يَغُوصُ فِي المَاءِ غَوْصَاً: نَزَلَ تَحْتَهُ)، واتە: چووە ژێری دەریا، چووە ژێر ئاو، (غَائِص) واتە: كەسێك كە چۆتە بن ئاوێ، كۆیەكەی (غُوّاص)، بەڵام صیغەی زێدەڕۆیی كردن (صيغة المبالغة) یە، (غَائِص) بریتیە لە (غَوّاص)، واتە: كەسێك كە زۆر دەچێتە نێو ئاوێ و خۆی تێیدا نقوم دەكات بۆ ئەوەی شت دەربێنێ، بە تایبەت ئەوانەی كە بە دوای گەوهەرو مرواریی دا دەگەڕێن لە ژێر دەریادا.

(مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ): (مَسَّهُ العَذَابُ: أَصَابَهُ)، واتە: تووشم بووە، (ضُر) هەر ئازارو ناڕەحەتییەکە کە لە جەستەی مرۆڤدا دەبێت، جاری وایە بە مانای زیانی ماڵ و سامانیش دێت، بەڵام لێرەدا بە مانای زیانی جەستە و ناخۆشیی و نەخۆشیی دێ.

(نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ): (قَدَر الرِّزْقَ عَلَيْهِ: ضَيَّقَ)، واتە: بژێوی لێ وە تەنگ هێنا، ﴿فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ﴾، پێی وا بوو ئێمە سەر زەمینمان لێ وەتەنگ نەهێناوە، واتە: مولزەم و پابەندمان نەکردوە کە لەسەر زەمینی نەینەوادا بمێنێتەوەو، نەچێ بۆ جێگایەکی دی.

(ٱلۡغَمِّ): (الكَرْبُ أوِ الحُزْنُ: يَحْصِلُ للقَلْبِ بِسَبَبٍ مَا، وَالجَمْعُ: غُمُوم)، (غَمّ) بریتیە لە غەم و پەژارەیەک کە بە هۆکارێکەوە دێتە نێو دڵەوە، کە بە (غُمُوم) کۆدەکرێتەوە، (غَمّ) پەیوەندیی بە ئێستا و داهاتووەوە هەیە، بەڵام (حُزْن) پەیوەندیی بە ڕابردووەوە هەیە، (همّ)یش پەیوەندیی بە داهاتووەوە هەیە.

(رَغَبٗا): (رَغِبَ يرغَبُ، رَغَباً وَرَغْبَةً وَرُغْبَةً: حَرَصَ عَلَى الشَّيءِ وَطَمِعَ فِيه)، (رَغِبَ يرغَبُ، رَغَباً وَرَغْبَةً وَرُغْبَةً)، واتە: ئارەزووی بۆ چوو، لەسەری سوور بوو، تەماعی تێیکرد، پێی ئومێدەوار بوو.

(وَرَهَبٗا): (رَهِبَ يَرْهَبُ رَهَباً وَرَهْبَةً وَرُهْبَاً: خَافَ)، واتە: ترسا، بەڵام جیاوازیی نێوان (خَوْف) و (رَهْبَة)، ئاوایە: (رَهْبَة) واتە: سام لێکردن، بەڵام (خَوْف) واتە: ترسان، کەواتە: ﴿وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗا﴾، بە ئومێدەواربوون و تامەزرۆ بوون و عەوداڵبوونەوە، بە سامڵێکردن و سام ڕێنیشتنەوە بەرانبەرمان، لێمان دەپاڕانەوە.

(وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم): واتە: کارەکەی خۆیانیان - کە مەبەست پێی لە ئایینەکەیانە - بەش بەش کردو دابڕ دابڕ کرد، (تَقَطَّعَ الشَّيءُ: تَفَرَّقَتْ أَجْزَاؤهُ: أَي: تَفَرَّقُوا فِيه)، واتە: لە ئایینەکەیاندا گرووپ گرووپ بوون، بوونە بەش بەش و تاقم تاقم، هەر کامێکیان بەشێک لە ئایینەکەی پیادە دەکرد، هەروەک ئەو دەردە لە مسوڵمانانیش قەوماوە، یەکیان تەنیا لە لایەنی ڕووحیی دەگرێ و، یەکێک

تەنیا لایەنی فیکریی دەگرێ و، یەکێک تەنیا لایەنی پەروەردەیی دەگرێ و، یەکێ تەنیا لایەنی سیاسیی دەگرێ و، یەکێک تەنیا لایەنی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە دەگرێ و... هتد، کە هەمیشە مسوڵمانان وەک ئۆممەتانی پێشوو، لە ئەنجامی ئەوەدا کە تێگەیشتنی گشتگیرو قووڵ و تێرو تەواویان بۆ ئایینەکەیان نابێ، دینداریيەکەشیان پچڕ پچڕو دابڕ دابڕ دەبێ.

(كُفْرَانَ): (كَفَرَ بِاللهِ يَكْفُرُ كُفْراً وَكُفْرَاناً، وَكَفَرَ بِالنِّعْمَةِ جَحَدَهَا، وَكَفَرْتُه كُفْراً أي: سَتَرْتُهُ)، (كُفْرَان) دەگونجێ چاوگی (كَفَرَ بِاللهِ يَكْفُرُ كُفْراً وَكُفْرَاناً) بێ، واتە: بێبڕوایی، بەڵام لێرەدا ﴿فَلَا كُفْرَانَ لِسَعْيِهِۦ﴾، ئەمە مەبەست پێی کوفرانی نیعمەتە، واتە: نادیدەگرتنی، دەگوترێ: (وَكَفَرَ النِّعْمَةَ وَكَفَرَ بِالنِّعْمَةِ جَحَدَهَا)، واتە: نکووڵیی لێکردو نادیدەی گرت، کەواتە: (كُفْرَانَ) یانی: سپڵەیی و ناسوپاسیی و نادیدەگرتنی چاکە، دەگوترێ: (كَفَرْتُهُ كَفْراً أي: سَتَرْتُهُ)، (كَفْر) واتە: پۆشین، هەر وشەی (كُفر) لە ئەصڵدا لە (كَفْر)ەوە هاتوە، چونکە بابای بێبڕوا ئەو هەقە کە ڕاستییەکانی ئیمانن، دایاندەپۆشێ بە هۆی نکووڵییلێکردنەوە، هەروەک کەسێکی سپڵەش ئەو چاکەیەی لەگەڵیکراوە، دایدەپۆشێ و لە بیرخۆی دەباتەوە، هەم سپڵەیی (كُفْرَانَ)، کە پێچەوانەی (شُكْر)ە، هەم (كُفْر) کە پێچەوانەی (ئیمانە)، هەردووکیان پەیوەندییان بە ڕیشە زمانەوانییەکەیانەوە هەیە کە بریتیە لە داپۆشین (كَفْر).

(لِسَعْيِهِۦ): (سَعَى فِي مَشْيِهِ: هَرْوَلَ وَسَعَى إلى الصَّلَاةِ: ذَهَبَ)، (سَعى) واتە: بە ڕاکردن و بە خێرایی ڕۆیشت بۆ نوێژ، دەشگونجێ هەر بە مانای ڕۆیشتنی ئاسایی بێ، بەڵام (سَعي) لێرەدا یانی: کۆشش و هەوڵ، ئنجا لەبەر ئەوەی ئینسان کارێک کە دەیکات، دەبێ بە پێیان بە دوایی دا بچێ، لەوەوە وشەی (سَعي) خوازراوەتەوە بۆ هەر هەوڵ و تێکۆشانێک، بەڵام لە ئەصڵدا وشەی (سَعي) بە مانای ڕۆیشتنی خێرا دێ.

(وَحَرَامٌ): (الحَرَامُ: المَمْنُوعُ مِنْ فِعْلٍ)، واتە: قەدەغە، شتێک کە نەهێڵدرێ ئەنجام بدرێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی هەر کام لە مووسا و هارووونی برای کرد، صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، بە ئاماژە پێکردن و، تۆزێک بە درێژیی باسی بەسەرهاتی ئیبراهیمی کرد لەگەڵ بابی و لەگەڵ گەلەکەیدا و، تەگبیر کردنی بۆ تێک و پێک شکاندنی بت و صەنەمەکانیان و، ئەوەی کە بەسەری هات، کە لەسەر ئەوە خرایە نێو ئاگری سوورەوەو، خوا ﷻ دەربازی کردو، دوای ئەوەی کە ئاماژەکرا بەوەی خوا ﷻ هەر کام لە ئیسحاق و یەعقووبی بە ئیبراهیم بەخشین (**عليهم الصلاة والسلام**)، دوای ئەوە باسی لووط کرا، کە خوا ﷻ هەر کام لە ئیبراهیم و لووطی دەربازکردن، بەرەو سەر ئەو زەمینەی پیت و پێزی تێخراوە (کە شامە) دوایی کورتەیەکی ئاماژە ئاسا لەسەر ژیان و بەسەرهاتی (**لوط**) ﵇ باسکرا، کە ئێمە بەسەرهاتی ئەویشمان لە سوورەتی (هود)دا خستۆتە ڕوو، ئنجا باسی هەر کام لەو پێغەمبەرانەی دیکە دەکات: (نووح و داوودو سولەیمان و ئەیووب و یونوس و زەکەرییا و ئاماژەیەکیش بە مەریەم و عیسای کوڕی).

سەرەتا دەفەرمووێ: ﴿ وَنُوحًا إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ ﴾، واتە: (**أُذْكُرْ نُوحَاً**) یادی نووح بکەوە، یاخود: (**وَنَجَّيْنَا نُوحَاً**) ئێمە نووحیشمان دەرباز کرد، ﴿ إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ ﴾، کە پێشتر هاوارو بانگی کرد، بانگی کێی کرد؟ بە دڵنیایی بانگی پەروەردگاری خۆی کرد، لە خاوەنی پاڕایەوە، کە دەفەرمووێ: ﴿ مِن قَبْلُ ﴾، لە پێشدا، واتە: لە پێش ئەو پێغەمبەرانەدا کە باسکران، چونکە نووح ﵇ لە پێش هەموویانەوە بووە، ﴿ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَنَجَّيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴾، ئێمەش وەڵامان دایەوە و بە دەمیەوە چووین و، خۆی و نزیکەکانیمان لە خەم و بەڵایەکی مەزن قوتار کردن.

﴿ وَنَصَرْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ ﴾، دەربازمان کردو سەرمان خست بەسەر ئەو کۆمەڵەدا کە نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆ دانان، ﴿ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَوْمَ سَوْءٍ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان کۆمەڵێکی زۆر خراپەکارو ناقۆڵا بوون، ﴿ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، بۆیە ئێمەش تێکڕایانمان خنکاندو نغرۆمانکردن لە تۆفاندا.

﴿ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ ﴾، هەروەها داوودو سولەیمانیشمان دەرباز کردن، یاخود: یادی داوودو سولەیمانیش بکەوە، کە باب و کوڕ بوون، چونکە خوا ﷻ لە سوورەتی (ص)دا دەفەرمووێ: ﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ ۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ ﴾، واتە: سولەیمانمان بە داوود بەخشی، باشترین بەندە بوو و، زۆر بۆ لای پەروەردگاری دەگەڕایەوە، ئنجا لێرە دەفەرمووێ: ﴿ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ ﴾، یادی داوودو سولەیمان بکەوە، ﴿ إِذْ يَحْكُمَانِ فِى ٱلْحَرْثِ ﴾، کاتێک کە دادوەرییان دەکرد لە بارەی کشتوکاڵەکەوە، ﴿ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ ﴾، کاتێک کە مەڕی خەڵکێک بەشەوێ چووە تێی، {(نَفْش) واتە: بڵاوکردنەوە، بەڵام ﴿ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ ﴾، واتە: مەڕی کۆمەڵەکە بە شەوێ بەر هەڵدا بوو، بە شەوێ لەوەڕی کرد.

بێگومان کۆمەڵەکە (قوم) خەڵکێکی دیکەی جیا بوون، لە ئەو خەڵکەی خاوەنی کشتوکاڵەکە بوون، واتە: کۆمەڵە خەڵکێک هەبوون خاوەنی کشتوکاڵ بوون، خەڵکێکی دیکەش هەبووە خاوەنی ئاژەڵ بوون، ئاژەڵی ئەو خەڵکەی خاوەن ئاژەڵ بوون، بە شەوێ بەربۆتە کشتوکاڵی جوتیارەکان، ﴿ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَٰهِدِينَ ﴾، داوودو سولەیمانیش دادوەرییان دەکرد لە بارەی ئەو کێشەیەوە، کە چۆن چۆنی ئەو کێشەیان چارەسەر کرد؟ کە ئاژەڵی خاوەن ئاژەڵەکان، زیانی گەیاندوە بە کشتوکاڵی خاوەن کشتوکاڵەکان، خوا ﷻ دەفەرمووێ: ئێمەش بۆ دادوەرییەکەیان ئامادە بووین و ئاگادار بووین.

﴿ فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ﴾، ئێمە کێشەکەمان لە سولەیمان حاڵیی کردو تێمان گەیاند، یاخود حوکم و بڕیاری ڕاستمان لە بارەی ئەو کێشەیەوە، لە سولەیمان

حاڵیی کرد، ﴿ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ﴾، بەڵام بە هەر کامێکیانیش هەم حیکمەت و دانایی، هەم زانیاریی و شارەزاییشمان پێدابوون، لێرە هەر بە ئاماژە باسی ئەو بەسەرهاتە دەکات، بەڵام دوایی وەک لە مەسەلە گرنگەکانیشدا دەیخەینە ڕوو، زانایان و شارەزایان لە تەفسیرەکانیاندا، ئەو بەسەرهاتەیان بە ڕوونیی هێناوە، کە وا پێدەچێ ئەو بەسەرهاتەیان لە کتێبی خاوەن کتێبەکان وەرگرتبێ و کورتەکەی ئەوەیە:

ئاژەڵی چەند کەسێک (چونکە خوا ﷻ بە قەوم ناویان دەبات)، وادیارە مێگەلێکی مەڕو بزنان بووە، چۆتە نێو کشتوکاڵی خەڵکێکی دیکەوە، (کە ئەویش مەرج نیە هی یەک پیاو بوو بێ، ئەوانیش لەوانەیە کۆمەڵێک بووبن)، بە شەوێ بەرهەڵدا بوونە نێوی و، خواردوویانە و زەڕیان پێگەیاندوە و شێلاویانە، زیان پێگەیشتووەکان کە خاوەن کشتوکاڵەکانن، دەچن بۆ لای داوود ﷺ کە هەم حوکمڕان بووە و، هەم پێغەمبەری خوا بووە، ئەویش وا دادوەریی دەکات کە مەڕەکان بینە هی خاوەن کشتوکاڵەکان و، زەوییەکەش ببێتە هی خاوەن ئاژەڵەکان، دوایی کە دەردەچن سولەیمان ﷺ کە ئەو کاتە گەنج بووە، لێیان دەپرسێ: بابم چۆن دادوەریی لە نێواندا کردن؟ ئەوانیش بۆی باس دەکەن، ئەویش دوایی دەچێتەوە خزمەت بابی و دەڵێ: ئەگەر بە جۆرێکی دیکە دادوەرییان لە نێواندا بکەی باشترە، بابیشی دەڵێ: چۆن؟ دەڵێ: ئاژەڵەکان تەسلیمی خاوەنانی زەوییەکە بکە، با لێیان بەهرەمەند بن، لە بەرهەمەکانیان بەهرەمەند بن و، زەوی کشتوکاڵەکەش بدە بە خاوەن ئاژەڵەکان، تاکو کشتوکاڵە پێش ئەوەی زەڕ بکرێ چۆن بووە، ئاوای لێ دەکەنەوە، زەوییەکەیان بۆ دادەچێننەوە و دەیکەنەوە بە کشتوکاڵ، تا ئەو کاتەی مەڕەکانیان زەڕیان کردوە، دوایی با ئاژەڵەکان بینەوە هی خاوەن ئاژەڵەکان و، زەوییەکەش ببێتەوە بە موڵکی خاوەنەکانی خۆی، داوودیش ﷺ دادوەرییەکەی ئەوی لەلا پەسندتر دەبێ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: حوکمە ڕاستترەکەمان لە سولەیمان حاڵیی کرد.

دوایی خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ﴾، لەگەڵ داووددا چیاکانمان ملکەچ کردبوون، ڕام و دەستەمۆ کرد بوون و، هەروەها باڵندەکانیش، ﴿يُسَبِّحْنَ﴾، خوایان بە پاک دەگرت، تەسبیحاتیان بۆ خوا دەکرد، ﴿وَكُنَّا فَٰعِلِينَ﴾، هەر ئێمە ئەنجامدەری ئەو کارە بووین، دوایی باسی دەکەین، کە ئایا مەبەست لە تەسبیح لێرەدا هەر ئەوە بووە کە کاتێک داوود ڕاز و نیاز و پاڕانەوەی کردوە، چیایەکان و باڵندەکانیش لەگەڵیان گوتوتەوە، واتە: چیایەکان دەنگیان داوەتەوەو، باڵندەکانیش جریواندوویانە، یاخود بە شێوەیەکی موعجیزە بووە، واتە: بە شێوەیەکی نائاسایی بووە، ئەگەر نا هەر کەسێک لە چیایەکان هاوار بکات، هەر دەنگ دەدەنەوە و ئەوە تایبەت نیە بە داوودەوە، کە هەندێکیان بەو شێوەیە تەفسیریان کردوە، ﴿وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ﴾، هەروەها پیشەسازیی دروستکردنی پۆشاکمان فێری داوود کرد بۆ ئێوە، نەیفەرمووە: (لِبَاسٍ لَكُم) بەڵکو (لَبُوسٍ لَّكُمْ) بۆچی؟ ﴿لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ﴾، تاکو لە سەختیی و زبریی جەنگ بتانپارێزێ، کەواتە: (لَبُوسٍ) لێرەدا مەبەست پێی پۆشاکێکی تایبەتە، کە پۆشاکی جەنگییە و مەبەست پێی زرێیە، یاخود هەر شتێکی دیکە کە مرۆڤ لە زەبری بەرانبەرەکەی لە کاتی جەنگدا بپارێزێ، هەرچەندە (لَبُوسٍ) بە واتای پۆشاکی ئاساییش هاتوە، بەڵام لێرەدا بە پێی سیاقی ئایەتەکان دەزانرێ، کە ئەوە پۆشاکێکی تایبەتە و پۆشاکی جەنگییە، ﴿فَهَلْ أَنتُمْ شَٰكِرُونَ﴾، ئنجا ئایا ئێوە سوپاسگوزارن لەسەر ئەوەی خوا ﷻ ئەو نیعمەتانەی بەو پێغەمبەرانە داون، کە بۆ خەڵکی بەکاریان هێناون؟!.

﴿وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً﴾، (و) وشەی (سلیمان) بادەداتەوە و دەگێڕێتەوە سەر: ﴿وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ﴾، واتە: (وَسَخَّرنا لِسُلَيمانَ الرِّيْحَ)، هەروەها بۆ سولەیمانیش (با)مان دەستەمۆ کرد بوو، ﴿عَاصِفَةً﴾، بە توندیی و بەهێز هەڵیدەکرد، ﴿تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا﴾، بە فەرمانی ئەو دەڕۆیی بۆ ئەو سەر زەمینەی کە پیت و پێزمان تێخستبوو، مەبەست پێی سەر زەمینی

شامە، ﴿ وَكُنَّا بِكُلِّ شَيْءٍ عَٰلِمِينَ ﴾، ئێمە بە هەموو شتێک زانا بووین، ئەمیش لێرەدا دیسان زانایان مشت و مڕیان بووە لەو بارەوە: کە ئایا ئەو بایە هەر ئەوە بووە، کە کەشتییەکانی بۆ سولەیمان گەیاندووە جێی مەبەست، یاخود بە جۆری دیکەش بووە؟ بە تەئکید بە جۆری دیکەش بووە، وەک دواتریش باسی دەکەین، چونکە (با) کەشتییان بڕوێنێ، تایبەت نیە بە سولەیمانەوە، (با) کەشتیی هەموو کەس لە دەریادا هەر دەجوولێنێ.

﴿ وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ ﴾، هەروەها لە شەیتانەکانیشمان بۆی ملکەچکردبوون کە بۆی ڕۆ دەچوون، واتە: بۆی ڕۆدەچوونە نێو دەریا، ئنجا لێرەدا وشەی: (غاصَ: يَعْني دَخَلَ تَحْتَ المَاء) (غاصَ) چووە نێو ئاوو پێیدا ڕۆچوو، ئیدی پێویست ناکات وشەی دەریا بەکار بهێنێ، چونکە (غَوْص) هەر چوونە نێو دەریایە، بۆیە ئەو قورئانە مەزنە وشەیەکی زیادی تێدانیە، هەر وشەیەک خوا ﷻ زاینویەتی، دەزانرێ بە پێی سەلیقە و سیاق، کتێبی خۆی پێ قەڕەباڵغ نەکردوە، ئنجا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: هەندێک لە شەیتانەکانمان بۆ ملکەچ و دەستەمۆ کردبوون، بۆی ڕۆ دەچوونە نێو دەریا، هەر دیارە بۆچی ڕۆ دەچنە نێو دەریا؟ بۆ ئەوەی گەوهەرو مرواریی بۆ دەربێنن، بۆیەباسی نەکردوە، ﴿ وَيَعْمَلُونَ عَمَلًا دُونَ ذَٰلِكَ ﴾، هەروەها کاری جگە لەوەشیان بۆ دەکرد، وەک لە سوورەتی (سبأ)دا دەفەرموێ: ﴿ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَٰتٍ ﴾، وەک دوایی باسی دەکەین، ﴿ وَكُنَّا لَهُمْ حَٰفِظِينَ ﴾، ئێمەش بۆ ئەوان پارێزەر بووین، واتە: ئەو شەیتانانەمان دەپاراست و نەماندەهێشت لابدەن، یاخیی بن، نەماندەهێشت زیان بە خەڵک بگەیەنن، نەماندەهێشت لە فەرمانی سولەیمان دەربچن.

ئنجا دێتە سەر باسی پێغەمبەرێکی دیکە، کە ئەییووبە ﷺ، دەفەرموێ: ﴿ وَأَيُّوبَ ﴾، واتە: یادی ئەییووب بکەوە، یاخود: ئەیووبیشمان تاقی کردەوە، ﴿ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ ﴾، کاتێک کە لە پەروەردگاری پاڕایەوە، ﴿ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ

﴿ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾، پاڕانەوەکەی ئەوە بوو فەرمووی: من ئازارو ناڕەحەتییم تووش بووە، تۆش بە بەزەییترینی بە بەزەییانی، دیارە ناڕەحەتیی و گرفتارییەکەی ئەییووب، لێرەدا باس نەکراوە، چییە، هەروەک لە سوورەتی (**الصافات**)یشدا هەر بە وشەی (ٱلضُّرُّ) هاتوە، بەڵام لە سەرچاوە مێژوویەکاندا و، لە کتێبی خاوەن کتێبەکاندا هاتوە، کە ئەو گرفتاریی و ناڕەحەتییەی ئەییووب بریتی بووە لە نەخۆشیی، نەخۆشیەکی ناڕەحەتکەر، ﴿ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَكَشَفۡنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ ﴾، ئێمەش بە دەمیەوە چووین و وەڵامان دایەوە، ئەو ناڕەحەتیی و زیانەی کە هەیبوو لێمان لابرد، ﴿ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ ﴾، ماڵ و خێزانەکەیمان پێدا و، وێنەی خۆشیان لەگەڵیاندا، واتە: ماڵ و خێزانەکەیمان بۆ گێڕایەوەو، هێندەی دیکەشمان خستە سەر، ﴿ رَحۡمَةً مِّنۡ عِندِنَا ﴾، ئەوەش بەزەییەک بووە لە لایەن خۆمانەوە، ﴿ وَذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰبِدِينَ ﴾، پەندو بیرخەرەوەش بوو بۆ خوا پەرستان.

﴿ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِدۡرِيسَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِ ﴾، هەروەها یادی ئیسماعیل و ئیدریس و زەلکیفل بکەوە، کە ئێمە باسی ئیسماعیل و ئیدریسمان کردوە لە کاتی تەفسیری سوورەتی (**مريم**)دا، بەڵام زەلکیفل، پشتیوان بە خوا، لەم سوورەتەدا باس و بەسەرهاتی دەخەینە ڕوو، خوا دەفەرموێ: ئەم سێیانەش ئیدریس و ئیسماعیل و زەلکیفل، یادیان بکەوە، یاخود: خوا ﷻ بەسەری کردنەوە و تاقیکردنەوە، بەڵام: ﴿ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾، هەر کامێکیان لە خۆ ڕاگران بووە، ﴿ وَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ فِي رَحۡمَتِنَآ ﴾، ئێمەش خستماننە نێو بەزەیی خۆمانەوە، ﴿ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ بێگومان ئەوان لە چاکان بوون، لە بەندە شایستەکانی خوا بوون.

﴿ وَذَا ٱلنُّونِ ﴾، هەروەها یادی زەننون بکەوە (**أُذْكُرْ ذَا النُّون**)، یاخود: زەنووینیشمان بەسەر کردەوە و تاقیمان کردەوە (**إِبْتَلَيْنا ذَا النُّون**)، (**ذَا**) بە مانای خاوەن دێ، (**النُّون**) بە مانای ماسیی و نەهەنگ دێ، کەواتە: (**ذَا النُّون: يَعْنِي صَاحِبُ النُّون**)، وەک لە سوورەتی (**القلم**)دا هاتوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ ﴾، لەوێ فەرموویەتی: (**صَاحِبُ الحُوت**) واتە: خاوەنی نەهەنگ،

لێرەشدا کە دەفەرموێ: (ذَا النُّون) هەر هەمان مانای هەیە، واتە: خاوەنی نەهەنگ، بۆچی وا دەفەرموێ؟ چونکە (یونس) نەهەنگ قووتی داوە، بۆیە بۆتە هاوەڵی، یاخود بۆتە خاوەنی، چونکە (صَاحِبْ) بە مانای هاوەڵییش دێ و، بە مانای خاوەنیش دێ.

﴿إِذ ذَّهَبَ مُغَـٰضِبًا﴾، کاتێک کە بە تووڕەیی ڕۆیشت، لەگەڵەکەی تووڕە بووە، کە خەڵکی نەینەوا بوون، دوای ئەوەی بەینێک لەگەڵیان دا خەریک بووە، ئەوانیش وەڵامیان نەداوەتەوە، ئەویش لێیان تووڕە و پەست بوو، ﴿فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ﴾، پێی وابوو کە ئێمە سەر زەمینمان لێ وەتەنگ نەهێناوە، لەسەرمان پێویست نەکردوە کە هەر لەو شوێنە بمێنێتەوە، پێی وابوو بۆ هەر شوێنێک بچێت بانگەوازی خوا بکات و، پەیامی خوا بگەیەنێت، هەر بۆی هەیە، بەڵام لە بۆچوونەکەیدا بە هەڵەدا چوو بوو، مادام بەبێ مۆڵەتی خوا ڕۆیشت، خوا ﷻ سزای دا، سزادانەکەشی ئەوە بوو کە لە سکی نەهەنگدا سجنی کرد، هەروەک بەسەرهاتەکەیمان لە سوورەتی (**یونس**)دا بە درێژیی باسکردوە، ﴿فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَـٰتِ﴾، واتە: نەهەنگە قووتی دا و، کەوتە نێو سکی ماسییەوە، ئنجا ئایا هەر بە دەمیەوە گرت؟ چونکە خوا ﷻ لە سوورەتی (**الصافات**)دا دەفەرموێ: ﴿فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾﴾، واتە: نەهەنگ بەدەمیەوە گرت، ئایا هەر بە دەمیەوە گرت و ماسییەکە گەورە بوو؟ یاخود چوەتە شوێنی دیکەیەوە؟ چونکە هەر لە سوورەتی (**الصافات**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾﴾، واتە: لە سکییدا دەمایەوە تاکو ڕۆژی زیندوو کرانەوە، واتە: لەوێدا گیانی دەسپاردو، ئەوێ بۆی دەبوو بە گۆڕ، ئەگەر خوای بە پاک نەگرتبایە و پەشێمان نەبووبایەوە؟ دوایی زیاتر باسی دەکەین و لە تەفسیری سوورەتی (**یونس**)یش دا بەدرێژیی لەوبارەوە دواوین.

﴿فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَـٰتِ﴾، لە تاریکاییەکاندا هاواری کردو بانگی کرد، بانگ و هاواری کێی کرد؟ بێگومان هی خوا ﷻ ﴿أَن لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنتَ﴾، کە بێجگە

لە تۆ هیچ پەرستراوێک نیە، ﴿ سُبۡحَٰنَكَ ﴾، پاکیی بۆ تۆ، من تۆ بە پاک دەگرم، ﴿إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، بە دڵنیایی من لە ستەمکاران بووم، خەتای خۆم بوو، تووشی ئێرە بووم، ئاوا تووشی ئەو سزادرانە بووم.

﴿ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ ﴾، ئێمەش بە دەمیەوە چووین و وەڵاممان دایەوەو، لەو خەم و ناڕەحەتییەی کە تێیدا بوو، دەربازمان کرد، ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، هەر بەو شێوەیەش بڕواداران کە دەکەونە خەفەت و ناڕەحەتییەوە، بە مەرجێک بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، دەربازیان دەکەین.

ئنجا دێتە سەر باسی پێغەمبەرێکی دیکە، دەفەرمویٚ: ﴿ وَزَكَرِيَّآ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ ﴾، یادی زەکەریا بکەوە، یاخود: زەکەریاشمان تاقیکردەوە، کاتێک بانگ و هاواری پەروەردگاری کرد، ﴿ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا ﴾، پەروەردگارا! بە تەنیا بەجێم مەهێڵە، واتە: با چی دیکە بە تەنها نەبم و بێ پاشەوار نەبم ﴿ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴾، تۆ باشترینی میراتگرانی، ﴿ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ ﴾، بە دەمیەوە چووین و، وەڵاممان دایەوەو، یەحیامان پێ بەخشیی، وەک کوڕێکی ناوازە.

ئێمە بەسەرهاتی زەکەریا و یەحیاشمان لە سوورەتی (**مریم**)دا باس کردوون، ﴿ وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ ﴾، هاوسەرەکەیشیمان بۆ چاککرد، واتە: نەخۆشیی نەزۆکییەکەمان لێ لابرد، هەرچەند تەمەنیشی زۆر بوو و بەساڵدا چوو بوو، بەڵام هەر کاتێک خوا ﷻ کارێکی ویست، هەموو شتێک لە بەرانبەر ویستی ڕەهای خوادا، ئاسانە، ﴿ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ ﴾البروج، واتە: ئەنجامدەری هەر کارێکە کە بیەوێ بیکات، ﴿ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ ﴾، ئەوان خێراییان دەکرد لە چاکەکاندا، واتە: هەم زەکەریا و هەم یەحیا و، هەم خێزانی زەکەریاش خێراییان دەکردو پێشبڕکێیان دەکرد لە ئەنجامدانی چاکەکاندا، ﴿ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ ﴾، بە تەماع پێ بوون و سام لێکردنەوە، لێمان

دەپاڕانەوە، هەم ئومێدیان هەبوو بە ڕەحمەتی خوا و، هەم سام و ترسیان هەبوو لە سزای خوا، بە دوو باڵی ئومێدو سام و ترس، بەرەو خوا دەچوون، ﴿ وَكَانُوا۟ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴾، ئەوان بۆ ئێمە زۆر ملکەچ و زەبوون بوون.

﴿ وَٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا ﴾، یادی ئەو ئافرەتەش بکەوە کە داوێنی خۆی پاراست لە هەڵەو پەڵە، نەک هەر لە حەڕام، بەڵکو لە حەڵاڵیش هەر پاراستی، مەریەم هاوسەرگیریی نەکردوە، ﴿ فَنَفَخْنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا ﴾، ئێمەش لە ڕووحی خۆمان فوومان پێدا کرد، واتە: فوومان بە جەستەی مەریەمدا کردو، کە دەفەرموێ لە ڕووحی خۆمان، واتە: ئەو ڕووحەی کە بە تایبەت دروستمان کرد بوو، نەک لە ئەنجامی پێکگەیشتنی ژن و مێرددا خوا دروستیکردبێ، بەڵکو بە تایبەت ڕووحی عیسامان خستە نێو جەستەی مەریەمەوە، ﴿ وَجَعَلْنَٰهَا وَٱبْنَهَآ ءَايَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾، خۆی و کوڕەکەیمان کردنە نیشانەیەک بۆ جیهانییان، نیشانەیەک کە خەڵک بزانن هەر کاتێک خوا ﷻ شتێکی ویست، ئەو شتە ئاسانە بۆ خوا، دەتوانێ مرۆڤ دروست بکات بە بێ دایک و باب، وەک ئادەم، دەتوانێت مرۆڤ دروست بکات بە بێ باب، وەک عیسا ؈.

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾، ئا ئەم کۆمەڵەتان یەک کۆمەڵە، ﴿ وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُونِ ﴾، منیش پەروەردگارتانم، تەنها بەندایەتیی بۆ من بکەن، واتە: ئەو کاروانی پێغەمبەران، یاخود کاروانی بڕواداران، کە پێغەمبەران سەرقافڵەیانن، یەک کۆمەڵن، کە لەسەر ڕاستە شەقامی پەروەردگارن، ﴿ وَتَقَطَّعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ ﴾، بەڵام ئایینەکەی خۆیانیان لە بەینی خۆیاندا بەش بەش کرد، واتە: پاشینەکانیان و شوێنکەوتەکانیان و وەچەکانیان، ئەوانەی کە بە دوایاندا هاتوون، کە لایاندا، ئایینەکەیانیان بەش بەش کردو دابڕ دابڕ کرد، ﴿ كُلٌّ إِلَيْنَا رَٰجِعُونَ ﴾، هەر کامێکیشیان دەگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە، ئەوەی کە چاکەی کردوە و، ئەوەشی کە خراپەی کردوە، دەگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە بۆ سزا و پاداشت.

﴿فَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا كُفْرَانَ لِسَعْيِهِۦ﴾، ئنجا هەر کەسێک لە کردەوە باشەکان ئەنجام بدا و، بڕواداریش بێت، نادیدەگرتن بۆ هەوڵ و کۆششەکەی نابێت، واتە: سپڵەیی و بێ ئەمەگیی لە بەرانبەردا ناکرێ و، کردو کۆششەکەی لە بیر ناکرێ و فەرامۆش ناکرێ، ﴿وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ﴾، ئێمەش نووسەر دەبین بۆ ئەو کردو کۆشش و ماندوو بوونەی، ﴿وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَآ أَنَّهُمْ لَا يَرْجِعُونَ﴾، ئاوەدانییەکیش کە فەوتاندوومانە، قەدەغەیە کە نەگەڕێنەوە، واتە: قەدەغەیە کە نەگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە، تاکو سزایان بدەین، وەک چۆن لە دنیادا سزادراون، هەر بۆیەش فەوتێنراون، لە دوارۆژیشدا دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا و سزا دەدرێن، کەواتە: ﴿وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَآ أَنَّهُمْ لَا يَرْجِعُونَ﴾ (يَعنِي: مَمْنُوعٌ عَلَى قَريَةٍ أَهلَكْنَاهَا أَنَّهُم لَا يَرْجِعُونَ إِلَيْنَا لِلعِقَاب)، ئاوەدانییەک کە فەوتاندوومانە، قەدەغەیە کە نەگەڕێنەوە بۆ لامان، تاکو سزایان بدەین، هەڵبەتە ئەو ئایەتە چەند مانایەکی دیکەشی هەن، کە دواتر لە مەسەلە گرنگەکاندا دەیانخەینە ڕوو.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**نووحیش پێشتر بانگی پەروەردگاری کرد، ئەویش بە دەمیەوە چوو و خۆی و نیزیکانی لەو بەڵا مەزنە (تۆفان) دەربازکردو، بەسەر کۆمەڵی بێبڕوایاندا سەری خست و تێکڕایانی لە تۆفاندا نغرۆ کردو خنکاند:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿وَنُوحًا إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ فَاسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَنَصَرْنَٰهُ مِنَ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِـَٔايَٰتِنَآ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمَ سَوْءٍ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٧٧﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿وَنُوحًا إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ﴾، واتە: یادی نووح بکەوە! کە لەوە و پێش بانگی کردو هاواری کرد (لە پەروەردگاری)، یاخود: نووحیشمان تاقیکردەوە، (**وابْتَلَيْنَا نُوحاً إذ نَادَى مِنْ قَبْل**)، کە لەوەو پێش بانگی کرد، بانگی پەروەردگاری کرد، کە دەفەرموێ: (**مِنْ قَبْل**) واتە: پێش ئەو پێغەمبەرانەی (**عَلَيهِمُ الصَّلاةُ والسَّلام**) کە ناویان هێنرا لەم سووڕەتەدا، بەڵکو پێش سەرجەم پێغەمبەران (**عَلَيهِمُ الصَّلاةُ والسَّلام**)، جگە لە ئادەم و ئیدریس و هەندێکیش دەڵێن: (**شیث**)، هەرچەندە ناوی لە قورئاندا نەهاتوە، ئەگەرنا نووح ؑ دەڵێن یەکەم پێغەمبەری خاوەن ئوممەت بووە و لە سەردەمی ئەودا مرۆڤایەتیی زۆر بووە و، بوونە کۆمەڵێک کە بە زەوییدا بڵاوبینەوە.

٢)- ﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُۥ﴾، ئێمەش یەکسەر وەڵامان دایەوە، یانی: (**لَبَّيْنَا طَلَبَهُ وَقَبِلْنَاهُ**) ئێمە داواکارییەکەیمان قبووڵکردو پەسەند کردو بە دەمیەوە چووین، وشەی (لَهُۥ) واتە: لەبەر وی وەڵامان دایەوە، (**مِن أجلِهِ**) لەبەر خاتری وی.

٣)- ﴿ فَنَجَّيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴾، خۆی و کەس و کارەکەیمان لە بەڵای مەزن و خەفەتی مەزن دەربازکرد.

کە دەفەرمویٚ: (أَهْلَهُ) واتە: نیزیکانی کە لەگەڵی لە ماڵێ دابوون، (أهْل) واتە: نیزیک، (أَهْلُ البَيْت)، واتە: کەسێک کە لە ماڵێ لەگەڵتدا دەژی، کە پێش هەموو کەس هاوسەرە، ئنجا کوڕو کچن، بەڵام ئێمە وەک پێشتر باسمان کردوە، بە هۆی قورئانەوە بۆمان دەرکەوتوە، یەکێک لە کوڕەکانی کە دەڵێن: ناوی (**كنعان**) بووە، بە دەنگیەوە نەهاتوە، هەروەها لە سوورەتی (**التحريم**)یشدا، کە دەفەرمویٚ: ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ ﴿١٠﴾ ﴾التحريم، کەواتە: خێزانی نووح (ژنەکەی) کافر بووە، بەڵام مەرج نیە هەر ئەو ژنەی هەبوو بێ، کە کافر بووە و فەوتاوە لەگەڵ فەوتاواندا، وادیارە ژنی دیکەشی هەبووە، بە پێی ئەوە کە لە پەیمانی کۆندا هاتوە: دەڵێ: تەنیا سێ کوڕی و بووکەکانی، لەگەڵیدا بوون، بەڵام نازانین، چونکە نۆسەدو پەنجا (٩٥٠) ساڵ هەر پێغەمبەر بووە، پێش تۆفان، وادیارە کوڕیشی هەبوون و کچیشی هەبوون و، نەوەشی هەبوون و، نەوەی نەوەیشی هەبوون و، لە پەیمانی کۆندا ئەوانەی کە سواری کەشتییەکە بوون ژمارەیان بە کەم دێنێ، بەڵام مەرج نیە هەر ئەوەندە بوو بوون، بەڵام وەک لە سوورەتی (**هود**)یشدا باسمانکردوە، بە پێی ئەوەی کە لە سوورەتی (**الصافات**)دا هاتوە، کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾، واتە: وەچەکەی ئەومان هێشتنەوەو، تەنیا وەچەکەی ئەومان لە هێڵدراوان گێڕان، کەواتە: دەبێ هەموو ئەوانەی کە لە کەشتییەکەدا لەگەڵ نووحدا سواربوون و دەربازبوون لە تۆفان، هەموویان لە وەچەی نووح عليه السلام بوون.

٤)- ﴿ وَنَصَرْنَـٰهُ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَآ ﴾، سەرمانخست بەسەر ئەو خەڵکەدا کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دانان، یان: نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆ دانان، وشەی (**نَصَرَ**) بە (**عَلَى**) بەرکاردەخوازێ، (**نَصَرَهُ عَلَيْهَا**)، بەڵام لێرەدا بە (**مِنْ**) بەرکاری خواستوە، (**ضُمِّنَ مَعْنَى المَنْعِ وَالحِمَايَة**)، ( وَنَصَرْنَـٰهُ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَآ )، واتە: سەرمانخست بەسەر ئەو کۆمەڵەدا و، پاراستیشمان لەو خەڵکەی ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دادەنا،

وەک لە قورئاندا هاتوە: ﴿إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ۝٦٥﴾المؤمنون، یانی: ئێوە سەرناکەون بەسەرماندا و دەربازیش نابن لە دەستمان، چونکە کار (فعل)ێک کە عادەت نیە، بە پێتک تێپەڕ بکات بۆ بەرکار (مفعول)، کاتێک کە بەو پیتە بەرکار (**مفعول به**) دەخوازێ، هەم مانا ئەصڵییەکەی خۆی دەگەیەنێ و، هەم ئەو مانایەش کە بەهۆی ئەو پیتەوە کە بەرکاری پێ خواستوە، ئەویش پەلکێش دەکات و دەگرێتە نێو خۆی، واتە: لە یەک کاتدا ئەو فیعلە دوو واتایان دەگەیەنێ، لێرەدا: ﴿وَنَصَرْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ﴾، سەرمانخست بەسەر ئەو کۆمەڵەدا، کە نیشانەکانمانیان بەدرۆدانان و دەربازیشمان کرد، لێیان، یان کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ۝٦٥﴾المؤمنون، واتە: بە دڵنیایی ئێوە بەسەر ئێمەدا سەرناکەون و، لە چنگیشماندا قوتار نابن.

٥)- ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوان کۆمەڵە خەڵکێکی خراپ بوون، دەگوترێ: (**رَجُلٌ سَوْء، وَعَمَلٌ سَوْء**)، واتە: پیاوێکی خراپ و کردەوەیەکی خراپ، (**والسُّوءُ: كُلُّ مَا يَغُمُّ الإِنْسَان**)، (**سُوء**) هەر شتێکە کە ئینسان خەفەتبار بکات و، حاڵی نارەحەت بکات، یانی: کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر خراپ بوون.

٦)- ﴿فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ﴾، بۆیە تێکڕایانمان خنکاند، یانی: هیچ کامیانمان لێ دەرباز نەکردن.

## مەسەلەی دووەم:

**دادوەریی کردنی داوودو سولەیمان سەلامی خوایان لەسەر بێ، لە بارەی کشتوکاڵێکەوە کە مەڕی خەڵکێکی دیکە بە شەوێ زەڕی کرد بوو، بەڵام خوا سولەیمانی لە دادوەریی ڕاستتر حاڵیی کردو، خوا چیایەکان و باڵندەکانیشی بۆ داوود ڕامکردبوون، کە لەگەڵیدا خوایان بە پاک دەگرت، هەروەها فێری چنینی زرێ و پۆشاکی جەنگیشی کرد بوو:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِى ٱلْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَـٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾ فَفَهَّمْنَـٰهَا سُلَيْمَـٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ ۚ وَكُنَّا فَـٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾ وَعَلَّمْنَـٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ ۖ فَهَلْ أَنتُمْ شَـٰكِرُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە (١٠) بڕگەدا:

١)- ﴿ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ ﴾، واتە: داوودو سولەیمانیشمان تاقیکردنەوە، یاخود: یادی داوودو سولەیمانیش بکەوە (عَلَيهِمَا الصَّلاةُ والسَّلام)، کە هەم پێغەمبەر بوون و هەم حوکمڕانیش بوون.

٢)- ﴿إِذْ يَحْكُمَانِ فِى ٱلْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ ﴾، کاتێک کە دادوەرییان دەکرد لە بارەی کشتوکاڵەکەوە، کە مەڕی خەڵکێکی دیکە بە شەوێ چوو بووە نێوی، (النَّفْشُ: الإِنْفِلاتُ للرَّعِي لَيْلاً)، (نفش) بەرهەڵدابوونی ئاژەڵە بە شەوێ کە بلەوەڕێ و بچێتە نێو کشتوکاڵێکەوە و زەڕی بکات.

٣)- ﴿ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَـٰهِدِينَ ﴾، ئێمەش بۆ دادوەرییەکەیان ئامادە بووین، (شَـٰهِدِينَ ) دەگونجێ بە مانای (حَاضِرِيْن)بێ، واتە: ئامادەبووین، دەشگونجێ بە مانای

(عَالِمِيْن)بێ، واتە: ئێمە زانا و ئاگاداربووین، (لِحُكْمِهِمْ)، بۆچی بە ڕاناوی کۆ هێناویەتی، لە حاڵێکدا ئەوان دووانن، داوودو سولەیمان؟ لێرەدا دوو تەئویل باسکراون:

أ- گوتوویانە: لە زمانی عەرەبییدا، دووان (مُثَنَّى) دەکرێ بە کۆ (جمع).

ب- (حُكْمِهِم)، واتە: دادوەریی داوودو سولەیمان بۆ دوو لایەنە ناکۆکەکە، هەم خاوەن ئاژەڵەکان و هەم خاوەن کشتوکاڵەکان، دەبن بە کۆ.

ئێمە ئامادەی دادوەریی داوودو سولەیمان بووین، لە کاتێکدا دادوەرییان دەکرد لە نێوان خاوەن ئاژەڵەکان و کشتوکاڵەکەدا، کە خاوەن کشتوکاڵەکە، کشتوکاڵەکەیان زەرکرابوو، لە لایەن ئاژەڵی خاوەن ئاژەڵەکانەوە، کە مەڕو بزن بوون.

٤)- ﴿ فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ ﴾، ئنجا ئێمە لە سولەیمانمان حاڵیی کرد، وشەی (فَفَهَّمْنَاهَا) کە ڕاناوی مێینەی بۆ بەکارهاتوە، واتە: (فَهَّمْنَا الحُكُومَة)، دادوەریی کردن، (أو الخُصُومَة) یان: ناکۆکییەکە، (أو القَضِيَّة) یان: کێشەکە، بۆیە ڕاناوی مێینەی بەکارهێناوە، واتە: ڕای ڕاسترمان بەو ڕاگەیاندو پێمان ئاشنا کرد.

٥)- ﴿ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ﴾، واتە: بە هەر کامێکیشیان هەم لێزانیی و هەم زانستمان دابوو، ئەمە بۆ ئەوەیە نەوەک کەسێک وا گومان بەرێ، کە داوەرییەکەی داوود هەڵە بووە، هەڵە نەبووە، بەڵام دادوەرییەکەی سولەیمان چاکترو ڕاستتر بووە و، هی داوودیش هەر ڕاست بووە، بەڵام هی سولەیمان باشتر بووە.

یاخود: داوودیش‌عليه السلام تەنیا لەو مەسەلەیەدا نەیپێکاوە، ئەگەرنا وە نەبێ داوودیش خاڵیی بووبێ لە لێزانیی و زانست، بەڵکو زۆر کارزان و لێزان بووە و، زۆریش زانا و شارەزا بووە، بەڵام لەو مەسەلەیەدا نەیپێکاوە، وەک گوتراوە: (لِكُلِّ عَالِمٍ هَفْوَةٌ، وَلِكُلِّ حُسَامٍ نَبْوَةٌ، وَلِكُلِّ جَوَادٍ كَبْوَةٌ)، واتە: هەموو زانایەک جارێک بە هەڵە دادەچێ و، هەموو شمشێرێکی بڕندە جاری وایە نابڕێ و، هەموو ئەسپێکی چاکیش جاری وایە ڕەتەڵێک دەبا و دەکەوێ.

٦)- ﴿وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ﴾، چیایەکان و باڵندەکانیشمان لەگەڵ داووددا ملکەچ کرد بوون، خوایان بە پاک دەگرت، (وَسَخَّرْنَا) یانی: ملکەچ و ڕامان کردبوو، دەستەمۆمان کردبوون، لەگەڵ داووددا چیایەکان و باڵندەکان خوایان بە پاک دەگرت، ئنجا لێرەدا تەنیا دەفەرمویٚ: (يُسَبِّحْنَ)، بەڵام مەرج نیە تەنیا گوتبیان: (سُبحَانَ الله)، بەڵکو ستایشی خواشیان کردوە و، خواشیان بە مەزن گرتوە و، باقی ئەو وشانەی دیکەشیان بەکارهێناون، کە لە پێگە و مەقامی ستایشگرتنی خوا و، بە پاکگرتنی خوا و، بە گەورە گرتنی خوا و، پاڕانەوە لە خوا و، ڕاز و نیازکردن لەگەڵ خوادا، بەکاردێن.

٧)- ﴿وَكُنَّا فَٰعِلِينَ﴾، ئێمە ئەنجامدەری ئەو کارانە بووین، واتە: نەک هەر ئەو کارانەمان کرد، بەڵکو ئێمە بووین لە ڕابردووشدا ئەو جۆرە کارانەمان پێکراون و لە دەست هاتوون.

٨)- ﴿وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ﴾، هەروەها فێری پۆشاکی جەنگیشمان کرد بوو بۆ ئێوە، (اللَّبُوسُ: مَا يُلبَسُ)، هەر پۆشاکێکە کە بپۆشرێ، ئەوە واتایەکی، واتایەکی دیکەی: (الدِّرْعُ: بِقَرِيْنَة لِتُحْصِنَكُم مِّنْ بَأْسِكُم)، لێرەدا (لَبُوسٍ) بە مانای زرێ دێ، بە نیشانەی ئەوە کە دەفەرمویٚ: ﴿لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ﴾، تاکو لە کاتی جەنگدا و لە کاتی زەبرو سەختیی دا کە دێتە ڕێتان، بتانپارێزێ، ئەوەش کە مرۆڤ دەپارێزێ، بریتیە لە زرێ، هەڵبەتە خوا نەیفەرمووە: (دِرِعْ)، بەڵام لە شوێنی دیکەدا کە دوایی باسی دەکەین، خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ ﴿١١﴾﴾سبأ، واتە: ئەندازەگیریی بکە لە چنیندا و لە ئاڵقەکاندا، لەوەوە دەتوانین بڵێین: لێرەدا (لَبُوسٍ)ی مەبەست پێی زرێیە، ئەگەرنا هەر شتێک بۆ جەنگ لەبەر بکرێ و بپۆشرێ، چ خوودە بێ، چ زرێ بێ، چ قەڵغان بێ، هەمووی دەگرێتەوە، بەڵام بە نیشانەی ئەوە کە لە سووڕەتی: (سبأ)دا هاتوە، دیارە زیاتر مەبەست پێی زرێیە، کە زانایان دەڵێن: لە پێش داوود ﷺ دا، زرێیەکان یەک پارچە بوون، لەوح لەوح بووە، بەڵام زرێ یەکەمجار بە ئاڵقە لە لایەن داوودەوە دروست کرا، کە ئەویش بە ئیلهام و فێرکردنی خوا ﷻبوو.

٩)- ﴿لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ﴾، تاكو لە زەبرو جەنگتان بتانپارێزێ، (لِتُحْصِنَكُم ) واتە: (لتَحْفَظَكُمْ، لتَحْمِيَكُمْ)، ئامرازەكانی جەنگ هەموویان، بتانپارێزن، لە كاتی جەنگدا.

١٠)- ﴿فَهَلْ أَنتُمْ شَٰكِرُونَ﴾، ئنجا ئایا ئێوە سوپاسگوزارن، یانی: (هَلْ تَقَرَّرَ شُكْرُكُمْ وَثَبَتَ)، ئایا سوپاسگوزاریی ئێوە چەسپاوە و هاتۆتە دی، ئەی مرۆڤەكان! كە خوا ﷻ ئەو نیعمەتانەی بە پێغەمبەران داون (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، بۆ ئێوە؟!

## کورتە باسێک

## نۆ (٩) هەڵوەستەی کورت لە بەردەم ئەم ئایەتانەدا (٧٩-٨٠)

**١-) بەسەرهاتی زەڕکردنی مەڕو بزنی ئاژەڵدارێک لە کشتوکاڵی جوتیارێکدا، یاخود: باسی زەڕکردنی ئاژەڵی چەند ئاژەڵدارێک لە کشتوکاڵی چەند جوتیارێکدا:**

بەسەرهاتەکە بەمجۆرە بووە: (شەوێک ئاژەڵی ئاژەڵدارێک، کە بە پێی ئایەتەکان (غَنَمُ)، واتە: ئاژەڵی ورد، هەم مەڕو هەم بزن دەگرێتەوە، بەرهەڵدادەبن، دەچنە نێو کشتوکاڵی خەڵکێکی دیکەوە، بە شەو، چونکە ئەگەر بە شەو نەبووایە نەیدەفەرموو: (نَفَشَتْ)، ئەم وشەیە کە دەفەرموێ: ﴿ نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ ٱلۡقَوۡمِ ﴾، واتە: مەڕو بزنەکان بە شەوێ بەرهەڵدا بوون، ئەو وشەیە بۆ بەرهەڵداکردن و زەڕکردنی ئاژەڵ لە شەوێدا بەکاردێ، ئاژەڵەکە بەردەبنە نێو کشتوکاڵەکە و دەیخۆن و، دەیشێلن و لە بەینی دەبەن و، زیانی زۆری پێدەگەیەنن، خاوەن کشتوکاڵەکە دەچێت بۆ لای داوود ﷺ، دادوەرییان کە لە نێوان دا بکات، دەعوایان هەیە لەسەر ئەو خاوەن ئاژەڵانە، ئەو خاوەن مەڕو بزنانە:

**أ-** داوود ﷺ دەڵێ: پێکیان بگۆڕنەوەو، ئەی خاوەن ئاژەڵەکان! ئاژەڵەکان بدەنە خاوەن زەوییە کشتوکاڵییەکەو، با زەوییەکەش بۆ خاوەن ئاژەڵەکان بێ، واتە: بە یەکجاریی، پێدەچێ نرخ و بەهای ئاژەڵەکان لەگەڵ زەوییە کشتوکاڵییەکە، بەرانبەر بوو بێ و لێک نیزیک بووبن.

**ب-** سولەیمان ﷺ ڕایەکی دیکەی دەبێ، وا پێدەچێ سولەیمان لەو کاتەدا لەوێ نەبووە، دەشگونجێ لەوێش بوو بێ، گوتوویێتی: بابە! من پێشنیارێکم هەیە، دەشگونجێ وەک لە هەندێک ڕیوایەتاندا هاتوە، سولەیمان لە دەرەوە بووە، کە دێنە دەرەوە لەلای بابی،

لێیان دەپرسێ؟ چۆن دادوەریی لە نێواندا کردن؟ بۆی باس دەکەن، ئەویش دەچێتەوە بۆ لای بابی دەڵێ: بابە! ئەگەر بە جۆرێکی دیکە دادوەرییان لە نێوان بکرێ باشترە، ئەویش ئەوەیە: ئاژەڵەکان بدرێنە خاوەن زەوییە کشتوکاڵییەکە و لێیان بەهرەمەند بن، لە خوریی و مووویان و بەروبوومیان، تاکو خاوەن ئاژەڵەکان، کشتوکاڵی خاوەن زەوییە کشتوکاڵییەکە دەگەیەننەوە ئەو ئاستەی زەڕ کراوە، واتە: تاکو ساڵ تێوەر دەسووڕێتەوە، دوایی با ئاژەڵەکان بدرێنەوە خاوەنەکانی خۆیان و، زەوییە کشتوکاڵییەکەش تەسلیمی خاوەنەکەی بکرێتەوە.

داوودیش ﷺ دەمارگیرنەبووە بۆ ڕای خۆی، هەندێک کەس ئەگەر کەسێکی وەک خۆی و یان لە خۆی بچووکترو، یان گەورەتر، ڕایەک بڵێ، پێچەوانەی ڕای ئەو، لەگەڵ ڕای ئەودا تێکبگیرێ، تەماشا ناکات: هەقە یان نا! مادام یەکێکی دیکە گوتوویەتی: هەر لە ڕێوە ڕەفزی دەکات، بەڵام پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ**) و ئەوانەی بە دوای پێغەمبەران دەکەون، دوورن لەو جۆرە دەمارگیریی و خۆ بەزلگریی و خۆ پەسندییە، بۆیە داوود ﷺ یەکسەر دەڵێ: ڕایەکەی تۆ پەسندە و دادوەرییەکەی سولەیمان ﷺ جێبەجێ دەکرێ و تەبەنیی دەکرێ، ئەمە لە سەرچاوە مێژوویەکاندا وا هاتوە، ئەگەرنا لە ئایەتەکەدا تەنیا ئاماژەی پێداوە.

### ٢-) حوکمی زەڕکردنی ئاژەڵ بە شەوێ و بە ڕۆژێ:

بە پێی ئەم سێ فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ:

١- {**عَلَى أَهْلِ الْأَمْوَالِ حَفِظُهَا بِالنَّهَارِ، وَعَلَى أَهْلِ الْمَاشِيَةِ حَفِظُهَا بِاللَّيْلِ**}، (**أخرجه أحمد: ٢٣٧٤٧، وأبو داود، ٣٥٧١ ابن حبان: ٦٠٠٨، عَنْ حَرَامِ بْنِ مُحَيِّصَةَ عَنْ أَبِيهِ**).

واتە: خاوەن ماڵ و سامان دەبێ بە ڕۆژێ بیپارێزن و، لەسەر خۆیانە بە ڕۆژێ پارێزگاریی لێ بکەن، بەڵام خاوەن ئاژەڵیش دەبێ ئاژەڵەکانیان بە شەوێ بپارێزن و، بەرهەڵدا نەبن و زەڕی ماڵ و سامانی خەڵک نەکەن.

٢- {الْعَجْمَاءِ جُرْحُهَا جُبَارٌ} (أخرجه مالك: ١٥٦٠، وأحمد: ٧٢٥٣، وعبد الرزاق: ١٨٣٧٣، والبخاري: ١٤٢٨، ومسلم: ١٧١٠، وأبو داود: ٤٥٩٣، والترمذي: ٦٤٢، والنسائي: ٢٤٩٥، وابن ماجه: ٢٦٧٣ عَنْ أَبِي هُرَيرَة).

واتە: (الْعَجْمَاءِ) مەبەست پێی ئاژەڵە {لەبەر ئەوەی کە گۆیا نیە، نوتقی نیە، ناتوانێ قسە بکات} برینەکەی بەفیڕۆ چووە.

٣- دیسان لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ} (أخرجه البخاري: ١٤٢٨، ومسلم: ٤٥٦٢)، واتە: ئەوەی کانزا دەردەهێنێ {ئەو شوێنەی کانزایەکەی لێ دەردەهێنرێ ئەگەر چاڵەکەی بەسەردا برووخێ} خوێنی لەسەر خۆیەتی، نەک لەسەر بابای کە کانزایەکەی بۆ دەردەهێنرێ.

(جُبارٌ) یانی: بەفیڕۆ چوو، واتە: نابژێردرێ، یانی: ئاژەڵێک قۆچێک لە کەسێک هەڵدەدا و دەیکوژێ و، یان برینداری دەکات، ئەوە دەبێ خۆی بپارێزێ لەو ئاژەڵە، ئەگەرنا بە هەدەر دەڕوا و تۆڵە و قەرەبووی ناکەوێ، هەروەها بابای ئیشکەر لە دەرهێنانی کانزادا.

ئنجا بە پێی ئەمە، زانایان و شارەزایان زۆر قسەیان کردوە لەو بارەوە، کورتەکەی و پوختەکەی ئەوەیە کە: ئەگەر بەشەوێ ئاژەڵ بەربنە، بچنە نێو کشتوکاڵێکەوە، یان شتێکەوە کە زیانی پێ بگەیەنن، ئەوە زیان بژاردنەکە دەکەوێتە سەر خاوەن ئاژەڵ، چونکە بە شەوێ دەبێ ئاژەڵی خۆی بپارێزێ، ئنجا مەڕو بزنە، ڕەشەوڵاخە، حوشترە، وڵاخە بەرزەیە، کەرە، هەرچی هەیە، بەڵام بە ڕۆژێ، دەبێ خەڵک موڵک و ماڵ و سامان و شتەکانی خۆی بپارێزێ و، ناکەوێتە سەر بابای خاوەن ئاژەڵ، بەڵکو دەبێ کابرا ئاگاداری کشتوکاڵ و شتەکانی خۆی بێ، بە گشتیی ئاوایە، ئەگەرنا مەرج نیە لە هەموو حاڵاندا وابێ، ئەمە وردەکاریی زیاتریشی دەوێ، بەڵام لە کتێبە فیقهییەکاندا، وەک بنچینەیەکی گشتیی ئاوا باسکراوە.

### ٣-) ڕاستیی و پێکان لە دادوەرییدا یەکێکە:

زۆربەی شەرعزانان گوتوویانە: هەق لە قسەی کۆششکەراندا و، لە قسەی هەڵهێنجەرانی حوکمە شەرعییەکان و فتوادەراندا، یەکێکە، بە بەڵگەی ئەوەی کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ﴾، کێشەکەمان لە سولەیمان حاڵییکرد، واتە: ئەوەی کە هەق و ڕاست بوو، لە بارەی ئەو کێشەیەوە، سولەیمانمان لێ حاڵیی کرد، کەواتە: داوود ﷺ، نەیپێکاوە، چونکە لێرەدا خوا تێگەیشتنەکەی تایبەت کردوە بە سولەیمانەوە.

هەروەها ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: {**إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ**}[١].

واتە: دادوەر ئەگەر کۆششی کرد، پاشان پێکای، دوو پاداشتی هەن، (پاداشتی کۆشش کردن و پاداشتی پێکان) و ئەگەر کۆششی کردو بە هەڵەدا چوو، پاداشتێکی بۆ هەیە {کە پاداشتی کۆششکردنەکەیەتی}.

ئەم فەرمایشتەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە مەسەلەیەکدا، کە چەند ڕایەک هەن، تەنیا دەگونجێ یەکێکیان ڕاست بێ، زۆربەی شەرعزان و شارەزایان وا دەڵێن.

بەڵام من پێم وایە هەندێک جار، بۆ هەندێک بابەت ئەم بنچینەیە ڕاست نیە، چونکە جاری وایە هاوکێشەیەک هەیە بە سێ چوار ڕێگا چارەسەر دەکرێ، هەروەک شارێک هەیە لە چوار پێنج ڕێگاوە دەگونجێ بچیە نێو ئەو شارە و، بابەتی وا هەیە زیاتر لە ڕێیەک هەیە بۆ چارەسەرکردنی، بەڵام زۆرجاریش وا دەبێ کە ئەنجامی ڕاست تەنیا یەکێکە، وەک دوو کۆ دوو دەکاتە چوار (٢+٢=٤)، ئیدی ئەگەر بڵێی: پێنج، شەش، سەد، هەر هەڵەیە، بەڵام لە هەموو شتێکدا هەر وانیە، چونکە هەندێک بابەتی شەرعیی هەن، خوا ﷻ وایهەڵخستوون کە

---

(١) أخرجه البخاري في: ٩٦ كتاب الاعتصام: ٢١ باب أجر الحاكم إذا اجتهد فأصاب أو أخطأ.

بە زیاتر لە شێوەیەک ئەنجام بدرێن، یاخود هەندێک مەسەلە هەن، زیاتر لە وەڵامێک هەڵدەگرن، کەواتە: بە زۆریی وایە ڕاستیی و پێکان یەکێکە، بەڵام لە هەندێک بابەتیشدا، ئەم بنچینەیە مەرج نیە لە هەموو حاڵاندا ڕاست دەربچێ.

**٤-) بەسەرهاتێکی دیکەی داوودو سولەیمان (عَلَيْهِما الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ):**

ئەم بەسەرهاتەش دەشوبهێتە ئەو بەسەرهاتەوە کە خوا ئاماژەی پێداوە، ئەویش لە صەحیحی بوخاریی و موسلیمدا هاتوە و، شتێکی باشە ئاماژەی پێ بدەین و، لەو بەسەرهاتەشدا سولەیمان باشتر دەپێکێ لە بابی:

**{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: كَانَتِ امْرَأَتَانِ مَعَهُمَا ابْنَاهُمَا، جَاءَ الذِّئْبُ فَذَهَبَ بِابْنِ إِحْدَاهُمَا، فَقَالَتْ صَاحِبَتُهَا إِنَّمَا ذَهَبَ بِابْنِكِ، وَقَالَتِ الأُخْرَى إِنَّمَا ذَهَبَ بِابْنِكِ؛ فَتَحَاكَمَتَا إِلَى دَاوُدَ، فَقَضَى بِهِ لِلْكُبْرَى؛ فَخَرَجَتَا عَلَى سُلَيْمَانَ بْنِ دَاوُدَ، فَأَخْبَرَتَاهُ، فَقَالَ: ائْتُونِي بِالسِّكِّينِ أَشُقُّهُ بَيْنَهُمَا، فَقَالَتِ الصُّغْرَى: لَا تَفْعَلْ، يَرْحَمُكَ اللهُ، هُوَ ابْنُهَا، فَقَضَى بِهِ لِلصُّغْرَى } (أخرجه أحمد: ٨٢٦٣، والبخاري: ٣٢٤٤، ومسلم: ٧٢٠، والنسائي في الكبرى: ٥٩٦٠).**

واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، فەرموویەتی: لە کاتێکدا دوو ژن، دوو کوڕی خۆیانیان پێ بوون، لە شوێنێک بوون، گورگ هات کوڕی یەکێکیانی برد، (ڕفاندی و ڕۆیشت) ئەو کوڕەی مایەوە یەکێک دەیگوت: هی منە و ئەوی دیکەش دەیگوت: هی منە، {ژنەکان یەکێکیان بە تەمەن بووە و، ئەوی دیکەش تەمەنی کەمتر بووە} بۆ دادوەریی و چارەسەری کێشەکەیان چوونە لای داوود ﷺ {کە هەم پێغەمبەر بووە و هەم حوکمڕان بووە} داوود ﷺ بە بۆ چوونی خۆی گوتی: ڕەنگە ئەم منداڵە هی ژنە بە تەمەنەکە بێ {لەوانەیە وای زانیبێ کە گچکەکە هێشتا منداڵی نەبووە و، وایزانیبێ کە هی گچکەکەی فڕاندوە] منداڵەکەی (کوڕەکەی)دا بە ژنە گەورەکە، بە تەمەنەکە، دەرچوون بۆ لای سولەیمان و هەواڵیان پێدا، {دەبێ کە ئافرەتە کەم تەمەنەکە،

هەر پرتە و بۆڵەی بوو بێ و دەنگە دەنگی بوو بێ} ئەویش گوتی: چەقۆم بۆ بێنن تاکو لە نێوانتان لەتی بکەم {سولەیمان مەبەستی نەبووە لەتی بکات} ئافرەتە کەم تەمەنەکە گوتی: کاری وا مەکە، خوا بەزەیی پێتدابێ، هی ئەوە {لێی گەڕێ لەتی مەکە، دەبێ گەورەکە گوتبی: لەتی بکە، چونکە هی خۆی نەبووە، گوتوویەتی: کە بۆ من نەبێ، با بۆ ویش نەبێ} ئنجا سولەیمان کە وا دەبینێ، کوڕەکە دەداتە ئافرەتە کەم تەمەنەکە.

چونکە دەزانێ جەرگی خۆیەتی بۆیە دەڵێ: ئەگەر نەیەتەوەش بۆ لای من، گرنگ ئەوەیە کوڕەکەم نەفەوتێ و نەکوژرێ، با لە لای ئەو ئافرەتە بێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە نەمرێ، بەڵام ئەوی دیکە دەربەست نەبووە، گوتوویەتی: لەتی بکەن!

سولەیمان ﷺ لەو مەسەلەیەشدا لە بابی باشتری پێکاوە.

**٥-) ئایا پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، بۆیان هەیە کۆشش بکەن، هەوڵ بدەن یاسای شەرعیی بە بۆچوونی خۆیان هەڵهێنجن و، لەسەر وەحیی خوا ڕانەوەستن؟!**

زۆربەی هەر زۆری زانایان بە ڕەوا و دروستیان زانیوە و، هەندێکیشیان گوتوویانە: نەخێر پێغەمبەران بۆیان نیە کۆشش بکەن، بە تایبەتی شیعەی دوازدە ئیمامیی هەر زۆر دژی ئەوەن، کە پێغەمبەران کۆشش بکەن.

ئنجا هەرچەندە زانایان زۆربەیان وایانگوتوە، بەڵام من پێم وایە، دەبووایە هەموویان لەسەر ئەوە یەک دەنگ بن، کە بەڵێ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کۆششیان کردوە و عەقڵی خۆیان بەکارهێناوە و، لە کاتێکدا کە وەحییان لەبەر دەستیی دا نەبووە و، بەڵگەی شەرعییان لەبەر دەست دا نەبووە، عەقڵی خۆیان بەکارهێناوە و هەڵگوشیوە و تێوەڕاماون، بۆ ئەوەی پەی بە حوکمی شەرعیی و وەڵامی ڕاست ببەن، بۆ ئەو پرسیارەی ڕووبەڕوویان بۆتەوە، بۆ ئەو کێشەیەی کە هاتۆتە بەردەستیان، چارەسەری بۆ بدۆزنەوە، بۆ وێنە: ئەگەر

تەماشای ژیانی پێغەمبەری خاتەمﷺ بکەین، لە چەند شوێنان خوا ﷻ ڕەخنەی لێ دەگرێ، بەهۆی ئەوەوە کە بە کۆششکردن و بە بیرکردنەوەی خۆی و بە بۆ چوونی خۆی، بڕیارێکی داوە و نەیپێکاوە، بۆیە خوای پەروەردگار بۆی ڕاستکردۆتەوە و ڕەخنەی لێگرتوە و گلەیی لێکردوە، بۆ وێنە:

١-﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ١ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ٢ ﴾عبس،

٢- هەروەها: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ ٦٧ ﴾ الأنفال،

٣- هەروەها: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ ٤٣ ﴾التوبة،

٤- دیسان: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٖ مِّنۡهُم مَّاتَ أَبَدٗا ٨٤ ﴾التوبة، دەگونجێ زۆر شتی دیکەش بهێنرێتەوە لە ژیانی پێغەمبەری خاتەمداﷺ کە هەرچەندە سەروەری پێغەمبەرانە، بەڵام کۆششی کردوە و لە بۆچوونەکەیدا، ئەگەر نەیپێکابێ، خوا ﷻ بۆی ڕاستکردۆتەوە، کەواتە: زۆر جاریش کۆششی کردوە و پێکاویەتی، خوای زانا وتوانا بە پێویستیی نەزانیوە بۆی ڕاست بکاتەوە و فەرمایشتی لەسەر بفەرموێ، بۆیە هیچ گومانی تێدا نیە کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، ئەوە نەبووە وەک ڕۆبۆتێک تەنیا دەبێ وەحیی بێ، ئنجا بجووڵێن! پێغەمبەران خاوەنی گەورەترین عەقڵ بوون، عەقڵی خۆیان بەکارهێناوە و کۆششیان کردوە، لە کاتێکدا کە وەحیی خوای پەروەردگاریان لەبەر دەستدا نەبووبێ، بە زۆرییش پێکاویانە و، جار جار ئەگەر بە هەڵەدا چووبن، خوای میهرەبان بۆی ڕاستکردوونەوە، هەڵبەتە بە هەڵە داچوونی پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لە ئیجتهادیاندا، بە گوناح لە قەڵەم نادرێ، چونکە ئەوان نەیانویستوە گوناح بکەن، ویستوویانە شتێک چارەسەر بکەن، وەڵامێک بدەنەوە، بەڵام نەیانپێکاوە، یاخود جۆرە مامەڵەیەکیان کردوە، کە پێیان وابووە ئەوە باشترە، بەڵام دوایی خوای پەروەردگار بۆی ڕاستکردوونەوە و بۆی دەرخستوون، کە نەخێر ئەوە باش نەبووە، شتێکی دیکە باشتر بووە و، کە ئەوان پەییان پێ نەبردوە.

٦-) ئایا دروستە بابای دادوەر دادوەرییەکی کە کردوە، لێی پەشێمان بێتەوە و لێی بگەڕێتەوە؟:

ئەمیش زانایان مشت و مڕیان لە بارەیەوە هەیە، بەڵام نەدەبوو مشت و مڕ لەو بارەوە بکەن! چونکە بەڵێ هەر کاتێک دادوەر بۆی دەرکەوت کە بڕیارێکی داوە، هەڵەیە و نەپێکاوە، نەک هەر دروستە و ڕەوایە، بەڵکو لەسەری پێویستە کە هەڵەکەی خۆی ڕاست بکاتەوە و بگەڕێتەوە، چونکە کاتێک دادوەرێک بڕیارێک دەدات و حوکمێک دەردەکات، بەڵام دوایی بۆی دەردەکەوێ کە نەیپێکاوە، نابێ لەسەر هەڵەی خۆی بڕوا، بەڵکو دان بە هەڵەی خۆ داهێنان چاکییە (**الإعتراف بالخطأ فضيلة**) هەروەک بەردەوام بوون لەسەر هەڵە، گوناهە و تاوانە.

هەر بۆیەش داوود ﷺ لە مەسەلەی منداڵەکەدا، کە داویەتی بە ئافرەتە گەورەکە، دوایی سولەیمان ﷺ کە بەو شێوەیە دادوەریی کردوە و بۆی دەرکەوتوە، کە هەق بە ئافرەتە کەم تەمەنەکەیە، داوود ﷺ بڕیارەکەی سولەیمانی پەسند کردوە، هەروەها لە مەسەلەی ئاژەڵە زەڕکردووەکان و کشتوکاڵەکەشدا، بە هەمان شێوە، داوود گەڕاوەتەوە بۆ دادوەرییەکە و، بڕیارەکەی سولەیمانی کوڕی (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) پەسند کردوە.

٧-) بە پاکگرتنی چیایەکان و باڵندەکان بۆ خوا:

أ- ئایا مەبەست پێی دەنگدانەوەی چیایەکانە، یان دەنگ لێهاتنی باڵندەکانە، دەنگی سروشتیی و ئاسایی خۆیان؟ هەندێک لە توێژەرەوان وایانگوتوە!

ب- یاخود مەبەست پێی بە پاکگرتنی چیایەکانە بە شێوەیەک و، بە دەنگێک ئەو کاتە لێیان پەیدابووە و، هی باڵندەکانیش بە دەنگێک کە ئەو کاتە لێیان پەیدابووە، وەک هاودەنگیی و هاوئاوازیی لەگەڵ داووددا ﷺ، لە کاتێکدا موناجاتی کردوە لە خزمەت خوادا و، لە خوا پاڕاوەتەوە و گفتوگۆی لەگەڵ دا کردوە؟

بە دڵنیایی پێم وایە مەبەست دووەمە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ ۚ وَكُنَّا فَـٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾﴾، لەگەڵ داووددا چیایەکان و باڵندەکانمان ملکەچ کرد بوون، لەگەڵیدا خوایان بە پاک دەگرت و ئێمە ئەنجامدەر بووین.

لێرەدا (سَخَّرْنَا)، واتە: ملکەچمان کردن و، ڕام و دەستەمۆمان کرد بوون، هەم چیایەکان و هەم باڵندەکان، ئنجا ئەگەر مەبەست دەنگدانەوەی ئاسایی بێ، ئاشکرایە شوانێکیش کە بانگ دەکات لە چیایەک، چیایەکان دەنگ دەدەنەوە، لە ئەشکەوتێکدا قسە بکە، ئەشکەوتەکە دەنگ دەداتەوە، ئەوە هیچ پێویست بەوە ناکات خوای باڵادەست وەک نیعمەتێک و موعجیزەیەک بۆ پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەک داوود باسی بکات، چونکە ئەوە بۆ هەموو کەس هەر وایە و، هەر کەسێک هەرا بکات لە ئەشکەوتێک دا دەنگدەداتەوەو، چیایەکانیش دەنگ دەدەنەوە، هەروەها باڵندەش هەر دەجریوێنن لەسەر هەموو کەس.

کەواتە: هەم چیایەکان خوا بەپاکگرتنێکی تایبەتییان هەبووە و، تایبەت بووە بە داوودەوە ﷺ وەک داوود دەنگیان لێوە هاتوە و، قسەیان کردوە، وەک موعجیزەییەک بۆ داوود، هەروەها باڵندەکانیش ئەو جۆرە زیکرو موناجاتەی داوود کردوویەتی بە زمانی خۆی، هەمان شتیان دووبارە کردۆتەوە، چونکە ئەمە بەس لێرە نیە و لە شوێنی دیکەش دا دەفەرموێ: ﴿يَـٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾﴾سبأ، واتە: ئەی چیایەکان! لەگەڵی بڵێنەوە، باڵندەکان ئێوەش لەگەڵی بڵێنەوە و ئاسنیشمان بۆی نەرمکردبوو، (أَوِّبِى مَعَهُۥ) واتە: (رَجِّعِي مَعَهُ)، ئەوە نیە کە دەنگ بدەنەوە، ئنجا ئەگەر چیایەکان دەنگ بدەنەوە، باڵندەکان چۆن دەنگ دەدەنەوە! بەڵکو (أَوِّبِى مَعَهُۥ)، واتە: ئەو چی دەڵێ، ئێوەش وا بڵێنەوە، داوودیش دەنگێکی زۆر زوڵاڵ و خۆشی هەبووە، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**عَنْ أَبِي مُوسى** ﷺ، **عَنِ النَّبِيِّ** ﷺ **قَالَ لَهُ: يَا أَبَا مُوسى لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ**} **(أخرجه البخاري: ٤٧٦١، والترمذي: ٣٨٥٥)**،

واتە: ئەبوو مووسا ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: ئەی ئەبوو مووسا! بێگومان تۆ ئاوازێک لە ئاوازەکانی داوودت، پێدراوە.

ئەبوو مووسای ئەشعەرییش ﷺ دەنگی یەکجار خۆشبووە.

بەڵێ داوود دەنگی زۆر زۆر خۆش بووە و، کاتێک کە موناجات و پاڕانەوەی کردوە لە خزمەت خوادا و دەنگی هەڵبڕیوە و پاڕاوەتەوە، وا پێدەچێ بە شیعرو سروود خوای پەروەردگاری دواندبێ، چیایەکانیش وەک ئەویان گوتووتەوە و، باڵندەکانیش وەک وی هەمان تەسبیحات و زیکرو موناجاتیان دووبارە کردۆتەوە، بۆیەش ئەگەر ئایەتەکانی قورئان هەموو پێکەوە بێنی لە بابەتێکدا، باشتر واتاکەیانت بۆ دەردەکەوێ: ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰجِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُۥ وَٱلطَّيۡرَۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلۡحَدِيدَ ١٠ ﴾سبأ، واتە: ئەی چیایەکان و ئەی باڵندەکان! لەگەڵیدا بڵێنەوە، ئەو کاتە چەمکی ئایەتی: ﴿ وَسَخَّرۡنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلۡجِبَالَ يُسَبِّحۡنَ وَٱلطَّيۡرَۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴾، لێرە زۆر جوان ڕوون دەبێتەوە، هەروەها مانای (سَخَّرۡنَا)ش: بۆمان ملکەچ کردبوون، ﴿ وَسَخَّرۡنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلۡجِبَالَ ﴾، ئەگەر مەبەست دەنگ دانەوە بێت، پێویست ناکات بفەرموێ: بۆ داوود چیایەکان و باڵندەکانمان دەستەمۆ و ملکەچ و ڕامکردبوون، چونکە بۆ هەموو کەس وان و تایبەت نیە بە داوودەوە، کەواتە: ئەو ملکەچکردنە شتێک بووە، تایبەت بووە بە داوودەوە ﷺ، هەندێک لە توێژەرەوانی قورئان لە کۆن و تازە، زۆرجاران ئەو شتانەی کە موعجیزە و یاسا دڕن، ویستوویانە بە جۆرێک بیانخەنە ڕوو، کە زیاتر لەگەڵ ڕواڵەتی عەقڵ و سەلیقەدا بگونجێن، بەڵام من پێم وایە پێویست بەو پینە و پەڕۆیە ناکات و، خوا چی فەرمووە، پێویستە وابیبینرێ، بە تایبەتی بۆ پێغەمبەران (عَلَيۡهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ)، وەک موعجیزە و شتێکی یاسا دڕو پێچەوانەی ئەو حاڵەت و باوە کە هەیە و، پێچەوانەی ئەو حاڵەتە سروشتی و ئاساییەی کە ئێستا هەیە.

### ٨-) داوود چۆن زرێیەکانی دروستکردوون؟

وەک چۆن لێرەدا هاتوە: ﴿وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ فَهَلْ أَنتُمْ شَٰكِرُونَ ﴿٨٠﴾﴾الأنبیاء، دروستکردنی پۆشاکی جەنگمان بۆ ئێوە تاکو لە کاتی جەنگدا بتانپارێزێ، فێری داوود کرد بوو، ئنجا ئایا ئێوە سوپاسگوزارن؟

ئەم مەسەلەیە لە دوو ئایەتی: (١٠ و ١١)ی سوورەتی: (سبأ)یشدا هاتوە: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا يَٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعْمَلْ سَٰبِغَٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی ئێمە بەخششمان لە لایەن خۆمانەوە بە داوود دابوو، ئەی چیایەکان و باڵندەکان! لەگەڵی بڵێنەوەوە ئاسنیشمان بۆ نەرمکردبوو، ئنجا تۆ زرێی داپۆشەر دروست بکە و لە کاتی چنیندا { و لە کاتی بزمار لێدان و چنینی زرێیەکەدا} با زۆر بە ئەندازەگیریی و بە وردیی بێ {وابێ کە نووکی رم و تیرو شیر بە کونەکاندا نەچێ} ﴿وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا﴾، کردەوە باشەکانیش ئەنجام بدەن، ﴿إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾، من (خوا) بینەری ئەوەم کە دەیکەن.

کەواتە: لێرەدا مەبەست لە (لَبُوسٍ)یش پۆشاکی جەنگە، واتە: زرێ، کە لێرەدا خوای زانا وشارەزا، بە وشەی: (سَٰبِغَٰتٍ) وەسفی کردوون (دِرعٌ سَابِغة)، واتە: زرێیەک کە هەموو جەستە داپۆشێ، (وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ) واتە: لە چنیندا ئەندازەگیریی بکە و وردەکاریی بکە، کەواتە: دروستکردنی زرێ بۆ داوود بەم شێوەیە بووە، زانایان دەڵێن: یەکەمین کەسێک کە زرێی ئاڵقەداری دروست کرد، داوود بوو، ئەگەرنا لە پێش داووددا پارچە پارچە بوو، یانی: پارچە پارچەی ئاسنەکان بوون لێک دەدران و لەبەر دەکرا، ئەوەش جووڵەی جەستەی کەمکردۆتەوە، بەڵام کە زرێ بێت و وەک پۆشاک لەبەر بکرێ، هەم جەستە باشتر تێیدا هەڵدەسووڕێ و، سووکتریشە و لە جەستەش خۆشترە.

**٩-) كارو كەسابەت بە گشتیی پێویستە و، دەبێ مرۆڤ چاوی لە دەستی خەڵكی نەبێ، كارو كەسابەت بكات، دەست بجووڵێنێ و دەستە و ئەژنۆ دانەنیشێ:**

ئەم ئایەتەی كە باسی دروستكردنی زرێ دەكات لە لایەنی داوودەوە ﷺ، لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە: كە داوود بە دەستی خۆی كاری دەكردو، ئایەتەكەش دەیگەیەنێ، كە زرێی دروستكردوون و خواش دەفەرموێ: ئاسنمان بۆ نەرمكردوە و، كە دیارە ئەویش هەر شتێكی موعجیزەیی بووە و خوا ئاسنەكەی بۆ نەرمكردوە، ئەگەرنا نەیدەفەرموو: بەخششی خۆمان پێدا، ئەگەر ئاسن بۆ داوود، هەروەك ئاسنی ئاسایی بووایە، ئەو كاتە خوا بە بەخششی ناو نەدەهێنا، كەواتە: ئاسن لەبەر دەستی داوود دا وەك موعجیزەییەك نەرم بووە و، بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا كردوە، كە بە پێویستیی زانیوە و كاری پێی هەبووە.

ئنجا كارو كەسابەت و پیشە و بە ڕەنجی خۆ ژیان، ئەویش دیارە عادەتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، بووە و ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەریش ﷺ ئەوە دەگەیەنێ، كە دەفەرموێ: {**لَأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ ثُمَّ يَغْدُوَ إِلَى الْجَبَلِ، فَيَحْتَطِبَ، فَيَبِيعَ، فَيَأْكُلَ وَيَتَصَدَّقَ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ النَّاسَ**} (**أخرجه البخاري: ١٤١٠، والنسائي: ٢٥٨٩، ولم نقف عليه بهذا اللفظ عند مسلم**).

واتە: ئەگەر یەكێك لە ئێوە گوریسەكەی خۆی بگرێ و، بەیانی بچێ بۆ چیا و، داران بكات و بە كوڵ {یان بە وڵاخ} بیهێنێتەوە و بیفرۆشێ و لێی بخوا {لە پارەكەی} و خێریشی پێ بكات، ئەوە باشترە بۆی لەوە كە لە خەڵك داوا بكات و سواڵ بكات.

## مەسەلەی سێیەم:

**ملکەچکردنی بای بەهێز بۆ سولەیمان، کە بەرە و سەرزەمینی پیرۆزداری دەبرد (سەر زەمینی شام)، هەروەها شەیتانەکان کە بۆی ڕۆ دەچوونە نێو دەریا، بۆ دەرهێنانی گەوهەرو مرواریی و، گەلێک کاری دیکەشیان بۆ دەکردن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا ۚ وَكُنَّا بِكُلِّ شَىْءٍ عَٰلِمِينَ ﴿٨١﴾ وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعْمَلُونَ عَمَلًا دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَكُنَّا لَهُمْ حَٰفِظِينَ ﴿٨٢﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً﴾، واتە: (سَخَّرنَا لِسُلَيْمَانَ الرِّيْحَ عَاصِفَةً)، هەروەها بای بەهێزیشمان بۆ سولەیمان دەستەمۆ و ملکەچکردبوو، وشەی (عَاصِفَةً)، (حال)ە یانی: لە کاتێکدا بە توندیی هەڵیدەکرد، بەهێز هەڵیدەکرد.

٢)- ﴿تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا﴾، بە فەرمانی وی بەرە و سەر ئەو زەمینە دەچوو، کە پیت و پێزمان تێخستوە، کە بە تەئکید مەبەست پێی سەر زەمینی شامە، وەک پێشتریش باسمان کرد: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ ﴿١﴾﴾الإسراء، (ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا) لە فەلەستینە (لە شامە)، خواش دەفەرموێ: لە دەوری ئەو مزگەوتە پیت و پێزمان داناوە، کە دەفەرموێ: ﴿تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ﴾، دەڵێ: (أي: تَرْجِعِ عَنِ الأَقْطَارِ الَّتي خَرَجَتْ إِلَيْهَا، لِمَصَالِحَ المَلِكِ سُلَيْمَان إلى الشَّام)، دەگەڕایەوە لەو شوێنانەی کە بۆی دەرچوو بوو، بۆ بەرژەوەندییەکانی پادشا سلیمان دەگەڕایەوە بۆ شام، کە دەفەرموێ: (بِأَمْرِهِۦٓ)، واتە: بە پێی ئارەزوو و ویستی سولەیمان عليه السلام ئەو بایە جووڵەی دەکرد.

٣)- ﴿وَكُنَّا بِكُلِّ شَيۡءٍ عَٰلِمِينَ﴾، ئێمە بە هەموو شتێک زانا بووین، ئایا ئەو بایە لە قسەی سولەیمان دەردەچێ، دەرناچێ؟ چی پێدەکات و، چی پێ ناکات؟ ئێمە پێی زانابووین و سولەیمان شایستەی ئەوە بوو ئەو نیعمەتەی پێ بدەین.

٤)- ﴿وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ﴾، هەروەها لە شەیتانەکانیش هەبوون کە بۆی ڕۆ دەچوون، بۆی ڕۆ دەچوونە نێو دەریا، تاکو گەوهەرو مرواریی بۆ دەربهێنن، وشەی (غوصْ)یش تەنیا بۆ چوونە نێو ئاوو ماددەی شل (سائل) بەکاردێ.

٥)- ﴿وَيَعۡمَلُونَ عَمَلٗا دُونَ ذَٰلِكَ﴾، جگە لەوەش کاری دیکەشیان ئەنجام دەدا، وەک دوایی باسی دەکەین لە تەفسیری سووڕەتی (سبأ)دا.

٦)- ﴿وَكُنَّا لَهُمۡ حَٰفِظِينَ﴾، ئێمە بۆیان پارێزەر بووین، واتە: پارێزەری شەیتانەکان بووین، کە لە فەرمانی سولەیمان دەرنەچن و زیان بە خەڵک نەگەیەنن.

## مەسەلەی چوارەم:

**ئەییووبیش خوا بە نەخۆشیی و ناخۆشییەکی سەخت تاقیکردەوە، ئنجا کاتێک زۆر سەغڵەت بوو، هاواری کردە پەروەردگاری: من نارەحەتیی سەختم تووش بووەو، تۆش بە بەزەییترینی بە بەزەییانی، ئیدی خوا بە دەنگیەوە چوو، بەڵاو ئازارەکەی لێ لابردو، وێنەی خێزان و کەس و کارەکەی پێداو، هێندەی دیکەشی بۆ زێدە کرد، تاکو ببێتە پەندو سەر مەشق بۆ خواپەرستان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ﴾، ئەییووبیش کاتێ بانگی پەروەردگاری کرد، واتە: یادی ئەییووب بکە، کاتێ کە بانگی پەروەردگاری کرد، یاخود ئەییووبیشمان تاقیکردەوە، کاتێ کە بانگی پەروەردگاری کردو لێی پاڕایەوە.

ئایا ئەییووب ماوەی چەند لەو بەڵاو گرفتارییەدا ماوەتەوە؟ هەندێ لە زانایان دەڵێن: حەوت ساڵ، هەندێ دەڵێن: هەژدە ساڵ، بەڵام شتێکی دڵنیایی لەو بارەوە نیە، هەڵبەتە ئێمە دوایی بەسەرهاتی ئەییووبیش - وەک داوودو سولەیمان (**عليهم الصلاة والسلام**) - باسێکی سەربەخۆی لە بارەوە دەکەین.

٢)- ﴿أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ﴾، واتە: من نارەحەتییم توش بووە (**ضُرٌّ: مَا يَتَضرَّرُ المَرْءُ بِهِ فِي جَسَدِهِ مِنْ مَرَضٍ أو هُزَالٍ، أو فِي مَالِهِ مِنْ نَقْصٍ وَغَيْرِهِ**)، (**ضُرّ**) هەر شتێکە کە ئینسان پێی زیانبار بێ، یان پێی نارەحەت بێ، ئنجا چ لە جەستەی دابێ، وەک نەخۆشیی و بێ هێزیی، یاخود لە ماڵ و سامانیدا بێ، وەک لە دەستچوونی و کەم بوونی.

کە دیارە ئەوەی ئەییووب وەک دوایی لە بەسەرهاتەکەشدا باس دەکەین، هەم نەخۆشیی بووە و، هەم لە دەست دانی ماڵ و سامانی بووە و، هەم لە دەستدانی خزم و کەس وکاریشی بووە.

٣)- ﴿وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾، واتە: تۆ بە بەزەییترینی بە بەزەییانی، واتە: تۆ خاوەنی بەزەیی و لوتف و میهرەبانییەکی بێ سنووریی و لە فریام وەرە.

٤)- ﴿فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ﴾، واتە: ئێمەش وەڵاممان دایەوە و بە دەنگیەوە چووین.

٥)- ﴿فَكَشَفۡنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرّٖ﴾، واتە: ئەو ئازارو ناڕەحەتیی و نەخۆشیی و ناخۆشییەی کە لێی بوو، لێمان لابرد، (**الكَشْفُ: مُسْتَعْمَلٌ فِي الإِزَالَةِ السَّرِيْعَة شُبِّهَت بِإِزَالَةِ الغِطَاءِ**)، وشەی (**كَشْفُ**) بە مانای هەڵدانەوەیە، بە مانای لابردنی شتێکە لەسەر شتێک، کە لێرەدا بەکارهێنراوە بۆ لابردنی خێرا و، چوێنراوە بە لابردنی سەر پۆشێک لەسەر شتێک، چۆن بە خێرایی لای دەبەی، ئەو ئازارو ناڕەحەتییەش، بە خێرایی لە ئەییووب لاچووە، دوای ئەوەی خوا ﷻ ویستوویەتی.

٦)- ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُ أَهۡلَهُۥ﴾، واتە: خێزانەکەشیمان پێدا، لێرەدا کە دەفەرموێ: خێزانەکەیمان پێدا، واتە: ماڵ و خێزانەکەیمان بۆ گێڕایەوە، ئنجا (**أهل**) بریتیە لە کەسانێک کە لەگەڵ مرۆڤدا لە ماڵەوە دەژین، (**أهل البَيْت**)یشی پێ دەڵێن، واتە: ئەوانەی کە لە ماڵەوە لەگەڵ مرۆڤدان، کە خێزانی دەگرێتەوەو، کوڕەکانی و، کچەکانی، هەروەها جگە لەوانەی کە لە ماڵێدا لەگەڵی دەژین، خزمەکانیشی دەگرێتەوە، کەس و کاری و نزیکانی.

٧)- ﴿وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ﴾، واتە: وێنەی خۆشیان لەگەڵیاندا، زانایان هەندێکیان گوتوویانە و لە پەیمانی کۆنیش دا هاتوە: کە حەوت کوڕو سێ کچی بوون، دوایی خوا ﷻ ئەوانەی مردوون، ئەو حەوت کوڕو سێ کچەی مردوون، ئەو دە (١٠) منداڵە، دوایی خوا بیست (٢٠) منداڵی داوەتێ و، چواردە کوڕو شەش کچ، هەندێکیش دەڵێن: خوای باڵادەست ئەوانەی بۆ زیندوو کردوونەوەو، ئەوەندەی دیکەشی پێداون، خێزانەکەیشی

هەر لەگەڵیدا ماوەو وەفاتی نەکردوە، هاوسەرەکەی دوایی کۆمەڵە منداڵێکی زۆری بوون، لە کوڕان و لە کچان.

هەندێکیش وایان لێکداوەتەوە، کە خێزانەکەشی وەفاتی کردوە و منداڵ و کوڕو کچەکانیشی، بەڵام دوایی خوا ﷻ هاوسەرێکی دیکەی بۆ ڕەخساندوە و، دوو بەرانبەری ئەو منداڵانەی کە لە هاوسەری پێشووی بوون، لەو هاوسەرەی دوایی پەیدابوون، ئەو ڕایەش هەیە، بەڵام ڕای یەکەم نیزیکترە و لە بەسەرهاتەکەشیدا، وا هاتوە.

٨)- ﴿ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا ﴾، واتە: ئەوە بەزەییەک بووە لە ئێمەوە، بەزەیی و سۆزو پەرۆشییەک بوو لە ئێمەوە بەرانبەر بە ئەییووب.

٩)- ﴿ وَذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰبِدِينَ ﴾، واتە: ئەوە بیرخەرەوەش بوو، پەندێک بوو بۆ خواپەرستان، بیریان بخاتەوە و دەرس و پەندی لێوەربگرن، کە هەر کەسێک لە بن باری تاقیکردنەوەی خوادا، خۆی ڕابگرێ، سەرەنجام لە دنیاو دواڕۆژدا شانازیی بۆ دەمێنێتەوە.

لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین: ئەوەی لە بارەی نەخۆشییەکەی ئەییووبەوە گوتراوە و، لە زۆر لە سەرچاوەکاندا هاتوە و، لە پەیمانی کۆنیشدا هاتوە و، پێم وایە ڕوونکەرەوانی قورئان لەوێ وەریانگرتوە، وەک دوایی بەسەرهاتەکەی دەگێڕینەوە، هەندێک زێدەڕۆیی هەن، کە دڵنیاین، وانین، چونکە نابێ پێغەمبەران (عَلَيۡهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) تووشی نەخۆشیی و حاڵەتێکی وابن کە خەڵک لێیان بسڵەمێتەوەو، قێزەون بن و لەگەڵ پایەو مەقامی بەرزی پێغەمبەراندا نەگونجێ، بەڵێ دەگونجێ تووشی ناڕەحەتیی و نەخۆشیی و هەژاریی بن و، بکوژرێن و، دەربەدەربن، بەڵام نابێ کەم و کوڕییەکی وایان تێدا پەیدابێ، کە مایەی سڵەمینەوەی خەڵک و بێزلێبوونەوەیان بێ، ئنجا ئەوەی لەو بەسەرهاتانەدا هاتوە، کە گوایە کرمەڕێز بووە، ئەوە بێگومان درۆیە و لەگەڵ پایەو مەقامی پێغەمبەراندا (عَلَيۡهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) نەگونجاوە.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**هەر کام لە ئیسماعیل و ئیدریس و زول کیفل، ئەوانیش لە خۆڕاگران بوون، بۆیە خوا خستنیە ڕیزی بەندە چاک و پەسندەکانیەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا ٱلْكِفْلِ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٨٥﴾ وَأَدْخَلْنَٰهُمْ فِى رَحْمَتِنَآ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا ٱلْكِفْلِ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾، هەروەها ئیسماعیل و ئیدریس و زول کیفل، ئەوانەش هەر کامێکیان لە خۆڕاگران بوون.

خۆڕاگریی (ئیسماعیل)مان لێ دیارە، کە ئامادە بوو بابی سەری ببڕێ و پێیگوت: ﴿ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ﴾الصافات، واتە: ئەی بابە گیان! ئەوەی فەرمانت پێکراوە، ئەنجامی بدەو، ئەگەر خوا بیەوێ من لە خۆڕاگران دەبینی، هەر واشبوو.

بەڵام ئایا خۆڕاگریی ئیدریس ﷺ و، خوڕاگریی زول کیفل چۆن بووە؟ لە قورئاندا بەیان نەکراوە، هەروەها لە سوننەتی پێغەمبەریش دا ﷺ نەهاتوە، بەڵام ئێمە دڵنیاین، خوا کە ئەو دوو پێغەمبەرە پایە بەرزەشی بە خۆڕاگریی وەسف کردوە، دیارە خاوەنی ئەو سیفەتە بوون، هەڵبەتە هەموو پێغەمبەران خاوەنی خۆڕاگریی بوون، بەڵام ئەوانەی خوا ﷻ لێرەو لەم مەقامەدا بە صەبر وەسفیان دەکات، دیارە خاوەنی خۆڕاگرییەکی بەرچاو و گەورە بوون، کە شایانی باس بووە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ﴾، ئا ئەمە:

أ- دەگێڕدرێتەوە بۆ سەر باسی لووط ﷺ کە دەفەرموێ: ﴿ وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ﴾الأنبياء، واتە: هەر کامێک لە ئیسماعیل و ئیدریس و زول کیفلیش، هەم حیکمەت و دانایی و لێزانیی و، هەم زانیاریی و شارەزاییمان پێدابوون.

ب- یاخود دەگێڕدرێتەوە بۆ سەر: (**وإذ**)، واتە: (**واذْكُرْهُم**) واتە: یادیان بکە، یادی ئەو سێیانەش بکە.

ج- یاخود دەگێڕدرێتەوە بۆ سەر ئەوە، کە لە کۆی ئەو بەسەرهاتانە وەردەگیرێ، کە بریتیە لە تاقیکردنەوە، واتە: ئەوانیشمان تاقیکردەوە.

٢)- ﴿ وَأَدْخَلْنَٰهُمْ فِى رَحْمَتِنَآ ﴾، واتە: هەروەها خستماننە نێو بەزەیی خۆمانەوە.

٣)- ﴿ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان لە پەسندان و چاکان بوون، ئەمە هۆکار خستنەڕوو (**تعليل**)ی ئەوەیە کە بۆچی خوا خستنیە نێو بەزەیی خۆیەوە؟ لەبەر ئەوەی لە بەندە پەسندەکانی خوا بوون، ئیشی خوا هیچی لە گۆترە نیە.

دیارە ئێمە پێشتریش لە سوورەتی (مریم)دا، باسی ئیسماعیل و ئیدریسمان کردوە و، بەسەرهاتی (**ذا الكفل**)یش لە تەفسیری ئەم سوورەتەدا، خوا پشتیوان بێ دەیخەینە ڕوو.

مەسەلەی شەشەم:

**یونوس ﷺیش خوا بەسەری کردەوە کاتێک لە گەلەکەی تووڕە بوو، بەبێ مۆڵەت وەرگرتن ڕۆیی، خواش سزای دا بە قووتدرانی لە لایەن نەهەنگەوە، بەڵام لە تاریکاییەکاندا هاواری کردە خوا کە: تۆ پاکی و من ستەمکارم، ئیدی خواش دەربازی کردو، هەر ئاواش بڕواداران کاتێ دەکەونە تەنگانەو ناڕەحەتییەوە دەربازیان دەکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ ﴾، هەروەها یادی هاوەڵی ماسییش بکە، وشەی (ذَا) یانی: (صَاحِبْ) (صَاحِبْ)یش هەم بە مانای هاوەڵ دێ، هەم بە مانای خاوەن دێ، (ٱلنُّونِ)یش بە مانای نەهەنگ و ماسیی دێ، کەواتە: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ ﴾، واتە: (صَاحِب الحُوتِ) کە ئەم تەعبیرە لە سووڕەتی (القلم)دا هاتوە: ﴿ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ ﴿٤٨﴾ ﴾القلم، خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: وەک هاوەڵی، یاخود وەک خاوەنی نەهەنگەکە مە بە.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ (ٱلنُّونِ) بە مانای نەهەنگ دێ، واتە: ماسیی گەورە، لە شوێنی دیکەش دەفەرموێ: ﴿ فَٱلۡتَقَمَهُ ٱلۡحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٞ ﴿١٤٢﴾ ﴾الصافات، لێرەش (حوت) هەر بە مانای نەهەنگ دێ.

ئنجا ئەگەر باسی ماسییش کرابێ، لەبەر ئەوەی نەهەنگیش هەر ماسییە و ماسی ناوە گشتییەکەیەتی، بەڵام ئەو ماسییەی کە یونوسی قوتداوە، ماسییەکی تایبەت بووە، ماسییەکی گەورە بووە.

واتـە: وەک هاوەڵـی نەهەنـگ مەبـە، کاتێـک بانگـی پـەروەردگاری کـرد کـە زۆر خەفەتبـارو دڵ پـڕ مەینەتیـی بـوو، لێرەش دەفەرمـوێ: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ ﴾، واتـە:

أ- یادی خاوەنی ماسیی، یاخود هاوەڵی ماسیی، نەهەنگیش بکەوە.

ب- یاخود: ئەویشمان تاقیکردەوە.

ج- یاخود: ئەویش حیکمەت و زانیارییمان پێدا بوو.

٢)- ﴿ إِذ ذَّهَبَ مُغَـٰضِبًا ﴾، کاتێ کە بە تووڕەیی ڕۆیشت، بێگومان لە گەلەکەی تووڕە بووە کە خەڵکی نەینەوا بوون، بۆچی لێیان تووڕە بووە؟ دیارە زۆر کەللەڕەق بوون و، وەڵامی بانگەوازو پەیامەکەیان نەداوەتەوە، ئەویش تووڕە بووە و ڕۆیشتوە و ئەوێی بە جێهێشتوە.

٣)- ﴿ فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْـهِ ﴾، پێی وابوو ئێمە سەر زەمینمان لێ وەتەنگ نەهێناوە، یانی: (أن لَنْ نُضَيِّق عَلَيْه)، چونکە (قَدَرَ) لێرەدا بە مانای (ضَيَّق)یە، (قَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ)، (أي: ضَيَّقهُ عَلَيْه)، هەروەک لە قورئاندا هاتوە: ﴿ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥٓ ﴿٦٢﴾ ﴾العنكبوت، واتە: خوا بۆ هەر کەسێک بیەوێ، بژیو فراوان دەکات، یاخود لێی وەتەنگ دێنێ، تەنگی دەکاتەوە، ﴿ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ ۖ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ﴿٧﴾ ﴾الطلاق، واتە: هەر کەسێک بژیو لێ وەتەنگ هات، بژیوی لێ کەم کرایەوە، با بە پێی ئەوە کە خوا پێی داوە، ببەخشێ، کە مەبەست لە پیاوێکە کە خێزانی تەڵاق داوە، دەبێ نەفەقەی بکێشێ، هەر کەسە بە پێی خۆی.

جارێـک موعاوییـە لـە ئیبنو عەببـاس دەپرسـێ دەڵێ: مـن دوێنێ قورئانـم خوێندەوە یـان شـەپۆلەکانی دەریـای قورئـان لێیاندام، سـەرم لـەوە دەرنەچـوو: ﴿ فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْـهِ ﴾، ئـەو وای تێیگەیشـتوە کـە یونـوس پێـی وابـووە، ئێمـە دەسـتەڵاتمان بەسـەریدا نیـە! ئیبنـو عەببـاس گوتـی: (فَهَـذَا مِـنَ القَـدْرِ لَا مِـنَ القُـدْرَةِ)، ئـەم (قَـدَر) لـە (قَـدْر)ە واتـە: کەمکردنـەوە (تَضييـق) لـێ کەمکردنـەوە، نـەوەک لـە (قُـدْرَةِ) واتـە: دەسـەڵات بەسـەردا ڕۆیشـتن، ئەمـە لـە تەفسـیری (الكشـاف)دا ئاماژەی پێـدراوە.

کەواتە: ﴿فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ﴾، پێی وابوو ئێمە ئەو شوێنەی کە دەبوو پەیامی خوای تێدا ڕابگەیەنێ و، بەرنامەی خوای تێدا ڕابگەیەنێ، ئێمە لێمان تەنگ نەکردۆتەوە لە نەینەوا و دەوروبەریدا، بەڵکو بۆ هەر شوێنێ بچێ، بۆی هەیە، بەڵام دیارە بۆچوون و کۆشش کردنەکەی هەڵە بوو، بۆیە خوا ﷻ سزای دا، ئەویش بەوەی کە نەهەنگ قووتیدا، یان: بەدەمییەوە گرت، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ١٤٢﴾الصافات، واتە: نەهەنگ بەدەمیەوە گرت لە حاڵێکدا گلەیی هێنەر بوو بۆ سەرخۆی .

٣)- ﴿فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَـٰتِ﴾، لە تاریکاییەکاندا بانگی کرد، بێگومان بانگی خوای پەروەردگاری کردوە، تاریکاییەکان زانایان دەڵێن: تاریکایی شەو، تاریکایی دەریا و، تاریکایی سکی نەهەنگ.

٤)- ﴿أَن لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَـٰنَكَ﴾، کە جگە لە تۆ هیچ پەرستراوێک نیە، پاکیی بۆ تۆ، تۆ بە پاک دەگرم، واتە: تۆ بە پاک دەگرم، تۆ پێچەوانەی حیکمەت فەرمانم پێ بکەی، تۆ بە پاک دەگرم، نەدەبوو من بە بێ مۆڵەت وەرگرتن لە تۆ، ڕۆیشتبامایە.

٥)- ﴿إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾، بە دڵنیایی من لە ستەمکاران بووم، واتە: من کە ڕۆیشتم بە بێ مۆڵەت، ستەمم لە خۆم کرد، بۆیە شایستەی ئەوە بووم، سزام بدەی، پاکیی بۆ تۆ کە بە ناهەق بەندەکانت سزا بدەی.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **{دَعْوَةُ ذِي النُّونِ فِي بَطْنِ الحُوتِ: لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ، لَمْ يَدْعُ بِهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلَّا اسْتَجَابَ اللَّهُ لَهُ} (أخرجه أحمد: ١٤٦٢، والترمذي: ٣٥٠٥، والنسائي في الكبرى: ١٠٤٩٢، والحاكم: ١٨٦٢، وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي في شعب الإيمان: ٦٢٠).**

واتە: پاڕانەوەی (**ذِي النُّونِ**) لە سکی ماسییدا: (**لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ**)، بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراوێک نیە، پاکیی بۆ تۆ، (تۆ بە پاک

دەگرم) مـن لـە ستەمکاران بـووم، هیـچ مسـوڵمانێک هەرگیـز پێـی لـە پـەروەردگاری نەپاڕاوەتـەوە، مەگـەر وەڵامـی داوەتـەوە و بـە دەنگیـەوە هاتـوە.

٦)- ﴿ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ ﴾، ئێمەش بە دەنگیەوە چووین و وەڵاممان دایەوە.

٧)- ﴿ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ ﴾، لەو خەم و مەینەتییەی کە تێدابوو، دەربازمان کرد.

٨)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، هەر بەو شێوەیەش بڕواداران کە دەکەونە خەم و مەینەتییەوە، دەربازیان دەکەین.

لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، واتـە: ئەو بـە دەنگەوە هاتـن و لـە فریـا هاتنـەی خـوای پـەروەردگار بـۆ خاوەنـی نەهەنـگ، بـۆ یونـوس ﵇ تایبـەت نیـە بـەوەوە، بەڵکـو هـەر بـەو شـێوەیەش بڕوادارانـی دیکـەش کـە دەکەونـە خـەم و نارەحەتیـی و مەینەتییـەوە، ئـاوا بـە دەنگیانـەوە دێیـن و دەربازیـان دەکەیـن، بـە مەرجێـک ئـەوان ئـاوا لێـمان بپاڕێنەوە.

﴿ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، خوێندراویشـەتەوە: (وَكَذَلِـكَ نَجَّـى الْمُؤْمِنِيْنَ)، یـانی: بەوجـۆرەش (خـوا) بـڕوادارانی دەربازکـردن. لـە بـارەی ئـەوەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ ئامۆژگاریـی مسـوڵمانانی کـردوە، بەهـۆی ئـەو هەڵوێسـتەی (یونـوس)ەوە گومانـی خراپیـان بـۆ پەیـدا نەبـێ و، بـە کـەم باسـی یونـوس بکـەن، یـان ڕەخنـەی لـێ بگـرن، فەرموویەتـی: {لاَ يَنْبَغِي لِعَبْدٍ أَنْ يَقُـولَ: أَنَا خَيْرٌ مِـنْ يُونُـسَ بْـنِ مَتَّـى} (أخرجـه أحمـد: ٢١٦٧، والبخـاري: ٣٢٣٢، ومسـلم: ٢٣٧٧، وأبـو داود: ٤٦٦٩، ابـن حبـان: ٦٢٤١، وأبـو عوانـة: ٣٩٠).

واتـە: هیـچ بەندەیـەک ناگونجـێ و نابـێ بڵـێ: مـن (پێغەمبـەری خـوا) باشـترە لـە یونـوسی کـوڕی مەتتـا.

ئێمـە بەسـەرهاتی یونوسیشـمان لـە تەفسـیری سـوڕەتی (یونـس)دا، بـە تەفصیـڵ بـاس کـردوە، بۆیـە لێـرەدا بـە کورتیـی بەسـەریدا ڕۆیشـتین.

## مەسەلەی حەوتەم:

**هەروەها زەکەرییاش خوا حیکمەت و زانیاریی پێدا بوو، کاتێک لە خوا پاڕایەوە کە تەنیا جێی نەهێڵێ و کوڕێکی چاکی پێ بدات، خواش هاوسەرەکەی (کە نەزۆک بوو) بۆ چاک کردەوەو، یەحیاشی پێبەخشی، ئەوانیش دەستکەرم بوون لە چاکەکاریی داو، بۆ خوا دڵ پڕ هیواو سام بوون و ملکەچ بوون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَزَكَرِيَّآ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ٨٩ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ٩٠﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿وَزَكَرِيَّآ﴾، واتە: یادی زەکەرییاش بکە، یاخود زەکەرییاش حیکمەت و زانیارییمان پێدا بوو، یاخود زەکەرییاشمان تاقیکردەوە، بە هەر سێ واتایەکە، کە بۆ ئەوانی دیکەش باسمان کردن، هاتوە.

٢)- ﴿إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ﴾، واتە: کاتێ لە پەروەردگاری پاڕایەوە، بانگی پەروەرگاری کرد.

٣)- ﴿رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ﴾، واتە: پاڕانەوەکەی ئەوە بوو، گوتی: پەروەردگارم! بە تەنیا جێم مەهێڵە و، تۆ باشترینی میراتگرانی، وشەی (**فَرْد**)، (**أُطْلِقَ الفَرْدِ عَلَى مَنْ لَا وَلَدَ لَهُ، تَشْبِيْهًا لَهُ بِالمُنْفَرِد الَّذي لَا قَرِيْنَ لَهُ**)، وشەی (**فَرْد**) بەکارهێنراوە بۆ کەسێک کە منداڵی نیە، چوێندراوە بە بابایەکەوە کە تاکە و هاوەڵێکی نیە.

کە دەفەرموێ: ﴿وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ﴾، تۆ باشترینی میراتگرانی، بۆیە لەو سیفەتە هەقەی خۆت شتێکم پێ ببەخشە، کە تۆ باشترین میراتگری، با منیش میراتگرێکم هەبێ، چونکە پاڕانەوە لە خوا ﷻ وا باشە بە سیفەتەکانی بێ، ئەگەر ئینسان بیەوێ داوای لێبوردن لە خوا بکات بڵێ: (**یا غَفَّار**) یان (**یا غَفُور**) و، ئەگەر بیەوێ داوای بەزەیی

لێ بکات، بە سیفەتی (الرَّحْمَن) و، ئەگەر بیەوێ داوای سەرخستنی لێ بکات، بە سیفەتی عیززەت و توانا، هەروەها لە سووڕەتی (مریم)یش دا کە ئێمە بە تەفصیلْ باسی زەکەریا و یەحیامان کرد، لەوێدا خوا دەفەرموێ: ﴿ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ﴿٦﴾ ﴾، میرات لە منیش و لە بنەماڵەی یەعقووبیش بگرێ.

٤)- ﴿ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَوَهَبْنَا لَهُۥ يَحْيَىٰ ﴾، واتە: وەڵاممان دایەوەو، بە دەنگیەوە چووین و، یەحیاشمان پێدا.

٥)- ﴿ وَأَصْلَحْنَا لَهُۥ زَوْجَهُۥٓ ﴾، واتە: هاوسەرکەیشیمان بۆ چاککرد، واتە: وامانلێکرد کە چاک بێ، بتوانێ تۆڵدار بێ، بتوانێ کۆرپەی وەسك بکەوێ، دوای ئەوەی نەزۆک بووە، ئنجا بێگومان پێشێ خوا ﷺ هاوسەری زەکەریای چاک کردوە و، دوایی یەحیای پێ بەخشیوە، بەڵام لێرەدا بەخشرانی یەحیا پێشخراوە، چونکە ئەوە جێی مەبەست بووە، بۆیە ئەوەی جێی مەبەست بووە لە لای زەکەریا ئەوی پێشخستوە و، ئەوەی ئامراز و هۆکار بووە، دوای خستوە، یانی: چاککردنەوەی هاوسەری لە حاڵەتی نەزۆکیی، کە وای لێ بکات شایستەی ئەوە بێ دوو گیان بێ.

٦)- ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ﴾، ئەمە هۆکار دۆزیی (تَعْلِيْل)ە، بۆ ڕستەکانی پێشەوە، واتە: بۆیە ئەوەمان بۆ کردن، چونکە ئەوان خێراییان دەکرد لە چاکەکاندا، پێشبڕکێیان دەکرد، وشەی (ٱلْخَيْرَٰتِ) کۆی (خَيْرٌ)ە، هەروەک (حَمَّامَات) کۆی (حَمَّام)ە، (سَرَادِقَّات) کۆی (سَرَادِق)ە واتە: بە بێ قیاس کۆکراوەتەوە.

٧)- ﴿ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ﴾، واتە: لێمان دەپاڕانەوە، بە ئارەزوومەندانەو بە سام لێکردنەوە، وشەی (رَغَبْ) و (رَهَبْ) چاوگن لە (رَغِبَ) و (رَهِبَ)، (رَغِبَ) واتە: ئارەزوومەند بوو، (رَهِبَ) واتە: سامی کردو ترسا.

٨)- ﴿ وَكَانُوا۟ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴾، ئەوان بۆ ئێمە ملکەچ بوون، (الخُشُوعُ: خَوْفُ القَلْبِ بِالتَفَكُّرُ دُونَ اضْطِرَابِ الأَعْضَاء الظَّاهِرَة)، (خُشُوعُ): بریتیە لە ترسی دڵ لە حاڵەتێکی پەنهان و بیرکردنەوەدا، بێ ئەوەی ئەو ترسە لەسەر ئەندامە ڕوواڵەتییەکان دەربکەوێ بە لەرزین و هەژان، یانی: (خُشُوعُ) بریتیە لە سام و هەیبەتێکی پەنهان.

### مەسەلەی هەشتەم:

**مەریەمی پاکیزەش کە خوا رووحی مەسیحی لە ڕێی جیبریلەوە بەبەردا کرد، هەروەها کوڕەکەیشی، نیشانەیەکی مەزنی خوا بوون بۆ جیهانییان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلۡنَٰهَا وَٱبۡنَهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ٩١﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿وَٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا﴾، هەروەها ئەوەی کە داوێنی خۆی پاراست، وشەی (فَرْج) بە مانای دابڕاوایی دێ و، لێرەدا بە مانای کەلێن و دابڕاوایی دێ، نەک بە مانای ئەندامی زاووزێ، چونکە لە قورئاندا خوا ﷻ نە ئەندامی زاوزێی مرۆڤ، چ پیاو یان ئافرەت، نە حاڵەتی پێکەوە جووت بوون، بە وشەی ڕاشکاو، نەیهێناون، بەڵکو بە لەبەر ڕاهاویشتن و لە پەردەدا (كناية) بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿وَقَدۡ أَفۡضَىٰ بَعۡضُكُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ ٢١﴾النساء، واتە: هەندێکتان چوونە لای هەندێکتان، یان دەفەرموێ: ﴿أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ ٦﴾المائدة، واتە: دەستتان گەیاندە ژنەکانتان، کە مەبەستی پێیان جووت بوونە، بەڵام بە تەعبیرێکی زۆر بە نەزاکەت دەیفەرموێ، هەروەها بۆ مەسەلەی تارەت گرتن، دەفەرموێ: ﴿أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ ٤٣﴾النساء، واتە: یەکێکتان لە شوێنی نزمەوە هاتەوە، عادەتیان وابووە لە شوێنی نزم و گۆملایی و پەنهان و نەدیو، تارەتیان گرتوە، ئەگەرنا (ٱلۡغَآئِطِ ) بە مانای پاشەڕۆک نیە، بەڵکو بە مانای شوێنی نزم و گۆملایی دێ، ئەو شوێنەی تارەتیان تێدا گرتوە، یانی: ئەگەر یەکێکتان لە شوێنی تارەت گرتنەوە گەڕایەوەو تارەتی گرتبوو، کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا﴾، واتە: ئەوە کە خۆی پاراستبوو، داوێنی خۆی پاراستبوو.

دوای ئـەوەی خـوا عـز وجـل باسـی پیاوانـی کـرد، پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَمُ**)، ئنجـا باسـی ئافرەتێکـی خـاوەن پێگـەو پایـەی بـەرز دەکات، چونکـە بەخششـی خـوا تایبـەت نیـە، بـە پیاوانـەوە و پەیوەسـت نیـە بـە ڕەگەزێکـی دیاریکـراوەوە.

هەندێـک لـە زانایان، یەکێـک لەوانـە (**محمـد الطاهـر بـن عاشـور**) دەڵـێ: (**مریـم**) ڕەوانەکـراو نەبـووە، بـەڵام پێغەمبـەر بـووە، واتـە: خـوا وەحیـی بـۆ نـاردوە، بـەڵام پێغەمبەرێـک نەبـووە، کـە ڕەوانەکـراو بـێ و ئـەو پەیامـەی خـوا بگەیەنـێ، بـەڵام زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان دەڵێن: نەخێر پێغەمبـەران بە هـەردووک جۆرەکەیانەوە: (**الأنبيـاء**) و (**الرسـل**)، کـە (**أنبيـاء**): خـوا وەحیـی بـۆ نـاردوون - بـە ڕای هەندێـک لـە زانایـان - بـەڵام فەرمانیـان پـێ نەکـراوە پەیامـی خـوا بگەیەنـن بـە غەیـری خۆیـان، (**رسـل**)یش ئەوانـەن وێـڕای ئـەوەی خـوا سروشـی بـۆ کـردوون، مولزەمیـش کـراون کـە پەیامـی خـوا بگەیەنـن بـە غەیـری خۆیـان، بـەڵام زۆربـەی زانایـان دەڵێـن: ڕەوانەکـراوان و پێغەمبـەران لـە نێـو بازنـەی پیاوانـدا کـورت هەڵاتـوون، ئایەتەکانیـش وا دەگەیەنـن، وەک چەنـدان جـار باسـمان کـردوە، ئنجـا دەفەرمـوێ: ئـەو ئافرەتـەش کـە داوێنـی خـۆی پاراسـت، کـە داوێنـی خـۆ پاراسـتنەکەی (**مریـم**) بـەس لـە حـەڕام نەبـووە، بەڵکـو لـە حەڵاڵیـش پاراسـتوویەتی، چونکـە هاوسـەرگیریی نەکـردوە.

٢)- ﴿فَنَفَخْنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا﴾، ئێمەش لە گیانی خۆمان فوومان بەبەردا کرد، واتە: لەو ڕووحە لەو گیانە تایبەتەی کە بە تایبەت خوڵقاندوومانە، بە شێوەیەکی تایبەتییش خستمانە نێو جەستەی (**مریم**)ەوە و، فوومان بە (**مریم**)دا کرد.

(**النَّفْـخُ: حَقِيْقَتُـهُ إِخْـرَاجُ هَـوَاءِ الفَـمِ بِتَضْيِيـقِ الشَّـفَتَيْنِ، وَأُطْلِـقَ هُنَـا تَمْثِيْلًا لِإِلْقَـاءِ رُوْحِ التَّكْوِيْـنِ لِلْنَّسـلِ فِي رَحِـمِ الْمَـرْأَةِ، دُفْعَـةً وَاحِـدَةً بِـدُونِ الوَسَـائِلِ الْمُعْتَـادَة، تَشْـبِيهَاً لِهَيْئَـةِ التَّكْوِيْـنِ السَّرِيْـعِ بِهَيْئَـةِ النَّفْـخِ**)، واتـە: وشـەی (**نَفْـخ**) لـە ڕاسـتییدا بریتیـە لـەوەی ئینسـان دوو لێوەکانـی خـۆی وێـک بێنێتـەوە، بـۆ ئـەوەی هـەوای لـێ بچێتـە دەرێ،

بەڵام لێرە بەکارهێنراوە بۆ هاویشتنی ڕووحێک کە وەچەی لێ پەیدا بێ و خستنیە نێو منداڵدانی ئافرەتێکەوە بە یەکجار، بەبێ ئامرازە باوەکان، کە لێرەدا ئەمە {شێوەی دروستبوونی خێرای مەسیح عليه السلام لە سکی دایکیدا} چوێندراوە بە فووکردن، فووکردن چەند خێرایە، عیساش عليه السلام ئاوا بە خێرایی برایە نێو منداڵدان و سکی دایکی کە مەریەمە، خوا لێی ڕازی بێ.

لە سووورەتی (**المؤمنون**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً ﴿٥٠﴾ ﴾، واتە: کوڕی مەریەم و دایکیمان کردنە نیشانەیەک، لێرەش دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَٰهَا وَٱبْنَهَآ ءَايَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٩١﴾ ﴾، خۆی کوڕەکەیمان کردنە نیشانەیەک بۆ جیهانییان، لە سوورەتی: (**المؤمنون**)یش دا، دەڵێ: کوڕی (مریم)و دایکیمان کردنە نیشانەیەک، یەکێ بۆی هەیە بپرسێ: باشە لە چەند شوێناندا خوا ﷻ بە تایبەت لێرەدا لە جێی دیکەش هاتوە، بۆچی مەریەم بەوە وەصف دەکات، کە داوێنی خۆی پاراستوە، لێرەدا مەریەمی ڕێک بە وەصفەکەی باسیکردوە، لە شوێنی دیکە گوتوویەتی: ﴿ وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ ٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا ﴿١٢﴾ ﴾التحريم، واتە: مەریەمی کچی عیمران کە داوێنی خۆی پاراست؟!

**ئەمە دوو حیکمەتی تێدا هەن:**

١- بەرپەرچدانەوەی جوولەکەکان کە (عیسا)یان، بەوە تۆمەتبار دەکرد دەیانگوت: زۆڵە، بیژوویە، دایکی زینای کردوەو بابی دیار نیە، ئەوە بەرپەرچدانەوەی جوولەکەکانە، نەخێر دایکی زۆر ئافرەتێکی پاکیزەو پاک بووە، بەڵام خوا بە شێوەی تایبەت ڕووحی (عیسا)ی بەبەردا کردوە، بەبێ ئەوەی لەگەڵ پیاوێکدا جووت بێ، نە بە حەڵاڵیی و، نە بە حەڕامیی.

٢- ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە پاکیی ئافرەتان، چ مەریەم، چ غەیری مەریەم، هۆکاری ئەوەیە کە خوا ﷻ لە فەیزو بەخشش و بەرەکەتی خۆییان پێ ببەخشێ، پاکیی ئافرەتان هۆکاری ئەوەیە کە خوا لوتف و میهرەبانیی زیاتریان لەگەڵ دا بنوێنێ، هەڵبەتە هی ئافرەتانیش و هی پیاوانیش، بەڵام لێرەدا باس باسی (**مریم**)و باسی ئافرەتانە.

شایانی باسە ئێمە بەسەرهاتی (مریم)و (عیسا)شمان سەلامی خوا لەسەر هەردووکیان بێ، لە سوورەتی (مریم)دا، بە تەفصیل باسکردووەو گێڕاوەتەوە، بۆیە لێرەدا بەو ئاماژە کورتەی کە لە ئایەتەکەدا هاتووە، وازی لێ دێنین.

## مەسەلەی نۆیەم:

**کۆمەڵی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) یەکێکە، پەروەردگاریشیان تەنیا خوایەو، پێویستە بەس ئەو بپەرستن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٩٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ ﴾، ئا ئەم کۆمەڵە کۆمەڵی ئێوەیە، (**الأُمَّةُ: الجَمَاعَةُ الَّتِي حَالُهَا وَاحِدٌ، فَأُطْلِقَتْ عَلَى مَا تَكُونُ عَلَيْهِ الجَمَاعَةُ مِن الدِّيْنِ بِقَرِيْنَةِ أَنَّ الأُمَّةَ لَيْسَتْ وَاحِدَة**)، واتە: (أُمَّةٌ) بە مانای کۆمەڵ دێ، ئەو کۆمەڵەی کە لەسەر یەک حاڵە، لێرەشدا بەکارهێندراوە بۆ ئەوەی کە کۆمەڵێک لەسەری دەبن لە ئایین و بەرنامە، بە بەڵگەی ئەوە کە ئۆممەتەکان یەک ئۆممەت نین، بەڵام من ئەو رایەم پێ ڕاست نیە و پێم وایە:

ڕای ڕاست ئەوەیە کە مەبەست لە (**أمة**) ئەو پێغەمبەرانەن (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) کە لێرەدا ناوی شازدەیان بە ناوی ئاشکرا هاتوە و، بە ئاماژەش ناوی (**عیسا**) هاتوە، ئەوە حەڤدە و، (**مریم**)یشیان خراوەتە گەڵ، ئەوە هەژدە، واتە: مەریەم وەک ئافرەتێکی زۆر پاکیزەی چاک کە لە چاکیی و پاکییدا لە ڕیزی پێغەمبەراندا بووە، خوا دەفەرموێ: ئا ئەم کۆمەڵی پێغەمبەرانە، یەک کۆمەڵە.

٢)- ﴿ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ ﴾، منیش پەروەردگارتانم، واتە: پەروەردگاری هەموو لایەکتانم.

٣)- ﴿ فَٱعۡبُدُونِ ﴾، تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن، ﴿ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ ﴾، ئەم ڕستەیە کورت هەڵێنان (**حَصْر**) دەگەیەنێ، واتە: تەنیا من پەروەردگارتانم، نەک کەسێکی دیکە، ﴿ فَٱعۡبُدُونِ ﴾، ئەمەش دیسان کورت هەڵێنان دەگەیەنێ، واتە: تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن، نەک بۆ کەسێکی دیکە، وەک گوتمان: لێرەدا ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ

وَٰحِدَةً ﴾، دەگونجێ باس باسی ڕێبازی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بێ واتە: ئا ئەم ڕێبازە کە پێغەمبەران هەموویان لەسەری بوون، یەک ڕێبازە، کە بریتیە لە خوا بە یەکگرتن و تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن، کە ئەوە ڕایەکی زانایانە.

ڕایەکی دیکە ئەوەیە کە: ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ ﴾، ئەمە هەر ئاماژەیە بۆ ئەو پێغەمبەرانەی کە باسکران، کە ئەو ڕایە پەسندترو ڕاسترە، چونکە خوا ﷻ یەکسەر دوای سەر ژمێرکردنی ئەو پێغەمبەرانە ﷺ و وەسفکردنی زۆربەشیان، کە خاوەنی خۆڕاگریی بوون و، ئەهلی عیلم و حیکمەت بوون و، ئەهلی صەلاح و چاکەکاریی بوون، دوای ئەوە دەفەرموێ: ئا ئەمانە کۆمەڵی ئێوەن، یەک کۆمەڵە، هەڵبەتە ئەو کۆمەڵەش لەسەر یەک ڕێباز کۆبوونەوە، کە تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن و خوا بەیەکگرتنە، بەڵام ئەو مانایە لەگەڵ سیاقی ئایەتەکاندا باشتر دەگونجێ لەوە کە بڵێین: (أُمَّةٌ) لێرەدا مەبەست پێی ڕێباز (طَرِيْقَة)ە، ئەگەرنا وشەی (أُمَّةٌ) لە قورئاندا بە مانای بەرنامە و ڕێبازیش هاتوە، بەڵام زیاتر بە مانای کۆمەڵە خەڵکێک هاتوە لە حاڵێکدا لەسەر بەرنامەیەک کۆببنەوە.

## مەسەلەی دەیەم و کۆتایی:

**شوێنکەوتووانی پێغەمبەران، لە دوای وان، بەرنامەکەیانیان دابڕ دابڕ کرد، ئنجا کە دەگەڕێنەوە خزمەت خوا، بڕوادارانی کردار باش، کۆششیان نادیدە ناگیرێ و، بۆیان تۆمار دەکرێ و، قەدەغەشە کە ئاوەدانییە فەوتێندراوەکان، نەگەڕێنەوە لای خوا بۆ سزادرانیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡۖ كُلٌّ إِلَيۡنَا رَٰجِعُونَ ﴿٩٣﴾ فَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَا كُفۡرَانَ لِسَعۡيِهِۦ وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ ﴿٩٤﴾ وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآ أَنَّهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ﴿٩٥﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ﴾، یەکسەر خوا ﷻ لە دوای سەرژمێری ژمارەیەکی زۆر لە پێغەمبەران کە حەڤدەن، دەفەرموێ: ﴿وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ﴾، ئنجا کاروباری خۆیانیان دابڕ دابڕ کرد، بێگومان مەبەست لە پێغەمبەران نیە، یانی: شوێنکەوتووانی پێغەمبەران، ئەوانەی لە دوای وان هاتن، هەرچەندە خوا ئامۆژگاریی کردبوون، فەرمووبووی: ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٩٢﴾﴾، ئا ئەم کۆمەڵی پێغەمبەرانە، یەک کۆمەڵەو، منیش پەروەردگارتانم و تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن، کە چی: ﴿وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ﴾، شوێنکەوتووەکانیان ئامۆژگاریی خوایان لە گوێ نەگرت و، ئایینەکەیان لە بەینی خۆیان دابڕ دابڕ کرد، وشەی (أَمْر) هەم بە مانای حاڵ (شَأْن) دێ هەم بەمانای (دين)، بەڵام لێرەدا وا پێدەچێ هەر مەبەستی ئایین بێ، واتە: دینداریی، یاخود: ئایینەکەی خۆیانیان بەش بەش کرد، بەشێکیان بەشێکی تەبەننیی کردو، بەشێکیان بە بەشێکی پەیوەست بوو، بەشەکانی دیکەیان فەرامۆش کرد، کە دەفەرموێ: ﴿وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ﴾، ڕاناوی (هم)

دەگەڕێتەوە بۆ کەسێک کە شایستەیەتی، کە ئەوانیش بریتین لە هاوبەش بۆ خوا دانەران و کافرەکان، کە لە ڕێبازی پێغەمبەران لایان داوە، یاخود: ﴿وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ﴾، واتە: ئۆممەتانی دوای پێغەمبەران، ئەو ئۆممەتانەی لە دوای پێغەمبەران هاتن، ئایینەکەی خۆیان بەش بەش کرد، (تَقَطُّع)یش لە (قَطَعَ)ەوە هاتوە، (أي تَفَرَّقُوا)، لە ئایینەکەی خۆیان دا پەرتەوازە بوون و، بەش بەشیان کرد.

لە سووڕەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍۚ إِنَّمَآ أَمۡرُهُمۡ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ١٥٩﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی کە ئایینەکەی خۆیانیان پارچە پارچە کردو تێیدا بوونە تاقم تاقم، تۆ هیچ پەیوەندییت پێیانەوە نیە، کاریان بۆ لای خوایە دوایی هەواڵیان پێدەدا بەوەی کە دەیانکرد.

لە سووڕەتی (الروم)یشدا: ﴿وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٣١ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۢ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ٣٢﴾، واتە: لە هاوبەش بۆ خوا دانەران مەبن، ئەوانەی ئایینەکەیانیان بەش بەش و پەرتەوازە کردو، تێیدا بوونە دەستە دەستە و، تاقم تاقم، هەر کۆمەڵێک، هەر تاقمێک بەوەی کە بۆ خۆی لەسەریەتی، دڵخۆشە، وەک پێشینان دەڵێن: (هەر کەسە بە یاری خۆی هەڵدەڵێ)، «کەس بە ڕبەی کەس ناپێوێ و، کەس لە مەڕی کەس ناخێوێ»، (هەر کەسە، بە دۆڵ و شیوێک دا دەڕوا)، سەلام و مەرحەبای لەگەڵ ئەوەی دیکەدا نیە، ئەمە دەردی کوشندەی شوێنکەوتووانی پێغەمبەران بووە، لە دێر زەمانەوە، دیارە لە ئۆممەتی پێغەمبەریشدا ﷺ ئەم حاڵەتە دووبارە بۆتەوە.

ئێستا هەندێک ناوی سەلەفییان لە خۆیان ناوە، خەڵکی دیکەیان هەر پێ گومڕاو سەرلێشێواوە، هەندێ خۆیان ناو ناوە ئەهلی تەریقەت و تەصەووف، پێیان وایە بەهەشت بەس بۆ ئەوان تەرخان کراوە، یەکێکی دی ناوی لە خۆی ناوە جەنگاوەر (**مجاهد**) و پێی وایە ئیسلام تەنیا لەوەدا خوڵاصە بۆتەوە کە هەمیشە سەنگەر بگرێ، یەکی دی لای شتێکی دیکەی گرتوە و، یەکی دی

لایەکی دیکەی گرتوە و، هیچ کام لەوانەش دان بەوەی دیکەدا ناهێنێ و، بەو کارەی ئەوەی دیکە دەیکات و لێک دابڕاون.

هەمیشە کاتێ ئینسان لە تێگەیشتنی دیندا بە هەڵەدا دەچێ، لە پیادەکردنی دینداریيشدا بە هەڵەدا دەچێ، ئەگەر تێگەیشتنت بۆ دین تەسک بوو، پابەندییشت بە دینەوە، بە باریکە ڕێیەکدا دەبێ، نەک بە فراوانیی، هەمیشە هەڵس وکەوتی ئینسان لە تەصەووڕیەوە سەرچاوە دەگرێ، بۆیە ئەگەر بمانەوێ مسوڵمانان کۆببنەوە و ڕێک بن، دەبێ لە جۆری تێگەیشتنیانەوە بۆ ئیسلام ڕاستیان بکەینەوە، دەبێ تەصەووڕو تێگەیشتنیان بۆ ئیسلام ڕاست بکەینەوە، لە ڕووی قوڕئان و سوننەتەوەو، لە ڕووی وەحیی ساغ و بێ خەڵتەی خواوە، لە دین تێبگەن، نەک لە ڕووی تەفسیرو بۆچوون و تێگەیشتنی زانایەک کە لە سەردەمی خۆیدا و لە کاتی خۆیدا، بە جۆرێک تێگەیشتوە، یاخود بە پێویستی زانیوە، داکۆکیی لەسەر لایەنێک بکات و، جەخت لەسەر چەند لایەنێک بکاتەوە، لە سەردەمی ئەودا پێویست بووە، ئەو بۆچوونانە لە خۆیان نەکەن بە دین، هەمیشە ئەوەی کە ئایینی پابەندکەرە بۆ مسوڵمانان، ئەوەیە کە لە قوڕئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، ئەوی دیکە هەمووی تێگەیشتنی زانایانە بۆ ئیسلام و، نابێ تێگەیشتنەکان لە خۆمان بکەینە دین.

ئنجا سبحان الله لەم ڕۆژگارەدا: کێ زیاتر باسی شوێنکەوتنی سەلەفی صاڵح و شوێنکەوتنی قوڕئان و سوننەت دەکات، بە زۆریی ئەوانە لە هەموو کەس دەمارگیرترن و، لە هەموو کەس زیاتر تەسکترو بچووکتر لە دین تێگەیشتوون و، لە ئیسلام حاڵیی بوون و، لە هەموو کەس خۆ پەسندترن و، خەڵکی دیکە بە کەمتر تەماشا دەکەن و، لە هەموو کەس زیاتر بوونە مایەی لێک ترازانی مسوڵمانان و، بەش بەش بوون و پارچە پارچە بوونیان!!

لە حاڵێکدا کە شوێنکەوتنی سەلەفی صاڵح، بە ناو لە خۆنان نیە، هەروەک صاف بوونەوەو ساغ بوونەوە، بە ناوی (صوفي) لە خۆنان نیە، هەروەک

شـوێنکەوتنی قورئـان و سـونەت، بـە بەرزکردنـەوەی شـیعار نیـە، هـەروەک خـوا بەیەکگرتـن و تەنیـا خواپەرسـتن، تەنیـا بـە ئیددیعـا نیـە، بەڵکـو هەمـوو ئـەو شـتانە دەبـێ بـە کردەوەبـن.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ کـە بـە کـردەوە و بـە ڕاسـتیی، بـە فراوانیـی و بـە قووڵیـی لـە دیـن تێدەگـەن و، بـە فراوانیـی و بـە قووڵیـی پێـوەی پابەنـد دەبـن و، دڵیشـیان بـە کاری هەمـوو مسـوڵمانان خۆشـە و، ئـەو هەقـەی کـە خۆیـان لەسـەرینی و، ئـەو هەقـەی کـە ئەوانـی دیکـەش لەسـەرییینی، هەمـوو بـە هـی خۆیـان دەزانـن، نـەک: ﴿كُلُّ حِزْبِۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ۝٥٣﴾المؤمنـون، وەک خـوا هاوبـەش دانەرەکانـی وا پێناسـە کـردوە، بەڵکـو ئینسـان دەبـێ ئـەوەی خـۆی دەیـکات و ئـەوەی کـە ئەوانـی دیکـەش دەیکـەن، دڵـی بـە هەمـووی خـۆش بـێ، مـادام هەقـەو لـە لایـەن خـواوە هاتـوە.[1]

٢)- ﴿كُلٌّ إِلَيْنَا رَٰجِعُونَ﴾، خوا دەفەرموێ: هەر کامێک لەوانە دەگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە.

٣)- ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا كُفْرَانَ لِسَعْيِهِۦ﴾، هەر کەسێک لە کردەوە باشەکان ئەنجام بدات، ئەوە نادیدە گرتن نیە بۆ کۆششەکەی، واتە: پاداشت دەدرێتەوە و نادیدە ناگیرێ.

٤)- ﴿وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئەوەی کردوویەتی بۆی تۆمار دەکەین، بۆی دەنووسین، هەرکەس کردەوە چاکەکان ئەنجام بدات بە ئیمانەوە، با دڵنیا بێ، کە کۆشش و هەوڵەکەی نادیدە ناگیرێ.

---

(١) لـە کتێبـی پێنجەمـی مەوسـووعەی: [بیرکردنـەوەی ئیسـلامیی لـە نێـوان وەحیـی و واقیـع دا] و کتێبـی دوازدەیەمـی مەوسـووعەی [بـەرەو باشـتر تێگەیشـتن و پێگەیشـتن]دا بەدرێـژی لەبـارەی چۆنیەتی تەبایـی و یەکڕیزیـی و هاوکاریـی مسـوڵمانانەوە، دواویـن.

٥)- ﴿ وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآ أَنَّهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ﴾، ئاوەدانییەک کە فەوتاندوومانە قەدەغەیە لەسەریان کە نەگەڕێنەوە، کە نەگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە، بۆ ئەوەی سزا بدرێن لەسەر ئەو تاوانانەی کە لە دنیادا، بوونە هۆکاری فەوتێندرانیان، لە دواڕۆژیشدا دەبنە هۆکاری سزادرانیان.

وشـەی (كُفـران): ﴿ فَلَا كُفۡرَانَ لِسَعۡيِهِۦ ﴾، (كُفۡرَانَ) چاوگـەو مانایەکـەی بریتیـە لـە دان نەهێنـان بەوچاکەیـەدا، کە لەگەڵ کەسێکدا دەکرێ، کـە پێچەوانەکەی بریتیـە لـە (شُكْر) و لێـرەدا بەکارهێـنراوە بـۆ بـێ بـەش بوونـی کەسێک لـە پاداشـت، پاداشـت نەدرانـەوەی لەسـەر کـردەوەی باشـی، ئەمـە بـە نسـبەت وشـەی: ﴿ فَلَا كُفۡرَانَ لِسَعۡيِهِۦ ﴾، واتـە: هـەوڵ و کۆششـەکەی نادیـدە ناگیـرێ، ژێرلێـو ناخـرێ و سـپڵەیی دەرهـەق ناکـرێ.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ ﴾، نووسـین، لێـرەدا کینایەیـە لـە هاتنـە دی و چەسـپاندنی واتـە: زایـە ناکـرێ و کـردەوە باشـەکانی بـۆ تۆمـار دەکرێـن و زایـە ناکرێـن.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرۡيَةٍ ﴾، کـە خوێندراویشـەتەوە بـە (وَحِـرْمٌ عَـلَى قَرْيَـةٍ)، دەڵـێ: (الحَـرَامُ: الـشَّيءُ المَمْنُوْع)، شـتێکی ڕێ لێگیـراو، واتـە: ڕێیـان لێگیراوە کە نەیگەڕێنـەوە بـۆ قیامـەت، بـۆ سـزاو پاداشـت، هەڵبەتـە چەنـد جـۆرە تەفسـیرێکی دیکەشـیان بـۆ کـردوون، بـۆ وێنـە:

هەندێکیـان گوتوویانـە: ﴿ وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآ أَنَّهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ﴾، واتـە: لێیـان قەدەغـە کـراوە کـە بگەڕێنـەوە، لـە ڕێبـازی غەڵـەت و پەڵـەت، مـادام بڕیـاری فەوتاندنیانمـان داوە، توانـای گەڕانەوەیـان نیـە، لـە ڕێـی چـەوت بـۆ ڕێـی ڕاسـت، بـەڵام ئـەو مانایـەی گوتمـان، زیاتـر لەگـەڵ سـیاقی ئایەتـەکان دا دەگونجـێ.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی ئێمـە لـەو کەسـانە بگێـرێ کـە بـە دوای پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام)، دەکـەون و لـە ڕاسـتە شـەقامەکەیان لانـادەن و

بەملاولادا ناخلیسکێن و بەلاڕێدا نابرێن، تاکو هەم لە دنیادا سەربەرزانە بژین، هەم لە دواڕۆژدا سەرفرازو سەربەرز بین، لە خزمەت خواو پێغەمبەرانی خوادا ﷺ.

## بەسەرهاتی شەش لە پێغەمبەرانی پایە بەرز (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)

بەڕێـــــزان !

شـەش کـەس لـە پێغەمبەرانـی خـوا، کـە تاکـو ئێسـتا بەسـەرهاتیانمان نەخسـتۆتە ڕوو، لێـرەدا باسـیان دەکەیـن، کـە هـەر کام لـە (**داود**) و (**سـلیمان**)ی کـوڕی، پاشـان (**أيـوب**) دوایـی (**ذاالكِفـل**)، ئنجـا (**اليسـع**) و (**إليـاس**)، بـاس و بەسـەرهاتی هـەر کامێکیـان بـە کورتیـی دەخەینـەڕوو:

### یەکەم: بەسەرهاتی داوود عليه السلام

لە پێنج (٥) بڕگەدا باسی داوود عليه السلام دەکەین:

### ا)- ناوو ڕەچەڵەکی:

لـە قورئانـدا نـاوی داوود تەنیا بـەو جـۆرە هاتـوە، واتـە: بـە وشـەی داوودو باسـی نـاوی بابـی نەکـراوە، بـەڵام لـە پەیمانی کۆنـدا دەڵـێ: داوود بچووکترین و هەشـتەمین کـوڕی (**يَسَّى الأفـراتيّ**) بـووە[1]، شـایانی باسـە: بەسـەرهاتی داوود لـە پەیمانـی کۆنـدا لـە لاپەڕەکانـی: (٥٩٦ - ٧٠٨)یـە دا و، سـەدو دوو (١٠٢) لاپـەڕی گرتـوە.

---

(١) التفسـير التطبيقـي للكتـاب المقـدس، العهـد القديـم، سـفر صموئيـل الأول، الإصحـاح: ج١٧، ص ٥٩٩.

## ٢)- دووبارە بوونەوەی ناوی (داوود):

داوود عليه السلام، شازدە جاران، ناوی هاتوە لە قورئاندا، لە نۆ سورەتاندا کە ئەمانەن:

١- سوورەتی (البقرة)، ئایەتی: ٢٥١.

٢- سوورەتی (النساء)، ئایەتی: ١٦٣.

٣- سوورەتی (المائدة)، ئایەتی: ٧٨.

٤- سورەتی (الأنعام) ئایەتی: ٨٤.

٥- سوورەتی (الإسراء) ئایەتی: ٥٥.

٦- سوورەتی (الأنبياء) ئایەتەکانی: ٧٨ و ٧٩.

٧- سوورەتی (النمل) ئایەتەکانی: ١٥ و ١٦.

٨- سوورەتی (سبأ)، ئایەتەکانی: ١٠ و ١٣.

٩- سوورەتی (ص) ئایەتەکانی: ١٧ و ٢٢ و ٢٤ و ٢٦ و ٣٠.

## ٣)- کورتەی ژیان و بەسەرهاتەو هەڵوێستەکانی داوود:

١- یەکەمین ناوهێنانی داوود لە قورئاندا لە بەسەرهاتی کوشتنی **(جالووت)**دایە، بەپێی ڕیزبەندیی **(مُصحف)** مەبەستمە، وەک خوا تعالى دەفەرموێ: ﴿ فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُ ﴾البقرة.

لە پەیمانی کۆندا، ناوی ئەو پێغەمبەرەی کە **(طالووت)**ی هەڵبژاردوە، بە مەلیک، بە **(صَموئیل الأوَّل)** هاتوە و، ناوی **(طالووت)**یش بە **(شاول)** هاتوە[1].

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر صموئيل الأوّل، ص٥٩٤.

هەروەها لە پەیمانی کۆن[1]دا دەڵێ: (**وَكَانَ فَتْرَةُ حُكْمُ دَاوُد أَرْبَعِينَ سَنَةً، مَلِكَ سَبْعَ سِنِينَ فِي حَبْرُونَ، وَثَلَاثَةً وَثَلَاثِينَ فِي أُورشَلِيم**)، واتە: ماوەی حوکمڕانیی داوود چل ساڵ بووە، حەوت ساڵان لە (**حبرون**) {شارێکە لە شارەکانی فەلەستین} و سی و سێ (٣٣) ساڵیش لە (**أُورشَلِيمَ**).

شایانی باسە لە پەیمانی کۆندا، درێژەی زۆر دراوە بە بەسەرهاتی داوود ﷺ باسی زۆر جەنگ و کێشەو بێشەی نێوان ئەو و (**شاول**)، یانی: (**طالوت**) کراوە، کە (**شاول**) ویستوویەتی داوود بکوژێ، ئەویش لەبەری هەڵاتووەو چەند جاران داوود زەفەری بە (**شاول**) بردوە، بەڵام نەیکوشتوە، کە (**شاول**) پادشای بەنی ئیسرائیل بووە و، (**صموئیل**) - کە بە حیساب ناوی یەکێ لە پێغەمبەرانە - ئەوی داناوە بە پادشا، بەڵام بەسەرهاتەکانی داوود لە قورئاندا ئەمانەن:

**یەکەم**: کوشتنی (**جالووت**)، واتە: داوود کە جالووتی کوشتوە: ﴿وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ﴾ البقرة: ٢٥١، لە کاتێکدا سوپای بەنی ئیسرائیل بە سەرکردایەتیی (**طالوت**) {کە لە پەیمانی کۆندا پێی دەڵێ: (**شاول**)} ڕووبەڕوو بۆتەوە لەگەڵ سوپایەک لە ئەهلی کوفر، کە لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: ئەوانە فەلەستینییەکان بوون و (**عمالقة**)شیان پێ گوتراوە، لەو کاتەدا داوود جالووت دەکوژێ، لە پەیمانی کۆندا درێژەی زۆری داوەتێ.

**دووەم**: دادوەریی کردنی لە بارەی زەڕکردنی کۆمەڵێ لە کشتوکاڵی خەڵکێکدا، کە پێشتر لە تەفسیری ئایەتەکاندا هێنامان، (**الأنبياء**): (٧٨و ٧٩).

**سێیەم**: شتێکی دیکە کە لە داوود گێڕدراوەتەوە لە قورئاندا، دروستکردنی (زرێ)یە، کە لە سوورەتی (**الأنبياء**) ئایەتی: (٨٠) و، لە سوورەتی (**سبأ**) ئایەتەکانی: (١٠و ١١)دا هاتوە، ئەوەی کە لە سوورەتی (**سبأ**)دا هاتوە، خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا ۖ يَٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعْمَلْ سَٰبِغَٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ ۖ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١﴾﴾

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، ص٧٠٨.

واتە: ئێمە بە دڵنیایی بەخششی خۆمان دابوو بە داوودو بنەماڵەکەی، چیایەکان لەگەڵی بلێنەوەو، هەروەها باڵندەکان ئێوەش و، ئاسنیشمان بۆ نەرم کرد بوو {سروشمان بۆ کرد} کە زرێیە پۆشەرەکان {کە جەستەی جەنگاوەرەکان دادەپۆشن} دروست بکەو، وردەکاریی بکە لە چنینیان دا و، کردەوە باشەکان ئەنجام بدەن، من بینەری ئەوەم کە ئەنجامی دەدەن.

**چوارەم:** شتێکی دیکە لە داوود گێڕدراوەتەوە، کە بریتیە لە وەی چیاو باڵندەکان خوایان لەگەڵ دا بە پاکگرتوە، ئەمە لە سوورەتی (**الأنبياء**) ئایەتی: (٧٨)دا، وەک پێشتر هێنامان و، لە سوورەتی (سبأ) ئایەتی: (١٠)دا و، لە سوورەتی (**ص**) ئایەتەکانی: (١٨و ١٩)دا هاتوە، کە خوا ﷻ لە هەر کام لەم سێ شوێنەدا بە شێوەیەکی نیزیک لە یەکدی، باسی ئەو موعجیزەیەی داوود دەکات، بۆ وێنە: خوا ﷻ لە ئایەتەکانی: (١٨و ١٩)ی (**ص**)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِشْرَاقِ ﴿١٨﴾ وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً ۖ كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٩﴾﴾ص، واتە: ئێمە چیایەکانمان لەگەڵیدا ملکەچ کرد بوون (دەستەمۆ کردبوون) ئێواران و دەمەو خۆرهەڵات، خوایان لەگەڵ بە پاک دەگرت، هەروەها باڵندەکانیش هەموویان بۆی کۆدەکرانەوەو، هەموویان لەگەڵیاندا دەگوتەوە {یان: لەگەڵیدا بۆ لای خوا دەگەڕانەوە}.

**پێنجەم:** کۆمەڵێک بۆ چارەسەری کێشەیەک دەچنە لای لە میحرابەکەیدا، کە لە سوورەتی (**ص**)، ئایەتەکانی: (٢٠ - ٢٦) دا، خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ﴿٢٠﴾ وَهَلْ أَتَىٰكَ نَبَؤُا۟ ٱلْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا۟ ٱلْمِحْرَابَ ﴿٢١﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ خَصْمَانِ بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَٱهْدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ هَٰذَآ أَخِى لَهُۥ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِىَ نَعْجَةٌ وَٰحِدَةٌ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِى فِى ٱلْخِطَابِ ﴿٢٣﴾ قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ۖ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ۩ ﴿٢٤﴾ فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ

﴿وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٢٥﴾ يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَـٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾﴾

واتە: ئێمە حوکمڕانیی داوودمان پتەو و مەحکەم کردبوو و، حیکمەت و قسە ڕوونیشمان پێ بەخشیبوو، (هەم لێزانیی و هەم قسە ڕوونیی) و، ئایا هەواڵی ئەو کۆمەڵە کە پێکەوە ناکۆکییان هەبوو پێت گەیشتوە؟ کاتێ بەسەر دیواری میحرابەکەدا وەسەر دیوارەکە کەوتن و، لە داوود وەژوور کەوتن، ئەویش بەهۆیانەوە ڕاچڵەکی (لێیان ترسا) پێیان گوت: مەترسێ ئێمە دوو کەسین پێکەوە ناکۆکییمان بووە، هەندێکمان ستەممان لە هەندێکمان کردوە، تۆش دادوەرییمان بە هەق لە نێواندا بکە، بەڵام لە هەق لامەدەو، دوور مەکەوەو، بەرەو ڕاستە ڕێ ڕێنماییمان بکە، {یەکێکیان گوتی:} ئەوە برامە نەوەدو نۆ مەڕی هەیەو، منیش مەڕێکم هەیە، گوتی: ئەو مەڕەی خۆشت بدە بە من و، لە قسەکردنیشدا بەسەرمدا زاڵ بوو، {واتە: منی بێ قسە کرد، کە دەبێ ئەو تاکە مەڕەی خۆم بدەم بە و، هی ئەو ببنە سەدو منیش هیچ مەڕێکم نەبێ}{یەکسەر داوود حوکمیدا} بێگومان بەوە کە داوای مەڕەکەتی کردوە بۆ گەڵ مەڕەکانی خۆی، ستەمی لێکردووی و، زۆر لەوانەی کە پێکەوە هاوبەشن، ستەم لە یەکدی دەکەن، مەگەر ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و، کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، ئەوانەش کەمن، دوایی داوود بۆی دەرکەوت کە ئێمە تاقییمان کردۆتەوە، بۆیە داوای لێبوردنی لە پەروەردگاری کردو بە ڕکووعدا چوو وگەڕایەوە بۆ لای خوا (یاخود: کڕنووشی بردو بۆ لای خوا گەڕایەوە)، ئێمەش لەوەدا {کە پەلەکردن بوو لە دادوەرییدا} لێمان بورد، بێگومان بۆ وی لە لای ئێمە هەم نزیکیی هەیە، هەم سەرەنجامی گەڕانەوەی چاک هەیە، {دوایی خوا پێی فەرموو:} ئەی داوود! ئێمە تۆمان کردوە بە جێنشین لە زەوییدا، لە نێوان خەڵکدا بە هەق دادوەریی بکە و بە دوای ئارەزوو {عاتیفەو سۆز} مەکەوە، لە ڕێی خوا

لات دەدا، بە دڵنیایی ئەوانەی لە ڕێی خوا لا دەدەن، سزایەکی سەختیان هەیە، بە هۆی ئەوەوە کە ڕۆژی لێپرسینەوەیان فەرامۆش کردوە.

هەڵبەتە ئەو بەسەرهاتە کە خوا لێرەدا بە ڕەمز هێناویەتی، بەڵام لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: {داوود نەوەدو نۆ (٩٩) هاوسەری هەبوون و، تەماعی لە هاوسەری ئۆریا کردوە، کە هاوسەرێکی جوانی هەبووە} شایانی باسیشە ئەو بەسەرهاتەی لە پەیمانی کۆندا هاتوە، کە ئەفسانەیە و لەگەڵ مسوڵمانێکی عادەتییش دا ناگونجێ، چ جای لەگەڵ پایەو مەقامی پێغەمبەرانی پایە بەرزدا! لە زۆربەی تەفسیرەکاندا ئەو بەسەرهاتە ئەفسانەییان کردوە و بە تەفسیری ئەم ئایەتانە! کە ئەم ئایەتانە ئەگەر بەبێ لەبەر چاوگرتنی ئەو حیکایەت و بەسەرهاتە ئەفسانەییەی کە لە پەیمانی کۆندا هاتوە، تەماشایان بکەین زۆر بە ڕوونیی دیارە، مەبەست پێیان چییە؟

دوو کەس دەچن بۆ لای داوود ﷵ کێشەیەکیان هەیە، دەیخەنە ڕوو کە لە سیاقی ئایەتەکان دا بۆمان دەردەکەوێ ئەو دوو کەسە فریشتە بوون، چونکە داوود، پێغەمبەریش بووە و پادشاش بووە، ئنجا ئایا دوو کەس چۆن دەتوانن داوود ئەو هەموو پاسەوانەی هەبن، یەکسەر لە ژووره تایبەتەکەی خۆی دا کە خوا پەرستیی تێدا کردوە، لێی وەژوور بکەون، ئەویش لە ترسان ڕابچڵەکێ؟ ئنجا ئەوانیش ئەو کێشەیە کە زۆر ورووژێنەرە، بیخەنە ڕوو: یەکێکیان دەڵێ: ئەوە برامە نەوەدو نۆ مەڕی هەیە و منیش مەڕێکم هەیە گوتی: مەڕەکەی خۆتم بدەیە و، بەسەریشمدا زاڵ بووە لە قساندا، قەزیەیەکی زۆر ورووژێنەریان خستۆتە ڕوو، کە ئەوە تاقیکردنەوەی خوا بووە بۆ داوود، چونکە داوود پادشا بووەو دەبووایە دادوەرییش بکات بە هەق، کەچی داوود لێرەدا هەڵچووە و، بێ ئەوەی گوێ لە قسەی داوا لەسەر کراو (**مُدَّعى عليه**)ەکە، بگرێ یەکسەر بەپێی قسەی داواکەر (**مُدَّعي**) حوکمی داوە بەسەر داوا لەسەرکراو (**مُدَّعى عليه**) دا، لە تەفسیرەکان دا دەڵێ: دوایی ئەو دوو فریشتەیە تەماشای یەکدییان کردو

پێکەنین، دواییش خوا دەفەرموێ: (ئەی داوودا ئێمە تۆمان کردوە بە جێنشین لە زەوییدا، کە لە نێوان خەڵکدا بە هەق دادوەریی بکە و، دوای ئارەزوو مەکەوە)، واتە: بە دوای عاتیفەو قسەی وروووژێنەر مەکەوە، ئەگەرنا لە ڕێی خوا لات دەدات.

مەسەلەکە هەر ئەوەیە کە ئەوانە کێشەیەکیان بۆ داوود خستۆتە ڕوو، زۆر وروووژێنەر بووە و، سەرەنجام داوود لەو تاقیکردنەوەی خوای پەروەردگار دەرنەچووە، هەر بۆیەش دوایی داوای لێبوردنی لە خوای لێبوردە کردوەو پەشێمان بۆتەوە،

ئیدی هیچ پەیوەندیی بە نەوەدو نۆ (٩٩) ژن و، تەماع لە ژنی خەڵک کردن و ... هتدەوە نیە.

ئنجا لە ڕاستییدا ئەوە لەگەڵ مسوڵمانێکی سادەو ئاساییشدا، ناگونجێ، چ جای لەگەڵ پایەو مەقامی پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، بەڵام بە داخەوە جوولەکەکان زۆر شتی لەوەش ناشیرنتریان داوەتە پاڵ پێغەمبەران، لە پەیمانی کۆندا، بەڵکو لە پەیمانی نوێشدا، کە من لە مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلى فِي كتاب الله**) لەو بەرگەدا کە بەرگی شەشەمە و، بۆ باسی پێغەمبەران تەرخانم کردوە، هەروەها لە بەرگی پێنج دا، کە بۆ دیراسەکردنی کتێبەکانی خوا تەرخانم کردوە، لە هەردووك لەو کتێبەکەدا، بە درێژیی لەو بارەوە قسەم کردوە و، ئەو تۆمەتانەی دراونە پاڵ پێغەمبەران، لە پەیمانی کۆن و نوێدا، بەرپەرچمداونەوە.

**شەشەم:** شتێکی دیکە کە لە بارەی داوودەوە، لە قورئانی بەڕێزدا هاتوە، ئەوەیە کە خوا (زەبوور)ی بە داوود داوە:

١- لە سووڕەتی (النساء)، ئایەتی: (٦٣)دا، هاتوە: ﴿وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾﴾.

٢- هەروەها لە سوورەتی (**الإسراء**)، ئایەتی: (٥٥)دا، هاتوە: ﴿وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾﴾.

بەڵام لە پەیمانی کۆن دا لەبارەی کتێبەکەی داوودەوە، ناڵێ زەبوور بەڵکو دەڵێ: (**المزامیر**)، کە بە پێی پەیمانی کۆن لە ئەو مەزموورانەی بە داوود دراون، سەدو پەنجا (١٥٠) دانە بوون و، لە پەیمانی کۆندا[1]، سیفرێکی تایبەت بە (**المزامیر**) هەیە، کە لە لاپەڕە: (١١٣٣ تاکو ١٢٧٨)ی بۆ تەرخان کراوە، یانی: ١٢٧٨-١١٣٣=١٤٥، لاپەڕە.

**حەوتەم:** هەر لە قورئاندا لە بارەی داوودەوە، حەوتەمین شت ئەوەیە کە خوا ڕایگەیاندوە سولەیمانی بە داوود داوە، سولەیمان کوڕی داوود بووە، وەک لە سوورەتی (**ص**)دا دەفەرمویٚ:

﴿وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ ۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾﴾، واتە: سولەیمانمان بە داوود بەخشی، باشترین بەندە بوو، زۆر بۆ لای خوا دەگەڕایەوە.

**هەشتەم:** ئەوەی کە لە سوننەتدا لە بارەی داوودەوە، هاتوە دەتوانین ئەو دوو فەرموودەیە بێنین:

**١- کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {أَحَبُّ الصَّلاَةِ إِلَى اللهِ صَلاَةُ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ، وَأَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللهِ صِيَامُ دَاوُدَ، وَكَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ وَيَقُومُ ثُلُثَهُ وَيَنَامُ سُدُسَهُ، وَيَصُومُ يَوْمًا، وَيُفْطِرُ يَوْمًا } (أخرجه: البخاري: ٣٤٢٠، ومسلم: ١١٩٥، عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ).**

واتە: خۆشەویسترین نوێژ لە لای خوا، نوێژ کردنی داوود بووە و، خۆشەویسترین ڕۆژوو گرتن لە لای خوا، ڕۆژوو گرتنی داوود بووە، (نوێژکردنەکەی باس دەکات، دەفەرموێ:) نیوەی شەوگار دەخەوت و، یەک لەسەر سێی هەڵدەستا {بۆ شەو نوێژ و خوا پەرستیی و} دواییش یەک لەسەر شەشی شەو کە دەمایەوە، دەخەوت و، ڕۆژێک بەڕۆژوو دەبوو، ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نەدەبوو.

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر المزامير، ص١١٣٣ – ١٢٧٨.

٢- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَمِعَ صَوْتَ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ وَهُوَ يَقْرَأُ، فَقَالَ: لَقَدْ أُوتِيَ أَبَو مُوسَى مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ} (أخرجه أحمد: ٢٥٣٨٢، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، أصله في الصحيحين).

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازیبێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە دەنگی ئەبوو مووسای ئەشعەریی بوو، قورئانی دەخوێند فەرمووی: ئەبوو مووسا لە ئاوازەکان و دەنگ خۆشیی داوودی پێدراوە.

داوود یەکێ لە موعجیزەکانی ئەوە بووە کە دەنگێکی زۆر زۆر خۆشی هەبووە.

## ٤)- موعجیزەکانی (داوود):

١- یەکێ لە موعجیزەکانی داوود ئەوە بووە کە چیایەکان و باڵندەکان لەگەڵیدا خوایان عز وجل بە پاک گرتوە، کاتێ داوود تەسبیحاتی کردوە و، ڕازو نیازو موناجاتی لە خزمەت خوادا کردوە، هەم چیایەکان و هەم باڵندەکانیش لەگەڵیان دا گوتۆتەوە.

کە پێشتر لەو بارەوە قسەمان کردو، پێویست ناکات زیاتر لەسەری بدوێین.

٢- موعجیزەیەکی دیکەی ئەوە بووە کە ئاسنی بۆ نەرم بووە، هەروەک خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ١٠﴾سبأ، ئنجا ئەو ئاسن بۆ نەرم بوونە، ئەگەر ئاسن بۆ نەرم بوونی ئاسایی بووایە، وەک چۆن خەڵک ئاسن دەخاتە نێو کوورەوە و بە مووشەدە کوورەکە فوو لێ دەکات، دوایی ئاگرەکەی بەهێز دەبێ و ئاسنەکە نەرم دەکات، ئەگەر وا بووایە، خوا وەک موعجیزەیەک باسی نەدەکرد، بەڵکو بە شێوەیەکی یاسادڕ (خارق العادة)، ئاسن بۆ داوود نەرم بووە و بە کەیفی خۆی شتی لێ دروست کردوە.

٣- موعجیزەیەکی دیکەی ئەوە بووە کە خوا فێری دروستکردنی زرێی کردوە، وەک دەفەرموێ: ﴿وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ ۖ فَهَلْ أَنتُمْ

﴿شَٰكِرُونَ ٨٠﴾الأنبياء، واتە: فێری دروستکردنی پۆشاکێکمان کرد بۆتان، تاکو لە سەختیی جەنگدا بتانپارێزێ، ئایا ئێوە سوپاسگوزار نابن!

لە سوورەتی (سبأ)یشدا دەفەرمووێ: ﴿أَنِ ٱعْمَلْ سَٰبِغَٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ ١١﴾، واتە: تۆ زرێ پۆشەرەکان دروست بکە و، لە ئاڵقەکاندا وردەکاریی بکە بە ئەندازەگیریی، کەواتە: وەک زۆرێک لە زانایان ڕایان وایە، یەکەمین کەسێک زرێی بە ئاڵقەی دروست کردوە (بە ئاڵقەچن) داوود ﷷ بووە، پێشتر بە جۆرێکی دیکە بووە، پارچە ئاسن بوون و، لێکیان داون، بەڵام ئەوەی داوود بە ئاڵقە بووە و وەک پۆشاکێک کراوەتە بەرو، ئاسانتر جەستە تێیدا جووڵەی کردوە.

٤- موعجیزەیەکی دیکەی داوود بریتی بووە لەوە کە خوای بەخشەر زەبووری پێداوە: ﴿وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ٥٥﴾الإسراء، زەبووریش، کتێبێک بووە بە داوود دراوە، ئنجا ئایا ئەوەی کە لە پەیمانی کۆن دا ماوە، کە سەدو پەنجا مەزموورە، چەندی ڕاستەو چەندی ڕاست نیە، کە ئەوەی لەوێشدا هاتوە، بە زۆریی ڕازو نیازو موناجاتە لەگەڵ خوادا؟ ئەوەیان لێی دڵنیا نین، چەندی هی زەبوورەکەی داوودە، چەندیش هی ئەو نیە؟

٥- موعجیزەی پێنجەمی بریتی بووە لە دەنگی خۆش، وەک لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، ئەو ئایەتانەش کە باسی تەسبیحات کردنی چیایەکان و باڵندەکان دەکەن لە خزمەت داووددا، هەر ئاماژە دەکەن بەوە دەبێ داوود دەنگێکی یەکجار زوڵاڵ و خۆش و بە جۆشی هەبووبێ، کە دەنگێکی نا ئاسایی بووە، بۆیە چیایەکان و باڵندەکان لەگەڵیان گوتۆتەوە.

## ٥- تەمەن و مردنی (داوود):

سەرەتا ئەوە دێنین: ئەو بەسەرهاتەی ئادەم ﷷ کە (**أحمد والترمذي**) لە (**إبن عباس**)ەوە، هەروەها (**أحمد**) لە (**إبن عباس**)ەوەو، (**الترمذي**) لە (**أبو هريرة**)ەوە، هەروەها (**إبن خزيمة**)و (**إبن حبان**)یش هێناویانە و، (**حاكم**)یش گوتوویەتی: (**صحيح**

**على شرط مسلم**)، ئەویش ئەوەیە کە خوا ﷻ وەچەی ئادەم، پێشانی ئادەم دەدات، ئادەم گەنجێکیان تێدا دەبینێ زۆر جوانە، ئەویش لە خوای پەروەردگار دەپرسێ: ئەوە کێیە؟ دەفەرموێ: داوودە، ئادەم دەپرسێ: چەند ساڵ تەمەنت بۆ داناوە؟ دەفەرموێ: سەد ساڵ، ئادەم، دەڵێ: چل ساڵ لە تەمەنی من بخە سەر تەمەنی وی، بەڵام کاتێ کە فریشتەی مەرگ (**ملك الموت**) دێ، گیانی ئادەم بکێشێ، ئادەم لەو بەڵێنەی پەشێمان دەبێتەوە. کەواتە: دەبێ تەمەنی داوود، سەد (١٠٠) ساڵ بووبێ[1]، بەڵام خاوەن کتێبەکان، دەڵێن: تەمەنی داوود، حەفتاو حەوت (٧٧) ساڵ بووە و ئەو قسەیەی خاوەن کتێبەکانیش لەگەڵ دەقێک دا کە لە ژیانی داووددا هاتووە[2]، ناگونجێ کە دەڵێ:

(**وَشَاخَ الْمَلِكُ دَاوُدُ وَطَعَنَ فِي السِّنِّ، فَكَانُوا يُدَثِّرُونَهُ بِالأَغْطِيَةِ فَلاَ يَشْعُرُ بِالدِّفْءِ**)، واتە: داوودی پادشا پیر بووو، کەوتە نێو تەمەنەوە، بە پۆشاکان دایان دەپۆشی (بە لێفەو بەتانی)، بەڵام هەستی بە گەرمیی نەدەکرد، واتە: زۆر کەوتبووە تەمەنەوە، ئنجا ئەگەر زۆر کەوتبێتە تەمەنەوە، نابێ تەمەنی حەفتاو حەوت ساڵ، بوو بێ.

دکتۆر (**شوقي أبو خليل**) لە کتێبی (**أطلس القرآن**)دا[3]، دەڵێ: (**توفي (٩٦٣) قبل الميلاد**) واتە: داوود لە ساڵی (٩٦٣) پێش زایین دا، واتە: پێش ئەوەی عیسا لە دایک بوو بێ، کۆچی دوایی کردوە.

ئەمە کورتەی بەسەرهاتی داوود بوو.

---

(١) قصص الأنبياء، لابن كثير، ص٤٣٠.

(٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، ص ٧٠١.

(٣) ص ٨٩.

## دووەم: بەسەرهاتی سولەیمان

ژیان و بەسەرهاتی سولەیمانیش لە پێنج (٥) بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

### ١)- ناو و ڕەچەڵەکی:

سولەیمان کوڕی داوودە، وەک لە سوورەتی (ص)دا، خوای زانا وتوانا دەفەرموێ: ﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ ۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ ﴾، واتە: سولەیمانیشمان بە داوود بەخشی، باشترین بەندە بوو، بەڕاستیی زۆر گەڕاوە بوو (بۆ لای خوا) کەواتە: سولەیمان کوڕی داوود بووە، سەلامی خوایان لێبێ، لە پەیمانی کۆنیش دا، ئەوە زۆر بە ڕوونیی باسکراوە.

### ٢)- ژمارەی دووبارە بوونەوەی ناوی سولەیمان لە قورئاندا:

سولەیمان لە قورئاندا، حەڤدە (١٧) جاران، ناوی هاتوە، جارێک زیاتر لە بابی (داوود) ئەویش بەم شێوەیە و، لە حەوت (٧) سوورەتاندا ناوی هاتوە:

١- لە سوورەتی (البقرة)دا، ئایەتی: (١٠٢) دوو جاران ناوی هاتوە.

٢- لە سوورەتی (النساء)دا، لە ئایەتی: (١٦٣)دا.

٣- لە سوورەتی (الأنعام)دا، لە ئایەتی:(٨٤)دا.

٤- لە سوورەتی (الأنبیاء)دا، لە ئایەتەکانی: (٧٨ و ٧٩ و ٨١)دا.

٥- لە سوورەتی (النمل)دا، لە ئایەتەکانی: (١٥ و ١٦ و ١٧ و ١٨ و ٣٠ و ٣٦ و ٤١)دا.

٦- لە سوورەتی (سبأ)دا، لە ئایەتی: (١٢)دا.

٧- لە سووڕەتی (ص)دا، لە ئایەتەکانی: (٣٠و ٣٤)دا.

هەمووی دەکاتە حەڤدە (١٧) جار.

## ٣)- کورتەی ژیان و بەسەرهاتی سولەیمان:

سەرەتا دەبێ ئەوە بڵێین کە لە پەیمانی کۆندا: (**التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم**)، سیفرێک دیاریکراوە بە ناوی: (**أمثال سُليمان**) کە لە لاپەڕە: (١٢٨٣ تاکو ١٣٤٠)، سی پەندو حیکمەتی گرتۆتە خۆی و، ژیان و بەسەرهاتی سولەیمانیش، بە درێژیی لە پەیمانی کۆندا هاتوە، بەڵام لە قورئاندا، دەتوانین بڵێین: لە پێنج شوێنان دا، زیاتر بەسەرهاتی سولەیمان باسکراوە، بەم شێوەیەی خوارێ:

١- لە سووڕەتی (ص)دا، ئایەتەکانی: (٣٠ - ٤٠)، واتە: یازدە ئایەت.

٢- لە سووڕەتی (الأنبياء)دا، ئایەتەکانی: (٧٨و ٧٩) و (٨١و ٨٢)، چوار ئایەت.

٣- بەسەرهاتی سەرەکیی سولەیمان لە سووڕەتی (النمل)دا، ئایەتەکانی: (١٥ - ٤٤)دا، هاتوە، بیست و نۆ (٢٩) ئایەت، کە ئەوە شوێنی سەرەکیی بەسەرهاتی سولەیمانە.

٤- لە سووڕەتی (سبأ)دا، ئایەتەکانی: (١٢و ١٣و ١٤) و، باسی مردنیشی دەکات.

٥- لە سووڕەتی (البقرة)دا، لە ئایەتی: (١٠٢)دا، کە باسی جادوو دەکات، لە سەردەمی سولەیماندا و، ئێمە کاتی خۆی ئەو ئایەتەمان تەفسیر کردوە.

ئنجا ئێمە درێژەی تەفسیری ئایەتەکان هەڵدەگرین بۆ شوێنی خۆیان و، ئەو یازدە ئایەتەی سووڕەتی (**ص**)، لێرەدا تەفسیر دەکەین، بەڵام ئایەتەکانی سووڕەتی (**النمل**) و سووڕەتی (**سبأ**) هەڵدەگرین بۆ کاتی تەفسیرکردنی ئەو دوو سووڕەتە، بەڵام لە سووڕەتی (**ص**)دا، خوا ﷻ کە باسی بەسەرهاتی سولەیمان دەکات، لەو یازدە ئایەتەدا، تیشکێکی باش دەخەنە سەر بەسەرهاتەکەی، خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُدَ سُلَيْمَانَ نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِالْعَشِيِّ الصَّافِنَاتُ الْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّي أَحْبَبْتُ حُبَّ الْخَيْرِ عَنْ ذِكْرِ رَبِّي حَتَّى تَوَارَتْ بِالْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَيَّ فَطَفِقَ مَسْحًا بِالسُّوقِ وَالْأَعْنَاقِ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَانَ وَأَلْقَيْنَا عَلَى كُرْسِيِّهِ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ ﴿٣٤﴾ قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ ﴿٣٥﴾ فَسَخَّرْنَا لَهُ الرِّيحَ تَجْرِي بِأَمْرِهِ رُخَاءً حَيْثُ أَصَابَ ﴿٣٦﴾ وَالشَّيَاطِينَ كُلَّ بَنَّاءٍ وَغَوَّاصٍ ﴿٣٧﴾ وَآخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ ﴿٣٨﴾ هَذَا عَطَاؤُنَا فَامْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُ عِنْدَنَا لَزُلْفَى وَحُسْنَ مَآبٍ ﴿٤٠﴾ ﴾.

ئەم یازدە ئایەتە، لە هەموو ئایەتەکانی قورئان زیاتر باسی بەسەرهاتی سولەیمان و ئەو نیعمەتانەی کە خوا پێی داون و، ئەو موعجیزانەی کە پێی داون، دەکەن و، تیشک دەخەنە سەر چەند لایەک لە بەسەرهاتی سولەیمان، ماناکەیان بە کورتیی ئاوایە:

(سولەیمانمان بە داوود دابوو، باشترین بەندە بوو، زۆر بۆ لای خوا دەگەڕایەوە. یاد بکەوە لە کاتێکدا کە دەمەو ئێوارە، ئەسپە چاکەکانی {کە سمێکیان بەرز دەکردەوە و لەسەر سێ سم ڕادەوەستان، کە ئەوانەی شارەزای ئەسپن، دەڵێن: ئەوە جۆرە وڵاخە بەرزەیەکی ڕەسەنە} بەسەردا ڕانوێندران. ئەویش گوتی: من خۆشویستنی خێرو چاکەم هەڵبژارد بەسەر یادی پەروەرگارمدا، تاکو خۆر ئاوا بوو، لە پەردەگیرا {وا پێدەچێ بەهۆی ئەوەوە کە تەماشای ئەسپەکانی کردوە، نوێژەکەی چووبێ} ئەسپەکان بۆ لام بگێڕنەوە، ئنجا دەستی بەلاقیان و بە ملیان دا دەهێنان {داخۆ هیچ نەخۆشییەکیان نیە، هەروا خەریکیان بوو سەرپەرشتیی دەکردن}[1].

---

(١) ئەمە دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ کە سولەیمان زۆر مشووری لەو ئەسپانە خواردوە کە بۆ جەنگ و جیهاد بەکاری هێناون و، هەندێکیش دەڵێن: مەبەست ئەوەیە لە سزای ئەوەی نوێژی چووە، بەهۆی تەماشاکردنی ئەسپەکان و مشوور لێ خواردنیانەوە، گوتوویەتی: هەموو ئەو ئەسپانە دەکەمە (صَدَقَة)، ئیدی هەموویانی پەیکردوەو سەری بریون، گۆشتی وڵاخە بەرزەش دەخورێ لە شەریعەتی ئێمەش دا.

بەدڵنیایی ئێمە سولەیمانمان تاقیکردەوەو، جەستەیەکمان خستە سەر کورسییەکەی، دوایی گەڕایەوە بۆ لای خوا[١]، گوتی: پەروەردگارم! لێم ببوورە و، موڵک و حکومڕانییەکم پێ ببەخشە کە لە دوای من بە کەڵکی کەس نەیەت، {بۆ کەس نەگونجێ} بێگومان هەر تۆی بەخششەر، ئێمەش (با)مان بۆ ملکەچکرد، بە فەرمانی ئەو دەڕۆیی زۆر بە نەرمیی بۆ هەر شوێنێ ویستبای، هەروەها شەیتانەکانیشمان بۆ دەستەمۆو ملکەچکردن، بیناشیان بۆ دروستدەکردو، بۆیشی دەچوونە نێو دەریا {تاکو گەوهەرو مرواریی بۆ دەربێنن}و، هەندێکی دیکەش لە شەیتانەکان لە زنجیرو کەلەپچاندا بوون (پێکەوە کەلەپچەی کردبوون)، ئەوە بەخششی ئێمەیە، ببەخشە لێی، یاخود مەبەخشە، بێ ئەوەی حیسابت لەگەڵدا بکەین[٢]، بە دڵنیایی لە لای ئێمە بۆ وی نیزیکیی و سەرەنجامی چاک هەیە.

ئەمانەش مەدحی گەورە گەورەن بۆ سولەیمان ﷺ.

شوێنێکی دیکە کە بە پێویستی دەزانم بە خێرایی ئایەتەکان تەفسیر بکەم، کە زۆر تیشک دەخەنە سەر کەسایەتیی سولەیمان ﷺ و، چۆنیەتی مردنیشی، ئەو سێ ئایەتەی سوورەتی (سبأ)ن، کە خوا دەفەرموێ:

﴿ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ۖ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ۖ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَٰتٍ ۚ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ

---

(١) ئایا ئەو جەستەیە چی بووە و چۆن بووە؟ لەوەشدا دیسان زانایان زۆر قسەیان کردوە، گرنگ ئەوەیە خوا سولەیمانی تاقیکردوەتەوە و بە تاقیکردنەوەیەک، بەڵام سولەیمان دوای ئەو تاقیکردنەوەیە گەڕاوەتەوە بۆ لای خوا، کە دوایی لە تەفسیرکردنی سوورەتی (ص)دا، درێژەکەی دەخەینە ڕوو.

(٢) زۆرمان پێدابوو، پێویستیی بەوە نەدەکرد ئەوەی دەیبەخشێ بیژمێرێ، یاخود ئەوەی نایبەخشێ بیژمێرێ.

﴿ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ١٣ فَلَمَّا قَضَيۡنَا عَلَيۡهِ ٱلۡمَوۡتَ مَا دَلَّهُمۡ عَلَىٰ مَوۡتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلۡأَرۡضِ تَأۡكُلُ مِنسَأَتَهُۥۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلۡجِنُّ أَن لَّوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٱلۡغَيۡبَ مَا لَبِثُواْ فِي ٱلۡعَذَابِ ٱلۡمُهِينِ ١٤ ﴾ سبأ: ١٤

﴿ وَلِسُلَيۡمَٰنَ ٱلرِّيحَ ﴾، واتە: (با)مان بۆ سولەیمان دەستەمۆو ملکەچ کردبوو، ﴿ غُدُوُّهَا شَهۡرٞ وَرَوَاحُهَا شَهۡرٞۖ ﴾، ڕۆیشتنی بەیانیانی مانگە ڕێیەک بوو و، ڕۆیشتنی ئێوارانیشی مانگە ڕێیەک[1]، ﴿ وَأَسَلۡنَا لَهُۥ عَيۡنَ ٱلۡقِطۡرِۖ ﴾، ئێمە کانیاوی مسیشمان بۆ دەرقوڵاندبوو {بۆ ئەوەی شتی لێ دروست بکات} ﴿ وَمِنَ ٱلۡجِنِّ مَن يَعۡمَلُ بَيۡنَ يَدَيۡهِ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ ﴾، لە جندیش هەبوون کەسانێک کە بە فەرمانی پەروەردگاری لەبەر دەستی دا کاریان بۆ دەکرد، ﴿ وَمَن يَزِغۡ مِنۡهُمۡ عَنۡ أَمۡرِنَا نُذِقۡهُ مِنۡ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴾، هەر کامێک لەوان لە فەرمانی ئێمە لایدابایە، لە سزای کڵپەداری دۆزەخ، پێمان دەچێژت، ﴿ يَعۡمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٖ كَٱلۡجَوَابِ وَقُدُورٖ رَّاسِيَٰتٍۚ ﴾، هەرچی ویستبای بۆیان دروست دەکرد، لە میحرابەکان و پەیکەرەکان و مەنجەڵەکانی وەک حەوزان و[2]، ﴿ وَقُدُورٖ رَّاسِيَٰتٍۚ ﴾، مەنجەڵە چەسپاوەکان کە نەدەگوازرانەوە، {چێشتی هەزاران کەسیان تێدا کوڵێنراوە و زۆر گەورە بوون} ﴿ ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ ﴾، ئەی بنەماڵەی داوود! سوپاسگوزاریی ئەنجام بدەن، ﴿ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴾، کەمێک لە بەندەکانیشم سوپاسگوزارن.

﴿ فَلَمَّا قَضَيۡنَا عَلَيۡهِ ٱلۡمَوۡتَ مَا دَلَّهُمۡ عَلَىٰ مَوۡتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلۡأَرۡضِ تَأۡكُلُ مِنسَأَتَهُۥۖ ﴾، ئنجا کاتێک مردنمان لەسەر بڕیاردا، هیچ شتێک خەڵکەکەی لە مردنی سولەیمان

---

(١) یانی: پێش نیوەڕۆیان یەک مانگە ڕێی دەبڕی لە بەیانیەوە تاکو نیوەڕۆ و، ئێوارانیش لە نیوەڕۆوە تاکو ئێوارەش مانگەڕێیەکی دەبڕی، واتە: بە ڕۆیشتنی ئاسایی ئەو بایە، واتە: بە ڕۆژێک، ڕێی دوو مانگ ڕێ چوون و هاتنی دەبڕی.

(٢) (محاریب) کۆی (محراب)ە، (مِیْحرَاب) واتە: ژوور، یاخود شوێنێکی تایبەت بووە، خواپەرستییان تێدا دەکرد، (تماثیل) کۆی (تِمْثَالْ) واتە: پەیکەر، (جِفَان)یش کۆی (جَفْنَة)یە، واتە: قاپێک وەک مەنجەڵی گەورە، بە قەدەر حەوزێک دەبوون.

ئاگادار نەکردەوە مەگەر، خۆرکە، مۆرانە[1]، ﴿ تَأۡكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ﴾، لە گۆچانەکەی دەداو دەیخوارد[2]، ﴿ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلۡجِنُّ أَن لَّوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٱلۡغَيۡبَ مَا لَبِثُواْ فِي ٱلۡعَذَابِ ٱلۡمُهِينِ ١٤ ﴾سبأ، پاش ئەوە سولەیمان کەوت {چونکە گۆچانەکەی بۆش بوو و شکا} جینن بۆیان دەرکەوت: ئەگەر پەنهانیان زانیبایە، لەو سزا ڕیسواکەرەدا نەدەمانەوە {سۆغرەو بێگارێک کە سولەیمان لەسەری فەرز کردبوون} چونکە تەنیا هەتا سولەیمان ماوە، مولزەم بوون بەوەی ئەو کارو سۆغرەو بێگارە بکەن، دەبێ چەند ڕۆژێک، یاخود چەند هەفتەیەک دوای ئەوە سولەیمان وەفاتی کردوە، ئنجا پێیان زانیوە،کە گۆچانەکەی سولەیمان خۆرکەو مۆرانە لێی داوەو کەوتوە، ئنجا جند بۆیان دەرکەوتوە کە مردوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەو کاتە جند ئیددیعای ئەوەیان کردوە کە پەنهان (غیب) دەزانن و، ئەوەش بەڵگە بووە لەسەر ئەوەی نایزانن و، ئەگەر زانیبایان، دەبووایە زانیبایان سولەیمان وەفاتی کردوە، نەوەک هەتا نەکەوتبایە، بۆیان دەرنەکەوتبایە.

## (با)یەکەی سەلەیمان:

دەربارەی ئەو بایەی کە بۆ سولەیمان ڕام کراوە و پێشتریش باسمان کرد، زانایان زۆر شتیان لەو بارەوە باسکردوە، بەڵام ئەوەی کە لە ڕواڵەتی ئایەتەکان وەردەگیرێ، ئەوەیە کە خوای بەرزمەزن، بای بۆ سولەیمان دەستەمۆو ملکەچ کردوە و، کاتێ ویستبێتی: بە نەرمیی ڕۆیشتوە، وەک ئەو ئایەتە ئاماژەی پێدەکات: ﴿ رُخَآءً حَيۡثُ أَصَابَ ٣٦ ﴾ص، (رُخَآءً)، واتە: بە نەرمیی بۆ هەر شوێنێک

---

(١) بە عەرەبیی پێی دەڵێن (أرَضَة)، ئەوەی لە دارو تەختە دەداو دەیخوات، کلۆری دەکات.

(٢) دوای ئەوەی مۆرانە لە گۆچانەکەی داوەو بۆش بووە، ئەویش کاتێ سولەیمان عليه السلام خۆی داوەتە سەر گۆچانەکەی، ئیدی نەیانزانیوە مردوە، یان نا، پادشا بووە، کەس بە لای دا نەچووە، تاکو کاتێ گۆچانەکەی کە مۆرانە لێی داوەو لە نێوەوە خواردوویەتی و شکاوە و، سولەیمان کەوتوە.

ویستبای، هەروەها کاتێ بە پێویستیی زانیبایە، بایەکە بە توندیی هەڵیدەکرد، وەک دەفەرمویٚ: ﴿وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً...﴾ (٨١) الأنبیاء، بۆ سولەیمان بایەکی بەهێز هەڵیدەکرد.

گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ لە سوڕەتی (سبأ)دا بۆمان دەردەخات، دەفەرمویٚ: ﴿غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ﴾، پێش نیوەڕۆیان مانگەڕێیەکی دەبڕی و، دوای نیوەڕۆیانیش مانگەڕێیەکی دەبڕی، ئنجا ئایا ئەو بایە چۆن چۆنی سولەیمان لێی بەهرەمەند بووە؟

هەندێک دەڵێن: کەشتییەکانی لە دەریادا بۆ پاڵداون و، هەندێک گوتوویانە: ئەو (با)یە بە دڵی ئەو، هەڵیکردوە.

بەڵام زۆربەیان دەڵێن: سولەیمان عليه السلام تەختێک یان فەڕشێکی گەورەی هەبووە، خۆی و ئەو سوپایەی بە پێویستیی زانیوە بچێ بۆ فلان شوێن، هەمووی چۆتە سەر ئەو فەڕشە یان سەر ئەو تەختە و، با هەڵیگرتوەو بردوویەتی، بەرەو ئەو شوێنەی کە بۆی دەچێ، وەک ئایەتەکە دەفەرمویٚ: کە پێش نیوەڕۆیەک، ڕێی مانگەڕێیەکی بۆ بڕیوە و، دوای نیوەڕۆیەکیش ڕێی مانگەڕێیەک، واتە: بە ڕۆژێک ڕێی دوو مانگەڕێی بڕیون، پێش نیوەڕۆیان مانگێک و دوای نیوەڕۆیان مانگێک، لەو بارەوە لە زۆربەی تەفسیرەکاندا ئەوە هاتوە، بۆ نموونە: لە تەفسیری (المنير) دا، دەڵێ: **(رُوي أن كان له بساط من خشب، يوضع عليه كلُّ ما يحتاجه من أمور المملكة، كالخيل والجمال والخيام والجند، ثم يأمر الريح أن تحمله، فتدخل تحته، ثم تحلمه و ترفعه، وتسير به وتُظِلُّه الطيرُ، لِتَقِيَهُ الحرَّ إلى حيث يشاء من الأرض)**[1].

واتە: گێڕدراوەتەوە کە ڕاخراوێکی هەبووە لە تەختە، هەرچی کە پێویستی پێبووە لە کاروباری حوکمڕانیی خۆی، لە ئەسپ و وڵاخەبەرزەو حوشترو چادرو سەرباز، ئەوانە هەموویان لەسەر ئەو تەختە دانراون، دوایی فەرمانی کردوە بە

---

(١) التفسير المنير: ج١٧، ص١١٠.

با، (با)ش چووەتە ژێری و هەڵیگرتوە، دوایی بەرزی کردۆتەوەو ڕۆیاندوویەتی و، باڵندەش سێبەریان لێکردوە بۆ ئەوەی لە تینی گەرما بیپارێزن و، بەرەو هەر شوێنێک لەسەر زەمین ویستوویەتی، ڕۆیشتوە.

لە پەیمانی کۆندا باسی ئەوە نەکراوە، بەڵام خوای پەروەردگار لە قورئانی بەپێزدا فەرموویەتی و، گەلێ شتی دیکەش، خوا لە قورئاندا فەرمووني، لە پەیمانی کۆندا نەهاتوون، گەلێ شتیش خوا نەیفەرموە و، لە پەیمانی کۆندا هاتوە، ئنجا ئێمەش دڵنیاین کە قورئان وشەیەکی لێ کەم و زیاد نەکراوەو کتێبەکانی دیکەش گۆڕراون و دەستکاریی کراون.

## ماوەی حوکمڕانیی و سەرەنجامی سولەیمان لە پەیمانی کۆن دا :

شایانی باسە لە پەیمانی کۆن دا باسکراوە: ماوەی حوکمڕانیی سولەیمان، چل (٤٠) ساڵ بووە، کە باسی ژیان و بەسەرهاتی سولەیمان دەکات و سی (٣٠) لاپەڕی بۆ تەرخان کراوە، ئنجا هەر لەوێش دا هاتوە کە سولەیمان ﷺ کاتێ مردوە، لەسەر کوفرو شیرک مردوە و پەروەردگاری لێی تووڕە بووە، با خودی عیبارەتەکە بخوێنمەوە کە لە لاپەڕە (٧٣٣) هاتوە، دەڵێ: (**وعيدُ الربِّ لسليمان**) {هەڕەشەی پەروەردگار لە سولەیمان}: (**فغضب الربِّ على سليمان، لأن قَلْبَهُ ضَلَّ عنه، مع أنه تجلَّى له مرتين ونهاه عن الغواية وآلهة أخرى، فلم يُطِعْ وصيَّته، لهذا قال الله لسليمان: بأنك انحرفت عنِّي ونكثت عهدي ولم تُطِعْ فرائضي التي أوصيتك بها، فإني حتماً أُمزِّق أوصال مملكتك و أُعطيها لأَحَدِ عَبيدك**)[1].

واتە: پەروەردگار لە سولەیمان تووڕە بوو، چونکە دڵی لە خوا لایدا، لەگەڵ ئەوەشدا پەروەردگاری دوو جار خۆی بۆ دەرخست (خۆی پێشاندا)و ڕێگریی لێکرد لە سەرگەردانیی، کە بە دوای پەرستراوانی دیکە بکەوێ، بەڵام وەسیەتی

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، ص٧٠٤ - ٧٣٤.

پەروەردگاری جێبەجێ نەکرد، بۆیە خوا بە سولەیمانی فەرموو: چونکە تۆ لە من لاتداو پەیمانی منت شکاندو، ئەو ئەرکانەی لەسەرم پێویست کردبووی، جێبەجێت نەکردن {ئەوانەی کە ڕام سپاردبووی جێبەجێیان بکەی} ئەوە بە دڵنیایی من حوکمڕانییەکەت بەش بەش دەکەم (پارچە پارچە دەکەم) و دەی دەم بە یەکێک لە کۆیلەکانت {بەڵام لەبەر ڕێزو حورمەتیی داوودی بابت، هەتا خۆت لە ژیان دابی، حوکمڕانییەکەت لێوەرناگرمەوەو بەش بەشی ناکەم}.

کە ئێمە دڵنیاین ئەوە یەکێکە لەو ئەفسانەو درۆو دەلەسانەی، کە جوولەکان بۆ پێغەمبەرانیان هەڵبەستوون، ئەگەرنا پێشتر زانیمان خوای کاربەجێ چۆن مەدحی سولەیمان ﷺ دەکات.

## ٤- موعجیزەکانی سولەیمان:

دەتوانین بەمجۆرە موعجیزەکانی سەرژمێر بکەین:

١- (با) بۆی ڕام و ملکەچ و دەستەمۆ کراوە.

٢- جند و شەیتانەکانی بۆ ڕام و دەستەمۆ کراون.

٣- قسەی کردوە لەگەڵ مێرووولەدا کە زیندەوەرێکە و، لەگەڵ پەپوولە سلێمانە (هدهد) دا کە باڵندەیەکە.

٤- بارەگای شاژنی (سبأ) کە هەندێکیان بە بەڵقیس ناویان هێناوە، لە چاوترووکانێک دا لە یەمەنەوە گوازراوەتەوە بۆ شام، وەک لە سوورەتی (النمل)دا، بە ڕوونیی هاتوە، کە لە کاتی خۆیدا تەفسیری دەکەین، بەڵام لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: شاژنی (سبأ) بۆ خۆی سەردانی سولەیمانی کردوە و، باسی ئەوە ناکات کە عەرش و بارەگایەکەی لە چاوترووکانێکدا بۆ گوازرابێتەوە[1].

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، ص ٧٢٨ - ٧٢٩.

٥- كۆشكێكی لە قەواریر واتە: لە شووشە بەند، یان لە مەڕمەڕی وەک شوشە، دروستكردووە، تاكو ئەو شاژنە بچێتە نێوی و، بزانێ كە ئەو تواناو دەستەڵاتەی بە سولەیمان دراوە، هی خوایە و موعجیزەیە و، دان بە پێغەمبەرایەتیی سولەیماندا بێنێ.

٦- موعجیزەیەكی دیكەی ئەوەیە: كە لە دادوەریی كردن دا - وەک لە سووڕەتی: (الأنبياء)دا هاتوە و لە فەرمایشتی پێغەمبەری خواش دا ﷺ هێنامان - جاری وا هەبووە سولەیمان باشتر پێكاویەتی لە بابی.

## ٥- تەمەن و مردنی سولەیمان:

لە (**أطلس القرآن**)دا[1] دەڵێ: سولەیمان ﷺ، لە (**بيت المقدس**) لە ساڵی (٩٢٣)ی پێش زایینـدا وەفاتی كردو، هەر لەوێش بە خاک سپێردرا، بەڵام لە (**الزهري**) یەوە هاتوە وەک لە (**قصص الأنبياء**)ی (**إبن كثير**)دا هاتوە[2]، كە سولەیمان پەنجاو دوو (٥٢) ساڵ ژیاوە و، چل ساڵ حوكمڕانیی كردوە، لە پەیمانی كۆنیشدا دەڵێ: چل (٤٠) ساڵ حوكمڕانیی كردوە.

ئنجا ئەوە كە جند تەنیا بۆ سولەیمان ملكەچ و دەستەمۆ كراون، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دەلالەتی لەسەر دەكات و، دەیكەین بە كۆتایی بەسەرهاتی سولەیمانیش، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**إِنَّ عِفْرِيتًا مِنَ الْجِنِّ تَفَلَّتَ عَلَيَّ الْبَارِحَةَ لِيَقْطَعَ عَلَيَّ الصَّلاَةَ، فَأَمْكَنَنِي اللَّهُ مِنْهُ فَذَعَتُّهُ، وَأَرَدْتُ أَنْ أَرْبِطَهُ إِلَى جَنْبِ سَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي الْمَسْجِدِ حَتَّى تُصْبِحُوا، فَتَنْظُرُوا إِلَيْهِ كُلُّكُمْ أَجْمَعُونَ، قَالَ: فَذَكَرْتُ دَعْوَةَ أَخِي سُلَيْمَانَ:** ﴿قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَهَبْ لِى مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِىٓ﴾، **فَرَدَدْتُهُ خَاسِئًا**} (**أخرجه أحمد: ٧٩٥٦، والبخاري: ٣٢٤١، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ**). واتە: دوێنێ شەو عیفریتێک لە جند لێم یاخیی بوو (لێم بەلەسە

---

(١) ص ٩٣.

(٢) قصص الأنبياء، ص ٤٤٩.

بوو)، ویستی نوێژەکەم لێ ببڕێ، بەڵام خوا منی بەسەر ئەودا زاڵ کردو، گرتم و ویستم بە کۆڵەکەیەک لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە بیبەستمەوە، تاکو بەیانیی هەمووتان تەماشای بکەن، بەڵام دوایی پاڕانەوەی سولەیمانی برام هاتەوە بیر [پەروەردگارم! لێم ببوورە و موڵکێکم پێ ببەخشە کە لە دوای من بۆ کەس نەبێ]، بۆیە بەرم هەڵدا و، بە ڕیسوایی وازم لێهێنا.

کەواتە: بەپێی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ و ئایەتەکەش جند، تەنیا بۆ سولەیمان ملکەچ و دەستەمۆ کراون.

## سێیەم: بەسەرهاتی ئەییووب عليه السلام

بەسەرهاتی ئەییووب لە سێ بڕگەدا دەتوێژینەوە:

### ١)- ناوو ڕەچەڵەکی:

ناوی هەر بە ئەییووب هاتوە لە قورئاندا، هەروەها لە پەیمانی کۆنیشدا (**سفر أيوب**) هاتوە، واتە: لەوێشدا هەر بە ئەییووب ناوی هاتوە، لە سیفرێکی تایبەت دا، کە سیفر لە جێی کتێبە، یانی: کتێبێکی تایبەت لە کتێبەکانی پەیمانی کۆن، لە بارەی ئەییووبەوەیە.

### ٢)- ژمارەی ناوهێندرانی لە قورئاندا:

ئەییووب چوار (٤) جار ناوی لە قورئان دا هاتوە:

١- لە سووڕەتی (النساء)، ئایەتی: (١٨٦)دا.

٢- لە سووڕەتی (الأنعام)، ئایەتی: (٨٤)دا.

٣- لە سووڕەتی (الأنبياء)، ئایەتی: (٨٣)دا.

٤- لە سووڕەتی (ص)، ئایەتی: (٤١)دا.

### ٣)- ژیان و بەسەرهاتی ئەییووب:

سەرەتا ئاماژە دەکەم بەوەی کە لە پەیمانی کۆندا هاتوە لە ژێر ناوونیشانی: (**سيرة أيوب**)[1]دا، هاتوە:

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر أيوب، ص ١٠٧٧.

دەڵێ: (**عَاشَ فِي أَرْضِ عَوْصٍ رَجُلٌ اسْمُهُ أَيُّوبُ، كَانَ صَالِحاً كَامِلاً يَتَّقِي اللهَ، وَيَحِيدُ عَنِ الشَّرِّ، وَأَنْجَبَ أَيُّوبُ سَبْعَةَ أَبْنَاءٍ وَثَلاثَ بَنَاتٍ، وَبَلَغَتْ مَوَاشِيهِ سَبْعَةَ آلافٍ مِنَ الْغَنَمِ، وَثَلاَثَةَ آلافِ جَمَلٍ، وَخَمْسَ مِئَةِ زَوْجٍ مِنَ الْبَقَرِ، وَخَمْسَ مِئَةِ أَتَانٍ، ...**)، واتە: لەسەر زەمینی عەوص پیاوێک دەژیا ناوی ئەییووب بوو، پیاوێکی پەسندو تێرو تەواو بوو، پارێزی لە خوا دەکردو، خۆی لە خراپە لادەدا و، ئەییووب حەوت کوڕو سێ کچی پەیدا بوون و، ئاژەڵەکانی لە مەڕ، حەوت هەزار (٧٠٠٠) سەر مەڕی هەبوو، {دەبێ مەڕو بزن بووبن} و سێ هەزار (٣٠٠٠) سەر حوشتری هەبوون و، پێنج سەد (٥٠٠) لە ڕەشە وڵاخی هەبوو {پێنج سەد جووت، واتە: گا و مانگا} و پێنج سەد (٥٠٠) ماکەریشی هەبوون، {ئەو کاتە بەکاریان هێناون بۆ زاووزێ}.

ئنجا لە کۆتایی باسی و ژیانی و تەمەنەکەیدا دەڵێ:

(**وَعَاشَ أَيُّوبُ بَعْدَ تَجْرِبَتِهِ مِئَةً وَأَرْبَعِينَ سَنَةً، وَاكْتَحَلَتْ عَيْنَاهُ بِرُؤْيَةِ أَبْنَائِهِ وَأَحْفَادِهِ إِلَى الْجِيلِ الرَّابِعِ، ثُمَّ مَاتَ أَيُّوبُ شَيْخاً، وَقَدْ شَبِعَ مِنَ الأَيَّامِ**)، دەڵێ: ئەییووب لە دوای ئەزموونەکەی {واتە: دوای تاقیکرانەوەکەی بە نەخۆشیی، کە دوایی باسی دەکەین} سەدو چل (١٤٠) ساڵ ژیا و چاوی ڕۆشن بوون بە بینینی کوڕەکانی و نەوەکانی، تاکو وەچەی چوارەم، {کوڕی، کوڕی، کوڕی، کوڕی} دوایی ئەییووب بە پیریی وەفاتی کرد، لە کاتێکدا کە تێر بووبوو لە تەمەن.

ئنجا ئەگەر سەدو چل (١٤٠) ساڵ لە دوای نەخۆشییەکەی ژیانی گوزەراندبێ، پێش نەخۆشییەکەشی چل پەنجا (٤٠ - ٥٠) ساڵێک هەر بووە، ئەگەر زیاتریش نەبووبێ، مانا وایە دەوری دوو سەد (٢٠٠) ساڵ یان زیاتر ژیاوە!! ئنجا پێویستە ئەوەش باسکەین کە سیفری ئەییووب چل و دوو (٤٢) ئیصحاحە و، ئیصحاح لە شوێنی سوورەتە.

ئەو چل و دوو (٤٢) ئیصحاحە، لە لاپەڕە (١٠٧٧ تاکو ١١٢٨) لە (**التفسير التطبيقي للكتاب المقدس**)، دەگرێتەوە، ئەمە گوشراوی ئەوە بوو کە لە سیفری ئەییووبدا هاتووە، لە پەیمانی کۆندا.

بەڵام ئەوەی لە سەرچاوە مێژوویەکاندا باسکراوە، لەبارەی ئەییووبەوە حەوت (٧) ڕای جۆراوجۆرن:

١- هەندێک گوتوویانە: ئەییووب هاوچەرخ بووە لەگەڵ مووسادا.

٢- هەندێک دەڵێن: هاوچەرخ بووە لەگەڵ دادوەران (**قضاة**)دا، چەند جیلێک دوای مووسا بوون، ئەوانەی کە حوکمیان کردوە بەسەر بەنی ئیسرائیل دا و، پێیان گوتراوە: (**الْقُضَاة**).

٣- هەندێک گوتوویانە: هاوچەرخ بووە لەگەڵ ئەردەشیر، کە پادشای ئێران بووە.

٤- هەندێک گوتوویانە: هاوچەرخ بووە لەگەڵ یەعقووبدا ﵇ بابی یوسوف.

٥- هەندێک گوتوویانە: هاوچەرخ بووە لەگەڵ سولەیماندا.

٦- هەندێک گوتوویانە: لەگەڵ بوختەننەصردا، هاوچەرخ بووە.

٧- هەندێکیش گوتوویانە: پێش ئیبراهیم ﵇ ژیاوە.

کەواتە: حەوت ڕا لە بارەی کاتی ژیانی ئەییووبەوە هەن، بەڵام لە قورئاندا هیچ کام لەوانە دیاریی نەکراون و، بەڵگەیەکی واشیان لەسەر نیە.

## بەسەرهاتی ئەییووب لە قورئان دا:

ئەگەر بمانەوێ بەسەرهاتی ئەییووب لە قورئاندا تەماشا بکەین، دەبێ سەرەتا تەماشای هەردووک ئایەتی (٨٣ و ٨٤) بکەین لە (الأنبیاء)دا، کە ئێمە پێشتر توێژیمانەوە و خوا ﷻ ئاوا باس دەکات: ﴿ وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾، واتە: یادی ئەییووب بکەوە، یاخود: ئەییووبیشمان تاقی کردەوە یان: ئەگەر ئەمە بگێڕدرێتەوە بۆ سەر ئەوەی لە بارەی لووطەوە، خوا فەرمووی: ﴿ وَلُوطًا ءَاتَيْنَـٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ﴿٧٤﴾ ﴾، یانی: (وَأَيُّوبَ آتَيْنَاهُ حُكْمَاً

وَعِلْمَاً)، هەر سێ ئەگەرەکەی هەن، وەک هەمـوو جارێ باسمان کردوە: یادی ئەییووب بکەوە، یان: ئەییووبیش حیکمەت و زانستمان پێدابوو، یاخود: ئەییووبیشمان تاقیکردەوە، ﴿ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ ﴾، کاتێک کە بانگی پەروەردگاری کرد، ﴿ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾، بانگ کردنەکەی ئەوە بوو گوتی: من ئازارو نەخۆشییم تووش بووە، تۆش بەبەزەییترینی بەبەزەییانی، ﴿ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَكَشَفۡنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرّٖ ﴿٨٤﴾ ﴾، ئێمەش وەڵاممان دایەوە و بە دەنگیەوە چووین و، ئەو ئازارو ناڕەحەتییەی هەیبوو، لێمان لابرد، ﴿ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ ﴾، خاو خێزانەکەیمان پێدا و وێنەی خۆشیان لەگەڵیاندا، ﴿ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا ﴾، ئەوە بەزەییەک بوو لە لایەن ئێمەوە، ﴿ وَذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰبِدِينَ ﴾، پەندو ئامۆژگارییش بوو، بیرخستنەوەش بوو بۆ خواپەرستان، کە خوا بەسەریان دەکاتەوە و تاقییان دەکاتەوە، بەڵام دەربازیشیان دەکات و بە دەنگیشیانەوە دێ.

لە سوورەتی (ص)دا، هەر هەمان مەبەست لە چوار ئایەتدا هاتوە، کە خوا ﷻ تۆزێک درێژتر لەوەی سوورەتی (الأنبياء)، باس دەکات و دەفەرموێ:

﴿ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ ﴿٤١﴾ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَۖ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ﴿٤٢﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنَّا وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٤٣﴾ وَخُذۡ بِيَدِكَ ضِغۡثٗا فَٱضۡرِب بِّهِۦ وَلَا تَحۡنَثۡۗ إِنَّا وَجَدۡنَٰهُ صَابِرٗاۚ نِّعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٞ ﴿٤٤﴾ ﴾ ص

واتە: یادی بەندەکەمان ئەییووب بکەوە، کاتێک بانگی پەروەردگاری کرد: من شەیتان تووشی ماندوێتیی و ئازاری کردووم {پێمان گوت:} ﴿ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَ ﴿٤٢﴾ ﴾، پێ بە زەویدا بدە.

(رَكْض)، بە مانای ڕاکردن دێت، بەڵام لێرەدا یانی: (اضْرِبْ الأرْضَ بالقَدَمِ أو بالرِّجل)، پێ بە زەویدا بکوتە، ﴿ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ﴾، ئنجا یەکسەر کە پێت بە زەوی دادا، وەک موعجیزەیەک بۆ ئەییووب ﷺ کانییەک دەردەقوڵێ،

(هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ)، ئەمە خۆشۆرگەیە، ئەو شوێنەی خۆی لێ دەشۆردرێ، (بَارِدٞ وَشَرَابٞ)، هەم ساردەو، هەم بۆ خواردنەوەشە، واتە: خۆتی پێ بشۆ، سارده و لێشی بخۆوه تاکو ئەو دەردو عیلەتەی لە هەناوتدایە، بە هۆی خواردنەوەیەکەیەوە بڕوا و، ئەو دەردو نەخۆشییەی لە پێستیشتدا هەیە، لەسەر جەستەشت، هەیە ئەویش بڕوا، واتە: بۆ ئەوەی کە دەروون و ڕواڵەتت، دەرو دەروونت، یانی: دیوی پەنهان و دیوی ئاشکرات، پاک بێتەوە لە نەخۆشیی.

﴿وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنَّا ۝٤٣﴾، واتە: نیزیکەکانی[1]، خاوو خێزانەکەیمان پێدا، (وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ)، هەروەها هێندەی خۆشیان لەگەڵیاندا، وەک پێشتر باسمان کرد، هاوسەرەکەی بە پێی ئەوەی کە ئایەتەکەش ئاماژەی پێ دەدا، دەبێ هەر مابێت، بەڵام ئایا کوڕو کچەکانی:

أ- خوا بۆی زیندوو کردوونەوە؟ ئەوە ڕایەکە و من ئەوە بە دوور دەزانم.

ب- یاخود: ئەگەر پێشێ - وەک لە پەیمانی کۆن دا هاتوە - حەوت کوڕو سێ کچی بوون، ئنجا خوا ﷻ هەر لەو خێزانەی، یاخود لە خێزانێکی دیکەی کە هێناویەتی، چواردە کوڕو شەش کچی پێداون، واتە: دوو هێندەی ئەو کوڕو کچانەی کە بوونی و مردوون؟! ئەم ڕایەم زیاتر پێ پەسندە.

ئنجا خوای پەروەردگار لێرەدا باسی ماڵ و سامان ناکات، بەڵام لە پەیمانی کۆندا باسی ماڵ و سامانەکەشی دەکات، کە پێشێ لە دەستی چووە، خوای بەخشەر بۆی قەرەبوو کردۆتەوە، ﴿رَحۡمَةٗ مِّنَّا﴾، ئەوە بەزەییەک بووە لە لایەن ئێمەوە، کە ئەوەمان لەگەڵ کرد، ﴿وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾، بیرخەرەوەش بوو، پەندو ئامۆژگارییش بوو بۆ خاوەن عەقڵان.

---

(١) (أهل) یانی: نیزیکانی کەسێک، کە لە ماڵدا لەگەڵی کۆدەبنەوە، هاوسەر دەگرێتەوە، کوڕان دەگرێتەوە، کچان دەگرێتەوە، نەوە دەگرێتەوە، هەموو ئەوانەی لەگەڵ مرۆڤدا دەژین لە ماڵێکدا، دەیانگرێتەوە.

﴿ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْ ﴿٤٤﴾ ﴾، (هەروەها پێمان فەرموو): بە دەستی خۆشت چەپکێک[1] بگرە و (فَٱضْرِب بِّهِۦ)، پێی لێ بدە، (وَلَا تَحْنَثْ)، با سوێندەکەت لێ نەکەوێ، (حَنْث)، واتە: سوێند لێ کەوتن، ئەوە کە سوێند لە شتێک بخۆی و، سوێندەکە جێبەجێ نەکەی، ﴿ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا ﴾، ئێمە ئەومان بە خۆڕاگر بینی، خۆڕاگرمان لێ هەڵکەوت، خۆڕاگر هاتە بەرچاومان، ﴿ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ ﴾، ئەو باشترین بەندە بوو، ﴿ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾، زۆر بۆ لای پەروەردگاری دەگەڕایەوە و لێی دەپاڕایەوە، دانی بە کەم و کوڕیی خۆیدا دەهێنا.

لێرەدا خوا ﷻ بە وردیی باس ناکات کە بۆچی و لەبەرچی دەفەرموێ: چەپکێک بە دەستەوە بگرە و ئنجا پێی لێ بدە، لە کێ بدات؟ دیاریی نەکردوە، بەڵام لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هاتوە، کە دەبێ ڕۆژێک لە هاوسەری تووڕە بووبێ و سوێندی لێ خواردبێ کە سەد قەمچیی لێ بدات، یان سەد داری لێ بدات، وەک سزادانێک، خوای میهرەبانیش وەک وەفادارییەکی خێزانی بۆ وی و، وەک ئەوەش کە ئەیووب سوێندەکەشی لێ نەکەوێ، خوا ﷻ ئەوەی بۆ کردوە کە لە جیاتی ئەو سەد قەمچییە، سەد چڵە گیا بە دەستەوە بگرەو پێی لە خێزانت بدە، کە سوێندەکەشت لێ ناکەوێ و ئەویش ئازاری پێ ناگات، چونکە خزمەتی زۆری تۆی کردوە، هەڵبەتە دوایی وردتر ئەوە باس دەکەین، بەڵام گرنگ ئەوەیە لە قورئاندا، لەو دوو شوێنەدا باسی ئەیووب کراوە و، چوار جاریش ناوی هاتوە، چوار جارەکان باسمان کردن، دووانیان لە سوورەتی (الأنبياء) و (ص)دا ن و، دووانیشیان بەس ناوهێندرانن، لە سوورەتی (النساء) و (الأنعام)دا.

---

(١) ضغث: چەپک لە گژوگیا، یان پووش و پەڵاش.

**پێویستە لە ژیان و بەسەرهاتی ئەیووب دا چەند شتێک باسبکەین:**

**أ)- نەخۆشییەکەی ئەیووب عليه السلام:**

لە کتێبە مێژووییەکاندا زۆر باسی نەخۆشییەکەی ئەیووب کراوە و پێشتریش ئاماژەمان پێدا، بەڵام لە قورئاندا دیاریی نەکراوە چ نەخۆشییەکی هەبووە، کەواتە: ئەوەی کە لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هەیە و، زانایانی ئیسلام نووسیویانە و، لە پەیمانی کۆندا لە ژێر چەند ناوونیشانێک دا باسی نەخۆشییەکەی ئەیووب دەکات، بۆ وێنە:

لە ژێر ناوونیشانی: (**الإذنُ للشيطانِ بتَجْرُبَةِ أيوب**)[1]، مۆڵەت درانی شەیتان تاکو ئەیووب تاقی بکاتەوە، دەڵێ: شەیتان داوای مۆڵەتی لە خوا کرد: ڕێگای بدات ئەیووب توشی نەخۆشیی و ئازار بکات.

هەروەها هەر لە پەیمانی کۆن دا لە لاپەڕە (١٠٧٩)دا لە ژێر ناوونیشانی: (**هلاكُ أبناءِ أيوب ودَمارُ مَمْلَكَتهِ**) {مردنی کوڕەکانی ئەیووب و نەمانی دەسەڵات و موڵک و سامانەکەی}دا، هەروەها لە لاپەڕە (١٠٨١)دا لە ژێر ناوونیشانی: (**أيوب يُصابُ بالقروح**)، {ئەیووب تووشی برین و نەخۆشیی پێست دێ}لەوێدا زۆر بە بێ ڕەزایی هەندێ شت باس دەکات، کە لەگەڵ پێگە و مەقامی بەرزی پێغەمبەران دا، ناگونجێ، تووشی نەخۆشیی ئاوا بن، کە خەڵک بێزی لێیان ببێتەوە و قێزەون بن و لەبەر چاوی خەڵک بکەون، بەڵام لە پەیمانی کۆندا ئەو شتانە باسکراون، کەواتە: ئەوەی زانایانی ئیسلام لە کتێبەکانیاندا هێناویانە، لە پەیمانی کۆنەوە هاتوون، پەیمانی کۆنیش هەموو شتی تێدا هەیە، شتی تێدایە کە لەگەڵ عەقڵ و مەنتیق و لەگەڵ قورئانیشدا دەگونجێ و، تێشیدا هەیە، کە لەگەڵ عەقڵ و مەنتیق و لەگەڵ قورئان و زانستیشدا ناگونجێ.

بەڵام ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ بە گشتیی فەرموویەتی: {**أَشَدُّ النَّاسِ بَلَاءً الْأَنْبِيَاءُ وَالصَّالِحُونَ الْأَمْثَلُ فَالْأَمْثَلُ**}، (**أخرجه الطيالسي: ٢١٥، وأحمد:١٤٨١، وعبد**

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، ص ١٠٧٨.

بن حميد: ١٤٦، والدارمي: ٢٧٨٣، والترمذي: ٢٣٩٨، وقال: حسن صحيح، وابن ماجه: ١٣٣٤)، واتە: سەختترین تاقیکرانەوەی خەڵک بەسەر پێغەمبەراندا دێ، (واتە: پێغەمبەران لە هەموو خەڵکی تاقیکردنەوەیان سەخترە)، دوایی چاکان، دوایی وێچوو بە وێچوو، واتە: تاکو زیاتر کەسانێ بە پێغەمبەران بچن و شێوەی ئەوان بکەن، بە ڕێی ئەواندا بڕۆن، تاقیکردنەوەکەشیان قورستر دەبێت.

**ب)- چاکبوونەوەی ئەییووب عليه السلام:**

**{بَيْنَمَا أَيُّوبُ يَغْتَسِلُ عُرْيَانًا، خَرَّ عَلَيْهِ جَرَادٌ مِنْ ذَهَبٍ، فَجَعَلَ أَيُّوبُ يَحْتَثِي فِي ثَوْبِهِ، قَالَ: فَنَادَاهُ رَبُّهُ، يَا أَيُّوبُ: أَلَمْ أَكُنْ أَغْنَيْتُكَ عَمَّا تَرَى؟ قَالَ: بَلَى يَا رَبِّ، وَلَكِنْ لا غِنَى بِي عَنْ بَرَكَتِكَ} (أخرجه أحمد: ٨١٤٤، والبخاري: ٢٧٥، والنسائي: ٤٠٩، الطيالسي: ٢٤٥٥، وابن حبان: ٦٢٢٩).**

واتە: لە کاتێکدا ئەییووب ڕووت بوو، خۆی دەشۆرد {لە کانیی و سەرچاوەیەک، وا پێدەچێ ئەو کانیی و سەرچاوەیە بووبێ کە خوا بۆی دەرقوڵاندوە} ڕیزە کوللەیەکی زێڕ بەسەریدا بارین {واتە: لە شێوەی کوللەدا بوون، بەسەریدا بارین و هەموویان زێڕ بوون} ئەییووب لە کۆشی خۆی کردن {(يَحْتَثِي)، یانی: خستنیە کۆشیەوە، گیرفانی، یان: دامێنی کراسەکەی} پەروەردگاری عز وجل بانگی کرد: ئەی ئەییووب! ئایا لەوەی کە دەیبینی، تۆم بێنیاز نەکردوە؟ گوتی: با ئەی پەروەردگارم، بەڵام من هیچ کات لە پێز و بەرەکەتی تۆ بێنیاز نیم! یانی: ئەوەش بەرەکەتی تۆیە، بۆیە وا سوورم لەسەر کۆکردنەوەی و، هەرچی زیاتر لێ بەرهەمەند بوونی.

**ج)- بۆچی ئەییووب سوێندی لە ژنەکەی خوارد:**

(**إبن كثير**) لە (**قصص الأنبياء**)[1] دا، چەند شتێکی باس کردوون، هەروەها لە سەرچاوەکانی دیکەشدا هاتوون:

---

(١) ص ٢٤٦.

١- هەندێکیان گوتوویانە: ئەیووب بۆیە لە خێزانی تووڕە بووە، چونکە هەژارو نەدار کەوتوون، خێزانەکەی قژی خۆی بڕیوە و فرۆشتوویەتی، بۆ ئەوەی پارەی شتێکی پێ پەیدا بکات بۆ خزمەتی ئەیووب و مەسرەفی ماڵیان، ئەویش لەسەر ئەوە لێی تووڕە بووە، چۆن قژی خۆت فرۆشتوە؟

٢- هەندێک گوتوویانە: لەبەر ئەوە بووە شەیتان دەرمانێکی بۆ وەسف کردوە، کە ئەیووبی مێردی پێ چاک بێتەوە، ئەویش ئەوەی بۆ ئەیووب گێڕاوەتەوە، گوتوویەتی: دەرمانێکی وام بۆ پێشنیار کراوە، ئەویش کە زانیویەتی هی ئیبلیسە، یان دەبێ خێزانەکەشی زانیبێتی، بەڵام ئەوەندە سوور بووە لەسەر ئەوەی مێردەکەی چارەسەر بکات، ویستوویەتی لەو پێشنیارەی ئیبلیس بەهرەمەند بێ، ئەوەیش لەسەر ئەوە لێی تووڕە بووە.

٣- هەندێکیش دەڵێن: لەبەر ئەوە بووە کە ژنەکەی بۆ پێویستییەک، ئیشێکی خۆی چۆتە دەرێ و درەنگی پێچوە، تاکو گەڕاوەتەوە، لەسەر ئەوە لێی تووڕە بووە.

هەر چۆن بێ لە قورئاندا دیاریی نەکراوە، گرنگ ئەوەیە لەسەر شتێک ئەیووب لە خێزانی تووڕە بووە و، سوێندی خواردوە کە چاک بۆوە سەد قەمچیی لێ بدات، خوای میهرەبانیش بەو تەئویلە کارێکی وایکردوە، ئەویش سوێندی لێ نەکەوێ و هاوسەرەکەشی تووشی ئازارو ناڕەحەتیی نەیەت، بە هۆی ئەوەوە کە سەد قەمچیی لێ بدرێ.

### د)- کۆچی دوایی ئەیووب عليه السلام:

لە قورئاندا لەوبارەوە هیچ باس نەکراوە، بەڵام لە پەیمانی کۆندا هاتوە، دوای ئەوەی لە نەخۆشییەکەی چاک بۆتەوەو، موڵک و سامان و ماڵ و منداڵەکانی و، هێندەی دیکەش لەگەڵیان دا، بۆی گەڕاونەوە، سەدوچل (١٤٠) ساڵ دوای ئەوەو لە تەمەنێکی زۆر بەساڵدا چوون و پیرییدا، کۆچی دوایی کردوە.

## چوارەم: بەسەرهاتی (ذو الكفل) عليه السلام

بەسەرهاتی (**ذو الكفل**) یش لە چوار بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

### ا)- ناوو ڕەچەڵەكی:

ناوی هەر بە (**ذَا الكفل**)، هاتووە، ئنجا (**ذَا**)، بە مانای (**صاحب**) خاوەن و (**الكفل**)، واتە: وەئەستۆ گرتن، لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە، كە ئەوە لە حاڵەتی (**نصب**)دا یەو، ئەگەر لە حاڵەتی (**رفع**)دا ناوەكەی بگوترێ، (**ذو الكفل**)ە و، لە حاڵەتی ژێرداریی (**جر**)دا: (**ذِي الكفل**)ە، چونكە لە قورئاندا لە هەردوو شوێنەكان لە حاڵەتی (**نصب**)دا هاتووە، بۆیە گوتراوە: (**ذَا الكفل**)، ئەگەرنا ئەگەر بڵێی: (**ذو الكفل**)یش هەر تەواوە، كەواتە: ناوی (**ذو الكفل**)ە و لە بارەی پێغەمبەر بوونیشیەوە، زانایان ڕاجیاییان هەیە:

أ- هەرچی (الطبري)یە (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، تێیدا وەستاوە.

ب- هەندێك گوتوویانە: پیاوێكی چاك و دادوەرێكی دادگەر بووە.

ج- هەندێكیش گوتوویانە: كوڕی ئەیووب بووە.

بەڵام زۆربەی زانایان بە پێغەمبەریان زانیوە و بەڕای من هەر واشە، چونكە خوا لە ڕیزی پێغەمبەراندا هێناویەتی، وەك دواتر ئایەتەكان دێنین[١].

---

(١) قصص الأنبياء، لابن كثير، ص ٢٤٦، و (أطلس القرآن)، د. شوقي أبو خليل، ص ١٠٠.

## ٢)- ژمارەی ناوهێنددرانی (ذو الكفل) عليه السلام لە قورئاندا:

(**ذو الكفل**) تەنیا دوو جاران ناوی هاتوە، جاری یەکەم لە سووڕەتی (**الأنبياء**)، لە ئايەتەكانی: (٨٥ و ٨٦) دا، كە خوا دەفەرمووێ: ﴿وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا ٱلْكِفْلِ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٨٥﴾ وَأَدْخَلْنَٰهُمْ فِى رَحْمَتِنَآ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٦﴾﴾، ئیسماعیل و ئیدریس و (**ذو الكفل**)، هەر كامێك لەوانە لە خۆڕاگران بوون و، خستمانە نێو بەزەیی خۆمانەوە، چونكە ئەوان لە چاكان بوون.

شوێنی دووەم لە سووڕەتی (**ص**)دا، ئايەتی (٤٨): ﴿وَٱذْكُرْ إِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَذَا ٱلْكِفْلِ وَكُلٌّ مِّنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٨﴾﴾، واتە: هەروەها یادی ئیسماعیل و ئەلیەسەع و (**ذو الكفل**)، بكەوە، هەر كامێكیان لە هەڵبژێرراوان بوون، {بەندە هەڵبژاردەكانی خوای بەرزی مەزن}.

## ٣)- ژیان و سەرگوزشتەی (ذو الكفل) عليه السلام :

لە قورئاندا هیچ شتێك لە بارەی (**ذو الكفل**)ەوە نەهاتوە و، ئەو فەرموودەیەش كە باسی (**الكفل**)، دەكات وەك (**إبن كثير**) گوتوویەتی، جیایە لە (**ذو الكفل**)، ئنجا من ئە و دەقە دێنم، دوایی قسەی ئیبنو كەثیریشی لە بارەوە دێنم، وەك ئەمانەتی عیلمیی قسەكە دێنم، ئەمە دەقەكەیە:

**{كَانَ الكِفْلُ مِنْ بني إسرائيل لَا يَتَوَرَّعُ مِنْ ذَنْبٍ عَمِلَهُ، فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ فَأَعْطَاهَا سِتِّينَ دِينَارًا عَلَى أَنْ يَطَأَهَا، فَلَمَّا قَعَدَ مِنْهَا مَقْعَدَ الرَّجُلِ مِنْ امْرَأَتِهِ، أَرْعَدَتْ وَبَكَتْ، فَقَالَ: مَا يُبْكِيكِ أَأَكْرَهْتُكِ؟ قَالَتْ: لَا وَلَكِنَّهُ عَمَلٌ مَا عَمِلْتُهُ قَطُّ، وَمَا حَمَلَنِي عَلَيْهِ إِلَّا الحَاجَةُ، فَقَالَ: تَفْعَلِينَ أَنْتِ هَذَا وَمَا فَعَلْتِهِ؟ اذْهَبِي فَهِيَ لَكِ، وَقَالَ: لَا وَاللَّهِ لَا أَعْصِي اللَّهَ بَعْدَهَا أَبَدًا، فَمَاتَ مِنْ لَيْلَتِهِ فَأَصْبَحَ مَكْتُوبًا عَلَى بَابِهِ، إِنَّ اللَّهَ قَدْ غَفَرَ لِلْكِفْلِ}** (أخرجه أحمد برقم: ٤٧٤، الترمذي برقم: ٢٤٩٦، وأبو يعلى: ٥٧٣٦، قال حسين سليم أسد: إسناده صحيح، وضعَّفه كل من الألباني وشعيب الأرنؤوط، قال ابن كثير

رحمه الله: فَهُوَ حَدِيثٌ غَرِيبٌ جِدًّا، وَفِي إِسْنَادِهِ نَظَر، وَإِنْ كَانَ مَحْفُوظًا فَلَيْسَ هُوَ ذَا الْكِفْلِ، وَإِنَّمَا لَفْظُ الْحَدِيثِ «الْكِفْلُ» مِنْ غَيْرِ إِضَافَةٍ؛ فَهُوَ رَجُلٌ آخَرُ غَيْرُ الْمَذْكُورِ فِي الْقُرْآنِ الْكَرِيمِ) [1].

واتە: دەڵێ: کیفل پیاوێک بووە لە بەنی ئیسرائیل، لە هیچ گوناهێک نەدەپریناگایەوە، ئافرەتێک هات بۆ لای، کیفل شەست دیناری دایە، کە لەگەڵی جووت بێ {بە حەرامیی} ئنجا دوای ئەوەی وەک چۆن پیاو دادەنیشێ بۆ ئەوەی سەرجێیی لەگەڵ هاوسەری خۆیدا بکات، ئاوا بۆی دانیشت، ئافرەتەکە لەرزی و گریا، کیفل پێی گوت: چ شتێک دەتگرێنێ؟ ئایا زۆرم لێکردووی؟ گوتی: نەخێر، بەڵام ئەمە کارێکە هەرگیز نەمکردوە، (واتە: داوێن پیس نەبووم)، بەڵکو پێویستیی منی ناچار کردوە، ئەوە بکەم، ئەویش گوتی: تاکو ئێستا ئەوەت نەکردوە و ئێستا دەیکەی؟ {ئنجا لەسەری هاتە خوار} و گوتی: برۆ دینارەکانیش بۆ خۆت بن، ئنجا گوتی: سوێند بە خوا کیفل نابێ هەرگیز گوناهان بکاتەوە، ئیدی لەو شەوەدا مردو بەیانیی لەسەر دەرگاکەی نوسرابوو: خوا لە کیفل خۆش بوو.

ئیبنو کەثیر دەڵێ: ئەوە دەقێکی زۆر ناوازەیە و سەنەدەکەشی جێی سەرنجە و ئەگەر گریمان ڕاستیش بێ، ئەو کیفلە نیە کە لە قورئاندا هاتوە، ئەوەی کە لە قورئاندا هاتوە خوا بە (ذَا الْكِفْلِ)، ناوی هێناوە، ئەمەیان هەر بە کیفل هاتوە، ئنجا پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامَ)، پێش پێغەمبەرایەتییش لە گوناهی گەورە و لەو شتانە کە قێزەون و ناشیرنن، پارێزراو بوون، بەڵام (کیفل): لە هیچ گوناهێک نەپرینگاوەتەوە.

---

(١) قصص الأنبياء، لابن كثير، ص ٥٤٨.

## ٤)- كۆچی دوایی و گۆڕی:

لە (أطلس القرآن)[1]دا دەڵێ: دیار نیە كەی (ذو الكفل) وەفاتی كردوە، بەڵام لە چیای قاسیۆن كە بەسەر شاری دیمەشقدا دەڕوانێ، لە لای باكوریەوە، شوێنێكی لێیە پێی دەگوترێ: (مَقامُ ذَا الْكِفْلِ)، ئەمە شوێن و مەزارگەی، یاخود گۆڕی (ذو الْكِفْلِ)ە، ئنجا ئایا ڕاستە، یان نا؟ گرنگ ئەوەیە دیار نیە لە كوێ وەفاتی كردوە، بەڵام ئەو شوێنەوارە هەیە.




(١) ص ١٠٠.

## پێنجەم: بەسەرهاتی ئیلیاس عليه السلام

بەسەرهاتی ئیلیاسیش لە چوار بڕگەدا دێنین:

### ١)- ناوو ڕەچەڵەکی:

(إلیاس) هەر بە (إلیاس) ناوی هاتوە، چونکە هەرچەندە لە سووڕەتی (الصافات) دا بە (إلیاسین) ناوی هاتوە، بەڵام هەر یەکن، وەک دوایی باسی دەکەین.

### ٢)- ژمارەی ناو هێندرانی لە قورئاندا:

سێ جاران (إلیاس) عليه السلام ناوی لە قورئان دا هاتوە، بەم جۆرە:

١- لە سووڕەتی (الأنعام)دا، دەفەرموێ: ﴿وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿٨٥﴾﴾، واتە: زەکەرییا و یەحیا و عیسا و ئیلیاس، هەر کامێک لەوانە لە چاکان بوون، {لە بەندە پەسندەکانی خوا بوون}.

٢- لە سووڕەتی (الصافات)دا، دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی (إلیاس)یش لە ڕەوانەکراوان بوو.

٣- هەر لە سووڕەتی (الصافات)دا، دەفەرموێ: ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ﴿١٢٩﴾ سَلَامٌ عَلَىٰ إِلْ يَاسِينَ ﴿١٣٠﴾﴾ لە دواییەکاندا ئەوەمان لەسەر بەجێهێشت: سەلام لە (إلیاسین).

بە تەئکید (إلیاسین)یش هەر (إلیاس)ە، ئنجا هەندێک دەڵێن: (إلیاسین)، هەرچەندە لە ڕەسمی موصحەفدا بەو شێوەیە هاتوە، بەڵام دەڵێ: لە ئەصڵدا (إلیاسٍ) بووە، یانی: بە تەنوین، تەنوینەکە ئیشباع کراوە و بۆتە (إِلْ يَاسِينَ).

## ٣)- ژیان و بەسەرهاتی (إلياس):

ژیان و بەسەرهاتی (ئیلیاس) ﷺ، لە هەموو قورئان دا:

تەنیا لە سووڕەتی (**الصافات**)دا هاتوە، کە ئەمە دەقی ئایەتەکانە و بە کورتیی واتایان دەکەین:

﴿ وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ ﴿١٢٥﴾ اللَّهَ رَبَّكُمْ وَرَبَّ آبَائِكُمُ الْأَوَّلِينَ ﴿١٢٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿١٢٨﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ﴿١٢٩﴾ سَلَامٌ عَلَىٰ إِلْ يَاسِينَ ﴿١٣٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿١٣١﴾ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ ﴾ **الصافات**.

بە دڵنیاییش (**إلياس**) لە ڕەوانە کراوان بوو، ﴿ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ ﴾، کاتێک بە خەڵکەکەی خۆی گوت: ئایا پارێز ناکەن؟ واتە: پارێز لە خوا ناکەن؟ ﴿ أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ ﴿١٢٥﴾ ﴾، ئایا لە بەعل دەپاڕێنەوە و باشترینی بەدیهێنەرانیش {کە خوایە} پشتگوێ دەخەن، وازی لێ دێنن؟ واتە: ئایا بەعل دەپەرستن، بەڵام واز لە پەرستنی باشترین بەدیهێنەر دێنن، کە خوایە؟ ﴿ اللَّهَ رَبَّكُمْ وَرَبَّ آبَائِكُمُ الْأَوَّلِينَ ﴿١٢٦﴾ ﴾، خوا، پەروەردگاری خۆتان، پەروەردگاری باب و باپیرانی پێشووشتان، ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٢٧﴾ ﴾، خەڵکەکە بە درۆیان دانا و، بەڵام بە دڵنیایی ئەوان ئامادە دەکرێن، واتە: لە دۆزەخدا ئامادە دەکرێن، ﴿ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿١٢٨﴾ ﴾، جگە لە بەندە ساغکراوە و هەڵبژێردراوەکانی خوا، ﴿ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ﴿١٢٩﴾ ﴾، لەوانی دواییش دا لەسەری نووسیمان و بە جێمان هێشت، لە کتێبە دواییەکان دا کە دوای وی هاتوون، ﴿ سَلَامٌ عَلَىٰ إِلْ يَاسِينَ ﴿١٣٠﴾ ﴾، کە سەلام لە ئیلیاسین، سەلامەتیی لەسەر بێ، ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿١٣١﴾ ﴾، ئێمە هەر بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، ﴿ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ ﴾، بە دڵنیایی ئەو لە بەندە بڕوادارەکانمان بوو.

وشەی (إِلۡيَاسَ)، لەگەڵ (إِلۡ يَاسِينَ)، هەندێک دەڵێن: (إلۡيَاسۡ)، ئەوە ناوی خۆیەتی و (إلۡ يَاسِين)، واتە: ئیلیاس و شوێن کەوتووەکانی، هەندێکیش گوتوویانە: (إِلۡ يَاسِينَ)، هەر ئیلیاسە، بەڵام تەنوینەکەی تێرکراوە و بەو شێوەیە هاتوە، (إلۡ يَاسِين)، یاخود: هەم بە (إلۡيَاسۡ) بانگ کراوە و، هەم (إلۡ يَاسِين)یش بانگ کراوە.

**(إبن كثير)** لە **(قصص الأنبياء)**[1]دا، دەڵێ: **(قالوا وكان إرساله إلى أهل بعلبك غربي دمشق، فدعاهم إلى الله عز وجل وأن يتركوا عبادة صنم لهم كانوا يسمونه «بَعْلاً» وقيل كانت امرأة اسمها «بعل)**.

گوتراوە: ڕەوانەکرانی ئیلیاس بۆ لای خەڵکی بەعلەبەک بووە، کە لە ڕۆژئاوای شاری دیمەشقە، بانگی کردن بۆ لای خوا عزوجل، کە واز بێنن لە پەرستنی بتێک کە بەعلیان پێ دەگوت، هەندێکیش گوتوویانە: (بعل)، ناوی ئافرەتێک بووە، ئەو ئافرەتەیان پەرستوە.

**(إبن كثير)** هەر لە کتێبەکەی خۆی **(قصص الأنبياء)** لە هەمان لاپەڕەدا[2]، دوای ئەوەی کۆمەڵێک شت دێنێ لە بارەی ئیلیاسەوە، دەڵێ: **(حكايات كثيرة لم يثبت لها سند، ومنها حاكم على شرط الشيخين، وهذا مُسْتَدْرَكٌ على مستدرَكٍ، فإنَّه حديث موضوع)**.

دوای ئەوەی کە ئیبنو کەثیر کۆمەڵێک بەسەرهات دێنێ، جا بەوە چاکە ئیبنو کەثیر وەک چۆن مێژوو زان بووە، فەرمووده ناس **(مُحَدِّث)**یش بووە و لێکۆڵەرەوەیەکی باش بووە، دوای ئەوەی بەسەرهاتەکان دێنێ، دەڵێ: کۆمەڵێ: بەسەرهاتی زۆر هەن کە هیچ کامیان سەنەدێکی چەسپاوی نیە و، لەو بەسەرهاتانە هەیە کە **(حاكم)** خاوەنی **(المستدرك على الصحيحين)**، گێڕاویەتەوەو،

---

(١) ص ٤٠٦.

(٢) ص ٤٠٦.

بـە صەحیحیشـی داناوە بـە پێـی مەرجـی دوو شـێخەکان {واتـە: بوخاریی و موسـلیم} بـەڵام ئـەو حوکمـەی حاکیـم لەوەیـە کـە پێویسـتە بـۆی ڕاسـت بکرێتـەوە.

{واتـە: وەک چـۆن ئـەو بـە حیسـاب هەندێـک فەرمـوودە کـە مەرجەکانـی صەحیحـی بوخاریـی و صەحیحـی موسـیلیمی تێـدا هـەن، بـەڵام نەیانهێنـاون و هەڵیگرتوونـەوە، دەبـێ هـی ویـش هەڵبگیرێتـەوە، کـە تـۆ لـەوەدا بـە هەڵـەدا چـووی} چونکـە ئـەوە دەقێکـی هەڵبەسـتراوە.

**٤)**- وەک خاوەنی **(أطلس القرآن)**، (د. شوقي أبو خليل)[1] دەڵێ: {**عاش و مات إلياس في مدينة بعلبك**}، ئیلیاس هەم ژیانی هەم مردنیشی لە شاری بەعلەبەک بووە.

(بەعلەبەک)یـش ئێسـتا لـە وڵاتـی سـوریایە، ئیـدی وردەکاریـی زیاتـر لـە بـارەی ئیلیاسـەوە ﷺ نەهاتـوە، نـە لـە قورئـان و نـە لـە سـوننەتدا، بـەڵام لـە کتێبـەکان و سـەرچاوە مێژووییـەکان دا هاتـوە، کـە جێـی پشـت پـێ بەسـتن نیـن و، لـە پەیمانـی کۆنیشـدا، شـتێکم نەبینـی لـە بـارەی ئیلیاسـەوە.



(١) ص ٨٦.

## شەشەم: بەسەرهاتی (أَلْيَسَعْ) عليه السلام

بەسەرهاتی ئەلیەسەعیش لە چوار بڕگەدا دێنین:

### ١)- ناوو ڕەچەڵەکی:

ناوی تەنیا بە (**اليسع**)، هاتوە لە قورئاندا و، هیچ ناوێکی دیکەی بۆ بەکارنەهێنراوە، چونکە بۆ وێنە: (**يعقوب**)، ناوی بە (**يعقوب**) هاتوە و، ئیسرائیلیش کە نازناویەتی، یان (**يونس**) هەم بە یونس هاتوە، هەم بە (**ذا النون**) هاتوە و بە (**صاحب الحوت**)یش هاتوە، بەڵام (**اليسع**)، هەر بەو ناوە، ناوی هێنراوە.

### ٢)- ژمارەی ناوهێنرانی لە قورئاندا:

ئەلیەسەع تەنیا دوو جاران ناوی لە قورئان دا هاتوە:

أ- شوێنی یەکەم: لە سوورەتی (**الأنعام**)، ئایەتی (٨٦)دا، کە ئەمە دەقەکەیەتی: ﴿وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾﴾،

واتە: ئیسماعیل و ئەلیەسەع و یونوس و لووط و، هەر کامایێک لەوانەمان بەسەر جیهانییاندا هەڵبژاردبوو.

ب- شوێنی دووەم: لە سوورەتی (**ص**) ئایەتی (٤٨)دا: ﴿وَٱذْكُرْ إِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ۖ وَكُلٌّ مِّنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٨﴾﴾، هەروەها یادی ئیسماعیل و ئەلیەسەع و ذول کیفل بکەوە، هەر کامێک لەوانە لە بەندە هەڵبژاردراوەکانی خوا بوون.

تەنیا لەو دوو شوێنەدا ناوی (**اليسع**) عليه السلام هاتوە.

هەردووک سیاقەکەش بەڵگەیەکی ڕوونن، لەسەر ئەوە کە (الیسع) ﷺ لە پێغەمبەران بووە:

**١)**- لە ڕیزی: ئیسماعیل و یونوس و لووط، دا هاتوە کە بە تەئکید ئەو سێیانە پێغەمبەر بوون، ئنجا (الیسع)یش لە پاش ئیسماعیل و، لە پێش یونوس و (لووط)ەوە هاتوە.

**٢)**- خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، هەر کامێک لەوانەمان هەڵبژاردبوو بەسەر جیهانییاندا.

پەروەردگاریش تەنیا پێغەمبەرانی ﷺ بەسەر جیهانییاندا هەڵبژاردوون.

**٣**- هەروەها لە شوێنی دووەم دا، لە سوورەتی (ص) ئایەتی (٤٨)دا: ﴿ وَٱذْكُرْ إِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ۖ وَكُلٌّ مِّنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴾، واتە: یادی ئیسماعیل و ئەلیەسەع و دەلکیفل بکە، هەر کامێک لەوانە لە بەندە پەسندو هەڵبژاردەکان بوون.

خوای پەروەردگاریش ئەو تەعبیرەی تەنیا بۆ پێغەمبەران بەکارهێناوە، وەک لە سوورەتی (النمل)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ۗ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾، بڵێ: ستایش بۆ خواو سەلامی خوا لەسەر ئەو بەندانەی هەڵیبژاردوون.

## ٣)- بەسەرهاتی (الیسع) ﷺ:

لە قورئاندا تەنیا ناوی هاتوە و، هیچ لە بەسەرهاتەکەی باس نەکراوە، هەروەها لە سوننەتی پێغەمبەریشدا ﷺ هیچ شتێکم نەبینی لەبارەیەوە هاتبێ، بەڵام (إبن كثير) لە (قصص الأنبياء)دا[1] ئەم دەقە لە حەسەنی بەصرایییەوە دێنێ: {عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: كَانَ بَعْدَ إِلْيَاسَ، الْيَسَعُ عَلَيْهِمَا السَّلَامُ فَمَكَثَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَمْكُثَ، يَدْعُوهُمْ إِلَى اللَّهِ، مُسْتَمْسِكًا بِمِنْهَاجِ إِلْيَاسَ وَشَرِيعَتِهِ، حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ}.

---

(١) ص ٤١٤.

واتە: حەسەنی بەصرایی دەڵێ: لە دوای ئیلیاس ئەلیەسەع بوو (سەلامی خوایان لێ بێ)، ئەوەندەی خوا حەز بکات مایەوە، بانگی دەکردن بۆ لای خوا و، دەستگرتوو بوو بە ڕێبازی ئیلیاس و بەرنامەکەیەوە، تاکو خوا ﷻ بردیەوە بۆ لای خۆی، {تاکو خوا مراندی}.

٤)- ژیان و مردنی **(الیسع)** ؑ: **(د. شوقي أبو خليل)** لە **(قصص القرآن)**[1]، دەڵێ: {**عاش ومات إلياس في مدينة بعلبك**}، ئەلیەسەعیش ژیان و مردنی هەر لە شاری بەعلەبەک بوو، بە پێی ئەوەش کە لە حەسەنی بەصرابییەوە هاتوە **(الیسع)**، دەبێ جێنیشینی، ئیلیاس بووبێ و لە دوای ئیلیاسەوە هاتبێ و لەسەر ڕێبازی ئەویش ڕۆیشتبێ، ئەویش هەر لە بەعلەبەک ژیاوە و مردوە و **(الیسع)**یش بە هەمان شێوە.

شتێکی دیکەش لەو بارەوە لە **(قصص الأنبياء)**ی **(إبن كثير)**دا هاتوە:

**(قَالَ ابْنُ جَرِيرٍ وَغَيْرُهُ: ثُمَّ مَرَجَ أَمر بني إِسْرَائِيل وعظمت مِنْهُم الخطوب وَالْخَطَايَا، وَقَتَلُوا مَنْ قَتَلُوا مِنَ الْأَنْبِيَاءِ، وَسَلَّطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ بَدَلَ الْأَنْبِيَاءِ مُلُوكًا جَبَّارِينَ يَظْلِمُونَهُمْ وَيَسْفِكُونَ دِمَاءَهُمْ، وَسَلَّطَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْأَعْدَاءَ مِنْ غَيرهم أَيْضاً، وَبَقِيَ بَنُو إِسْرَائِيلَ كَالْغَنَمِ بِلَا رَاعٍ، حَتَّى بَعَثَ اللَّهُ فِيهِمْ نَبِيًّا مِنَ الْأَنْبِيَاءِ، يُقَالُ لَهُ: شَمْوِيلُ، فَطَلَبُوا مِنْهُ أَنْ يُقِيمَ لَهُمْ مَلِكًا لِيُقَاتِلُوا مَعَهُ الْأَعْدَاءَ، فَكَانَ مِنْ أَمْرِهِمْ مَا سَنَذْكُرُهُ مِمَّا قَصَّ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ)**[2].

واتە: ئیبنو جەریرو جگە لەویش گوتوویانە: کاروباری بەنوو ئیسرائیل تێکچڕژاو دوو بەرەکیی تێکەوت و، گرفت و کێشە و گوناهیان لە نێودا زۆر بوون و، ژمارەیەکیان لە پێغەمبەران کوشتن، بۆیە خواش لە جێی پێغەمبەران کە سەرپەرشتییان بکەن، حوکمڕانانێکی ستەمکاری لەسەر فەرز کردن و بە دەستیانەوە گرفتار بوون، ستەمیان لێ دەکردن و خوێنیشیان دەڕشتن، هەروەها

(١) ص ١٨٦.

(٢) قصص الأنبياء، ص٤١٥.

جگە لەو حوکمڕانانە کە هی خۆیان بوون، دوژمنانی جگە لە خەڵکی خۆیشیانی بەسەردا زاڵ کردن (وەک سزایەک کە دەستیان چۆتە خوێنی پێغەمبەران و خوێنی خەڵک و ستەمیان لێ کردوون)، بەنوو ئیسرائیل وەک مەڕی بێ شوان مانەوە، تاکو خوا یەکێک لە پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، لە نێودا ناردن، کە پێی دەگوترا: (شمویل)، {لە پەیمانی کۆندا بە (صمويل)، ناوی هاتوە، وەک پێشتر باسمان کرد}، داوایان لێ کرد کە پادشایەکیان بۆ دابنێ، سەرکردەکەیان بۆ دابنێ تاکو لەگەڵیدا دژی دوژمنەکانیان بجەنگن.

دوایی باس دەکات کە ئەویش شاولیان بۆ دادەنێ، کە لە قورئاندا ناوی بە (طالوت) هاتوە، کە لە سوورەتی (البقرة)دا خوا ﷻ بە تەفصیل دەکات: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعۡدِ مُوسَىٰٓ إِذۡ قَالُواْ لِنَبِيّٖ لَّهُمُ ٱبۡعَثۡ لَنَا مَلِكٗا نُّقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ قَالَ هَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُواْۖ قَالُواْ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدۡ أُخۡرِجۡنَا مِن دِيَٰرِنَا وَأَبۡنَآئِنَاۖ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ تَوَلَّوۡاْ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٤٦﴾ وَقَالَ لَهُمۡ نَبِيُّهُمۡ إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ بَعَثَ لَكُمۡ طَالُوتَ مَلِكٗاۚ ﴿٢٤٧﴾﴾.

کە درێژەی بەسەرهاتی طاڵووت و، جالووت و داوود چۆن جالووتی کوشتوە، کە جالووت فەرماندە و پادشای دوژمنە بەرانبەرەکانیان بووە، ئەمە بە تەفصیل لە سوورەتی (البقرة)دا خراوەتە ڕوو.

ئێمە لێرەدا دێینە کۆتایی بەسەرهاتی ئەو شەش پێغەمبەرە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، خوا یارمەتی ئێمەش بدات کە بە ڕێبازی پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) و بە بەرنامەکەیانەوە ئەو بەرنامەیەی کە لەلایەن خواوە بۆیان هاتوە و، ئەو ڕێبازەی کە بریتی بووە لە بەرجەستەکردنی پابەندییان بە بەرنامەی خواوە، خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی تەوفیقمان بدات و هیدایەتمان بدات، لەسەر ئەو ڕاستە شەقامەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بڕۆین.

# پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە حەڤدە (١٧) ئایەت پێک دێ: (٩٦ - ١١٢)، واتە: حەڤدە ئایەتی کۆتایی لە سوورەتی (الأنبیاء)، کە تەوەری سەرەکیی ئەم حەڤدە ئایەتە باسی ڕۆژی دواییە، بە هەردوو قۆناغی (**الساعة والقیامة**)، ئاخیر زەمان و هەڵسانەوەوە.

هەروەها لەو حەڤدە ئایەتەدا باسی چارەنووسی هەر کام لە بیبڕوایانی هاوبەش دانەرو، خواپەرستانی چاکەکار کراوە و، باسی ئاکام و سەرەنجامی گەردوون کراوە، کە بریتیە لە پێچرانەوەی و گێڕانەوەی بۆ حاڵەتی سەرەتای.

پاشان باسی یەکێک لە یاساکانی خوا کراوە، لە ژیانی بەشەردا، کە بریتیە لەوەی سەرزەمینی خوا لە لایەن بەندە شایستەکانی خواوە بە میرات دەگیرێ و، خوا ڕایگەیاندوە کە ئەوەی لە زەبووردا باسکردوە دوای زیکر، کە وا پێدەچێ مەبەست پێی تەورات بێ.

دوایی باسی ئامانجی نێردرانی پێغەمبەری خاتەم کراوە، ئەویش ئەوەیە کە ببێتە مایەی ڕەحمەت و بەخششی خوا بۆ تێکڕای جیهانییان، لە کۆتاییشدا چەند ڕێنماییەک بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ ڕاگەیەنراون، لە بارەی چۆنیەتی هەڵس و کەوتی لەگەڵ بێبڕوایاندا و ڕاگەیاندنی چەند ڕاستییەک پێیان.

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا بَلۡ كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٩٧﴾ إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ

جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ لَوْ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةً مَّا وَرَدُوهَا ۖ وَكُلٌّ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٩٩﴾ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا ٱلْحُسْنَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ﴿١٠١﴾ لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا ۖ وَهُمْ فِى مَا ٱشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٢﴾ لَا يَحْزُنُهُمُ ٱلْفَزَعُ ٱلْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا يَوْمُكُمُ ٱلَّذِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿١٠٣﴾ يَوْمَ نَطْوِى ٱلسَّمَآءَ كَطَىِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِى ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِىَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ فِى هَٰذَا لَبَلَٰغًا لِّقَوْمٍ عَٰبِدِينَ ﴿١٠٦﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ قُلْ إِنَّمَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٨﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُلْ ءَاذَنتُكُمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ ۖ وَإِنْ أَدْرِىٓ أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٌ مَّا تُوعَدُونَ ﴿١٠٩﴾ إِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلْجَهْرَ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَيَعْلَمُ مَا تَكْتُمُونَ ﴿١١٠﴾ وَإِنْ أَدْرِى لَعَلَّهُۥ فِتْنَةٌ لَّكُمْ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١١١﴾ قَٰلَ رَبِّ ٱحْكُم بِٱلْحَقِّ ۗ وَرَبُّنَا ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١١٢﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(ژیانی دنیا بەردەوام دەبێ) هەتا کاتێک یەئجووج و مەئجووج بەردەدرێن، لە حاڵێکدا کە بە خێرایی لە هەموو بەرزاییان دەڕۆن ﴿٩٦﴾ بەڵێنی هەقیش (کە قیامەتە) نیزیک بۆوە، یەکسەر دەبینی ئەوانەی بێبڕوابوون، چاویان ئەبڵەق بوون، (دەڵێن:) هەی هاوار بۆ ئێمە! بێگومان ئێمە لەمە بێ ئاگابووین (هەرچەندە ئاگاداریش کرابووینەوە)، بەڵام خۆمان ستەمکار بووین، بە دڵنیایی خۆتان و ئەوەی لە جیاتی خوا دەتانپەرست، سووتەمەنیی تێفڕێدراوی دۆزەخن، ئێوە دەچنە نێوی ﴿٩٧﴾ ئەگەر (ڕاستبایە) ئەوانە (وەک دەتانگوت:) پەرستراوان

(ی ڕاستەقینە) بوونایە، ئەوە نەدەچوونە نێوی و، هەمووشیان تێدا هەمیشەیی دەبن (٩٨) لەوێدا هەنسک و ناڵەی سەختیان هەیە و، لەوێدا هیچ نابیستن (٩٩) مسۆگەر ئەوانەی لە ئێمەوە بڕیاری پاداشتی هەرە باشیان بۆ دراوە، ئا ئەوانە لەو سزایە دوورن (١٠٠) لە دوورەوەش گوێ بیستی هەست و خوستی (دۆزەخ) نابن و لەوەدا کە نەفسیان ئارەزوومەندیەتی، بە هەمیشەیی دەمێننەوە (١٠١) گەورەترین داچڵەکاندن دڵتەنگیان ناکات و، فریشتەکان پێشوازییان لێدەکەن (پێیان دەڵێن:) ئەوە ئەو ڕۆژەتانە کە بەڵێنتان پێدەدرا (١٠٢) ئەو ڕۆژە کە ئاسمان وەک پێچرانەوەی تۆماری نووسراو دەیپێچینەوە (١٠٣) ئاسمان (گەردوون دروستکراوەکان) وەک چۆن لە سەرەتاوە هێناومانەتە دی، دەیگێڕینەوە، ئەوە بەڵێنێکە لەسەرمان ئێمە ئەنجامی دەدەین (١٠٤) هەروەها پاش زیکر (تەورات) یش لە زەبووردا نووسیومانە کە زەمین بەندە پەسندەکانم بە میراتی دەگرن (١٠٥) لەمەدا پێڕاگەیاندنێکی باش هەیە بۆ کۆمەڵێ خوا پەرستان (١٠٦) تۆشمان (ئەی موحەممەد!) تەنیا بە بەزەیی بۆ تێکڕای جیهانییان ناردوە (١٠٧) بڵێ: سروشم بۆ دەکرێ کە پەرستراوی ڕاستەقینەتان یەک پەرستراوە، ئنجا ئایا ئێوە ملکەچ دەبن (بۆ خوای تاک؟) (١٠٨) ئنجا ئەگەر پشتیان کردە هەق، بڵێ: هەمووتانم بە یەکسانیی ( و، وەک یەک) ئاگادار کردۆتەوە و ناشزانم ئایا ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ، نیزیکە یان دوورە! (١٠٩) بێگومان ئەو (خوا) قسەی ئاشکراو ئەوەش کە پەنهانی دەکەن، دەیزانێ (١١٠) ناشزانم ڕەنگە دواخستن (ی بەڵێن) ەکە تاقیکردنەوە و پێ گوزەراندنێکی کەم بێ بۆ ئێوە (١١١) (پێغەمبەر) گوتی: پەروەردگارم! دادوەریی بە هەق بکە و، پەروەردگاریشمان تاکە میهرەبانی پشت پێ بەستراوە، لە بەرانبەر ئەوەدا کە دەیڵێن ( وخوا و قورئان و پێغەمبەری بە ناهەق پێ وەسف دەکەن) (١١٢)}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(حَدَبٍ): (الحَدَبُ: ما ارتَفَعَ وَغَلُظَ مِنَ الأَرْض)، (حَدَب) واتە: هەر شوێنێک کە لە زەوی زبرو بەرز بێت، ڕەنگە بە کوردیی: گردۆلکە، تەپۆلکە، بگەیەنێ.

(يَنسِلُونَ): واتە: بە خێرایی دەڕۆن (نَسَلَ المَاشِي: أَسْرَعَ)، بابای پێڕۆ کە دەڕوا، ئەگەر بڵێی: (نَسَلَ) یانی: (أَسْرَعَ)، بە خێرایی ڕۆیی.

(شَاخِصَةٌ أبصارهم) چاویان ئەبڵەق بوون، چاویان زەق بوون، (شَخَصَ فُلاَنٌ بَصَرَهُ وَبِبَصَرِهِ: فَتَحَ عَيْنَيْهِ ولَمْ يَطْرِف بِهِمَا مُتَأَمِّلاً أو مُنْزَعِجاً)، کەسێک کە چاو ببڕێتە شتێک و، چاوی نەترووکێنی و، چاوی ئەبڵەق بێ و زەق بێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (شَخَصَ بَصَرُهُ)، یان (شَخَصَ بِبَصَرِهِ)، ئنجا بەهۆی سەرنج دانەوە لە شتێک بێ، چ بەهۆی ترسان و داچڵەکینێکەوە بێ.

(حَصَبُ): (الحَصَبُ: صِغَارُ الحِجَارَةَ، الحَطَبُ كُلُّ مَا يُلْقَى فِي النَّارِ مِنْ وَقُود)، وشەی (حَصَب) لە ئەصڵدا بە مانای وردە بەرد دێ، دوایی بە مانای سووتەمەنیی دێ، دوایی بە مانای هەر شتێک دێ بسووتێندرێ.

(زَفِيرٌ): (زَفَرَ يَزْفِرُ زَفَراً وَزَفِيْراً: أَخْرَجَ نَفَسَهُ بَعْدَ مَدِّه إِيَّاهُ)، (شَهِيْق) واتە: هەڵمژین، بەڵام (زَفِير) واتە: هەناسە دانەوە، ئنجا: (زَفِير: زَفَرَ يَزْفِرُ زَفْراً وَزَفِيْراً)، واتە: هەناسەکەی دایەوە، دەرهاویشتەوە، دوای ئەوەی درێژی کردەوە.

(حَسِيسَهَا): (الحَسْيسُ: الحِسُّ)، (حَسيس) بریتیە لە هەستێک، بە هەستەکان ببێسترێ.

(ٱلْفَزَعُ ٱلْأَكْبَرُ): واتە: داچڵەكینی گەورەترین، گەورەترین داچڵەكین، (الفَزَعُ: الخَوْفُ والذُّعْرُ فَزَعَ يَفْزَعُ فَزْعَاً: تَقَبَّضَ وَنَفَرَ مِنْ شَيءٍ مُخِيْفٍ)، (فَزَعَ يَفْزَعُ فَزْعَاً)، (فَزْعْ) ئەوەیە كە ئینسان ڕێک بێ و بیڵەمێتەوە لە شتێكی مەترسییلێكراو.

كەواتە: (ٱلْفَزَعُ ٱلْأَكْبَرُ)، واتە: ترسی گەورەترین، گەورەترین ترسی داچڵەكێنەر.

(نَطْوِى): واتە: دەپێچینەوە، (طَوَى الشَّيءَ يَطْوِيَ طَيَّاً: ضَمَّ بَعْضَهُ عَلَى بَعْضٍ أو لَفَّ بَعْضَهُ عَلَى بَعْض)، (طَوَى الشَّيءَ يَطْوِيَ طَيَّاً)، واتە: شتەكەی هەندێكی خستەوە سەر هەندێكی، یاخود هەندێكی لە هەندێكی پێچا، یانی: پێچرانەوە و كۆكرانەوەی شتێک.

(ٱلسِّجِلِّ ): (السِّجِلُّ: الكِتَابُ يُدَّونُ فِيْهِ مَا يُرَادُ حِفْظُهُ، وَالجَمْعُ: سِجلاَّت)، (سجل) بە تۆمارێک دەگوترێ كە شتی تێدا دەنووسرێ، ئەوەی كە دەویسترێ بپارێزرێ و لەبەر بكرێ، هەندێک گوتوویانە: (السِّجل)، واتە: (الكاتِب)، نووسەر، ئەو كەسەی كە شتێک دەنووسێ لە تۆماردا.

(ءَاذَنتُكُمْ): (أَعْلَنْتُكُم)، ئاگادارم كردوونەوە.

(عَلَىٰ سَوَآءٍ): واتە: بە یەكسانیی، هەمووتانم وەک یەک ئاگادار كردۆتەوە، دەڵێ: (سَاوَاهُ: عَادَلَهُ، السَّواءُ: المُسْتَوى)، واتە: وەک یەک، لە ئەصڵدا (سَواء)، بە مانای ئەرزێكی تەخت دێ، كە هیچی لە هیچی بەرزتر نەبێ، واتە: لەو ڕاگەیاندنەمدا هەمووتانم وەک یەک ئاگادار كردوونەوە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَارِدُونَ...﴿٩٨﴾﴾، لەو بارەوە ئەم بەسەرهاتە هەیە:

{وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: آيَةٌ فِي كِتَابِ اللهِ لَا يَسْأَلُنِي النَّاسُ عَنْهَا، وَلَا أَدْرِي، أَعَرَفُوهَا فَلَا يَسْأَلُونِي عَنْهَا؟ أَمْ جَهِلُوهَا فَلَا يَسْأَلُونِي عَنْهَا؟ قِيلَ: وَمَا هِيَ؟ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ آيَةُ: ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَارِدُونَ...﴿٩٨﴾﴾، شَقَّ ذَلِكَ عَلَى أَهْلِ مَكَّةَ، وَقَالُوا: شَتَمَ مُحَمَّدٌ آلِهَتَنَا، فَقَامَ ابْنُ الزِّبَعْرَيِّ، فَقَالَ: مَا شَأْنُكُمْ؟ قَالُوا: شَتَمَ مُحَمَّدٌ آلِهَتَنَا، قَالَ: وَمَا قَالَ؟ قَالُوا: قَالَ: ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَارِدُونَ ﴿٩٨﴾﴾، قَالَ: ادْعُوهُ لِي، فَدُعِيَ مُحَمَّدٌ ﷺ فَقَالَ ابْنُ الزِّبَعْرِيِّ: يَا مُحَمَّدُ! هَذَا شَيْءٌ لِآلِهَتِنَا خَاصَّةً، أَمْ لِكُلِّ مَنْ عُبِدَ مِنْ دُونِ اللهِ؟ قَالَ: بَلْ لِكُلِّ مَنْ عُبِدَ مِنْ دُونِ اللهِ عز وجل، فَقَالَ: خَصَمْنَاهُ وَرَبِّ هَذِهِ الْبَنِيَّةِ، يَا مُحَمَّدُ! أَلَسْتَ تَزْعُمُ أَنَّ عِيسَى عَبْدٌ صَالِحٌ، وَعُزَيْرًا عَبْدٌ صَالِحٌ، وَالْمَلَائِكَةَ عِبَادٌ صَالِحُونَ؟ قَالَ: بَلَى، قَالَ: فَهَذِهِ النَّصَارَى يَعْبُدُونَ عِيسَى، وَهَذِهِ الْيَهُودُ تَعْبُدُ عُزَيْرًا، وَهَذِهِ بَنُو مَلِيحٍ تَعْبُدُ الْمَلَائِكَةَ، قَالَ: فَضَجَّ أَهْلُ مَكَّةَ، فَنَزَلَتْ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا الْحُسْنَىٰ أُولَٰئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ﴿١٠١﴾﴾الأنبياء أَيْ: عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ، وَعُزَيْرًا، قَالَ: وَنَزَلَتْ: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ابْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾﴾الزخرف}[1].

---

(١) الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٢، ص ٤٩٣ -٤٩٤، وقال مؤلّفا الإستيعاب: صحيح لغيره.
أخرجه الطحاوي في (مشكل الآثار): ٩٨٦ وأمجد في المسند (٣١٨/٣١٧/١) والطبراني في المعجم الكبير: ١٢٧٣٩، قلنا: وهذا إسناد حسن.

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: ئایەتێـک لـە کتێبـی خـوادا هەیـە خەڵـک لێـم ناپرسـن لـە بارەیـەوە، ناشـزانم ئایـا دەیزانـن و لێـم ناپرسـن، یاخـود نایزانـن و لێشـم ناپرسـن، گوتـرا: ئـەو ئایەتـە کامەیـە؟ گوتـی: کاتێـک ئـەو ئایەتـە هاتـە خـوار: ﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ ﴾، (واتـە: ئێـوە و ئەوانـەی لـە جیاتـی خـوا دەیانپەرسـتن سـووتەمەنیی دۆزەخـن و ئێـوە دەیچنـە نێـو)، لەسـەر خەڵکی مەککـە زۆر قـورس بـوو، گوتیـان: موحەممـەد ﷺ جنێـو بـە پەرسـتراوەکانمان دەڵـێ، ئیبنـو زیبەعریـی هەڵسـا گوتـی: چیتانـە؟ گوتیـان: موحەممـەد ﷺ قـسەی بـە پەرسـتراوەکانمان گوتـوە، گوتـی: چـی گوتـوە؟ گوتیـان: دەڵـێ: ﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ ﴾، {ئـەوان وایانزانیـوە هـەر قسـەی خۆیەتـی، بۆیـە پێغەمبەریـان ﷺ تۆمەتبـار کـردوە} ئیبنـو زیبەعریـی گوتـی: بـۆم بانگبکـەن، ئنجـا موحەممـەد ﷺ بانگکـرا، ئیبنـو زیبەعریـی پێـی گـوت: ئـەی موحەممـەد! ﷺ ئایا ئـەوەی کـە هاتـوە تایبەتـە بـە پەرسـتراوەکانی ئێمـەوە، یاخـود بـۆ هـەر کەسـێکە کـە لـە جیاتـی خـوا بپەرسـترێ؟ فەرمـووی: بەڵکـو بـۆ هـەر کەسـێکە کـە لـە جیاتـی خـوا عـز وجـل بپەرسـترێ، گوتـی: کەواتـە: سـوێند بـە خاوەنـی ئـەم ماڵـە، ئێمـە زاڵ بوویـن لـە قسـەدا بەسـەرتدا: ئـەی موحەممـەد! ﷺ تـۆ گومانـت وا نیـە کـە عیسـاش بەندەیەکـی چـاک بـووە و، عوزەیریـش بەندەیەکـی چـاک بـووە و، فریشـتەکانیش بەنـدەی چاکـن؟ پێغەمبەریـش ﷺ فەرمـووی: بـا، ئیبنـو زیبەعریـی گوتـی: ئـەوە نەصرانییـەکان عیسـا دەپەرسـتن، یەهوودیـش عوزەیـر دەپەرسـتن، بەنـو مەلیحیـش {هۆزێـک بـووە لـە عەرەبـەکان} فریشـتەکان دەپەرسـتن، کەواتـە: دەبـێ هـەر کام لـە عیسـا و عوزەیـرو فریشـتەکانیش، مـادام دەپەرسـترێن، لە جیاتـی خـوا، لەگـەڵ پەرسـتارەکانیاندا بخرێنـە دۆزخـەوە؟ ئیـدی خەڵکـی مەککـە بوو بـە گاڵـە و دەنگـە دەنگیـان {گوایـە ئیبنـو زیبەعریـی لـە وتووێـژدا بەسـەر پێغەمبەردا ﷺ زاڵ بـووە} ئنجـا خـوا ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوار: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا

ٱلْحُسْنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ﴾، واتە: ئەوانەی لە ئێمەوە بڕیاری پاداشتی هەرە باشیان بۆ دەرچووە پێشتر، ئەوانە لەو دۆزەخە دوورن، (کە عیسا و عوزەیرو فریشتەکانن)، هەروەها هەر لەوەشدا ئەو ئایەتەی سوورەتی (**الزخرف**) هاتە خوار: ﴿ وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ۝٥٧ ﴾، واتە: کاتێک کوڕی مەریەم بە وێنە هێنرایەوە، خەڵکەکەت بە هۆی ئەوەوە کردیان بە گاڵە.

(يَصِدُّونَ )، یانی: (**يضجُّون**)، کردیانە گاڵە و هەرا، گوایە ئەوان قسەکەیان زاڵ بووە بەسەر قسەی پێغەمبەردا ﷺ، بەڵام خوا ڕوونی کردۆتەوە، کەوانیە، هەڵبەتە وەڵامی ئەوەش زۆر ئاسانە، ئەویش ئەوەیە کە هەر کەسێک بپەرسترێ لە جیاتی خوا و ڕازی بێ بەو پەرستراوەی، حوکمەکەی ئەوەیە، بەڵام عیسا کە دەپەرسترێ، گوتوویەتی: جگە لە خوا کەس مەپەرستن، عوزەیریش کە دەپەرسترێ بەندەیەکی خوایە و نارازیی بووە بپەرسترێ و، فریشتەکانیش کە دەپەرسترێن بە ناهەق، ئەوانیش نارازین، بۆیە خوا ئەوان سزا نادات، بەهۆی نەزانیی و کەودەنیی ئەوانەوە، کە بە ناهەق دەیانپەرستن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـە کۆتایـی سـوورەتی (الأنبياء)دا، وەک لـە پێناسـەی ئـەم دەرسـەش دا باسـمان کـرد، پانتاییەکـی بـاش تەرخـان دەکات بـۆ بـاسی ڕۆژی دوایـی، بـە هـەردوو قۆناغـی ئاخیـر زەمـان و هەڵسـانەوە و زیندووبوونـەوەوە، سـەرەتا دەفەرمـوێ:

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ ﴾، هەتـا کاتێـک یەئجـووج و مەئجـووج کرانـەوە، واتـە: بەریـان بـەر درا، یاخـود ئـەو بەربەسـتەی لـە بەردەمیـان بـوو، لابـرا، ڕێیـان بـۆ کرایـەوەو هاتـن، ﴿ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴾، ئەوانیـش لـە هەمـوو بەرزاییەکـدا زۆر بـە خێرایـی دەڕۆن، ئنجـا ئەگـەر لـە بەرزاییـان بـە خێرایـی بـڕۆن، دەبـێ لـە دەشـتایی چـۆن بـڕۆن؟! واتـە: زۆر بـە خێرایـی بـە زەویـدا بڵاودەبنـەوە، ئایـا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ حَتَّىٰٓ ﴾، ئەمـە پەیوەسـتە بـە کوێـوە؟ واتـە: ئـەم ژیانـی دنیایـە بـەردەوام دەبـێ، هەتـا یەئجـووج و مەئجـووج دێـن و بەسـەر دنیـا وەردەبن.

یاخـود: قەدەغەیـە خەڵکـی ئـەو ئاوەدانییانـەی کـە فەوتاندوومانـن بـە هـۆی گوناهـو تاوانەکانیانـەوە، قەدەغەیـە نەگێڕدرینـەوە بـۆ لای خـوا، بـۆ ڕۆژی سـزا و پاداشـت، بەڵکـو ئەوانـە ناگێڕدرێنـەوە و سـزا نادرێـن جـارێ، هەتـا ئـەو کاتـەی یەئجـووج و مەئجـووج دێـن، کـە سـەرەتای هاتنـی قیامـەت و ڕۆژی دواییـن، بەردەبـن و دنیـا کۆتایـی پـێ دێ.

﴿ وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ ﴾، بەڵێنـی هەقیـش زۆر نیزیـک بـۆوە، بەڵێنـی هـەق، بـە تەئکیـد ئـەو بەڵێنەیـە کـە خـوا داویەتـی ئـەو خەڵکـە زینـدوو بکاتـەوە و لێـی بپرسـێتەوە، کەواتـە: ﴿ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ ﴾، لێـرەدا مەبەسـت پێـی هاتنـی ئاخیـر زەمان

(الساعة) نیە، بەڵکو مەبەست پێی قیامەت و زیندووکرانەوە و هەڵسانەوەیە، چونکە ئەوەیە کە خوای پەروەردگار وەعدی داوە، هەقی تێدا بچەسپێنێ، کە بریتیە لە کاتی سزادانی خراپەکاران و، پاداشت دانەوەی چاکەکاران، ﴿فَإِذَا هِيَ شَاخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، تۆ دەبینی ئەوانی بێبڕوان، چاویان ئەبڵەق و زەق بووە، ﴿يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا﴾، (دەڵێن:) هەی هاوار بۆ ئێمە! ئێمە لەمە بێئاگا بووین، ﴿بَلۡ كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾، بەڵکو ئێمە ستەمکار بووین، واتە: ئاگادارکرابووینەوە و ترسێنرابووین، بەڵام هەر خۆمان ستەمکار بووین و بەرژوەندییمان لە ستەم و خراپەدا بوو، بۆیە گوێمان نەدا بەو هۆشداریی و ئاگادارکردنەوانەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) و شوێنکەووتوانی پێغەمبەران.

ئنجا خوا ﷻ یەکسەر کافرەکان دەدوێنێ، دوای ئەوەی سزایان بەسەر چەسپێنرا و حوکم دران بخرێنە دۆزەخەوە، خوا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ﴾، بە دڵنیایی خۆتان و ئەوانەی لە جیاتی خوا دەیپەرستن، سووتەمەنیی دۆزەخن، ﴿أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ﴾، ئێوە دەیچنە نێو، دەچنە نێو دۆزەخ.

﴿لَوۡ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةٗ مَّا وَرَدُوهَا﴾، ئەگەر ئەوانە پەرستراو بوونایە، پەرستراوی ڕاستەقینە و شایستەی پەرستران بوونایە، نەیدەچوونە نێو، ﴿وَكُلّٞ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾، هەمووشیان بە هەمیشەیی لە دۆزەخ دا دەمێننەوە، واتە: هەم پەرستراوەکان و هەم پەرستارەکان.

﴿لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَهُمۡ فِيهَا لَا يَسۡمَعُونَ﴾، لەوێدا (زَفِيرٌ) یان هەیە، (زفیر) یش یانی: هەناسەدانەوە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی هەنسک و هەناسەی قووڵ دەرهاویشتن و، خەفەتباریی و مەینەتبارییە، ﴿وَهُمۡ فِيهَا لَا يَسۡمَعُونَ﴾، لەوێدا هیچیش نابیستن.

پاشان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی پێشتر لە ئێمەوە پاداشتی چاکیان بۆ بڕیار دراوە، ئەوانە لەو دۆزەخە، لەو ئاگرو سزایە دوورن، دوورخراوەن لێی، ئەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی کافرەکانە، کە گوتیان: ئەگەر پەرستراوەکان لەگەڵ پەرستەرەکاندا سزا بدرێن، کەواتە: دەبێ عیسا کە دەپەرسترێ و، عوزێر کە دەپەرسترێ و، فریشتەکان کە دەپەرسترێن، سزا بدرێن، خوای کارزان ئەو ئایەتەی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەوان ناردە خوارو، دەشگونجێ هەمووی پێکەوە بووبێ.

کە لە ڕاستییدا قسەکەی ئەوان پووچە و، خوا مەبەستی ئەوەیە، ئەوەی دەپەرسترێ و ڕازیشە بپەرسترێ، کە زیاتر مەبەست پێی پەیکەرو بت و سەنەمەکان و سادینە[1]کانیان و طاغووتەکان، بووە، بەڵام بوو، ئەوان لە خۆیانەوە بردوویانە بۆ فریشتەکان و عوزێرو عیسا، کە عوزێرو عیسا و فریشتەکان (عَلَيۡهِمُ السَّلَام)، نە ڕازی بوون و نە خەتاشیان هەبووە لەوەدا کە بپەرسترێن.

خوا دەفەرموێ: ئەوانەی کە لە لایەن ئێمەوە بڕیاری پاداشتیان بۆ دراوە، ﴿ لَا يَسۡمَعُونَ حَسِيسَهَا ﴾، دوورن لە دۆزەخ و لە دوورەوەش هەر دەنگ و هەستیشی نابیستن، (حسیس)، دەنگێکە لە دوورەوە ببیسترێ، بە پێنج هەستەکان دەرک دەکرێ، ﴿ وَهُمۡ فِي مَا ٱشۡتَهَتۡ أَنفُسُهُمۡ خَٰلِدُونَ ﴾، هەروەها ئەوان لەوەدا کە نەفسیان ئارەزووی لێیەتی، بە هەمیشەیی دەمێننەوە، لە بەهەشتدا.

﴿ لَا يَحۡزُنُهُمُ ٱلۡفَزَعُ ٱلۡأَكۡبَرُ ﴾، داچڵەکاندنی هەرە گەورە، دڵتەنگ و ناڕەحەتیان ناکات، داچڵەکاندنی هەرە گەورە، چ مەبەست پێی فووی یەکەم بێ، چ مەبەست فووی دووەم بێ، چ مەبەست پێی ئەو کارەساتە مەزنە بێ کە دێتە پێشێ، کە ڕۆژی دواییە بە گشتی، ئەوە دڵتەنگیان ناکات، ﴿ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ﴾، فریشتەکانیش پێشوازییان لێدەکەن، ﴿ هَٰذَا يَوۡمُكُمُ ٱلَّذِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴾، پێشیان دەڵێن: ئەمە ئەو ڕۆژەتان بوو کە بەڵێنتان پێ دەدرا.

---

(١) سادن ج: سدنة، مثل: كاهن ج كهنة. (سادن) بتەوان، سەرپەرشتیاری بت و صەنەم.

﴿ يَوۡمَ نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِۚ ﴾، هەر بەو بۆنەیەوە خوا باسی چۆنیەتی پێچرانەوەی ئەم گەردوونە دەكات و دەفەرمویێ: ئەو ڕۆژە كە ئاسمان دەپێچینەوە، وەک چۆن بابای نووسەر ئەو تۆمارەی شتی تێدا نووسیوە، دەیپێچێتەوە و هەڵیدەوێژنێ. یاخود: وەک چۆن ئەو تۆمارەی شتی تێدا نووسراوە، دەپێچرێتەوە، ئێمەش ئاوا ئاسمان دەپێچینەوە، ﴿ كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ ﴾، ئەو دروستكراوە، وەک چۆن سەرەتا هێناومانەتە دی، دەیگێڕینەوە بۆ حاڵەتی یەكەمی، ﴿ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ ﴾، ئەوە بەڵێنە لەسەرمان و وای لێ دەكەین، ﴿ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئەنجامدەری ئەوەین.

﴿ وَلَقَدۡ كَتَبۡنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعۡدِ ٱلذِّكۡرِ أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە لە زەبووردا لە دوای زیكر، نووسیومانە و تۆمارمان كردوە، كە زەوی، بەندە چاكەكانم بە میراتی دەگرن، (ٱلذِّكۡرِ)، دەگونجێ مەبەست پێی تەورات بێ، ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ٱلۡفُرۡقَانَ وَضِيَآءٗ وَذِكۡرٗا لِّلۡمُتَّقِينَ ٤٨ ﴾، واتە: لە زەبووردا نووسیومانە، دوای ئەوەی مرۆڤەكانمان لە تەورات دا هۆشیار كردۆتەوە و وریا كردۆتەوە، لە زەبووریشدا نووسیومانە، وشەی (ٱلزَّبُورِ)یش هەم بە (زَبُور)، خوێندراوەتەوە، هەم بە (زُبُر)یش خوێندراوەتەوە، (زُبُر)، واتە: نووسراوو كتێبەكان، (زَبُور)یش یانی: كتێب و نووسراو، كە دەگونجێ مەبەست پێی زەبووری داوود بێ، ﴿ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ٥٥ ﴾الإسراء، دەشگونجێ مەبەست پێی هەموو كتێبەكانی خوا بێ، بە تایبەت ئەگەر بە (زُبُر)، هاتبێ، هەڵبەتە ئەگەر بە (زَبُور)یش بێ، ئەو كاتە جینسی ئەو كتێبانەی لە خواوە هاتوون بۆ پێغەمبەران و نووسراونەوە، هەموویان دەگرێتەوە، یانی: ئەو ڕاستییە نووسراوە كە: سەرزەمینی خوا بەندە شایستەكان بە میراتی دەگرن، سەرزەمینیش دەگونجێ مەبەست پێی سەرزەمینی دنیا بێ، دەشگونجێ مەبەست سەرزەمینی بەهەشت بێ، وەک دوایی باسی دەكەین.

﴿ إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَٰغًا لِّقَوۡمٍ عَٰبِدِينَ ﴾، بێگومان لەوەدا، پێڕاگەیاندن هەیە بۆ کۆمەڵێک خواپەرست بن، بەندایەتیی تەنیا بۆ خوا بکەن، کەواتە: لە ڕێی بەندایەتیی بۆ خواوە، شایستەیی بۆ میراتگرتنی سەرزەمینی خوا لە دنیادا و لە دواڕۆژیشدا، پەیدا دەبێ.

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾، تۆشمان تەنیا وەک بەزەییەک بۆ تێکڕای جیهانییان ناردوە.

﴿ قُلۡ إِنَّمَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾، بڵێ: تەنیا ئەوەم بۆ سروش دەکرێ، کە پەرستراوی ئێوە یەک پەستراوە، ﴿ فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾، ئنجا ئایا ئێوە بۆی ملکەچن؟ ﴿ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُلۡ ءَاذَنتُكُمۡ عَلَىٰ سَوَآءٍ ﴾، ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکردو ڕوویان وەرچەرخاند، بڵێ: من ئێوەم هەمووتان ئاگادار کردووە، ﴿ وَإِنۡ أَدۡرِيٓ ﴾ ناشزانم، ﴿ أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٌ مَّا تُوعَدُونَ ﴾، ئایا ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ، نیزیکە یان دوورە! ﴿ إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا تَكۡتُمُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەو (خوا) قسەیەک کە دەنگی پێ هەڵدەبڕن و بە ئاشکرا دەیکەن، دەیزانێ و، ئەوەش کە پەنهانی دەکەن، هەر دەیزانێ، ﴿ وَإِنۡ أَدۡرِي ﴾، یانی: هەروەها ناشزانم، ﴿ لَعَلَّهُۥ فِتۡنَةٌ لَّكُمۡ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴾، ئەو دواخستنەی ئێوە، لە سزادران دا، یان دواخستنی ئەو بەڵێنەی خوا پێیداون، ڕەنگە تاقیکردنەوە و پێگوزەراندنێکی کەم بێ بۆتان، تاکو کاتێکی دیارییکراو {پێی لە خۆتان بایی مەبن}.

لە کۆتاییدا قسەی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، ﴿ قَٰلَ رَبِّ ٱحۡكُم بِٱلۡحَقِّ ﴾، (موحەممەد) فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! بە هەق دادوەریی بکە، ﴿ وَرَبُّنَا ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ ﴾، پەروەردگاریشمان میهرەبانی پشت پێ بەستراوو داوای کۆمەکیی لێکراوە، ﴿ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴾، لەسەر ئەوەی ئێوە وەسفی دەکەن و دەیڵێن {دەربارەی خوا، کە هاوەڵ و ڕۆڵەی بۆ بڕیار دەدەن، هەروەها دەربارەی

پێغەمبەر ﷺ کە بە شێت و جادووگەری دادەنێن، دیسان دەربارەی قورئان، کە بە ئەفسانەی پێشینانی دادەنێن، لەسەر ئەو قسانەی ئێوە دەیانڵێن، ئەو وەسفە نابەجێیانەی بەرانبەر بە خوا و پێغەمبەر ﷺ و قورئان دەیانکەن، تەنیا پشت بە خوا دەبەستم و، داوای کۆمەکی و یارمەتیی تەنیا لەو دەکەم}.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بـەردەوام بوونـی ژیانـی مـرۆڤ لەسـەر زەوی هەتـا بەردانـی یەئجـووج و مەئجـووج و نیزیـک کەوتنـەوەی قیامـەت و، چـاو زەق بوونـی کافـران و، دادو فیغـان کردنیـان و، دان بـە سـتەمکاریی خۆداهێنانیـان:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ٩٦ وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا بَلۡ كُنَّا ظَٰلِمِينَ ٩٧ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ ﴾، ژیانی دنیا بەردەوام دەبێ، ئەم ژیانە بەردەوام دەبێ، هەتا کاتێ یەئجووج و مەئجووج دەکرێنەوە، واتە: ڕێیان لە بەردەمدا دەکرێتەوە و دەرفەتیان دەدرێ، هۆکار دەڕەخسێ کە یەئجووج و مەئجووج بە زەویدا بڵاوببنەوە.

یاخـود: (حتـى) پەیوەندیـی بـە وشـەی (حـرام)ەوە هەیـە: ﴿ وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآ أَنَّهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ٩٥ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ ﴾الأنبیـاء، ئەوانـە لێیـان قەدەغەیـە کـە نەگەڕێنـەوە بـۆ سـزا و پاداشـت، لێیـان قەدەغەیـە، بەڵکـو جـارێ دەمێننـەوە لـە قۆناغـی بەرزەخـدا، بـەڵام هەتـا کاتێـک کـە یەئجـووج و مەئجـووج دێـن و بـە دنیـا وەردەبـن و، ئـەم دنیایـە دوایـی کۆتایـی پـێ دێ، ئـەو کاتە ئەوانـە دەگێڕدرێنـەوە و دەهێنرێنـەوە بـۆ لای خـوا، بـۆ سـزا و پاداشـت.

٢)- ﴿وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ﴾، ئەوان لە هەموو بەرزاییان زۆر بە خێرایی دەڕۆن، (حَدَبٍ)، یانی: بەرزایی (إرتفاع)، (يَنسِلُونَ)، یانی: بەخێرایی دەڕۆن (**يُسرِعون**)، ئنجا ئەگەر لە بەرزاییان بە خێرایی بڕۆن، ماناى وایە لە پێ دەشت، زۆر خێراتر دەڕۆن، ئەمە وێناکردنی بەخێرایی بڵاوبوونەوەی یەئجووج و مەئجووجە بە زەویدا، لە کاتێکدا پێش ئاخیر زەمان، خوای پەروەرگار ئەو دیاردەیە دێنێتە پێش، کە لە فەرموودەکانی پێغەمبەریشدا ﷺ ئاماژەی پێدراوە و، ئێمە پێشتریش لە تەفسیری سوورەتی (**الكهف**) دا، باسی یەئجووج و مەئجووجمان کرد، کە ڕای زاڵترو بەهێزتر ئەوەیە مەبەست پێیان تەتەرو مەغۆل بێ، کە جارێک دەرچوون و بە دنیا وەربوون و جیهانی ئیسلام و جیهانی ڕۆژئاوایان و زۆربەی دنیایان خستە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە و، ئاژاوە و خراپەیەکی زۆریان بڵاوکردەوە.

جاری کۆتایی کە دەردەچن، نازانین داخۆ چەند جاری دیکە دەردەچن، بەڵام جاری کۆتایی کە دەردەچن، ئەو جارەیە کە ڕێیان لە بەردەمدا تەخت و ئاچووخ دەبێ و، بە دنیایە وەردەبن زۆر بە خێرایی، واش پێدەچێ ئەو خەڵکانەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بن، بە تایبەتی (چین) کە ئێستا ژمارەیان زۆر زۆرە و ئەوانی دیکەی وەک ئەوانیش، لە گەلانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، دەشگونجێ مەبەست پێی قەومێکی دیکە بێ.

هەندێکیش گوتوویانە: یەئجووج و مەئجووج، خەڵکێکی زۆرن بە دنیا وەردەبن و، کاتی زیندوو کرانەوە و کاتی هەڵسێنرانەوەیەو یەئجووج و مەئجووج ڕەمزن بۆ خەڵکێکی زۆر، لە ڕۆژی دواییدا ئەو خەڵکە هەمووی دێتە سەر ئەو زەمینە و، دێتە ئەو گۆڕەپانە کە خوا بۆی ئامادەکردوون، کە ئەم ڕایەم پێ بێهێز و پێزە.

٣)- ﴿وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ﴾، بەڵێنی هەق نیزیک کەوتەوە، بەڵێنی هەق دەگونجێ مەبەست پێی (**ساعة**) (ئاخیر زەمان) بێ، یاخود: مەبەست (**قيامة**) (هەڵسانەوە) بێ،

بە پێی ئەو تەفسیرەی کۆتایی کردم، دەگونجێ مەبەست لە: ﴿ٱلْوَعْدُ ٱلْحَقُّ﴾، بەڵێنی چەسپاندنی هەق لە لایەن خواوە، ئەو بەڵێنەی داویەتی هەق بچەسپێنێ: خراپەکاران بە سزای خۆیان بگەن و، چاکەکاران بە پاداشتی خۆیان بگەن، یانی: نیزیک کەوتەوە کە خوا بەیەکجاریی ئەو تەصفیە حیسابە بکات و، هەر کەسە بە پێی سزا و پاداشتی خۆی، بۆ شوێنی خۆی بەڕێ بکرێ.

٤)- ﴿فَإِذَا هِىَ شَٰخِصَةٌ أَبْصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، تۆ دەبینی ئەوانەی بێبڕوان، چاویان ئەبڵەق و زەق بووە، (**الشخوص: إِحْدَادُ البَصَرِ دُونَ تَحَرُّكٍ كَمَا يَقَع للمبهوت**)، (**شخوص**)، ئەوەیە کە ئینسان چاوی تیژ بکات و چاو ببڕێتە شتێک بێ جووڵاندن، وەک چۆن بابای سەراسیمە وای لێدێ، ئنجا کە چاویان ئەبڵەق و زەق بوو، دەڵێن:

٥)- ﴿يَٰوَيْلَنَا قَدْ كُنَّا فِى غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا﴾، ئەی هاوار بۆ ئێمە! ئێمە لەمە بێئاگا بووین، یانی: ئەی هاوار بۆ ئێمە! یاخود: هەی فەوتان بۆ ئێمە! ئێمە چیمان دەکرد؟

٦)- ﴿بَلْ كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾، بەڵکو ستەمکار بووین، ئەمە: (**إِضْرَابٌ إِبطَالِيٌّ أي بَلْ أُنْذِرْنا، وَإِنَّمَا كُنَّا ظالمين لأنفسنا**)، ئێمە بێئاگا نەبووین، بەو واتایەی ئاگادار نەکرێینەوە، بەڵکو ئێمە ئاگادار کراینەوە و هۆشیارییمان پێدرا، بەڵام ئێمە ستەمکار بووین، ئەگەرنا پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) و، شوێنکەوتووانی پێغەمبەران، ئێمەیان ئاگادار کردەوە، کە ڕۆژێکی ئاوا چاوەڕێی ئێمەیە.

## مەسەلەی دووەم:

**بتپەرست و پەرستراوەکانیان دەبنە سووتەمەنیی دۆزەخ، ئنجا ئەگەر پەرستراوەکانیان پەرستراوی ڕاستەقینە بوونایە، نەدەچوونە دۆزەخ و، لەوێدا نرکە و ناڵەیەکی سەختیان هەیە و هیچیش نابیستن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ لَوْ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةً مَّا وَرَدُوهَا ۖ وَكُلٌّ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٩٩﴾ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ ﴾، بە دڵنیایی ئێوە خۆتان و ئەوەی لە جیاتی خوا دەیپەرستن، ئەوەی لە خوار خواوە دەیپەرستن، ئەوەی وێڕای خوا دەیانپەرستن، سووتەمەنیی دۆزەخن. (حَصَبُ جَهَنَّمَ)، (حَصَبُ)، بە مانای وردە بەرد دێ، بە مانای شتی فڕێدراو دێ، وردە بەردێک کە فڕێی دەدەی، واتە: ئێوە چۆن وردە بەرد فڕێ دەرێتە دۆزەخەوە، ئێوەش خۆشتان و پەرستراوانیشتان ئاوا فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە، وەک چۆن بەردێکی ورد بە تیژیی فڕێی دەدەی، ئێوەش ئاوا بە تیژیی فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە، یاخود (حَصَبُ) بە مانای سووتەمەنیی دێ، (حَصَبُ)، لێرەدا ناوە بە مانای (**المرمي به**)، ئەوەی فڕێ دەدرێ.

٢)- ﴿أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴾، ئێوە دەیچنە نێو، لێرەدا (وَٰرِدُونَ)، بە مانای چوونەتێیان (**داخلون**)، دێ، پێم وایە بۆیە وشەی (وَٰرِدُونَ) بەکارهاتوە، چونکە پێشێ دەچنە سەر سوێی و بە ترس و لەرزەوە دەیبینن، دەزانن چ وەزعێکە، ئنجا دەیچنە نێو، کەواتە: بە تەئکید لێرەدا (وَٰرِدُونَ)، ئەو مانایەی نیە کە لە سووڕەتی (**مریم**)دا هاتوە: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ﴾، کە لەوێ واتە: هەمووتان

دەبرێنە سەر سوێی دۆزەخ، ( ثُمَّ نُنَجِّى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ ) دوایی ئەوانەی پارێزیان کردوە، دەربازیان دەکەین، ﴿ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾، بەڵام ستەمکاران بە لەپەوڕوو کەوتوویی، لەسەر چۆکان بەجێ دێڵین، لەوێدا (ورود)، جیایە و، لێرە جیایە، لەوێ واتە: دەچنە سەر سوێی، بەڵام لێرە یانی: دەیچنە نێو، پێشێ دەچنە سەر سوێی، دوایی دەیچنە نیو، پێم وایە حیکمەتی بەکارهێنانی (وَٰرِدُونَ)، لە جیاتی (**داخلون**)، لێرەدا ئەوەیە، ئەم مانایە لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە، بەڵام ئێستا هاتە زەینمەوە.

٣)- ﴿ لَوْ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةً مَّا وَرَدُوهَا ﴾، ئەگەر ئەوانە پەرستراو بوونایە، پەرستراوی ڕاستەقینە بوونایە، نەدەچوونە نێوی.

٤)- ﴿ وَكُلٌّ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، {کەچی نەک هەر دەیچنە نێو، بەڵکو} هەموویان لەوێدا بە هەمیشەیی دەمێننەوە.

٥)- ﴿ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ ﴾، لەوێدا هەناسەدانەوە (**زفیر**) بۆ ئەوان هەیە، (الزفیر: **النَّفَسُ يَخْرُجُ مِنْ أقصى الرئتين لِضَغْطِ الهَوَاءِ مِنَ التأَثُّرِ والغَمِّ**)، بە کوردیی هەنسک و نرکە و ناڵەی پێدەڵێن، چونکە (زفیر) پێچەوانەی (**شهیق**)ە، کە دەفەرموێ: ﴿ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾، (زَفِيرٌ)، واتە: هەناسە دان، هەناسە خستنە دەر، هەوا خستنە دەر لە سییەکان، لە ئەنجامی دڵ دا گیران دا، جاری وایە ئینسان هەناسەیەکی قووڵ دەر داوێ، ئەوە پێ دەگوترێ: (زفیر)، (**شهیق**)یش، واتە: هەناسە هەڵمژین، واتە: نرکە و ناڵە و هەنسکێکی سەختیان لەوێدا هەیە.

٦)- ﴿ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ ﴾، ئەوان لەوێشدا هیچ نابیستن، لەبەر زرمە و گرمەی دۆزەخ و ناڕەحەتیی لەوێدا، هیچ قسەیەک نابیستن، یاخود: کۆئەندامی بیستنیان لە دەست دەدەن، یان: مەبەست ئەوەیە کە هیچ قسەیەکی خۆشی تێدا نابیستن، (**لا يسمعون فيها كلاماً طيِّباً**) هەموو ئەو واتایانەی هەن.

## مەسەلەی سێیەم:

**ئەوانەی پێشتر بڕیاری پاداشتی چاکی خوایان بۆ دراوە، لە دۆزەخ دوورن، تەنانەت لە دوورەوەش گوێبیستی هەست و خوستی نابن و، بە هۆی بەڵای داچڵەکێنەری گەورەترینیشەوە، دڵتەنگ نابن و، فریشتەکان پێشوازییان لێ دەکەن و دەڵێن: ئەوە ئەو ڕۆژەتانە کە بەڵێنتان پێ دەدرا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ۝١٠١ لَا يَسۡمَعُونَ حَسِيسَهَاۖ وَهُمۡ فِي مَا ٱشۡتَهَتۡ أَنفُسُهُمۡ خَٰلِدُونَ ۝١٠٢ لَا يَحۡزُنُهُمُ ٱلۡفَزَعُ ٱلۡأَكۡبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا يَوۡمُكُمُ ٱلَّذِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ۝١٠٣ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی پێشتر لە ئێمەوە هەرە باشیان بۆ بڕیار دراوە.

٢)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ﴾، ئا ئەوانە لەوێ دوورخراوەن، لە دۆزەخ دوورن، ڕاناوی (عنها) بۆ دۆزەخ دەچێتەوە، دوورخراوەن لە دۆزەخ، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ ﴾، (مجازٌ فِي ثُبُوتِ الأَمْنِ فِي الماضي)، ئەمە مەجازە بۆ چەسپاندنی دڵنیایی و ئەمینیی لە ڕابردوودا، یانی: پێشتر ئەو بڕیارەیان بۆ دراوە، (**الحسنى: الحَالة الحسنةُ في الدِّين**)، حاڵەتی باش لە دینداریيدا، ئەوانەی کە پێشتر بڕیاریان بۆ دراوە، خوا هیدایەتی بە قسمەت کردوون لەبەر ئەوەی شایستەی بوون، ئەوانە لە دۆزەخ دوورن.

واتایەکی دیکەی: ئەوانەی کە پاداشتی هەرە باشیان بۆ بڕیار دراوە لە لایەن خواوە، لەبەر ئەوەی لە دنیادا خاوەنی خەسڵەتی هەرە باش بوون، کە ئیمان و

تەقوا بووە، لە دوا ڕۆژیشدا پاداشتی هەرە باشیان دەبێ لە لایەن خواوەو ئەوەیان بۆ بڕیار دەدرێ، ئا ئەوانە لە دۆزەخ دوورن.

٣)- ﴿لَا يَسۡمَعُونَ حَسِيسَهَا﴾، تەنانەت گوێبیستی ئەو دەنگەش نابن کە لە دوورەوەش دەبیسترێ، کەواتە: هێندەی لێ دوورن، لە دوورەوەش دەنگی نەبیستن، مانای وایە نەک هەر لە دۆزەخ نیزیک نابنەوە، بگرە لە دوورەوەش دەنگی نابیستن.

٤)- ﴿وَهُمۡ فِي مَا ٱشۡتَهَتۡ أَنفُسُهُمۡ خَٰلِدُونَ﴾، هەروەها ئەوان لەوێدا، لە هەرچی دا کە نەفسیان ئارەزوومەندیەتی و ئارەزووی دەکات، بە هەمیشەیی دەمێننەوە، واتە: لە بەهەشتەکانی خوادا، کە هەرچی نەفسیان ئارەزووی بکات، لەوێدا هەیە.

٥)- ﴿لَا يَحۡزُنُهُمُ ٱلۡفَزَعُ ٱلۡأَكۡبَرُ﴾، گەورەترین داچڵەکێنەر دڵتەنگیان ناکات، (الفَزَعُ: نَفْرَةُ النَّفْسِ وَانْقِبَاضُهَا مِمَّا تَتَوَقَّعُ أَنْ يَحْصُلَ لَهَا مِنَ الأَلَمِ)، (فَزَع) بریتیە لە ترسان و سڵەمینەوەی نەفس و ڕێک هاتنی نەفس، لەوەدا کە مەترسیی هەیە و، لە ئازارو ئێش، تووشی ببێت، (ٱلۡفَزَعُ ٱلۡأَكۡبَرُ)، واتە: گەورەترین ترس، کە خەڵک بە هۆیەوە دادەچڵەکێ و، ڕێک دێ و ناڕەحەت دەبێ، ئەوانە ئەو گەورەترین داچڵەکێنەرو ناڕەحەتکەرە، دڵتەنگیان ناکات.

٦)- ﴿وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾، هەروەها فریشتەکان پێشوازییان لێدەکەن، (تَلَقّي) بریتیە لەوەی شتێک بەرەو ڕووی بچی، وەک ڕێز لێگرتن و پێشوازییکردن.

٧)- ﴿هَٰذَا يَوۡمُكُمُ ٱلَّذِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ﴾، پێیان دەڵێن: ئەوە ئەو ڕۆژەتان بوو، کە ئێوە پێشتر بەڵێنتان پێ دەدرا، ئەوە ئەو ڕۆژەتان بوو کە موژدەتان پێدەدرا، کەواتە: خۆشیی لە خۆتان و پیرۆزباییان لێ دەکەن و پێشوازییان دەکەن.

## مەسەلەی چوارەم:

**ڕۆژێک دێ خوا ئەوەی دروستیکردوە {واتە: گەردوون} وەک تۆماری نووسین دەپێچێتەوەو، دەیگێڕێتەوە حاڵەتی سەرەتای کە لێیەوە هاتوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوۡمَ نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِۚ كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

**١)-** ﴿ يَوۡمَ نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ ﴾، ئەو ڕۆژە کە ئاسمان دەپێچینەوە، **(الطَّيُّ: ضِدُّ النَّشْرِ وردُّ بَعض أَعْضاء الجِسْمِ اللَّيّن المطلق عَلَى البَعْضِ الآخر)**، شتێکی نەرم کە بەرهەڵدا کراوە و پان ڕاخراوە و بڵاو کراوە، هەندێکی بخەیەوە سەر هەندێکی، دەگوترێ: **(الطي)**، پێچرانەوە و ڕێک نوشتین، یانی: ئەو ڕۆژە کە ئاسمان ڕێک دەنوشتین و دەپێچینەوە و خڕی دەکەینەوە سەر یەک.

**٢)-** ﴿ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِ ﴾، وەک پێچرانەوەی تۆمارێک کە شتی تێدا نووسراوە، وشەی (سجل) هەم بە مانای ئەو پەڕەی کە شتی تێدا دەنووسرێ، هاتوە، هەم بە نووسەری ئەو پەڕەیەش دەگوترێ، واتە: وەک چۆن بابای نووسەر شتێک کە دەنووسێ، هەڵی دەوێژنێ و ڕێکی دەنووشتێ و دەیپێچێتەوە، ئێمەش ئاوا ئاسمان دەپێچینەوە، ئەمە واتایەکی.

یان: وەک چۆن ئەو تۆمارەی کە شتی تێدا نووسراوە، دەپێچرێتەوە، ئێمەش ئاوا گەردوون دەپێچینەوە، وشەی **(كُتُب)**، خوێندراویشەتەوە: **(كِتابُ)**، **(كَطِي السِّجلِّ للكتاب)**، هەردوو خوێندنەوەکەی هاتوون و یەک ماناشیان هەیە.

٣- ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ﴾، وەک یەکەم جار ئەو دروستکراوەمان دروست کردوە، ئاوا دەیگێڕینەوە، وشەی (خلق) لێرەدا بە مانای (**مخلوق**)ە، ئەو دروستکراوە، ئەو گەردوونە، وەک یەکەم جار هێنامانە دی، ئاوا دەیگێڕینەوە بۆ ئەو حاڵەتە.

## تیشکێك لەسەر ڕستەی: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ﴾

(**البَـدء: الفِعْـلُ الَّـذِي لَـمْ يَسبِقْهُ مُمَاثِلُـه**)، (**بَـدء**) بریتیـە لـە کردەوەیـەک کـە هاووێنـەی پێـش نەکەوتبـێ، یەکەمجـار ئـەو گەردوونـە خـوا چۆنـی هێناوەتـە دی، ئـاوا دواجـار دەیگرێتـەوە بـۆ ئـەو حاڵەتـەی، ئێمـە پێشـتر لـە تەفسـیری سـووڕەتی (**یونـس**)دا، باسـی ئەوەمـان کـرد، هەروەهـا لـەم سـووڕەتەش، لـە تەفسـیری ئـەو ئایەتـەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾﴾، ئاماژەمـان پێـدا.

نوێتریـن بیـردۆزەش لەوبـارەوە ئەوەیـە کـە ئـەم گەردوونـە، لـە ئەنجامـی تەقینەوەیەکـی گـەورەدا پەیـدا بـووە، کـە پێـی دەگوتـرێ: تەقینـەوەی گـەورە (Big Bang)، (**الإنفجـار الكبـير**) ئـەوەی تەقیوەتـەوەش تەنێکـی یەکجـار یەکجـار گچکـە بـووە، کـە یەکـەی گەردوونـی (الوحـدة الكونيـة) یـان هێلکـەی گەردوونیـی (البيضـة الكونيـة)ی پێدەگوتـرێ بـە ئینگلیزیـی سـینگولاریتیی (Singularity)، دەڵێـن: بـەردەوام کەهکەشـانەکان و ئەسـتێرەکان لێـک دوور دەکەنـەوە تاکـو کاتێـک کـە خـوا دەزانـێ، جارێکـی دیکـە ئـەم گەردوونـە دێتـەوە یـەک و، لـەو حاڵەتـی ماددەی سـادەی کـە لێـوەی دەسـت پێکـرد، دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو حاڵەتـە، کـە هـەر خـوا دەزانـێ چۆنـە، بـە هـەر حـاڵ ئـەوە ئاماژەیـە بـەوە، بـەڵام ئامـاژەی بـە شـتێکی دیکـەش تێـدا هەیـە: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ﴾، دەگونجـێ مەبەسـت پێـی مرۆڤـەکان بـێ، یـانی: مرۆڤەکانمـان پێشـێ چـۆن هێناونـە دی، ئـاوا دەیانگێڕینـەوە بـۆ ئـەو حاڵەتـە.

٤)- ﴿وَعۡدًا عَلَيۡنَآ﴾، ئەوە بەڵێنێکە لەسەر ئێمە.

٥)- ﴿إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئەنجامدەری ئەوەین.

ئنجا بەو مانایەی دووەمیان کە مەبەست پێی مرۆڤەکان بێ، ئەم فەرمایشتە هەیە:

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَطِيبَاً بِمَوْعِظَةٍ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ تُحْشَرُونَ إِلَى اللَّهِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً، ثم تلا: ﴿كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ١٠٤﴾} (أخرجه الطيالسي: ٢٦٣٨، وأحمد: ٢٢٨١، والبخاري: ٤٣٤٩، مسلم: ٢٨٦٠، والترمذي: ٣١٦٧، والنسائي: ٢٠٨٧).

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک هەڵسا وتاریداو ئامۆژگاریی کردین، فەرمووی: ئەی خەڵکینە! ئێوە بۆ لای خوا کۆدەکرێنەوە بە پێخواسیی و بە ڕووتیی و بە سوننەت نەکراویی، ئنجا ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ١٠٤﴾، وەک یەکەمجار دروستکراومان هێناوەتە دی، ئاوا دەیگێڕینەوە، ئێمە ئەنجامدەری ئەوەین.

ئەگەر مەبەست پێی مرۆڤەکان بێ: یانی: چۆن لە دایکی خۆیان بوون، ئاوا دەیانگێڕینەوە بۆ ئەو حاڵەتەی ئینسان تێیدا لە دایک دەبێ، بێ بەرگ و پۆشاک و بێ پێڵاو و، هیچ گۆڕانێک بەسەر جەستەیدا نەهاتوە، دەیگێڕینەوە بۆ ئەو حاڵەتە.

بەڵام ئەگەر مەبەست پێی گەردوون بێ بە گشتیی، یانی: ئەو بوونە چۆن لە خاڵێکەوە دەستیپێکردوە، دەیگێڕینەوە بۆ ئەو حاڵەتە و خاڵی دەستپێکی.

### مەسەلەی پێنجەم:

**خـوا لـە زەبـووردا دوای تـەورات تۆمـاری کـردوە کـە بەنـدە شایسـتەکانی سـەرزەمین بـە میـرات دەگـرن، ئەمـەش پەندی بـە ئامانج گەیەنـەرە بۆ خواپەرسـتان و، پێغەمبـەری کۆتاییـش ﷺ بەزەیـی خوایـە، بـۆ سـەرجەم جیهانییـان:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَاغًا لِّقَوْمٍ عَابِدِينَ ﴿١٠٦﴾ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴿١٠٧﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ﴾ بە دڵنیایی ئێمە لە زەبووردا تۆمارمان کردوە و نووسیومانە، خوێندراویشەتەوە: (**فِي الزُّبُر**).

أ- ئنجا ئەگەر (الزَّبُورِ) بێ، دەگونجێ بە مانای کتێب (**كتاب**) بێ بە موتڵەقیی، یانی: لە کتێبی خۆماندا، ئەویش بریتی بووە لە وەحیی خوا، کە دوای نووسرانەوەی، کراوە بە کتێب، ئنجا بە ئیعتیباری خوێندرانەوەی پێی دەگوترێ: قورئان و، بە ئیعتیباری نووسران، پێی دەگوترێ: کتێب و، بە ئیعتیباری ئەوە کە بە شێوەیەکی پەنهان بۆ پێغەمبەران هاتوە، پێی دەگوترێ: وەحیی و، بە ئیعتیباری ئەوە کە ڕاستییەکان دەخاتەوە بیر مرۆڤەکان، پێی دەگوترێ: (**ذكر**)، دەفەرموێ: ئێمە لە زەبووردا کە دەگونجێ کتێب بێ، بەگشتیی یاخود مەبەست ئەو کتێبە بێ کە بە داوود دراوە: ﴿وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾﴾الإسراء، کە لە پەیمانی کۆندا بە (**مزامیر**)، کە کۆی (**مزمور**)ە، هاتوە.

**ب**- ئەگەر بە (الزُّبُر)یش بخوێندرێتەوە، یانی: لە کتێبەکاندا، نووسیومانە.

٢)- ﴿مِنۢ بَعۡدِ ٱلذِّكۡرِ﴾، دوای زیکر، زیکریش یانی: دوای ئەوەی ڕاستییەکانمان ڕوونکردوونەوە، یاخود (ٱلذِّكۡرِ)، ناوێکە بۆ تەوڕات، یان سیفەتی تەوڕاتە، واتە: دوای تەوڕات، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ٱلۡفُرۡقَانَ وَضِيَآءٗ وَذِكۡرٗا لِّلۡمُتَّقِينَ ٤٨﴾، واتە: مووسا و هاڕوون (فورقان و ضیاء و زیکر)مان پێدابوون بۆ پارێزکاران.

ئنجا ئایا خوا چی تۆمارکردوە و چی نووسیوە لە زەبووردا، دوای زیکر؟!

٣)- ﴿أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ﴾، کە سەرزەمین بەندە شایستەکانم بە میراتی دەگرن، ئایا مەبەست لە زەوی، ئەم زەمینەی دنیایە؟ یاخود مەبەست لە زەوی، سەر زەمینی بەهەشتە؟ هەردووک ئەگەرەکەی هەن.

أ- بە نسبەت سەرزەمینی بەهەشتەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعۡدَهُۥ وَأَوۡرَثَنَا ٱلۡأَرۡضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلۡجَنَّةِ حَيۡثُ نَشَآءُۖ فَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ٧٤﴾الزمر، واتە: پارێزکاران گوتیان: ستایش بۆ ئەو خوایەی بەڵێنی لەگەڵ ئێمەدا ڕاست بردە سەرو سەرزەمینی، {سەرزەمینی بەهەشتی} کردە میراتی ئێمە، ئێمە لە هەر شوێنێکی بەهەشتدا بمانەوێ نیشتەجێ دەبین.

ئەگەر مەبەست پێ ئەوەیان بێ، واتە: خوا تۆماری کردوە کە سەرزەمینی بەهەشت لە گرەوی بەندە پەسندو چاکەکانی خوا دایە و، ئەوان بە میراتی دەگرن.

ب- ئەگەر مەبەست ئەم سەرزەمینەی دنیاش بێ، دیسان ئەوانەی کە شایستە بن لەم سەرزەمینی دنیادا، دەبنە حوکمڕان و باڵادەست، دەبێ شایستە بن، لێرەدا (ٱلصَّٰلِحُونَ) ئەگەر ئەوەی یەکەم بێ واتە: بۆ خوا صوڵحاوبن، بەڵام ئەگەر ئەمەیان بێ واتە: بۆ ژیانی دنیا صوڵحاوبن، شایستە بن، بە توانابن، زانابن، شارەزابن، کراوەبن، لێهاتووبن، ئنجا دەبنە حوکمڕان و دەستەڵاتدار لە زەویدا، هەڵبەتە بە هۆی ئایین و بەرنامەی خوا و بەندایەتیی بۆ خواشەوە، بە تەئکید بۆ مرۆڤەکان شایستەیی ئەوەیان دەبێ، کە خوا لەسەر زەویدا حوکمڕانییان پێبدات، هەروەک هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وابوون و جیلەکانی دوایی مسوڵمانان زۆریان وابوون، هەر بۆیەش دوایی دەفەرموێ:

٤)- ﴿ إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَٰغًا لِّقَوۡمٍ عَٰبِدِينَ ﴾، بێگومان لەوەدا پەندو ئامۆژگارییەکی بە ئامانج گەیەنەر هەیە بۆ کۆمەڵێکی خواپەرست، واتە: ئەوانەی کە خواپەرست بن و، بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، بە هۆی بەندایەتیی بۆ خواوە، وایان لێ دێ بە کەڵکی ئەوە بێن، سەرزەمینی خوا بە میرات بگرن و خوا باڵادەستیان بکات.

٥)- ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾، خوا پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەدوێنێ: تۆشمان نەناردوە مەگەر بەزەیی بی بۆ تێکڕای جیهانییان، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەحمەت و بەزەیی خوایە بۆ تێکڕای خەڵکی، نەیفەرموە: (رحمة للمُسلمين)، فەرموویەتی: (رَحۡمَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ)، ئنجا بەشەر هەمووی پێی دەگوترێ: جیهان (عالم) (عالَمُ الإنس)، (عالَمُ الجن)، (عالَمُ الملائكة)، (عالَمُ الشَّجر)، (عالَمُ النَّبات)، (عالم الجماد) پێغەمبەری خاتەم (محمد)یش ﷺ ئەو پەیام و بەرنامەی خوا پێیدا ناردوە، ئەگەر بچەسپێ، ئەو پەیام و بەرنامەیە، مایەی ڕەحمەت و بەزەیی خوایە، بۆ تێکڕای دروستکراوەکان، لەو بارەوە چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ هەن:

١)- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِنِّي لَمْ أُبْعَثْ لَعَّانًا، وإِنَّمَا بُعِثْتُ رَحْمَةً} (أخرجه مسلم برقم: ٢٥٩٩).

واتە: من بە نەفرینکەر نەنێردراوم، بەڵکو بە ڕەحمەت و بەزەیی نێردراوم، ڕەوانەکراوم.

٢)- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {أللَّهم أَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي سَبَبْتُهُ فِي غَضَبِي، أَوْ لَعَنْتُهُ لَعْنَةً، فَإِنَّمَا أَنَا رَجُلٌ مِنْ وَلَدِ آدَمَ، أَغْضَبُ كَمَا يَغْضَبُونَ، وَإِنَّمَا بَعَثَنِي رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ، فَاجْعَلْهَا صَلَاةً عَلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} (أخرجه أحمد: ٢٣٧٥٧، وأبو داود: ٤٦٥٩، والبخاري في الأدب المفرد: ٢٣٤، والبزار: ٢٥٣٢).

واتە: ئەی خوایە! هەر پیاوێک لە ئوممەتی خۆم قسەیەکم پێ گوتبێ، لە کاتی توڕەبوونمدا، یان نەفرینێکم لێ کردبێ، من پیاوێکم وەک ڕۆڵەکانی ئادەم، تووڕە دەبم وەک چۆن ئەوانیش تووڕە دەبن، بەڵام خوا منی بە ڕەحمەت

ناردوە بۆ هەموو جیهانییان {بۆیە ئەو قسەیەی پێم گوتوە و، ئەو نەفرینەی لێم کردوە} لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی بکە بەبەزەیی، واتە: لە خوا پاڕاوەتەوە کە هەر کەسێ قسەی پێ گوتبێ و نەفرینی لێ کردبێ، بۆی بکات بە مایەی ڕەحمەت و بەزەیی.

٣)- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّمَا أَنَا رَحْمَةٌ مُهْدَاةٌ} **(أخرجه الحاكم: ١٠٠، وقال: هذا حديث صحيح على شرطهما، وقال الذهبي في التلخيص : على شرطهما، وتفرُّد الثقة مقبول، وأخرجه الدارمي: ١٥، قال حسين سليم أسد: إسناده صحيح ولكنه مرسل).**

واتە: بە دڵنیایی من تەنیا بەزەییەکی خەڵاتکراوم (بۆ مرۆڤایەتیی).

## مەسەلەی شەشەم:

**فەرمان کردنی خوا بە پێغەمبەر ﷺ کە یەکتایی خوا ڕابگەیەنێ لە پەرستراوێتییدا و بڵێ: ئەوە هەمووتانم بە یەکسانیی ئاگادار کردەوە، ناشزانم بەڵێنی خوا نیزیکە یان دوورە و، خواش ئاشکرا و پەنهان دەزانێ و، ڕەنگە ئەو دوا خستنەی ئەو بەڵێنەش {ئنجا ئەگەر سزایە، ئەگەر هاتنی قیامەتە} تاقیکردنەوە و گوزەرانێکی کاتیی و کەم بێ بۆ ئێوە، پاشان خوا پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ باس دەکات، دەفەرموێ: خوایە! بە هەق دادوەریی بکە و، لە بەرانبەر ئەوەشدا کە کافرەکان دەیڵێن و وەصفی دەکەن، پەنا پێبراوی من، بەس خوای خاوەن بەزەیی و میهرەبانیی بێسنوورە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٨﴾ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ ءَاذَنتُكُمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ وَإِنْ أَدْرِىٓ أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٌ مَّا تُوعَدُونَ ﴿١٠٩﴾ إِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلْجَهْرَ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَيَعْلَمُ مَا تَكْتُمُونَ ﴿١١٠﴾ وَإِنْ أَدْرِى لَعَلَّهُۥ فِتْنَةٌ لَّكُمْ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١١١﴾ قَٰلَ رَبِّ ٱحْكُم بِٱلْحَقِّ وَرَبُّنَا ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ إِنَّمَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾، بڵێ: بە دڵنیایی من بەس ئەوەم بۆ سروش دەکرێ (لە بارەی پەرستنی خواوە)، کە پەرستراوی ئێوە یەک پەرستراوە، ئەویش خوایە ﷻ، ئێمە دەڵێین: (لا إله إلاَّ الله)، واتە: جگە لە خوا هیچ پەرستراوێک نیە، پەرستراوی بە هەق، ئەگەرنا پەرستراوی بە ناهەق زۆرن.

٢)- ﴿ فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾، واتە: ئنجا ئایا ئێوە لە دوای ئەم ڕوونکردنەوەیەو، ئەو ڕاگەیاندنە ڕوون و ڕۆشنە، ملکەچن بۆ خوا، کە تەنیا ئەو بپەرستن و، واز لە هاوبەش بۆ خوا دانان **(الإشراك بالله)** بێنن؟!

٣)- ﴿ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُلۡ ءَاذَنتُكُمۡ عَلَىٰ سَوَآءٍ ﴾، ئنجا ئەگەر پشتیان تێکرد، ڕۆیشتن و وازیان هێنا، واتە: ڕوویان لە هەق وەرچەرخاند، ئەوە هەمووتانم بە یەکسانیی ئاگادار کردۆتەوە، (ءَاذَنتُكُمۡ: **أي أعلمتكم**)، ئاگاردارم کردوونەوەو، هۆشیارم کردوونەوە، (سَوَآءٍ: **مستوٍ، أي مستوين في إعلامكم به**)، واتە: هەمووتان وەک یەک ئاگادارم کردوونەوە، جیاییم پێ نەکردوون، یەکێک چاک ئاگاداربکەم و یەکێک خراپ.

٤)- ﴿ وَإِنۡ أَدۡرِيٓ أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٞ مَّا تُوعَدُونَ ﴾، ناشزانم: ئایا ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ، نیزیکە یان دوورە؟ ئەوەی بەڵێنیان پێ دەدرێ:

أ- دەگونجێ مەبەست پێی هاتنی ئاخیر زەمان بێ.

ب- دەگونجێ مەبەست پێی هاتنی قیامەت و هەڵسانەوە و زیندووکرانەوە بێ.

ج- دەگونجێ مەبەست پێی بەڵاو سزای دنیا بێ.

د- دەگونجێ مەبەست پێی ئەو هەڕەشەیە بێ کە ئێوە لە دنیادا، دوایی لە بەرانبەر ئەهلی ئیسلامدا شکست دەخۆن.

گرنگ ئەوەیە من نازانم ئەوەی کە بەڵێنتان پێ دەدرێ و هەڕەشەتان پێ لێدەکرێ، نیزیکە یان دوورە؟

٥)- ﴿ إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ ﴾، بە دڵنیایی ئەو (خوا) قسەی ئاشکرا و بە دەنگی بەرز دەزانێ.

٦)- ﴿ وَيَعۡلَمُ مَا تَكۡتُمُونَ ﴾، دەشزانێ ئەوەی پەنهانی دەکەن و دەیشێرنەوە، یانی: **(وما تكتمون من القول)**، ئەو قسەیەی کە پەنهانیشی دەکەن، ئەویش دەزانێ و، ئەوەش کە بە ئاشکراش دەیکەن، دەیزانێ.

٧)- ﴿وَإِنْ أَدْرِي لَعَلَّهُۥ فِتْنَةٌ لَّكُمْ﴾، من ناشزانم ڕەنگە ئەو دواخستنی سزایە، بەڵا، یان هاتنی قیامەت، یان هاتنی ئاخیرزەمان، بۆ ئێوە تاقیکردنەوە بێ.

٨)- ﴿وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ﴾، هەروەها بەهرەوەرگرتنێك بێ، تاكو ماوەیەكی كەم (متاع: **ما يُنْتَفعُ به مُدَّة قليلة**)(متاع) ئەوەیە كە بەهرەی لێوەردەگیرێ بۆ كاتێكی كەم، واتە: ڕەنگە ژیان و گوزەرانێكی كەم و كاتیی بێت، واتە: پێی بوغرا مەبن، پێی لە خۆتان بایی مەبن، پێتان وانەبێ كە لێپرسینەوە و سزا و پاداشت لە ئارادا نیە، ئەوە بەس تاقیكردنەوەیەكە و ڕابواردنێكی كەم و كاتییە.

٩)- ﴿قَٰلَ رَبِّ ٱحْكُم بِٱلْحَقِّ﴾، گوتی: پەروەردگارم! بە هەق دادەوریی بكە، بە تەئكید پێغەمبەر ﷺ گوتی، هەروەک خوێندراویشەتەوە: (**قُلْ رَبِّ احْكُم بالحَقِّ**)، بڵێ: پەروەردگارم! بە هەق و ڕاستیی و دادگەرانە، دادوەریی بكە (لە نێوان من و ئەواندا).

ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە كە ئایندە لە گرەوی ئەم ئایینە دایە، سەرەنجام خوای هەق، خوای پەروەردگار عزوجل بە هەق لە نێوان ئەوان و ئەهلی ئیسلام دا دادوەریی دەكات، كە دەچەوسێنرێنەوە، ئەو كاتە لە مەككەو، ئێستا لە دنیادا، بەڵام سەرەنجام ئایندە لە گرەوی ئەهلی ئیسلام دایە، ئەگەر ڕاست بكەن.

شایانی باسە: ﴿قَٰلَ رَبِّ ٱحْكُم بِٱلْحَقِّ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**قُلْ**)، وشەی (رَبِّ)یش، هەم بە ژێر (كَسْر) خوێندراوە: (**رَبِّ احكم**)، هەم خوێندراوەتەوە: (**رَبِّي احْكُم**)، واتە: بە (ی)ش خوێندراوەتەوە، هەردوو خوێندنەوەكان یەک واتایان هەیە.

١٠)- ﴿وَرَبُّنَا ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلْمُسْتَعَانُ﴾، پەروەردگاریشمان خاوەن بەزەیی بێسنوورو میهرەبانی پشت پێ بەستراوە و، داوای هاوكاریی لێكراوە، (ٱلْمُسْتَعَانُ)، واتە: ئەو كەسەیە داوای هاوكاریی لێدەكرێ و، پشتی پێ دەبەسترێ و، هاواری تێ دەبەسترێ، پەروەردگارمان: خاوەنی ئەوپەڕی میهرەبانیی و بەزەییە، هەر ئەویشە كە پشتی پێ دەبەسترێ و، هاواری لێ دەكرێ و، داوای یارمەتیی لێ دەكرێ، لە بەرانبەر چیدا؟

١١)- ﴿عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾، لەسەر ئەوەی کە ئێوە دەیڵێن، واتە: لەسەر ئەوەی کە ئێوە زمانتان وەصفی دەکات:

أ- لە بارەی خواوە ﷻ،

ب- لە بارەی قورئانەوە.

ج- لە بارەی موحەممەدەوە ﷺ کۆتا پێغەمبەری خوا.

د- لە بارەی ئیسلامەوە، واتە: ئەو قسانەی کە ئێوە بە ناهەق لە بارەی خواوە دەیانکەن، کە هاوبەشی هەیە و ڕۆڵەی هەیە، هەروەها لە بارەی قورئانەوە کە دەڵێن: ئەفسانەی پێشینانەو موحەممەد ﷺ لە خۆیەوە هەڵیبەستوە و، کەسی دیکە فێری کردوە، دیسان لە بارەی موحەممەدەوە ﷺ کە دەڵێن: لە خۆوە لافی پێغەمبەرایەتیی لێدەدا، یاخود جادووگەرە، یان شێتە، هەروەها لە بارەی ئیسلامەوە، ئەو شتە ناهەقانەی کە لەبارەیەوە دەیانڵێن: من پشتم بە خوا قایمە و، خوای منیش خاوەنی ئەوپەڕی میهرەبانیی و بەزەییە و، هەر ئەویش پشت پێبەسترا و و داوای یارمەتییلێکراوە، لە بەرانبەر ئەو قسانەدا کە ئێوە دەیانکەن.

واتە: بۆ بەتاڵکردنەوەو، پووچەڵکردنەوەی ئەو قسانەی ئێوە، پشتم بە خوا قایمە، کە خوا بە هۆی دابەزاندنی قورئان و سووڕەتەکانی قورئانەوە، ئەو قسانەی ئێوە، وەک بڵقی سەر ئاو بپووچێنێتەوە، هەر واش بووە.

لێرەشدا زۆر سوپاس و ستایشی خوا دەکەین، کە کۆتایی بە تەفسیرو لێکدانەوەی ماناو مەبەستەکانی ئایەتە موبارەکەکانی سووڕەتی (الأنبیاء) دێنین، لە خوای پەروەردگار دەپاڕێینەوە بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، ئێمەش لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خاتەم ﷺ بەردەوام بین و، یارمەتییمان بدات هەرچی زیاتر لە قورئان تێبگەین و، زیاتر پێوەی پابەندبین، هەم تێیبگەین، هەم تێیدا پێبگەین، خۆمان و دەوروبەرمان، لەو نوورو بەرەکەتەی قورئان و

ئیسلام بەهرەمەند بین، هەم ژیانی دنیامان پڕ لە بەختەوەریی بێ، هەم لە دواڕۆژیش دا سەرفرازو شادمان بین.

دواپێداچوونەوە :

٢٠٢٠/١٠/٢٩ز --- ١٢ / رەبیعی یەکەم / ١٤٤٢ك

# نێـوەڕۆک



## تەفسیری سوورەتی طه

## تەفسیری سوورەتی الأنبیاء